

دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان

گی دۆمۆپەسان

# "پییر و جان"، "بیل ئام"



کۆ ڕۆمان





وەرگێڕانی:

حەمەکەریم عارف

گی دۆمۆپەسان

# "پییر و جان"، "بیل ئام"

## کۆ ڕۆمان

وەرگێڕانی:

حەمە کەریم عارف

٢٠٢٢

**سەرچاوەکانی ئەم وەرگێڕانە:**

پيير وجان/ رواية/ نزار أباظة، بول كواتلان/ دارطلاس للدراسات و الترجمة و النشر/ الطبعة الاولى/ ١٩٨٩.

گی دو موپاسان/ بل ئامی
ترجمه: پرويز شهدی/ انتشارات مجيد چاپ اول، تهران. ١٣٨٤.




---




بڵاوکراوەکانی ناوەندی توێژینەوەی ئەدەبیی
عەبدولڕەحمان زەبیحی ٢٠٢٢

زنجیرە: (٩١)


---


بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید



Tel: 0533202936 07701549509
email: jamalerfan99@gmail.com

jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر ماکسی مۆڵ

گی دۆمۆپەسان

# "پییر و جان"، "بیل ئام"

## کۆ ڕۆمان

وەرگێڕانی:

حەمە کەریم عارف

٢٠٢٢

# "پییر و جان"، "بیل ئام"



کۆ ڕۆمان


- نووسەر: گی دۆمۆپەسان
- وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف
- دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد
- دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
- نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ١٠٠٠٠ دینار
- چاپ: چاپخانەی تاران

# پێڕست

## پییروجان



## بیل ئام

## وتەیەك

گی دو موپاسان، نووسەری فەرەنسایی لە 1850/8/5، لە کۆشکی " میرومانسنیل " ی هەشت کیلۆمەتری دیپ دێتە دنیاوە. لور دو موپاسان، وەکو دایکێک دەیەوێت کوڕەکەی بە دەستوور و داب ونەریتێن ئەشرافیانەی ماڵباتەکەی خۆی پەروەردە بکات.

بابی، واتە گوستاف دو موپاسان، هیچ پیشینەیەکی ئەشرافی نەبوو، یانی ئەشراف زادە نەبوو، ئیدی ژیانی خێزانداری ئەم ژن و پیاوە بەهۆی غرووری ژنەکە و سەرسەرێتی و لامێژیی نهێنی پیاوەکەوە، هەمیشە ناخۆش و بە ئاژاوە بووەو کەشێکی ئارام و ئاسوودە بۆ ئەم کوڕیژگە هەستیارە نەڕەخساوە. ئیدی بەهۆی کێشماکێش و شەڕە دەنووکی بەردەوامی ئەم دایک و باوکەوە، بەرەبەرە نیشانەێن خەمینی و ڕەشبینی لە کوڕەکەدا پەیدا دەبێت و باندۆر و کاریگەریی شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی بەردەوامی ئەم دایک و باوکەی تا مردن لە کۆڵ نابێتەوە.

لور دو موپاسان، لە نامەیەکیا بۆ نزیکترین دۆستی خۆی، گوستاف فلوبیر، سەبارەت بە کوڕەکەی، دەڵێت: " نە زەوقی هیچی هەیە، نە حەزی لە هیچە، نە کەس خۆش دەوێ، نە هیچ جۆرە مەیل و ئارەزوویەک، نە هیچ بەرزەفڕییەک و ئومێدوارییەک نانوێنێ. "

پێش ئەوەی گی بگاتە تەمەنی دوازدەساڵی، باوک و دایکی لێکدی جیادەبنەوەو سەرپەرشتی کوڕەکە، بە دایکی دەسپێردرێت. لور دو موپاسان، کە دەیەوێ کوڕەکەی بە

داب و نەریت و دەستووری ئەشرافیانەی خۆی پەروەردە بکات، فێرکردن و پەروەردەی ئەو بە کابرایەکی کەشیش دەسپێرێت. لێ ئەخلاق و خووی کومیدیانەی یارۆی کەشیش، تەنیا سەلیقە و بەهرەی تەنز و تەنزگەری لەلای موپاسان دەهاڕوژێنێت.

لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا بە ناچاری بۆ قوتابخانەی ئۆلی " ئیڤوتوت "ی دەنێرێت. ئیدی ناخۆشی بینای قوتابخانەکە و خەمئەنگێزی قوتابخانەکە هێندەی دی خەمینی و نائومێدی گی، زیاد دەکات. گی کە لە ماڵی خۆیان فێری ئەوە بوو، هەموو ڕۆژێ خۆی بشوات، لێرە شتی وای بۆ نەدەلوا و ئەمەی زۆر لەبەر گران بوو. ناچار بۆ سەرگەرمکردنی خۆی، ڕووی کردە خوێندنەوەی ئەم کتێب و بەرهەمانەی کە خوێندنەوەیان لە قوتابخانەی ناڤبری قەدەغە بوو. لە ژێر باندۆر و کاریگەری ڤیکتور هۆگۆدا، کەوتە نووسینی شیعرێن ڕۆمانتیکی. ئیدی لەم سەروبەندەدا زەوق و سەلیقەی ئەدەبی لە لا پەیدا بوو..

لور دومموپاسان، کوڕەکەی لە تەمەنی هەڤدە ساڵیدا، لە کاتێکا دووچاری خەمۆکی و سستی ئەعساب بووبوو، لە قوتابخانەی " ئیڤوتوت " دەردێنێت. موپاسان، دوای ئەوەی مالیجە و دەرمان دەکرێت، لە ساڵی 1868 دا دەچێتە ئامادەیی شاری ڕوین، لە 1869/10/27. بە دەرەجەی ئیمتیاز، شادەتنامەی قوناغی دووەمی ئامادەیی لە بەشی ئەدەبیاتدا وەردەگرێت و لە هەمان شاردا ئاکنجی دەبێت.

موپاسان لە روین دا، ئاشنایەتی دەگەڵ ئەدیبێکی چل و شەش ساڵاندا، بەنێوی لویس بویە، پەیدا دەکات، ئەم شاعیر و درامانووسە کە لە ڕوین دا، سەرقاڵی کتێبفرۆشی بوو، زۆر شتی گرینگ دەربارەی هونەری نووسەراتی فێری موپاسان دەکات و نهێنی سەرکەوتنی ئەدەبی، واتە کۆڵنەدان و کاری بەردەوامی پێ دەناسێنێ.

موپاسان لەم قۆناغەدا بە کۆمەکی لویس بویە وگوستاف فلوبیر کە لە لایەکەوە نزیکترین دۆستی دایکی بوو و لایەکی دییەوە ڕازڤان و مەحرەمی ڕازی لویس بویە بوو، دەکەوێتە خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی بالزاک و دەرس و پەندی زۆر باشیان لێوەردەگرێت و بە شێوەیەکی جدی دەست بە نووسین دەکات.

موپاسان لە ئوکتوبەری/ 1869 دا بۆ پاریس دەڕوات تا لەوێندەر و لە بەشی ماف دا درێژە بەخوێندن بدات، بەڵام بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان پروس و فەرەنساوە، ناچار دەڕوات بۆ عەسکەری. ئیدی لەو ژینگەیەدا، پەی بە دەسیسە و فەندەڵ فێڵی سوپاییان و سیاسەتوانانی سەر بە چینە باڵاکان دەبات و ئیدی لەو ساڵانەدا، بەرەبەرە چ سەبارەت بەوان و چ سەبارەت بە جەنگ، ڕق و کینەی دەکەوێتە دڵ، کە ئەمەی زۆر بەجوانی لە بەرهەمەکانیدا هونەراندووە...

موپاسان تەمەنی لاوی لە کاروباری کارگێڕی زەوقکوژی ئەو سەردەمەدا بەسەر دەبات. هەوەڵجار لە وەزارەتی دەریاوانی و کەشتیرانی و پاشان لە وەزارەتی

پەروەردە و فێرکـــردن دا، وەکـــو فەرمـــانبەر دامەزرا... لەم سەروبەندەدا، زۆر شتی دەربارەی ژیانی فەرمانبەران وەکو توێژێکی گەورەی وردە بورژوازی شاری، بۆ دەرکەوت و لەلا کەڵەکە بوو کە پاشان بوو بە هەوێن و ئامیانی چەندین شاکاری ئەدەبی.

بەڵام موپاســـان، هەر زوو لە کـــارێن کـــارگێڕی بێـــزار دەبێـــت و ڕۆژ بە ڕۆژ بـــاری دەروونـــی خراتـــر دەبێـــت، لە دایەرەکەی خۆیـدا، خـۆی بە زنـدانی دەزانـی، لە نـۆڤەمبەری 1878 دا لە نامەیەکـدا بـــۆ فلـــوبیر دەنووســـێت: " ژووری کـــارەکەم، دۆزەخـــێکە لەو گـــۆڕە. " کەمێـــک دواتـــر و لە نـامەیەکی دیدا بەمجۆرە سکاڵا دەباتە بەر فلوبیر: " من تـا بیناقاقـا لە پوخلەواتـا ڕۆچـووم، لە داخ و پەژارەیەکـی بـێ وێنەدا نقووم بووم. "

لە ماوەی ئەم هەشت ساڵەدا تەنیا پەناگەی ئەو دەبێت بە سروشـــت و تەبـیعەت، ئەم جارەیـان خـــوو دەداتە ڕوبـاری سـین و مەلە و مەلەوانـی و بەلەمڕانـی و کە پـیچەک خەم و پەژارە دەروونـــی و ســـایکۆژییەکانی دەڕەوێنێـــتەوە.... ئەم ســـەروبەندە دەبێـــتە ســـەرچاوەو ئیلهامبەخشـــی گەلێـــک لە چیرۆکە کورتەکـانی دەربـارەی بەلەمڕانـی لە ڕوبـاری سـین دا.

دیـارە فلـوبیر، دەورێکـی یەجگـار گەورە، لە پەروەردەی فیکـــری وئەدەبـــی ئەودا دەبینـــێ و زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکەکـانی بە فیلـتەری ئەودا تێـدەپەڕێت و بەچیـرۆک و نووســـینەکانیدا دەچێـتەوە و پوختەیـان دەکـات. موپاســـان

هانـدەدات کە بە زمـانێکی پـاک و پـوختە و ڕوون و ڕەوان وسـفت بنووسـێت، بە کۆڕ وئەنجوومەنـانی ڕۆژنامەڤانـان و نووسەرانی دەناسێنێت... فلوپێر بە بەردەوامی ئەو قسـەیەی شـاتوبریانی بیـر دەخسـتەوە کە: " بەهـرە، جگە لە سـەبر و حەوسـەڵەی دوور ودرێـژ هیچـی دی نیـیە. " هەمیشـە ئامۆژگاری موپاسان دەکات کە سـەرەتا، بزێوی و عەجولی و نائـارامی و بـێ سـەبری زکمـاکی خـۆی هێـور بکـاتەوە، ئەوسـا لە هەنبەر دیـاردە و ڕووداوەکانـدا دادەنیشـێت و بە وردی لێیان ورد ببێتەوە، دیقەتیان بدات. دەڵێت:

" وەکو ئەوەی بتەوێ لایەن و حاڵەتێک کە هیچکەسێکی دی تا نها نەیدیتوون و قسـەی دەربـارە نەکردوون، کەشف بکەیت ". فلوپێر ڕازی وەسف کردن بەمجۆرە شەرح دەکات:

" ئەو شـتەی دەمـانەوێ باسـی بکەیـن، جـا هەرچییەک بـێ، تەنیـا یەک نـاو هەیە بـۆ دیـاریکردنی. تەنهـا یەک فرمـان بـۆ خسـتنە جـوڵانی هەیە، تەنیـا یەک سـیفەت هەیە بـۆ وەسـف کردنی. "

فلـوپێر، هەمیشـە ئامۆژگـاری دەکـرد، کە تـا دەتـوانێ لە هەوڵـدان بەردەوام بـێ و کـۆڵنەدات: " هەر کەسـێک کە بە جدی عەوداڵی شتێک بێت، دەیدۆزێتەوەو دەیگاتێ. " هەڵبەتە نوێئاوەرییەکانی موپاسان لە دنیای هونەری چیرۆکدا و ئەو گۆڕانکـاریەی لە بونیـادی چیرۆکـی کورتـا دایهێنـا، ئەنجـامی ئەو هەوڵە جـدی و بەردەوامـانەی خـۆی بـوو.. فلـوپێر سـەبارەت بە حـوزووری نووسـەر لە کـارە هونەریەکەیـدا دەڵێت: " هونەرمەند، پێویستە لە بەرهەمەکەیدا، وەکو خـودا

بێ لە داهێنانەکەیدا، دەبێ لە هەموو شوێنێکا هەستی پێبکرێت بەڵام نەبینرێت. "

موپاسان، لە ژمارەیەک چیرۆکی خۆیدا، پەیڕەوی ئەو ڕێنماییەی فلوبیری کردووە. پاش ئەوەی ساڵانێک لە کاری کارگێڕی دەوڵەتیدا بەسەر دەبات و پتر لە سێسەد چیرۆک و ڕۆمانان دەنووسێت و شۆرەت و ناوبانگێکی زۆر پەیدا دەکات ئیدی لە ساڵی 1891 دا بەرەبەرە نیشانەکانی دەروونپەرێشی لێ بە دیار دەکەوێت. لە مانگی 1892/1 دا، هەوڵی خۆکوژی دەدات، بەڵام سەرناگرێت ولە6 /1/ 1892دا دەخرێتە ئاسایشگەکەی دکتۆر بلانشەوە و ئیدی هەر لەوێ و لە 1893/7/6 دا لە تەمەنی چل وسێ ساڵی و لە هەرەتی بەخششی فیلیڤانیدا کۆچی دوایی دەکات..

***

هەڵبەتە باشترین پێوەر ومیتۆد بۆ هەڵسەنگاندنی دەقی ئەدەبی. خودی دەقەکەیە کە خوێنەر لە هەر پێشداوەرییەک دوور دەخاتەوە و ناچاری دەکات هەموو توانایەکی فیلیڤانی و ئەفراندنەوانی خۆی بۆ کەشفکردنی نهێنگە تووشەکانی لایەنە ئیستاتیکی و هونەرییەکانی دەقەکە بەکار بەرێت و لە نێوەڕۆکی دەقەکە ورد بێتەوە و وەردی بداتەوەو لە دوا ئەنجامدا، بەگوێرەی توانا خوێندنەوەی بۆ بکات. بابەتی دەقی ئەدەبی هەرچییەک بێت، ئەوەی بەلای خوێنەرەوە گرینگە، چۆنیەتی گەیشتن وگەیاندنی پەیامی نووسەرە بە خوێنەر و وەرگر، جۆری تەرح کردنی بابەت و پەیامەکەیە،

که بێگومـان ڕەگـی دەچێتەوە سـەر شـێواز وسـتایل و بەهـا ئیسـتاتیکیەکانی دەقەکە. هەڵـبەتە ئاشـکرایە کە هـیچ دەق و بەرهەمێــک، لە بۆشـــاییدا چێنەبـــووە. لە هەل ومەرجـــی مێژوویـی وجڤاکی خۆیدا لە دایک دەبێت. ناسنامەی خۆی وەردەگرێـــت، بەروار و شـــوێنی لە دایکبـــوونی دیـــاریی دەکرێت، ئەوسا پەساپۆرتی بەزاندن و بڕینی سنووری کات و شـــوێنان وەردەگرێـــت، کە بمـــانەوێ و نەمـــانەوێ ئەمە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە دەقی ئەدەبیدا ڕەنگدەداتەوە و ناشـێت دەور و بانـدۆر وکـاریگەری کـۆمەڵگەش وەکـو سـەرچاوەیەکی ئیلهـامبەخش و گرینگـی ئەدەب فەرامـۆش بکرێت کە دەشێت ببێت بە ڕێنما و ڕێگوشای ناسینی دەق.

هەڵـبەتە ڕەهەنـدێکی دیـکەی هەڵسـەنگاندنی دەقێکـی ئەدەبی، زانینی پەیوەندی ئەو دەقەیە، بە دەقێن دیکەوە.

فلـوپیر لە قسـەیەکیا دەڵێـت: " نووسـەر نـابێ لە دوای مەرگی خۆی، جگە لە بەرهەمەکانی هیچی دی بەجێ بێڵێت! "

وادیارە موپاسان، هەمان ئامۆژگاری فلوپیری مامۆستای جێبەجێ کردووە... بۆیە بەنـدە نـامەوێ لەوەی پتـر بەتـانی قسـاندا بچم و خـوێنەری هێژا لە لەزەتـی خوێنـدنەوە بکەم، فەرموو ئێوە و دەقی ڕۆمانی ( پییر وجان ) کە لەو دەقانەیە کە لە پاش موپاسان بەجێ ماوە.

تێبینی: بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

1 – گی دو موپاسان/ خرخەپان و چەند چیرۆکێکی دی/ وەرگێرانـی: حەمە کەریـم عـارف، چـاپی یەکەم ( 2020 )، دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان.
2 – هـورلا ( داسـتان هـای کوتـاه ) گـی دو موپاسـان، ترجمە: شیرین دخت دقیقیان، چاپ اول، 1373، تهران.
3 – اسـفار، مجلـة دوریە تعنـی بـالادب والفـن، بغـداد، 1985.
4 – مێژووی ئەدەبیاتی جیهان، ن. بوکنر، ب. تراویک، و: حەمە کەریـم عـارف، بەرگـی دووەم، دەزگـای تـوێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، 2008.

**حەمە کەریم عارف**

# پییرو جان

## ( ١ )

بابە ڕۆلاند لە ناکاوا هاواریکرد:- زفت.

چارەکە سەعاتێک بە بێدەنگی و بێ هیچ جووڵەیەک وەستا، چاوانی بڕیە ئاوەکە. ناو بە ناو، زۆر بە ئەسپایی، پەتەکەی کە بە قولایی ئاوەکەدا شۆڕ بووبووەوە، بەرز دەکردەوە.

خات ڕولاند، کە لە پاشی کەشتیەکەوەو لە تەنیشت خاتوو روزمیلیەوە کە بۆ ئاهەنگی ئەم ڕاوە ماسییەیان دەعوەت کردبوو، چاوی گەرم کردبوو، لە ناکاو بێدار بووەوە و ئاوڕی لای مێردەکەی دایەوە و گوتی:- ئەوە چیتە جیروم!

پیاوەکە بە تووڕەیی بەرسڤی دایەوە:

- حاڵەکە ئاسایی نییە، لە نیوەڕۆوە هیچم ڕاو نەکردووە، پێویستە لە گەڵ پیاواندا ڕاو بکرێت، چونکە ژنان خاوە خاو دەکەن و لە مەوعیدی کەشتیەکە دوا دەکەون.

کوڕەکانی ڕولاند، پییر وجان کە لەم بەرو لەوبەری کەشتیەکە ڕۆنیشتبوون، بە دوو قۆڵی دەستیان بە پێکەنین کرد، هەریەکەیان پەتێکی ڕاویان پێ بوو و لە قامکیانەوە ئالاندبوو. جان گوتی:

- باوکە خێرە مجامەلەی میوانەکەمان ( روزمیلی ) ناکەی!

جەنابی رولاند شڵەژا و تەوازی هێنایەوە و گوتی:

- بوورە خات روزمیلی، من ئاوام، خانمان دەعوەت دەکەم چونکە حەزدەکەم لەگەڵیاندا بم، پاشان کە دەگەمە ناو ئاو و خۆم بە سەر ئاوەوە دەبینم، خۆم لە بیر دەکەم و تەنیا بیر لە ماسی دەکەمەوە.

خات رولاند، بە تەواوەتی بێدار بووەوە، ئەوسا بە ڕوخسارێکی میهرەبانەوە، ڕوانیە ئاسۆی دوور ودرێژی کەناراو و دەریاکە ولە بن لێوانەوە گوتی:- وێڕای ئەوەش ڕاوێکی زۆرتان کردووە.

بەڵام مێردەکەی سەرێکی لەقاند و گوتی:- نا.

لە هەمان کاتدا چاوێکی ڕەزامەندی بە سەبەتەکەدا گێڕا، ئەو ماسییانەی هەرسێ پیاوەکە ڕاویان کردبوون، هێشتا لەناو سەبەتەکەدا، بە ئاستەم دەجوولانەوە، دەنگێکی سووک، لە پوولەکە و باڵە لینجەکانیانەوە، کە بە زەحمەت دەیان جولاند، و دەمیان کە لە هەوا کوشندەکەدا دادەچەقاند، دەهات. بابە رولاند، سەبەتەکەی خستە نێوان هەردوو زرانییەوە، سەبەتەکەی خوار کردەوە، ماسییە زیوینەکانی لێژ کردنەوە تا بنی سەبەتەکە بدینێ و نیگەرانی و گیانەڵڵای ماسییەکان، کە سات بەسات خێراتر دەبوو بدینێت و ئەو بۆسارده تیژە هەڵمژێ کە لە ماسییەکانەوە هەڵدەستا. لە قوڵایی سەبەتەکەوە، بۆنی ماسی تازە ڕاوکراو بەرز دەبووەوە. پیرەمێری ڕاوچی، بەجۆش و خرۆشەوە، وەکو چۆن بۆنی گوڵ هەڵدەمژن، بەو ئاوایە بۆنەکەی هەڵمژین و گوتی:- ماشەڵڵا! تازەی تازەیە.

ئەوسا درێژەی دایە و پرسی:- دکتۆر تۆ چەندت ڕاو کردووە؟

پییری کوڕە گەورەی، کە پیاوێکی سی ساڵان بوو و لاجانگەکانی وەکو لا جانگی قازیان بڕی بوو و ڕدێن و سمێڵی پاک تراشی بوو بەرسڤی دایەوە: - حەیفێ کەمە، سیان یان چوار.

باوکەکە، ئاوڕی لای کوڕی دووەمی دایەوە و گوتی:- ئەدی تۆ جان گیان؟

جان، کە کوڕێکی کەتەی قژ زەردی ڕیشن بوو و لە پییر بچووکتر بوو، بزەیەکی کرد و گوتی: - تەقریبەن بە ئەندازەی ئەوەی پییر، چوار پێنج دانە.

جووتە کوڕ، هەموو جارێک هەمان درۆیان دەکرد کە بابیانی دڵخۆش دەکرد.

بابەکە، پەتەکەی لە سەر سەوڵەکە هەڵکرد و هەردوو باسکی لە سەر سینگی تێک هاڵاندن و گوتی:

- لەمڕۆ بە دواوە هەوڵدەدەم دوا نیوەڕوان ڕاوێ نەکەم، لە سەعات دە بە دواوە ڕاو تەواو دەبێت، ئەم ماسییە خوێڕیانە لە سەعات دە بە دواوە، ئیدی پەلاماری چەشە نادەن، حەز دەکەن خۆ بدەنە بەر هەتاو و بخەون.

ئەوسا، بە ڕەزامەندییەوە، ڕوانییە دەریاکەی دەوروبەری. جەنابی ڕولاند، پێشتر لە پاریسدا دووکانی زەڕەنگەری هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆری حەز لە دەریاوانی و ڕاوەماسی بوو، ئیدی خۆی لە دووکانداری دزییەوە و بەو دەرامەتە قەناعەتی کرد کە هەی بوو و ژیانێکی خاکیانەی گرتەبەر.

چوو بۆ بەندەری هاڤەر و کەشتیەکی کڕی و بوو بە دەریاوانێکی هاوی . بەڵام کوڕەکانی، پییر و جان لە پاریس مانەوە تا درێژە بە خوێندنەکەیان بدەن وخوێندن تەواو

بکەن، لە کاتی پشوودا، ناو بەناو دەهاتن و بەشدارییان لە هیوایەتەکەی بابیاندا دەکرد.

پییر، کە پێنج ساڵ لە براکەی گەورەتر بوو، دوای ئەوەی خوێندنی قۆناغی ئامادەیی تەواوکرد، هەستی دەکرد، مەیلی لە کۆمەڵێک پیشەی جیاوازە، شەش دانەیانی جەڕباند، یەک لە دوای یەک جەڕباندنی و زۆر زوو لە هەرهەموویان بێزار بوو، ئیدی بیری لە کاروپیشەی تازە کردەوە. ئەنجام حەزی چووە پزیشکی و نوژداری، بەجۆش و خرۆشەوە کەوتە کارکردن، دوای چەند لێکۆڵینەوەیەکی کورت، بڕینی قۆناغە پێویستەکان، ئیدی بەشی پزیشکی تەواو کرد و وەزیر مۆڵەتنامەی دکتۆری دایێ.

کوڕێکی ڕووخۆش، زیرەک و دەم دەمی مگێز، تووندە تەبیعەت و هەڵچوو، فرە خەون و بەرزە خەیاڵ، بارگاوی بە هزرێن فەلسەفی، ئەم ئەسمەر ڕەنگ و ، جان کوڕێکی سوورەی، ئارام بوو، چەند پییر بۆغزن و ڕکونی بوو، ئەم حەلیم وهێدی بوو. بەشی مافی، بێ هیچ کۆسپێک تەواو کرد، لەو کاتەدا پییر شادەتنامەی نوژداری وەرگرت، ئەمیش شادەتنامەی مافی وەرگرت..

هەردووکیان دەگەڵ خانەوادەکەیاندا دەچوونە سەیران وگەڕان، هەردووکیان بیریان لەوە دەکردەوە، ئەگەر هەلومەرجی لەباریان بۆ هەڵبکەوێت بچنە بەندەری هاڤەر و لەوێندەر ئاکنجی ببن. بەڵام جۆرە حەسوودی و بەغیلیەکی پەنهان و گونگ باڵی بەسەردا کێشان، ڕێک لەو غیرە گونگ و ئاڵۆزە دەچوو کە ژێراوژێر و بە پەنهانی لە نێوان برایان یان خوشکاندا چێدەبێت و تا تەمەنی پێگەیشتن و پوختەبوون بە نهێنی دەمێنێتەوە و ئەوجا لە پڕێکا بە بۆنەی

ژنهێنانی یەکێکیانەوە، یان شادی و بەختەوەرییەک ڕووبکاتە یەکێکیان، دەتەقێتەوە و ئاشکرا دەبێت. ئەم حەسوودی و غیرەیە، جۆرە بوغزێکی بێوەی لە نێوان جووتە برادا چێکرد. دروستە خۆشەویستیان بۆ یەکدی دەنواند، بەڵام وێڕای ئەوەش لە کەمینا بوون بۆ یەکدی. پییر، پێنج ساڵان بوو کە جان لە دایک بوو. بە دژمنایەتی حەیوانێکی چکۆلەی نازدارەوە، دەیڕوانیە ئەم حەیوانە چکۆلەیەی دی، کە لە ناکاوا لە باوەشی دایک و باوکیا پەیدا بوو و بە سۆزەوە دەیان لاواند و گەمەیان دەگەڵ دەکرد ودەیان حوباند.

جان، لە منداڵییەوە نموونەی سۆز ومیهر و ڕەفتاری سەنگین و ئارام بوو، بەڵام پییر، هەرکە گوێی لە دایک و باوکی دەبوو کە ستایشی ئەم کوڕە کەتەیەیان دەکرد، دەهری دەبوو، تووڕە دەبوو، نەرم ونیانیەکەی ئەوی بە پووچەڵ، ئارامی و باشیەکەی بە گەوجاتی، سەلاری و ئاقڵیەکەی ئەوی بە ساویلکەیی دەزانی. دایک و باوکە سادەکە، کە هیوای پێگەیەکی ئابڕوومەندانەیان بۆ هەردوو کوڕەکەیان دەخواست، دڕدۆنگی گومان و دوودڵیە ناکامەکانی پییر یان لە هەنبەر بیرێن باڵا و پیشەێن گەورەدا لەبەر گران بوو و گلەییان لێدەکرد. لەوەتای گەورە بووبوو وبووبوو بە پیاو، ئیدی پێیان نەدەگوت: " تەمەشای جان بکە وچاو لەو بکە، وەکو ئەو بە " بەڵام هەرکە گوێی لێیان دەبوو دەیانگوت: " جان ئەمەی کرد، جان ئەوەی کرد " زۆر بە چاکی لە مانای ئەو وشانە و ئاماژە پەنهانەکانی ئەو وشانە حاڵی دەبوو.

دایکیان ژنێکی بە بەرنامە بوو، بورژوایەکی دەست بڵاو نەبوو، کەمێک بە سۆز و عاتیفی و، ڕوح سووک بوو،

هەموو ڕۆژێک، هەڤڕکی نێوان کوڕەکانی هێور دەکردەوە، ئەو هەڤـڕکییەی کە لە ئەنجـامی وردە ناکۆکییـانی ژیـانی هاوبەشـیانەوە، سـەری هەڵـدەدا. بەڵام لەم دواییـانەدا، بـویەرێکی بچـووک، نیگەرانـی کـرد، لە ئاکـامی ئەم بـویەرە سـادەیە ترسـا، لە وەرزی زسـتاندا، لەو کـاتەدا کە هەردوو کـوڕەکەی خوێنـدنی زانکۆیـان تەواو کـرد، تووشـی ژنێکـی دراوسـێیان بـوو نێوی خـاتوو روزمیلی بوو، ئەمە بێوەژنی ئەفسـەرێکی دەریـاوانی بـوو، دوو سـاڵێک بـوو لە دەریـادا مردبوو، ئەم بێوەژنە گەنج بوو، تەمەنی بیست وسێ ساڵان بوو، خاتوونێکی هۆشیار بوو، بە غەریزە، وەکو حەیوانێکی ڕەها ژیانی دەناسی، وەکو ئەوە بوو بویەر و ڕووداوەکان بـدینێت و بخـوێنێتەوە، تەحەمولیـان بکـات، بە ئەقـڵ و ئـاوەزێکی سـاغڵەم حوکمیـان بەسـەردا بـدات، ئیـدی خـووی بەوەوە گرت کە ئێواران سەری ئەو دراوسێ ئازیزانە بدات و چایەکیان لەگەڵدا بخواتەوە و بەدەم قسانەوە کات بەسـەر بەرن. بـاوکە رولانـد، بە حـوکمی ئەوەی ڕژد بـوو لە سـەر ئەوەی ببێت بە دەریـاوان، لە پەسـتا و بێ پسـانەوە، هەواڵـی ئەفسـەرە مـردووەکەی لەم ئاشـنا تـازەیە دەپرسـی، ژنەی تاینیش، بێ هیچ دوو دڵییەک باسی مێردە ئەفسـەرەکەی بـۆ دەکرد، باسـی سـەفەر و چیرۆک و سـەربردە کۆنەکـانی بـۆ دەگێڕایەوە، ژنێکـی بە ئـاوەز بـوو، ژیـانی خۆشدەویسـت و ڕێزی مردنی دەگرت.

جـووتە بـراش کە ئەم بێـوەژنە خشـیک و جوانەیـان لە ماڵی خۆدا بینی کەوتنە چاوبازی و ئاشقێنی لەگەڵیا، هەڵبەتە ئەمەیـان لە ڕووی دڵبەنـدییەوە نەدەکـرد، بەڵکـو لە ڕووی هەڤـڕکییەوە و بەنیـازی ئەوەی، بەسـەر یەکـدا زاڵ بـن

ئەوەیان دەکرد. دایکیان کە ژنێکی پراگماتیکی بوو، لە دڵی خۆیدا، خوا خوای بوو، یەکێک لە کورەکانی، دڵی خاتوون بەدەست بێنێ، چونکە دراوسێ گەنجەکەیان دەوڵەمەند بوو. بەڵام دایکەکە حەزیدەکرد، کوڕی دووەم لەم کارە دڵگیر نەبێت.

خاتوو روزمیلی، چاوانی شین بوو، قژی لە تاجێک دەچوو کە بە کەمترین سروە با دەکەوتە سەما. جۆرە پرکێشی و بێ پەروایی و مەیلێکی سەوداگەری بە رواڵەتیەوە دیاربوو، کە دەگەڵ رەفتاری حەکیمانەیدا تێکی نەدەکردەوە. پێدەچوو، بەلای جان دا مایل بێ و بەلای ئەودا دایدەکێشا. چونکە تەبیعەتی جان لە تەبیعەتی ئەم دەچوو. دیارە ئەم مەیلە، لە دەم و دوویا و لە گۆڕانی دەنگیا ولە جۆری نیگا کردنەکەیا، لەو پرسیارانەدا کە ناو بەناو لە جانی دەکرد بە ئاستەم بەدیار دەکەوت. وادیار بوو گەیی بووە قەناعەت کە ڕاوبۆچوونی جان، وەکو ڕاوبۆچوونی ئەوە و ڕاوبۆچوونی پییر، پێچەوانەی ڕای ئەوە ( روزمیلی ). وەختایەک روزمیلی باسی هزرە سیاسی و هونەری و فەلسەفی و ئەخلاقییەکانی جەنابی پزیشکی دەکرد، ناو بەناو دەیگوت: " پیف لە قسە بۆش وبەتاڵەکانت " هەنگێ دکتۆر قازی ئاسا تەمەشایەکی سارد و سڕی روزمیلی دەکرد، تەمەشایەک کە ئیدانەی ژن، هەموو ژنان، ئەم بوونەوەرە بەسزمانانەی دەکرد.

باوکە رولاند، پێش گەڕانەوەی کورەکانی، هەرگیز و بۆ تاقە جارێکیش ئەم بێوەژنەی بۆ ڕاوە ماسی دەعوەت نەکردبوو، چونکە قەت ژنەکەی لە گەڵ خۆیدا نەدەبرد، چونکە حەزیدەکرد سپێدە زوو، شەوەکی، دەگەڵ کاپتنی

خانەنشین (بوسیر ) دا، بۆ ڕاوە ماسی بڕوات . جارێک لە کاتی خێزاوی دەریاییدا تووشی ئەم کاپتنە بووبوو و، ئیدی لەو کاتەوە بووبوو بە هاوڕێی دڵسۆزی، ئیدی حەزیدەکرد دەگەڵ ئەو و دەریاوانێکی پیردا کە ( جان بار ) یان پێدەگوت و پاسەوانی کەشتیەکەی دەکرد، بچێتە ڕاوەماسی. ئێوارەیەکی هەفتەی ڕابردوو، لە کاتێکا خاتوو روزمیلی، لە ماڵی ئەمان شێوی دەخوارد، بە رولاندی گوت: - لەوە دەچێ ڕاو زۆر خۆش بێت؟

کۆنە زەڕنگەری خانەنشین لە دڵی خۆیدا، زۆر کەیفی بەو قسەیەی یارۆی بێوەژن هات، وەکو چۆن ڕەبەنان، ئارەزوومەندی گوێگرتنن لە ئیعترافی دینداران و باوەڕداران، بەو ئاوایە هاواریکرد:- حەز دەکەی بچیتە ڕاوێ؟

- بەڵێ، زۆریش.
- سێ شەممەی داهاتوو، باشە؟
- بەڵێ، باشە.
- باشە دەتوانی سەعات پێنجی بەیانی هەستیت؟

ژنەی تاین، حەپەسا، گوتی: - نەخێر! بۆچی چییە!

ئیدی نائومێد بوو، ورەی بەردا، گومانی ئەوەی لا دروست بوو کە خاتوون دەعوەتەکەی قەبووڵ بکات، وێڕای ئەوەش لێی پرسی:- سەعات چەند دەتوانی لەماڵ وەدەر بکەوی؟

- سەعات نۆ...
- پێشتر ناتوانی ئامادەبیت؟
- نەخێر، لەوە زووتر ناتوانم، نۆش زۆر زووە.

کابرا کەوتە دوو دڵی وگومانەوە. هەڵبەتە لەم حاڵەدا هیچ شتێک ڕاو ناکات، چونکە هەتاو بەرز بووەوە و دنیا گەرم ببێت ئیدی ماسی ناکەوێتە تۆڕەوە. بەڵام جووتە برا یەکسەر و زوو ئامادە بوون و سەفەرەکەیان بە تەواوەتی ڕێکخست.

سێ شەممەی داهاتوو، کەشتی " مرواری " لەلای بەردە سپیەکانی کەپکی ( لاهیف ) لەنگەری خست و نەفەرەکانی ناوی تاوەکو نیوەڕۆ ماسییان ڕاو کرد، ئەوجا هەنۆزکێکیان دا ( سەرە خەوێکیان شکاند )، پاشان دووبارە دەستیان بە ڕاوکردن کردەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ڕاوێکیان دەست بکەوێ. وەختایەک بابە ڕولاند، بە درەنگەوە بۆی دەرکەوت کە خاتوو ڕوزمیلی، حەزی لە ڕاو نییە وزیاتر گەشتە دەریاییەکەی مەبەستە تا ڕاوەماسی و کە تەمەشای کرد پەتی قولاپەکەی هیچ ناجوڵێت و هیچ ماسییەکی پێوە نەبووە، وەکو یەکێک سەبری سوابێ، بێ هیچ بیرکردنەوەیەک هاواریکرد:

" زفت! " بەتووندی و ڕوو لەو ماسیەی کە نەیتوانی بیگرێت ئەو قسەیەی کرد، هەڵبەتە هەم مەبەستی ماسییەکە بوو و هەم مەبەستی بێوەژنە خەمساردەکەش بوو. بووکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێبێ.

ڕوانییە ماسییەکانی ناو سەبەتەکە، ماسییەکەی خۆی، بە جۆش و خرۆشی بابایەکی بەغیلەوە لێی ڕوانی. ئەوجا چاوی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی، سەیری کرد هەتاو بەرەو ئاوابوون نشێو دەبێتەوە. گوتی:

- کوڕینە دەڵێن چی کەمێک بگەڕێینەوە؟

هەردووکیان پەتەکانیان هەڵکێشایەوەو، هەڵیان کردەوە و دوای ئەوەی پاکیان کردەوە، بە پارچە فلینێکیانەوە بەست و چاوەڕوانیان کرد.

رولاند هەستا، تا وەکو کاپتن، چاو بداتە ئاسۆ و گوتی:

- بایەکەی خستووە، کوڕینە دەبێ سەوڵ لێبدەین.

لە ناکاوا، باسکی بەرەو چەپ ڕاکێشا و لە سەری ڕۆیی و گوتی:

- سەیرە، سەیرە، ئەم کەشتیە لە بەندەری ساوتمبونەوە دێ.

بە سەر دەریاکەوە، کە وەکو پارچەیەکی شینباوی بێ سنووری ڕاخراو دەینواند و وەکو زێڕ و ئاگر دەدرەوشایەوە، لەو ئاستەدا کە ئەو ئاماژەی بۆ دەکرد، پەڵە هەورێکی ڕەش بۆ ئاسمانی گوڵگون بەرز بووەوە، کەشتیەکە لە ژێر پەڵە هەورەکەدا بە دیار کەوت، لە دوورەوە زۆر بچووک دیاربوو. لە باشوورەوە دووکەڵێکی دیکە بەرچاو کەوت، دووکەڵێکی زۆر چڕ بوو، بەرەو لەنگەرگاکەی بەندەری هافەر دەڕۆیی، دنیا تاریک بوو، منارەکەی ئەوبەر بە ئاستەم دەبینرا، رولاند پرسی:

- باشە، ئەمڕۆ، مەوعیدی گەڕانەوەی کەشتیە نورماندییەکە نییە؟

جان بەرسڤی دایەوە: - بەڵێ باوکەگیان.

- کوا دووربینەکەم وێدە، وابزانم لەوێندەرە.

بابەکە، دووربینەکەی لە قاوغە مسینەکەی دەرهێنا، بەباشی نای بە چاویەوە و چاوی بۆ خاڵەکە گێڕا، لە ناکاوا بەدی کرد، بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

- بەڵێ، بەڵێ، خۆیەتی، ئەوەتانێ خۆیەتی، من ئەم دوو دووکەڵکێشە دەناسمەوە. خاتوو روزمیلی دەتەوێ تەمەشا بکەیت؟

خاتوو روزمیلی دووربینەکەی وەرگرت، ڕووی کردە کەشتیە دوورەکە کە ئوقیانووسەکەی دەبڕی، نەیتوانی بە دروستی ڕووی دووربینەکەی تێبکات، هیچ شتێکی نەبینی تەنیا شیناتیەک و کۆڵکە زێڕینەیەکی بازنەیی تەواو و هەندێ شتی سەیر نەبێ کە لە خۆرگیران دەچوو و دڵ لێی تێک هەڵدەهات. دووربینەکەی بۆ گێڕایەوە و گوتی:

- قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمزانی چۆن ئەم ئامێرە بەکاربێنم، مێردەکەم بەمە تووڕە دەبوو، بەخۆی بە سەعاتان لەبەر پەنجەرەکە دەوەستا و تەمەشای ئەو کەشتیانەی دەکرد کە دەریایان دەبڕی.

باوکە رولاند، بێزار بوو، لە سەری ڕۆیی و گوتی:

- ڕەنگە عەیب لە چاوتا بێ، دەنا دووربینەکەم، دووربینە نە گاڵتە.

ئەوجا دووربینەکەی دایە ژنەکەی و پێی گوت: - دەتەوێ تەمەشا بکەیت؟

- نا، سوپاس، پێشوەختە دەزانم کە ناتوانم بەکاری بێنم.

خات رولاند، ژنێکە لە تەمەنی چل و هەشت ساڵیدا، بە ڕواڵەت گەنجتر دیاربوو، لەم سەفەرەدا و لە کۆتایی ڕۆژەکەدا لە هەموو ئەوانی دی بە کەیفتر دیاربوو، قژە ڕەشەکەی خەریک بوو سپی دەبوو، سیمای هێمن و ئارام بوو، ئۆخژنی دەخستە دڵ و دەروونەوە. هەرچەندە، پییری کوڕی گوتەنی، قیمەتی پارەی دەزانی، بەلاّم ئەمە

نەیکردبـووە کارێـک خـۆی لە ئەفسـوونی فیلمـان بـێ بەش بکات. حەزی لە خوێندنەوەی چیرۆک و شیعر بوو، نەک لە بەر بەهـا هونەرییەکەیـان، بەڵکـو لەبەر ئەوەی لەزەت لە و زنـدە خەونە ڕۆمانسـی و دەروونیـانە وەربگرێـت کە ئەو خوێندەوانە لە نیهادیا بێداریان دەکردەوە. هەر بەیتە شیعری بـازاڕی و جەڵەبـی خراپ، خـۆی گـوتەنی دەمـارە چکـۆڵەی دەبزواند و کۆمەڵێک هەسـت و ئـارەزووی پەنهـان و واقیعـی لەلا دەبوژانـــدەوە ، زۆری لەزەت لەو ســـۆزە پەنهانـــانە وەردەگـرت کە بە ئاســتەم دەروونیـان کە وەکـو ســەعاتی میقـات کـراو میقـاتکرابوو، دەشـڵەقاند. لەوەتـای گەیـی بـووە هـاڤەر، خەریـک بـوو قەڵەو دەبـوو و ئەمەی بە ئاشـکرا پێـوە دیـاربوو، سـمت و کەفەڵـی ئەسـتوور بـوو، پێشـتر باریـک و لاواز بوو، زۆری کەیف بەم سەفەرە دەریاییە هات.

مێردەکەی پیاوێکی جینگز و شەڕانی نەبوو، بەڵام بەبـێ ڕق و تـووڕە بـوون سـەرکۆنەی دەکـرد، ڕێـک وەکـو ئەو دووکانـــدارە تـــووڕە و ترۆیـــانەی لە دووکانەکانیانـــدا، بە جنێـوان ئەمـر دەکەن. لەبەردەم بێگانانـدا سـڵی دەکـردەوە، بەڵام کە لەگەڵ ماڵباتەکەیـــدا بـــوایە، دەســـتبەرداری ئەم سـڵکردنەوەیە دەبـوو، ئیـدی شـێوەو شـکڵێکی ترسـناکی وەردەگـرت، هەرچەنـدە بەخـۆی لە هەمـوو خەڵکـی دەترسـا. بەڵام خات رولاند هەمیشە ملی بۆ دەدا، چونکە بە تەبیعەت حەزی لە قەرقەشـە ودەمەقـاڵە و گەنگەشـەی بێهـودە وبـێ سوود نەبوو و، داوای هیچی لە مێردەکەی نەدەکرد. لەبەر ئەمە زۆر دەمێـک بـوو نەیـدەوێرا داوا لە جەنـابی رولانـد بکات، کە دەگەڵ خۆیدا بۆ سەفەری دەریایی ببات، بۆیە ئەم

دەرفەتەی قۆستەوە و بەکامی دڵ لەزەتی لەم سەفەرە دەگەمەن و تازەیە بینی و زۆری کەیف پێهات.

لەگەڵ دەستپێکی سەفەر و سەیرانەکەدا، هەم لە ڕووی ئەقڵی و هەم لە ڕووی جەستەییەوە، خۆی تەواو خاو کردەوە و خۆی دایە دەم نشێو بوونەوە جوانەکەی ئاوەکەوە و بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە، پەتی خەیاڵی بۆ هیچ بیرەوەری و هێڤی و ئاواتێک شل نەکرد، هەستی دەکرد دڵی وەکو جەستەی دەکەوێتە سەر شتێکی نەرمی ڕەوانی بەلەزەت، دەی هەژێنێ و مەست و خەواڵووی دەکات.

کاتێ باوکە ڕولاند، قەراری گەڕانەوەی دا، بە کوڕەکانی گوت: " دەی بچنە جێگاکانی خۆتان و دەست بە سەوڵ لێدان بکەن ". خات ڕولاند بزەیەکی کرد و ڕوانیە کوڕەکانی کە چۆن چاکەتەکانیان دادەکەند و قۆڵی کراسەکانیان هەڵدەکرد.

پییر، کە لەوانی دی لە جووتە ژنەکەوە نزیکتر بوو، سەوڵەکەی لای دەستە ڕاستی هەڵگرت و "جان" ش دەستی دایە سەوڵەکەی دەستە چەپ، هەردووکیان حازر و ئامادە، چاوەڕوانی ئەوە بوون، ڕەئیس ( کاپتن ) پڕ بەزار هاوار بکات: " دەی بەتووندی بۆ پێشەوە. " چونکە زۆر گرینگی بە ڕێبەریەکی سیستەماتیک دەدا.

بە دوو قۆڵی و لە هەمان کاتدا و بەهەمان هێز وتواناوە، سەوڵەکانیان داهێشتە ئاوەکەوە، ئەوجا خۆیان بە پشتا برد، بە هەموو هێز و توانای خۆیانەوە کەوتنە سەوڵ لێدان و ئیدی شەڕی هێز نواندن دەستی پێکرد. کەشتیەکە بە کاوەخۆ بۆ ڕاو هاتبوو، زیاتر بایەوانەکە هەڵی گرتبوو،

بەڵام بـایەکەی خسـت، ئیدی غیـرەت و دەمـاری پیاوەتیـان جـوڵا، هەرکەسـەو هەوڵیدەدا، هێز و قـوەتی خـۆی بە سـەر ئەوی دیدا بنوێنێت.

که دەگەڵ بابیاندا بۆ ڕاو دەچوون، بەبێ کاپتن و زۆر بێ سەروبەرانە سەوڵیان لێدەدا، چونکە لەو کاتانەدا ڕۆلاند خەریـک و خجڵـی پەت و تۆڕەکـان دەبـوو و زۆر ئاگـای لە کەشتیەکە نەدەما و ناو بەناو بە ئاماژەیەک یان بە وشەیەک ئاراسـتەی دەکـرد: " جـان، سـووک "، " پییـر، لەزێـکە " یـان دەیگـوت " دەی، تـۆی یەکەم دەرچـۆ و، تـۆی دووەم تـۆزێ دەسـت بجـوڵێنە." ئەوەی کەمێـک دەبیـرەوە دەچـوو، خەیـاڵ دەیبردەوە دەبوایە بەتووندی سەوڵ لێبدات و، ئەوەی پەلەی دەکرد، دەبوو دەست سووک بکات تـا کەشتیەکە بگەڕێتەوە سەر ڕێگای دروستی خۆی.

بەڵام ئەمڕۆ، ڕۆژی بازوو نواندن بوو، بازووەکانی پییر تووکن، بارک، بەڵام دەماراوی بوون. بەڵام بازووەکانی جان ئەستوور، سپی و مەیلەوپەمەیی بوون، یەکپارچە ماسوولکە بوون.

پییـر، لە سـەرەتاوە، زۆر بەچـاکی کەوتە سـەوڵ لێدان. ددانەکـانی بە جیـرەوە بردبـوون، تەوێڵـی گـرژ بووبـوو، لاقەکـانی درێـژ کردبـوون، هەردوو دەسـتی توونـد بە سـەوڵەکەوە گرتبوون، سـەوڵەکە ئەوەنـدە درێژ بوو، لەگەڵ هەر سـەوڵ لێـدانێکا کەمێـک دەنەوی. کەشـتی " مـراوی " بەرەو کەنـارەکە دەڕۆیـی، بـاوکە رولانـد لە پێشـەوە دانیشـتبوو، کورسـییەکەی دواوەی بـۆ هەردوو ژنەکە چـۆڵ کردبوو، بەدەم هانکە هانکەوە گوتی: " یەکەم دەست سـووک بـکە، دووەم لەزێـکە." یەکەم بە تـوورەییەکی دووچەنـانەوە

دەستی پێکرد و دووەم نەیتوانی مل بۆ ئەم ئاژۆتنە بێ سەروبەرە بدات . ئەنجام ڕەئیس ( کاپتن ) ئەمری کرد وگوتی: " بوەستن! " هەردوو سەوڵەکە پێکەوە بەرز بوونەوە، جان، بە ئەمری باوکی ماوەیەک بە تەنیا سەوڵی لێدا. ئیدی لەم ساتەوە بەسەر براکەیدا سەرکەوت و بۆڕی پێدا، هێندەی دی گەرم بوو، هەستی بە گەرما کرد، بەڵام پییر بە تەواوی شەکەت بوو، هەناسەی تەنگ بوو، لە شەکەتیا وبە هۆی هەوڵە کوت وپڕەکەیەوە، تەواو ماندوو بوو و کەوتە هانکەهانک. باوکە ڕۆلاند، چوار کەڕەتی دوا بەدوای یەک کەشتیەکەی ڕاگرت، تا دەرەتانی پشوویەکی بۆ بڕەخسێنێ و نەفەسێک تازە بکاتەوە و ئاراستەکە ڕاست بکاتەوە.

ئارەقە نیشە سەر تەوێڵی دکتۆر، گۆناکانی زەرد هەڵگەڕان، شەرمەزاری و تووڕەیی دایگرت، لە بن لێوانەوە گوتی:- نازانم چیمە، هەست دەکەم دڵم دێشێت. زۆر بەباشی دەستم پێکرد، کەچی پاشان بازووەکانم خاو بوونەوە.

جان لێی پرسی: - دەتەوێ هەرخۆم بە تەنیا سەوڵ لێبدەم؟

- نا سوپاس، چاک دەبم.

دایکیان، بە بێزارییەوە گوتی: - دەی پییر، ئەمە چییە؟ خۆ منداڵ نیت کوڕم.

پییر، شانەکانی هەڵتەکاندن و، دەستی بە سەوڵ لێدان کردەوە.

خاتوو روزمیلی، خۆی لە گێلی دابوو، دەتگوت نەهیچ دەبینێ و نە هیچ تێدەگات و نەهیچ دەژنەوێت. دەگەڵ هەر

تەکان وجوڵەیەکی کەشتیەکەدا، سەرە زەرد و بچووکەکەی بە پشتا دەچوو، جووڵەیەکی کوت وپڕ وجوان قژەکەی بەرز دەکردەوە.

باوکە رۆلانـد هاواریکرد: " تەمەشاکەن، ئەوە کەشتیەکەی میرزادە ئەلبێرتە، لە دوامانەوە دێ. " هەموو ئاوڕیان دایەوە، چاویان بە کەشتیەکی درێژی ڕووتەخت کەوت، دوو دووکەڵکێشی پێوەبوو، کە بۆ دواوە خواربوون. دوو پەروانەی زەردی خڕی پێوەبوو.

کەشتیەکەی بەندەری ساوتمبتون، بەخۆی و نەفەرەکانی سەرییەوە زۆر بلەز گەییەجێ، چەترەکانی سەری کرابوونەوە، دوو پەروانە خێراکان دەسووڕانەوە، لە ئاوەکەیان دەدا و کەفاویان دەپرژاند و گوڕیان دەدایە و لە تۆوایە پۆستەبەری خێرایە. ڕاستەوڕاست ئاوەکەی شەق دەکرد و دەبڕی، ئاوەکەی بەرز دەکردەوە و ڕوون و زولاڵ بەهەردوو لای کەشتیەکەدا دادەڕژا.

وەختایەک کەشتیەکە، لە کەشتی " مرواری " نزیک بووەوە، بابە رۆلاند، کلاوەکەی بەنیشانەی سلاو بۆ بەرزکردەوە، جووتە ژنەکەش دەستە سڕەکانیان بۆ تەکان دا. هەندێک لە چەترەکان سلاوەکەیان بۆ سەندنەوە، لە سەر کەشتیە گەورەکەوە جووڵەجوولیان پێکەوت، کەشتیەکە بەدەم دوور کەوتنەوەوە، دەریا ئارامەکەی شەق دەکرد و کۆمەڵێک وردە شەپۆلی لە دووی خۆی بەجێدەهێشت.

کۆمەڵێک کەشتی دیکەش دیاربوون کە دووکەڵ دای پۆشی بوون، بلەز لەهەموو لایەکەوە بەرەو لەنگەرگا سپیەکەی بەندەرەکە دەهاتن، کە وەکو زارێکی گەورە هەموو کەشتیەکانی یەکێ لە دوای یەک قووت دەدا.

کەشتیانی ڕاو وکەشتیانی گەورەی چارۆکەدار بە بورجە سووکەڵەکانیانەوە، بەسەر ئاوەکەوە دادەخزین و کەشتیانی قاتیرەی نادیار ڕایدەکێشان، ئیدی هەموو ئەو کەشتیانە بە خێرایی یان بە هێواشی بەرەو ئەم دێوە زۆرخۆرە دادەکشان کە ناو بەناو پڕ دەبوو. ئیدی گەلە کەشتی جیاواز بەناو دەریاکە دەکەوتن. ئیدی هەر قاتیرەی دەریایی بوو کە بەپەلە و بەسەر ئۆقیانووسە ڕووتەختەکەوە، لە چەپەوە بۆ ڕاست و لە ڕاستەوە بۆچەپ دەهاتن و دەچوون، کەچی کەشتیەکی چارۆکەدار لە بەندەرەکە دەردەچوو، قاتیرەیەک ڕایدەکێشا، کە هیشتا ڕاوەستابوو و چارۆکەێن سپی یان قاوەیی، کە لەبەر زەردەپەڕی ئێوارەدا، سوور دەچوونەوە و بەسەر بورجە گەورە و بچووکەکانەوە، دەشەکانەوە.

خات ڕولاند، بە چاوانی نیمچە نوقاوەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەڵڵا! ئەم دەریایە چەند جوانە!

خاتوو ڕوزمیلی، هەناسەیەکی قووڵی، خاڵی لە هەر خەم وپەژارەیەکی هەڵکێشا وگوتی:- ڕاستە، بەڵام هەندێجار، بە تاولوکەیە.

جەنابی ڕولاند هاواریکرد:

- تەمەشاکەن، ئەوە کەشتیە نورماندییەکەیە، بەرەو دەروازەکە دێت، چەند گەورەیە! نا؟

ئەوجا بە دوور و درێژی کەوتە باسی کەناری دەریاکەی بەردەمیان. ڕولاند سەرنجی بۆ بەندەری هاڤەر ڕاکێشان کە هەردوو دەڤەری نورماندی ژوورو و ژێری لێکدی جیا دەکردەوە. لە نورماندی ژێریدا، کەنارێکی دەشتانی هەبوو لە پاوان ومێرگ وکێڵگەکانەوە تا دەریاکە

نشـــێو دەبـــووەوە. کەنـــارەکەی نورمانـــدی ژوورو، بەپـێچەوانەوە، ڕک و دژوار وبەکەنـد و کەلـێن و سـەخت، دیوارێـک بـوو بەرز، سـپی، دوور و درێـژ، هەر کەلێنێکـی گونـدێک یـان بەنـدەرێکی لەخـۆ گرتبـوو: ( ئیترونـا، فیکـان، سانت ئالیری، لوتریبو، دبیب )... هتد.

جووتە ژن هەرگیز گوێیان لێنەدەگرت، هۆش و گۆشیان لای ئەو نەبـوو، هـۆش و گۆشـیان لای ئوقیانووسـە پـڕ لە کەشـتیەکە بـوو، کە وەکـو حەیوانـات بەدەوری لانەکانیانـدا دەسـووڕانەوە. جـووتە ژن حـایر و حەپەسـاو دەیـانڕوانیە ئاسۆی بەرینی ئـاو و هەواکەی دەمەدەمـی خۆر لە زەردەی ئێوارێ و ئارامی پێ دەبەخشین.

رولاند تاقەکەس بوو کە قسەی دەکرد و لە پەسـتا و بێ پسـانەوە قسـەی دەکـرد، چـونکە لەو پیـاوانە بـوو کە هـیچ شـتێک کاریـان تێناکـات، بەڵام ژنـان هەندێجار، بەبێ ئەوەی بزانن بۆ، ژاوەژاوی ناپێویستیان لە جنێو و قسەی دزێو پێ ناخۆشترە.

پییر وجان، هێدی وهێمن، بەکاوەخۆ سـەوڵیان لێدەدا و، کەشتی مرواری، کە لەچـاو کەشـتیە گەورە و زەبەلاحەکانـدا زۆر بچـووک بـوو، بەرەو بەنـدەرەکە دەکشـا. وەختـایەک گەیـیە لەنگەرگـاکە، بابـاگری دەریـاوان چـاوەڕوانی دەکـرد، دەسـتی هەردوو خـانمەکەی گـرت تـا یارمەتیـان بـدات کە دابەزن . ئیدی خـانەوادەکە، لە کاتێکا کە خەڵکی بە ئـارامی بـۆ مـاڵی خۆیـان دەگەڕانەوە، خۆیـان بە شـاردا کـرد.. ئەو خەڵکەی هەمـوو ڕۆژێ لە کـاتی هەسـتانی خێزاوی دەریـادا بۆ بەندەرەکە دەچوون.

هەردوو خانم رولاند و روزمیلی لە پێشەوە ڕێیان دەکرد و هەرسێ پیاوەکە دوایان کەوتبوون و بە شەقامی پاریسدا هەوراز دەبوونەوە. جووتە ژن هەندێجار لەبەر دووکانی جلکان یان زەڕەنگەریدا دەوەستان تا چاو لە شەپقەیەک یان موستیلەیەک بکەن، پاشان دوای ئەوەی ڕاوبۆچوونیان دەگۆڕییەوە، دووبارە بەڕێ دەکەوتنەوە.

جەنابی رولاند، لە مەیدانی ( دولابووس ) دا وەکو هەموو ڕۆژێک ڕوانییە ئەستێڵی( باسان دی کومیرس) کە پڕبوو لە کەشتی، دوای ئەوە کۆمەڵێک ئەستێڵی دیکەی تەمەشا کرد کە چوار پێنج ریزە کەشتیان، بەپاڵ یەکەوە تیا وەستابوون. هەموو ئەو بورجە زۆر وزەبەندانەی کە چووبوون بە حەوادا و لە ژمارە نەدەهاتن، پانتاییەکی چەندین کیلۆمەتریان داگیر کردبوو، بە کۆڵەکە وپەتەکانیانەوە لە ناوەندی شارەکەدا قوت بووبوونەوە، چۆن سەیرت دەکرد، دیمەنی دارستانێکی گەورەی بە شارەکە دەدا. ئیدی پۆلی نەورەسان بەسەر ئەم دارستانە رووتەدا، دەسووڕانەوە، چاویان دەگێڕا، هەرکە خواردنێک بخرایەتە ئاوەکەوە، وەکو بەرد لە ئاسمانەوە بۆ دادەهاتنەوە. کوڕێک لەلای بورجێکەوە خەریک بوو بەکرەیەکی دەبەست، لەوە دەچوو، بۆ ئەوە سەرکەوتبێتە ئەوێندەر، تا لە هێلانەی تەیران بگەڕێ.

خات رولاند، لە خاتوو روزمیلی پرسی:

- حەز دەکەی، بەبێ ڕەسمیات شام لەگەڵ مەدا بخۆیت و پێکەوە ڕۆژەکەمان بەرینەسەر؟

- بەڵێ، بە خۆشحاڵییەوە، خۆ بەبێ ڕەسمیات بێ، دەها باشتر، حەز ناکەم ئێوارە بەتەنیا بم.

پیـر، وەختـایەک کە گـوێی لە قسـە بـێ موبالاتەکـانی بێـوەژنە گەنـجەکە بـوو، نێوچـاوانی تێکنـا ولەبـن لێـوانەوە گـوتی: " ئەم بێـوەژنە نـایەوێ لە کۆڵمـان بێـتەوە." چەنـد ڕۆژێک بوو بە بێوەژن ناوی دەبرد، جان، هەر ئەم وشەیەی پـێ نـاخۆش ولەبەر گـران نەبـوو، بەڵکـو لە جـۆری وتنەکەیشـی، کەبەلایەوە تەوسـامێز و دزێـو بـوو قەڵـس و بێزار دەبوو.

سێ پیاوەکە تا بەر دەرگای ماڵەوە فزەیان لێوە نەهات. مـاڵەکە یـان، خـانوویەکی تەنگ و چکۆلەی دوو نهۆمی بـوو کەوتبـووە شـەقامی (نومانـدیەی جـوانەوە). جـوزفینی کارەکەریان هات و دەرگای کردەوە، کچێکی نۆزدە ساڵان و گونـدی بـوو، بە کرێیەکـی کەم کـاری دەکـرد، بە ڕواڵەتیـا کچێکـی زۆر کەودەن و گەمـژە بـوو. دەرگـای داخسـت و ئەوجـا تـا هـۆڵی نهـۆمی یەکەم دووی ئاغاکـانی کەوت و ئەوسا گوتی:

- پیا.. و...ێک.. سێ جار هات.

باوکە ڕولاند، کە هەمیشە بەدەم بۆڵەبۆڵ و جنێودانەوە دەیدواند هاواریکرد: - کێ هات.. هەی..

کـارەکەرەکە، بێـئەوەی خـۆی شـلوێ بکـات و لە هـاوارەکەی بـابە ڕولانـد پەسـت بێـت، بەرسـڤی دایەوە:- پیاوێک لە لای دادنووسەوە هاتبوو.

- ئەم دادنووسە دەکاتە کێ؟
- لەلای جەنابی کانوەوە هاتبوو...
- باشە ئەم پیاوە چی گوت؟
- گوتی: جە... نابی کانو، ئەم شەو بەخۆی دێت.

جەنابی کانو، دادنووسی دادگا بوو، سووکە دۆستایەتی و ناسیاوییەکی دەگەڵ باوکە رولاندا هەبوو و مشووری دەخوارد. کە گوتبێتی ئەمشەو بەخۆی دێت، مانای وایە کارێکی لەزگین ( خێرا ) وگرینگ لە ئارادایە. بۆیە ئەندامانی خانەوادەکەی رولاند، بەگومانەوە نۆڕیانە یەکدی و بەم نووچەیە پەست بوون، چونکە دەیانزانی دادنووس، تەنیا بۆ مەسەلەی گرێبەست و میرات و سکاڵا و دەعوا سەری ماڵان دەدات، جگە لەوشتانە هیچ کارێکی دیکەی نییە.

باوکەکەیان، دوای بێدەنییەکی کەم گوتی:- باشە ئەمە مانای چیە؟

خاتوو روزمیلی پێکەنی و گوتی:

- گوێ مەدەیە، مەسەلەکە میراتی و بەشە میراتیە، من دڵنیام لەمە، مژدەتان دەدەمێ.

بەڵام ئەوان چاوەڕوانی مردنی کەسێک نەبوون کە میراتیان بۆ بەجێبێڵێ. خات رولاند، لە زەینی خۆیدا کەوتە گەڕان بەناو خزمەکانی مێردەکەی و خزم وکەسوکارەکانی خۆیدا، ئیدی لە باوانەوە پێیدا هات و لە بنعام و خاڵوانەوە دەردەچوو. کەسی نەبوارد. ئەوجا بەبێئەوەی شەپقەکەی دابکەنێ پرسی:

- پێم بڵێ جەنابی باوک ( لەماڵەوە بە باوک مێردەکەی بانگ دەکرد وهەندێجار لەبەرچاوی بێگانان بە جەنابی رولاند بانگی دەکرد) تۆ دەزانی ژنی دووەمی جوزیف لوبر کێ بوو؟

- بەڵێ، کچۆڵەیەکی بنەماڵەی دومینیل بوو، کیژی خودان کتێبخانەیەک بوو.

- باشە منداڵی لێ بوو؟

- وابزانم، بەلای کەمەوە چوار پێنج منداڵی هەن.
- نا، کەواتە ئەوەمان فت، هیچ ئومێدێکمان پێی نەبێت.

خات رولاند بەدەم وەردەوەدانی زەینی خۆیەوە، خۆی بە سووکە ئومێدێکەوە هەڵواسی، ئومێدێک، لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە. بەڵام پییر کە دایکی زۆر خۆش دەویست و بە دنیای خەونە سادەکانی ئاشنا بوو ودەترسا کە ئەگەر هەواڵ و نوچەکە ناخۆش بێت، دایکی لە نائومێدیدا تووشی نیگەرانی و خەم وپەژارە ببێت، گوتی:

- دایکە پەلە مەکە، ئێمە لە ئەمریکا مامان نییە! بەڵام من پێموایە مەسەلەکە، ژنهێنان و زەماوەندی جانە.

هەموو سەریان لەم بیرۆکەیە سوڕما. جان کە ئەم قسەیەی براکەی لەبەردەم خاتوو روزمیلی دا لەبەر گران بوو، گوتی:

- باشە بۆچی زەماوەندی من بێ، هی تۆ نەبێت؟ ئەم بیرۆکە و گریمانەیە دروست نییە، تۆ لە من گەورەتری، بۆیە خەڵکی بیر لە تۆ دەکەنەوە، تا براگەورە وەستابێ، کەس بیر لە برابچووک ناکاتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە من نەمگەرەکە زەماوەند بکەم.

پییر بەدەم تەوسخەنێکەوە گوتی:- کەواتە تۆ ئاشقی؟

جان بە پەستی بەرسڤی دایەوە:

- یانی مەرجە ئاشق بم، ئەوجا بلێم، من جارێ نامەوێ ژن بێنم؟
- چاکە! وشەی" جارێ " هەموو شتەکەی ڕاست کردەوە. کەواتە تۆ چاوەڕوانی.
- گرینگ نییە، ئەگەر حەز دەکەی باوابێت.

باوکە رولاند، بەدەم گوێگرتن و هزرینەوە، نزیکترین چارەسەری بە خەیاڵدا هات وگوتی:

- بە ڕاستی ئێمە لە خۆڕایی مێشکی خۆمان ماندوو دەکەین. ئەمە گەوجاتیە. جەنابی لوکانو دۆستمانە، دەزانێ پییر لە عیادە دەگەڕێت و، جان لە نووسینگەیەکی پارێزەری دەگەڕێت، وادیارە شوێنی بۆ یەکێکیان دۆزیوەتەوە.

ئەم بۆچوونە هەرچەندە سادە بوو، بەڵام لە هەموو بیرۆکەکانی دی زیاتر ڕێی تێدەچوو، تەنانەت ئامادەبووانیش قەناعەتیان پێی بوو.

کارەکەرەکە گوتی: " خواردن ئامادەیە " هەرکەسە چووە ژووری خۆی تا خۆی ئامادە بکات و دەستی بشوات و ئەوجا بێتە سەر خوانەکە. دوای دە خولەکێک هەموویان لە ژوورە چکۆلەکەی نهۆمی ژێرەوە، لە دەوری خوانەکە خڕ بوونەوە و دەستیان بە شێو خوارن کرد. لە هەوەڵەوە، زۆر کەم قسەیان دەکرد. پاشان بابەکەیان، دوای چەند ساتێک، دووبارە سەرسوڕمانی خۆی سەبارەت بە سەردانی دادنووسەکە دەربڕی وگوتی:

- باشە، بۆ شتێکی نەنووسیوە؟ بۆچی سێ چەلان پێشکارەکەی خۆی ناردووە؟ چما بەخۆی نەهاتووە؟

پییر، مەسەلەکەی بەلاوە ئاسایی بوو وگوتی:

- دیارە پێویستی بە وەڵامێکی لەزبلەز بووە، ڕەنگە بیەوێ هەندێ مەسەلەی نهێنیمان پێ بێژێت کە حەزی نەکردبێت بە نووسین پێمان بڵێت.

هەرچواریان مژوول بوون، جۆرە نیگەرانیەکیان لەلابوو کە بۆچی ئەم ژنە بێگانەیەیان دەعوەت کردبوو، کە نەیاندەتوانی لە حوزووری ئەودا ئازادانە گەنگەشە بکەن و

قەرارێک بدەن. وەختایەک یارۆی دادنووس هات، چوونە هۆڵەکە و رولاند بەدەنگی بەرز پێشوازی و خێرهانینی ئاغای لوکانوی کرد:

- خێر هاتی جەنابی پایەبەرز سەرچاوان.

خاتوو روزمیلی هەستا وگوتی:- من دەڕۆم، دوعای خزمەت دەخوازم، زۆر شەکەتم.

هەربۆ مجامەلە وبەسارديەوە هەوڵیان لەگەڵدا دا کە وەمێنێ و نەڕوات، بەڵام ئەو قاییل نەبوو، ئیدی بەبێ ئەوەی هیچ یەکێک لە پیاوەکان وەکو جاران بەڕێی بکەن ڕۆیی.

خاتو رولاند، مژوولی پێشوازی میوانە تازەکە بوو وپێی گوت:

- قاوەت بۆ بێنم قوربان؟
- نا سوپاس، تازە نانم خواردووە.
- ئەدی چا؟ با چایت بۆ بێنم.
- ناڵێم نا: بەڵام تۆزێکی دی، جارێ باسی... دەکەین.

دوای ئەو قسانە بێدەنگییەکی قوول باڵی بەسەردا کێشان، کە تەنیا دەنگی بەندۆڵی سەعاتەکە دەهات، بەڵام تەق وهۆڕی ئەو قاپ و ئامانانەی کە کارەکەرە کەودەنەکە لە خوارەوە دەیشۆردن، نەیدەهێشت لە پشت دەرگاکەوە گوێت لە هیچ شتێک بێت.

دادنووسەکە، هەڵیدایە وگوتی:- کەسێک بەنێوی ماریشال، لە پاریس دەناسن؟

جەنابی رولاند و خات رولاند، پێکڤە هاواریانکرد: - بەڵێ!

- باشە ئەو کابرایە دۆستتانە؟

رولاند گوتی:

- ئەزبەنی باشترین دۆستمانە، بەڵام پاریسیەکی زۆر پاریسییە، پێی ڕێ دانـاگرێ، بـۆ سـاتێک لە پـاریس وەدەربکەوێ، لە وەزارەتی داراییدا، بەڕێوەبەری دایەرەیە، لەوەتای لەوێ بارمان کردووە نەم بینیوە، هێشتا نامەمان لە نێواندا هەیە. بەخۆت دەزانی کە پیاو بەتەنیا بژی..

یارۆی دادنووس، دووبارە تێهەڵچووەوە وگوتی:- ئاغـای ماریشال مردووە.

ژن ومێرد، هەردووکیان بە ئاستەمێک، چ بەڕاست و چ بە درۆ بەم هەواڵە پەشـۆکان و شـپرزە بـوون. جەنـابی لوکانو، لە سەری ڕۆیی:

- هاوڕێیەکی پاریسیم، ئاگاداری کردوومەوە کە گوایە ماریشال لە وەسێتنامەکەیدا، جانی کوری ئەنگۆی کردووە بە یەکە میراتگری خۆی، ئاغای جان رولاند.

سـپرایزەکە ئەوەنـدە گەورە بـوو کە هەمـووانی بێدەنگ کرد، کەس تاقە وشـەیەکی لەزار نەبووەوە. خـات رولاند، لە پێش هەموانـا، هەسـت وسـۆزی خـۆی کـۆنترۆڵ کـرد وبە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- ئەیەڕۆ، لیـونی بەلەنگـاز... دۆسـتە داماوەکەمـان، حەیفی، مخابن... مرد!

ڕوندک زاییە چاوانی، ڕوندکی بێدەنگی ژنـان، لە کـانگەی ڕوحیەوە هەڵقوڵاو، بە گۆناکانیا هـاتنە خوارەوە. بە ئاشـکرا خەفەتبـاری پێـوە دیـاربوو. بەڵام رولانـد دەبیـرەوە چـوو، خەفەتـی سـەبارەت بە کارەسـاتەکە زۆر کەمتـر بـوو لەو ئومێـدەی بەهەواڵ و نـووچەکەی هەبـوو. بەڵام وێـڕای ئەوەش زاتی ئەوەی نەبوو، لەم کاتەدا پرسیاری وردەکاری نیـوەڕۆکی وەسـێتنامەکە وبـڕی میـراتیەکە بکـات، بەڵام بـۆ

ئەوەی بگاتە وەڵامی دڵخۆشکەرە پرسی:- باشە ئەم ماریشالە بەلەنگازە بۆ مردووە؟

جەنابی لوکانو، کەم وزۆر هۆی مردنەکەی یارۆی نەدەزانی، گوتی:

- نازانم، تەنیا ئەوەندە دەزانم کە کابرا بەبێ هیچ میراتگرێکی ڕاستەوخۆ کۆچی دوایی کردووە و هەموو سەروەت و سامانەکەی کە دەرامەتەکەی بیست هەزار فرانکە بە سوودی لە سەدا سێی بەشەکانی، بۆ کوڕی دووەمی ئەنگۆ، کە ماریشال بەخۆی ئاگاداری لە دایکبوون وگەورەبوونی ئەو بووە، بەجێ هێشتووەو کوڕەکەی ئەنگۆی بە شایستەی ئەو میراتە زانیوە. هەروەها وەسێتی کردووە لە حاڵی ڕەفز کردنی وەسێتەکەیا، ئەو برە پارەیە بدرێت بە خانەی بێژوان.

باوکە رولاند تا ئەم ساتە نەیتوانی خۆشحاڵی خۆی وەشێرێت، هاواریکرد:

- بەگیانی من! بەڕاستی کابرایەکی جوامێر ودڵاوایە، ئەوە دڵ و دەروونە. باوەڕ بکە، منیش ئەگەر میراتگرم نەبوایە، هەمان ئەم کارەم دەکرد کە ئەم دۆستە بە ئەمەکە کردوویەتی.

یارۆی دادنووس، بزەیەکی بۆکرد وگوتی:

- حەزم کرد بەخۆم، خەبەرەکەت پێ بڵێم، لەوە خۆشتر نییە پیاو خەبەری خۆش بە خەڵکی بدات .

کەس بیری بۆ ئەوە نەدەچوو کە ئەم خەبەرە خۆشە، هەواڵی مەرگی دۆستێک بێ، باشترین دۆستی باوکە رولاند، کە بە خۆیشی ئەو دۆستە گیانی بە گیانیەی لەبیر

چووبووەوە وماوەیەک لەوەپێش بە دڵنیاییەوە ئەوەی گوتبوو.

خات رولاند و هەردوو کوڕەکەی خەمینیان پێوە دیاربوو، خات رولاند، ماوەیەکی کەم لە گریان بەردەوام بوو، ئەوجا بە دەستە سرەکەی چاوانی سڕین و پاشان لە زاری پەستا تا بەر بە هەنسک هەڵدانە قووڵەکەی بگرێت.

دکتۆر، لەبن لێوانەوە گوتی:

- پیاوێکی باش بوو، زۆر میهرەبان بوو زۆرجار من و براکەمی بۆ شێو دەعوەت دەکرد .

چاوانی جان تەواو کرابوونەوە، دەدرەوشانەوە، بەشێوەیەکی ئاسایی دەستی ڕاستی بە سەراپای ڕدێنە زەردەکەیدا هێنا، دەتگوت دەیەوێ دایبهێنێ و ڕێکی بخاتەوە. دوو جاران لێوەکانی بزواندن، تا قسەیەکی پڕبە پێستی حاڵ و هەڵوێستەکە بکات، دوای هەڵوەستەیەکی زۆر، هیچی بۆ نەهات، تەنیا ئەمە نەبێ کە گوتی: - ئەلهەقی خۆشی دەویستم، هەرجارێک بۆلای چووبام، ماچی دەکردم.

بەڵام باوکە، هەموو هۆش و بیری بە دەوری میراتەکەدا دەسووڕایەوە، بە دەوری ئەو میراتەدا کە هێشتا لەودیو دەرگاکەوە پەنهان بوو و لەگین بوو، دوای ماوەیەک، سبەینێ، دوای قابیل بوون، بگاتەجێ. گوتی:

- تۆ بڵێی ئەگەری هیچ کۆسپێک هەبێت؟.. هیچ فەرتەنەیەک لە ئارادا هەبێت؟ هیچ کێشە و ئاریشەیەک لە گۆڕێ بێ؟..

جەنابی لوکانو، هیدی وهێمن، گوتی:

- نەخێر، هاوڕێ پاریسییەکەم ئاگاداری کردوومەوە، کە مەسەلەکە زۆر زەلال و خویایە، هیچی کەم نییە، هیچی ناوێ تەنیا ڕەزامەندی ئاغای جانی دەوێت و تەواو.

- زۆرچاکە، بڕی سەروەت و سامانەکەش زەلال و خویایە.

- زۆر ڕوون و خویایە.

- ئەدی معامەلاتەکان تەواو بووە؟

- بەڵێ، هەر هەمووی تەواو بووە.

یارۆی کۆنە زەڕنگەر لە ناکاوا، بەهۆی ئەو هەموو فزوڵیەت و پرسیارانەی خۆیەوە هەستی بە جۆرە شەرمەزارییەک کرد، شەرمەزارییەکی گۆنگ، غەریزی، ڕەوتەنی، کرد. دووبارە گوتی:

- دەزانی، من بۆچی ئێستا ئەو هەموو پرسیارە دەکەم، بۆ ئەوەی کوڕەکەم لە هەندێک ئاریشە و ئاستەنگانی چاوەڕوان نەکری بپارێزم، بۆ نموونە هەندێجار، لە پەنایەکەوە، مەسەلەی قەرز و قۆڵەیەکی ئاڵۆز سەر هەڵدەدات، من چۆن ئەمە بزانم و بچمە بنج وبناوانی؟ یان لە ناکاوا و لە پەنایەکەوە مێملێکمان لێ پەیدا ببێت و لە کۆڵمان نەبێتەوە. بەهەرحاڵ، من میراتگر نیم. بەڵام خەمی منداڵەکەمە.

جان، لە ماڵەوە و لە ناو خانەوادەکەدا ' بە منداڵەکە ' ناودەبرا، هەرچەندە بە کەلەش و باڵا زۆر لە پییر گەورەتر بوو.

خات رولاند، لە ناکاوا، وردە وردە، لەخەون و خەیاڵەکانی وەدەرهات و شتێکی کۆنی، تا ڕادەیەک

فەرامۆشکری وەبیر هاتەوە کە جاران گوێی لێ دەبوو و وێڕای ئەوەش لێی دڵنیا نەبوو، لە بن لێوانەوە گوتی:

- جەنابی دادنووس، تۆ نەتگوت کە ماریشالی دۆستمان، ڕەحمەتی خوای لێبێ، وەسیێتی کردووە کە سەروەتەکەی بۆ منداڵەکەم، بۆ جان بێت؟

- بەڵێ خانمەکەم.

ئەوجا زۆر ساکارانە لە سەری ڕۆیی وگوتی: - من ئەمەم زۆر پێخۆشە، چونکە نیشانەی خۆشەویستیەتی.

ڕولاند، هەستایە سەرپێیان و گوتی:

- پایەبەرز، دەتەوێ کورەکەم، ئێستا قبووڵنامەکەت بۆ واژۆ بکات؟

- نا، نا... جەنابی ڕولاند. سبەی، سبەی لە نووسینگەکەی منا، سەعات دووی ڕێک، ئەگەر کاتەکە بۆ ئەنگۆ گونجاوە.

- هەڵبەتە، هەڵبەتە، گونجاوە!

ئەوسا خات ڕولاند هەستا، ڕوندکەکانی سڕی وبزەیەکی کرد، دوو هەنگاو لە دادنووسەکە چووە پێشێ، دەستی خستە سەر پشتی کورسییەکەی و نیگایەکی میهرەبانانەی دایکێکی سوپاسگوزاری کرد وپرسی:

- جەنابی لوکانو، چایەکەت بۆ نەیەنم؟

- ئێستا با، بەخۆشحاڵییەوە خانم.

کارەکەرەکەی بانگکرد، یەکەمجار هەندێک شیرینەمەنی وشکی لە قوتوویەکی قولا هێنا، شیرینی ئینگلیزی بێتام وزۆر ڕەق بوو، لەخۆیەوە هەڵدەوەری، دەتگوت بۆ دەندووکی تووتی دروستکراوە، لە قوتوویەکی سەرمۆر نرابوو، بەکەڵکی ئەوە دەهات لەگەڵ خۆتا بە دەوری هەموو

دنیایدا بگێڕیت. ئەوجا چوو هەندێک دەستەسڕی قاوەیی بێنــێ، کەبە شــێوەی چوارگۆشــەی بچــووک بچــووک قەد ونوشت کرابوو، دەستەسری چای کە خەڵکانی سەربە چینی کرێکاران هەرگیز نەیان دەشت. ئەوجا بۆجاری سێیەم گەڕایەوە، شەکردان و پیاڵەکانی هێنا، ئەوجا چوو تا ئاوەکە بکوڵێنێت. کەواتە دەبێ چاوەڕوان بکرێت.

هیچ کەسێک لە ئامادەبووان قسەی نەدەکرد، هەمووان لە فکران ڕاچووبوون.. و هیچ بابەتێکیان پێنەبوو کە قسەی لە سەر بکەن، تەنیا خات رولاند نەبێ کە لە هزر وبیری خۆیدا بـۆ ڕسـتەێن سـواو وجەڵەبـی دەگەڕا، ئیـدی کەوتە باسـی سـەفەری ڕاوە ماسـییەکەیان و تـاریفی کەشـتی مـرواری و خـاتوو روزمیلـی. دادنووسـەکە، وەڵامـی دایەوە: " جـوانە... جوانە ".

رولاند، پشتی دابوو بە کاشی سۆپاکەوە، وەکو چۆن لە زستاندا لەکاتی ئاگرکردنەوە هەردوو دەستی لە گیرفانەکانی دەنـا. لێوەکـانی بەجۆرێ دەبـزوان، وەک ئەوەی خۆیـان بـۆ فیکەکێشان ئامادە بکەن.

نەیتوانی لەیەک شـوێندا ئۆقرە بگرێت، شـتێک لە نـاوەوە هـانی دەدا کە جڵەو بۆ شـادمانیەکەی شل بکـات. جووتەبرا لەسەر دوو کورسی هاوشێوەدا لە ڕاست وچەپی مێزەکەی ناوەنـدی ژوورەکەدا دانیشـتبوون وبەهەمـان شـێوە لاقیـان لەسـەر لاق نـابوو. بەهەمـان شـێوە دەیـانڕوانیە بەردەم خۆیان، بەڵام بە خەیاڵ و هزرینی جیاوازەوە.

ئەنجـام چـایەکە هـات، دادنـووس کـووپەکەی خـۆی هەڵگـرت، شـەکری تێکـرد، دوای ئەوە پسـکیتێکی ڕەقـی، کە دان نەیـدەبڕی، تـێ هەڵوەرانـد، خـواردی. ئەوجـا هەسـتا،

تەوقەی دەگەڵ هەمووانـا کـرد ورۆیـی. رولانـد دووبـارەی کردەوە:

- ڕازین، سبەینێ سەعات دوو. ڕازین، سبەی سـەعات دوو.

جان، تاقە وشەیەکیشی لە دەم دەرنەچوو.

کە یـارۆی دادنـووس وەدەرکەوت، بێدەنگی بـاڵی بەسـەر ماڵەکەدا کێشـا، ئەوجا بـابە رولاند، چووە پێشـێ و هەردوو دەستی بە شانی جانی کوڕیدا کێشان و هاواریکرد:

- دەی دەی، بەخـــتەوەری گەورە، لێـــت داوە، چـــیە ناتەوێ دەست لە ملم بکەیت؟

هەنگـێ، بـزەیەک ڕوخسـاری جـانی بزواند و دەسـتی لە ملی بابی وەرێنا وگوتی: - ئەمەم بەلاوە زەرووری نەبوو.

پیاوە، نەیتوانی شادمانی خۆی کۆنترۆڵ بکات. ئەوجا بە قامکـان، وەکـو ئەوەی پیـانۆ بژەنێـت، کەوتە لێـدانی مـوبێلە دارینەکان. ئەوجا لە سەر پاژنەکانی وەرسووڕایەوە وگوتی:

- شانس! ئەوەیە شانس، ئەوەیە بەخت وناوچەوان!

پییـر، پرسـی: - کەواتە ئەم ماریشـالەتان بـاش دەناسـی، ها؟

بابەکەیان، بەرسڤی دایەوە:

- بەڵـێ، هەمـوو شـەوێک دەهـاتە مـاڵی مە، ڕەنـگە لە بیرت مابێ کە ڕۆژانی پشوو بە دووتا بۆ قوتابخـانە دەهـات و دەیهێنـــایەوە و زۆرجـــار دوای شـــێو بـــۆ قوتابخـــانەی دەبردیەوە. ئا، ئەو بەیانیەی کە تۆ لەدایک بوویت، ئەوچوو بە دوای دکتـۆردا، کە دایکـت ژان گرتـی، لەمـاڵی ئـێمە نـانی دەخـوارد. یەکســەر زانیمــان مەســەلە چیــیە، بـلەز لەمــاڵ وەدەرکەوت. لە پەلەپەلیـــدا لەجیـــاتی کـــڵاوەکەی خـــۆی

کڵاوەکەی منی لەسەر کرد. ئەوەم چاک لەبیرە، چونکە دواتر زۆر بەوە پێکەنین. دوورنییە بەدەم ئاوزینگەوە ئەوەی بیر کەوتبێتەوەو چونکە میراتگری نەبووە، لە دڵی خۆیدا گوتبێتی: " خۆ باشتر وایە سەروەت وسامانەکەم بۆ ئەم منداڵە بەجێ بێڵم کە بەشداریم لە هاتنە دنیای کردووە.

خاتوو رولاند، کە لە قەنەفەکەی ژێریا نقوم بووبوو، پێدەچوو خەیاڵ بردبێتیەوە و لەوێندەر دوور کەوتبێتەوە، بۆیە خەیاڵاوی ولەبن لێوانەوە گوتی:

– ئاە، بە ڕاستی دۆستێکی باش بوو، زۆر بەخزمەت بوو، پیاوێکی دەگمەن بوو، پیاوی وا لەم زەمانە کەمە.

جان، هەستا وگوتی: – کەمێک پیاسە دەکەم.

بابی مەندەهۆش بوو، ویستی نەیەڵێ بڕوات، چونکە حەزی دەکرد باسی پرۆژانی لەگەڵ بکات و قەراری لە سەر بدەن.

بەڵام جان ڕژد بوو لەسەر ئەوەی وەدەربکەوێ، گوایە مەوعیدی هەیە. بەهەرحاڵ وەختیان زۆر بەدەستەوە مابوو تا میراتەکە وەربگرن. حەزی دەکرد وەدەربکەوێ،تا بە تەنیا بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە. پییرش گوتی حەزدەکات وەدەربکەویت. دوای چەند خولەکێک دووی براکەی کەوت.

کە بابە رولاند و ژنەکەی بە دوو قۆڵی مانەوە، ژنەکەی لە ئامێز گرت و هەر گۆنایەکی دە چەلان ماچ کرد . ئەوجا بۆ ئەوەی وەڵامی گلەیی و گازنی ژنەکەی، کە زۆرجار بە ئاشکرا لێی دەکرد بداتەوە گوتی:

– دەبینی گیانەکەم، مانەوەمان لەپاریسدا وبۆ ماوەیەکی زۆر نە بۆ منداڵەکان باش بوو نە بۆ من، کاری لە

تەندروستیم دەکرد، کە هاتین بۆ ئێرە، هەستم کرد ئاو وهەوای ئێرەم پێدەکەوێ. سەبارەت بەم سەروەتەش لە ئاسمانەوە بەسەرماندا داباریوە.

خات رولاند، بە ڕواڵەتێکی جدییەوە گوتی:- لە ئاسمانەوە بۆ جان داباریوە، ئەی پییر؟

- پییر! دکتۆرە، پەکی ناکەوێ، بەشی خۆی پەیدا دەکات.. هەڵبەتە برایەکەشی یارمەتی دەدات و چاوی تێوە دەبێت.

- نا، قەبووڵ ناکات. میراتەکەش بۆ جانە، تەنیا بۆ جانە، بۆ پییر نییە.

کابرا، تیامابوو، گوتی: - کەواتە، ئێمە لە وەسێتنامەکەماندا بەشێکی کەمێک زیاتر بۆ ئەو دادەنەین.

- نا ئەمە ڕەوا نییە.

کابرا هاواریکرد و گوتی:

- ئاە، لەم حاڵەدا هیچ... زفت! دەتەوێ من چی بکەم؟ تۆ هەمیشە بیر لە شتێک دەکەیتەوە کەبە دڵی من نەبێت، هەر دەبێت شادیم لێ تاڵ بکەیت. ئێستا کاتی خەومە، دەبێ بخەوم، شەو باش، بە هەرحاڵ ئەمە شانسە، شانسێکی گەورەیە.

بەخۆشی و شادییەوە، بەبێ ئەوەی کەمترین کەسەر بۆ مەرگی دۆستە بەخشندەکەیان دەربڕێت، ڕۆیی.

خات رولاند، دووبارە لە فکران ڕاچوو، لە نزیکی ئەو چرایەوە بوو کە کەوتە دەردانی دووکەڵێکی ڕەش.

## (٢)

پییر، هەرکە لە ماڵ وەدەرکەوت، بەرەو شەقامی پاریس کەوتە ڕێ، کە شەقامی سەرەکی بەندەری هاڤەر بوو، شەقامێکی ڕوناک و قەرەباڵغ و ئاوا وئاوەدان بوو. شنەبای کەناری دەریاکە کە لە سەروچاوی دەدا، زۆر خۆشبوو. بەکاوەخۆ ڕێی دەکرد، دارعاساکەی لە ژێر باڵی نابوو و هەردوو دەستی خستبوونە پشتی. وەکو یەکێک خەبەرێکی ناخۆشی بیستبێت، هەستی بە دڵتەنگی و شەکەتی و بێزاری کرد. بیرێکی دیاریکراو ماندووی نەدەکرد، لە هەوەڵەوە بەخۆیشی نەیدەزانی ئەم واز وازی و دڕدۆنگی وگومان و دوو دڵییەی لە کوێوە لێ پەیدا بوو. ژان و ئازارێکی هەبوو، خۆیشی نەیدەزانی لەکوێوەیە. خاڵێکی پڕ لە ئازاری لە دڵ و دەروونا بوو، خاڵێکی بچووک، زامێک بوو لەو زامانەی کەسمان بەزەلالی و ڕوونی هەستی پێناکەین و پەی بە شوێنەکەی نابەین، بەڵام زامێکە دڵ دەگوشێت، ماندوو، خەمبار و بێزارت دەکات. هەستی بە ئازارێکی نادیار، ئازارێکی سووک، وەکو سووکە خەمۆکییەک، دەکرد.

کە گەییە مەیدانی شانۆ، هەستیکرد، ڕوناکی قاوەخانەی "تورتونی" بانگی دەکات، بەکاوەخۆ بەرەو ڕووکارە ڕووناکەکە ڕۆیی، بەڵام لەو دەمەدا کە وەژوور کەوت بیری لەوە کردەوە کە تووشی دەبێت بە تووشی کۆمەڵێک دۆست وبناژۆ وناسیاو و خەڵکانێکەوە کە دەبێ قسەیان دەگەڵدا بکات، لە کاتێکدا حەزی نەدەکرد قسە دەگەڵ کەسدا بکات. لە ناکاوا، هەراوزەنای بێتام و جەڵەبی ئەوانەی فینجانێ قاوە یان پێکێ شەراب کێشابوونیە ئەوێندەر، بێزار وبێتاقەتی کرد.

هەنگی ژێوان بووەوە، گەڕایەوە، ملی ئەو شەقامە سەرەکییەی گرت کە بۆ بەندەرەکە دەچوو، لە دڵی خۆیدا پرسی: " باشە بۆ کوێ بچم؟ " چاوی بۆ شوێنێک گێڕا بەدڵی بێ و دەگەڵ حاڵی ئەودا بگونجێت، شوێنی دڵخوازی ئەو نەبوو، چونکە هەم لە تەنیایی بێزار بوو، هەم نەیدەویست کەس بیدینێت.

وەختایەک گەییە لەنگەرگا گەورەکەی بەندەرەکە، دیسان دوودڵی تێ وروکایەوە، بایدایەوە و ڕووی کردە لەنگەرگا لاوەکییەکە و، تەنیایی هەڵبژارد.

کە گەییە کورسیەکەی سەر ئەو دیوارە بەردینانەی بۆ گێڕانەوەی شەپۆلان دروست کرابوو ( شەپۆل شکێن ) دانیشت، ڕێکردن ماندووی کردبوو، لە ڕاستیا لەم پیاسە و ڕاوێچکەیە بێزار بوو، تەنانەت بە نەبەدڵی دەستی پێکردبوو. لە دڵی خۆیدا پرسی: " ئەم شەو بۆ وام لێهات؟" وەکو چۆن یەکێک پرسیار لە نەخۆشێک دەکات تا هۆی بەرزبوونەوەی تایەکەی بزانێت، بەو ئاوایە کەوتە گەڕان بەدوای هەندێک هەڤدژیاندا، کە توانی بیاندۆزێتەوە .

زەینی لە نێوان دوو حاڵەتی هەڤدژی نیگەرانی و ئارامیدا لە هاتوچۆدا بوو، جارێ هەڵدەچوو و جارێ ئارام دەبوو، جارێ پشتیوانی لە هەڵچوونەکانی دەکرد، جارێ نکۆڵی لێدەکردن، بەڵام حاڵەتی یەکەم، کە نیگەرانیەکە بوو لە دوا ئەنجاما زاڵ دەبوو، باری هەست وسۆز بە سەر باری ئەقڵانیدا زاڵ دەبوو..

ئیدی عەوداڵی ئەوەبوو کە بزانێ ئەم نیگەرانی وپەشێویەی لە چییە و لە کوێوە پەیدا بووەو، بۆچی بەبێ ئەوەی حەزی بەهیچ شتێک بێ، ملی ڕێگەی گرتووە، بۆچی

حەز دەکات یەکێک لەو کەسانە بدینێ کە حەزی لە چارەیان نییە، ئەدی ئەم دوورەپەرێزییە، لەو خەڵکانەی دەتوانێ بیاندینێ لە چییەوە هاتووە، ئەدی ئەم دوورەپەرێزییە لەو شتانەی دەتوانن پێی بڵێن، هۆکارەکەی چییە.

ئەم پرسیارەی لە خۆی کرد: " تۆ بڵێی بە هۆی میراتیەکەی جانەوە بێ؟ "، بەڵێ، لەگینە، دەشێت. وەختایەک یارۆی دادنووس ئەو خەبەرەی دانێ، پییر هەستی کرد لێدانی دڵی کەمێک خێراتر بوو، ئیدی مرۆڤ بە تەبیعەت هەموو کاتێ خۆی پێ کۆنترۆڵ ناکرێ، خۆی پێ بەرزەفت ناکرێت، زۆرجار لە خوت وخۆڕایی، بێئەوەی بەدەست خۆی بێ، حەسوودی و بەغیلی بە خەڵکانی دی دێت.

ئیدی بە قووڵی کەوتە بیرکردنەوە لەم کێشە فیزیولوجیەی کە لە ڕووداوێکەوە سەر هەڵدەدا، کار لە غەریزەکانی بەشەر دەکات و زنجیرەیەک بیروهەستی ناخۆش یان خۆشی لەلا دروست دەکات ، بیر وهەستێن، پێچەوانە و هەڤدژی ئەو بیرانەی خۆی دەیەوێن و بانگەوازیان بۆ دەکات، بە بیری دروست وچاکیان دەزانێ. ئەم بوونەوەرە پەنای وەبەر ئەقڵ برد. ئەو بار وحاڵە دەروونیەی هێنایە بەرچاوی خۆی، کە کوڕێک لە ناکاوا بووە بە خاوەن سەروەتێکی گەورە، کە دەتوانێت لە ڕێگەیەوە بە گەڵێک لەو ئاواتانەی بگات کە لە مێژەوە خەونی پێوە دەبینی، ئەو ئاواتانەی کە بابێکی ڕژد و چروک نەیدەهێشت پێی بگات.

هەستا، دووبارە کەوتە ڕێکردن بۆ ئەوبەری لەنگەرگاکە. هەستی بە جۆرە خۆشی و ئارامییەک کرد، چونکە خۆی ناسی، لە خۆی حاڵی بوو، سەری لە خۆی لە ناخی خۆی

سوورِما، کەسەکەی دیکەی ناخی خۆی کەشف کرد، ئەو کەسەی کە بە زۆری لە ناخ و نیهادی خۆمان کەشفی دەکەین، دەیدۆزینەوە. دەبیرەوە چوو: ˝ کەواتە، بەغیلیم بە جان دێت، بەڕاستی ئەمە کارێکی کرێت و دزێوە! بەڕاستی شەرمە! ئێستا لەوە دڵنیابووم، بەغیلی یەکەمم ئەوەبوو لەوەیە دەگەڵ روزمیلی دا زەماوەند بکات. کەمن یەک لەباری خۆم حەزم لە چارەی ئەم ئافرەتە وردیلە گەوجە نەدەکرد. کەواتە ئەم بەغیلییە کارێکی نابەجێ بوو، تەنیا بەغیلی و حەسوودی بوو، حەسوودی لە پێناوی حەسوودیدا! دەبێ چارێکی ئەوە بکەم˝.

ئەوسا گەیـیە لای ئەو عامودە نیشانەدارانەی کە بۆ پێوانەی بەرزی ئاوەکە لە بەندەرەکەدا دانرابوو، شقارتەیەکی پێکرد تا لیستی ئەو کەشتیانە بخوێنێتەوە کە دەگەڵ خێزاوەکەی دواتردا دەگەیشتنە بەندەرەکە . کۆمەڵێک کەشتی هەڵمی چاوەڕوان بوون کە لە بەرازیل و ئەرجەنتین و شیلی و ژاپۆنەوە بێن، لەگەڵ دوو کەشتی لە دانیمارکەوە، کەشتیەکی چارۆکەدار لە نەرویجەوە و، کەشتییەکی هەڵمی تورکی کە پییر، پێی سەیر بوو، وەکو ئەوە بوو لە لیستەکەدا ئەوەی خوێندبێتەوە: ˝ کەشتییەکی هەڵمی لە سویسراوە ˝ وەکو ئەوەی لە خەونا کەشتیەکی گەورە ببینێ کە پڕ بێ لە زەلامی عەمامە بەسەر، کە بە شەڕواڵی دەڵبەوە بە پەتا سەربکەون. لە دڵی خۆیدا گوتی: ˝ کە کەرم، خۆ تورکیش لە میللەتە دەریاییەکانن. ˝

دوای ئەوەی چەند هەنگاوێکی نا، وەستا تا لەبەندەرەکە ڕابمێنێ، بە دەستە ڕاستا گوندی ( سانت ئەدرس ) هەبوو، دوو منارەی کارەبایی لە لووتکەی ( دولاهیف ) دا هەبوو،

وەکو جمکی شێواوی دزێوی پیاوانی سیلکوپ، دەیانڕوانیە دەریـاکە، دوو تیشـکی گەورە لە ئـاگردانی منـارەکەوە، بە هەڵدێرێکی ڕکی بێ سنوورا، لە لووتکەی کەنارەکەوە بۆ قـولایی ئاسـۆ دەدادەگەڕان . ئەوجـا لە سـەر هەردوو لەنگەرگـا لاوەکیەکانی بەندەرەکەوە، دوو تیشکی دیـکە، لە کـوڕانی ئەم جـووتە زەبەلاحە، بەرەو دەروازەی بەنـدەری هـاڤەر نشـێو دەبـوونەوە. لەوێ، لە ڕەخەکەی دی ڕوبـاری سـینەوە، کۆمەڵێـک تیشـک و ڕونـاکی دیـکەش دەبینـران، هەنـدێک لەو ڕونـاکی و تیشـکانە جێگیربـوون، هەنـدێکی دیکەیان دەکوژانەوە و هەڵدەبوون، وەکو چاو دەکرانەوەو دادەخـران، چـاوانی زەرد و سـوور و کەسـکی بەنـدەر و لەنگەرگاکان، کە چاودێری دەریا تاریکە پڕ لە کەشتیەکەیان دەکرد، چاوانی بێداری وشکانیانی خانەخوێ، کە بە ئاماژەی چـاوانی میکـانیکی بەردەوام دەیـانگوت: " مـن لێـرەم، مـن بەنـدەری تـروڤیلم، مـن بەنـدەری ئونفلـورم، مـن ڕوبـاری گونـدی بونـت ئـودمیرم " لە دووری دوورەوە، بـورج ومنارەیەکی زۆر بڵند، بەجۆرێ باڵی بەسەر هەموو ڕوناکی و تیشـکەکاندا کێشـابوو، خەڵکـی وایانـدەزانی ئەسـتێرەیە، منـارەی گونـدی (ئیتوڤیـل) چـوو بـوو بە ئاسـمانا، دەتگـوت ئاماژەیە بۆ ڕێگای شاری ڕوان،کە خۆی بە ناو لمەلانەکانی ڕێژاوگەی ڕوبـارە گەورەکەدا دەکـات. ئەوجـا بەسـەر ئـاوە قـووڵەکەوە، ئـاوە بێ سـنوورەکەوە، کە لە ئاسـمان تـاریکتر بوو، تەمەشاڤان وای وێنا دەکرد لێرەولەوێ ستێران دەبینێ، سـتێرانێک کە لە مـژ ودوومـانی شـەودا، دەدرەوشـانەوە و دوور ونزیـک بچـووک، سـپی و سـەوز و سـوور دەنـوێنن، تەقیـریبەن هەموویـان بێ جـووڵە بـوون، وێـڕای ئەوەش

هەندێکیان وادەهاتنە بەرچاو کە غار بدەن، ئەمانە تیشکی ئەو کەشتیانە بوو کە لەنگەریان خستبوو و چاوەڕوانی خێزاوی ئایندە بوون، یان لە شوێنێک دەگەڕان کە لەنگەر بخەن.

ڕێک لەم کاتەدا، مانگ لە پشت شارەوە هەڵهات، بە حەوێقی ئاسمانەوە لە بورج و منارەیەکی زۆر گەورەی پرشنگدار دەچوو، کە ڕێنوێنی کاروانی ئەستێرە ڕاستەقینەکانی دەکرد.

پییر، بە دەنگێکی نیمچە بەرز لەبەر خۆوە گوتی: " ئەوەیە، ئێمە خۆمان، نیگەرانی بۆ خۆمان دروست دەکەین، لەسەر هیچ ترین شت نیگەرانی بۆخۆ چێدەکەین. "

لە ناکاوا، تاریکییەکی بەرین و نامۆ، باڵی بەسەر حەوزە قووڵ و بەرینە ڕەشەکەی نێوان هەردوو لەنگەرگاکەی بەندەرەکەدا کێشا، بەسەر دیوارە گرانیتەکەدا دانەوییەوە، کەشتییەکی ڕاوی بەدی کرد کە دەگەڕایەوە، نەدەنگی مرۆڤ، نە خورە خوڕی شەپۆل و نە شڵپە شڵپی سەوڵان نەدەهات، بە کاوەخۆ خۆی دابووە دەم بایەوانە بەرزە کەوەییەکەیەوە، کە بەدەم شنەبای دەریاکەوە دەشەکایەوە. دە فیکرەوە چوو: " چەند ژیانێکی ئارامە، بریا دەیتوانی لێرە بژی!".

ئەوجا چەند هەنگاوێک ڕۆیی، پیاوێکی بینی کە لەوسەری لەنگەرگاکە دانیشتبوو. پیاوێک خەیاڵاوی، ئاشق، هێمن و بە ویقار، شادمان یان پەست و خەمناک؟ دەبێ ئەم پیاوە کێ بێ؟ بە کونجکاوییەوە لێی نزیک بووەوە، تا لە

نزیکەوە ڕوخساری ئەو پیاوە گۆشەگیرە ببینێت، یەکسەر براکەی خۆی ناسییەوە:- ئا... ئەمە تۆی جان گیان؟

- ئا.. پییر بۆچی بۆ ئێرە هاتوویت؟

- هاتووم بایەکی باڵ بدەم، ئەدی تۆ؟

جان، دەستی بە پێکەنین کرد وگوتی:- منیش هاتووم بای باڵێک بدەم.

پییر لە نزیکی براکەیەوە دانیشت و گوتی: - دەی باشە ئەوە شتێکی جوانە.

- بێگومان.

بە تۆن و ڕاوێژی دەنگیا بۆی بەدیار کەوت کە جان سەیری هیچی نەدەکرد، درێژەی دایە وگوتی:

- من کە بۆ ئێرە هاتم، ئارەزوویەکی سەیرم بۆ هاتنە دەرەوە هەبوو، پڕ بەدڵ حەزم دەکرد دەگەڵ هەموو ئەم کەشتیانەدا بۆ باکوور یان باشوور بڕۆم، پێم وایە ئەو ڕوناکیانەی ئەوێندەر لە هەر چوارنکاڵی دنیاوە دێن، لە دیار ودەڤەری گوڵان و کیژانی شەنگوڵی سپی و برۆنزییەوە، لە وڵات و مەڵبەندێن چۆلەکان و، فیلان و، شێرێن ئازاد و لە هەموو ئەو وڵاتانەوە کە حیکایەتی خەیاڵیان دەربارەیان بۆ دەگێڕانەوە، ئەو حیکایەتانەی کە باوەڕمان پێیان نەدەکرد، ئەو حیکایەتانەی سەبارەت بە پشیلەی سپی وشازادە خانمی نوستوو بۆیان دەگێڕاینەوە. چەند خۆشە سەفەرێکی ئەو دیار ودەڤەرانە بکەین، بەڵام پارەیەکی زۆری دەوێ.

لە ناکاوا بێدەنگ بوو، دەفیکرەوە چوو، براکەی ئێستا ئەو پارەیەی هەبوو، هیچ خەمێکی نەبوو، هیچ کارێکی ڕۆژانەی دەست وپێ گیری نەبوو، ئازادی ئازاد بوو، شاد و

خوشـحاڵ، دەیتـوانی بـۆ هەر کـوێیەکی بوێـت، بـڕوات، بـۆ مەڵبەندی زەریایی سوێدی یان ئەسمەرانی هاڤانا.

ئەوسـا، لە ناکـاوا، بـێ ئەوەی لە دەسـتی خۆیـا بێـت بیرۆکەیەک لە بیرۆکە باوەکانی هات بەسەرا، کە نە پێشبینی کردبـوو، نە دەیتـوانی ڕایبگـرێ یـان بیگـۆڕێ، وای هەسـت دەکـرد، لە ڕوحێکـی تـری سـەربەخۆ و توونـد وتیـژەوە هەڵدەقوڵێت: " ئوف! زۆر گەوجە، روزمیلی وردیلە وبچووک دەخوازێت. " هەستا وگوتی:

– من بەجێت دێڵم تا بیر لە ئایندەی خۆت بکەیەوە، خەونـی سـەوز وسـوور بە ئایـندەوە بـدینیت. بەڵام مـن پێویستم بە جووڵە و ڕێکردنە.

دەسـتی بـراکەی گوشـی و، بە ڕاوێژێکـی دۆسـتانەوە گوتی:

– دەی زۆرچـاکە جـان گیـان، تـۆ ئیتـر بۆخـۆت دەوڵەمەنـدی! مـن زۆر خۆشـحاڵم کە ئەم ئێـوارەیە بەتەنیا تووشت بووم، تا پێت بڵێم:

– زۆر بەوە خۆشـحاڵم. لە نـاخی دڵمەوە پیرۆزباییت لێدەکەم، خۆشم دەوێی.

جـان، کە بە تەبـیعەت نەرم ونیـان بـوو، سـۆزی بـزوا، بەدەمە لالکێـوە گـوتی: – سـوپاس.. سـوپاس بـرا باشـەکەم، سوپاس پییر، سوپاست دەکەم.

پییـر، پێچـی کـردەوە، لۆژلـۆژ کەوتەڕێ، دارعاسـاکەی نابووە ژێر باڵی وهەردوو دەستی لە پشتی نابوو.

کە گەییەوە ناوشـار، دووبـارە لەخـۆی پرسـی دەیەوێ چ بکـات، لەم سووکە پیاسـە و ڕاوێچکەیەی خـۆی بێزار بـوو، بێـزار بـوو لەوەی کە بـراکەی بینـی و لە لەزەتـی دیتنـی

دەریاکەی کرد. لە ناکاوا بیرۆکەیەکی بە مێشکا هات: " دەچم لەلای بابا " ماروڤسکو " پێکێک شەراب دەخۆمەوە. ئەوسا ڕۆیی و بەرەو گەڕەکی ئەنگوڤیل هەوراز بووەوە.

باوکە ماروڤسکو، لە خەستەخانەکانی پاریسدا بەنێوبانگ بوو. پیرەمێرێکی پولونی، وەکو دەگوترا پەناهەندەی سیاسی بوو، لەوێندەر زۆر قسە وقسەڵۆکی کرێت و دزێوی لەدوو بوو، ئیدی هاتبوو بۆ فەرەنسا – دوای هەندێ پشکنینی تازە – تا مومارەسەی کاری خۆی لەواری دەرمانسازیدا بکات، کەس هیچی دەربارەی ژیانی ڕابردووی نەدەزانی، بۆیە لەنێو دکتۆر و دکتۆرە موقیمەکان و، پاشان لەنێو دەرودراوسێکانیا، گەلێک چیرۆک و دەنگۆی دەربارە بڵاو بووەوە. ئیدی ئەم پیاوە ئەنتی دەوڵەتە وەکو ئەندامی ڕێبازی نەهیلیزمی، بکوژی پاشا، نیشتمانپەروەری ئامادە بۆ هەر کارێک، شۆڕەتی دەرکرد، کە بە پەڕچوو لەمەرگ خەلەسی بوو، ئیدی ئەم پیاوە کاری لە خەیاڵی ڕیسک ئامێزی پییر رولاند کرد، ئیدی بوو بە دۆستی ئەم پیرەمێردە پۆڵۆنی یە، بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی دەربارەی ڕابردووی ئەو دەست بکەوێت. ئیدی بەهۆی دکتۆرە گەنجەکەوە، ئەم پیاوە دەرمانسازە هات و لە بەندەری هاڤەر ئاکنجی بوو... بەو ئومێدەی یارۆی دکتۆری تازە، مشتەریانی زۆری بۆلا بنێرێت. ئیدی بەو ئاواتەوە، لە دەرمانخانە بچووکەکەیدا ژیانێکی هەژارانەی دەبردە سەر و لە گەڕەکەکەی خۆیدا دەرمانی بە خوردە بورژوا و کرێکاران دەفرۆشت.

پییر، بە زۆری دوای شێوی ئێواران دەچوو بۆ دیدەنی و نزیکەی سەعاتێکی بەدەم قسانەوە لە گەڵیا بەسەر دەبرد، پییر، " ماروڤسکو "ی خۆشدەویست، پیاوێکی سیما ئارام و کەمدوو و بەویقار بوو.

تاقە چرایەکی غاز بەسەر مێزەکەیەوە دەسووتا، سەر مێزەکەی پڕبوو لە شووشە. لەبەر پاشەکەوت چرای تری دانەدەگیرساند و هەموو شووشەکان دیار نەبوون. لەپشت مێزەکەوەو لەسەر کورسیەکەی، لاق لە سەر لاق دادەنیشت. پیرەمێرێکی سەرساف بوو، کەپوو گەورە، لە دەندووکە دالآش دەچوو، لە تەوێڵیەوە شۆڕ دەبووەوە، لە تووتیەکی خەمین دەچوو، خەوێکی قووڵ دەیبردەوە، چەناگەی بەسەر سینگیەوە شۆڕ دەبووەوە. لە دەنگی زەنگ خەبەری بووەوە. زانی دکتۆرە، بە باوەشی کراوەوە چووە پێشوازی. پالْتۆ ڕەشەکەی کە یەکپارچە پەڵەی دەرمان و ئەسید بوو، زۆر بەبەری دەڵب بوو، بەتایبەتی کە پیاوێکی لەڕ و لاواز بوو، لە جبەی کۆنە ڕەبەنان دەچوو، ئەم پیاوە بە فۆنەتیکی پولونی قسەی دەکرد و ئەمە شەقڵێکی بڕێک مندالآنەی بەدەنگە باریکەکەی دەدا . بۆیە کە قسەی دەکرد، وەکو ئەوەبوو کە منداڵێکی بچووک قسەت بۆ بکات.

پییر، ڕۆنیشت، ماروڤسکو لێی پرسی:- دکتۆر گیان، خەبەر وباسی تازە؟

– هیچ شتێک نییە، دنیا شامی شەریفە، هەمان تاس و هەمان حەمامە.

– ئەمڕۆ نیگەران دیاریت.

– من زۆربەی کات هەر نیگەرانم.

- دە دەی گوێ مەدەیە. پەرداخێ بادەت بدەمێ؟
- بەڵێ، مەمنوونیش دەبم.
- ئەمـڕۆ بـادەیەکی تـازەت دەرخـوارد دەدەم. دوو مـانگێکە سەروسـاختم دەگەڵ کشمیش دایە، دەمەوێ بـزانم شـتێکی تازەی لێ کەشـف ناکەم... شـەرابێکم لێ دروسـت کـردووە، شــەرابە ئەممـا شــەراب، زۆر خۆشــە گــاڵتەی پێناکرێ، بەڕاستی خۆشە.

بەخۆشـحاڵییەوە چـوو بـۆ گەنجینـەیەک، دەرگـاکەی کردەوە، قاپێکی هەڵبژارد و هێنای. هەندێک سووکە جوولەی نـاتەواوی هەبـوو، بـۆ نمـوونە، کە باسـکی دێنـا بەتەواوی درێـژی نەدەکرد، کە هەنگـاوی دەنـا، بە تەواوی لاقـی لێـک نەدەکردنەوە، یانی هیچ جووڵەکەی تەواوی نەدەکرد. هـزر وبیرەکانیشـی لە کردەوەکانی دەچوو. ئامـاژەی بـۆ دەکـرد، هەوڵــی لەگەڵ دەدا، پێشــنیازی دەکــرد، بەڵام بەتەواوەتــی ڕوونــی نەدەکـردەوە. هەمـوو خەون و خولیـایەکی ژیـانی ئەوەبوو، شـەربەت و شـەرابان بگرێتەوە و دروسـت بکـات، زۆرجار دەیگوت: " شەرابی خۆش و بادەی نایاب، سەروەت وسامان دروست دەکات. "

سەدان کەڕەت هەوڵی گرتنەوەو دروستکردنی شـەراب و بــادەی دابــوو، بەڵام تاقەجارێــک ســەرکەوتنی بەدەســت نەهێنابوو. پییر، هەموو جارێ دەیگوت مارڤسکو، ( مـارا ) ی بیر دەخاتەوە ( مارا: شۆڕشگێڕێکی فەرەنسی بوو، پزیشـک بوو، کابرایەکی ڕادیکاڵ بوو، لە سـاڵی 1793، لە کـاتی مەلە کردنا تیرۆر کرا. )

جووته هاوڕێ له بنه‌بانی ده‌رمانخانه‌که‌دا سه‌روپێکی بچووکیان خوارده‌وه و ئه‌وجا هێنایانه سه‌ر مێزی ئاماده‌کردن و گرتنه‌وه‌ی ده‌رمانان، له‌به‌ر ڕۆشنایی چرا غازیه‌که ته‌مه‌شای ڕه‌نگی شه‌رابه‌که‌یان کرد. پیر گوتی: که گه‌وهه‌رێکی جوانه.

- وانییه؟

سه‌روسیمای پیره‌مێره پولۆنییه‌که که له سه‌روسیمای تووتی ده‌چوو، زۆر سه‌رحاڵ و شه‌نگوڵ دیار بوو. دکتۆر تامی شه‌رابه‌که‌ی کرد، ده‌فیکره‌وه چوو، دووباره تامی کرده‌وه. ده‌بیره‌وه چوو، ئه‌وسا گوتی: - زۆر به‌له‌زه‌ته، گه‌له‌ک به‌له‌زه‌ته، له تام وبۆنا تازه‌یه، به‌ڕاستی ئه‌مه که‌شف و دۆزینه‌وه‌یه گیانه‌که‌م.

- ئاه، ئه‌وه‌ی ڕاستی بێ، زۆر خۆشحاڵم.

ئه‌وسا ماروفسکو، ڕاوێژی به دکتۆر کرد که ئه‌م شه‌رابه تازه‌یه نێو بنێ چی، حه‌زی ده‌کرد نێوی بنێت: " ڕوحی کشمیش " یان " کشمیشی خاڵیسه " یان " کشمیش " یان " کشمیشین " پیر به هیچ یه‌کێک له‌و ناوانه ڕازی نه‌بوو، بیرۆکه‌یه‌ک به‌بیری پیره‌مێردا هات وگوتی: ئه‌وه‌ی تۆزێ له‌وه‌پێش گوتت زۆر گونجاوه، زۆر به جێیه (گه‌وهه‌ری جوان )، پیر، ئه‌م ناوه‌شی، هه‌رچه‌نده قسه‌ی خۆی بوو، به‌گه‌ن نه‌کرد. ئامۆژگاری کرد که ناوی بنات (کشمیش) ماروفسکو هاواریکرد، ناوێکی جوانه. ئه‌وسا هه‌ردووکیان بێده‌نگ بوون، چه‌ند خوله‌کێک له ژێر ڕۆشنایی تاقه چرا غازیه‌که دانیشتن، به‌بێئه‌وه‌ی ورته‌یان لێوه‌بێت. ئه‌نجام پیر، به نه‌به‌دڵی گوتی:

- ئـا، ئەم ئێـوارەیە بـویەر و پێشـهاتێکی سـەیرمان هاتەڕێ، دۆستێک لە دۆستەکانی بابم، کە مردووە، وەسێتی کردووە سەروەت و سامانەکەی بۆ براکەم بێت.

وادیـاربوو کە یـارۆی دەرمانسـاز لە هەوەڵەوە بـاش لە مەسـەلەکە حـاڵی نەبـوو، بەڵام دوای بیرکـردنەوە، هیـوای خواسـت کە نیـوەی ئەو میـراتیە بەر دکتـۆر کەوتبـێ. بەڵام دوای ئەوەی مەسـەلەکەی بـۆ ڕوون بـووەوە، حەپەسـا، زۆری پێنـاخۆش بـوو، کە هـاوڕێ گەنـجەکەی بەو ئـاوایە فەرامۆش کرابوو، گوتی:- ئەمە ئاقیبەتی باش نابێت.

پییر، کە نیگەرانیەکەی بۆ گەڕایەوە، دەیویست بزانێ کە مارۆڤسکو مەبەستی لەو قسەیە چییە، گوتی:

- بـۆچی، ئـاقیبەتی بـاش نابێـت؟ باشـە چ ئاکـامێکی خـراپ لەمە دەکەوێـتەوە کە بـرایەکەم ببێـت بە میراتگـری یەکێک لە دۆستەکانی بنەماڵەکەمان؟

لـێ یـارۆی سـرک و بە پـارێز لەوە زیـاتری لە سـەر نەڕۆیی وگوتی:

- لەم حاڵەدا، دەبێ میراتەکە بەیەکسـانی بـۆ هەر دوو براکە بێت. من پێت دەڵێم ئەمە ئاقیبەتی خێر نابێت.

دکتـۆر، بێتـاقەت بـوو، سـەبری سـوا، هەسـتا وبـۆ مـاڵ ڕۆیشـتەوە. دوای مـاوەیەکی کەم چـووە نـاو جێگـاکەیەوە، گـوێی لێبـوو جـانی بـرای بە ئەسـپایی بە نێـو ژوورەکەی تەنیشـتا دەهـات و دەچـوو، پاشـان دوو پەرداخ ئـاوی خواردەوە و نووست.

## (٣)

دکتـۆر، بەیـانی لە خەو ڕابـوو، ئیـدی قەراری دابـوو سـەروەت و سـامان پـێکەوە بنێـت. زۆرجـار ئەو قەرارەی دابـوو، بەڵام هەر قسـەی ڕووت بـوو وجێبەجـێ نەکردبـوو. هەمـوو جارێـک هەوڵـی دەدا پیشـەیەک بـدۆزێتەوە کە زوو دەوڵەمەنـدی بکـات و متمـانە بەخـۆی پەیـدا بکـات، لە ناکـاوا کۆسپ و تەگەرەیەکی دەهـاتەڕێ، ڕیسـەکەی لـێ دەکردەوە بە خوری و هەنگێ ناکامی ناچاری دەکرد ملی ڕێیەکی تـازە بگرێت.

هەر لە نـاو جێگاکەیـدا و لە ژێـر پەتـۆ نەرمەکـانەوە، دەفکرەوە دەچوو: چەندین دکتۆر لە ماوەیەکی کەما بوون بە ملیـۆنێر؟! بەڵام ئەو، کە شـیفتە و دڵبەنـدی زانیـاری پراکتیکـی بـوو، تـوانی لە مـاوەی خویندنەکەیـدا، مامۆسـتا باشەکانی بناسێت، زۆرجار بە گەوج و گەمژەی نـاودەبردن. بەڕاسـتی لەوان بەتوانـاتر و شـارەزاتر بـوو. خـۆ ئەگەر بیتوانیبـا بە هەرشـێوەیەک کۆمەڵێک مشتەری دەوڵەمەنـدی خەڵکی هـافەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، ئەوا زۆر بە ئاسـانی دەشـیا سـاڵانە سـەد هەزار فرانـک بەدەسـت بێنـێ. بەپێـی دەسکەوتی جێگیـر، بەیانی لە مـاڵ دەرچوبـا، بچوایە بـۆلای نەخۆشـەکانی، بە گـوێرەی نزیکتـرین تێکـڕا: دە نەخـۆش لە هەر ڕۆژێکـا، هەر نەخۆشـەی بیسـت فرانکـی دابـایە، ئەوا دەرامەتـی سـاڵانەی بەلای کەمەوە دەگەیـیە هەفتـا بـۆ هەفتـا وپێنج هەزار فرانک، بەڵام دە نەخۆشی تەقدیری کەمتر بوو لە نەخۆشانی واقیعی.

دوای نیوەڕوانیش، پێشوازی دە نەخۆشـی لە عیـادەکەی کردبـا و هەر نەخۆشـەی بە دە فرانـک بـوایە، دەیکـردە سـی

وشەش هەزار فرانک، واتە هەمووی دەیکردە سەد و بیست هەزار فرانـــک، ئەمە ژمـــارەیە نە گـــاڵتە. هەروەهـــا ئەو مشتەرییە کۆن و دۆستانەی کە لە ماڵەوە سەری دەدان و سەرو دە فرانکی لێوەردەگرتن وگەر بهاتبانە عیادەکەی پینج فرانکی لێ سەندبان، ڕەنگە هەندێک لە هەقەکەیان داشکاندبا، ئەوا قەرەبووی ئەو پارەیەی بۆ دەکردەوە کە لەبری ڕاوێژ بە دکتۆرانی دیکەی دەدا.

ئەوە کارێکی زۆر ئاسان بوو، تەنیا هەندێک ڕیکلامی زیرەکانەی دەویست، کە لە ڕۆژنامەی فیگارو بڵاوبکرێتەوە و ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە ئەنجوومەنی زانستی پاریس بە بـایەخەوە دەڕوانـنە ئەو چارەسـەرە عەجیبـانەی کە زانـای گەنج و خاکی لە شـاری هـاڤەر ئەنجامیان دەدات، هەنگێ لە بـراکەی دەوڵەمەنـدتر و بەناوبـانگتر دەبـوو، هەنگێ شـایی بەخۆی دەهـات، چونکە بە ڕەنجی شـانی خۆی پێدەگەیی و دەوڵەمەنـد دەبـوو، لە چـاوی داک و بـابە پیرەکەیـا، مەزن و بەڕێـز دەبـوو، شـانازیان بەخـۆی و شـۆرەت و ناوبـانگیەوە دەکـرد. ژنـی نەدەهێنـا، نەیدەویسـت خـۆی بە تـاقە ژنـێکەوە ببەسـتێتەوە، بەڵکـو چەنـدین دەنکـی لە نێـو مشـتەرییە زۆر جوان و خشیکەکانیا دەگرت.

زۆر لە سەرکەوتنی خۆی دڵنیابوو، بەڕادەیەک دڵنیابوو، کە لە ناو جێگاکەی دەرپەڕی، وەکو ئەوەی بیەوێ یەکسـەر بـاوەش بە سـەرکەوتنەکەیدا بکـات، خـۆی گـۆڕی، تـا لەمـاڵ وەدەربکەوێ و بە ناوشار بکەوێ تا شـوقەیەک وەدۆزێ کە بە کەڵکی کارەکەی بێت.

بیری کردەوە ئاخۆ بە کۆڵانەکانا بڕوات، لە دڵـی خۆیدا گـوتی: ئەگەر کەسـێک لە کـارکردن بـێ، هەنـجەت و بیـانوو

زۆره بۆ کارکردن، دەیتوانی سێ هەفتە لەمەپێش ئەم بڕیاره بدات، ئەم بڕیارەی کە لە ناکاوا و پاش میراتەکەی برایەکەی لەلای دروستبوو. ئیدی لەبەر ئەو دەرگایانەدا دەوەستا کە لێیان نووسرابوو شوقەی جوان، شوقەی نایاب بۆ کرێ، ئەو ئیعلانانەی هیچ کوالیتیەکیان نەدابوو، زۆری پەست دەکرد. زۆر شوقەی بەسەرکردەوە،بەرزییەکانیانی پێوا، نەخشەکانیان، ڕەوشی ژوورەکان و پەنجەرەکانیانی لە دەفتەری یاداشتەکانیا تۆمار دەکرد. بە خاوەن شوقەکانی دەگوت ئەو دکتۆره، نەخۆشی زۆره. پێویستە قاڵدرمەکە زۆر پان وپاک بێت، بەهەرحاڵ حەزی لە قاتی یەکەمە. دوای ئەوەی حەوت هەشت ناونیشانی لای خۆی تۆمار کرد و ڕەشنووسی ئیعلانێکی دووسەد نوسخەیی نووسی، ئەوسا بۆ فراڤین بۆماڵ گەڕایەوە، چارەکە سەعاتێک لە مەوعیدی ئاسایی نانخواردن دواکەوتبوو.

کەخۆی بە هۆڵەکەدا کرد گوێی لە تەق وهوڕی قاپ و ئامانان بوو. کەواتە بەبێئەوەی چاوەڕوانی ئەو بکەن نان دەخۆن. بۆچی؟

خۆ خانەوادەکە هەموو ڕۆژێ لە یەک کاتی دیاریکراودا نان ناخۆن، نێوچاوانی تێک نا، پەست بوو، چونکە تۆرینوک و دڵناسک بوو، زوو دەڕەنجا. هەرکە وەژوور کەوت رولاند پێی گوت:

- دەی پیر، لەزێکە، بەخۆت دەزانی، دەبێ سەعات دوو لە لای دادنووس بین . ئەمڕۆ ڕۆژی کات بەفیڕۆدان نییە.

دکتۆر، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، دوای ئەوەی دایکی ماچکرد و دەستی باب وبراکەی گوشی، دانیشت، لە بەلەمە

گەورەکەی ناوەندی خوانەکە، ئەو پارچە گۆشتەی هەڵگرت کە بۆ ئەو دانرابوو، پەراسووی بەرخ بوو. سارد و وشک بوو، پێدەچوو، خراپترین پارچە گۆشت بێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: دەکرا هەر لە فڕنەکەدا بوایە تا دەهاتمەوە، نەک مێشکی کەس وکارەکەی ئەوەندە مژوول بوایە کە کوڕە گەورەکەیان لە بیربکەن.

ئەو قسانەی کە لەگەڵ هاتنەوەی ویدا، بڕان، سەرلەنوێ دەستیان پێکردەوە، خات رولاند بەجانی گوت:

- ئەگەر من لە جیاتی تۆبام، لە خانوویەکی بەشکۆدا دادەنیشتم، خانوویەک سەرنجی ڕاکێشابا، لە نێو خەڵکیدا خۆم دەنواند، سواری ئەسپێک دەبووم، یەک دوو کەیسی گرینگم هەڵدەبژارد تا لە دادگادا شۆرەت و ناوبانگ دەربکەم و ببم بە پارێزەرێکی ناسراو، خۆ تۆ لە خوا بەزیاد بێ پێویستت بەپارە نییە، بەڵام ئەگەر پیشەیەکت هەبێ باشترە، با بەری خوێندنەکەت بە فیڕۆ نەچێ، خۆ پیاو دەبێ هەر چۆنێ بووە کارێک بکات.

باوکە رولاند، بەدەم پاک کردنی هەڵوژەیەکەوە گوتی:

- ئەگەر من لە جێگای تۆبام، کەشتییەکی جوانم دەکڕی، کەشتییەک لەشێوەی کەشتییانی کاپتنەکانمان و یەکسەر بەرەو سینگال دەڕۆیشتم.

پییرش ڕای خۆی دەربڕی و گوتی:

- بە هەرحاڵ نرخ وبەهای مەعنەوی و فیکری ئینسان بە سەروەت وسامانەوە نییە، بەتایبەتی بۆ خەڵکانی بچووک و بێ پشت وپەنا مایەی داڕوخانە، بەڵام بۆ خەڵکی بەهێز وگەورە، بەپێچەوانەوە، هەرچەندە ئەوانە کەمن، پێگەیان بەرز دەکاتەوە. جا ئەگەر جان، بەڕاستی پیاوێکی گەورە بێ،

ئەوە پێگەی بەرز دەبێتەوە و هێندەی دی پێی گەورە دەبێ، ڕاستە حاڵی حازر پێویستی بەهیچ نییە، بەڵام دەبێ زۆر وریابێ، بە جۆرێ کاربکات وەکو ئەوەی هیچی نەبێت. نابێ خۆی بە وردە کەیسی بێوەژنان و هەتیوانەوە مژوول بکات، نابێ بە چەند فرانکێک لەسەر ئەم کەیس و ئەو کەیس ڕازی بێت. بەڵکو دەبێ ببێت بە قانوون گوزارێکی گەورە.

ئەوسا، بەم ڕستەیە کۆتایی بە قسەکانی هێنا:

– من ئەگەر پارەم هەبوایە، خۆم بۆ توێکاری تەرخان دەکردا!

بابە رولاند، شانەکانی هەڵتەکاندن وگوتی:

– تـرەملالا! فەلسـەفەی ژیـان ئەوەیە کەبە خۆشـی بڕوات، ئێمە بەشەرین، خۆ ئاژەڵ نین. پیاو کە بە هەژاری لە دایک دەبێ، لە سەریەتی کاربکات، ئەوکاتە هەقە کاربکات. بەڵام – ئەگەر دەرامەت و پـارەیەکی زۆری هەبێـت – بە خودا کەرە ئەگەر خۆی بەکارێکەوە ببەستێتەوە کە مگێزی ماندوو بکات.

پییر بە لووت بەرزییەوە وەڵامی دایەوە:

– بۆچوونمـان جیاوازە، من لە دنیـادا تەنیا زانست و زانیـاری و زیـرەکیم بەلاوە گەورە وگـرینگە، ئیـدی هەمـوو شتێکی دیکەم بەلاوە پەشم و هیچە.

خات رولاند، کە هەمیشە هەوڵی دەدا ئەو مشت ومڕ و دەمەدەمەیەی نێـوان بـاب وکـوڕ، سـووک بکـات، بـابەتی گەنگەشەکەی گۆڕی و باسی ئەو تـاوانی تیرۆرەی هێنـایە پێشـێ کە هەفـتەی ڕابـردوو لە شـارۆچکەی ( بولبیـک – نوانتوت ) ڕوویدابوو، ئیدی یەکسەر هەموو بیریان مژوولی ئەو هەلومەرجە بوو کە تاوانبارەکەی تیابوو، ئەو ترسەیان

هێنایە بەرچاوی خۆ کە تاوان، چ گەورە و چ بچووک، چ باڵکێش و چ تورەهات و نەنگین، لە لای بەشەری دروست دەکات. بابە رولاند، کەبە درێژایی وەختەکە، ناوبەناو سەیری سەعاتەکەی دەکرد، گوتی:- بابڕۆین، دەبوایە ئێستا بەرێگاوە بین.

پییر، بە تەوسخەنێکەوە گوتی:

- ڕاستە، تەنیا یەک سەعات ماوە، نەدەبوو ئەم گرتکە گۆشتە ساردەشم بدەنێ.

دایکی لێی پرسی: - دێی بۆلای دادنووس؟

بەلالووتێکەوە وەلامی دایەوە: - من، نا، بۆچی بێم؟ هاتنم هیچ سوودێکی نییە.

جان، وەکو ئەوەی کارەکە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبێ، هەر بێدەنگ بوو. وەختایەک باسی تیرۆری "بولبیک" یان کرد، وەکو مافناسێک هەندێک ڕاوبۆچوونی لەمەڕ تاوان و تاوانباران و چۆنیەتی سەرهەلدان و پەرەسەندنی تاوان گوت. ئەوسا دووبارە بێدەنگ بووەوە. شادی بە سیمایەوە دیاربوو، چاوەکانی لە خۆشیان پرشنگیان لێدەبووەوە، گۆناکانی سوور هەلگەڕابوون، تەنانەت ڕدێنەکەشی دەبریقایەوە.

دوای ئەوەی خانەوادەکە ڕۆیشتن پییر بەتەنێ مایەوە، لە ماڵ وەدەرکەوت، دووبارە کەوتە گەڕان بۆ شوقەیەکی کرێ.

دوای دوو سێ سەعات هەلگەڕان و داگەڕان بەسەر ئەم قالدرمە و ئەو قالدرمەدا، ئاقیبەت لە شەقامی فرانسوای یەکەم شوقەیەکی جوانی دۆزییەوە.

شـوقەکە گەورە بـوو و لە نهـۆمی خـوارەوە بـوو، دوو دەرگـای لە سـەر دوو ڕێگـای جیـاواز هەبـوو، دوو هـۆڵ و داڵانێکـی بە جامخـانەی هەبـوو کە نەخۆشـەکان دەیـانتوانی بەدەم چاوەڕوانی نۆرەی خۆیانەوە، تەمەشای گوڵان بکەن، هەروەهـا هـۆڵێکی نـانخواردنی گەورەی بـازنەیی هەبـوو کە دەیڕوانیە سەر دەریا.

مەرجـی خـاوەن شـوقەکە ئەوەبـوو، کە پێشـەکیەکی سـێ هەزار فرانکی دەویست، لێ پییر تاقە فرانکێکی شک نەدەبرد. هەمـوو ئەو سـەروەت و سـامانەی بـابی کـۆی کردبـووەوە، نەدەگەییە هەشت هەزار فرانک. پییر کەوتە گلەیی لە خۆی کە دوو دڵە لە هەڵبژاردنـی کـار وپیشـەکەیدا و بەمە کەس وکـارەکەی ئیحـراج دەکـات، لە هەوڵەکانیـا خەمسـارد و بـێ موبالات بوو، لە بڕیارەکانیا جدی نەبوو و بەنیوەچڵی وازی لێدەهێنا.

لە شـوقەکە وەدەرکەوت، بەڵێنـی دا کە لە مـاوەی دوو ڕۆژا جـواب لە خـاوەن شـوقەکە بگێـڕێتەوە. بیـری لەوە کـردەوە کە بـراکەی هەرکـاتێ میـراتەکەی وەرگـرت، داوای سێ یەک یان نیوەی کرێی شوقەکەی لێبکات، لە دڵی خۆیدا گوتی: بۆ چەند مانگێک بەقەرز لێی وەردەگرێت و پاشان لە زەرفـی ئەوپەڕی سـاڵێکدا دەیـداتەوە، ئەمە کـارێکی ئاسـانە، هەڵبەتە براکەشم بە یارمەتی دانم خۆشحاڵ دەبێت.

دەوروبەری سـەعات چـوار، لە هەمـوو کارێـک بووبـووەوە، هـیچ کـارێکی نەبـوو بیکـات، ڕۆیـی بـۆ بـاخی گشتی تا تاوێک لەوێندەر دانیشێت، ماوەیەکی زۆر لە سـەر تەخـتەکە دانیشـت، بیـری لە هـیچ نەدەکـردەوە، چـاوانی بڕیبوونە ئەرزەکە، زۆر ماندوو بوو.

هەموو ڕۆژانی پێشووشی، لەوەتای لە پاریسەوە بۆماڵی بابی گەڕابووەوە، وەکو ئێستا بەسەر بردبوو، ئەو بۆشایی و بێکارییەی زۆر لەبەر گران نەبوو... چۆن کاتی خۆی لە بەیانییەوە کە لە خەو هەڵدەستا، تا شەوێ کە دەنووست، دەبردە سەر؟

ئیدی لە کاتی خێزاوا بە لەنگەرگای بەندەرەکەدا دەسووڕایەوە، بە کوچە و کۆڵانانـدا دەسووڕایەوە، کاتی خۆی لە لای ماروفسکو بەفیڕۆ دەدا، سەری بە هەموو کونێکا دەکرد . لە پڕێکا، ئەم ژیانەی کە بەو جۆرە دەیبردەسەر، لەبەرچاو کەوت، ئەگەر بڕە پارەیەکی هەبوایە، ئوتومبێلێکی بەکرێ دەگرت و دەچووە سەفەرێکی دوور ودرێژی گوندەواران و پیرە ئوتومبێلی بەو چاڵ و چۆڵانەدا داژۆت کە سێبەری دار بەڕوو ونارەنان دایان پۆشی بوو، بەڵام ئەوەندە بێ پارە بوو کە حیسابی بۆ نرخی پێکێک بیرە وپولێکی سەرنامە، دەکرد، ئەمە نەیدەهێشت بەخەون و خەیاڵیش بیر لەوجۆرە سەفەر و سیاحەتانە بکاتەوە.

لە ناکاوا بەخۆی گوت: ئەمە چەند ناخۆشە، سێ دانە ساڵە خەجاڵەتی دایکیەتی، ناچارە ناو بەناو داوای یەک جونەیهی لێبکات. لە کاتێکا سەری دار عاساکەی لە ئەرزەکە دەچەقاند، لەبن لێوانەوە گوتی: حەیفێ، خۆزگە پارەیەکم دەبوو!

دووبارە، وەکو ئەوەی چزی زەردەزیڕەیەک بێداری بکاتەوە، میراتی براکەی وەبیرهاتەوە، بەڵام خێرا ئەوەی لە مێشکی خۆی وەدەرنا، حەزی نەدەکرد، بکەوێتە هەڵدێری حەسوودی وبەغیلییەوە. چەند منداڵێک لە دەوروبەری ئەوا، لە ناو خۆڵەپەتانی سەر ڕاڕەوەکاندا یاریان دەکرد، هەموو

موو زەرد و قژ درێژ، زۆر بەجدی کەڵەکە خۆڵیان دروست دەکرد، پاشان، لەقەیەکیان پێدا دەکێشا و بڵاویان دەکردەوە. پییر ئەو ڕۆژە زۆر پەست وخەمگین بوو، دەیڕوانییە توێیەکانی ڕۆحی، هەر هەموویان دەلەرینەوە.. لە دڵی خۆیدا گوتی: کارەکانی مە، ڕێک لە ڕەفتاری ئەو منداڵانە دەچێت. ئەوجا پرسی: باشە باڵاترین حیکمەتی ژیان ئەوەنییە پیاو دووان سیانێک لەم بوونەوەرە بێ سوودانە بخاتەوەو بەکاوەخۆ تەمەشایان بکات کە چۆن گەورە دەبن. ئارەزووی زەماوەندی بزوا. ئیدی ئینسان کە لە تەنیایی ڕزگاری بوو بەو ڕادەیە وێڵ و سەرگەردان نابێت، بەلای کەمەوە لە کاتی تەنگانە و نیگەرانیدا، گوێی لە جم وجوڵی یەکێک دەبێت، کە هەست بە ژان و ئازارێک بکات، بە ژنێک بڵێت ' گیانەکەم. ' کەوتە بیرکردنەوە لە ژن. شارەزاییەکی کەمی لەمەڕ ژن هەبوو و لە گەڕەکی لاتینیدا، پەیوەندییەکی سنووورداری بە ژنانەوە هەبوو، هەمووی دوو هەفتەیەک دەوامی کرد ولەگەڵ تەواو بوونی خەرجی مانگانەیدا، ئەویش تەواوبوو و کۆتایی هات، لەمانگی دواترا، تازەی کردەوە، بەڵام پەیوەندییانی تازە جێگەی پەیوەندییەکانی پێشووتریان گرتەوە. بێگومان، ئافرەتێن زۆرباش، زۆر ناسک و نەرم ونیان، زۆر خەمخۆر و خەمڕەوێن هەبوون، باشە دایکی لە ماڵباتی بابیا، ئەقڵ و ئەفسوونی ماڵەکە نەبوو؟ چەند حەزدەکات ئافرەتێک بناسێت، ئافرەتێکی ڕاستەقینە!

لە ناکاوا هەستا، مکووڕ لە سەر ئەوەی بچێتە سەردانی خاتوو روزمیلی. پاشان، لە ناکاوا ژێوان بووەوە، دەستبەردار بوو. حەزی لەم ژنە نەدەکرد، پێی قەڵس دەبوو!

بۆچی؟ ئەقڵێکی بازاڕی و جەڵەبی و سووک بوو. باشە لەوەناچێ جانی پێ پەسند تر بێ؟ هەڵبەتە، بە ئاشکرا و لەدڵی خۆیدا دانی بەوەدا نەدەنا، کە لەبەر ئەم مەیلەی بەلای جاندا، ڕقی لەم بێوەژنە دەبووەوەو بە سائەقڵی دەزانی، چونکە هەرچەندە ( پییر ) براکەی خۆشدەویست، بەڵام وێڕای ئەوەش بە زیرەک و هۆشنی نەدەزانی وخۆی لەو بەزیرەکتر وئاقڵتر دەزانی. خۆ تا شەوێ لەوێندەر نامێنێتەوە. وەکو دوێنێ بە نیگەرانیەوە پرسی: " چی بکەم؟"

هەنگێ هەستیکرد، ڕوحی تینووی میهرە، پێویستی بە هەمێز و دڵدانەوەیە و، دڵدانەوە سەبارەت بەچی؟ بەخۆیشی نەیدەزانی چ دەڵێت. لە ڕەوش و حاڵێکی لاوازی و تەمەڵی ئەوتۆدا بوو، کە هەستی بە زەروورەتی هەبوونی ئافرەتێک، زەروورەتی دەستبازی دەگەڵ ئافرەتێکدا، بە زەروورەتی تەماسی دەستێک، ورشە و پرشەی مەکسیەک، نیگای گەرمی چاوێکی ڕەش یان شین دەکرد، ئەوەی لەم دۆخەدا و لە ئێستادا بە پێویست دەزانی.

لەم دەمەدا کیژێکی کرێکاری یەکێک لە قاوەخانەکانی وەبیرهاتەوە، کە شەوێک لە شەوان لە گەلیا ( لەگەڵ کیژێ دا) چووبووەماڵەوە. دوای ئەوە ناو بەناو دەیبینی.

هەستا، چوو بۆلای کیژێ تا بیرەیەکی لە گەڵدا بخواتەوە. چی پێ بڵێ؟ کیژێ چی بەم دەڵێ؟ بێگومان هیچ. دەی چ قەیدیە، دەستی خستەسەر دەست، هەستی کرد کیژێ بەلای دا مایلە. کەواتە بۆچی نەچێ بۆلای؟... سەیری کرد لە هۆڵی قاوەخانەکەدا کە نیمچە چۆڵ بوو، لە سەر کورسییەکە پاڵی داوەتەوە، سێ زەلام بەدەم مەینۆشیەوە سەبیلیان دەکێشا، ئانیشکیان دادابووە سەر مێزێکی دار بەڕووەوە، ئافرەتی

سەر دەغیلەکە خەریک بوو ڕۆمانێکی دەخوێندەوە، خاوەنی قاوەخانەکە، لە سەر کورسییەکی بچووک، بەبێ ئەوەی پاڵتۆکەی لەبەر کردبێت، لە غورابی خەودا بوو.

وەختایەک کیژەکە چاوی بە پییر کەوت، بلەز هەستا، بە هەشتاو بەرەو پیری هات وگوتی: - بەخێر هاتی، چ حاڵە؟

- من باشم، ئەدی تۆ؟

- من، بەدڵی دۆستم، عەیبم نییە، چییە کەم دیاری؟

- بەڵێ، وەختم نییە، بەخۆت دەزانی من بابایەکم دکتۆر.

- بەڕاست! ئەدی بۆ ئەمەت بەمن نەگوتووە. ئەگەر بمزانیبا – هەفتەی بووری نەخۆش بووم – ڕاوێژم پێدەکردیت. چیت دەوێ؟

- بیرەیەک، ئەدی تۆ؟

- منیش بیرەیەک، مادام تۆ بۆمی دەکڕیت.

کیژێ، بەبێ هیچ شەرم و شوورەییەک قسەی بۆ دەکرد، دەتگوت ئەم ڤەخوارنە، هەموو پەردەیەکی لاداوە. ئیدی ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتن، زۆر خۆمانی کەوتنە قسان، کیژێ ناو بەناو بە ئەسپایی دەستی دەگرت، ڕێک وەکو ئەو کیژانەی لوتفی خۆیان بۆ فرۆشتن ڕادەنەن. نیگایەکی باڵکێشی پییری کرد وگوتی:

- بۆ دیار نیت؟ من تۆم زۆر بەدڵە ئازیزەکەم.

پییر، خەریک بوو بەرەبەرە لێی بێزار دەبوو، هەستیدەکرد، زۆر کەودەن ورەشۆکییە. لە دڵی خۆیدا گوتی: ژنان تەنیا لە خەونا یان لە جل وبەرگێکی نایابا کە گەوجیەتی و سووکیان بشارێتەوە، جوانن.

له کیژێی پرسی: - چەند ڕۆژێ لەمەوبەر، بەیانییەک لەگەڵ گەنجێکی قۆزی موو زەردی، ڕدێن درێژی سوور وسپیا بینیمیت، ئەوە برات بوو؟

- بەڵێ، برامە.
- بەڕاستی کوڕێکی قۆزە.
- بەڕاستتە؟
- هەڵبەتە، لەوە دەچێ کوڕێکی زۆر ڕووخۆش بێ.

خۆیشی نەیزانی چ ئەنگیزەیەکی نامۆ هانی دا کە حیکایەتی میراتەکەی جان، بۆ ئەم کرێکارەی قاوەخانەکە بگێڕێتەوە؟ باشە بۆ وەختایەک کە تەنیا بوو، ئەو بیرۆکەیەی، لە دڵی خۆدا تووڕ دا وئێستا بەرۆکی گرتەوە، چ بوو، هەروا هات بەدەمیا، زادەی ئەم ساتە بوو؟ باشە بۆ ڕێگەی دا بەو ئاسانییە، دابڕژێ، وەکو ئەوەی دووبارە پێویستی بەوەبێ، گرێی دڵی بکاتەوەو داخی دڵی لە بەردەم کەسێکدا هەڵڕێژێت؟ لاقی خستەسەرلاق وگوتی:

- برایەکەم زۆر بە شانسە، میراتیەکی بیست هەزار فرانکی پێ براوە.

کیژێ، چاوە شینە، پڕ تەماعەکانی کردنەوە وگوتی:

- بیست هەزار! کێ ئەو هەموو میراتیەی بۆ بەجێهێشتووە؟ نەنکی یان پووری؟
- دۆستێکی پیری داک و بابم.
- تەنیا دۆست؟ ماقوول نییە! ئەدی هیچی بۆ تۆ دانەناوە؟
- نا، من زۆر کەمم دەناسی.

کیژێ، کەمێک دەبیرەوە چوو، ئەوجا بزەیەکی نامۆ و بەماناوە لێوەکانی کشاند وگوتی:

- بەڕاستی براکەت، لە بە دەستهێنانی ئەو جۆرە دۆستانەدا بە شانسە! بۆیە زۆر کەم لە تۆ دەچێت!

پیرۆ بەدڵ حەزی دەکرد، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی بە تەواوەتی بزانێ بۆ؟ کیژێ بەر زلله بدات. ئەوجا بە زاری داچەقیوەوە پرسی:- مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

مۆرکێکی گەوجانەی ساویلکانە نیشە سەر سیمای کیژێ و گوتی:

- من؟ هیچ. دەمەوێ بڵێم لە تۆ بە شانسترە.

بیست فرۆشی فڕێدایە سەر مێزەکە و هەستا و وەدەرکەوت. لەبەر خۆیەوە قسەکانی کیژێ دەگوت و دەگوتەوە: " بۆیە زۆر کەم لە تۆ دەچێت " بیری لە چی دەکردەوە؟ مەبەستی لەو قسانە چ بوو! بێگومان مەبەستێکی هەبوو، تەوس و توانجێکی پێ بوو، گومان و بەد گومانیەک لە ئارادا بوو. بەڵێ ئەو کیژە مەبەستی ئەوە بوو، کە دەبێ جان کوڕی ماریشال بێت.

هەستی بە ناخۆشییەکی زۆرکرد، ئەو گومان و تۆمەتەی کیژێ لە دایکی ئەمی کردبوو، تەزاندی. تەنانەت لە ڕیکردن وەستا، چاوی بۆ شوێنێک گێڕا تا لێی دانیشێت. قاوەخانەیەکی دیکەی لەبەردەمیا بەدی کرد، خۆی پێدا کرد، کورسییەکی پەیداکرد، وەختایەک شاگردەکە هات بەدەمییەوە گوتی: بیرەیەکم بۆ بێنە.

هەستی کرد دڵی پەلەپەل دەکات، هەستی کرد موچوڕکەی پێدا دێت، لە ناکاوا ئەو قسەیەی بیرکەوتەوە کە دوێشەو ماروڤسکو کردبووی: " ئەمە ئاقیبەتی باش نابێت " باشە ئەویش هەمان گومانی لەلا بوو، هەمان بەدگومانیەکەی ئەم سۆزانیەی بە دڵدا هاتبوو؟ سەری

بەسەر پەرداخە بیرەکەدا بەردابووەوە، دەیڕوانیە ئەو کەفە سپیەی بەسەر بیرەکەوە هەڵدەچوو ودادەمرکایەوە، لە خۆی پرسی: " تۆ بڵێی هەردووکیان هەمان گومانیان هەبێت؟ "

هەردوو ئەو بۆچوونەی، کە ئەم گومانە نەگریسەیان خستە دڵەوە، بۆ ڕوون بووەوە، یەک لە دوای یەک بۆی ڕوون بوونەوە، خویا وزەلال. هەڵبەتە ئاساییە پیرەمێرێکی سەڵت، بێ ژن ومنداڵ و هیچ میراتگرێک، سەروەت وساماناکەی بۆ هەردوو کوڕەکەی برادەرێکی خۆی تەرخان بکات، بەڵام کە بۆ یەکێکیانی بەجێ بێڵێت، بێگومان خەڵکی سەیریان پێدێت و دەکەونە مقۆمقۆ وبزەێن گومانامێز. باشە چۆن ئەم گومانی بۆ ئەمە نەچوو، چۆن بابی هەستی بەمە نەکرد، چۆن دایکی کەشفی نەکرد؟ نەخێر ئەوەندە بەم سەروەتە چاوەڕوان نەکراوە، شاد وخۆشحاڵ بوون، شتی وایان هەر بەبیردا نەدەهات. چۆن ئەم خەڵکە ئابڕوومەندە گومانی وا نەنگین لە خۆیان دەکەن؟ باشە خەڵکی، دەرودراوسێ، دووکاندار، بەقاڵ و هەموو ئەوانەی دەیانناسین، نەدەبوو باسی ئەم هەڵوێستە کریت و دزێوە بکەن، پێیان ڕابوێرن، گاڵتە بەبابی بکەن، دایکی ببوغزێنن؟

خۆ ئەو سەرنج و تێبینییەی کە کیژی قاوەخانەکە دەری بڕیبوو کە جان مووزەرد و سوور و سپییە و ئەو ئەسمەرەو، لە هیچ ڕوویەکەوە لێکدی ناچن، نە لە ڕواڵەت و سیمادا، نە لە ڕێکسرن دا، نە لە شێوەدا، نە لە ئاوەز و زیرەکیدا، لێکدی ناچن، ئەمە شتێکی پەنهان وشاراوە نەبوو، زەق و زۆپ بە بەرچاوی هەموو کەسێکەوە بوو. کەباسی کوڕانی رولاند دێتە پێشەوە، دەڵێن: " کامیان کوڕی

ڕاستەقینەی خۆیەتی و، کامیان کوڕی درۆینەیەتی، کامیان بیژووە؟ "

هەستا، بڕیاری دا کە فریای برایەکەی بکەوێ و لەم ئیهانە ترسناک ودزێوە ئاگاداری بکاتەوە کە بە کەرامەت و ئابڕووی دایکیان دەکرێت. باشە هەڵوێستی جان چ دەبێت، جان چی دەکات؟ جان زۆر ساویلکەیە. بێگومان میراتەکە ڕەفز دەکات، هەنگێ دەدرێ بە هەژار و فەقیر و فوقەرا، هەنگێ بەو دۆست وئاشنا و ڕۆشنایانەی ئاگاداری ئەم میراتییە بوون دەڵێت: وەسیێتنامەکە هەندێ مەرجی تێدا بوو، بەپێی ئەو مەرجانە، جان نەیدەکردە میراتگر، بەڵکو دەیکردە سەرپەرشتیاری میراتیەکە.

خۆی بەماڵی بابیا کرد، بیری لەوە دەکردەوە چۆن براکەی بەرێتە لایەکەوەو لەبەردەم داک و بابیا ئەو بابەتەی دەگەڵدا باس نەکات. لە بەر دەرگادا، پێش ئەوەی وەژووربکەوێ، لەبەر دەرگا وەستا، دەنگی ژاوەژاو و پێکەنین لە هۆڵەکەوە دەهات، کە وەژوور کەوت گوێی لە دەنگی خاتوو روزمیلی و کاپتن بوسیر بوو، بابی بۆ شێوی دەعوەت دەکردن بەبۆنەی خەبەرە خۆشەکەوە.

شەرابی سپی و مەی " ئەبسنت " ی بۆ کردنەوەی ئیشتیا دانا، هەمووان لە هەوەڵەوە خۆشحاڵ بوون. کاپتن بوسیر، پیاوێکی کورتەباڵای خڕیلانە بوو، ئەوەندە بە دەریادا خولابووەوە کە تەواو خڕ بووبوو، هزر وبیریشی لە خڕ و بازنەیی دەچوو، ڕێک وەکو بەردی کەناراوان، بەجۆرێ پێدەکەنی کە پێکەنینەکە پڕبوو لە پیتی " ڕا " و ئەوکی پڕ دەکرد، ژیانی بە شتێکی زۆر خۆش ونایاب

دەزانی. پەرداخەکەی لە پەرداخەکەی بابە رولاندا دا، جان دوو پەرداخی پڕی بۆ جووتە ژنەکە دەبرد.

خاتوو روزمیلی، شەرابەکەی قەبووڵ نەکرد، کاپتن بوسیر کە مێردە مردووەکەی دەناسی، گوتی:

- دەی، دەی خانمەکەم، پەندی پێشینیانە: " خۆشە، ئەو شتانەی دووچەلان دووبارە دەبنەوە. " واتە دوو پێک شەرابی سپی قەیدی نییە. من پێت دەڵێم: من لەوەتای لە دەریا دابڕاوم هەموو ڕۆژێ بەرلە شێوکردن، دوو سێ پێکان هەڵدەدەم و دەکەومە هەوای خۆم! پاشان قاوەیەکی بەسەردا دەکەم، ئیدی بۆ شەوێ دەبم بە دەریایەکی خرۆشاو، بەڵام هەرگیز نایگەیەنمە گەرداو، هەرگیزاو هەرگیز، چونکە لە خەلەل و پەککەوتن دەترسم.

رولاند، بەدەم ستایشکردنی ئارەزوو و مەیلە دەریاییەکەی پیرە کاپتنەوە، پێکەنی، لە کانگای دڵییەوە پێکەنی، دەم وچاوی سوور هەڵگەڕا، شەرابی ئەبسنت چاوەکانی لێڵ کرد. ورگی زۆر زەلام بوو، لە ورگی ئەو دووکاندارانە دەچوو کە هەموو ئازایان بووە بە ورگ، ئەو دووکاندارانەی بەردەوام لەسەر کورسی دانیشتوون و نەڕان و نە سینگ و بەرۆک و نە باسک وبازوو، نە گەردن و ملیان نەماوە و هەمووی بووە بە ورگ و بەسەر کورسیەکەی ژێریاندا داتەپیوە.

بوسیر، بەپێچەوانەی ئەوەوە، وێڕای ئەوەی کورتەباڵا و زەلام بوو، کابرایەک بوو پڕ وەکو هێلکە، توند وەکو تۆپ.

خات رولاند، هێشتا پێکی یەکەمی تەواو نەکردبوو، گۆناکانی سوور هەڵگەڕابوون، چاوەکانی لە خۆشیا دەبریقانەوەو، سەیری جانی کوڕی دەکرد.

جان، بسکەی سمێڵی دەهات، مەسەلەی واژۆکە تەواو بووبوو، یدی خاوەنی بیست هەزار فرانک بوو. ڕەفتاری جۆرە لە خۆبایی بوونێکی پێوە دیاربوو، لە ڕەفتاری ئەو کەسانە دەچوو، کە سەروەت و سامان بوغرایان دەکات، پێدەکەنی، بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد، بە متمانەیەکی گەورەوە سەیری خەڵکەکەی دەکرد.

خواردن دانرا، وەختایەک رولاندی پیر هات، تا تەوقە لەگەڵ خاتوو روزمیلی بکات، ژنەکەی هاواریکرد:- نا، نا، پیاوەکە، ئەمڕۆ جان خاوەن ماڵە.

خوانەکە بەشێوەیەکی نائاسایی ڕازابووەوە، دڵاوایی و دەوڵەمەندی پێوەدیار بوو: چەپکێ گوڵی گەورە، کە جۆرەها قردێلە و نەواری ئاوریشمی لێ بەسترابوو، لەبەردەم قاپەکەی جان دانرابوو، جان لە شوێنی بابی دانیشتبوو، چەپکە گوڵ، وەکو قوببەی ڕازاوە بەرز بووبووەوە، چوار قاپی گەورەی پڕ لە میوە لە دەوری چەپکە گوڵەکە دانرابوو. قاپی یەکەم پڕ بوو لە قۆخی نایاب، قاپی دووەم قاڵبێک کاتۆی گەورەی بە کەرە و خەرمانێک پسکیتی تیابوو، قاپی سێیەم، پڕبوو لە ئەناناسی نوقمی شەرابێکی زوڵاڵ، قاپی چوارەم ترێیەکی ڕەشی بزمارکوتی نایاب وسەیری تیابوو کە لە وڵاتە گەرمەسێرەکانەوە هێنرابوو.

پییر، بە دەم دانیشتنەوە گوتی:- سەیرە! ئێمە ئاهەنگ بۆ جانی دەوڵەمەند دەگێڕین!

دوای خواردنی سوپ و شۆربا، شەرابی مادیر هێنرا، هەمووان لەیەک کاتدا قسەیان دەکرد، بوسیر، لەسەر خوانەکە باسی ئەوەی دەگێڕایەوە، چۆن جارێک لە دورگە و گراڤی ( سانت دوماغ ) لە هایتی، دەعوەتی جەنەڕاڵێکی

زەنگی بووە. بابە رولاند، بەدەم گوێگرتنەوە عەودالی ئەوەبوو، چۆن لە هەلێکا خۆی بکات بەبەینی قسەکانی ئەوا، باسی دەعوەتێکی کرد کە برادەرێکی لە ( میدون ) بۆی کردبوون و چۆن پاشان هەریەکێک لە میوانەکان نەخۆش کەوتبوون و پازدە ڕۆژان لەجێگادا کەوتبوون. خاتوو روزمیلی و جان و دایکی باسی گەشت و فراڤینێکیان لە گوندی (سان جوان) کرد کەچەند خۆشبووە. پییر، خۆزی دەخواست کە بە تەنیا ولە خوارنگەیەکی بچووکی کەناری دەریادا شامی بکردایە و لەم هەرا و هەنگامە و پێکەنین و شادیە وروژێنەرە، بخەلەسیبا. بیری لەوە دەکردەوە چۆن قسە دەگەڵ براکەیدا بکات، کارێکی وەها بکات دەستبەرداری ئەو سەروەتە ببێت کە پێشوەختە قەبووڵی کردبوو و دڵی پێ خۆشکردبوو، هەڵبەتە ئەمە بۆ ئەو قورس دەبێت، بەلام دەبێ ئەوە بکات، نابێ هیچ دوو دڵیەک بنوێنێ، ناوی دایکیان دەزڕێ. رولاند، وەختایەک ماسییەکی گەورەی " قاروس " یان دانا کەوتە باسی ڕاوە ماسی، بوسیر حیکایەتێکی سەیری دەربارەی ( گابوون ) و ( سانت ماری ) لە مەدەغەشقەر گێڕایەوە، بەشێوەیەکی تایبەتی باسی کەناراوەکانی چین و ژاپۆنی کرد، کە گوایە ماسیانی ئەوێندەر، دەم وچاویان ناسک و وەکو دەم وچاوی بەشەرن. باسی سیمای سەروچاویانی کرد، چاوە درشتە زێڕینەکانیان، سکەشین و سوورەکانیان، باسی زەعانیفەکانی کرد کە لە باوەشێن دەچوون، باسی کلکە کولەکانیانی کرد. بەشێوەیەکی خۆش قسەی دەکرد، بەدەم قسەکردنەوە ئاماژەی دەکرد وسەرنجی هەمووانی ڕادەکێشا و بە جۆرێ دەیهێنانە پێکەنین کە ڕوندک دەزاییە چاوانیان.

پییر، تاقه کەسێک بوو کە بەو دیمەن و قسانە قەڵس و بێزار دەبوو، لە بن لێوانەوە گوتی: " هەقی خۆی بوو کە دەگوترا نورماندییەکان، دەکەنە گاسکونیانی باکوور ".
(گاسکونیەکان، خەڵکانێک بوون کە لە باشووری ڕۆژئاوای فەرەنسا دادەنیشتن و بەچیرۆک وحیکایەتێن خەیاڵی بەنێوبانگ بوون. ) دوای ماسی، سەندەویچ و بابۆلان هات، پاشان مریشکی برژاو، زەڵاتە و فاسۆلیای تەڕ، کوبە بەگۆشتی پاساری، هی شاری ( بیتی ڤیپە) کارەکەرەکەی خاتوو روزمیلی، لە میوانداریپەکەدا خزمەتی دەکرد. خۆشی و شادییەکە بەگوێرەی ژمارەی پێکەکان، زۆرتر بوو.
وەختایەک، قەپاخی یەکەمین بوتڵە شامپانیا هەڵپچڕێنرا، بابە رۆلاند، بەتووندی ڕاچڵەکی و بە دەم لاسایی شڵپەی کرانەوەی قەپاخەکەی، کرد و ئەوسا گوتی:
– من ئەم دەنگەم زۆر لە دەنگی تەقەی دەمانچە پێخۆشترە.
پییر، کە زۆر بێزار وبێتاقەت بووبوو، بەتەوسەوە گوتی:
– ڕەنگە ئەم شەرابە بۆتۆ زۆر خراپتر بێ.
رولاند، کە زۆری حەز لە شەراب بوو، پەرداخە پڕەکەی لە سەر مێزەکە دانا : – بۆچی؟
بابە رولاند، ماوەیەک بوو لە تەندروستی خۆی ڕازی نەبوو، هەستی دەکرد نەخۆشە، گیانی قورسە، سەری بەگێژەوە دەچێ، مگێزی تێک دەچێت. دکتۆر بەرسڤی دایەوە:

- چونکە فیشەکی دەمانچەکە لەوەیە سەربکات، لا بکات، بە نزیکتا تێبپەڕێت، بەڵام پێکە شەرابەکە، یەکسەر و ڕاستەوخۆ دەچێتە گەدەتەوە، کونی دەکات.

- پاشان؟

- پاشان، گەدەت دەسووتێنێ، مێشک وکۆئەندامی مێشک ودەمارت دەشێوێنێ، سووڕی خوێن سست دەکات، ئیدی ئامادە دەبیت بۆئەوەی سەکتە وجەڵتەی مێشک لێتبدات. کە ئەمە لە هەموو پیاوێکی وەکو تۆوە نزیکە.

ئیدی هەموو خۆشی و نەشئەکەی یارۆی کۆنە زەڕەنگەر، وەکو دووکەڵێک با ڕای بدات و لە گەڵ خۆیدا بیبات، ڕەوییەوە، بە دووچاوی نیگەرانەوە ڕوانییە کوڕەکەی و دەیویست بزانێ ئاخۆ ئەو قسانەی بەڕاستە یان گاڵتە دەکات. لێ بوسیر هاواریکرد و گوتی:

- پەح کە ئەم دکتۆرانە قسەیان ناخۆشە، سەری زمان وبنی زمانیان ئەمەیە: مەخۆ، مەخۆرەوە، ئەمە مەکە، ئەوە مەکە، هەموو ئەمانە نەخۆشیان پێوەیە، بۆ تەندروستی خراپە. من بەخۆم هەموو ئەو شتانەم کردووە، لە هەموو دنیادا، لە هەموو شوێنێکا بۆم کرابێ، بێدڵی خۆم نەکردووە، لە هیچ شتێک نەپرینگاومەتەوە و هیچیشم لێنەهاتووە.

پییر، بە پەستی وەڵامی دایەوە:

- یەکەم، جەنابی کاپتن، تۆ لە بابم بەهێز وگوڕتری، دووەم هەموو ئەهلی ڕابواردن هەمان قسەی تۆ دەکەن تا ئەو ڕۆژەی... بۆ سبەی فریا ناکەون بێنەوەو بە دکتۆرەکە بڵێن: " هەق بە تۆیە جەنابی دکتۆر، تۆ ڕاستدەکەیت ". هەڵبەتە هەقی خۆمە وەختایەک بابم دەبینم کە خراپترین و ترسناکترین کار دەرهەق بەخۆی دەکات، ئاگاداری بکەمەوە.

ئەگەر ئاگاداری نەکەمەوە، مانای وایە کوڕێکی بێ سفەتم، سپڵەم.

خات رولاند، بە شەرمێکەوە هەڵیدایەوە وگوتی:

– پییر، ئەمە چییە؟ جارێک هیچ نییە، ئەو زەرەرەی نابێ، تۆ بیر بکەوە:- ئاخر چەند جەژنی هەیە؟ چەند شادیمان هەیە؟ تۆ هەموو خۆشی و ئاهەنگەکانمان لێ تاڵ دەکەیت، ئەمەی تۆ دەیکەیت شەڕە.

پییر، شانەکانی هەڵتەکاند و لەبن لێوانەوە گوتی:

– کەیفی خۆیەتی، بابەدڵی خۆی بکات، من تەنیا ئاگاداری دەکەمەوە. بەڵام بابە رولاند، شەرابەکەی نەخواردەوە، بە تاسەوە دەیڕوانیە پەرداخەکەی، کە پڕبوو لە شەرابی زەرد باوی زوڵاڵ، کە وردە بڵق لە ژێری ژێرییەوە، بلەز بەرز دەبووەوە و هەرکە دەگەییەوە سەرەوە دەتەقی و مەحوو دەبووەوە، وەکو ڕێوییەک کە مریشکێکی مرداری لەبەردەما بێ و سڵ لە تەڵە بکات، بەو ئاوایە بە پارێزەوە تەمەشای پەرداخە شەرابەکەی دەکرد. بە دوودڵییەوە پرسی:

– بەڕاستی پێت وایە، ئەمە زەرەری زۆرم پێدەگەیەنێت؟

پییر، ژیوان بوو لەو قسەیەی کە کردبووی، لەزگ بوو بەهۆی بەدمگیزی خۆیەوە، ئەوانی دی ئازار بدات. گوتی:

– نا، دەی، هەر یەک کەڕەت بخۆوە، لە سنوور دەرمەچوو و مەیکە بە عادەت. بابە رولاند، پێکەکەی هەڵگرت، هێشتا بڕیاری نەدابوو بۆ دەمی بەرێ و بیخواتەوە. بە عەزرەتەوە، بە تاسەوە، بەترسەوە لێی دەڕوانی، ئەوسا بۆنێکی کرد، تامی کرد، بە قومی بچووک

بچووک کەوتە خواردنەوەی، بە لەزەتەوە دەیخواردەوە و بەدڵ پەست بوو. کە دوا چۆڕی خواردەوە هەستی بە پەشیمانی کرد. لە ناکاوا چاوانی پییر، لە چاوانی خاتوو روزمیلی هەڵەنگوتن، زۆر گەش وزەلاڵ، شین، ڕاستەوخۆ، بە ماناوە بڕی بوونیە ئەم. یەکسەر، بیرۆکە ومەبەستەکەی پشت ئەم نیگاکردنەی خوێندەوە، بیری تووڕەی ئەم ژنە منداڵکار و، سائەقڵە بەئاشکرا دەیگوت: " تۆ برادەر کەسێکی بەغیلی، زۆر شەرمە بۆ تۆ ". سەری دانەواند، گەڕایەوە سەر خواردنەکەی. برسی نەبوو، زۆر پەست بوو، ئارەزوویەکی سەیر دنەی دەدا، بڕواتە دەرێ، لە نێو ئەو خەڵکانەدا دانەنیشێت، گوێی لە قسەوباسەکانیان، لە کەیف و سەفایان، لە حیلکە حیلک و پێکەنینیان نەبێت. بابە رولاند، کە شەرابەکە کاری تێکرد و کەمێک سەری گەرم بوو، ئامۆژگارییەکەی پییری کوڕی فەرامۆش کرد. بەچاوێکی تینوو ومەستەوە ڕوانیە قاپە شامپانیاکە، کە هێشتا تەژی بوو و لەلای قاپەکەی ئەوەوە دانرابوو. لەترسی ئەوەی نەبا دووبارە لۆمە بکرێ، زاتی نەدەکرد دەستی بۆ ببات. کەوتە بیرکردنەوە لە ڕێگەیەک کە بێئەوەی پییر پێ بحەسێت بگاتە شەرابەکە. فێڵێکی سادەی بەبیردا هات، بەبێ موبالاتی بوتڵەکە هەڵدەگرێت، دەست بە بنیەوە دەگرێت، بەسەر مێزەکەدا دەست ڕادەکێشێت، تا یەکەمجار پەرداخە بەتاڵەکەی دکتۆر تەژی بکات و پاشان بە سەر پەرداخەکانی دیدا دەیگێڕێ و کە دەگاتە سەر پەرداخەکەی خۆی بەدەنگی بەرز دەکەوێتە قسبان و ئەگەر شتێکی کردە پەرداخەکەی خۆیەوە سەد سوێند دەخوات کە نەیزانی و سەهوێ کردووە. وێڕای ئەوەش کەس هەستی پێنەکرد.

پییر، بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک خواردیەوە. لە ناکاوا، بە شێوەیەکی نا خودئاگایی، لە دەمێکی بێزاری و پەشێویدا، پەرداخە شووشە درێژەکەی هەڵبڕی کە وردە بڵقی شەرابە سافەکەی لێوە دیاربوو هەڵبڕی و، ئەوسا بە هێواشی نای بەسەریەوە، هەستی بەتامێکی ئامال شیرین کرد کە بە هۆی هەڵچوونی غازی شەرابەکەوە زمانی تۆزاندەوە.

بەرە بەرە بەدەنی، تەزی گەرمایەکی خۆش بوو، کە لە سکیەوە بۆ هەموو بەدەنی سیرایەتی دەکرد، ڕێک لە گەرمای سۆپا دەچوو، لە پێشا باڵی بەسەر سینگیا کێشا و پاشان بە هەموو ئازایا بڵاو بووەوە، وەکو شەپۆلێکی فێنک هەموو بەدەنی گرتەوە و خۆشیەکی لە گەڵ خۆیدا هێنا، هەستی بەجۆرە باش بوونێک کرد و نیگەرانیەکەی کەمێک ڕەوییەوە، بێزارییەکەی سووک بوو و، ئەو قەرارەشی، کە لێبڕابوو ئەمشەو لە بارەیەوە قسە دەگەڵ براکەیدا بکات خاو بووەوە، نەک لە بەرئەوەی دەستبەرداری بیرۆکەکە بووبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، بەخێرایی ئەو لەزەتەی کە دایگرتبوو، نەڕەوینێتەوە. بوسیر هەستا، تا پێکێک بەسەلامەتی ئامادەبووان هەڵبدات، سڵاوی لە هەموو ئامادەبووان، کە لە شوێنی خۆ دانیشتبوون کرد وگوتی:

- خانمانی بەڕێز، برادەران، ئێمە لێرە کۆ بوینەتەوە، تا بەشداری ئاهەنگی ئەو بویەر وپێشهاتە خۆشە بکەین کە بۆ یەکێک لە هاوڕێ و دۆستەکانمان، هاتووەتە پێشێ. جاران دەیگوت: "سامان کوێرە " من پێموایە کورتبینە یان جنۆکەیە، دووبینێکی دەریایی زۆر چاکی کڕیوەو زەمینەی بۆ خۆشکردووە کە لە بەندەری هاڤوردا، کوڕی دۆستە باشەکەمان، کوڕەکەی ڕولاند، کاپتنی کەشتی مرواری ببینێ

و بــدۆزێتەوە. ئامــادەبووان بەدەم چەپڵەلێــدانەوە دەســت خۆشییان لێکرد، باوکە رولاند هەستا تا وەڵامی بداتەوە، ، دوای ئەوەی کـۆکەیەکی بـۆکرد، چـونکە هەسـتی دەکـرد ئەوکی گیراوە و زمانی قورسە، کەوتە دەمەلاڵکێ و گوتی:

- سوپاس جەنابی کاپتن، لە جیاتی خۆم و، لە جیاتی هەردوو کورەکەم سوپاست دەکەم، هەرگیز ئەو لوتفەت لە بیر ناکەم. بەسەلامەتی تۆ و ئاواتەکانت دەخۆمەوە.

هەردوو چاو وکەپووی تەڕی ڕوندک بوون، بەبێدەنگی لە جێی خـۆی دانیشـتەوە. ئەوسـا جـان، بەدەم پێکەنیـنەوە کەوتە قسان و گوتی:

- مـن دەبـێ لێـرەدا سوپاسـی دۆسـتانی دڵسـۆز، سوپاسـی هاوڕێیـانی بە ئەمەک بـکەم ( ڕوانـیە خـاتوو روزمیلی ) کە ئەمڕۆ دڵسۆزی و ئەمەکداری خۆیان نواند، بەڵام نـاتوانم بە وشــە سـوپاس و منەتبـاری خۆمیـان بـۆ دەرببڕم. سبەینێ ئەمەیان بۆ دەسـەلمێنم هەمیشە و لە هەر ساتێکی ژیانما ئەمەیان بۆ دەسـەلمێنم... چونکە دۆستایەتی مە، لەو دۆستایەتیانە نییە کە دەسڕێتەوە.

دایکـی بەوپەڕی سـۆزەوە و لەبـن لێـوانەوە گـوتی: " ئافەرین، باریکەڵلا کوڕەکەم " و بوسیر هاواریکرد:

- دەی خــاتوو روزمیلــی، نــۆرەی تــۆیە، بە نــاوی ڕەگەزی ناسکەوە قسان بکە.

روزمیلی، پێکەکەی هەڵبڕی و بە دەنگێکی ناسکی، کەمێک خەمینەوە گوتی:

- من، بەسەلامەتی وخۆشـی یـادی موبـارەکی جەنـابی ماریشالەوە دەخۆمەوە.

ئیدی چەند ساتێکی ئارامی و، ڕامانی مەند، وەکو ساتەکانی دوای نوێژ و نزا باڵی بەسەر کۆڕەکەدا کێشا. بوسیر، کە توانایەکی باشی ڕاستەوخۆی پیرۆزبایی کردنی هەبوو، ئەم تێبینییەی دەربڕی:- وتەکەی، ناسکی وتەی ژنانەی نەبوو.

ئەوجا، ئاوڕی لای باوکە ڕولاندی دایەوە و گوتی:

- باشە ئەم ماریشالە چی بوو کێ بوو؟ دۆستایەتیتان خۆشبوو؟

پیرەمێرد، کە شەراب کاری تێکردبوو و مەست بوو، دەستی بەگریان کرد و بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

- برا بوو.. بەخۆتان دەزانن.. کەسی وەکو ئەو لەم دنیایەدا نەماوە.. لێکدی جیانەدەبووینەوە.. هەموو ئێوارەیەک لە ماڵی مەدا شامی دەکرد.. دەعوەتی شانۆی دەکردین.. تەنیا ئەمەتان، ئەمەتان.. ئەمەتان پێدەڵێم.. دۆست بوو.. دۆستی گیانی بەگیانی.. گیانی بەگیانی.. گیانی بەگیانی.. ئەوە لویز ، وانەبوو لویز؟

ژنەکەی بە سادەیی بەرسڤی دایەوە: - با، دۆستێکی ئەمین بوو.

پییر، تەمەشای باب و داکی کرد. دوای ئەوەی بابەتی قسەکان گۆڕا، بایدایەوە سەر شەرابەکە. وەختایەک ئەم ئاهەنگ و شەوبێریە کۆتایی هات، تەنیا تۆزێکی بیرمابوو.

میوانەکان قاوەیان خواردەوە، شەرابیان خواردەوە، نوکتەیان گێڕایەوە و پێکەنین. ئەوجا ئەو، دەورووبەری نیوەشەو، بە هزری نیگەران و سەری قورسەوە، چووە ناو جێگاکەیەوە، ئیدی حەیوان ئاسا تاکو سەعات نۆی سبەینێ، خپ لێی خەوت.

## (٤)

خەوی دوای شامپانیا و شەرابی ڕەبەنانی شەرترانییان، ئارامیان کردبووەوە و مگێزی هێنابووەوە تایم. کە لە خەو ڕابوو، لە بارێکی دەروونی زۆر ئارام و هێمندا بوو، بەدەم لەبەرکردنی جلەکانیەوە، بیری لە ڕەفتار و هەڵچوونەکانی خۆی لەکاتی شەوبێری و ئاهەنگەکەدا دەکردەوە، دەوری دەکردەوە، هەڵیدەسەنگاند، بە وردی لە دووی فاکتەر و سەدەمە شەخسی و هۆکارە دەرەکیەکانی بوو.

دیارە ئاساییە، ئافرەتێکی وەکو ئافرەتی قاوەخانەکە وەختایەک نەزانێ کە کابرایەکی نەناس، وەسیێتی کردبێ سەروەت و سامانەکەی بدرێ بە یەکێک لە جووتە کوڕەکەی رولاند، بیری خراپی بەمێشکا بێ، بیرێک کە لە سۆزانییەک بوەشێتەوە. بەڵام ئایا ئەو ئافرەتە سووک و بازاڕیانە هەمیشە، ئامادەنین، بەبێ هیچ هۆیەک، ئەوجۆرە گومانە لە ژنانی ئابڕوومەند و داوێنپاک بکەن؟ هەمیشە لە پاشملە، جنێو بەو ژنانە نادەن کە سوور دەزانن هیچ عەیبێکیان تیانییە، بوختانیان بۆ ناکەن، قسە وقسەڵۆکیان دوو ناخەن؟ کە باسی ئافرەتێکی داوێنپاک و ئابڕوومەندیان لەلا بکرێ، پەست و بێتاقەت نابن؟ وەکو ئەوەی یەکێک جنێویان بداتێ، هاوار دەکەن: " ئاه، بەخۆت دەزانی من هەموویان دەناسم، ژنانی بەمێرد، من دەماریان دەناسم، ئەوە چ قسەیەکە، شەرمە...! ئەوانە، زۆر لەمە زیاتر ئاشق ودڵداریان هەیە، بەڵام ئەوان چونکە دوو ڕوون دەیشارنەوە. ئاه! بەڵێ... ئەمە شەرمە! "

ئەگەر خۆی لە حاڵێکی دیکەی غەیرەز ئەم حاڵەدا بوایە بێگومان بیری بۆ ئەم جۆرە گومانانە نەدەچوو کە لە دایکە

بەستەزمانەکەی، دایکە باشەکەی، دایکە زۆر سادەکەی، دایکە زۆر سەلارەکەی دەکرا، بەڵام ماکی بەغیلی روحی دەهاروژاند. ئاوەزی پەست و تووڕەی لە کەمینا بوو بۆ ئەوەی هەر شتێک بڵێت کە براکەی ئازار بدات، بەڵام ئەم نیازە گڵاوەی بە کیژێکی بیرەفرۆش سپارد، کە کیژەکە ئەو نیازەی لەلا نەبوو.

لەگینە، خەیاڵی خۆی ئەم گومانەی لەلا دروست کردبێ، ئەم گومانە ترسناکەی خولقاندبێت، خەیاڵی کە بەردەوام لە کۆنترۆڵی وی دەردەچوو، نەیدەتوانی بەرزەفتی بکات. ئەم خەیاڵە ئیدی ئازاد و ڕەها، سەرکێش و سەرەڕۆ، ڕێسکباز و فێڵباز دەڕوات، جۆرەها بیری لێدەبێتەوەو هەندێجار، هەندێک لەم بیرانە پڕن لەو شەرم وشەرمەزاریانەی لە دڵی خۆیدا، لە دەروونی خۆیدا، لە کانگای روحیا، لەو لۆچ و توێیانەی ناگەیە بنج وبناوانیان، دەشارێتەوە، وەکو شتی دزیاری دەیانشارێتەوە. بێگومان دڵی هەندیک نهێنیانی تیایە لەوی دەشارێتەوە، باشە ئەم دڵە برینداره، ئەو گومانە قێزەونەی نەکردبوو بە دەستاوێزێک بۆ ئەوەی براکەی لەو میراتە مەحرووم بکات کە ئەم بەغیلی و حەسوودی پێدەبرد. ئێستا لە خۆی بەگومان بوو، وەکو چۆن پارسایان ویژدانی خۆیان پرسیارپێچ دەکەن، بەو ئاوایە کەوتە پرسیاری نهێنییەکانی بیری خۆی.

خاتوو روزمیلی، هەرچەندە خودانی زیرەکییەکی سنووردار بوو، بەڵام جۆرە هۆشمەندییەکی خۆڕسکی هەبوو، ئیدی ئەم جۆرە هۆشمەندییە لە لای ژنان هەیە، بەڵام وێڕای ئەوەش، ئەم گومان و بیرەی بە مێشکا نەهات، ئەوەبوو زۆر سادە و ساکارانە پێکەکەی بەیادی موبارەکی

ڕەحمەتـی ماریشـاڵ هەڵـدا. ئەگەر کەمتـرین گومـانی لەلا هەبوایە ئەو کارەی نەدەکرد، ئەم ئێستا گومانی لەلا نەماوە. حەسـوودیە نەخـوازراوەکەی سـەبارەت بەو سـامانەی بە براکەی بڕابوو، متمانەی تەواوی بە دایکی وخۆشەویستیە ئـاینییەکەی دەرهەق بە دایکـی، هەمـوو گومـان و واز وازیەکەی سڕییەوە.

بەم ئەنجامگیریە خۆشحاڵ بوو، وەکو ئەوانەی چاکە وخێـر دەکەن خۆشـحاڵ بـوو، بڕیـاری دا لە گەڵ هەمـوو کەسێک باش بێ، لە پێش هەمووانەوە لەگەڵ بابیا باش بێ، کە بە بەردەوامی لە سەر خوو و خدە ناشیرینەکانی، لەسـەر گەوجێتیەکانی، لەسـەر بۆچوونە توڕهاتەکانی و کەودەنیە زەقەکانی، لێی توورە دەبوو و بەڕوویا هەڵدەشاخی.

ڕێـک لەکـاتی دیـاریکراوی فراڤینـدا بـۆ مـاڵ گەڕایەوە، بەنـوکتە وپێکەنـین و ڕووی خۆشـەوە، مجـامەلەی هەمـوو ئەنـدامانی خـانەوادەکەی کـرد. دایکـی بەسـۆزو خۆشەویستیەوە پێـی گـوت: " پییـرۆ گیـان، دەزانـی ئەگەر خۆت بتەوێ چەند کوڕێکی جوان و ناسکی!"

ئیدی کەوتە دەماوەری، هەرهەموویانی هێنایە پێکەنین، وەسفی دۆستەکانیانی بۆ کردن، هەندێک تەوسی بە بوسیر کرد، بە جۆرە پارێزێکەوە کە برایەکەی نەڕەنجێنێ، تالیقێکی لە خاتوو روزمیلی دا. لە دڵی خۆیدا وبەدەم تەمەشاکردنی براکەیەوە گوتی: " کەوایە داکۆکی لێبکە هەی قەل پیاو، من، وێڕای ئەوەی کە دەوڵەمەندیت، هەرکاتێ بمەوێ، دەتوانم بە سەرتا سەربکەوم ". کە هاتنەسەر قاوە خواردنەوە، بەباوکی گوت:

– ئەمڕۆ کەشتی مرواری دەردەکەوێت؟

- نا، کوڕەکەم.
- دەتوانم لەگەڵ جان بارتدا بییەم؟
- هەڵبەتە، بەدڵی خۆت.

لە یەکەم جگەرە فرۆشیدا، جگەرەی نایابی کڕی. بەگورجی بۆ بەندەرەکە داگەڕا. ئاسمان سایەقە، ساماڵ، شینێکی کاڵ، شنەی دەریا دەیشۆردەوە. باباگری دەریاوان، کە نازناوی جان بارت بوو، لە ناو کەشتیەکەدا، لە خوارەوە نووستبوو، ئەو ڕۆژەی بەیانی زوو بۆ ڕاوەماسی نەچووبا، دەبوا خۆی ئامادەبکات و لای نیوەڕۆ دەربچێت.

پییر، هاواریکرد:- بابڕۆین ڕەئیس.

پەیژە ئاسنینەکەی داگرت، خۆی بە ناو کەشتیەکەدا کرد. پییر گوتی:

- ئەمڕۆ با لە کوێوە دێ؟
- با هەمیشە لە دەشتەوە دێ ئاغای پییر. شنەیەک لە دەریادا هەیە.
- دەی با بڕۆین هاپۆ.

بەدوو قۆڵی چارۆکەکەی پێشەوەیان هەڵدا، لەنگەرەکەیان ڕاکێشا، کەشتییەکە ئازاد بوو، بە ئەسپایی بەرەو لەنگەرگا لاوەکیەکە و بەسەر ئاوە مەنگەکەی بەندەرەکەوە، داخزی. بایەکی کز لە ڕێگاوبانەکەوە، لەپێچ و پەناکانەوە هەڵیکرد و بەشی سەرەوەی چارۆکەکەی شەکاندەوە، بایەکە ئەوەندە کز بوو، کەس هەستی پێنەدەکرد. کەشتی مرواری وەکو ئەوەی هێزێکی پەنهان و نادیار وەگەڕی بخات. پییر، دەستی بە موحەجەرەکەوە گرت، جگەرەکەی بە ددانەکانی گرت. لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا چاوەکانی بەتەواوەتی هەڵنەدەهاتن، ڕوانیە ئەو

لەوحەد دارە زەلامانەی کە لەبەر دیوارە شەپۆل گیرەکەوە ڕەش دەچوونەوە وبەرەو ئەم دەجولان.

وەختایەک، کەشتییەکە بەرەو قولایی دەریاکە جولا، گەییە دوا لەنگەرگای لاوەکی دەستەچەپ، شنەیەک، شنەیەکی نمدار بەسەر دەم و چاو و دەستی دکتۆردا هەلیکرد، دەتگوت ختوکەی دەدا، شنەیەکی نیمچە سارد، خۆی بە سینگ وبەرۆکیا کرد، هەناسەیەکی دوور ودرێژی هەلکێشا. چارۆکە قاوەییەکە کرایەوە، وەکو میزەلان پڕبوو لەهەوا، کەشتییەکەی بە ئاستەم خوارکردەوە و خێراتر بوو. جان پارت، لە ناکاوا چارۆکە سێگۆشەکەی پێشەوەی هەلکرد، هەرسێ بەشەکەی پڕبوون لە هەوا، لە بال دەچوو، ئەوسا دوو هەنگاو بۆ پاشەوە کشایەوە، چارۆکەکەی دواوەی کە بە بورجەکەوە بەسترابوو کردەوە.

لە ناکاوا، ئاوە فێنکەکە بە شلپ وهۆڕ خۆی بەقەدی کەشتییەکەدا کێشا، زۆر خۆش بوو، کەشتییەکە بەوپەڕی خێرایی بۆی دەرچوو.

بەشی پێشەوەی کەشتیەکە بەجۆرێ دەریاکەی شەق دەکرد، دەتگوت گاسنی هەوجاڕێکی سەر شێتە، دەریا ئارامەکەش دووبارە کەوتەوە شەپۆل دان، شەپۆل بەرز دەبووەوەو دووبارە دەنیشتەوە، وەکو ئەو گلە خاکییەی بەدەم کێلانەوە، بەرز دەبووەوەو بە قورسی دەنیشتەوە.

کەشتی مرواری، لەگەل هەر شەپۆلێکا – شەپۆلەکان کەم خایەن وبچووک بوون – لەلای چارۆکە سێگۆشەکەوە تا سووکانەکەی تەکانێکی وەهای دەدا کە دەستی پییر دەلەرزی. لە چاو تروکانێکا بایەکی توونـد هەلیکرد، شەپۆلەکان خۆیان بە قەدی کەشتیەکەدا دەکێشا، لەوە

دەچوو لە ئان وساتدا، کەشتیەکە داپۆشن و بیکەنە ژێرەوە. کەشتیەکی بوخاری ( ئەو کەشتیانەی بە هەڵم کار دەکەن ) کە بە خەڵـوزی بەرد کـاری دەکـرد و لە ( لیڤەرپـولەوە ) هـاتبوو، لەنـگەری خستبوو و چـاوەڕوانی خیـزاوی دەکرد. بەرەوپـاش پێچیـان کـردەوە، ئەوسـا یەک لە دوای یەک سەری کەشتیەکیان دا کە لە لەنگەرگاکەدا وەستابوو. ئەوجا کەمێک دوور کەوتنەوە تا تەمەشای کەناره درێژەکە بکەن.

پییـر، سـێ دانە سـەعات بەسـەر ئـاوە لەرزانەکەدا، سـوڕایەوە، کەیفـی کـرد، زۆر بێـدەنگ وهـێمن وخۆشـحاڵ وشادمان بوو. لە تەیرێکی، تیژباڵی، نەرم ڕەفتار دەچوو کە ئەم دەعبـایەی کە لە تەخـتە وقومـاش دروسـتکرابوو، بە جووڵەیەکی قامکی ئەو بەکاوەخۆ دەهات ودەچوو.

وەکو چۆن خەڵکانێـک بەسـەر پشـتی ئەسـپێکەوە، یـان بەسـەر کەشـتییەکەوە خەون دەبیـنن، بەو ئـاوایە لە خەونەکانیا نقوم بـوو، بیـری لە ئایندەی پرشنگداری خۆی کردەوە، بیری لەوە کردەوە کە ژیان ئەگەر زیرەکی لەگەڵدا بێ چەند خۆشە، سبەینێ، داوای هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ لە بـراکەی دەکـات، بەقەرزی سـێ مانـگ، یەکسـەر شـوقەیەکی گەورە وبە شـکۆ لە شـەقامی فرانسـوای یەکەم بەکـرێ دەگرێ و بۆخۆی جیا دەبێتەوە.

یـارۆی دەریـاوان لە ناکـاوا گـوتی:- ئاغـای پییر، دنیـا مژ ودوومانە، دەبێ بگەڕێینەوە.

پییر، چاوی هەڵبڕی، لە قوڵی بـاکوورەوە، تەمتوومـانێکی کەوەیـی ئەسـتووری بەدی کـرد کە بەرەبەرە بەری ئاسـمان وسـەری دەریـاکەی دەگـرت و بـلەز وەکـو پەڵە هەورێـک لە بەرزییەکی زۆر بڵندەوە، بەرەولای ئەمان دادەهاتەوە.

ئاراستەکەی گۆڕی، بایەکە لە دواوە بەرەو لەنگەرگا لاوەکیەکەی بەندەرەکە دەڵەکی دا، تەم ومژە خێراکە دوای کەوت. وەختایەک تەم ومـژەکە گەیـیە کەشـتی مـرواری، بەچڕی تێی ئاڵا، تەزوویەکی تەزی بە سەراپای پییردا هات، بۆنی دووکەڵ و بۆنی بۆگەنی، بۆنی مژ ودوومانی دەریایی نامۆ، ناچاریان کرد دەمی دابخات تا تامی هەورە نمناکە ساردەکە نەکات. وەختایەک کەشتییەکە لە بەندەرەکەدا گیرسایەوە، هەڵمە تەنکەکە خەریک بوو شاری کفن پۆش دەکرد و وەکو خوناڤ بە سەر شار وبە سەر ماڵەکان و ڕێگاوبانەکاندا دادەباری.

پییر، بلەز بۆماڵ گەڕایەوە، دەست وقاچی چایی بوون، خۆی بەسەر جێگاکەیدا دا و تا ئێوارە خەوت. کە چووە ژووری نانخوارن، گوێی لێبوو، دایکی بە جانی دەگوت:

– هۆڵەکە زۆر جوان دەردەچێ، گوڵی تیا دادەنەین. هەنگێ بە خۆت دەبینی. من بەخۆم مشووری نۆژەنکردنەوەی دەخۆم. ئیدی هۆڵەکە، لە کاتی کەرنەڤاڵ و ئاهەنگاندا زۆر جوان دەنوێنێت.

دکتۆر پرسی:– دایکە ئەوە باسی چی دەکەیت؟

– باسی شوقەیەکی نایاب دەکەم کە بۆ براکەتم بەکرێ گرتووە، بەڕێکەوت دۆزیمەوە، لە قاتی خوارەوەیە، بەسەر دوو ڕێگادا دەڕوانێت. شوقەیەکی زۆر جوانە، هەر شایەنی بووکە.

پییر، ڕەنگی ڕەش داگەڕا، دڵی گوشرا، گوتی: – ئەم شوقەیە لە کوێیە؟

– لە شەقامی فرانسوای یەکەمە.

که گـوێی لەو قســەیە بـوو، هـیچ گومــانێکی لەلا نەمــا، بەڕادەیەک تـووڕە بـوو، حەزی دەکـرد، پـڕ بەزاری هــاوار بکـات: ' ئەمە کـارێکی نـاڕەوایە، شـوقە بڕابـوو، تەنیـا ئەمە نەبێ!

دایکی، بەردەوام قسەی دەکرد و بە ئاو وتاو دەیگوت:

- تەســەورکە، بە دوو هەزار و هەشــت ســەد فرانـک بەکــرێم گــرت. داوای ســێ هەزاریــان دەکــرد، بەخــورتی دووسەد فرانکم پێ داشکاندن، بە گرێبەستی سێ یان شـەش یـان نـۆ سـاڵ. ئەم شـوقەیە، زۆر لەبـار دەبـێ بـۆ بـراکەت. گرینـگ ئەوەیە نـاوەوەی ڕێـک وپێـک بـێ، ئیـدی خۆبەخـۆ پـارەی بە ســەردا دادەبـارێ. ئەمە مشــتەری ڕادەکێشــێت، شوێن گرینگە، هەیبەت وڕێز بۆ خاوەنەکەی پەیدا دەکات، وا لە مشتەری دەکات، وا تەسەور بکەن، پیاوێک لە خانوویەکی وەکـو ئەمەدا بـێ، دیـارە پیـاوێکی گەورەیە، شــایەنی ڕێـز وحورمەتە، ئەگەر لە مرافەعەکانیا کرێی زۆریش داوا بکات، کەس گلەیی ناکات.

بـۆ چەنـد چـرکەیەک بێدەنگ بـوو و ئەوسـا لە سـەری ڕۆیی:

- پێویستە شوقەیەکی وەکو ئەمە بۆتۆش بدۆزینەوە، با تۆزێ لەمە کەمتریش بێ، چونکە تۆ پارەت نییە، گرینگ ئەوەیە جوان بێ، دڵنیات دەکەم زۆری سوود لێ دەبینی.

پییر، بە قێزوبێزەوە بەرسڤی دایەوە:- من، سەرکەوتنی من بەزانست و کارەوەیە.

دایکی دووبارە گوتی: وایە، بەڵام دڵنیـات دەکەم شوقەی جوانیش دەوری خۆی هەیە و خزمەتێکی زۆرت دەکات.

لە ناکاوا و لە ناوەڕاستی نانخواردنەکەدا پرسی:- چۆن ئەم ماریشالەتان ناسی؟

باوکە رولاند، سەری هەڵبڕی وبەدەم بەسەرکردنەوەی بیرەوەرییەکانیەوە گوتی:

- بوەستە، من زۆرباش لە بیرم نەماوە. زۆر دەمێکە. ئاە، بەڵێ، دایکت لە دووکانەکەدا ئاشنایەتی دەگەڵدا پەیدا کردبوو، وانییە لویز؟ هاتبوو بۆ شتێک. ئیدی زۆرجاری دی دەهات. وەکو مشتەری دەهات، پاشان ناسیاویمان پەیدا کرد.

پییر، بە دەم فاسۆلیا خواردنەوە، کە وەکو گۆشت، بەنووکی چنگاڵەکەی دەنک دەنک لەتی دەکرد و دەیخوارد، دووبارە گوتی:- ئەم ناسیاویەتان کەی دەستی پێکرد؟

رولاند، دەفیکرەوە چوو، بەڵام هیچی بیر نەکەوتەوە، داوای لە ژنەکەی کرد، کە بیرێ بکاتەوە:

-خودایا چ ساڵێک بوو لویز، ناشێ لەبیرت چووبێ، تۆ بیرت باشە؟ خوایە، لە... لە... لەساڵی پەنجاوپێنج و پەنجاو شەشدا بوو؟ تۆ بیر بکەوە، یادگەی تۆ لە من باشترە؟

لویز ماوەیەک دەبیرەوە چوو، ئەوسا بە ڕاوێژێکی نەرمی پڕ متمانەوە گوتی:

-ساڵی پەنجا وهەشت بوو پیاوەکە گیان. پییر هەنگێ سێ ساڵان بوو، من دڵنیام بەهەڵەدا نەچووم، ئەوساڵە بوو کە منداڵەکان تووشی لەرز وتا بووبوون، ماریشال، کە هێشتا تازە ناسیاویەکی کەممان دەگەڵیا پەیدا کردبوو، یارمەتیەکی زۆری داین.

رولاند هاواریکرد:

- وایە وایە، بەڕاستی پیاوانە مشووری خواردین!
ئەوەبوو بە خۆی دەچوو لە دەرمانخانە دەرمانی بۆ دەهێنایت، بەتایبەتی کە دایکت لە بەر ماندوویەتی فریای هیچ نەدەکەوت و منیش مژوولی کاروباری دووکانەکە بووم. بەڕاستی پیاوێکی دڵئاوا و میهرەبان بوو. مەگەر خوا بزانێ چەند بە چاکبوونەوەت خۆشحاڵ بوو، چۆن لە باوەشی دەگرتیت، ئیدی لەوساوە بووین بە دۆست و برادەری گیانی بەگیانی.

ئەم هەواڵە کوت وپڕە، وەکو فیشەک لە دڵ ودەروونی پیر چەقی، لە دڵی خۆیدا گوتی: " باشە کە یەکەمجار منی ناسیوە، مشووری خواردووم، خۆشی ویستووم و لەباوەشی کردووم و کە من هۆکاری ناسیاوی ئەو بووم لە گەڵ داک وبابما، بۆچی هەموو سامانەکەی بە برایەکەم بەخشیوە و هیچ شتێکی بۆ من بەجێ نەهێشتووە؟ "

لەوە زیاتری نەپرسی، خەمین و خەمبار، شەکەت و ماندوو سەری لە بەرخۆ نا. بە قووڵی لە فکران ڕاچوو، هێشتا نیگەرانیەکەی هەوڵی نەڕەوی بووەوە، ئەمەشی هاتەسەر.

زۆر، زوو لە ماڵ وەدەرکەوت، بە ناو جادە و کۆڵانان کەوت. ئەو مژ و دوومانەی لە شار ئاڵابوو، هێندەی دی شەوەکەی لە سەردڵ قورس دەکرد، تەمێکی چڕ، پیاو دڵی تێک هەڵدەهات، لە دووکەڵێکی بۆگەن دەچوو، کە ئەرز و ئاسمانی گرتبوو. بەسەر گڵۆپە غازەکاندا دەڕۆیی و، وات دەهاتنە بەرچاو کە کوژاونەوە. شۆستەکان، وەکو شەوانی شەختە وخوسار، لینج و خز بوون. لە تۆ وایە هەرچی بۆنی ناخۆشی ماڵانە، لە کون وکەلەبەران و مووبەق و

بەلووعانەوە هاتوونەتە دەرێ و تێکەڵ بە تەم ومژە گەڕۆکە دزێوەکە بووە.

پییر، کە خۆی کووڕ کردبووەوەو هەردوو دەستی لە گیرفانی نابوون، حەزی نەدەکرد، بەم سەرمایە لە دەرەوە بسووڕێتەوە، بۆیە چوو بۆلای ماروڤسکو.

دەرمانسازە پیرەکە، هەمیشە لە ژێر گڵۆپە غازیەکەدا دەنووست، وەختایەک چاوی بە پییر کەوت، وەکو سەگێکی ئەمەکدار خۆشی دەویست، ڕابوو، کێشمانێکی خۆی دا و چوو دوو پەرداخ شەرابی کشمشی هێنا.

دکتۆر لێی پرسی:- ئێ، دەگەڵ شەرابەکەتا گەیویتە کوێ؟

یارۆی پولونی، بۆی باسکرد کە چوار قاوەخانە وباڕی سەرەکی شارەکە، ڕازی بوون بیخەنە بازاڕەوە. هەروەها ڕۆژنامەی ( بورجی کەنار ) و ڕۆژنامەی ( سیمافور ) لە هاڤەر ئیعلانێکیان بۆ بڵاوکردۆتەوە، کە لە بری ئەوە هەندێ دەرمان بە نووسەرەکانیان بدات. ماروڤسکو، دوای بێدەنگیەکی زۆر، پرسیاری ئەوەی کرد کە ئاخۆ جان بڕیاری داوە میراتیەکەی وەربگرێت، ئەوسا دوو سێ پرسیاری گونگی دیکەی دەربارەی هەمان بابەت کرد.. پییر، ڕاچڵەکی، لەو باوەڕەدا بوو گوێی لە بیرەکانیەتی، دەیان خوێنێتەوە، تێیان دەگات، چاوەکانی دەخوێنێتەوە، لە تۆنی دەنگیا ئەو پەیڤ و ڕستانە دەخوێنێتەوە کە دێنە سەر زمانی و نایانڵێت، نەیدەوتن، چونکە زۆر زیرەکە، زۆر سرکە، زۆر بە پارێزە.

ئێستا دڵنیابوو کە یارۆی پیرەمێرد لە دڵی خۆیدا دەڵێت:

" باشە بۆ ڕێگەی دەدەن کە ئەم میراتە وەربگرێت و خەڵکی

بەخراپە باسی دایکتان بکەن و ببێت بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانان ". کێ چوزانێ! لەوەیە قەناعەتی وابێ کە جان کوڕی ماریشالە. بێگومان باوەڕی وایە! چۆن باوەڕی وانابێت! زۆر شتی دیکەش لەگێنە، دەشێت و ئەولاتریش! باشە ئەم بەخۆیشی، پییر کە کوڕیەتی، سێ دانە ڕۆژە بەهەموو توانای خۆیەوە، لەگەڵ هەموو لێدانێکی دڵیا، بەگژ ئەم گومانەدا ناچێت تا ئەقڵی خۆی بخەڵەتێنێت؟ بەگژ ئەم گومانە سامناکەدا نەدەچوو!

سەرلە نوێ، لە ناکاوا، ئارەزووی ئەوەی کەوتەسەر، کونجی تەنیایی بگرێ، تا بیر بکاتەوە، لەگەڵ خۆیدا گەنگەشەی مەسەلەکە بکات، تا بێ هیچ لاوازییەک، بێ هیچ واز وازی و دوو دڵییەک، ڕوو بەڕووی ئەو ئەگەرە کرێت و دزێوە ببێتەوە. ئەو ئارەزووە زۆری بۆ هێنا، پێش ئەوەی پێکە شەرابەکەی بخواتەوە هەستا وتەوقەی دەگەڵ دەرمانسازە حەپەساوەکەدا کرد و، دووبارە بە نێو ڕێگاوبانە بەتەمتوومانەکە کەوت.

لە دڵی خۆیدا پرسی: " بۆچی ئەم ماریشالە هەموو سەروەتەکەی بە جان بەخشیوە؟ " ئێستا بەغیلی و حەسوودی هاندەری نەبوو کە تاقیبی ئەم مەسەلەیە بکات، هەروەها، ئەو گومانە نائاساییەش نەبوو کە سێ دانە ڕۆژ بوو پێوەی دەتلایەوە و دەیشاردەوە، بەڵام هاندەر و ئەنگێزەی ترس بوو لە شتێکی زۆر ترسناک، ترس لەوەی کە بەخۆیشی باوەڕ بەوە بێنێ کە جانی برای کوڕی ئەو پیاوەیە.

نەخێر، باوەڕی وانەبوو، تەنانەت نەیدەتوانی ئەو پرسیارەش، کە بۆنی تاوانی لێدەهات، بکات! وێڕای ئەوەش

دەبوایە بە بەردەوامی ئەو سووکە گومانە هەرگیز نەشیاوە، لە خۆی دووربخاتەوە. بەڵام پێویستی بە ڕوناکی، بەیەقین، بە دڵنیایی تەواو بۆ دڵەی نیگەرانی هەبوو. چونکە لە دنیادا جگە لە دایکی کەسی دی خۆش نەدەویست. بەخۆی ئەمشەو وێڵ و سەرگەردان، بەتاقی تەنیا لەگەڵ بیرەوەرییەکانیا، تاقیبێکی وردی ئەم مەسەلەیە دەکات، قوڕی بنی دەردێنێ و بە ئەقڵانیەت دەگاتە حەقیقەتی ڕوون و زوڵاڵ، ئەوسا هەموو شتێک تەواو دەبێت و، پاشان دەڕوا، دەخەوێ و لەوەی پتر بیر ناکاتەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: " با بزانین، با جارێ بویەر و ڕووداوەکان شەن وکەو بکەین، هەموو شتەکان وەبیر خۆ دێنمەوە، لە زەینی خۆدا تاوتۆیی دەکەم، هەڵس وکەوتی وی لەگەڵ براکەم و لەگەڵ خۆما وەبیر دێنمەوە، هەموو ئەو سەدەم وهۆکارانە هەڵدەسەنگێنم کە بوونەتە هۆی ئەم فەزڵدانەی جان بەسەر مندا.. لە دایک بوونی جانی دیوە؟ بەڵی، بەڵام منی لەپێش ئەودا ناسیوە. ئەگەر بەبێدەنگی و بە دزییەوە دایکمی خۆش بویستبایە، منی بەسەر جاندا تەفزیل دەدا، چونکە ئەو شتە بەهۆی منەوە و بەهۆی نەخۆش کەوتن و تاو لەرزی منەوە ڕوویداوە و بووە بە دۆستی داک وبابە میهرەبانەکەی من، ئەقڵ و لۆژیک وا دەخوازێ، منی بۆ ئەو بەخشینە هەڵبژاردبا. زۆر دەگەڵ مندا بەسۆز و میهرەبان بوو. بەڵام سەبارەت بە براکەم، کە دەیبینی لەبەردەمیا گەورە دەبوو، هەست وسۆزێکی غەریزی تایبەتی هەبوو. "

یادگەی خۆی داتەکاند، زۆر بەجدی، بەهەموو ئاوەزی خۆیەوە، وەردی دەدایەوە، دەی پشکنی، بۆ ئەوەی جارێکی

دی، به هەمـوو شـتەکاندا بچێـتەوە، بچێـتە بـنج وبنـاوانی دەروون و نیهادی ئەو کابرایەوە کە پییر لەو سـالانەدا کە لە پاریس بوو، نەیدەحوباند.

هەسـتیکرد، ڕێکـردن و هەنگـاوە خاوەکـانی، کەمێـک بیرکـــردنەوەی دەشـــێوێنن، تەرکیـــزی کەم دەکەنەوە، بیرکـردنەوەی سسـت دەکەن و بەری یـادگەی دەگـرن. پێویستە لە شـوێنێکی بەرینی چۆڵدا بوەستێ، تا چاوێک بە ڕابـردوو و بە سـەر بـویەرە نادیـارو پەنهانەکانـدا بگێڕێـت، چـاوگێڕانێکی ورد، کە هـیچ شـتێک نەبوێرێـت، بریـاری دا بـڕوات، وەکـو دوێشـەو لە سـەر کورنیشـە لاوەکیـیەکەی بەندەرەکە دانیشێت. وەختایەک لە بەندەرەکە نزیک بووەوە، گوێی بە ناڵەناڵێکی خەمناک زرینگایەوە. نـاڵەیەکی شـووم کە لە بۆڕەی گـاجووت دەچوو، نـاڵەیەک لەناوەندی دەریـاکەوە دەهـات، بەلام لە بۆڕەی گـاجووت دووردوودرێژتـر بـوو. ئەو نـاڵە وهـاوارە، دەنگـی ئـاژیری کەشـتیەکی وێـڵ بـووی نێـو مژودوومانان بوو.

تەزوویەک بەسـەراپایدا هـات، دڵـی گوشـی، لە ڕۆح و مێشـکیا زرینگـایەوە، وای هەسـتکرد، هـاوارە و بـۆ ئەو هێنراوە. دەنگ و ناڵەیەکی دی بەرز بووەوە، وەکو نـاڵەکەی پێشوو وابوو، پێدەچوو کەمێک دوورتر بێ، ئەوجا لە نزیک ئەوەوە، دەنگی ئاژیری پچڕپچڕی بەندەرەکە بەرز بووەوە.

پییر بلەز خۆی بە کۆڕنیشە لاوەکییەکەدا کرد، بیری لە هـیچ نەدەکردەوە، ئیدی بە ڕەزامەندییەوە خۆی بە تـاریکیە تراجیدیە پڕ ناڵە ناڵەکەدا کرد. وەختایەک لە کۆتایی شێوستە وکۆڕنیشـەکەدا ڕۆنیشـت، چاوەکـانی نوقانـدن تـا ئەو پەڵە ڕونـاکییە کارەباییـانە نەبینێ کە تەم ومژەکە داپۆشـی بوو،

وڕێنــــوێنی کەشـــــتیەکانی دەکــــرد کە بە شــــەوان خــــۆ بەبەندەرەکەدا بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی ڕوناکی ئەو بۆرجە سوورە نەبینێ کە لەسەر کۆڕنیشـە لاوەکییەکە چەقێنرابوو، هەرچەندە چاو بەزەحمەت دەیبینی و فەرقی دەکرد. ئەوسا نیوە ئـاوڕێکی دایەوە، هەردوو ئانیشکی دادایە سـەر تـاوێرە گرانیتەکـان و دەم وچـاوی لە نێـو هەردوو دەسـتی نـا. لە مێشکی خۆیدا، بەبێ ئەوەی زار هەڵێنـێ، بەردەوام دەیگوت و دەیگوتەوە: " ماریشـال، ماریشـال " وەکو ئەوەبوو بـانگی بکات کە بێت بۆلای. لە ناکاوا، لەبەر چـاوە نوقاوەکانیا قوت بووەوە، چۆنی بینی بوو، ئـاوابوو، پیاوێک بـوو لە تەمەنـی شەست ساڵیدا. ڕدێنی تیژ وسپی، برۆکانی ئەستوور وپاک سـپی بـوون. نە درێژبـوون نە کورتەبـالا، ڕووی گەش وخۆش، چـاوانی کەوەیـی وجـوان، سـیمایەکی ئینسـانیانەی سادە و میرەبانی هەبوو. پییر و جانی بە " کوڕە ئازیزەکانم " بانـگ دەکـرد. پێنـاچوو فەرقیـان بکـات، فەزڵـی کەسـیان بەسەر کەسیاندا بدات، پێکەوە دەعوەتی شێوی دەکردن.

پییـر، کەوتە بیرکـردنەوە لەو پەیـڤ وقسـانەی کە کـابرا لەگەڵ خۆیـدا بـردنیە ژێـر گڵەوە، لە هەڵس وکەوتەکـانی، لە تـۆن و ڕاوێـژی دەنگـی، لە نـۆڕین و تەمەشـاکردنەکانی. بەرەبەرە دەیهێنایەوە خەیاڵی خۆی، شوقەکەی کە کەوتبووە شـەقامی ترونشـیەوە هێنـایەوە بەرچـاوی خـۆی، ئەوەی هێنـایەوە خەیـاڵی خـۆی کەچـۆن لەوێـدا پێشـوازی ئەم وبـرایەکەی دەکـرد و لە دەوری خـوانەکە دایـدەنان. دوو کـارەکەری پیـر خزمەتیـان دەکرد و ماڵەکەیـان بـۆ بەڕێـوە دەبرد، ئەم دوو پیرەژنە، دەمیان بەوە ڕاهاتبوو کەبەم دوو منداڵە بڵێن " جەنـابی پییـر " و " جەنـابی جـان ". ماریشـال،

هەرکــاتێ ئەم دوو کــورە دەچــوون بــۆلای بە گەرمــی پێشــوازی دەکــردن، هەردوو دەســتی درێــژ دەکــرد و هەرچــۆنێ ڕێــک بکەوتبــا، بەدەســتی چەپ تەوقەی دەگەڵ یەکێکیــان و بەدەســتی ڕاســت تەوقەی لەگەڵ ئەوی دیــدا دەکرد. دەیگوت: " بەخێر هاتن کوڕەکانم، ئاگاتان لە هەواڵی داک وبابتان هەیە؟ نامەم بۆ نانێرن. "

زۆر بە ئاو وتاو باسی شتە ئاساییەکانی دەکرد، هیچ شتێک لە زەینی ئەم پیاوەدا نائاسایی نەبوو، زۆر پیاوێکی ڕووخۆش وبە ماریفەت و بە لوتف بوو. بێگومان دۆست وبرادەرێکی باشی هەردووکیان بوو، یەکێک بوو لەو دۆستە باشــانەی کە زۆر مێشــکی هاوڕێکــانی مــژوول نەدەکــرد، چونکە پیاوێکی ئەمەکدار بوو. ئیدی هەر بیرەوەری بوو و دەهاتەوە بیری پییر..

ماریشال زۆرجار کە بە خەمباری ئەمی دیتبا و هەستی بکردایە وەکو خوێندکارێک بێ پارەیە، بڕێک پارەی دەدایێ، لە خــۆیەوە پــارەیەکی زۆری بەقەرز دەدایــێ، هەنــدێجار دەگەیــیە چەنــد ســەد فرانکێــک، جــاری وابــوو، یەکێکیــان لە بیریــان دەچــۆیەوە و ئەو قەرزە نەدەدرایەوە. ئیــدی کــابرا خەمــی پێویســتیەکانی ئەمــی دەخــوارد، ئەمەش مانــای ئەوە بوو، ئەم کوڕەی ( پییر ) خۆشدەویست.

ئەدی.. ئەدی، بــۆ هەمــوو ســەروەتەکەی بە جــان بەخشــیوە؟ نــا، بە ڕواڵەت کــوڕە بچــووکەکەی لە کــوڕە گەورەکە خۆشتر نەدەویست، بە ڕواڵەت فەرقی نەدەکردن، بە ڕواڵەت بەیەک چــاو ســەیری هەردووکیــانی دەکــرد، بەهەمــان ئەنــدازە هاوســۆزی لەگەڵــدا دەکــردن، کەواتە.. کەواتە.. ئاخۆ هۆیەکی شاراوەو نادیاری ئەوەندە بەهێز بوو

کە واداری بکـات، وەسـێت بکـات هەمـوو سـەروەت و سامانەکەی بدرێت بە جان و، هیچ شتێک بە پییر نەدرێت؟

هەرچەنـد بیـری لەوە دەکـردەوە، بە خەیـاڵ دەگەڕایەوە بۆ ئەم ساڵانەی دوایی ولەو ساڵانەدا دەژیا. دکتۆر هەرچی سەری دێنا وسەری دەبرد، باوەڕی نەدەکرد ئەو فەرقەی کردبن.

ژانێکی تیژ و بێزارییەکی لە وەسف نەهاتگ سەر ودڵی گرت، دڵی خاو بووەوە، سست وەکو پەڕۆیەکی پەرێشان. هەستی کرد دڵی داڕما، بەبێ وچان خوێن دەدەڵێنێ، وەکو شەپۆلان خرۆشا. بە دەنگێکی نەوی ولە بن لێوانەوە، وەکو کەسێک مۆتەکە سواری سەری بووبێ و وڕێنە بکات: " پێویستە بزانم، خودایا، دەبێ بزانم، هەموو شتێک لە بنج وبناوان بکەم ".

گەڕایەوە بۆ دوورتر، بۆ ئەو ڕۆژان و ڕۆژگارانە کە داک وبابی لە پاریس دەژیان. وێنەی دەم وچاوەکان لێی هەڵـدەهاتن، خۆیـان بەدەسـتەوە نەدەدا، بیرەوەرییەکـانی تێکەڵ بوون. هەوڵیدا لە نێو دەم وچاوەکاندا، دەم وچاو و ڕوخساری ماریشال بدۆزێتەوە. قژەکەی بناسێتەوە، زەرد بوو، قاوەیی بوو، ڕەش بوو؟

بۆی نەدۆزرایەوە، دوا ڕوخساری کابرا، ڕوخساری پیری، هەموو وێنەکانی پێشووی دەسڕییەوە: بە تەواوەتی بیری کەوتەوە، زۆر لاوازتر بوو، دەستەکانی نەرم، زۆربەی کات چەپکێ گوڵی لەگەڵ خۆیدا دێنا، باوکی هەمیشە ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە: " دیسان چەپکە گوڵ! ئەمە گەوجاتیە گیانە، لە خۆڕایی پارەی خۆت دەدەی بە گوڵ ". ماریشال، بەرسڤی دایەوە: " گوێ مەدەیە خۆم ئەمەم زۆر

پێخۆشـــە ˝ لە ناكـــاوا دەنگـــی دایكـــی دەڵێـــت: ˝ ســـوپاس دۆســـتەكەم ˝ دەنگـی دایكـی بەجـۆرێ لە دەروونیـا دەنگـی دایەوە وەكـو ئەوەبـوو ئێسـتا بـێ. بەوجـۆرە وشـەكانی دەدركاند بۆئەوەی لەیادگەی كوڕەكەیدا نەخش ببێت.

كەواتە ماریشـال گـوڵی بـۆ دێنـان، ئەم مشـتەرییەی كە هاتوچۆی ئەم دووكانە بچووكەی دەكرد، گوڵی بۆ ژنەكەی ئەم زەڕنـگەرە خـاكیە دێنـا. باشـە ژنەكەی خۆشدەویسـت؟ باشـە ئەگەر خۆشـی نەویسـتبێ، چـۆن بـووە بە هـاوڕێ و دۆستی ئەم جووتە دووكاندارە؟ پیاوێكی بە ئەدەب و سەلار بوو. زۆرجار دەگەڵ پییردا باسی شیعر وشـاعیرانی دەكرد! هەڵبەتە وەكو كەسێكی شـارەزا ئەدەبیاتی هەڵنەدەسـەنگاند، بەڵام وەكـو بورژواكـان مەیلـی لە ئەدەب هەبـوو. دكتـۆر زۆرجـار كە ئەو مەیـل و سـۆز و میهرەبـانیەی لـێ دەبینـێ، بزەیەكـی بەمانـاوەی دەهـاتێ و لە دڵـی خۆیـدا بە نـیمچە گەوجـی دەزانـی. بـۆی دەردەكەوت كە ئەم پیـاوە عـاتیفی و ڕۆمانسـیە، نـاتوانێ ببێـت بە هـاوڕێی بـابی كە لە ڕادەبەدەر واقیعـی و مـادی بـوو و وشـەی ˝ شـیعر ˝ بەلایەوە دەیكـردە گەوجایەتی.

كەواتە ئەم ماریشـالە، گەنجێـك بـوو دەوڵەمەنـد، هـیچ كـارێكی نەدەكـرد، زۆر ئـارام وئامـادەی هەر سـۆزدارییەك بـوو، ڕۆژێـك بە ڕێـكەوت خـۆی بە دووكـانەكەدا دەكـات، چاوی بە ژنە دووكاندارە جوانەكە دەكەوێ، شـتی دڵخـوازی خـۆی دەكـڕێ و دەگەڕێتەوە. بەرەبەرە لەگەڵ ڕۆژدا ڕووی دەكـرێتەوە و بە مجـامەلەیەكی زیـاترەوە قسـان دەكـات، ئەوەندە شت دەكڕێ كە هەقی ئەوەی هەبێ بچێتە مـاڵی ژنە، بەدەم ئەم ژنە گەنـجەوە پێبكەنێت، تەوقە دەگەڵ مێردەكەیـدا

بکات. ئەوسا.. ئەوسا.. ئاه! خودایە... پاشان؟ خووی داوەتە نۆبەرەکەی، مجامەلەی کردووە، منداڵی زەرەنگەرەکە، تا منداڵی دووەم لە دایک بووە، ئەوسا تا مردووە هەر بە گۆنگی و مەندی ماوەتەوە. پاشان دوای ئەوەی لە گۆڕ دەنرێ، جەستەی دەڕزێ، ناوی لە لیستی زندووانەدا دەسڕێتەوە، بوونی بۆ هەتا هەتایە ون دەبێت، پێویستی بەهیچ پارێزێک، ترسێک، شاردنەوەیەک نامێنێ، هەموو سامانەکەی بە کوڕی دووەم دەبەخشێت!.. بۆچی ئەمە دەکات؟.. ئەم پیاوە زیرەک بوو.. بێگومان وای مەزەندە کردووە، وای بۆ چووە، کە ئەم کوڕە لەوە، هی ئەوە. کەواتە ژنەکەی لە خشتە بردووە؟ باشە ئەگەر جان کوڕی ئەو نەبێ، چۆن ئەو کارە دەکات؟

لە ناکاوا، بیرەوەرییەکی ترسناک بە خەیاڵی پییردا هات، ماریشال کابرایەکی موو زەردی سوور وسپی بوو، موو زەرد و سوور وسپی وەکو جان. وێنەیەکی بچووکی بیرهاتەوە، کە وەختایەکماڵیان لە پاریس بوو، لە سەر کوورەی هۆڵەکە دانرابوو، ئەو وێنەیە دیار نەماوە، لە کوێیە؟ ون بوو یان شاردرایەوە؟! خۆزگە جارێکی دی دەی بینی یەوە، ڕەنگە دایکی، لە سەبەتەیەکا یان لە سەندووقۆکەیەکدا کە پاشماوەی ئاشقینی یەکانی شاردبێتەوە، هەڵی گرتبێت.

ئەم بیرۆکەیە، زۆری ئەزیەت دەدا، لە ناوەوە ئەنجن ئەنجنی دەکرد، لە ناخی ناخیەوە ئاهێکی کورتی هەڵکێشا، کە ئەوکی هێنایە ژان. لە ناکاوا دەنگی ئاژیری بەندەرەکە کە لە نزیکی ئەمەوە، وەکو ئەوەی بە دەردەکەی ئەمی زانی بێ، بەرز بووەوە. بە هاوارێکی شێواوی، بەرزتر لە

دەنگدانەوەی هەورە تریشقە وەڵامی دایەوە، دەنگی دەنگ نەبوو، ئەوەندە گەورە وترسناک بوو، دەنگی بایەکە و هەموو شەپۆلەکانی خستە ژێرەوە و بە ناو تاریکی سەر دەریاکەدا کە لە مژ ودووماندا نقوم بووبوو و نەدەبینرا، بڵاو بووەوە.

لە نێو تەمتوومانە دوور و نزیکەکانەوە، شەو، ناو بەناو ئەو جۆرە هاوارانە بەرز دەبوونەوە، ئەم هاوارانەی کە لە کەشتیە گەورەکانەوە بەرز دەبوونەوە. دوای ئەوە هەموو شتێک کڕوکپ و بێدەنگ بوو.

پییر، چاوانی کردنەوە، تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، پێی سەیر بوو کە لێرە، کە لەو کابووسە بێدار بووەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: " من شێتم، من گومان لە دایکم دەکەم! " دڵی پڕبوو، لە خۆشەویستی ومیهر، لە پەشیمان بوونەوە، لە تۆبە، لە داخ و کەسەر. دایکی! ئاخر هەرچەندە دایکی زۆر باش دەناسی، چۆن توانی ئەو تۆمەتەی بداتەپاڵ؟ باشە ڕۆحی ئەم ژنە و، ژیانی سادە وبێگەردی ئەم ژنە لە ئاوی زوڵاڵ پاکترنییە؟ هەرکەس بیدینێ و بیناسێت ناتوانێ کەمترین گومانی لێبکات، هیچ گومانێک هەڵناگرێت. ئێستا کوڕی خۆی گومانی لێبکات! ئاخ! خۆزگە، هەنووکە و لەم کاتەدا، دەیتوانی لە هەمێزی بگرێت. چەند حەز دەکات ماچی بکات. نەوازشی بکات، چەند حەز دەکات، لەبەردەمیا بکەوێتە سەرچۆکان و داوای بووردنی لێبکات! ئایا دایکی، بابی خاپاندووە؟ بێگومان پیاوێکی باش، ئابڕوومەند، سەرڕاست بوو لە کار وکاسبیەکەیدا، بەڵام ڕۆح ورەوانی، لە ئاسۆی دووکانەکەی هێوەتر نەدەڕۆیی. ئەم ژنە زۆر جوانە پێشتر چۆن بووە. ئەو، ئەوە دەزانێ و هێشتاش

قەناعەتی وایە کە ژنێکی ڕوح سووک و نەرم ونیان وڕۆمانسی وبەسۆزە، چۆن ڕازی بووە مێرد بە پیاوێک بکات کە زۆر لەو جیاواز بووە؟ جا ئەمە پرسیاری بۆ چییە؟ وەکو هەر کچێک لەو کچانەی شوو بە هەر گەنجێک دەکەن کە دەتوانن مارەیی بدەن. ئەوانەی باوکیان بۆ داخوازی پێشیان دەکەون، ئیدی بەوجۆرە شووی پێکردووەو، خێرا لە شەقامی مونمارتردا دووکانەکەیان کردووەتەوە. ئیدی لە پشت پێشخوانی دووکانەکە دانیشتووە و پێشوازی کڕیارانی کردووە ودڵی بە بارەگا تازەکەی خۆش بووە، ئیدی ئیش وکاری هاوبەش و. پەیداکردنی بژێوی شوێنی خۆشەویستی ومیهرومەحەبەتی لە زۆربەی دووکان وکۆگا بازرگانیەکانی پاریسدا گرتووەتەوە. ئیدی بەنیازی کاروکاسبی و پەیداکردنی سەروەت و سامان بۆ هەردووکیان، بەدڵ وگیان دەستی بەکارکردن کردووە. ئیدی ژیانیان بەمجۆرە بردووەتە سەر: بە ڕۆتینی، بەئارامی، ئابڕوومەندانە، بەبێ هیچ خۆشەویستی یەک!... چی، بەبێ خۆشەویستی؟ ماقووله هیچ ژنێک بەبێ خۆشەویستی هەڵبکات؟ ژنێکی گەنجی خشیک کە لە پاریسدا بژی، کتێبان وەخوێنێت، چەپڵە بۆ ئەکتەرانی خۆشەویستی لە سەر شانۆ لێبدات. ماقووله، هەموو تەمەنی گەنجایەتی خۆی بەرەو پیری بەڕێبکات، بەبێ ئەوەی تاقە جارێک دڵی داخورپابێ؟ ئەمە سەبارەت بە هیچ ئافرەتێکی دی ناچێتە ئەقڵیەوە، ئەدی بۆ سەبارەت بەدایکی دروست بێ و ئەقڵی بیگرێت؟ هەڵبەتە توانیویەتی وەکو هەر ئافرەتێکی دی خۆشەویستی بکات! ئەدی بۆ لەوان جیاوازبێ، با دایکیشی بێت؟ ئافرەتێکی گەنج بووە، بە هەمان هەستی شاعیرانەوە،

که ختووکەی دڵی گەنجان دەدات. لە دووکانێکدا لە نزیکی مێردە بازاڕییەکەیەوە نیمچە دەستبەسەر حەپس بووە، سەری زمان و بنی زمانی مێردەکەی هەر پارە و کاروکاسبی وبازرگانی بووە، بەڵام ژنە خەونی بە تریفەی مانگ، بە سەفەر، بە ڕاموسانی سایەی تاریکی شەوانە بینیوە. پاشان، ڕۆژێ پیاوێک، وەکو ئاشقانی ناو ڕۆمانان و بەهەمان دەم و دووی وانەوە خۆی بە دووکانەکەیدا دەکات، ژنە خۆشی دەوێ. بۆچی خۆشی نەوێت؟

ئەوە دایکی بوو! دەی باشە، دەکرێ ئەوەندە کوێر و گەوج وگەمژە بێ، خۆی لە گێلی بدات و ئەم حاڵە ڕوون و ئاشکرایە نادیدە بگرێ، هەر لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە دایکیەوە هەیە!

ئایا خۆی ڕادەست کردووە؟ هەڵبەتە، مادامێکی ئەم پیاوە ماشقەی دیکەی نەبووە، مادام وەفاداری ئەم ژنە گۆشەگیرەیە کە بەرەو پیری دەچوو، هەڵبەتە مادام هەموو سامانەکەی بە کوڕەکەی، بە کوڕەکەیان بەخشیوە!

پییر، هەستا، بەدەم ئەو بیروخەیاڵە شێتانەیەوە دەلەرزی، دەیویست یەکێک بکوژێت، هەردوو باسکی کردبوونەوە، دەستەکانی بۆ لێدان، بۆ وەشاندن، بۆ ڕاکێشان، بۆ خنکاندن ئامادەکردبوو! لێدان وڕاکێشان و خنکاندنی کێ؟ هەموو کەسێک، باوکی، براکەی، ماریشال کە مردبوو، دایکی!

بە پەلە گوڕی بەستەوە تا بگەڕێتەوە. چی بکات؟ وەختایەک بەلای بورجێکی نزیکی عامودێکی ئیشارەتاندا تێپەڕی، ئاژیری خەتەرەکە، دەنگێکی تیژی لێبەرز بووەوە،

ڕێک بەر دەم وچاوی کەوت. غافڵگیر بوو، پێی هەڵنووتا، ڕەتی برد، کەوت و بەرەو بەربەستە گرانیتەکە غل بووەوە، لەوێ، شەکەت و ماندوو، داهێزراو ڕۆنیشت، دەنگەکە قەڵەمی دەست وپای شکاندبوو.

ئەو کەشتیە بوخارییەی یەکەمجار وەڵامی ئاژیرەکەی دابووەوە پێدەچوو زۆر نزیک بووبێتەوە، خێزاوەکە زۆر بەرزبوو. پییر، ئاوڕێکی دایەوە، لایتە سوورەکەی پێشەوەی کەشتیەکەی بەدی کرد، لە تەم ومژا بە ئاستەم دیاربوو. دەنگێک لە پشتیەوە بەرز بووەوە، دەنگی گڕی کاپتنێکی پیر بوو:

- ناوی کەشتیەکە؟

دەنگی کاپتنێک کە لەسەر بەندەرەکە وەستابوو، لە ناو تەمتوومانەکەوە بەرسڤی دایەوە: - سانت لوسیا.

- وڵات؟
- ئیتاڵیا.
- بەندەر؟
- ناپۆلی.

پییر، وای هاتەبەر خەیاڵ کە تەپو دووکەڵی ئاگری گڕکانی فیزوف دەبینێ، لە کاتێکا لە بناری گڕکانەکەدا، مێرووان بەسەر باخێکی پرتەقاڵی سورنت یان کاستیلامارادا دەسووڕانەوە!

زۆرجار بەجۆرێ بیری لەم ناوە باوانە دەکردەوە، وەکو ئەوەی بە دیمەنا بیانناسێت! ئاخ، خۆزگە ئێستا بیتوانیبا بۆ شوێنێک بڕۆیشتبا کە هەرگیز نەگەڕاباوە، نامەی بۆ هیچ کەسێک نەنووسیبا، بەکەسی نەگوتبا کە چی بەسەر هاتووە! بەڵام نا، دەبێ بگەڕێتەوە، بۆ ماڵی بابی بگەڕێتەوە

و له سـەر جێگـاکەی خـۆی بنووێـت، دەی کێشـە نیـیە، ناگەڕێتەوە، چاوەڕوان دەکات تا ڕۆژ دەبێتەوە، دەنگی ئاژیر و شووتی دەریاکەی پێخۆش بوو.

دووبـارە هەسـتا، وەکو ئەفسـەرێک، لە سـەر کەشـتیەک نۆرە ئێشک بگرێ. کەوتە ڕاوێچکە و هـاتوچۆ. کەشـتیەکەی دیکە، دوابەدوای کەشـتی یەکەم نزیـک بـووەوە، زۆر زەلام، سەیر بوو. کەشتیەکی ئینگلیزی بوو و لە وڵاتی هندستانەوە دەگەڕایەوە. زۆر کەشـتی دیـکەی بینـی کە دەگەڕانەوە، یەک لە دووی یەک، لە تاریکیە گونگەکەوە دەردەچوون .

تەمتوومـانەکە ئەوەنـدە نمـدار بـوو تەحەمـوول نەدەکرا، پییـر بەرەو ناوشـار ملـی ڕێگـای گـرت. سـەرما زۆری بـۆی هێنـا، خـۆی بە قاوەخـانەی دەریاوانەکاندا کرد، تـا بـادەیەکی گەرم بخواتەوە، کە بادە گەرمەکە دەم وزمان وئەوکی گەرم داهێنـا، سـەرلەنوێ ورەی وەبەر هـاتەوەو ئومێد وهیـوایەکی تازەی لە دڵ و دەروون گەڕا.

ڕەنـگە، هەڵە بـووبێ کە گـوایە دایکـی بـاش دەناسـێ، بێگومـان شـێتاتیە پەتەرییەکەی هەڵە بـوو؟! کۆمەڵێک بەڵگە وبورهـانی کەڵەکە کـرد، بەرزی کـردنەوە، ڕێـک وەکـو ئەو قەراری تۆمەتبـارکردنەی دژی کەسـێکی بێتـاوان، کەوا تەسـەور دەکـرێ تاوانبـارە، بەرزدەکـرێتەوە تـا بە ئاسـانی تاوانەکەی بەسەرا ساغ بکرێتەوە. کە بنووێ بەجۆرێکی دی بیر دەکاتەوە.

بـۆیە گەڕایەوە تـا بنووێـت، دوای هەوڵ وگێنگڵ دانێکـی زۆر خەوی لێکەوت.

## (٥)

دکتۆر دوای ئەوەی بۆ ماوەی سەعاتێ دووان خەوێکی پچڕپچڕ وناخۆشی لێکەوت، بێدار بووەوە. ژوورەکەی تاریک، گەرم و داخراو بوو. پێش ئەوەی دووبارە بکەوێتە بیرکردنەوە، هەستی بە دڵتەنگییەکی بەژان و سوێ کرد، پیاو کە بە خەم و نیگەرانییەوە بخەوێت، جۆرە خەمینی وکەسەرێکی لە لا دروست دەبێت.

پێدەچێ ئەو شۆکەی دوێنێ ورِی کردین، بەدەم خەو و ئیسراحەتەوە داخزی بێ ولە گۆشت و جەستەمان رۆچووبێ و نەخۆشی خستبێت و لەرزوتای لێ هێنابێ.

لە ناکاوا وەخۆ هاتەوە، لە ناو جێگاکەیدا دانیشت، ئەوسا بەرەبەرە، هەموو ئەو بەڵگە و بورهانانەی وەبیر هێنانەوە کە لە کورنیشی بەندەرەکەدا لە میانی هاواری ئاژیرەکانەوە، عەزابی دڵ ورِۆحیان دا . تا زیاتر بیری دەکردەوە، گومانی کەم دەبووەوە. هەستی دەکرد دەستێک بەرەو یەقینێکی لە توانا بە دەری ڕادەکێشێت، تینووی بوو، گەرمای بوو، دڵی خێراخێرا لێی دەدا، هەستا تا پەنجەرەکە بکاتەوە، هەوای پاک هەڵمژێ، کە وەستا دەنگێکی سووک لە دیوارەکەوە هاتەگوێ.

جان، لە غورابی خەوا بوو، بە ئەسپایی دەی پرخاند. ئەوە! هەست بە هیچ ناکات، پێشبینی هیچ ناکات! پیاوێک، کە ناسیاوی دەگەڵ دایکیاندا پەیدا کردبوو، هەموو سامانەکەی بەم بەخشی بوو، سامانەکەی وەرگرتبوو و ئەم کارەی بەلاوە دروست وئاسایی بوو.

بێ خەم وخەیاڵ، دەوڵەمەند ودارا دەخەوت، ئاگای لەوە نەبوو براکەی لە چ دڵتەنگیەکدایە و بە چ ئازارێکەوە

دەتلێتەوە. هەستا، زۆر لەم بوونەوەرە پەست بوو کە بێ خەم وخەیاڵ، ئاسوودە و شادمان دەی پرخاند.

خۆزگە دوێنێ لە دەرگاکەی دابا، بچووبا ژوورەکەی و لەلایەوە دانیشتبا، دوای ئەوەی لە ناکاوا هەستابوو، بیگوتایە: " جان، نابێ ئەو بەخشیشە قەبووڵ بکەی کە سبەی دەبێتە مایەی گومان لە دایکمان " بەڵام ئەمڕۆ نەیدەتوانی ئەم قسەیە بکات. ناتوانێ ئەو قسەیە بە جان بڵێ، چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە لە بابیان نییە، کوڕی کابرایەکی دیکەیە.

جا ئێستا، ئێستا دەبێ ئەم نەنگ و شەرمەزارییەی کە خۆی کەشفی کردبوو، لە دڵی خۆدا بشارێتەوە، بینێژێت، لە گۆڕی بنێت. ئەم پەڵە زەقە لە هەموو خەڵکی وەشێرێت و بە کەسی نەڵێت، تەنانەت لە براکەشی، بەتایبەتی لە براکەی بشارێتەوە.

ئیدی لۆس بوو، بیری لە قسە وقسەڵۆکی بێ سوود وبێ تامی خەڵکی نەدەکردەوە، گوێی پێنەدەدان. با خەڵکی هەر بڵێن گرینگ ئەوەیە ئەم، لە بێگەردی و پاکی دایکی دڵنیابێت، تەنیا ئەم گرینگە! باشە چۆن دەتوانێ، بە درێژایی ژیان لە نزیکیا هەڵبکات و هەرچەند سەیری بکات، گومانی ئەوەی لێبکات کە براکەی، لە باوکیان نییە و لە پیاوێکی دییە، دایکی بە دزی بابیەوە، دەستی دەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا تێکەڵاو کردووە.

تۆ تەمەشا چەند ژنێکی ئارام و ئاسوودەیە، چەند متمانەی بەخۆیە! باشە ماقوولە ژنێکی روح ودڵپاکی وەکو ئەو، بخزێت! خۆی بدۆڕێنێت! هەوا وهەوەس ڕایماڵێت و کەم وزۆر بەسەرخۆی نەیەنێ و پێوەی دیار نەبێت. ئاە!

پەشیمانی! پەشیمانی! ڕەنگە لە هەوەڵەوە پەشیمانی زۆری ئازار دابێت، ئەوسا وەکو هەرشتێکی دی سڕابێتەوە، بیرچووبێتەوە. بێگومان لەم هەڵەیەیَ خۆی ژێوان بووەتەوە، زۆر گریاوە و، پاشان بەرەبەرە لە بیری بردبێتەوە، لە بیری چووبێتەوە، باشە هەموو ژنان، بەهرەیەکی سەیر و دەگمەنی بیرچوونەوەیان نییە کە تەنانەت ئەو خەڵکانەش فەرامۆش دەکەن کە جەستەی خۆیان ڕادەست کردوون و لێویان داونەتێ ماچی بکەن؟ ماچێک وەکو چەخماخە لێیان دەدات و ڤیان وەکو باهۆز ڕایان دەماڵێ و پاشان ژیان سەرلەنوێ هێور دەبێتەوەو وەکو ئاسمان ساف دەبێتەوەو هەموو شتێک دەگەڕێتەوە دۆخی خۆی. تاقە یەک پەڵە هەوریمان وەبیر دێتەوە؟

پییر، نەیدەتوانی لە ژوورەکەی خۆیدا بمێنێتەوە. ئەم ماڵە، ماڵی بابی پان وپلیشی دەکردەوە. هەستی دەکرد میچەکە بەسەریا دادێتەوە، دیوارەکان دێنەوە یەک و خەریکە دەی خنکێنن. کە تینوویەتی زۆری بۆ هێنا، مۆمەکەی پێکرد، چوو بۆ مووبەقەکە تا پەرداخێ ئاوی سارد بخواتەوە.

هاتە نهۆمی خوارەوە، ئەوسا بە سوراحیەک ئاوی پڕەوە سەرکەوتەوە. هەر بە کراسی خەوەوە، لە سەر یەکێک لە پلەکانی قاڵدرمەکە دانیشت، بایەکی خۆشی دەهات، ئەوسا بەبێ پەرداخ سوراحیەکەی نابە سەرەوە، وەکو کەسێک ڕای کردبێ بەهانکە هانک بینی بە ئاوەکەوە نا. کە لە جوولە کەوت و هێور بووەوە، هێمنی و خامۆشی ماڵەکە کاری تێکرد، ئەوجا وردە وردە کەمترین دەنگی جیا دەکردەوە. یەکەم شتێ گوێی لێبوو دەنگی سەعاتی ژووری

نانخواردن بوو، کە دەنگەکەی لە گوێیدا سات بەسات گەورە وگەورەتر دەبوو. ئەوسا دووبارە دەنگی پرخەیەکی هاتەگوێ، پرخەیەکی پیری کورت، دەنگی پرخەپرخێکی ناخۆش، بێگومان پرخەی باوکی بوو، ئەم پرخەیە گرژی کرد، وەکو ئەوە بوو خۆبەخۆ هەڵقوڵێت، وەکو ئەوەی ئەم دوو پیاوەی لە هەمان ماڵدا دەیان پرخاند، باب وکوڕ، هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نەبێت، هیچ پەیوەندییەکی سستیش کە پێی بزانن، پێکیانەوە ببەستێت!

ئەمانە بە میهرەبانیەوە قسە دەکەن، باوەش بەیەکدا دەکەن، هەمان شت کاریان تێدەکات، وەکو ئەوەی یەک خوێن بە دەمارەکانیاندا بگەڕێ. دووکەس کە لەم پەڕ ولەو پەڕی دنیادا لەدایک بووبن، نەدەشیا بە ئەندازەی ئەم کەسە. ئەم باب وکوڕە لە یەکدی دووربن.

قەناعەتیان وابوو یەکدییان خۆشدەوێ، چونکە درۆیەک لە ناخی هەردووکیاندا گەورە بوو، درۆیەک کە ئەم خۆشەویستییە باوکانەیە و ئەم خۆشەویستییە فرزەندەیانەی لە نێوانیاندا دروست کردبوو. درۆیەک مەحاڵە کەشف بکرێت، کەس نەیزانی کوڕێکی بیژو و حەرامزادەیە، وێڕای ئەوەش، وێڕای ئەوەش هەردووکیان خەڵەتابوون. لە کوێ بزانن؟ ئاه، خۆزیا تاقە لێکچوونێک، لێکچوونێکی زۆرکەم لە نێوان بابی و جاندا هەبوایە. لێکچوونێک لەو لێکچوونە گونگ و نادیارانەی لە باپیرەوە بۆ نەوە دەگوازرێتەوە و، ئەوە دەسەلمێنێ کە سەرچاوەی ڕەگ ورەچەڵەکی هەموویان هەڵقوڵاوی هەمان خۆشەویستیە. وەکو دکتۆر پێویستی بەیەک شتی زۆر بچووک بوو، تا شێوەی شەویلاگەی، کەپووی، دووری نێوان هەردوو

چاوی، هەڵکەوتی ددان یان قژی بزانێ، یان کەمترین هەڵس وکەوت و ڕەفتاری، خوو و خدەیەکی، ڕەفتاری، یان سەلیقەیەکی بۆماوەیی، ئاماژەیەک بزانێ، کە لە مومارەسە کردنیا بەدیار بکەوێت.. گەڕا، زۆر گەڕا، هیچی بیر نەکەوتەوە، هەرهیچ. بەڵام چەند بە گومانەوە تەمەشای دەکرد، چەند بە گومانەوە سەرنجی دەدا، هیچ بەڵگەیەکی دەست نەدەکەوت کە ئاماژە پەنهان و نادیارەکانی بۆ کەشف بکات و بسەلمێنێت. هەستا تا بچێتە ژوورەکەی خۆی، بە خاوەخاو بە قاڵدرمەکەدا هەڵگەڕا، بیرکردنەوە باڵی بەسەردا کێشا، بەلای دەرگای ژووری براکەیدا ڕۆیی، لە ناکاوا وەستا. دەستی برد تا بیکاتەوە. ئارەزوویەکی سەرکێشی بەسەرا هات کە هەر ئێستا جان بدینێ، تا بە وردی و لە غورابی خەوا تەمەشای بکات، لەو کاتەدا تەمەشای بکات، کە ڕوخسار و دەم وچاوی ئارامە، سیمای خاو بووەتەوە و ئاسوودەیە، ڕواڵەت و ڕواڵەتبازیەکانی ژیان هەر هەموویان لە حەوت کێوان ئاوابوون. هەنگێ سڕ ونهێنییە پەنهانەکانی سەروسیمای دەدۆزێتەوە. جا هەنگێ ئەگەر سووکە لێکچوونێک هەبێ، پەی پێ دەبات و لە دەستی دەرناچێت. باشە ئەگەر جان لە پڕێکا بێدار ببێتەوە، ئەم چی پێ بڵێت؟ چۆن هۆی ئەم سەردانەی بۆ شرۆڤە بکات؟

لە جێی خۆی وەستا، قامکەکانی بەسەر دەسکی دەرگاکەوە ڕەق بووبوون، لە دڵی خۆیدا دەگەڕا کە هۆیەک بۆ هاتنەکەی خۆی بدۆزێتەوە، یەکسەر ئەوەی بیرکەوتەوە کە هەشت ڕۆژێک لەوەوبەر شووشەیەک دەرمانی دان یەشەی بە براکەی دابوو. ئەمیش ئەمشەو دانی هاتووەتە

ئێش و هاتووە بۆ حەب ودەرمانەکە. بە ئەسپایی وەکو دز خۆی بە ژوورا کرد.

جان، کەمێک دەمی کردبووەوە، خەوێکی ئاژەڵانەی قووڵی لێکەوتبوو. ڕدێن و قژە زەردەکەی، بە سەر داوە سپییەکانەوە ئاڵتوون ئاسا دەیان نواند. بێدار نەبووەوە، بەڵام لە پرخەپرخ کەوت.

پییر، بەسەریا دانەوییەوە، بەچاوانی تاسەمەندەوە لێی ڕاما، نا، ئەم گەنجە لە ڕولاند ناچێت. بۆ جاری دووەم سەروسیمای ماریشالی وەبیر خۆی هێنایەوە. هەردەبێ بیدۆزێتەوە! ڕەنگە ئەوسا ئەم گومانەی لەلا نەمێنێ.

براکەی جوڵایەوە، بێگومان لە ئامادەبوونی ئەم پەست بووە، یان لە تیشکی مۆمەکە کە دابووی لەچاوی بێزار بووە. ئەوسا دکتۆر بە پێدزکێ و لە سەر پەنجەی پێیان بەرەو دەرگاکە کشایەوەو بە ئەسپایی دایخست، ئەوسا بۆ ژوورەکەی خۆی ڕۆیی، بەڵام خەوی لێنەکەوت.

شەو درێژ بوو، ڕۆژ نەدەبووەوە، سەعاتی ژووری نانخواردن، یەک لە سەریەک لێی دەدا، دەنگی ئەوەندە قووڵ ومەند بوو لە تۆ وایە زەنگی کڵێسایەکی قووت داوە. زەنگەکان، بە قاڵدرمە چۆڵەکەدا سەردەکەوتن و دیوار ودەرگاکانیان دەبڕی و لە قووڵایی ژوورەکاندا و لە گوێی خەڵکە نووستووەکەدا مردار دەبوونەوە.

پییر، بەپانی و درێژی ژوورەکەدا، لە لای جێگاکەوە بۆلای پەنجەرەکە و بەپێچەوانەوە، کەوتە ڕاوێچکە و هاتوچۆ. چی بکات؟ هەستی بە نیگەرانیەکی زۆر کرد، نەیدەتوانی لەگەڵ خانەوادەکەیدا هەڵبکات. هێشتا حەزی دەکرد بە تەنیا بێ، بەلای کەمەوە تا سبەینێ، بۆ ئەوەی بیر

بکاتەوە، ئارام بێتەوە، خۆی بۆژیانی ڕۆژانە ئامادە بکات، بۆ ئەو ژیانەی کە دەبوایە بەردەوام بێت.

دەی باشە، دەچێت بۆ شاری ( تروڤیل ) تا تەمەشای ئاپۆڕای خەڵکەکە بەسەر " بلاجە " کەوە بدینێ. ئەو دیمەنە تۆزێ دڵی دەکاتەوە وجەوەکە بیری دەگۆڕێت، دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسێ تا خۆی بۆ ئەو شتە کرێتە ئامادە بکات کە بەخۆی کەشفی کردووە.

کە سپێدە ئەنگاوت دەست و دەم وچاوی شت و جلەکانی لەبەر کرد. مژودوومانەکە ڕەوی بووەوە، جەوەکە زۆرخۆش وجوان بوو. جا چونکە کەشتی شاری ( تروڤیل) سەعات نۆ لە بەندەرەکەوە دەردەچوو و دەکەوتەڕێ، دکتۆر وای بەباش زانی پێش ئەوەی بڕوات، بچێ دایکی ماچ بکات.

چاوەڕوانی کرد تا هەتاو بەرز بووەوە، دنیا ڕۆژ بووەوە، ئەوسا دابەزی. کە گەیبە بەردەرگای ژوورەکەی دایکی، دڵی بەتووندی کەوتەلێدان، بەجۆرێ هانکەهانکی پێکەوت، ناچار وەستا تا پشوویەکی وەبەربێتەوە. دەستی بەسەر دەسکی دەرگاکەوە سست بووبوو و دەلەرزی. وای لێهاتبوو، نەیدەتوانی دەسکی دەرگاکە بابدات و بچێتە ژوورەوە. لە دەرگاکەی دا، دەنگی دایکی بەرز بووەوە:

- کێیە؟
- منم، پییر.
- چیت دەوێ؟
- حەزم کرد سڵاوێکت لێبکەم، چونکە دەمەوێ بڕۆم بۆ شاری " تروڤیل " و ئەمڕۆ دەگەڵ هاورێکانما لەوێندەر بەرمەسەر.

- من هێشتا لەناو جێدام.
- دەی باشە، خۆت سەغلەت مەکە، کە شەوێ هاتمەوە ئەوسا ماچت دەکەم.

حەزی دەکرد، بەبێ ئەوەی بیدینێت، بڕوات، بێئەوەی ماچێکی ساختەی گۆناکانی کە دڵی لێی تێک هەڵدەهات، بکات، بڕوات. بەڵام دایکی گوتی:- کا بوەستە، با دەرگا بکەمەوە.

گوێی لە دەنگی پێیە پەتیەکانی بوو کە بەسەر پارکێتەکەدا هەنگاوی دەنا، ئەوجا گوێی لە دەنگی سورگی دەرگاکە بوو، دایکی هاواریکرد:

- وەرە ژوورەوە.

وەژوور کەوت. دایکی لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو، رولاند خەوتبوو، سەری داپۆشی بوو و ڕوویکردبووە دیوارەکە و لە غورابی خەودا بوو، پێدەچوو بەهیچ شتێک خەبەری نەبێتەوە، مەگەر کەسێک ڕای بتەکاندبا و دەستی لە بنا دەربێنابا.

لە ڕۆژانی ڕاوە ماسیدا، کارەکەرەکە لەو کاتەدا خەبەری دەکردەوە، کە باباگری دەریاوان بەدوویدا دەهات، تا لەم خەوە خۆشە بێداری بکاتەوە.

پییر، وەژوورکەوت، بەجۆرێ لە دایکی دەڕوانی وەکو ئەوەی بە عەمراتی نەی بینیبێ. دایکی دەم وچاوی هێنایە پێشەوە، دوو ماچی هەر دوو گۆناکانی دایکی کرد، ئەوسا لە سەر کورسییەکی نزم ڕۆنیشت. دایکی گوتی:

- دوێنێ شەو بڕیارت دابوو ئەم سەفەرە بکەیت؟
- بەڵێ، دوێنێ شەو.
- بۆ شێو دێیتەوە؟

- جارێ نازانم، بەهەرحاڵ چاوەڕوانم مەکەن.

بە کونجکاویەکی سەیرەوە تەمەشای دایکی دەکرد. ئەمە دایکیەتی. ئەم ژنە! بەم ڕوو وڕوخسارەوە کە لە منداڵییەوە، لەوەتای چاوی تروکاندووە دەی بینی. ئەم زەردەیە، ئەم دەنگە زۆر ئاشنایە و هەموو ئەمانەی بەلاوە تازەبوو و زۆر جیاواز بوو لەوانەی لە پێشا و تا ئێستا بەلایەوە ئاشنابوون.

ئێستا بۆی دەرکەوت، تێگەیی - چونکە خۆشی دەویست - قەت بەم دیقەتەوە تەمەشای نەدەکرد. وێڕای ئەوەش ئەمە خۆیەتی، هەموو وردەکارییەکانی ڕوخساری دەناسی، بەڵام ئەمە یەکەمجاری بوو، بەم زەلاڵی و ڕوونییە وردەکارییەکانی ڕوخساری دەبینی. ئیدی زەینی ورژا و، هەندێ شتی لە هێڵە گشتیەکانی ڕوو و ڕوخساریا خوێندەوە، کە پێشتر هەرگیز پەی پێیان نەبردبوو.

هەستا تا بڕوات، ئەوسائارەزوویەکی سەرکێش لە جێی خۆی چەقاندی، ئارەزووی ناسینی ئەو کەسەی لە دوێنێوە سەرودڵی گرتبوو، گوتی:

- باشە لە بیرتە جاران وێنەیەکی بچووکی ماریشال لە هۆڵەکەدا دانرابوو؟

دایکی، یەک دوو چرکەیەک پەشۆکا، یان پییر وای هەستکرد کە پەشۆکاوە، ئەوسا دایکی گوتی: - بەڵێ.

- ئەو وێنەیە چی لێهاتووە؟

خات رولاند، بلەز وەڵامی دایەوە:

- ئەو وێنەیە.. سەبرکە.. سەبرکە.. بەتەواوەتی نازانم. ڕەنگە لەنێو باوڵ و پریاسکەکانی مندا بێ.

- بێ زەحمەت، بۆی بگەڕێ، تاقیبی بکە.

- باشە، تاقیبی دەکەم. بۆچیتە؟

- ئاه، بۆ خۆمم ناویَ، با بیدەین بە جان، پێم وایە ئاساییە، دڵی پیَ خۆش دەبێت.

- بەڵــیَ. هەق بەتــۆیە، بیرکردنەوەیەکــی باشــە، کە هەستام بۆی دەگەڕێم.

وەدەرکەوت، ڕۆژێکــی خــۆش بــوو، کەمتــرین ســرووە نەدەهــات، خەڵکــی لە جــادە و بانانــدا، شــاد وبەکەیــف دیــاربوون، هەرکەســە وبــۆ ســەر کــاری خــۆی دەڕۆیــی، فەرمــانبەران دەچــوون بــۆ دایەرەکانیــان، کیــژان بــۆ کۆگــا وموغازەکانیــان دەڕۆیشــتن، هەندیَ کەس، بە ڕۆژی ڕونــاک بۆخۆ دەسترین و کەیفیان دەکرد.

ئیدی، ڕێبواران، بەرەبەرە سەرکەوتنە سەر کەشتیەکەی شــاری ( تروڤیل ). وەختــایەک پییر، لە دوای دواوە لە ســەر تەختێکی دارین گیرسایەوە، لە دڵی خۆیدا پرســی: " باشــە کە پرســیاری وێــنەکەم لێکــرد پەســت بــوو، یــان هەر ســەری سوڕما؟ ئایا ونی کردووە یان شــاردویەتیەوە، بۆچی؟ ئیدی ئەقڵــی هەمــان ڕێچکەی گەیشــتنە ئاکــامی گــرتەبەر: وێــنەکە وێــنەی کەســێکی دۆســت، وێــنەی خۆشەویســتێک بــوو، لە هــۆڵەکەدا و بە بەرچــاوی هەمــووانەوە دانرابــوو. تــا ئەو ڕۆژەی ژنەی تاین، دایکەکە، لە پێش هەموو کەسێکدا، پەی بەوە برد کە ئەم وێنەیە لە کوڕەکەی دەچێت، دیارە لە مێژ بــوو هەســتی بەو لێکچــوونە کردبــوو.. دوای ئەوە هەســتی کردبــوو، ڕۆژیَ لە ڕۆژان هەمــوو کەســێک هەســت بەو لێکچوونە دەکات، بۆیە وێنەکەی هەڵگرتووە تا کەس گومــانی لێنەکــات، دیــارە زاتــی نەکــردووە وێــنەکە بــدڕێنێت. پییــر بە ڕوونــی بیــری کەوتەوە کە ئەو وێــنە بچــووکە لە مێژە دیــار نەمــاوە، پێش ئەوەی خانەوادەکەیــان لە پاریســەوە بــۆ ئێرە

باربکەن دیار نەما! پێموایە ئەو کاتە دیار نەما و غەیب بوو کە جان خەریک بوو سمێڵ و ڕدێنی دەهات و لە ناکاوا شێوەی دەچووە سەر ئەو گەنجە موو زەردە سوورو سپییەی لەناو چوارچێوەکەدا بزە نیشتبووە سەر لێوی.

تەڤگەر وتەکانی کەشتیەکە، کە کەوتەڕێ، بیروخەیاڵەکەی شێواند! هەستایە سەرپێیان، دەستی بە تەمەشاکردنی دەریاکە کرد.

کەشتیە بچووکەکە لە لەنگەرگا لاوەکییەکەوە دەرچوو، بە هانکەهانک و لەرزە لەرز بە دەستەچەپا بایدایەوەو بەرەو ئالییە دوورەکە، کە چاو بە ئاستەم لە نێو تەمتوومانی دانی بەیانیدا، فەرقی دەکرد، بۆی دەرچوو. لێرەو لەوێ بایەوانێکی سووری بەلەمێکی نێچیروانی بەسەر دەریاکەوە دەشەکایەوە و لە دوورەوە لە تاوەرێکی گەورە دەچوو کە سەری لە ئاوەکەوە دەرهێنابێ. روباری سین، کە لە شاری روانەوە وەکو باسکی دەریاکە، دەهاتە خوارێ، بەپانی خۆی دوو خاکی هاوسێی لێکدی جیادەکردەوە.

بە کەمتر لە سەعاتێک، کەشتیەکە گەییە بەندەری ( تروڤیل ) ، کات کاتی مەلە کردن بوو، پییر یەکسەر چوو بۆ ( پلاجەکە).

پلاجەکە، لە دوورەوە لە گوڵگەشتێکی درێژی پڕ لە گوڵی پشکوتو دەچوو. لە سەر گردێکی گەورەی لمەلانی زەردباو، کە لە قەراخ لەنگەرگای بەندەرەکەوە دەستی پێدەکرد و دەڕۆیی تا دەگەییە تاوێرە ڕەشەکان، جۆرەها چەتر وسەیوانی ڕەنگاوڕەنگ، شەپقەێن جۆراوجۆر، جلێن ژنانەی ڕەنگاوڕەنگ، لەبەردەم کابینەکانی کەنارەکە وەستابوون یان ڕیزیان بەستبوو، یان لێرەو لەوێ بڵاو

بووبوونەوە، کە تەمەشات دەکردن، لە تۆوایە چەپک وتاجە گوڵینەی گەورەن لە ناو مێرگێکی بێ سنووردا. ژاوەژاو و هەرا و زەنـــای دەنـــگە تـــێکەڵاوە دوور و نزیکەکـــان، لە شنەبایەکەدا دەتوایەوە، هەرا وهەنگامەی ئەو منداڵانەی کە مەلەیـان دەکـرد دەگەڵ حیلـک وهـۆڕ و ژاوەژاوی خـۆش و بەردەوامـی ژنانـدا، تێکەڵ بەو شـنەبایە دەبـوو کە خەڵکەکە هەڵیـان دەمـژی. پییـر، وێـڵ و سـەرگەردان، بەنـاو ئـاپۆڕای خەڵکەکە کەوت، تەنیای تەنیـا بـوو، زۆر گۆشـەگیر بـوو، لە هـزرە بە ئازارەکـانی خۆیـدا نقـووم بووبـوو، وەکـو یەکێـک وابوو کە کەشتیەکە فرێی دابێتە نێرینەی دەریاکەوە. خۆی پێدا دەدان، گوێی لە هەندێک قسان دەبوو، بێئەوەی گوێیـان لێبگرێـت، تەمەشـای پیاوەکـانی دەکـرد بێئەوەی بیانـدینێت، پیـاوان قســەیان بـۆ ژنـان دەکـرد، ژنـان بەدەم پیـاوانەوە پێـدەکەنین. ئەوسـا لە ناکـاوا زۆر بەڕوونـی بەدی کـردن ، دەتگوت خەوی لێکەوتبوو و بێدار بووەوە، لە ناخی ناخەوە ڕقی لێیان بووەوە، چونکە شاد و بەکەیف دیاربوون.

ڕۆیـــی، لە خەڵکـــی نزیـــک دەبـــووەوە، بە دەوریانـــدا دەسـووڕایەوە، بیـری تـازەی بە مێشـکا دەهـات. هەمـوو ئەو جل وبەرگە ڕەنگاوڕەنگانەی کە لمەلانەکەیـان داپۆشـی بـوو، وەکـو چەپـکە گـوڵ هـاتنە بەرچـاوی. قوماشـە جوانەکـان، سـەیوانە ڕەنگیـنە زەردباوەکـان، بەژنـی زراڤ و نـاوقەدی باریک، جلێن تازە مۆد، هەرلە پێڵاوی ناسکەوە تا دەگاتە شـــەپقەێن ســـەیر وعەنتـــیکە، ســـیحری ڕەفتـــار، ســـیحر و ئەفســـــوونی دەنـــــگ، زەردەخەنە، نـــاز و کریشــــمە بە سەرانســـەری کەنـاراوەکەدا.. هەر هەمـوو ئەمـانەی وەکـو پشکوتنی گوڵ هاتەبەرچاو. کە بانگەشە بوون بۆ خۆفرۆشی

ژنـان. ئەو ژنـانەی کە خۆیـان بـۆ ئەوە ڕازانـدبووەوە، تـا کەسـێک بـخەنە داوەوە، دڵبەنـدیان ببێت، لە خشـتەی بەرن. خۆیان بۆ پیاوان دەڕازێننەوە، بۆ هەمـوو پیاوێک جگە لە مێردەکـانی خۆیـان، کە پێویسـتیان بەوە نەمـابوو فریویـان بدەن، تازە خستبوویاننە داوەوە، کەری خۆیان بەستبووەوە. ئیدی خۆیان بۆ ئاشقی ئەمڕۆ، بۆ ئاشقی سبەینێ، بۆ هەر پیـاوێ تووشـی بـبن، دەڕازانـدەوە، چاوبڕکێیـان دەگەڵ دەکردن و...

ئەو پیاوانەی لە تەنیشتیانەوە دانیشتبوون، چاویان بڕی بـووە چاویـان، دەم بەدەمەوە قسـەیان بـۆ دەکردن، بانگیـان دەکـردن، ئارەزوویـان دەکـردن، وەکـو نێچیرێکـی دیـارو ئاسانڕاو پەیگیریـان دەکردن، ئەگەرچی زۆر نزیک بـوون و زۆر ئاسـان دەگیـران. کەواتە ئەم کەنـار و پـلاجە بازاڕێـک بوو بۆ ئاشقێنی وچاوبازی، کە ژنـان خۆیـان تیا دەفرۆشت. ئیدی سەودا و مامەڵە بوو، پیـاوان دەکەوتنە ڕاوە ژن، ژنـان تەنیـا بەڵێنیـان دەدا. تەنیـا بیریـان لەیەک شـت دەکـردەوە. لەوەی بە جەستە پیاوان ببزوێنن، جەستەیان ڕادەست بکەن کە پێشتریش ئەو کارەیـان کردووە، جەسـتەیان فرۆشـتووە، بەڵێنیان بە پیاوانی دیکەش داوە. لە دڵی خۆدا گوتی: هیچ شتێکی تازە لەم سەرزەویەدا نییە. هەڵبەتە دایکیشی هەمـان ئەو فـیعلەی کـردووە کە ژنـانی دی دەیـکەن. ئەمە هەمـوو شـتەکەیە! وەکـو هەمـوو ژنـانی دی؟ نـا، نەخێر، ئـاوارتەش هەیە، زۆریشە! ئەو ژنانەی لە دەوروبەری خۆیدا دەیانبینێ، دەوڵەمەندن، شێتن، عەودالّی ڤیان و خۆشەویستین، ئەنـدامی یـانەی ئاشـقێنی ڕەهـان، تەنـانەت ئامـادەن بە نرخێکـی دیاریکراو ڕابوێرن، چونکە لە کەنارەکەدا تووشـی خێڵێک لە

ژنـانی ئابڕوومەنـد، گۆشـەگیری نـاو چـوار دیـواری مـاڵان نەبوو، بەڵکو تووشی لەشکرێک لە ژنانی بێکار بوو.

خێزاوی دەریاکە بەرز بووەوە، کردیە کارێک کە ڕیزی یەکەمی ئەوانەی خەریکی مەلە بوون، بەرەبەرە بەرەو شار بکشـێنەوە، ئیـدی خەڵکانی سـەر کەنـارەکە بەپەلە هەسـتان، کورسـیـەکانیان هەڵگـرت و لەبەر شـەپۆلە زەردبـاوەکە کە تارایەکی ناسکی کەفی بەسەردا دابوو، هەڵاتـن. تەنـانەت ئەو کـابینە گەڕۆکـانەش کە لە ئەسـپان بەسـترابوون، جمـان، ئـاپۆڕای خەڵـکەکە کەوتنەخـۆ، هەنـدێک دەهـاتن برێـک دەچـوون، لەم هـاتوچۆیەدا، بەریەکـدی دەکەوتـن وتـێکەڵ دەبوون.

پییـر، هەڵات، لەم بەریەک کەوتـنەی خەڵـکەکە پەسـت و تـووڕە بـوو، لە شـارا نقـوم بـوو، لە دەروازەی کێڵگەکانـدا، لەبەردەم مەیفرۆشـیـەکەدا، هەژارانەدا وەسـتا تـا فـراڤین بخوات.

دوای ئەوەی قـــاوەکەی خـــواردەوە، لە تەنیشـــت دەرگـاکەوە، لەسـەر دوو کورسـی پـاڵکەوت، چونکە شـەوێ نەنوسـتبوو، لە سـێبەری دار زەیزەفونێکـا خەوی لـێکەوت. دوای چەند سەعاتێک لە خەو ڕاپەڕی، سـەیری کرد وەختی گەڕانەوەی کەشـتیەکە هـاتووە، زۆر خەوتبـوو، ئـازای داهێزرابــوو، شـــەکەت و مانـــدوو کەوتەڕێ. دەیەوێ بگەڕێتەوە، دەیەوێ بزانـێ ئاخۆ دایکی وێنەکەی ماریشـالی دۆزیوەتەوە. ئایا خۆی ( دایکی ) لە پێشا باسی دەکات، یـان دەبێ ئەم دووبارە پرسیاری لێبکاتەوە، بێگومـان هەنـجەت و بیـانوویەکی پەنهـانی هەیە، بـۆ لابـردن و شـاردنەوەی ئەو وێنەیە.

بەڵام کە خۆی بە ژوورەکەیدا کرد، دوو دڵ بوو لەوەی کە بۆ شێو بچێتە خوارەوە، زۆر کەسەردار بوو، دڵەی خەمبار و تووڕەی هێور نەبووبووەوە. وێڕای ئەوەش بڕیاری دا بچێتە خوارەوە، کە خۆی بە ژووری نانخواردن دا کرد، هەموو خانەوادەکە لە دەوری خوانەکە دانیشتبوون.

شادی بە ڕوخساری هەموویانەوە دیاربوو. رولاند گوتی:

- دەی باشە، لە شت کڕین بوونەوە؟ من تا هەموو شتەکان تەرتیب نەکەن و لە جێی خۆیان دای نەنەن، نایەمە تەمەشا کردنیاین

ژنەکەی بەرسڤی دایەوە:

- هەڵبەتە هەموو شتێک بەدڵی خۆمانە. بەڵام بۆ ئەوەی تووشی هیچ هەڵەیەک نەبین، پێویستمان بە کاتی زیاترە تا بیربکەینەوە. مەسەلەی کەل وپەل و مۆبیلەکردنی شوقەکەمان زۆر لا مەبەستە.

هەموو ڕۆژەکەی دەگەڵ جاندا، بەسەردانی فەرشفرۆشییەکان و کۆگای مۆبیلان و کەل وپەلەوە بردەسەر. خات رولاند، حەزی لە قوماشی نایاب، کەمێک گرانبەها و، باڵکێش بوو. کوڕەکەی بە پێچەوانەوە حەزی لە شتی سادە بوو. ئیدی دەستیان بدایەتە هەرشتێک، هەنجەتەکانی خۆیان دووبارە دەکردەوە. خات رولاند، هەنجەتی ئەوەبوو، کە خاوەنی دەعوا، وەختایەک دەچێتە هۆڵی چاوەڕوانی پێویستی بەوەیە دیمەنێکی دەوڵەمەندانە بدینێ و هەست بە دەوڵەمەندی شوێنەکە و خاوەنی شوێنەکە بکات.

بەڵام جـان حەزی دەکـرد تەنیـا مشـتەریانی کەشـخە و دەوڵەمەنـــدان ڕاکێشـــێت و دەیەوێ لە ڕێگـــای زەوقە ســـادەکەیەوە، ســـەرنجیان ڕابکێشـــێت و بەلای خۆیـــدا ڕایانکێشێت. لە سـەر نـان خـواردن، هەمـان ئەو گەنگەشـەیان دووبارە کردەوە کە بە درێژایی ڕۆژەکە کردبوویان.

ڕولانـد، هـیچ ڕاوبۆچـوونێکی نەبـوو، هەمـان قسـەی دەگوتەوە:

- من نامەوێ نەهیچ بڵێم و نە گوێم لە هیچ بێ، کە لە خێـران هەمـوو شـتێک تەواو بـوو، دەچـم سـەیری دەکەم و بەچاوی خۆم دەیبینم.

خـات ڕولانـد، کوڕە گەورەکەی گـاز کـرد، تـا ڕای خـۆی بدات، گوتی:

- وەرە بابزانین ڕای تۆ لە هەنبەر قسەکانمان چییە؟

ئەعسـابی تەواو هەڵچووبـوو، حەزی دەکـرد بە جنێـو وەڵام بـداتەوە. بەڵام بە دەنگێکـی وشـک کە لە پەسـتی و تووڕەییدا دەلەرزی گوتی:

- ئۆف! منیش هەمـان ڕاوبۆچوونی جـانم هەیە، حەزم لە ســادەییە، ســادەیی و خــاکەرایی لە زەوق و ســەلیقەدا، وەکو ڕاستگۆیی و سەر ڕاستیە لەواری ئەخلاقدا.

دایکی گوتی:

- ئەوەشــت لە بیــر نەچــێ کە ئــێمە لە شــارێکی بازرگانیــدا دەژیــن و زەوق و ســەلیقەی بەرز وبەجــێ لە هەموو شوێنێ نییە.

پییر، بەرسڤی دایەوە:

- ئەمە گرینـگ نیـیە، ئایـا ئەمە مانـای وایە لاسـایی گەوجـان بکەیـنەوە؟ یـانی ئەگەر هاوڵاتیـان کەر و خـوێڕی

بـوون، دەبـێ منـیش وەکـو ئەوان بـم؟ یـانی ئافرەتێـک کە ئافرەتە هاوسێکەی دوو ئاشقی هەبوو، دەبێ ئەویش هەمـان هەڵە وخەتا بکات.

جان، دەستی بە پێکەنین کرد وگوتی:

- هەنجەتـــــی وات پێـــــیە، دەڵێـــــی لە پەنـــــدی فەیلەسووفانەوە وەرگیراوە.

پییر، بەرسڤی نەدایەوە. براکەی و دایکی کەوتنە باسـی قومـــاش و قەنەفە. هەردووکیـــان نـــامۆ وغەریـــب هـــاتنە بەرچـــاوی، وەکـــو چـــۆن بەیـــانی بەرلەوەی لە مـــاڵ وەدەربـکەوێ وبـۆ شـاری تروڤیـل بـڕوات، دایکـی نـامۆ وغەریب هاتە بەرچاوی، بەو ئاوایە هەردووکیانی، براکەی و دایکی نامۆ و بێگانە هاتنە بەرچاو. لە ڕاستیا وای هەستکرد، لە ناکـاوا خـۆی بەنـاو خانەوادەیەکـدا کـردووە کە نایـان ناسێت. سـەری سوڕما، بەتـایبەتی سـەری لە بـابی سـوڕما، باوەڕی بە چاو وبیری خۆی نەدەکرد. ئا ئەم پیاوە زەلامە سست وخاوە، ئەم کەودەنە بابیەتی، بـابی ئەوە! نـا، نـا، جـان هەرگیز لەو ناچێت.

سەبارەت بە خانەوادەکەی، دوو ڕۆژە، دەستێکی پەنهانی شەڕانی، دەستی مـردوویەک لێکی دابڕین، هەر هەمـوو ئەو پەیوەنـدییانەی بچـڕی کە ئەم چـوار بـوونەوەرەی پـێکەوە بەستبوو، بەرەبەرە شیرازەیانی پچڕاند، ئیدی تەواو. هەمـوو شتێک بڕایەوە، دایکی نەمـا، ئیدی ئەمە دایکی نییە، چونکە نـاتوانێ خۆشـی بوێت، نـاتوانێ ڕێزێکی ڕەهـای، پڕ میهر و دوور لە هەر ڕیـایییەکی بگـرێ، ئەو ڕێـزەی دڵـی فرزەنـدان پێویسـتی پێیەتـی، ئیـدی بـرای نیـیە، مـادام ئەم بـرایە لە پیـاوێکی بێگانەیە، چیتر برای نییە، ئەوەی بۆی مـاوەتەوە

هەر باوکیەتی، ئەم پیاوە زلحۆرتەی کە هیچ خۆشی ناوێ.
لە ناکاوا گوتی:
- دایکە، وێنەکەت دۆزییەوە؟
جایر وحەپەساو چاوانی کردنەوە وگوتی: - کامە وێنە؟
- وێنەکەی ماریشال.
- نـا.. یـانی.. بەڵـێ.. نەمـدۆزیوەتەوە، بەڵام وابـزانم شوێنەکەی دەزانم.
رولاند گوتی: - وێنەی چی؟
پییـر گـوتی:- وێنەیەکـی بچـووکی ماریشـال، کەکـاتی خۆی، وەختایەک ماڵمان لە پاریس بوو، لە هۆڵەکە دانرابوو، پێموایە جان حەزدەکات ئەو وێنەیەی لەلابێ.
رولاند هاواریکرد:
- ئا، ئا، لە بیرمە، هەفتەی ڕابردوو دیتم کە دایکت لە باوڵەکە دەریهێنا، ڕوخساری ڕوشابوو. ڕۆژی پێنج شەممە یان هەینی بوو. لویز لە بیرتە؟ کە لە باوڵەکەت دەردێنا، من تەمەشام دەکردیت، لەسەر کورسیەکەی بەردەم خۆتا دانتنا، لەگەڵ کۆمەڵێـک نـامەدا بـوو کە نیوەیانـت سـووتاند، هـا؟ ڕێکەوتێکی سەیر نییە، کە پێش دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ لە میـراتیەکەی جـان ئەو وێـنەیەت دەرهێنـا؟ ئەگەر هەسـتی پێشبینیم هەبووایە، دەمگوت ئەوەتا، ئەوە خۆیەتی.
خات رولاند، بە هێمنی بەرسڤی دایەوە:
- بەڵێ، بیرم کەوتەوە لە کوێیە، ئێستا دەچم دەیهێنم.
کەواتە درۆی دەکـرد! بەیـانی کە وەڵامـی کـوڕەکەی دایەوە درۆی کـرد، درۆی کـرد کە گـوتی: " بە دروسـتی نازانم لە کوێیە، ڕەنگە لە نیو باوڵ و پریاسکەکانی مندا بێ "

تۆمەز چەند ڕۆژێک، چەند ڕۆژێکی کەم بەرلە ئێستا، دیتبووی، دەستی پێدا هێنابوو، لێی ڕامابوو، پاشان لە شوێنێکی نهێنیدا، لەگەڵ نامەکاندا، ئەو نامانەی ماریشال بۆی ناردبوون، شاردبوویەوە.

پییر، ڕوانیە دایکی کە درۆی لەگەڵ کردبوو، وەکو کوڕێکی تووڕەکراوی خەڵەتێنراو تەماشای دەکرد، خۆشەویستیەکی پیرۆزی لە دەست دا، بە هەمان غیرەی پیاوێکی نابیناوە کە ئەنجام خیانەتێکی نەنگینی کەشف کردبێت، تەماشای دەکرد.

حەیفێ کوڕیەتی، ئەگەر مێردی ئەم ژنە بوایە، هەردوو مەچەکی، هەردوو شانی توونـد دەگرت، لە قژی دەنەوی، دەیدا بە عاردیدا، لێی دەدا، مار هەنجنی دەکرد! بەڵام حەیفێ ناتوانێ هیچ بڵێت، هیچ بکات، ئاماژە بۆ هیچ بکات، هیچ شتێک بدرکێنێت، چونکە کوڕیەتی، هیچ بیانوویەکی بۆ تۆڵەسەندنەوە بەدەستەوە نییە، ئەم نەخەڵەتاوە، بەڵکو ئەو ( دایکی ) بە میهر وسۆزی دایکانە خەڵەتاندوویەتی. دەبوایە سەبارەت بەم دایکێکی بێ عەیب، دایکێکی تەواو عەیار بێ، وەکو هەموو دایکێ سەبارەت بە منداڵەکانیان. ئەم هەڵچوونە تا ڕادەی ڕق وکینە تووڕەی کرد، هەستیکرد، تاوانی دایکی دەرهەق بەم، زۆر گەورەترە لەو تاوانەی دەرهەق بە باوکی کردوویەتی.

زەماوەندی پیاو وژن گرێبەستێکی ئیرادیە، ئەگەر هەریەکێکیان خیانەت لە هاوسەرەکەی بکات، ئەمە تاوانە، بەڵام ژنەکە دەبێت بەدایک، ئەرکی گەورەتر دەبێ، چونکە تەبیعەت ئەرکی پاراستنی ڕەگەزی پێ سپاردووە. ئەگەر

هەنگی خیانەت بکات، مانای وایە ترسنۆک و بودەڵەیە، داوێن تەڕ وسووکە.

رولاند، وەکو هەر ئێوارەیەک کە پێکێکی شەرابی خواردباوە، لاقی لەژێر مێزەکەدا ڕاکێشا ولە ناکاوا گوتی:

- پیاو، ئەگەر کەمێک دەستڕۆ بوو، هەق نییە زۆر لە خەمی کاروکاسبیدا بێ. هیوادارم لەمڕۆ بەدواوە جان هەموو ئێوارەیەک دەعوەتی باشمان بۆ بکات، هیچ بەلامەوە خەم نییە ئەگەر هەندێجار تووشی سک یەشەش ببم.

ئەوسا ڕوویکردە ژنەکەی وگوتی:

- دەی، ژنەکە گیان، مادام لە خواردن بوویتەوە، بڕۆ ئەو وێنەیە بێنە، منیش بە دیتنی خۆشحاڵ دەبم.

هەستا، مۆمێکی هەڵگرت، ئەوسا وەدەرکەوت، ماوەیەکی کەمی پێ چوو، ئەم ماوەیە هەرچەندە لە سێ خولەک زیاتر نەبوو، بەلای پییرەوە زۆر دووروودرێژ بوو، دوای ئەو ماوەیە بەخۆی و چوارچێوەیەکی مۆدکۆنی ئەڵقە زێڕینەوە گەڕایەوەو بەدەم زەردەخەنەیەکەوە گوتی:- ئەوەتا، تەقریبەن یەکسەر دۆزیمەوە.

دکتۆر یەکەم کەس دەستی برد. وێنەکەی وەرگرت. لە دوورییەکی کەمەوە ڕایگرت و کەوتە تەمەشاکردنی. پاشان کە هەستی دەکرد دایکی سەیری دەکات، بە ئەسپایی هەستا و چاوی بڕییە براکەی تا لەگەڵ وێنەکەدا بەراوردی بکات. لەزگ بوو بە تووڕەیی بڵێت: " ئاه، ڕێک لە جان دەچێت " لێ زاتی نەکرد ئەو پەیڤە ترسناکە بدرکێنێت، بەوە گوزارشتی لە بیرەکانی خۆی کرد کە کەوتە بەراوردێ دەم وچاوە زیندووەکە دەگەڵ دەم وچاوی وێنەکەدا.

هەڵبەتە هەندێک لێکچوونی هاوبەش لە نێوان هەردوو ڕوخسارەکەدا هەبوو: ڕدێنیان هەمان ڕدێن بوو، هەنیەیان هەمان شت بوو، بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆ لە ئارادا نەبوو کە بتوانرێ بگوترێ: " ئەمە باوکە و، ئەمەش کوڕیەتی " سەرباری ئەم نیشانە هاوبەشانە، شێوەی خانەوادە و نزیکی ڕواڵەتیش هەبوو کە هەمان خوێن دەیجوڵێنێ. کە ئەگەر پییر ئەمەی بەدی بکردبایە، پتر لە بەدگومانیەکەی خۆی ئەرخایەن دەبوو، دایکی هەستا پشتی تێکردن ، وای دەنواند کە گوایە شەکرەکە و شەرابەکە هەڵدەگرێت. هەستی کرد کە پییر زانیویەتی یان بەلای کەمەوە گومانی لێدەکات.

رولاند گوتی:– دەی، کوا با تەمەشایەکی بکەم.

پییر، وێنەکەی بۆ درێژ کرد، بابی مۆمەکەی هێنایە پێشەوە تا باشتر بیدینێت، ئەوسا بە ڕاوێژێکی میهرەبان گوتی:

– بەلەنگازۆ! وەختایەک یەکترمان بینی، کێ وێنای ئەمەی دەکرد، حەیفێ! ژیان چەند بلەز دەڕوات! بە هەرحاڵ ئەو کاتانە پیاوێکی جوان و قۆز بوو، زۆر بە ئەدەب بوو، وانییە لویز؟

کە ژنەکەی وەڵامی نەدایەوە، لەسەری ڕۆی:

– پیاوێکی سەلار وسەنگین بوو! قەت جارێ لە جاران بە بەد مگێزی نەمبینی، تەواو، ڕۆیی، تەنیا ئەوەی لە دوو ماوە کە بۆ جانی بەجێهێشتووە. بە هەرحاڵ دەتوانم سوێند بخۆم ئەمە بەڵگەیە کە تا دوا هەناسە دۆست و هاوڕێیەکی دڵسۆز و وەفادار بووە وتەنانەت لە سەرە مەرگ و گیانەڵلاشدا ئێمەی هەر لەبیر بووە.

" جان " ش دەستی برد تا وێنەکە وەربگرێت. لێی ورد بـــووەوە، دوای کەمێـــک بە کەســــەرەوە گـــوتی:- مـــن، نەمدەناسی، من تەنیا بە پۆرِی سپیەوە دیتبووم.

وێنەکەی دایەوە بە دایکی، ئەویش تەمەشایەکی بلەزی کرد و، خێرا چاوی لە سەر لابرد، وەک ئەوەی ترسابێ، ڕووی وەرگێرِا، ئەوسا بەدەنگی ئاسایی خۆی گوتی:- جانۆ گیان، ئەمە ئێستا پەیوەندی بە تۆوە هەیە، تۆ میراتگریت. لە شوقە تازەکەتدا دایدەنێین.

کە چوونە هۆڵەکەوە، وێنە بچکۆلەکەی وەکو جاران لە سەر کوورەکە و لە نزیک سەعاتەکەوە دانا.

پییـر وجـان، ســەر وجگەرەیـان پێکـرد. کە جگەرەیـان دەکێشـا، یەکێکیـان بەنێـو ژوورەکەدا ڕاوێچـکەی دەکـرد و ئەوی تریـان لەســەر قەنەفەیەک دادەنیشــت، تـا نیـوەی لە قەنەفەکە ڕۆدەچـوو و لاقـی دەخســتە ســەر لاق. رولانـد سەبیلەکەی دادەپەستایەوە، وەکو چۆن سواری ئەسپ بێ، بەو ئـاوایە لە ســەر کورســییەک دادەنیشــت، لە دوورەوە تفەکەی دەگرتە کوورەکە، خـات رولاند لە سـەر تەپڵەکێکی نـزم، لە نزیکی مێزێکی چکۆلەوە کە ڕونـاکی لە سـەر بـوو دانیشتبوو و گوڵدۆزی دەکرد. یان خوری دەڕست. ئەمشەو دەستی بە دروستکردنی پارچە " کنفا " یەک بۆ ژوورەکەی جان کردبوو، ئەمە کارێکی دژوار و ئاڵۆز بوو، بەتـایبەتی لە دەستپێکدا دەبوا هەمـوو هۆش و گۆشـی لەلای بێ. وێرای ئەوەش، چــــاوی کە لەگەڵ هەر تەقەڵێکــــدا بەرز ونـــــزم دەبـووەوە بـلەز دەچـووە سـەر وێـنە چکـۆلەکەی یـارۆی ڕەحمەتـی، کە بە سـەعاتەکەوە هەڵپەسـێردرابوو. دکتـۆر، بە چـوار یـان پێـنج شـەقاو پـانی هـۆڵەکەی دەبـڕی، هەردوو

دەستی نابوونە پشتی و جگەرەکەی نابوو بە لا لێویەوە وهەموو جارێک نیگای لە نیگای دایکی هەڵەنگوت.

دەکرێ بگوترێ، بە پارێزەوە تەمەشای یەکیان دەکرد، ئیدی کێشە وململانێیەکی بەسوێیان کەوتە نێوان، ململانێیەک کە تەحەموول نەدەکرا، دڵی پییری دەگوشی. لە دڵی خۆیدا، هەم بە ئازار وهەم بە ڕەزامەندییەوە گوتی: " باشە لەو دەمەدا کە بزانێ من کەشفم کردووە، ئازار دەچێژێ! " لە هەر بادانەوەیەکدا بۆلای کوورەکە، بۆ چەند ساتێک دەوەستا و لە ڕوخسارە سپیەکەی ماریشال ڕادەما، لەوە دەچوو بیرۆکەیەکی نەگۆڕ لە دووی بێ و لێی نەبێتەوە. وێنە چکۆلەکە بە ئەندازەی ناو لەپێک بوو، لە کەسێکی زندووی شەڕەنگێزی ترسناک دەچوو، کە لە ناکاوا خۆی بەمماڵەدا، بە ناو ئەم خانەوادەیەدا کردبێ.

لە ناکاوا زەنگی دەرگای دەرەوە لێدرا، خات رولاند کە ژنێکی هەمیشە ئارام و لە سەرخۆ بوو، شپرزە بوو، دکتۆر هەستی بە پەشۆکانەکەی کرد. ئەوسا گوتی:- ڕەنگە خاتوو روزمیکی بێ.

چاوەکانی، کە هێشتا نیگەران بوون، بەرەولای کوورەکە هەڵبڕین. پییر، لە شڵەژان و پەشۆکانەکەی دایکی حاڵی بوو یان وای تەسەور کرد تێی گەییوە. نۆرینی ژنان تیژە، زەینیان ڕوونە، بیریان بە گومانە. وەختایەک بێتە ژوورەوە، ئەو وێنە چکۆلە نەناسە دەبینێ و، ڕەنگە لەیەکەم نیگاوە، پەی بەو لێکچوونە بکات کە لە نێوان ئەم ڕوخسارە و ڕوخساری جان دا هەیە. کە ئەوەی زانی، ئیدی هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەبێتەوە! ترسی لێنیشت، ترسێکی کوت وپڕ، ترس لە ئاشکرابوونی ئەم نەنگە، کە دەرگا کرایەوە،

خێرا ئاوڕی دایەوە، وێنە بچووکەکەی هەڵگرت و بەبێ ئەوەی بیڵێ بابی یان براکەی پێی بحەسن، خستیە ژێر سەعاتەکەوە. دووبارە چاوی لە چاوانی دایکی هەڵەنگوت، لێڵ و سەرگەردان وپەشێو دیاربوون.

خاتوو روزمیلی گوتی:- شەوتان باش، هاتووم چایەکتان لەگەڵدا بخۆمەوە.

بەڵام کاتێ لە دەوری خڕ بوونەوە کە خێرهاتنی بکەن و لە حاڵی بپرسن، پییر، لە دەرگاکە کە هەر بە کراوەیی مابووەوە، ئاودیو بووبوو. کە هەستیان بە ڕۆیشتنەکەی کرد، سەریان سوڕما. جان پەست بوو، ترسا کە بێوەژنە گەنجەکە بڕەنجێت، لە بن لێوانەوە گوتی:- کە حەیوانە!

خات رولاند گوتی:- لێی مەگرن، کەمێک ناساغە، ماندووە، لە سەفەری (تروڤیل) بوو.

رولاند گوتی:

- با ماندووش بێ، ماقوول نییە، وەکو حەیوانی کێوی هەڵێت و خۆی بشارێتەوە.

خاتوو روزمیلی، ویستی جەوەکە ئارام بکاتەوە، بە دڵنیاییەوە گوتی:

- نا، نا، پەلەی بوو بۆیە ئیزنی نەخواست، هەموومان کە زوو و ، لە پێش خەڵکی دیکەوە دەردەچین وادەکەین، ئیزن ناخوازین.

جان، بەرسڤی دایەوە: - ئا، ئەو لە ناو خەڵکیدا و لە دەرەوە ئاساییە، بەڵام لە ناو یەک خێزاندا ئاسایی نییە، ئەم برایەی من، ماوەیەکی کەمە ئەم خووەی گرتووە.

## (٦)

له زەرفی هەفتەیە دووواندا هیچ شتێکی تازە لە خانەوادە و ماڵباتی رولاندا ڕووی نەدا، باوکەکە دەچووە ڕاوە ماسی خۆی، خات رولاند یارمەتی جانی دەدا، تا بۆ شوقەکەی بگوازێتەوەو جێگیر ببێت، پییری خەمین، تەنیا لە کاتی ژەمەکاندا بەدیار دەکەوت. شەوێک بابی لێی پرسی:- بۆچی سەروچاوت داوە بەیەکا و لە کۆستکەوتە و ماتەمباران دەچیت، ماوەیەکە هەست دەکەم ئاسایی نیت.

دکتۆر بەرسڤی دایەوە: - چونکە هەست بە بارگرانی ژیان دەکەم.

رولاند هیچی لەو قسەیە هەڵنەکڕاند، بە کەسەرەوە گوتی:

- بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە. لەوەتای ئەم میراتیەمان بە قیسمەت بووە، هەمووان دەڵێی خۆڵ و دۆتان بەسەرا کراوە، وەکو ئەوەی بویەرێکی خراپمان بەسەردا هاتبێ، وەکو ئەوەی تازیەباری کەسێک بین. بۆ کەسێک بگرین.

پییر گوتی:- ئەوەی ڕاستی بێ من بۆ کەسێک دەگریم.

- تۆ؟ ئەو کەسە کێیە؟

- ئاە، کەسێکە تۆ نایناسیت و، من زۆرم خۆشدەوێ.

رولاند مەزەندەی بۆ دڵداری و ڤیانێکی ڕەوتەنی دەچوو. بۆ ئاشقێتی کوڕەکەی دەگەڵ سۆزانیەکدا دەچوو. پرسی:- کێشەکەت ئافرەتە؟

- بەڵێ، ئافرەتێکە.

- مردووە؟

- نا، لەوە قورسترە.
- ئاه!

هەرچەندە پیرەمێر ئەم ڕونبێژیە چاوەڕوان نەکراوەی، لەبەردەم ژنەکەیا پێ ئاسایی نەبوو، ئەم دەم و دووەی کوڕەکەی پێ سەیر بوو، بەڵام زۆر لە سەر پرسیارەکە مکووڕ نەبوو، چونکە بەڕای ئەو ئەم جۆرە کێشانە، کێشەی شەخسی و تایبەتین.

خات رولاند، وەکو ئەوە بوو گوێی لەو قسانە نەبووبێ، نەساغ دیاربوو، ڕەنگی تەواو زەرد هەڵگەڕابوو. مێردەکەی زۆرجار کە دەیبینی، خەریکە لەسەر کورسیەکەی ژێری دەکەوێتەخوارەوە، یان گوێی لێ دەبوو بە دەم قسانەوە هانکەهانکی پێ دەکەوێ، سەری سوڕ دەما. بۆیە پێی گوت:

- لویز گیان، حاڵت لە باش ناچێت، لە خراپ دەچیت، تۆ خۆت زۆر، بە گواستنەوەی جانەوە بۆ ماڵە تازەکەی، ماندوو دەکەیت! کەمێک ئیسراحەت بەخۆت بدە، ئەو کوڕە پەلەی نییە، چونکە دەوڵەمەندە.

خات رولاند، بێئەوەی وەڵام بداتەوە سەرێکی بۆ لەقاند. ئەو ڕۆژە، ڕەنگی زیاتر زەرد هەڵگەڕا، رولاند دیسان هەستی پێکرد، گوتی:

- ئەمە وانابێ پیرەژنە داماوەکەم، پێویستە ئاگات لە خۆت بێ.

ئەوجا ئاوڕێکی لای کوڕەکەی دایەوەوگوتی:

- تۆ بەخۆت دەیبینی حاڵی باش نییە، دایکت بێتاقەتە، بۆ بەلای کەمەوە معایەنەیەکی ناکەی؟

پییر، بەرسڤی دایەوە: - نا، هەست ناکەم نەخۆش بێ.

رولاند، پەست بوو وگوتی:

- ئەوەی عەیانە چ حاجەت بە بەیانە! ئاخر ئەم دکتۆرییەی تۆ بەچی دەچێ ئەگەر هەست بە نەخۆشی دایکت نەکەی؟ تۆ تەمەشای بکە، تەمەشا. ئەگەر ئەم بایە لەم کونەوە بێ، ڕەنگە بمرین و ئەم دکتۆرە هەست بەهیچ نەکات.

خات رولاند کەوتە هەناسەبڕکێ، ڕەنگی بە ڕادەیەک زەرد هەڵگەڕا، مێردەکەی هاواریکرد: - خەریکە، دەبوورێتەوە.

- نا.. نا.. هیچ نییە.. تێدەپەڕێ.. هیچ نییە.

پییر، لێی نزیک بووەوە، چاوی تێبڕی وگوتی:- ها، چیتە، کوێت دێشێت؟

بەدەنگێکی نەوی و لەز گوتی:- هیچ نییە، هیچم نییە.. دڵنیابە هیچم نییە.. هیچ.

رولاند وەدەرکەوت تا سپرتۆ بێنێ، هاتەوە، شووشەکەی بۆ کوڕەکەی درێژکرد وگوتی:

- هانێ، ژانەکەی هێور بکەوە، گوێت لە لێدانی دڵی نییە؟

وەختایەک دانەوییەوە تا نەبزی بگرێت، خات رولاند لە ناکاوا بەتووندی دەستی ڕاپسکاند. دەستی کەوت بە کورسییەکی نزیکی خۆیدا.

دکتۆر بە ڕاوێژێکی سارد گوتی:- بوەستە، مادام نەخۆشیت با معایەنەیەکت بکەم.

هەنگێ هەستا، باسکی بۆ درێژ کرد، تایەکی گەرمی لیهاتبوو، گوشاری خوێنەکەی زۆر بەرز بوو. لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەڕاستی نەخۆشیت، دەبێ حەب ودەرمانی ئارامبەخش بەکار بێنی. هەنووکە ڕەچەتەیەکت بۆ دەنووسم.

وەختایەک دانەوی بووەوەو ڕەچەتەکەی دەنووسی، لە ناکاوا ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد، دایکی هانکەهانکی پێکەوتووە وخێرا خێرا هەنسک هەڵدەدا ودەگریا و دەم وچاوی لە نێو هەردوو دەستی نابوو. رولاند بە نیگەرانیەوە پرسی:

- لویز، لویز، چیتە؟ ئەوە چیتە؟

لویز، وەڵامی نەدایەوە، وادیاربوو، خەمێکی ترسناک وقورس سەری ژەندووەتە ناخی. مێردەکەی ویستی هەر دوو دەستی بگرێ و لەسەر دەم وچاوی لایان بدات. نەیهێشت و گوتی:- نا، نا، نا.

رولاند ئاوڕی لای کوڕەکەی دایەوە وگوتی:

- باشە چیەتی، بەحەیاتم بەو حاڵەوەم نەبینیوە.

پییر گوتی:- هیچ نییە، نەخۆشیەکی عەسەبی سووکە.

هەستی دەکرد، دڵی بەحاڵی دەسووتێت، ئەو ژان و ئازارە، ڕق و کینەکەی دەرهەق بە دایکی سووک دەکات، ئاستی تۆڵە خوازیەکەی کەم دەکاتەوە. وەکو قازییەک لە کارەکەی خۆی ڕازی بێت. لە دایکی ورد بووەوە.

خات رولاند، لە ناکاوا هەستا، بەپڕ تاوێکی چاوەڕوان نەکراوی ئەوتۆ کە کەس نەتوانێ بەری پێبگرێ، بەرەو دەرگاکە تەکانی دا، بەغار ڕۆیی تا خۆی لە ژوورەکەیدا

حەپـــس بكـــات. رولانـــد و دكتـــۆر ڕوو بەڕووی یەكـــدی ڕاوەستان، رولاند گوتی:- هیچ حاڵی بوویت؟

پییر، وەڵامی دایەوە:

- بەڵـێ، ئەمە جـۆرە نەخۆشـیەكی عەسـەبی سـووكە، بەزۆری لەو تەمەنەی دایكمـــدا دەردەكەوێـــت. دوور نیـــیە، زۆرجاری دیكەش تووشی ببێتەوە.

هەڵـبەتە وا دەرچـوو، تەقـریبەن هەمـوو ڕۆژێ تووشـی ئەو حـاڵە دەبوو، وەكو ئەوە بـوو كە هۆكـارەكەی پییـر بـێ، وەكـــو ئەوەی نهێنیـــیەک لە نهێنیـــیە نەزانراوەكـــانی ئەوی لەلابـێ. لە كـاتی ئیسـراحەتدا، لە ڕوخسـار وسـیمای دایكـی ورد بـووەوە. بە تـاقە وشـەیەک، ئەم ئـازارە دەروونـیەی لە ناخیا هاڕوژاند كە تا ئەم نزیكانەش، ئارام بوو.

پییـریش، بە ئەنـدازەی دایكـی ئـازاری دەچێشـت. زۆر ئـازاری دەكێشـا، چـونكە هەسـتی دەكـرد دایكـی، دایـكەكەی جـاران نییە، خۆشـی نەدەویسـت، ڕێـزی نەدەگـرت، چـونكە ئەزیەتی دەدات، ئازاری دەكێشا چونكە ئەو زامە خوێنینەی دەكولانـــدەوە كردبـــوویە دڵـــی ئەم ژن و دایـــكە. هەركـــاتێ هەستی بە كڵۆڵی و كوێرەوەرییەكانی ئەو بكردایە، هەركاتێ عەزابـی پەشـیمانی و بەزەیـی ئەنجـن ئەنجنـی بكـردایە و شـەرمی لە خـۆی بكـردایە، بە ڕق وكینـە ویرانـی بكـات، بە تەنیا دەڕۆیی بۆ شـار.. پڕ بەدڵ حەزی دەكرد خۆی بخـاتە دەریاكەوەو بخنكێ و كۆتایی بەم هەموو عەزابە بێنێت.

ئاه! چەندی حەز دەكرد، دەم ودەست لێی ببورێ! بەڵام نەیدەتوانی، لە ڕەوشێكا بوو، توانـای فەرامۆشـكردنی نەبـوو، ئەگەر بیتوانیبـــا ئەو ئەزیەت نەدات، بەخـــۆی ئەزیەتـــی

دەخـــوارد، کە لەکـــاتی ژەمەکانـــدا دەهـــاتەوە، بە کۆمەڵێـــک بڕیـــاری جـــوانەوە دەهـــاتەوە. ئەو کەچـــاوی بەو ( دایکـــی ) دەکەوت، کە چاوە بێگەرد و ڕاستگۆکانی جارانی دێنایەوە بەرچـــاوی خـــۆی و لەگەڵ چـــاوە ترســـنۆک ورەڤـــۆک وسەرگەردانەکانی ئەمڕۆییدا بەراوردی دەکرد، ئیدی خۆی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا وڕق وکینەی سەری دەکرد، دەبوایە هەرچۆنێ بوایە دەری ببڕێت.

ئەو نهێنییە نەنگینەی کە تەنیا هەردووکیان دەیانزانی خـــات رولانـــدی ئـــازار دەدا، ژەهـــرێکە ئێستا لە خـــوێنی پییـــر دایە، بە دەمارەکانیـــا دەڕوات، دەیەوێ وەکـــو ســـەگی هـــار. نهێنگیـــر، پەلامـــار بـــدات، بگرێـــت. هـــیچ لەمپەرێـــک ڕێـــی لێنەدەگرت، چونکە ئەو (لویز) بەبەردەوامی ئەنجن ئەنجن دەبوو، چونکە جان ئێستا لە شوقە تازەکەیدا دەژیا، ئێواران دەهـــاتەوە تـــا دەگەڵ خـــانەوادەکەدا شـــام بکـــات، لای ئەوان بخەوێت.

زۆرجـــار ، جـــان، داخ و پەســـتیەکی لە چـــاوی براکەیـــدا دەخوێندەوە کە نیشانەی حەسوودی و بەغیلی بوو. حەزی دەکـــرد، لە ســـنووری خۆیـــا ڕایگرێـــت، ڕۆژێـــک ئاگـــاداری بکاتەوە، چونکە ژیانی خانەوادەکە، بەو دیمەنە بەردەوام و یەک لە دووی یەکـــانەدا زۆر دژوار و نـــاڕەحەت بووبـــوو. بەڵام کەمتر لەجاران خەمی لەو قسە زبر وئەتوارە بەدانە دەخوارد، چونکە ئێستا بەجیا لە خانەوادەکە دەژیا. چونکە بە تەبـــیعەت هـــێمن بـــوو و حەزی لە ئـــارامی دەکـــرد، ئەمە کردبـــوویە کارێـــک ســـەبر بکـــات و دان بەخۆیـــدا بگرێـــت. ســـەروەت و ســـامان مەســـتی کردبـــوو، هەمـــوو بیـــری لە لای

بەرژەوەندی و قازانجە ڕاستەوخۆ و تایبەتیەکانی خۆی بوو.

کە دەگەییە ماڵەوە، زەینی پڕ بوو لە خەون و خەمێن بچووکی تازە، بۆ نموونە شێوەی پەردەکان، شێوەی شەپقە لبادەکە، قەوارەی کارتی سەردان، بیریان مژوول دەکرد. بەبەردەوامی باسی ورد ودرشتی شوقەکەی دەکرد، بۆ نموونە باسی عەلاگەی هەڵواسینی پاڵتۆ و چاکەتی نێو مەدخەلەکەی دەکرد، باسی ئەو زەنگە کارەباییانەی دەکرد، کە هەر یەکێک بە دزییەوە خۆی بەماڵەکەدا بکردایە، لە زەنگیان دەدا.

بەبۆنەی جێگیر بوونییەوە لە هەواری تازەدا، بڕیاری دا سەیرانێک بۆ گوندی ( سان جوان ) بکەن و کە دوای شێو گەڕانەوە، لەماڵەکەی ئەودا دەعوەتی چای بن. رولاند بە تەمابوو لە ڕێگای دەریاوە بۆ ئەوێندەر بڕوات، بەڵام دووری ڕێگاکە و ئەگەری ئەوەی کە ئەگەر بایەکی پێچەوانە هەڵبکات، ڕەنگە بەئاسانی نەگاتەجێ، ژێوانیان کردەوە. بۆیە گالیسکەیەکیان بۆ ئەم گەشت وسەیرانە بەکرێ گرت. دەوروبەری سەعات دە کەوتنەڕێ تا بۆ کاتی فراڤین بگەنە جێ. ڕێگا بەرینە، تەپوتۆزاوییە کە بە نێو کێڵگە و مەزرا نۆرماندییەکاندا دەڕۆیی، پێدەشت ومەزرا بەدار و درەختەکانی لە سەیرانگەیەکی بێ کۆتایی دەچوو. خانەوادەکەی رولاند و خاتوو روزمیلی و کاپتن بوسیر، هەموو بە بێدەنگی لە نێو گالیسکەکەدا دانیشتبوون، کە هەردوو ئەسپە زەلامەکە بە یورغە ڕێگاکەیان دەپێچایەوە،

دەنگی تەگەرەکان گوێی کەڕ دەکردن، لە تاو تەپوتۆز چاویان نوقاندبوو.

وەرز وەرزی میوەگەنان بوو، ئیدی کێڵگەی وێنجە و مەزرای چەوەندەران، سەوز دەچوونەوە، گەنمی زەرد، بە تیشکە زێڕینە زەرد باوەکەی گوندی ڕوناک دەکردەوە، لە تۆوایە ئەو تیشکی ڕۆژەی کە لێی دەدات، دەخواتەوە. جووتیاران لە هەندێک کێڵگاندا دەستیان بە دروێنە کردبوو، پیاوان بە خۆ وداسەکانیانەوە پەلاماری کێڵگەکانیان دەدا، کە داسە گەورەکانیان دەنایە سەر شانیان وبە نێو پەرێزەکان دەکەوتن، داسەکانی سەرشانیان لە دوورەوە لە باڵ دەچوون.

دوای دوو ساعەت ڕێکردن، گالیسکەکە بە سەمتی چەپدا پێچی کردەوە، بەلای ئاشە بایەکدا تێ پەڕی، پاشماوەی کۆمەڵێک شتی قاوەیی نیوە بۆگەنی فڕێدراوی لە پشتەوە کەڵەکە کرابوو. ئەوسا گالیسکەکە، گەیە مەیدانێکی جوان، لەبەردەم خانوویەکی جواندا وەستا، میوانخانەیەکی بەناوبانگی ئەو دیار و دەڤەرە بوو. سەرپەرشتیاری میوانخانەکە ژنێک بوو بە نێوی ئەلفونسین، ژنێکی جوان و خەنۆڵ بوو، بەدەم زەردەخەنەوە هاتەبەر دەرگا، دەستی هەردوو خانمی گرت، کە حایر ودوو دڵ لەبەردەم پلیکانە بەرزەکەدا وەستان.

کۆمەڵێک پاریسی غەوارە، لەژێر خێوەتێکی قەراخ مێرگێکی بەر سێبەری دار سێوان نانیان دەخوارد، ئەمانە لە " ئیترتا " وە هاتبوون. لە نێو میوانخانەکەوە، دەنگی هەرا وزەنا و پێکەنین و تەق وهۆڕی هیربارو ئامانان دەهات.

ئیدی دەبوا لە ژووریکدا نان بخۆن، هەموو هۆڵەکان پڕبوون. لە ناکاوا رولاند، لە بەردەم دیواریکا وەستا کە تۆڕی راوە ڕۆبیانی بەسەرەوە بوو، هاواریکرد:- هەی! هەی! چما لیرە ڕۆبیان ڕاو دەکریت؟

بوسیر وەڵامی دایەوە:- بەڵێ، زۆربەی ئەو ڕۆبیانانەی لە کەناراوەکاندا دەیبینی، لیرەوە بۆ ئەوێ دەبرین.

- خۆزیا دوای نیوەڕۆ دەچووین بۆ ئەوێندەر.

لەو کاتانەدا دەریا لە حاڵی داکشاندا بوو، کە سێ سەعاتیکی دەخایاند، ئیدی هەموو بڕیاریان دا، کە دوای نیوەڕ بە نێو تاویرەکاندا بکەون و لە ڕۆبیان بگەڕین. نانیان کەم خوارد، بۆ ئەوەی وەختایەک پێیان دەخەنە ئاوەکەوە، سەریان گێژ نەخوات. هەروەها بۆ ئەوەی خۆیان بۆ شام هەڵگرن، کە قەرار بوو سەعات شەشی ئیوارە، لە کاتی گەڕانەوەدا، شێوێکی نایابیان بۆ ئامادە کرابێت.

رولاند، خۆی پێنەگیرا، سەبری لە بەر برا. دەیویست تۆڕی تایبەت بە ڕاوە ڕوبیان بکڕیت، کە پێیان دەگوت (لانیە) کە زۆر لەو شەبەکەیە دەچوو کە لە مێرگەکاندا بۆ ڕاوە پەپولان بەکار دەهێنرێ. بریتییە لە دوو تۆڕی بچووک کە بە بازنەیەکی دارینەوە بەستراون، دەسکێکی دارینی درێژی پێوەیە. ئەلفونسینی هەمیشە خەنۆڵ، دانەیەکی بە ئەمانەت دایێ، ئەوسا دوو تەنوورەی خوری، دەڵبی درێژ وپێڵاوی وەرزشەوانی دا بە ژنەکان تا لە سەر جلەکانیانەوە لەبەری بکەن بۆئەوەی جلەکانیان تەڕ نەبێت. پیاوەکان، پێڵاوەکانیان داکەند و لەلای پینەدۆزێکی ئەوێندەر پێڵاوی قوماش و قاپ قاپیان کڕی.

ئیدی کەوتنەڕێ، تۆڕەکانیان نابووە سەرشانیان، سەلە و قەرتاڵەکانیان دابوو بە کۆڵا، خاتوو روزمیلی ئەو جلانەی زۆر لێدەهات، بەو جلانەوە لە ڕادە بەدەر جوان بوو. دەتگوت بابەل باب هەر جووتیار بووە، ئەو تەنوورەیەی کە ئەلفونسین بە ئەمانەت دابوویێ، لەم لا و لەولاوە بەرز بووبووەوە، بەجۆرێ دوورابوو، کە بتوانێ بەبێ ترس، غار بدات و بەسەر کەڤر و تاوێرەکاندا باز بدات.

دوو دەمارەکەی سەرووی هەردوو پاژنەی پێی و بەشێک لە ماسولکەی لاقی لە دەلنگی تەنوورەکەیەوە دەرکەوتبوون، ماسولکەیەکی قەڵەوی تەڕ وبڕی ژنێکی قەڵەوی بەهێز. ناوقەدی کە پشتێنی لێنەبەستبوو، وەکو سپرینگ دەلەرییەوە. شەپقەیەکی پووشی زەردباوی قەراغ پانی لە سەر بوو، کە لە هەردوو لاوە چڵەداری گەزی لێ بەرز بووبووەوە، کە دیقەتت دەدا لە سوار چاکێکی فەخرفرۆش دەچوو.

جان، لەوەتای ئەو میراتەی دەسکەوتبوو، هەموو ڕۆژێ لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ژن بێنێت یان نا ؟ هەموو جارێ کە لەوێ دەیبینی بڕیاری دەدا بیخوازێت، پاشان کە بە تەنێ دەبوو، هەستی دەکرد پێویستی بەبیرکردنەوەی زیاترە، حاڵی حازر ئەم لە خاتوو روزمیلی دەوڵەمەندترە، دەرامەتی روزمیلی، هی کرێی خانوو و مەزرا و زەوی وزاری هاڤەر، تەنیا دوازدە هەزار فرانکە، هەڵبەتە لەگینە ئەم دەرامەتە بەرەبەرە زیاد بکات و ببێت بەخاوەنی بڕە پارەیەکی مۆڵ. ئیدی لەوەیە سەروەت وسامانەکەی هاوتای سەروەت و سامانەکەی ئەم بکاتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە ئەم بێوەژنە

گەنجەی زۆر بەدڵ بوو. کە لە پێشی ئەمەوە ڕێی دەکرد، لە دڵی خۆیدا گوتی: " دەی، دەبێ قەرار بدەم. بێگومان لەم باشترم دەستناکەوێ".

بە شیوەڵەیەکدا، کە لە گوندەکەوە، بەرەو ئاودڕکەیەک دادەگەڕا، نشێو بوونەوە، ئاودڕکەکەی قەراخ ئەم شیوەڵەیە لە بەرزی هەشتا مەترەوە دەیڕوانیە سەر دەریا. لە دووی دوورەوە، لە کەناراوە سەوزەڵانەکانی دەوری دەریاکەوە، لەبەر ڕۆشنایی شینباوی زیوینی هەتاوەکەدا گۆلاوێکی سێگۆشە دەبینرا، هەروەها چارۆکەیەکیش بە ئاستەم دەبینرا و لە دوورەوە لە مێروو دەچوو. ئاسمانی ڕۆشن بە ڕادەیەک تێکەڵی ئاوەکە دەبوو، پیاو بۆی جیانەدەکرایەوە کە کامیان لە کوێدا کۆتایی دەهات و کێهەیان لە کوێوە دەستی پێدەکرد. هەردوو ژنەکە، کە سێ پیاوەکە دوایان کەوتبوون، هەردووکیان لە کراسەکانیاندا جەڕی بوون. جان لە دواوە بەچاوە پرشنگدارەکانی، دەیڕوانیە لاق و لەتەری ناسک و ناوقەدی نەرمی خاتوو روزمیلی وتەمەشای شەپقە گەورە دڵفریوەکەی دەکرد. ئارەزوو زۆری بۆ دێنا، هانی دەدا بڕیاری بنجبڕ بدات، لەو جۆرە بڕیارانەی کە خەڵکانی دوو دڵ و شەرمنۆک لە ناکاوا دەیدەن، هەوای فێنکی کەنارەکە، کە تێکەڵ بە بۆنی جۆرەها گیا و ڕووەکی وەکو جەولەق و نەفەل و بۆنی تاوێرە دیارەکانی دەریا بووبوو، گەشە وزەردەخەنەیان بەگیانی دەبەخشی و مەستیان دەکرد، لە گەڵ هەر هەنگاوێکا، لە گەڵ هەر تەمەشاکردنێکی قەدوباڵای زراڤی ئەم ژنە گەنجەدا، زیاتر لە قەراری کۆتایی نزیکتر دەبووەوە. بڕیاری دا، لەوەی پتر دوودڵ نەبێت، بەڕاشکاوی

پێـی بڵێـت کە خۆشـی دەوێـت، حەز دەکـات زەماوەنـدی دەگەڵدا بکـات. ئەم سـەفەری ڕاوە، خزمەتـی کـرد، هەلـی بـۆ ڕەخسـاند، کـردیە کارێـک ڕوو بەڕوو یەکـدی بـدینن، زەمینەیەکـی باشـی بـۆ ڕەخسـاندن، شـوێنێکی جـوانی بـۆ سـازاندبوون کە باسـی خۆشەویسـتی وڤیـان بـکەن، پێیـان خستبووە ئاوی زوڵاڵ و سافی ئەستێلان و دەیانڕوانیە ئەو ڕۆبیانانەی بە پرتاو خۆیان بە بن گیا و ڕووەکی دەریاکەدا دەکرد.

وەختـایە گەییـنە قەراخ شـیوەکەی سـەر هەڵـدێرەکە، چاویان بە باریکە ڕێیەک کەوت، کە بە درێژایی ئاودڕکەکەدا دادەگەڕا، لەخواریـانەوە، لە نێوان دەریـاکە وبنـار وناوقەدی چیاکەدا، لە ناکاو تووشـی دنیایەک تـاوێری زەلام بوون، کە هەرەسـیان هێنـابوو و بە سـەر یەکدا کەڵەکە بووبـوون وتـا چـاو بڕدەکـات، بە دەشـتاییەکی بەرز ونزمـی، سـەوزەزاردا بەرەو باشـوور درێـژ دەبـووەوە، دیـاربوو، ئەنجـامی عەردهەژی (بوومەلەرزە ) کۆن بوو، ئیدی بە درێژایی ئەم شـریتە دوور ودرێـژە، لە دڕک و داڵ ودەوەنەجـاڕ و سەوزەلانە، تاوێرە داڕوخاوەکان بەسـەر یەکا، لە شـوێنەوار و وێرانەی شارێکی گەورە دەچوو کە نوغرۆ بووبێ، کاتی خۆی ڕوانیبێتیە سـەر دەریا وشـوورە وحەسارێکی سپی و کەنارێکی تاوێرەلانی بێ کۆتایی دەوری دابێ.

خاتوو روزمیلی ڕاوەستا وگوتی: - ئەمە، ئەمە جوانە.

جـان خـۆی گەیانـدێ، دەسـتی گـرت، تـا لە سـەر ئەو پلیکانەیەی لە تاوێرەکەدا دروست بووبوو، بێتە خوارەوە.

بەرەوپـێش چـوون، بوسـیر، لە سـەر لاقە کورتەکـانی ڕاوەستا، دەستی بۆ خات ڕولاند ڕاکێشـا کە لە بەرزاییەکەدا سـەری دەسـووڕا. ڕولانـد و پییـر لە دوای هەمـووانەوە گەیینەجێ، دکتۆر ناچـاربوو بـاوکی، کە سـەری بە گێژەوە دەچوو، ڕابکێشـێت، تەنانەت ناچـاربوو بە قنگەخشـکێ و پلە بەپلە دابگەڕێ.

ئەو دوو گەنجەی لەپێشـەوە بوون، بلەز دەڕۆیشـتن، لە ناکـاوا لەلای تەختێکـی داریـنەوە، لە نـاو قەدی هەڵـدێر ولێـژگەکەدا لە شـوێنێکدا دەتکـوت بـۆ ئیسـراحەت دروسـتکراوە، جۆگەلەیەک ئاوی زولاڵیان بەدی کرد، کە لە کونێکی بچـووکەوە دەردەهـات. لەپێشـا دەڕژایە ئەسـتێڵێکی بچـووکەوە کە هەر بە ئەنـدازەی تەشـتێک دەبـوو، گـوژمی ئاوەکە هەڵی کەندبوو. ئەوسـا لەبەرزی نزیکەی مەترێکەوە، بە قەڵبەزە دادەڕژا و لە میانی باریکە ڕێگاکەدا، کە یەکپارچە جەرجیـر بـوو ون دەبـوو، پاشـان لە نێـو ئەو دڕک وداڵ و ڕووکانەدا کە لە دەشتە بەرزەکەدا ڕوابوون و یەکپارچە دار وپەردوو بوو، ون دەبوو و دیار نەدەما.

خاتوو ڕوزمیلی هاواریکرد: - ئـاه، چەندم تینووە! بەڵام چۆن ئاو بخۆمەوە؟

هەوڵی دا، بە چنگ ئـاو بخـواتەوە، بەڵام ئاوەکە لەبەینی پەنجەکـانیەوە دەڕژا. جـان بەردێکـی لەسـەر ڕێگـاکە دانـا، ڕوزمیلـی چـۆکی بەسـەریا دادا، تـا دەم بنـێ بەو سـەرچاوەیەوە کە ئـاوەکەی لێـوە هەڵـدەقوڵا. وەختـایەک سـەری هەڵبڕی کە هەزاران تنۆکە ئاوی پرشنگدار بەسـەر

دەم وچاو، قژ، برژانگ، سینگ و بەرۆکیا پڕرابوو. سەری لێ بردەپێشێ ولە بن لێوانەوە گوتی: - چەند جوانیت؟

بە زمانێک کە لە زمانی تەمبێ کردن وسەرزەنشتکرنی منداڵێکی خەتاکار دەچوو، وەڵامی دایەوە:- دەتوانی بێدەنگ بیت؟

ئەوە، یەکەمین قسەیان بوو کە تا ڕادەیەکی کەم بۆنی ئاشقێنی لێدەهات، جان، زۆر پەست بوو، گوتی:- با، تا ئەوان پێمان نەگەیشتوون، هەڵێین.

لە پڕ، پشتی کاپتن لە نزیکی ئەوانەوە بەدیارکەوت، پاشەوپاش دەهاتەخوارێ، تا بە هەردوو دەستان لەنگەری خات رولاند بگرێ، رولاند لەبەرزی تر بوو، لەوان دوورتر بوو، هێدی هێدی، بە خێرایی کیسەڵ، بەچوار چنگۆڵە دەهاتە خوارەوە. پییر، پێشی کەوتبوو و چاودێری ڕەفتاری ئەوی دەکرد.

سەرەولێژی باریکە ڕێیەکە، بەرەبەرە کەم بووەوە، دەچووەوە سەر ڕێگایەکی کەمێک لێژ کە بەدەوری تیشەلانێکی سەختا دەسووڕایەوە کە کاتی خۆی لە چیایەکە بەربووبووەوە. خاتوو روزمیلی و جان دەستیان بە غاردان کرد، دوای تۆزێک گەیینە ئەرزێکی چەو و زیخەلان، ئەوسا گەیینە تاوێرەکان، خۆیان لە تەختانیەکی دوور ودرێژا بینییەوە کە ڕووەکێن دەریایی دایپۆشی و، ئیدی چالاو و زنەێن بچووک بچووک لە پشت ئەم سەوزەزارەوە، کە لە شینایدا ڕەش دەچووەوە، دەبریقایەوە.

جان، پانتۆڵەکەی تا سەرووی ئەژنۆی هەڵکرد، هەردوو قۆڵی تا ئانیشکەکانی هەڵکرد، تا تەڕ نەبن، گوتی:- دەی!

بەبێ دوودڵی خۆی بە یەکەم چاڵە ئاودا دا. هەرچەندە روزمیلــی لەو بەپــارێزتر بــوو، خێــرا قەراری دا بچێــتە ئاوەکەوە، بەڵام بە ترسەوە بە دەوری چاڵاوە بچووکەکەدا ســوورِایەوە: ترســی ئەوەی نەبــا لە ســەر گیــایە لیــنج و خلیسکەکە بخزێ گوتی:

– هیچ دەبینیت؟

– بەڵێ، روخساری تۆ لە ناو ئاوەکەدا دەبینم.

– ئەگەر هەر ئەمە بدینی، راوێکی زۆر ناکەی.

بە دەنگێکی پڕ سۆزەوەو لە بن لێوانەوە گوتی:

– من ئاە! ئەمەم لە هەموو جۆرە راوێک پێ خۆشترە.

روزمیلی بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

– کەواتە خــۆت تــاقیبکەوە. بــزانە نێچیــرەکە چــۆن لە بەینی تۆرِەکەتەوە دەردەفرتێ.

– ئەگەر تۆ بتەوێ.. ئەو کارە دەکەم.

– دەمەوێ، تەنیا روبیان بگریت نەک شتی دی.

– هەی زۆرزان. با برِۆین بۆ شــوێنێکی دوورتــر. ئێرە هیچی لێ نییە.

دەستی گرت تا بە سەر تــاوێرە قاوەییەکاندا، بە ئاســانی بپەرِێــتەوەو نەکەوێــت، روزمیلــی کەمێــک دەترســا، جــان لە ناکـــاوا هەســـــتیکرد خۆشەویســـــتی زۆری بـــۆ دێنــــێ، ئارەزووەکانی دەبزوێنێ، تامەزرۆ و تینوی روزمیلییە، وەکو ئەوەی ئەو خولیــایەی لە ســـەری کـــرِ کەوتبـــوو، ئەمـــرِۆ تروکــابێ و بــیەوێ هەڵبــێ. خێــرا گەیینــە ئاســتی چاڵاوێکی قــووڵتر، لە ژێــر ئەو ئــاوە لەرزۆکەکەوە بەدیــارکەوت کە لە درزێکــی نادیــارەوە بەرەو دەریــا دوورەکە دەرِۆیــی، ئیــدی

جۆرەهـا ڕووەک و گیـای درێـژ و ڕەنگـین و غەریـب و جلەشڕەی ( گیای قەوزە ئاسا ) سوور و سەوز دای پۆشی بوو، لەتۆ وایە مەلەی دەکرد. خاتوو روزمیلی، هاواریکرد:

- تەمەشا! تەمەشا، دانەیەکم بینی، دانەیەکی گەورە، دانەیەکی زۆر گەورە لەوێندەرێ.

جانیش بینی، بێ سێ و دوو خۆی بە چالاوەکەدا کرد، تـا پشـتێنەی تەڕ بـوو. بەلام ڕوبیـانەکە، سمێڵە درێژەکـانی جوولانـد، بە ئەسـپایی خـۆی لەو تـۆڕە دزیـیەوە کە جـان هەڵیـدابووە نـاو گیـا وڕووەکەکـانەوە و لەوە دڵنیـابوو کە دەیگرێـت. وەختـایەک هەسـتی بە مەترسـی ئەوە کـرد کە خەریکە گەمـارۆ دەدرێ، تەکـانێکی لە ناکـاوی دا و بە ژێـر تـۆڕەکەدا فـرتەی کـرد و خـۆی لە نێـو گیـا وڕووەکە دەریاییەکاندا ون کرد.

روزمیلـی، کە بەوپەڕی دڵەڕاوکێـوە، تەمەشـای دیمەنـی ئەم ڕاوەی دەکرد، خۆی پێنەگیرا و هاواریکرد:- ئاە! دەرباز بوو! نەتگرت!

جان تووڕە بوو، بێ ویستی خۆی، تۆڕەکەی بۆ ژێر قۆپەنە گیـایەک ڕاکێشـا و ئەوسـا بـۆ سـەر ئـاوەکەی بەرز کـردەوە، سـێ ڕوبیـانی گەورەی تێکەوتبـوو. بەرێـکەوت کەوتبوونە تۆڕەکەوە. ئیدی بە خۆ نواندنەوە، سەرکەوتووانە بۆ خاتوو روزمیلی درێژی کردن کە نەیوێرا، بیانگرێت، لە سەرە چکۆلە تیژەکەی دەترسا، وێڕای ئەوەش بڕیاری دا لە لای سـمێڵە باریکەکانیـانەوە بیانگرێـت، ئیـدی یەک یەک خستنیە ناو ئەو زەمیلەیەی بە پشتییەوە بوو، تۆزێ گیای دەریایشی بۆ تێکردن تا نەمرن.

ئەوسا روزمیلی گۆلاوێکی تەنگتری دۆزییەوە، بە دوو دڵییەوە پێی تێخست، ئەوەندە سارد بوو مووچوڕکەیەکی توونـدی پێـدا هـات. ئیـدی ئەویـش کەوتە ڕاوکـردن. زۆر کارامە و لێزان بوو، دەستی نەرم و بەخێر بوو زوو هەستی بە نێچیـرەکەی دەکـرد، هەمـوو جارێـک بە لێزانـی خـۆی، گیانەوەرێکی فریو خواردووی ڕاو دەکرد. جان، دوای ئەوە هیچی دی نەدۆزییەوە، بەڵام وردە وردە پەیگیری روزمیلی دەکـرد، خـۆی لـێ هەڵدەسـوو، سـەیری دەکـرد، بە هـۆی ناکامیەکەی خۆیەوە، هەستی بە نائومێدیەکی زۆر دەکـرد، حەزی دەکرد لەوەوە فێری ڕاو بێت. گوتی:- ئۆە! فێرم کە، فێرم بکە!

ئەوسـا، لە کاتێکـا ڕوخسـاریان، بە تەنیشـت یەکەوە، لە ناو ئاوە ساف وزۆر ڕوونەکەدا، عەکس دەبوونەوە، جان بۆ ئەو سـەرەی تەنیشـت سـەری خـۆیەوە کە لە خـوارێ ڕا تەمەشـای ئەمی دەکرد، دەگرژییەوە، هەندێجار، قامکی بەو سـەرەدا دێنـا، وەکـو ئەوە بـوو لەسـەرێ ڕا بەربێـتەوە. روزمیلی گوتی:

- ئـاە! کە لاسـاری! گیـانەکەم نـابێ دوو ئـیش لەیەک کاتدا بکەی.

وەلامـی دایەوە:- مـن تەنیـا یەک ئـیش دەکەم، ئەویـش ئەوەیە کە خۆشم دەوێی.

روزمیلی، ڕاست بووەوە و، بە ڕاوێژێکی جدی گوتی:- چیتە؟ ئەقڵت تێکچووە؟

- نا، ئەقڵم تێکنەچووە. من خۆشم دەوێی، ئەنجام زاتم وەبەرخۆنا کە ئەوەت پێ بڵێم.

لە نـاو خێـزاوە سـوێرەکەدا وەسـتان کە تـا ئەژنۆیـان هـاتبوو، دەسـتیان بەسـەر دەسـکی تۆڕەکانیـانەوە خـاو بووەوە، چاویان بڕییە دوڕ چاوی یەکدی.

ئەمجارەیـان روزمیلـی، بە ڕاوێژێکـی سـوعبەت ئـامێز وجیاوازەوە گوتی:

– تـۆ بـۆچی ئەوەنـدە گێلـی لەم کـاتەدا باسـی ئەمەم لەگەڵ دەکەیت؟ ناتوانی بیخەیتە ڕۆژێکی دی و ڕاوەکەم لێ تێکنەدەیت؟

جان لەبن لێوانەوە گوتی:

– ببـوورە، ئیدی نەمـدەتوانی لەوەی پتـر سـەبر بکەم، من لە مێژە خۆشم دەوێی، ئەوە ئەمـڕۆش بەجـارێ مەسـتت کردم، ئەقڵت بە تاڵان بردم.

هەنگێ، لە ناکاوا، وادیاربوو هاتە ڕەدایە، ناچـار وازی لە ڕاوێ هێنـا، دەسـتبەرداری لەزەتەکەی بـوو، بەجـدی کەوتە قسـان و گـوتی: - بـا خۆمـان لە سـەر ئەم تـاوێرە وشـک بکەینەوە، تا بتوانین بە کاوەخۆ قسان بکەین.

بە دوو قـۆڵی خۆیـان گەیانـدە سـەر تـاوێرێکی کەمێـک بەرز، کە لە سـەر تـاوێرەکە گیرسـانەوە و شـان بە شـانی یەکدی ڕۆنیشتن، لاقیان لەبەر هەتـاوە پرشنگدارەکەدا شـۆڕ کردەوە، هەنگێ روزمیلی لە سەری ڕۆیی وگوتی:

– هـاوڕێ ئـازیزم، نە تـۆ منـداڵیت ونەمـن کچێکـی چکۆلەم، ئێمە هەردووکمـان لەوسـەری مەسـەلەکە دێینەوە. دەتـوانین، ئەنجـامی هەمـوو کارەکـانی خۆمـان بەوردی هەڵبسـەنگێنین. تـۆ کە ئەمـڕۆکە قەرارت داوە، خۆشەویسـتی

خـۆتم بـۆ دەربـڕی، مـن وای لێکـدەدەمەوە کە دەتەوێ زەماوەندم دەگەڵدا بکەیت.

هەڵبەتە جـان، چـاوەڕوانی ئەم هەمـوو تـول و تەفسـیلە نەبوو، گێلانە بەرسڤی دایەوە:- هەڵبەتە.

- باشـە، لەمبـارەیەوە قسـەت دەگەڵ داک و بابتـدا کردووە؟

- نا، من جارێ دەمەوێ بزانم تۆ پێم ڕازیت.

روزمیلـی، دەسـتی کە هێشـتا تەڕ بـوو، بـۆ درێـژ کـرد، وەختـایەک جـان بە تاسـەوە، دەسـتی دەنێو دەسـتی ئەو نـا، گوتی:

- مـن ڕازیـم، پـێم وایە تـۆ کەسـێکی بـاش و سـەر ڕاستیت. بەڵام ئەوەت لە بیر نەچێت کە من نـامەوێ داک و بابت توورە بکەم.

- پێت وایە دایکم پێشبینی ئەمەی نەکردبێ، پێت وایە ئەگەر حەزی نەکردبـا زەماوەنـد بکەیـن، بەمجـۆرەی ئێسـتا خۆشی ویستبای؟

- ڕاستە، بەڵام من کەمێک دوو دڵ و نیگەرانم.

هەردووکیان بێدەنگ بوون، جان لە خۆشیا حەپەسابوو، روزمیلـی بە پـێچەوانەوە، کەمێـک دوو دڵ بـوو. جـان دوای ئەو هەمــوو نــوکتە و مجـامەلە ئاشـقێنییەی کە بەدەم ڕاو وبەدەم خـورە خـوڕ وبڵقەبڵقـی ئـاوەوە کردیـان، چـاوەڕوانی سووکە ئاشقێنییەکی لێدەکرد، چاوەڕوانی ڕەفزێکی ڕواڵەتـی، بەڵام بە مانا و تامی ڕەزامەندی، لێدەکرد!

شـتەکە بـڕایەوە، جـان هەسـتیکرد، تەواو بەسـترایەوە، دوای بیست وشـەیەک زەماوەنـدی کـرد، ئیـدی هـیچ نەمـا تـا

بیلێت، هەردووکیان قاییل بوون، باوەڕیان نەدەهات کە شتەکە بەو خێراییە ڕووی دا، کەمێک پەشۆکابوون، نیگەران بوون، زاتیان نەدەکرد هیچ قسەیەک بکەن، دەستیان نەدەچووە ڕاو، نەیاندەزانی چ بکەن.

دەنگی رولاند، بێداری کردنەوە کە گوتی:

– لێرەوە، لێرەوە، منداڵینە! بوسیر وەرە تەمەشا بکە. ئەم قارەمانە دەریاکەی بەتاڵ کردووە.

کاپتن، نێچیرێکی سەیری ڕاو کردبوو. تا ناوقەدی تەڕ بووبوو، لە چاڵاوێکەوە دەچووە چاڵاوێکی دی، بە نیگایەک باشترین شوێنی دەدۆزییەوە. بەکاوەخۆ، زۆر بە ئەرخایەنی تۆڕەکەی دەکرد بە کەلێنەکانی ژێر ڕووەکە دەریاییەکاندا، کە بە پڕتاو ڕوبیانە بۆرقنەکانی دەگرت تا بیانخاتە زەمیلەکەیەوە، لە ناو دەستیا هەڵدەپلان، خاتوو روزمیلی، حایر و حەپەساو لێی نەدەبووەوە، بە هەموو توانایەکی خۆیەوە چاوی لەو دەکرد، تەقریبەن وەعدەکەی خۆی لە بیر کرد، جانی هەر لە بیر نەما کە دوای روزمیلی کەوتبوو، خەیاڵاوی تەمەشای دەکرد کە بە چ زەوقێکەوە، بە چ لەزەتێکی منداڵانەوە، ڕوبیانی لە ژێر گیای سەر ئاو کەوتوو دەردێنا.

رولاند، لە ناکاوا هاواریکرد: – سەیرە خۆ خات رولاندیشمان پێگەییشت.

لە سەرەتاوە، هەر خۆی و پییر بەتەنی لە سەر کەنارەکە بوون. چونکە نە خات رولاند و نە پییر، حەزیان نەدەکرد بەغاردان بە بێو تاوێرەکان بکەون و یان خۆ بە چاڵاوەکاندا بدەن، وێڕای ئەوەش دوو دڵ بوون، بە یەکەوە بمێنن. خات رولاند لەو دەترسا و کوڕەکەشی لەو ولە خۆی

دەترسا. لەو بوغزە دەترسا کە لە دڵیا پەنگی خواردبووەوە و پێی کۆنترۆڵ نەدەکرا. هەردووکیان لە بەر هەتاوەکە بوون، بای دەریاکە تینی خۆرەکەی شکاندبوو، بەردەمیان تا چاو هەتەر دەکات ئاوێکی شینی سافی زیو ئاسای بە پێل و شەپۆلان بوو. هەردووکیان، لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: " جاران ژیانی ئێرە چەند جوان و لەبەر دڵان بوو! ".

خات رولاند، زاتی نەدەکرد قسە بۆ پییر بکات، چونکە دڵنیابوو زۆر بە ڕەقی وەڵامی دەداتەوە، پییریش جورئەتی نەدەکرد قسە بۆ ئەو بکات، پییریش دەیزانی کە بە توندی بەرسڤی دەداتەوە. بە نووکی دارەکەی بەردە خڕەکانی غل دەکردەوە. خات رولاندیش بەدوو چاوی لێڵ و خەمینەوە، سێ چوار بەردی چکۆلەی هەڵگرت و بە ئەسپایی، ئەم دەست و ئەودەستی پێدەکرد. ئەوجا بە نیگایەکی حایر وحەپەساو، وێڵ و سەرگەردان ڕوانیە جان کە دەگەڵ خاتوو روزمیلیدا، لە ناوەندی گیا دەریاییەکاندا ڕاوی دەکرد. دووراودوور چاودێری ڕەفتاریانی دەکرد، بە شێوەیەکی گونگ و بە زەبری غەریزەی دایکایەتی پەی بەوە برد کە قسەکردنەکەیان، قسەکردنی ئاسایی نییە و ئەم ماستە موویەکی تێدایە.

سەیری کرد شان بە شانی یەکدی وەستاون، لە ئاوەکەدا تەمەشای یەکدی دەکەن، ڕوو بەڕووی یەکدی دەوەستن، ڕاز ونیاز دەکەن، ئەوسا سەردەکەونە سەر تاوێرەکە، دادەنیشن، قسە بۆ یەکدی دەکەن.

تارماییەکەیان بە ڕوونی دیار بوو، ئیدی لە ناو جەرگەی دیمەنانی ئاسمان و دەریا و ئاودڕەکانەوە، گەورەتر دەیان نواند.

پییرش، تەمەشای کردن، لە ناکاوا پێکەنینێکی وشکی لە زار بووەوە، خات رولاند بێئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە گوتی:- چیتە؟

پییر، کە هێشتا بە تەوسەوە پێدەکەنی گوتی:

- خۆم ڕادێنم، خۆم فێر دەکەم، بزانم چۆن پیاو خۆی بۆ خەڵەتان ئامادە دەکات.

خات رولاند، تەزوویەکی تووڕەیی پێداهات، هەڵچوو، قسەکەی پییر زۆری پەست کرد، چونکە لە مەبەستی حاڵی بوو:- مەبەستت لە کێیە؟

- مەبەستم جانە! بە ڕاستی مایەی پێکەنینە کە بەوجۆرە ببینرێ!

خات رولاند، بە ڕاوێژێکی نەوی و لەرزۆک و خەفەتبار گوتی:

- ئاخ! پییر، بەڕاستی بێ ویژدانی! ئەم ئافرەتە نموونەی وەفاداری و سەر ڕاستییە، براکەت لەو باشتری دەستناکەوێت.

پییر، بە ئانقەست، لە قاقایەکی دەستکردی پڕ بە زاری دا.

- ها! ها! ها! نموونەی سەر ڕاستی، ژنان هەموویان نموونەی سەر ڕاستین.. هەموو مێردەکانیشیان، خەڵەتاون. ها! ها! ها!

خات رولاند، بە بێدەنگی ڕابوو، بە گورجی بێئەوەی گوێ بە مەترسی هەڵخزین، مەترسی کەوتنە ئەو چاڵانەی کە گیا دایپۆشی بوون، مەترسی ئەوەی لاقی یان باسکی بشکێ، بدات. بە گورجی بە هەڵدێرە بەردەلانەکەدا داگەڕا. بە

گـورگه لـۆقه، به نـاو چاڵاوەکانـدا، ڕاسـتەوخۆ بەرەو لای کوڕەکی دیکەی ڕۆیی. وەختایەک جان بینی، گوتی:

- چیته دایکه؟ بڕیارت دا؟

بێئەوەی بەرسڤ بداتەوە، قۆڵی کوڕەکەی گرت، وەکو ئەوەی پێی بڵێت: " فریام بکەوە، لەسەرم بکەوە ".

وەختـــایەک جـــان بەو شـــەپرێویه بینـــی، بەوپەڕی سەرسامی گوتی:

- ڕەنگت به ڕووەوە نەماوە! چیته؟

بەدەم دڵه لەرزەوە گوتی:

- خەریکه دەکەوم، من له سەر ئەم تاوێرانه دەترسم.

هەنگـی جـان، دەسـتی گـرت و بـردی، به دەم ڕێگـاوە باســی ڕاوی بـۆدەکرد، تـا تـرس و نیگەرانـیەکەی له بیـر بەرێتەوە. بەڵام که زانی گوێی لێناگرێت، که زۆر پێویستی به یەکێکه گرێی دڵی خۆی بۆبکاتەوە، بۆ شـوێنێکی دووری بکێش کـرد و، به دەنگێکـی نەوی گـوتی:- به مەزەنـدەی تـۆ چیم کردووە؟

- بەڵام... بەڵام... نازانم.

- هەڵی بێنه.

- نا.. نازانم.

- کەواته باخۆم بیلێم، به خاتوو " روزمیلی " م گوت، حەز دەکەم زەماوەندی دەگەڵ بکەم.

خـات رولانـد، هیچـی نەگـوت، مێشـکی دەزرینگـایەوە، ئەوەنـدە دڵـی تەنـگ بـوو، که زۆر به زەحـمەت له قسـەی کـوڕەکەی حـاڵی بـوو، لەبەر خـۆیەوە دوبـارەی کـردەوە:- زەماوەند؟

- بەڵێ، باشم کردووە؟ جوانە، وانییە؟
- با، جوانە، چاکت کردووە.
- کەواتە تۆ قاییلی؟
- بەڵێ.. ڕازیم.
- چەند ئەو قسەیەت لەزار خۆشە. وام دەزانی پێت خۆش نییە.
- بە پێچەوانەوە.. زۆرم پێخۆشە.
- بەڕاست؟
- بەڕاست.

خات رولاند، بۆ ئەوەی بۆی بسەلمێنێ کەبە ڕاستیەتی، باسکی کوڕەکەی تووند گرت و بەگەرمی دایکانەوە ڕوومەتی ماچکرد. پاشان، کە ئەو دوو دڵۆپە ڕوندکەی زابوون چاوەکانی، سڕی، تەمەشای کرد، لە دوورەوە، لەسەر کەنارەکەدا جەستەیەکی بەدی کرد، بەدەما وەکو جەنازە کەوتبوو، ڕوخساری لەسەر زەویە بەردەڵانەکە بوو، ئەوە پییر بوو، کە نائومێدانە لە فکران ڕا چووبوو. هەنگێ جانی کوڕی بۆ دوور برد، بۆ ماوەیەکی زۆر لە نزیکی شەپۆلەکەدا باسی ئەم زەماوەندەیان کرد، کە دڵی هێنایەوە جێ.

ئیدی خێزاوی دەریاکە هەستا، بەرەو ماسیڤانەکانی (ڕاوچی ماسییان ) ڕاونان و چوون بۆ لای وان، ئەوسا هەموویان بەرەو کەنارەکە ڕۆیشتن، پییریان، کە بە درۆوە خۆی کردبووە خەوتوو، هەستاند، شامەکەیان زۆر تێروتەسەل و دوور ودرێژ، بە بادە و شەرابی زۆرەوە بوو.

## (٧)

لە نـاو گالیسـکەکەدا و بەڕێـی گەڕانەوەدا جگە لە جـان، هەموو پیاوەکان خەویان لێکەوت. بوسـیر و رولاند، هەرسـا ناساتێ بەدەم خەوەوە، بەیەکدا دەکەوتـن، شـانیان بە شـانی یەکـدییەوە بـوو. لەگەڵ هەر تەکـانێکی گالیسـکەکەدا بێـدار دەبوونەوە، لە پرخەپرخ دەکەوتن، چاویان هەڵدێنا و، خەیـاڵ و خەواڵو لە بـن لێـوانەوە دەیـانگوت: ״ جەوێکـی زۆر جـوان وخۆشـــە ״ وبـــلەز، بە هەردوو لای پـــێچەوانەی یەکدیـــدا دەکەوتنەوە.

وەختــایەک خۆیــان بە هــاڤەردا کــرد، خەو بە جـۆرێ دایگرتبوون، نەیاندەتوانی بە ئاسـانی چاو بکەنەوە.. بوسـیر کە ڕەفزی کرد لە ماڵی جان دا، کە چاییان بۆ ئامادە کرابوو دابەزێت، بۆیە هەر لەبەر دەرگاکەوە، خواحافیزیـان لێکـرد و بەڕێیان کرد.

ئەمە یەکەم شــەو بـوو کە پـارێزەرە گەنـجەکە لە مـاڵە تـازەکەی خۆیـدا دەنووسـت، لە ناکـاوا شـادییەکی منداڵانە لە سەراپای نیشت، زۆر خۆشحـاڵ بوو، دەزگیرانەکەی ئەمشەو ئەو خـانووە بـدینێت، کە دوای مــاوەیەک دەبـوو بە مــاڵ و سوکنەی ئەو.

کارەکەرەکە ڕۆیی بوو، خـات رولاند گوتی ئەو ئاوەکە گەرم دەکات، حەزیدەکرد بەخۆی چای بۆ جەمـاعەت ئامـادە بکات، چونکە حەزی نەدەکرد کـارەکەران تـا درەنگـانی شـەو بمێننەوە، لە ترسی ئاگر کەوتنەوە.

هێشتا جگە لە خۆی و کوڕەکەی و کرێکارەکـان، کەسـی دی پێیـان نە نـابووە مـاڵەکە، بـۆیە وای کردبـوو، تـا جـوانی

ماڵەکەیان بۆ بکات بە سپرایز. جان، لە مەدخەلەکەدا داوای لێکردن چاوەڕوان بکەن، دەیویست مۆم و چرا داگیرسێنێت، خاتوو روزمیلی و باوکی و براکەی لە تاریکیەکەدا ڕاگرت، ئەوسا دەرگا گەورەکەی خستە سەر گازی پشت و هاواریکرد: " وەرن! "

دالانە شووشەبەند و جامخانەکە کە ئاوێزەیەکی گەورە ڕوناکی کردبووەوەو وردە شووشە لە نێو لق وپۆی نەمامی خورما و درەختێن کاوچوک و گوڵاندا دەبریسکایەوە، کە تەمەشای ئەم دیمەنەت دەکرد، دەتگوت شانۆیە ڕازێنراوەتەوە. سپرایزێکی دیکەش مابوو. رولاند، سەری لەم فەخفەخە و دەب دەبەیە سوڕما، لە بن لێوانەوە گوتی: " بڕوانە! " پڕ بە دڵ حەزیدەکرد، وەکو چۆن خەڵکی چەپڵە بۆ سەرکەوتووان لێدەدەن، بەو ئاوایە لە چەپڵە بدات.

ئەوسا خۆیان بە هۆڵی یەکەمدا کرد، بچووک بوو، دیوارەکانی بە قوماشێکی زەردباوی وەکو ئالتوونی کۆن داپۆشرابوو، ڕێک لەو قەدیفەیە دەچوو کە لە قەنەفە دەگیرێت، هۆڵە گەورەکە کە تایبەت بوو بە ڕاوێژ و شیرەتێن یاسایی، زۆر سادە بوو، سووورباو بوو، لە ڕەنگی ماسی سەلەمون دەچوو، دیمەنێکی بەشکۆی هەبوو.

جان، لە سەر قەنەفەکەی بەردەم مێزەکەی، کە لە کتێبا بارکرابوو، دانیشت و بەدەنگێکی پڕ ویقاری دەستکردەوە گوتی:

- بەڵێ خانمەکەم، دەقێن قانوونی بنجبڕە، چەند و چوون هەڵناگرێ ئەمە دەگەڵ ئەو ڕەزامەندییەدا کە پێم ڕاگەیاندیت، متمانەیەکی ڕەهام پێدەبەخشێت کە ئەو

کەیسەی بەرگریمان لێکردووە لە زەرفی سێ مانگدا، بە ئەنجامێکی دڵخۆشکەر، کۆتایی دێت.

جان، دەیڕوانیە خاتوو روزمیلی کە بەدەم زەردەخەنەوە دەیڕوانیە خات رولاند، خات رولاند دەستی خاتوو روزمیلی گرت وگوشی. جان وەکو منداڵە مەکتەبلیان هەڵبەزییەوە و هاواری کرد:

- ئاە، دەنگ لێرە چەند ساف و ڕوونە، ئەم هۆڵە زۆر لە بارە بۆ مەرافەعە، ئەوسا کەوتە وتاردان:

- ئەگەر بەزەیی بە تەنیا، ئەگەر ئەو هەست و سۆزە ئاساییەی پێوەی دەتلێینەوە، هۆکار و سەدەمی تەبرێ بوون بێ، ئەوا ئێمە هانا بۆ سۆز وبەزەیی ئێوە دێنین دەستەی دادوەرانی بەڕێز، هانا بۆ دڵی ئێوە، دڵی باوکانەتان، دڵی مرۆڤانەتان دێنین، بەڵام ئێمە وێڕای ئەوەش، یاسامان هەیە، کە تاقە زامنی ئەو حەقەیە کە بۆ ئێوەی بەرز دەکەینەوە.

پییر، چاوێکی بە ماڵەکەدا گێڕا، کە بە تەما بوو ببێت بەماڵی ئەو، زۆر لە ڕەفتارەکانی براکەی، کە زۆری بەلاوە گەوجانە بوو، پەست بوو. خات رولاند، دەرگایەکی سەمتی ڕاستی کردەوە وگوتی: - ئەمەش ژووری نووستنە.

ئیدی، هەموو میهر و شادمانی دایکی لێ بەدیارکەوت.. پەردەی دیوارەکان، لە جۆری (کریتون) ی دروستکراوی روان بوو، هاوتای کری کۆنی نورماندی بوو.

وێنەیەکی لویسی پازدەیەم بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو. ئافرەتێکی شوان لە میدالێکدا نەخشابوو، میدالەکە بە دەنووکی جووتێ کۆترەوە بوو، دیمەنێکی گوندیاتی یەجگار جوان و ناسکی بە دیوار و پەردە و قەنەفەکان بەخشی بوو.

خاتوو روزمیلی گوتی:- ئاه ئەمە زۆر جوانە.

روزمیلـــی کە چـــووە نـــاو ژوورەکەوە، زۆر جـــدیتر دەرکەوت. جان لێی پرسی:- ئەمەت بەدڵە؟

- زۆر.

- ئەم ڕەزامەندییەی تۆم زۆر پێخۆشە.

بۆ ساتێک، بەوپەڕی میهر وسۆزەوە، ڕوانیانە یەکدی، وێـــڕای ئەوەش، وەختـــایەک روزمیلـــی خـــۆی لە ژووری نووستنەکەدا، کە دەبوو بە ژووری بووکێنی خۆی، هەستی بە ســـووکە دڵەنگـــیەک کـــرد، کەمێـــک شـــڵەژا. کە چـــووە ژوورەکەوە، هەستی کـــرد سیســـەمەکە زۆرپـــانە، سیســـەمی زەماوەنـــدی ڕاســـتەقینەیە، بێگومـــان خـــات رولانـــد هەڵـــی بژاردبوو، چونکە حەزی دەکرد، کوڕەکەی بە زووترین کات ژن بێنێـت. ئەم مشـــورخۆری و تەگبیـــرە دایکـــانەیەی خـــات رولانـدی زۆر بەدڵ بوو، وەکو ئەوەبوو بە روزمیلی بڵێت: چاوەڕوانی ئەون کە ببێت بە یەکێک لە ماڵباتەکەی وان.

وەختایەک بۆ هۆڵەکە زڤڕینەوە، جان لە ناکاوا دەرگای لای چەپی کـردەوە، ژووری نانخواردنیـان بینـی، ژوورێکـی بازنەیی بوو، گەورە بوو. سێ پەنجەرەی هەبوو، سێ چرای ژاپۆنیان بەسەرەوە بوو. دایک و کوڕ جۆرەها توحفەیان تیـا دانـابوو، ژوورەکە بە کەل وپەلی حەیزەران مۆبیلە کرابوو، بە پەیکەری ماگوی چینی و سـوالەت و پـارچەێن ئاوریشـمی زێڕکفت و پەردەێن تەنکی ڕازاوە بە مراوری چوون دڵۆپە ئاو، بە تابلۆ و شمشێر و کڵاوخود و قورینگی مومیا کراو، بە ئامـــانێن ناســـک و جـــوانی ســـوالەت و لە دار و عـــاج و ســـەدەف و برۆنـــز دروســـتکراو ڕازێنرابـــووەوە. ژوورەکە هەنـدێک قەرەبـاڵغ بـوو، زێـدەڕۆیی لە ڕازانـدنەوەی کرابـوو،

دەستانی ناکارامە ئەنجامیان دابوو، ڕەچاوی زەوق و پەروەردەی هونەری نەکرابوو، کەچی لە ژوورەکانی دی زیاتریان بەدڵ بوو.

تەنیا پییر، کۆمەڵێک ئیرادی تەوسامێزی گرت کە کردیە کارێک کە براکەی لە ڕوو دابمێنێت. ئیدی میوە لە سەر مێزەکە قەڵا قەڵا هەڵدرابووەوە، قاپی شیرینی وەکو مینۆمێنتان بەرز بووبووەوە. جەماعەت زۆر برسیان نەبوو، میوەکانیان مژی، سەروقەپیان لە شیرینیەکان دا و بە نیوە خوراوی وازیان لێهێنان. دوای سەعاتێک خاتوو روزمیلی دوعای خزمەتی خواست.

بڕیاردرا کە بابە رولاند، تا بەر دەرگای ماڵەکەی خۆی لە گەڵیا بڕوات، یەکسەر لە گەڵ روزمیلی دا وەدەرکەوت. خات رولاند لە غیابی کارەکەرەکەدا، چاوێکی دایکانەی بە ماڵەکەدا گێڕا، تا دڵنیا ببێت کە ماڵی کوڕەکەی لە هیچی کەم نییە. رولاند پرسی:

- بێمەوە بە دوورا؟

خات رولاند، دوای دوو دڵیەکی کەم گوتی:

- نا گیانەکەم، بۆ خۆت بنوو، پییر دەمهێنێتەوە.

دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، خات رولاند مۆمەکانی تەمراند، میوەکانی هەڵگرت، شەکر و شەرابەکانی خستە دۆلابەکەوە و کلیلەکانی دانە دەست جان، ئەوسا چوو بۆ ژووری نووستنەکە، تەمەشایەکی سیسەمەکەی کرد، تەمەشای سوراحیەکەی کرد تا بزانێ ئاوی ساردی تێدایە یان نا، ئەوسا سەیری کرد تا بزانێ پەنجەرەکە بە باشی داخراوە یان نا. پییر و جان، بە دوو قۆلی لە هۆڵە بچووکەکەدا بوون، جان، هێشتا لەو ئیرادەی پییر پەست

بوو کە لە زەوقی دابوو، پیریش زۆر تووڕە بوو لەوەی کە براکەی لەم خانووەدا دەبینی. بە دوو قۆڵی، بەدەم جگەرەکێشانەوە دانیشتبوون و کەسیان قسەیان لە گەڵ یەکدیدا نەدەکرد، پییر لە ناکاوا هەستا وگوتی:

- ئەمڕۆ بێوەژنەکە زۆر ماندوو بوو، بەکەڵکی سەفەر نایەت.

جان، لە ناکاوا، بە هەشتاو ڕابوو، وەکو کەسێکی دڵشکاو تووڕە بوو، دڵی تەنگ بوو، بە ڕادەیەک پەست و دڵگران بوو، زمانی خەریک بوو لە گۆ دەکەوت، بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- لە ئێستا وهێوە، قەبووڵ ناکەم کە باسی خاتوو روزمیلیت کرد، پێی بڵێی بێوەژن!

پییر، بە فرناخیەوە ئاوڕی لێدایەوەوگوتی:

- وادیارە دەتەوێ ئەمرم پێبکەیت. یانی بەو ڕادەیە شێت بووی؟ شێتیش بەو ڕادەیە؟

جان، هەستایە سەرپێیان وگوتی: دەگەڵ منا.

- نا، شێت نەبووم، بەڵام ڕەفتارت دەهری کردووم.

پییر، بەدەم پێکەنینێکی تەسامێزەوە گوتی:

- لەگەڵ تۆدا؟ باشە تۆ بەشێکی لە خاتوو روزمیلی؟

- نا، بەڵام چاک بزانە خاتوو روزمیلی دەبێ بە خێزانم.

پییر، بە دەم تەوسخەنێکی توندترەوە گوتی:

- ها! ها! زۆر چاکە. ئێستا تێگەیشتم بۆچی نابێ بە بێوەژنەکە ناوی بەرم. تۆ ڕێگەیەکی ناسکت گرتەبەر تا هەواڵی زەماوەندەکەتم پێڕابگەیەنی.

- من قەبووڵ ناکەم گاڵتەم پێبکەیت.. گوێت لێیە.. لێتی قەبووڵ ناکەم!

جان، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، دەنگی دەلەرزی، زۆر لەو تەوس وتوانجەی براکەی پەست بوو کە ئاراستەی ئەو ژنەی کردبوو کە ئەم خۆشی دەویست و بەگەنی کردبوو، پییریش لە ناکاوا وەکو برایەکەی تووڕەبوو، هەرهەموو ئەو تووڕەییەی لە دڵیا پەنگابووبووەوە، هەرهەموو ئەو بوغز وکینەیەی لە ناخیا کەڵەکە بووبوو، هەرهەموو هەڵچوونە سەرکوتکراوەکانی، نائومێدییە بێدەنگەکانی بە جارێ تەقینەوە، دای لە کەللەی و، وەکو گوشاری خوێن بەرز بووەوە وگوتی:

- حەدت چییە؟ ناماقووڵیت کرد.. من ئەمرت پێدەکەم دەمت تێکبنەی، گوێت لێیە، من ئەمرت پێدەکەم!

جان، واقی لەم هەڵچوون وتووڕەبوونە ورما، کەمێک بێدەنگ بوو. لە زەینی شپرزەی خۆیدا، بۆ وشەیەک، ڕستەیەک دەگەڕا کە براکەی پێ بریندار بکات.. هەوڵێکی زۆری دا کە خۆی کۆنترۆڵ بکات، بە هێمنی قسان بکات، بۆ ئەوەی زیاتر براکەی بریندار بکات، گوتی:

- ماوەیەکی زۆرە دەزانم کە تۆ ئیرەییم پێدەبەیت، ماوەیەکە کە دەزانی من بە وشەی بێوەژن قەڵس دەبم، تۆ زیاتر بەکاری دەبەی، ئەمەت لە بەغیلی و ئیرەییە.

پییر، قاقایەکی تەوسامێزی لێدا وگوتی:

- ها! ها! خودایا!سەیرە! ئیرەییت پێدەبەم! من؟.. من؟.. من؟.. ئاخر ئیرەیی بەچیتا بەرم؟.. بە چیتا؟ بە قوزیەکەتا یان بە ئەقڵە گەورەکەتا؟..

جان، زۆر چاک هەستی بەکاریگەری قسەکەی خۆی کرد وگوتی:

- بەڵێ، تۆ غیرە لە من دەکەی، بەغیلیم پێدەبەیت، تۆ لە منداڵیتەوە بە بەغیلی هاتوویت و کەسێکی بەغیل بوویت، کە زانیت ئەم ژنە منی دەوێ و تۆی ناوێت، ئیدی ڕق وکینەت کردووە بە پیشە.

پییر، زمانی تێک ئالآ، لەم گومان و مەزەندەیە پەست بوو، گوتی:

- من.. من.. غیرە لە تۆ دەکەم، بەغیلیت پێدەبەم؟ بە هۆی ئەم ژنە گەوجەوە، بەهۆی ئەم مریشکە حەبەشییەوە، بە هۆی ئەم قازە قەڵەوەوە؟

جان، کە هەستی کرد، تانە لە سەر تانەی لێدەدا، بەرسڤی دایەوە:

- ئەو ڕۆژەی کە لە کەشتیی مرواری دا خۆت تاقیکردەوە، کە لە من زیاتر و باشتر سەوڵ لێبدەیت؟ ئەو قسەیەی لەبەردەم خاتوو روزمیلیدا کردت، بۆ ئەوەی لەبەر چاوی ئەودا خۆت بنوێنیت؟ بەڵام تۆ لە حەسوودیدا دەمریت! کە ئەو سەروەتە بە من بەخشرا، ئیدی ڕقت لێهەڵگرتم، بە هەموو جۆرێک ئەوەت دەربڕی، هەموو خەڵکەکەت ئازار دا، بەردەوام ئەو تاڵاوەت کاوێژ دەکردەوە، کە هەناسەتی سوار دەکرد.

پییر، بەڕادەیەک هەڵچوو کە لە حەژمەتا هەردوو کۆڵەمستی گوشین، بەو بوایە پەلاماری براکەی بدات و، دەست بنێتە بینی. گوتی:

- ئاە! بێدەنگ بە، باسی ئەم سەروەتە هەر مەکە!

جان هاواریکرد:

- بەڵام، تۆ ئیرەییت لێ دەچۆڕێ. جارێ نەبوو قسە دەگەڵ بابم ودایکم و، یان مندا بکەیت، کە ئیرەییت پێوەدیار نەبێت. تۆ بۆیە من دەبوغزێنی چونکە حەسوودیت! بۆیە بەگژ ئەم خەڵکەدا دەچیت چونکە بەغیلی. ئێستاش چونکە دەوڵەمەند بووم ئیدی خۆت پێ کۆنترۆڵ ناکرێت و بوویت بە بوونەوەرێکی ژاردار، دایکمان ئازار دەدەیت و بیانووی پێدەگریت وەکو ئەوەی ئەو شتە زادەی خەتا وهەڵەی ئەوبێت!

پییر، تالای کوورەکە پاشەکشەی کرد، دەمی داچەقی بوو، چاوی ئەبڵەق بووبوون، کەرێتی ئەو سەگە گرتبووی کە بۆ ئەنجامدانی تاوان هاندەدرێت. بەدەنگێکی نزمتر، بەڵام پڕ هانکە هانک گوتی:- بێدەنگ، دەمت تێکنە!

- بێدەنگ نابم. دەمێکە دەمەوێ، بیر وهزرینی خۆمت بەڕوونی ورەوانی پێ ڕابگەیەنم، ئیدی وا خۆت زەمینەت بۆ خۆشکردم، بەڕاستی شەرمە بۆ تۆ، کە سوور دەزانی من ئەو ژنەم خۆشدەوێ و تۆ بە بەرچاوی منەوە گاڵتەی پێدەکەیت. بەڵام دەم ودانت دەشکێنم، ئەو دانانەی دەڵێی دانی ئەژدیهان، من ناچارت دەکەم کە ڕێزم بگریت.

- ڕێزت بگرم. ڕێزی تۆ!

- بەڵێ، ڕێزی من!

- ڕێزت بگرم.. ڕێزی تۆیەک کە بە تەماعکاری خۆت هەمووومانت شەرمەزار کرد؟

- چیت گوت؟ بیڵێوە.. بیڵێوە؟

- دەڵێم، نابێ کەس میراتی پیاوێک وەربگرێت و سوور بزانێ کوڕی پیاوێکی دیکەیە.

جـان، بێـدەنگ بـوو، هـیچ حـاڵی نەبـوو، سـەری لەم تانەوتەشەرە دەرنەکرد. گوتی:

– چۆن؟ وتت.. دووبارەی بکەوە؟

– ئەوەم پێ گوتی کە هەموو خەڵکی دەیڵێنەوە، بووە بەداستان و کەوتووەتە سەر زاران.. تۆ کوڕی ئەو پیاوەی کە میـراتەکەی خـۆی بـۆبەجێ هێشـتوویت. کـوڕی پـاک وحەڵاڵزادە، سەروەتێک قەبووڵ ناکات، کە ناو وباوی دایکی بزڕێنێت.

– پییر.. پییر.. پییر تۆ چۆن باوەڕ بەمە دەکەیت؟ تۆ.. تۆ.. تۆ ئەم قسە نەنگینە دەکەیت؟ ئاخر ئەمە کەی قسەی تۆیە؟

– بەڵێ.. من.. من. کەواتە تۆ هەستت بەوە نەکردووە کە چۆن خەریک بوو لە داخ وکەسەردا دەمردم، ئەوە یەک مانگ پترە شەو تا بەیانی خەوم پێدا ناکەوێ و بەداخەوە دەتلێمەوە، بە ڕۆژەوە وەکو حەیوان خۆم دەشارمەوە، ڕووی ناو خەڵکیم نەماوە.. نەمدەزانی چ دەڵێم، نەمدەزانی چی دەکەم، بۆ وام بەسەر هاتووە، زۆرم ئازار دەخوارد.. ئیدی زیرەم لەو نەنگە کردبوو، هەوەڵجار تەنیا گومان بوو لەلام.. ئێستا تەواو بۆم ڕوون بووەتەوە.

– پییـــــر.. بێـــــدەنگ بە.. دایکـــــم لە ژوورەکەی تەنیشتمانەوەیە! بیر لەوە بکەوە نەبا گوێی لێمان بێت.. لەگینە گوێی لێمان ببێت.

پێویسـتی بەوە بـوو، گرێـی دڵـی خـۆی بکـاتەوە، هەرچیەکـی لە دڵـدایە بیڵێـت، گومانەکـانی، بەڵگەکـانی، یەقینەکانی، چیرۆکی ئەو وێنە چکۆلەیەی کە جارێکی دی

غەیب بووبوو، هەرهەمووی هەڵڕێژێت. ئەو قسانەی دەیکردن، کورت وپچڕپچڕ بوون، پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بەیەکەوە نەبوو، لە قسەی پیاوێک دەچوون کە وڕاوە بکات. پێدەچوو، ئێستا ئاگای لە جان نەمابێ، ئەوەی بیرچووبێ کە دایکی لە ژوورەکەی تەنیشتەوەیە. بەجۆری داخاوت وەکو ئەوەی چ کەسێک گوێی لێی نەبێت، پێویست بوو قسان بکات چونکە گەلەک کەسەردار بوو، تەواو زۆری بۆ هاتبوو، زامە سارێژ بووەکەی وەکو دوومەڵ دەئاوسا، ئیدی ئێستا ئەم دوومەڵە دەربووبوو، هەموو خەڵکەکەی لەوتاندبوو. وەکو هەموو ڕۆژێک دەستی بە ڕۆیشتن کرد. چاوەکانی بڕی بوونە بەردەم خۆی، بەهەڵچوونێکی نائومێدانەوە ئاماژەی دەکرد، هەناسە لە ئەوکی گیرابوو. ڕق وبوغزەکەی بۆ هاتەوە، بە ئاوایەک داخافت، وەکو یەکێک دانی بە کڵۆڵی و داماوی خۆی وکەس وکارەکەیدا نابێ، وەکو یەکێک هەموو ژان و ئازارەکانی خۆی کردبێ بە حەوای کەڕ ونادیاردا و، ئەو حەوا وئاسمانەی کە وشەکانی تیادا دەفڕی.

جان پەشۆکا، لە ناکاوا، قەناعەتی بە هەڵچوونە کوێرانەکانی براکەی هێنا، پشتی نا بە دەرگاکەی پشتەوە، پێی وابوو دایکیان لەو دەرگایەوە گوێی لێیان دەبێت. دایکیان نەیتوانی لەو دەرگایەوە بێتەدەرێ، دەبوایە بە هۆڵەکەدا تێپەڕێت. کەچی نەگەڕایەوە، دیاربوو جورئەتی نەکردبوو.

پییر، لە ناکاوا پێی بە عارددیا کێشا و هاواریکرد:- بۆیە ئەمەم گوت چونکە بەرازم.

به سەری کۆتەوە، لە پشت پلیکانەکانەوە دیار نەما، جان، کە ئازای تەزی ( سڕبوون) بوو، لە دەنگی دەرگە گەورەکەی دەرەوە کە بە توندی درا بەیەکا، بێدار بووەوە. چەند ساتێکی بە سەرا بووری کە هەر چرکەیەکی لە سەعاتێ درێژتر بوو. لەم ماوەیەدا روحی گەوجانە خاو دەبووەوە. هەستیکرد پێویستە بلەز بیربکاتەوە وهەڵوێست بنوێنێت، بەڵام چاوەڕوانی کرد، لەبەر ترسنۆکی و لاوازی خۆی حەزی نەدەکرد هیچ شتێک تێبگات و بزانێت، نەیدەویست هیچی بیر بکەوێتەوە. بە تەبیعەت لەو کەسانە بوو کاری ئەمڕۆ دەخەنە سبەی. وەختایەک پێویست بکات قەرارێکی خێرا بدەن، بە غەریزە لە بیانوویەک دەگەڕێن کە پەلە نەکەن.

لە ناکاوا، ئەو بێدەنگیە مەنگەی کە دوای هاوارەکەی پییر، تێی ئاڵا ترساندی، ئەو بێدەنگیە کوت وپڕەی کە لە دیوار وکەل وپەلەکانەوە هەڵدەقوڵا، دەگەڵ ڕۆشنایی شەش مۆم ودوو چرادا، بەڕادەیەک ترس وخۆفیان خستە دڵییەوە، کە پڕ بەدڵ حەزی دەکرد هەڵێت.

مێشکی خۆی تەکاند، بیرەکانی دوور خستنەوە، ویستی بیربکاتەوە.. لە ژیانیا هیچ دژواری و ناخۆشییەکی نەبینی بوو. لەو خەڵکە نازدارانە بوو کە ژیانیان وەکو ئاوی ڕەوان، دەقەتێ، قۆناغەکانی مەکتەب وخوێندنی بەجدی و بێ هیچ سزایەک بڕی، چونکە ژیانی ئارام و بێ کێشە وئاریشە بوو، خوێندنی یاسای بە ڕێک وپێکی وبێ هیچ گرفتێک تەواو کرد. هەموو شتەکانی ئەم دنیایەی بەلاوە ئاسایی بوو، هیچ شتێک مایەی سەرنج نەبوو. بە تەبیعەت حەزی لە نیزام و

زاکـونی و ئـارامی بـوو، هـیچ گرێیەکـی دەروونــی نەبـوو، سەبارەت بەم کارەساتە، وەکو پیاوێک بوو، کەوتبێتە ئاوەوە ومەلە نەزانێت.

هەوەڵجــــار تیامــــابوو. ئایــــا بــــراکەی بە هــــۆی ڕق وحەســوودی خـۆیەوە درۆ دەکـات؟ باشــە ئەم کـوڕە زۆر گوناح نییە، زۆر سەرگەردان و نائومێد نییە کە ئەم شـتە بە دایکـی دەڵـێ. جـان، هەنـدێ قسـەی پییـری لە گـوێی دا، لە نیگایــدا، لە مێشـکیا، لە جەســتەیدا هەڵگرتبــوو، هەروەهــا هەنـدێک لە هـاوارە بە سـۆییەکانی، لە هەڵـس وکەوتە زۆر ناخۆشەکانی، کە وەکو یەقین دەیاننواند، هەڵگرتبوو.

ئیدی دەستەوەستان نەیدەتوانی هیچ کارێک بکـات، لە ڕادەبەدەر نیگەران و دڵتەنگ بوو، هەستی دەکرد دایکی لەو دیــو دەرگــاکەوەیە و، گـوێی لە هەمــوو شــتێکە وتەمەشــا دەکات. ئاخۆ چی دەکات؟ هیچ جووڵەیەک نییە، کە نیشانەی ئەوەبـێ کەسـێک لەو دیـو دەرگـاکەوەیە، نە جـووڵەیەک، نە هەناسەیەک، هەست پێدەکرێت. تۆ بڵێی هەڵاتبێت؟ بەڵام بۆ کــوێ؟ ئەگەر هەڵاتبێــت.. دەبــێ لە پەنـــجەرەکەوە خــۆی هەڵدابێتە سەر جادەکە!

تەزوویەکــی زۆر خێــرای بەترســی بە قاڵبیــدا هــات، یەکسەر هەستایە سەرپێیان، بە توندی پاڵی بە دەرگاکەوە نـا، نەیکردەوە.. بە پرتـاو بۆ ژوورەکەی خۆی چوو. چۆڵ بـوو، تەنیـا یەک مـۆمی تیـا دەسـووتا، لە سـەر کـۆمەدیەکە دانرابوو.جـان، بە هەشـــتاو بەرەو لای پەنـــجەرەکە چـــوو، بەچـاوی نـیگەرانەوە کەوتە تەمەشـای گۆشــە وکەنارەکـان،

سەیری کرد پەردە و چەرچەفی سیسەمەکە دادراوەتەوە، ڕایکرد و لای برد.

دایکی لە سەر سیسەمەکەی ئەو ڕاکشابوو، دەم وچاوی لە بالیفەکەدا نقوم بووبوو، توونـد بە هەردوو دەستی گرتبووی تا لەوەی پتر گوێی لە هیچ نەبێت. هەوەڵجار وایزانی خنکاوە. ئەوسا هەردوو شانی گرت، وەری گێڕا، بەڵام دەستبەرداری ئەو بالیفە نەبوو کە بە دەم وچاوییەوە گرتبوو و قەپی پێدا کردبوو تا هاوار نەکات.

تەماسی ئەم جەستە ڕەق بووە و ئەم باسکە گرژانە، تەزوویەکی بە سەراپایدا هێنا، هەستی بەو عەزابە بەترەفە، ئەو ئازارە لە وەسف نەهاتگەی کە دایکی پێوەی دەتلایەوە. دەکرد. زۆر بەتووندی، بە دەست و بە دان قوماشە پڕ لە پەڕەکەی بالیفەکەی گرتبوو، نابوویە سەرچاوی، نابووی بە گوێچکەکانیەوە بۆ ئەوەی کوڕەکەی نەیبینێ، قسەی دەگەڵدا نەکات، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئەو شۆکە بوو کە تووشی بووبوو، بەڵگەی ئەو ئازارە بوو کە پێوەی دەتلایەوە. جان، زۆر بەزەیی پێدا دەهاتەوە، دڵە ساویلکەکەی خەریک بوو لە بەزەییدا ئەنجن ئەنجن دەبوو. هێشتا نەبووبوو بە قازی، خۆبەخۆ قازییەکی بە ڕەحم بوو. پیاوێک بوو لێوان لێو لە لاوازی، کوڕێک بوو سەرڕێژ لە میهرەبانی. هیچ قسەیەکی پییری بیر نەکەوتەوە، بیری لێنەکردەوە، گەنگەشەی نەکرد، بەهەردوو دەستان جەستە جەمەدییەکەی دایکی گرت، نەیتوانی بالیفەکە لە سەر ڕوخساری لابدات، بەدەم ماچکردنی جلەکانیەوە

هاواریکرد:- دایکە، دایکە، دایکە بەسەزمانەکەم، تەمەشای من بکە!

ئەگەر، هەموو ئازای ناو بەناو، تەزوویەکی بە ئاستەمی پێدا نەهاتبا، سەد سوێندت خواردبا کە مردووە، سوێندت نەدەکەوت. جان لێکدا لێکدا دەیگوت و دەیگوتەوە:

- دایکە، دایکە، گوێ لە من بگرە، ئەمە ڕاست نییە، سوور دەزانم کە ئەمە ڕاست نییە.

هەناسەی خات رولاند تەنگ بوو، ئەوسا گریان لە ئەوکی گیرا، هەر بە بالیفەکەوە کەوتە هەنسک هەڵدان، هەنگێ ئازای خاو بووەوە، قامکەکانی کرانەوە، بالیفەکەی بەردا، ڕوخساری دەرکەوت.

ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، تەواو سپی بووبوو، چاوانی نوقاندبوون، جان ڕیزە ڕوندکێکی بەدی کرد کە بە گۆناکانیا دەهاتنەخوارێ. دەستی لە ملی کرد، بە ئەسپایی و بە داخ و کەسەرەوە چاوە فرمێسکاوییەکانی ماچ باران کرد، بەردەوام دەیگوت و دەیگوتەوە: - دایکە، دایکە ئازیزەکەم، من دەزانم ئەمە ڕاست نییە، مەگری، من ئەوە دەزانم! ئەمە ڕاست نییە!

خات رولاند، دانیشت، تەمەشای جانی کرد، بەهەمان بێپەروایی و ئازایەتی کەسێکەوە کە بیەوێ خۆی بکوژێت، بە جانی گوت:- نا، ئەمە ڕاستە کوڕەکەم.

بۆ چەند ساتێک هەردووکیان بێدەنگ بوون، کڕوکپ بەرانبەر بەیەکدی وەستان، خات رولاند کە خەریک بوو دەخنکا ملی بەرز کردەوە، سەری بردە دواوە، تا هەوا

هەڵمژێت، ئەوسا سەرلەنوێ خۆی کۆنترۆڵ کردەوەو دووبارە گوتی:

- ئەمە ڕاستە کوڕم، درۆی بۆ چییە؟ ئەمە ڕاستە. ئەگەر درۆم بکردایە باوەڕت پێنەدەکردم.

خات رولاند، شێت ئاسا، ترس دایگرت، جان لە نزیکی سیسەمەکە کەوتە سەرچۆکان و لەبن لێوانەوە گوتی:- بێدەنگ بە دایکە، قسەی وا مەکە.

بە توانا و ڕژدبوونێکی ترسناکەوە هەستا و گوتی:

- هیچی دیم نەماوە پێتی بڵێم. بە دوعا کوڕەکەم.

خات رولاند، بەرەو دەرگاکە ڕۆیی، جان، باوەشی پێدا کرد و هاواریکرد: - چی دەکەی دایکە؟ بۆ کوێ دەڕۆیت؟

- نازانم.. چوزانم!.. هیچ کارێکم نییە بیکەم.

بە تەنیا، هەنگاوی هەڵێنا تا هەڵێت. جان توونـد گرتی، تەنیا یەک وشەی پێ بوو کە لێکدا لێکدا دووبارەی دەکردەوە:- دایکە، دایکە، دایکە..

خات رولاند، بەدەم خۆ ڕاپسکاندنەوە، کە دەیویست خۆی لە دەستی کوڕەکەی دەرباز بکات، گوتی:

- نا، نا، لە ئێستا بە دواوە ئیدی دایکت نیم، نە بۆ تۆ و نە بۆ هیچ بەنی بەشەرێکی دی ناکەمە هیچ، هیچ، هیچ! نە باوکت هەیە و نە دایک کورەکەم!! بە دوعا.

یەکسەر زانی کە ئەگەر بیەڵێت بڕوات، ئیدی هەرگیز نایبینێتەوە. بەرزی کردەوە و لە سەر قەنەفەکە داینا، بە تۆبزی داینا، ئەوجا کەوتە سەر ئەژنۆیان، باوەشی پێدا کردو گوتی:

- هەرگیز لێرە دەرناچیت، دایکەگیان، من خۆشم دەوێی، من دەتپارێزم، تۆ دایکی منیت.

خات رولاند، بە ڕاوێژێکی ماندوو و، لە بن لێوانەوە گوتی:

- نا کوڕەکەم، شتی وانابێت، ڕاستە تۆ دەرم ناکەیت، بەڵام بە هیچ جۆرێ نام بوریت.

- من؟ من؟ تۆ باش نامناسیت.

بەوپەڕی دڵسۆزی وخۆشەویستییەوە ئەو قسەیەی کرد. تەنانەت خات رولاند هاوارێکی کرد، سەری جانی گرت، پڕ بە هەر دوو دەستی قژەکەی گرت، بەتووندی ڕایکێشا و بە حەواسپەرتی ڕوو و ڕوخساری ماچ کرد، ئەوسا بێدەنگ بوو، ڕوومەتی نا بە ڕوومەتی کوڕەکەیەوەو لە میانی ڕدێنەکەیەوە هەستی بە گەرمی گۆشتەکەی کرد، ئەوسا دەمی لە پەنا گوێی نا و بە ئەسپایی و بە چپەدوو گوتی:

- نا کوڕە ئازیزەکەم جان، تۆ سبەی لێم نابووریت، تۆ باوەڕت بەوە هەیە و خۆت دەخاپێنی، ئێستا لێم دەبووری، ئەم بوردنە ژیانی دەرباز کردم، بەڵام پێویست ناکات چیتر بمدینیت.

جان، دایکی گرتبوو، دووبارەی کردەوە:- دایکە، قسەی وا مەکە!

- بەڵێ ڕۆڵەکەم، پێویستە بڕۆم. نازانم بۆ کوێ و چۆن ئەم کارە دەکەم و، چی دەڵێم، بەڵام پێتڤیە بڕۆم. جورئەت ناکەم نە تەمەشات بکەم و نە ماچت بکەم، تێدەگەیت؟

هەنگیٚ جان، بە گوێیدا چپاند:

- دایکی ئازیز، نابێ بڕۆیت، چونکە من حەز ناکەم، من پێویستم بە تۆیە، دەبێ هەر ئێستا سوێندم بۆ بخۆیت کە ناڕۆیت.

- نەخێر کوڕی خۆم.

- ئۆف، دایکە گیان، دەبێ بە قسەم بکەیت، نابێ بڕۆیت، گوێت لێمە، دەبێ..

- نەخێر کوڕەکەم، ئەمە مەحاڵە، ئەمە ژیانی هەردووکمان دەکاتە دۆزەخ. من ئەمە دەزانم، من دەزانم ئەمە سزایە، سزایەکە مانگێکە دەستی پێکردووە. تۆ بەزەییت پێمدا دێتەوە. بەڵام دوای ئەوە، وەختایەک قسەکەی منت بیردەکەوێتەوە، بەهەمان چاوی پیرەوە تەماشام دەکەیت!.. ئاه جان گیان، بیربکەوە.. بیربکەوە من دایکتم!..

- دایکە، من نامەوێ بەجێم بێڵیت، من، خودی تۆم.

- بەڵام بیربکەوە کوڕەکەم، چاومان لە حانای یەکدا هەڵنایەت، ڕەنگی شەرمەزاریمان لە ڕوو دەنیشێت، من لە شەرمەزاریدا دەمرم، چاوم لەبەر چاوانت هەڵنایەت.

- ئەمە ڕاست نییە دایکە گیان.

- با، با، با ئەمە ڕاستە! ئاه! ئێستا لە هەموو کێشەکانی برا داماوەکەت حاڵی بووم، لەمڕۆوە بۆم بەدیارکەوت. ئێستا کە هەست بە هەنگاوەکانی، لە ماڵەکەدا دەکەم، دڵم دادخورپێ، خەریکە لە سینگم دێتە دەرەوە، کە گوێم لە دەنگی دەبێت، هەستدەکەم خەریکە لە خۆ دەچم، تۆ لەوەتای بوویت و تا ئێستا هی من بوویت! بەڵام ئیدی تەواو، لە ئێستا بە دواوە هی من نیت. ئۆف! جان گیان،

کوڕە چکۆلەکەم، یانی پێت وایە من بتوانم لە نێوان ئێوەدا، لە نێوان تۆ وبراکەتدا بژیم؟

– بەڵێ دایکە، ئەوەندەم خۆش دەوێی کە بیر لەو شتە نەکەیتەوە.

– ئۆف! ئۆف! شتی وا مەحاڵە!

– نەخێت مەحاڵ نییە.

– چۆن دەتوانم لەنێوان تۆ وبراکەتدا بیر لە شتی وا نەکەمەوە؟

– باشە ئێوە بیری لێناکەنەوە؟

– من، بەش بە حاڵی خۆم سوێندت بۆ دەخۆم.

– بەڵام بە درێژایی ڕۆژ بیری لێدەکەیتەوە.

– نەخێر، سوێندت بۆ دەخۆم. گوێ بگرە: ئەگەر تۆ بڕۆیت، پەیوەندی بە سوپاوە دەکەم و، خۆ دەکوژم.

ئەم هەڕەشە منداڵانەیە خات رولاندی هاڕوژاند، دەستی لە ملی کرد و بەسۆزو میهرەوە کەوتە نەوازشتی وگوتی:

– مـن لەوە زیـاترم خۆشـدەوێی کە وێنـای دەکەیـت، زیاتر لەوەی وێنای دەکەی، پتر لەوەی وێنای دەکەیت، ئاقڵ بە. تەنیا هەشت ڕۆژ خۆت بگرە، خۆت تاقی بکەرەوە، بەڵێنم پێ دەدەی، هەر هەشت ڕۆژ؟ دەتوانی ئەم داوایەم جێبەجێ بکەیت؟

هەردوو دەستی نانە سەر شانەکانی جان، گرتیە باوەش و گوتی:

– کوڕەکەم.. با هەوڵ بدەین هێور بین، بە سۆز بیر نەکەینەوە. ڕێم بدە با پێت بڵێم، ئەگەر بۆ تاقە جارێک ئەوەم لە زاری تۆ ببیستایە کە مانگێکە لە زاری براکەتی دەبیستم،

ئەگەر بۆ تاقە جارێک لە چاوانی تۆدا ئەوەم خوێندباوە کە لەچاوانی براکەتی دەخوێنمەوە، ئەگەر هەستم بە تاقە یەک وشە یان نیگایەک بکردایە، ئەگەر هەستم بەوە بکردایە تۆش وەکو ئەو دەم بوغزێنی، تاقە یەک سەعات بەند نەدەبووم، بۆ هەتا هەتایە دەڕۆیشتم، دوای یەک سەعات، گوێت لێیە.

- دایکە، سوێندت بۆ دەخۆم کە..

- ڕێم بدە با قسە بکەم... یەک مانگی خشتە من بە ئازارەوە دەتلێمەوە، تلانەوە ئەمما تلانەوە، ڕێک لەو ساتەوە کە زانیم براکەت، کوڕەکەی دیکەم، لێم بەگومانە، چرکە بەچرکە مەزندەی دروست لێدەدات، هەموو چرکەیەک دەمردم و دەژیامەوە، ئازارێکم دەچێشت کە مەحاڵە بتوانم بۆتی وەسف بکەم.

دەنگی بە ڕادەیەک خەمناک بوو، کە کاری لە جان کرد و ڕوندک زاییە چاوانی، جان ویستی دەست لە ملی بکات، بەڵام خات ڕولاند دەڵەکی دا وگوتی:

- ڕێم بکە.. گوێ بگرە.. هێشتا زۆرشت ماوە تا پێتی بڵێم بۆ ئەوەی تێبگەیت.. بەڵام تۆ تێناگەیت.. چونکە من.. ئەگەر بمێنمەوە... پێویستە.. نا، ناتوانم!..

- بڵێ دایکە، قسەی خۆت بکە.

- چاکە، بەڵێ، بەلای کەمەوە بۆ ئەوەی نە خۆم و نە خەڵکی دی نەخەڵەتێنم... دەتەوێ لە گەڵ تۆ وەمێنم، وانییە، لەبەر ئەمە، بۆ ئەوەی بتوانین سەیری یەکدی بکەین، هەموو ڕۆژێ لە ماڵەوە، پێکڤە قسان بکەین، چونکە من وام لێهاتووە جورئەت ناکەم دەرگا بکەمەوە، دەترسم، براکەت لە پشت دەرگاکەوە بدینم، لە بەر ئەمە پێویستە، نەک لەبەر

ئەوەی بمبووری، بمبەخشیت، ئەوەی کە زۆر ئازارم دەدات بووردنە، بەڵکو لەو کارە پەست نەبیت کە کردوومە. دەبێ هەستێکی بەهێزی ئەوتۆت لە جەم چێ ببێت کە لە هەستی هەموو خەڵکی جیاواز بێت، تا پێت بڵێم: " کوڕی رولاند نیت " بێئەوەی لەم قسەیە شەرمەزار بی، لە تەریقیدا سوور ببیتەوە و، بێ ئەوەی بمبوغزێنی!.. زۆر ئازارم بەمەوە خوارد، ئیدی بەسە... زۆرم ئازار خوارد، لەوەی پتر بەرگە ناگرم، نا، لە توانامدا نەما، ئەم ئازارەی من لە دوێنێوە دەستی پێنەکردووە، لە مێژە دەستی پێکردووە. بەڵام تۆ ناتوانی لەمە تێبگەیت! جا بۆ ئەوەی بتوانین پێکەوە بژین، یەکدیمان خۆشبوێ، یەکدی لە ئامێز بگرین جان گیان، پێویستە ئەوەت پێ بڵێم: من ماشقەی بابت بووم، لەوەش زیاتر بووم، ژنی بووم، ژنی ڕاستەقینەی، من لە ناخ و نیهادی خۆما هەست بە هیچ شەرمەزارییەک ناکەم، هەرگیز ژێوان نیم و، من تا ئێستاش، هەرچەند مردووشە، هەر خۆشم دەوێ و، لەمەو دواش هەر خۆشم دەوێ، من جگە لەو کەسی دیکەم خۆشنەویستووەو، ئەو هەموو ژیانم بوو، هەموو خۆشی و شادیەکم، هەموو ئاواتێکم، هەموو سەبر و سەلوایەکم بوو.. لە ماوەیەکی زۆرا، هەموو شتێک، هەموو شتێک بوو بۆ من! گوێی لە دایکی خۆت بگرە کوڕەکەم، لەبەردەم ئەو خوایەی هاوەبان سەرەوە و ئاگای لێمە دەیڵێم: خۆ ئەگەر تووشم بە تووشی ئەوەوە نەبوایە، هەستم بە هیچ جوانییەک لە ژیانی خۆما نەدەکرد، نە هەستم بە میهر، نە بە خۆشی نەدەکرد، هەرگیز هەستم بە هیچ نەدەکرد، من لە هەموو شتێکا هەر قەرزاربارى ئەوم!

لەم دنیایەدا تەنیا ئەوم هەبوو، دوای ئەو ئێوە هەردووکتان، براکەت و تۆ، بەبێ ئێوە، ژیانم، تاریک، چۆڵ و هۆڵ، لێدەبوو بە شەوەزەنگ. هیچم خۆشنەدەویست، هیچم نەدەزانی، ئارەزووی هیچم نەدەکرد. نە دەگریام، چونکە گریابووم جان گیان، ئاخ! ئەوسای کە بۆ ئێرە بارمان کرد، گریام.

من بە تەواوەتی، بە خوایشتی خۆم، بەوپەڕی شادی و ڕەزامەندییەوە، بە درێژایی دەدانە ساڵ، چ وەکو جەستە و چ وەکو روح خۆم ڕادەستی کردبوو، بە شایەدی و بە بەرچاوی خواوە کە هەردووکمانی بە نەسیبی یەکدی کردبوو، ژنی بووم، ئەویش مێردم بوو. پاشان تێگەیشتم کە ڤیانی وی بۆ من، لە ڤیانی من بۆ ئەو کەمتر بوو، هەمیشە کەسێکی چاک و مەحبووب ومیهرەبان بوو. ئەوە کۆتایی هات! ئۆف! چەند گریام...! چەند ناخۆش بوو، ئیدی ئەوە ژیانە!.. هیچ شتێک بەردەوام نابێت.. هاتینە ئێرە، ئیدی نەمدەبینی، ئەویش هەرگیز نەهات... لە هەموو نامەکانیا سۆز وبەڵێنی دەدامێ!.. هەمیشە چاوەڕوانم دەکردا.. ئیدی نەمدەبینی! ئەنجام ئەوەتا مردا.. بەڵام بەوەدا کە بیری لە تۆ کردووەتەوە، وادیارە خۆشی ویستووین. من تا دوا هەناسە خۆشم دەوێت، قەت حاشای لێناکەم، تۆشم خۆشدەوێت چونکە کوڕی ئەویت، قەتیش لەبەردەم تۆ شەرم لەوە ناکەم! تێدەگەیت؟ تەریق نابمەوە! ئەگەر دەتەوێ وەمێنم دەبێ بە باوکایەتی ئەو قاییل بیت و، هەندێجار باسی بکەین و، بڕێک خۆشت بوێ و کە تەمەشای یەکدی دەکەین، بیری لێبکەینەوە، یادی بکەینەوە. ئەگەر ناتەوێ، ئەگەر ناتوانی،

ئەوا من بەخێر و تۆ بە سەلامەت گیانەکەم. مەحاڵە پێکەوە هەڵبکەین! من بە بڕیار و قەراری تۆ دەکەم.

جان، بە دەنگێکی نەرم گوتی:- بمێنەوە دایکە.

خات رولاند، توونـد هەردوو باسکی گـرت، دووبـارە دەسـتی بەگریـان کـرد، ئەوسـا ڕوومەتـی نـا بە ڕوومەتـی کوڕەکەیەوە ودووبارە گوتی:

- بەڵێ، ئەدی پییر؟ حاڵمان لەگەڵ ئەودا چۆن دەبێت!

جـان لەبـن لێوانەوە گـوتی:- چـارێکی بـۆ دەدۆزینەوە، ناتوانی لە نزیکی ئەو بژیت.

تەزوویەکـی پێـداهات، یـادەوەری کـوڕە گەورەکەی بێتاقەتی کرد وگوتی:

- نا، لەگەڵیا هەڵناکەم، نا! نا!

بە دڵتەنگی خۆی هاوێشتە باوەشی جان وهاواریکرد:

- فریـام کەوە، ئەوم لە کـۆڵ بـکەوە، کـوڕی خـۆم ڕزگارم بکە، شتێک بکە، نازانم.. بگەڕێ.. ڕزگارم بکە!

- بەڵێ دایکە، دەگەڕێم.

- هەر ئێستا.. دەبێ.. زوو.. بەتەنیا جێم مەهێڵە! من زۆر لێی دەترسم.. زۆر دەترسم!

- بەڵێ، چارێک دەدۆزمەوە، سۆزت دەدەمێ.

- یـۆف، بەڵام زوو، زوو، تـۆ نـازانی کە کـاتێ ئەو دەبینم چیم بەسـەردێت. ئەوسـا، بە دەنگێکی زۆر نەوی بە گوێیدا چپاند:- لێرە، لەلای خۆت بمشارەوە.

لە فکران ڕاچوو، یەکسەر پەی بە مەترسی ئەم تەگبیرە بـرد. بەڵام چـاری نەبـوو، دەبـوایە بـگەڕێ، زۆر بـگەڕێ، گەنگەشە بکات، ئاقڵانە و بە هەنجەتی وردوە، ڕوو بەڕووی ئەم شێتاتی و ترسەی دایکی ببێتەوە. خات رولاند گوتی:

- تەنیا ئەم شەو. سبەی یەکێک بۆلای رولاند بنێرە کە پێی بڵێت: من نەخۆش بووم.

- مادام پییر لێرە بوو، شتی وانابێت. دەی کەمێک زات وەبەر خۆت بنە. خەمت نەبێ، بەخۆم مشووری هەموو شتێک دەخۆم. بەڵێنت دەدەمێ، لە سبەیەوە سەعات نۆ لە ماوەڵەوە دەبم. دەی شەپقەکەت لە سەر بنە با بتگەیەنمەوە.

- دەی بەدڵی تۆ دەکەم.

بەلارە ملییەکی منداڵانەی پڕ ترس و منەتبارییەوە ئەو قسەیەی کرد. ویستی هەستێت، بەڵام زۆر بە توونـدی دەلەرزی، نەیتوانی خۆی بە پێوە بگرێت، جان، قەنداغی دایە، سرکەی لە لا جانکەکانی هەڵسوو. وازی لێهێنا تا وەخۆ بێتەوە. ئەوجا بە هەمان ئاوای دووی منداڵ بوون، ئازارەکەی دامرکایەوە. ئەنجام توانی خۆی بە پێوە بگرێت و ڕێ بکات، ئیدی قۆڵی جانی گرت.

وەختایەک بەبەر باڵەخانەی شارەوانیدا ڕەت بوون، سەعات سێی شەو بوو. لەبەر دەرگای ماڵەوە دایکی ماچ کرد وگوتی:- بە دوعا دایکە گیان، ورەت بەرزبێت.

خات رولاند، بە هەنگاوی سووک بە پلیکانەکاندا سەرکەوت، چووە ژوورەکەی خۆیەوە، بلەز جلەکانی داکەند، بە هەمان هەستی ژنانی هەڵەکاری جارانەوە، بە تەریقی خۆی بەژێر جێگاکەیدا کرد تا لەپاڵ رولاندا، کە لە گەرمەی پرخ وهۆڕی خەودا بوو، بنوێت.

لە ماڵەکەدا تەنیا پییر بێدار بوو و، گوێی لێبوو کە دایکی هاتەوە.

## (٨)

کاتێ جان گەیەوە شوقەکەی خۆی، لەسەر قەنەفە گەورەکە پاڵکەوت. ئەو خەم و پەژارەیەی کە کردیە کارێک براکەی وەکو حەیوانێکی ڕاوەدوو نراو غار بدات و هەڵێت و بە پێچەوانەی تەبیعەتی ساردی خۆی ڕەفتار بکات، قەڵەمی دەست وپێی ئەوی شکاند.

هەستی کرد، تەواو خاوبووەتەوە، ناتوانێ بجوڵێت، ناتوانێ بڕواتە ناو جێگاکەی، چ وەکو جەستە وچ وەکو روح داهێزراوە، داڕوخاوە، وێرانە، وەکو پیر، دووچاری بەدگومانی لە ئەسڵ و فەسڵی خۆی نەبووبوو، ئەو ئابڕووە پەنهانەی کە قاوغی دڵانی بە خۆنازیوە، لێنەدرابوو، بەڵکو ئەو، ئەو جەزرەبەیەی قەدەر، کە لە هەمان کاتدا هەڕەشەی لە هەموو، خەم وخولیا و ئاواتە لە دڵا شیرینەکانیشی دەکرد، تەواو شەکەتی کردبوو.

وەختایەک، روحی ئارام بووەوە، کاتێ بیرەکانی کە لە ئاوی کانی زوڵاڵ تر بوون و دەستانێک لێلیان کرد، ڕوو بەڕووی ئەو ڕەوشە بووەوە کە بۆی کەشف بوو. خۆ ئەگەر نهێنیی لە دایکبوونەکەی بە شێوەیەکی دی و لە ڕێگەیەکی دیکەوە بۆ کەشف بوایە و زانی بوایە، بێگومان پەست دەبوو، لە کانگای دڵەوە خەمگین دەبوو. بەڵام دوای شەڕەکەی لە گەڵ براکەیدا و، دوای ئیعترافە بێ چەند وچوونەکەی دایکی هەر توانایەکی هەڵچوون ویاخی بوونی لەدەست دا. ئەو شۆکەی کە پێیکەوت ئەوەندە توند بوو، کە بەوپەڕی میهرەبانیەوە، هەر حوکمێکی پێشوەختە و ئەخلاق فرۆشیەکی بەپەلە، لەخۆی دوور بخاتەوە. لەلایەکی دیکەوە پیاوی بەرخۆدان نەبوو. حەزی لە شەڕ و دژایەتی

هیچ کەسێک نەبوو و بە تایبەتی شەڕی دژ بەخۆی، ئیدی بە مەیلێکی غەریزی وئیسراحەتخوازییەکی خۆڕسکەوە ملی بۆ ژیانی ئارام و هێدی دا. هەستی بە نیگەرانی و ترس لەو قسە وقسەلۆکانە کرد، کە لە دەوروبەری دەکران و کەم وزۆر ئەویشی دەگرتەوە. دەیزانی بیەوێ و نەیەوێ ئەمە هەر ڕوودەدات، جا بۆ ئەوەی ئەمە لە خۆی دوور بخاتەوە، بڕیاری دا، ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بدات، هەوڵێکی جدی، لە سەرووی هەوڵی بەشەرانەوە بێ. هەوڵێک زۆر بەخێرایی، لە سبەینێوە واداری بکات، کە ئەم کێشەیە تێ بپەڕێنێت، چونکە بە تەبیعەت حەزی بەو چارەسەرە هەنووکەییانە هەبوو، کە ورەیەکی وەبەر بنەن و ئەو بێ دەسەلاتی و بێ ئیرادەییەی لە لا بسڕێتەوە کە لە مێژ بوو لەگەڵیا بوو. لەلایەکی ترەوە نەفەسی محاماتی و پاریزەری ئەو گیانەی لەلا دروستکردبوو، کە حاڵەت وڕەوشە ئاڵۆزەکان جیابکاتەوەو هەڵیان بسەنگێنێت، ئاگاداری کێشەی ناوخۆی ماڵباتە شپرزەکان بوو بۆیە یەکسەر پەی بەهەموو ئەو ئەنجامە چاوەڕوان کراوانە برد کە لەگێن بوو لەبارە دەروونییەکەی براکەیەوە بکەونەوە. بۆیە لە ڕوانگە وگۆشەنیگای پیشەییەوە، هەموو هەنگاوەکانی دواتری هێنایە بەرچاوی خۆی، ڕێک وەکو ئەوەی لە پاش بویەرێکی ئەخلاقی کۆمەڵێک پەیوەندی ئایندەگەرایی بۆ هەندێک لە مشتەریەکانی خۆی ڕێک بخات. مەحاڵە هیچ مامەڵە و بەرخوردێکی بەردەوام لەگەڵ پییردا بکرێت. بەڵام دەشێت بە ئاسانی خۆی لە براکەی ببوێرێ و لەماڵەکەی خۆیدا بمێنێتەوە، بەڵام چۆن دایکی لەگەڵ کوڕە گەورەکەیدا و لەیەک ماڵدا هەڵبکات.

ماوەیەکی زۆر بەدەم بیرکردنەوەوە لە سەر بالیفەکانی دانیشت، بەخەیاڵ جۆرەها چارەسەری دەدۆزییەوە ودوایی بەبێ ئەوەی بگاتە هیچ تەگبیرێکی قەناعەتبەخش هەرهەمووی ڕەفز دەکرد.

لە ناکاوا بیرۆکەیەکی بۆهات: ئایا ڕەوایە ئەم سەروەت وسامانەی کە وەریگرتووە بۆ خۆی هەڵگرێت، کارێکی ئابڕوومەندانەیە؟ یەکەمجار وەڵامەکەی ' نەخێر ' بوو. بڕیاریدا بەسەر هەژاران و نەدارانیدا دابەش بکات. ئەمە کارێکی قورسە، دەی کێشە نییە، کەل وپەل و شمەکەکانی دەفرۆشێت و وەکو خەڵکی دی مل بەکار وکاسبییەوە دەنێت، وەکو هەموو ئەوانەی کە ژیانیان بەکار دەست پێدەکەن. ئەم بڕیارە پیاوانە بەسوێیە وەکو قامچی چزەی لێ هەڵدەستان. لە جێی خۆی هەستا، ڕۆیی هەنیەی نا بەجامی پەنجەرەکەوە. پێشتر هەژار بوو، دووبارە بۆ هەژاری دەگەڕێتەوە، بە هەرحاڵ، خۆ هەژاریی نایکوژێت. نیگای لە سەر ئەو گڵۆپە غازیەی کە لە شەقامەکەدا دەسووتا گیرسایەوە. ژنێکی دێرکەوتوو بەسەر شۆستەکەدا دەڕۆیی، یەکسەر خاتوو روزمیلی هاتەوە بیر. دڵی داخورپا، هەموو ئاکامەکانی بڕیارە نەرێنییەکەی خۆی هاتە بەرچاو. ئیدی نابێ ئەم ژنە بخوازێت، دەبێ دەستبەرداری شادمانی بێت، دەستبەرداری هەموو شتێک ببێت، ئایا دەتوانێ دەستبەردار ببێت، بە تایبەتی کە تازە بەڵێنی بەو ئافرەتە داوە؟ ئەو ژنە بۆیە پێی ڕازی بوو چونکە دەیزانی دەوڵەمەندە. باشە بە هەژاریش پێی قاییل دەبێت، ئایا مافی ئەوەی هەیە داوای ئەم قوربانیە لەم ژنە بکات و بە سەریا بیسەپێنێت؟ باشە وا باشتر نییە، بە ئەمانەت سەروەتەکە لای خۆی هەڵگرێت و

پاشـان بەسـەر هەژاراندا دابەشـی بکات؟ هەر هەمـوو خەم وخولیا و ئاواتە پەنهانەکانی، لە قوڵایی روحیا بە گژ یەکدیدا دەچـــوون وخۆپەرســـتی وخۆویســـتی لە ژێـــر پەردەی ئابڕوومەندیدا دەشاردەوە. ئیدی حیرەتی یەکەمی شوێنی بۆ بیـانوو وهەنجەتـانی زیرەکـانە چـۆڵ کـرد، پاشـان وەدیـار کەوتەوە، دوایی جارەکی دی سڕدرایەوە.

هـــاتەوە و دانیشـــت، بیـــری لە هەنجەتێکـــی بنجبـــڕو یەکلاکەرەوە دەکردەوە، بۆ بیانوویەکی بەهێز دەگەڕا، تا لە دوو دڵیەکانی بخەلەسێت و قەناعەت بە خودی خۆی بکات. بیسـت چەلان ئەم پرسـیارەی لە خـۆی دووبـارە کـردەوە: " مـادامێکی بەوە قایـل بـووم کە کـوڕی ئەم پیـاوە بـم، ئایـا ئاسایی نییە بە میراتەکەشـی ڕازی بـم؟ " بەڵام ئەم هەنـجەتە قەناعەتبەخش نەبوو، نەیتوانی قەنـاعەت بە ناخودئاگایی ئەو بکات کە لە بن لێوانەوە گوتی: " نا ".

لە ناکاوا ئەمەی بە بیرا هات: مادام من کوڕی ئەم پیاوە نـیم کە وام دەزانـی بـاوکمە، کەواتە هـیچ شـتێکی ئەوم چ لە ژیانیا و چ پاش مردنـی پێ نابڕێت، ئەم کـارە نە مـاقووڵە و نە ڕەوایە. ئەمە دەکاتە دزی لە براکەم.

بەم بۆچـوونە تـازەیە ئاسـوودە بـوو، بـاری دەروونـی سووک بوو، ئاوڕی لای پەنـجەرەکەی دایەوە. گوتی: بەڵێ، پێویســـتە دەســـتبەرداری میراتـــی خـــانەوادەکەم بـــم، هەرهەمووی بۆ پییر بێت، مادام کوڕی باوکی ئەو نیم، ئەمە دروســـتە. ئایـــا لەم حـــاڵەدا کـــاری دروســـت ئەوە نیـــیە کە سەروەت و سامانەکەی باوکم بۆخۆم هەڵگرم؟

دوای ئەم ئیعتـراف و قەرارەی کە گـوایە هـیچ میراتێکـی رولانـدی پێ نابڕێت و بڕیـاری داوە دەسـتبەرداری بێ بـۆ

پییـر، لەو ڕوانـگەیەوە قەراری دا سـەروەتەکەی ماریشـال بۆخۆی هەڵگرێت، چونکە ئەگەر هەردوو بەشە میراتەکە، چ ئەوەی ماریشـال و چ ئەوەی رولانـد ڕەفـز بکـات، هەنگـێ دەبێ سواڵ بکات.

پـاش ئەوەی ئەم کێشـە وردەی چارەسـەر کـرد، کەوتە بیرکردنەوە لە پییرو بوون ومـانی وی لە ماڵباتەکەدا. چۆنی دوور بخاتەوە؟ هەرچی سەری هێنا و سەری برد، نەیتوانی چارەسەرێکی کردەیی وەدۆزێ، وەختـایەک گوێی لە دەنگی کەشتیەکی هەڵمی بوو کە خۆی بە بەندەرەکەدا دەکرد، وای هات بەخەیاڵا کە وەڵامێکی بۆ نازڵ بوو، هەر بە جلەکانیەوە لە سـەر سیسـەمەکەی ڕاکشـا، تـا ڕۆژ بـووەوە، بە دەم خەیاڵاتەوە تلایەوە.

دەوروبەری سـەعات نۆ، لە مـاڵ وەدەرکەوت تـا بزانـێ ئاخۆ پرۆژەکەی هی ئەوەیە جێبەجێ بکرێت یان نـا، پاشـان دوای هـاتن وچـوونێکی زۆر، بـۆ مـاڵی کەس وکـارەکەی گەڕایەوە، دایکـی لە ژوورەکەی خۆیـدا چـاوەڕوانی ئەمـی دەکرد. دایکی گوتی:

- ئەگەر تۆ نەهاتبای، هەرگیز نەدەوێرام دابەزم.

دوای ئەوە دەنگـی رولانـد لە سـەر قاڵـدرمەکەوە بەرز بووەوە، هاواری دەکرد: - وادیارە ئەمڕۆ نان ناخۆین!

کەس وەڵامی نەدایەوە، قیژاندی: - جوزفین، چ دەکەن؟

دەنگـی کـارەکەرەکە لە قـوڵایی ژێـرزەمینەکەوە بەرز بووەوە:

- ئەوەتام، قوربان.. چیتە.
- ئەدی خانمت لە کوێیە؟
- خانمم لە سەرەوەیە.. دەگەڵ ئاغای جان دایە.

هەنگێ، بۆڵەیەکی کرد، سەری بۆ نهۆمی سەرەوە بەرز کردەوە و بانگی کرد:- لویز؟

خات رولاند، دەرگاکەی بە ئاستەم کردەوەو بەرسڤی دایەوە:- چییە؟ هاوڕێم؟

- یانی نان نەخۆین.

- ئەوەتاین، هاوڕێم، واهاتین.

خات رولاند دابەزی، جان دووی کەوت. رولاند کە جانی بینی هاواری کرد:- عەجایب، ئەمە تۆ لێرەیت! هەروا زوو لە ماڵەکەی خۆت بێزار بوویت.

- نا، باوکە، ئەم بەیانیە هەندێ قسەم لە گەڵ دایکمدا هەبوو.

جان، بە دەستی کراوەوە چووە پێشێ، وەختایەک پیرەمێرد باوکانە دەستی گوشی، هەستێکی غەریبی چاوەڕوان نەکری، ئازای سڕ وگرژ کرد، هەستی جیابوونەوەو ماڵاوایی یەکجارەکی.

خات رولاند پرسی: - پییر نەهاتووەتەوە؟

مێردەکەی شانەکانی هەڵتەکاند وگوتی:

- نا، بەڵام قەیدی نییە، هەموو جارێ دێر دەکەوێ، با چاوەڕوانی ئەو نەکەین و ئێمە نانی خۆمان بخۆین.

خات رولاند، ئاوڕی لای جانی دایەوە وگوتی:

- کوڕم، بڕۆ بیهێنە، ئەگەر کەس چاوەڕوانی نەکات خەفەت دەخوا.

- بەڵێ، دایکەگیان، هەر ئێستا دەچمە دووی.

جان، بە پلیکانەکاندا سەرکەوت، بە نەفەس و نیەتی پیاوێکی پەشۆکاوی ترساوەوە کە بۆ شەڕ بڕوات،

ســـەرکەوت. کە لە دەرگـــای دا، پییـــر، وەڵامـــی دایەوە:-
فەرموو.

جـان وەژوور کەوت. پییـر، بە سـەر مێزەکەیـا دانەوی بـووەوە وخەریکـی نووسـینی شـتێک بـوو. جـان گـوتی: -ڕۆژباش.

ئیدی بەجۆرێ تەوقەیـان دەگەڵ یەکدی دا کـرد وەکـو ئەوەی دوێنێ هیچ شتێک ڕووی نەدابێت.

- نایەیتە خوارەوە نان بخۆیت؟
- بەڵام.. ها.. کارم زۆرە.

دەنگی پییر دەلەرزی و چاوەکانی ئەبلەق بوون. براکەی پرسی چی بکات.

- ئەوان لە خوارەوە چاوەڕوانت دەکەن.
- ئاە! ئایا... ئایا دایکمان لە خوارەوەیە؟
- بەڵێ. ئەو بەخۆی ناردمی بە شوێنتدا.
- ئاە! کەواتە.. دادەبەزم.

لە بەر دەرگاکە هەڵوەستەیەکی کرد، ئەوسا بەرەبەرە دەرگاکەی کردەوە. داک وبابی بەرانبەر بەیەکدی لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون.

یەکەمجـار بەبێـئەوەی چـاو هەڵبـڕێ، بەبێـئەوەی چ قسـەیەک بکـات، لە دایکـی نزیـک بـووەوە، لە جیـاتی ئەوەی وەکو جاران ڕوومەتی دایکی مـاچ بکات، هەنیەی مـاچ کـرد، هەستی کـرد دایکی دەمـی دێنێتە پێشـەوە، بەڵام هەسـتی بە تەماسی لێوەکانی لە سـەر ڕوومەتـی خـۆی نەکـرد، دڵـی بەم مجـامەلە ڕواڵەتـیە داخورپـا و لە دڵـی خۆیـدا پرسـی: " ئـاخۆ دوای دەرچوونی من چ بڵێن ". جان بە میهرەبانی لێکدا لێکدا دەیگوت: " دایکە" و " دایکەگیان " و بابەخی پێدەداو خزمەتی

دەكرد و چای بۆ تێدەكرد. ئیدی پییر تێگەیی كە بە دوو قۆڵی گریاون، بەڵام نەیتوانی بچێتە بنج وبناوانی هزر وبیری وان!

ئاخۆ جان باوەڕی وابوو كە دایكی تاوانبارە، براكەی كەسێكی شەڕەنگێزە، ئیدی سەرلەنوێ هەموو ئەو ئیرادانەی كە بە خۆی دروستی كردبوون،ئەو نهێنییە نەنگینەی كەشفی كردبوو، هێرشیان بۆ هێنایەوەو ئەوكیان گرت، زاریان بەست، زمانیان لە گۆ خست و نەیان هێشت هیچ بڵێت.

ئیدی كەڵكەڵەیەكی توونـدی هەڵاتنی كەوتە سەر، كەڵكەڵەی ئەوەی كە ئەم ماڵەی چیتر بەماڵی خۆیی نەدەزانی، بەجێبیڵێت، ئەم خەڵكانە بەجێ بێڵێ كە تەنیا داوێكی قرچۆك بەوانەوەی دەبەست.

ویستی یەكسەر هەستێ وبڕوات بۆ شوێنێك، ئیدی هەرشوێنێك بێت. هەستی كرد هەموو شتێك تەواو بوو، كۆتایی هات و ناتوانێ لە گەڵ ئەواندا بمێنێتەوە، بەبێئەوەی لە دەستی خۆیدا بێ ئەوان ئەزیەت دەدات وئەوانیش بۆ ئەم مایەی عەزابێكی بێ بڕانەوەن، عەزابێك بەرگەی ناگرێت.

جان قسەی دەكرد، رولاندی دەدواند، بێئەوەی گوێی لە ڕای پییر بێت، پێی وابوو لە نیاز ونیەتی براكەی حاڵی بووە، هەر بە تۆنی دەنگیا پەی بەنیاز ونیەتی براكەی بردووە.

جان گوتی:

- وادیارە ئەمە جوانترین كەشتی ناو گە لە كەشتیەكەیان دەبێت. باسی شەش هەزار وپێنج سەد بەرمیل دەكەن. مانگی داهاتوو دەست بەیەكەم سەفەری خۆی دەكات.

رولاند، بەحەپەساوی گوتی:- ئاوا زوو! وام وێنا دەکرد، کە ئەم هاوینە ناجووڵێت.

- زۆریـــان پەلەیە، دەیـــانەوێ بەر لە پـــایز لە یەکەم سەفەری دەریایی خۆیان ببنەوە.

ئەم بەیانیە، سەرێکی نووسینگەی کومپانیاکەم دا، قسـەم دەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی نووسینگەکەدا کرد.

- ها! ها! کێ بوو؟

- ئاغـــای مارشـــاند، دۆســـتی دڵســـۆزی ســـەرۆک و ئەنجوومەنی کارگێڕییە.

- عەجەب، چما دەیناسیت؟

- بەڵێ، ئیشێکی بچووکم پێی هەبوو.

- باشـە دەتـوانی هەرکـاتێ کەشـتی " لـورین " گەیـیە بەندەرەکە ولەنگەری گرت، بمگەیەنیتە کەشتی نێوبراو؟

- بێگومان، لەوە ئاسانتر نییە!

جـــان لە دوودڵ دەچـــوو، بـــۆ ڕســـــتەیەک دەگەڕا، بیگەڕێنێتەوە سەر ئەسڵی ئەو بابەتەی باسی دەکرد. دەسـتی بە قسان کردەوە.

- بە شـێوەیەکی گشـتی، ژیـانی نـاو کەشـتیەکە زۆر باشـە، ئەو خەڵکانەی لەم پاپۆڕە دەریـا و ئەتڵەسـی بڕانەدا کـار دەکەن، نیـوەی سـاڵەکە لە هەردوو شـارە جـوانەکەی نیویـورک وهـــافەر و لە ســـەر عـــاردی بەســـەر دەبەن و نیـــوەکەی تـــری لە دەریـــا و لە گەڵ خەڵکـــانی باشـــدا دەمێنێـتەوەو، دەتـوانێ ئاشـنا وڕۆشـنای بـاش بـدۆزێتەوەو بگرێـت وسـوودیان لێوەربگرێـت. تەسـەور بـکە کـاپتنەکە دەتـوانێ تەنیـا لە پاشـەکەوتی خەڵۆزا سـاڵانە بیست وپێـنج هەزار فرانک وهەندێجار زیاتریش بەدەست بێنێ.

رولان، بەواقی وڕەوە، بە شێوەیەکی باوەڕ نەکردەنیەوە فیکەیەکی کێشا. جان درێژەی دایی وگوتی:

- کاشێر و ژمێریاری کەشتیەکە، مووچەکەی دەگاتە نزیکەی دە هەزار، دکتۆری کەشتیەکە تەنیا لە معاینەی جێگیرا، پێنج هەزار وەردەگرێت، جگە لەوەی سوکنە وخواردن ورونـاکی و گەرمـکەرەوە و هەموو خزمەتگوزارییەکی دیکەشی بۆ دابین دەکرێت.. و ئەمە بەلای کەمەوە هاوتای دە هەزار دەکاتەوە کە شتێکی زۆر باشە.

پییر، چاوانی هەڵبڕین، نیگای لە نیگای براکەی هەڵەنگوت، یەکسەر تێی گەیی، هەنگێ دوای کەمێک دوودڵی پرسی:

- باشە، زەحمەتە، دکتۆرێک لەو پاپۆڕەدا کاری دەست بکەوێت؟

- ئا و نا. ئەمە وەستاوەتە سەر هەل ومەرج و ناسیاوی و پشتیوانی.

بێدەنگیەکی دوور ودرێژ باڵی بە سەردا کێشان، ئەوسا دکتۆر لە سەری ڕۆیی: - "لورین" مانگی داهاتوو دەردەچێت؟

- بەڵی، لە حەوتی مانگی داهاتوودا.

هەردووکیان بێدەنگ بوون، پییر دەبیرەوە چوو: ئەگەر وەکو دکتۆرێک لەم پاپۆڕەدا دابمەزرێ، زۆرچاکە، ئەمە چارەسەرێکی باشە، پاشان، پاشان بەرچاو ڕوونیەکی لا دروست دەبێت کە بزانێ چی بکات، لەوانەیە واز لە پاپۆڕەکە بێنێ، بەلام خۆ پێش ئەمە دەتوانێ بێئەوەی داوای هیچ شتێک لە خانەوادەکەی بکات، نانی خۆی پەیدا بکات و منەتی کەس هەڵنەگرێت. پێرێ ناچار سەعاتەکەی فرۆشت،

چونکه نەیدەویست دەست لە دایکی پان بکاتەوە! جگە لەوە هیچ پارەیەکی دی پێ نەبوو، ئیدی هیچ چار و مالیجەیەکی نەبوو، جگە لەوەی نانی ئەم ماڵە بخوات، کە لێی بووبوو بە دۆزەخ و تیای نەدەحەوایەوە. زۆری بەلاوە زەحمەت بوو، لە جێگەیەکی غەیرەز جێگاکەی خۆی و لە ژێر میچێکی دیکەدا بخەوێت و خەوی لێبکەوێت. ئەوسا بە سووکە دوو دڵییەکەوە گوتی:- ئەگەر بمتوانیبا، لەو پاپۆڕەدا کارێکم دەست بکەوێت لە گەڵیا دەڕۆیشتم.

جان پرسی: - بۆ ناتوانیت؟

- چونکە من لە " کۆمپانیای ئەتلەنتی " دا کەس ناناسم.

رولاند، حەپەسا، گوتی:- ئەدی پرۆژە جوانەکانت چیان بە سەر دێت؟

پییر، لە بن لێوانەوە گوتی:

- هەندێ رۆژان هەن پیاو دەبێ لە پێناوی ئامانجێن باشتردا دەست بەرداریان بێت و بیانکات بە قوربانی، وێڕای ئەوەش ئەمەی من گەرەکمە بیکەم، تەنیا هۆیەکە بۆ کۆکردنەوەی چەند هەزار فرانکێک، بۆ زامنکردنی ئایندە.

رولاندی باوک، خێرا قەناعەتی کرد وگوتی:

- هەقی خۆیەتی، لە زەرفی دوو ساڵدا دەتوانی شەش حەوت هەزار فرانکێک پاشەکەوت بکەی، ئەگەر بەچاکی بەکاری بێنی، ئاسۆیەکی بەرینتر لە بەردەمتا دەکاتەوە. لویز تۆ چ دەڵێیت؟

لویز، بە دەنگێکی نەوی و ئاڵۆز گوتی: - پێموایە بیرکردنەوەکەی پییر، بیرکردنەوەیەکی دروستە.

رولاند هاواریکرد:

- من دەچم قسە لە گەڵ ئاغای بولان دا دەکەم، زۆر باشی دەناسم، لە دادگای بازرگانیدا قازییە، خۆی بۆ کارێن کۆمپانیاکە تەرخان کردووە، هەروەها جەنابی " لوینان " ش دەناسم، کە کەشتیان ساز دەکات، دۆستی گیانی بەگیانی یەکێک لە نوێنەرەکانی سەرۆکە.

جان، لە براکەی پرسی:

- دەتەوێ، ئەمرۆ دەمی جەنابی ماریشاند تاقی بکەمەوە و بزانم بەنیازی چییە؟

- بەڵێ، زۆریش مەمنوون دەبم.

پییر، پاش ئەوەی بۆ چەند ساتێک دەبیرەوە چوو، دووبارە گوتی:

- ڕەنگە باشترین کار ئەوەبێ نامەیەک بۆ مامۆستاکانم لە کۆلیژی پزیشکی، کە زۆریان ڕێز دەگرتم بنووسم، کۆمپانیاکە زۆرجار خەڵکی ئاسایی هەڵدەبژێرێت، ئیدی نامەی گەرم وگوڕی مامۆستایانی وەکو: ماروسیل، فلاش، ریموسو، بوریکل، دەورێکی ئەرێنی دەبێت و لە هەر پاڵاوتنێکی گومانـاوی زیاتر دەیخوات. ئەوەندە بەسە ماریشاندی برادەرت ئەم نامانە بخاتە بەردەستی ئەنجوومەنی کارگێڕی.

جان، ئەم پێشنیازەی زۆر بەدڵ بوو وگوتی:- بیرۆکەیەکی زۆر جوانە!

بە خۆشحاڵی وئاسوودەییەوە پێکەنی، دڵنیابوو لە سەرکەوتنی ڕێکارەکە وبۆ ماوەیەکی زۆر ئۆخژنی لە دڵ ودەروون گەڕا و، گوتی:- ئەمرۆ نامەیان بۆ دەنێریت؟

- هەر ئێستا، هەنووکە دەست بە نووسینی دەکەم. قاوە ناخۆمەوە، ئەعسابم تەواو نییە.

ئەوسا هەستا و ڕۆیی، هەنگێ جان ئاوڕی لە دایکی دایەوە وگوتی:

- ئەدی تۆ دایکە، دەتەوێ چ بکەیت؟
- هیچ.. نازانم.
- دەتەوێ لە گەڵ منا بێی سەری خاتوو روزمیلی بدەین؟
- بەلام.. بەڵێ.. بەڵێ.
- دەزانی.. دەبێ ئەمڕۆ بچم بۆلای.
- بەڵێ.. بەڵێ.. ڕاستە.

رولاند، وێڕای ئەوەی خۆی لەو قسەوباسانە هەڵنەدەقورتاند کە لەبەردەمیا دەکران، پرسی: - بۆچی دەبێت؟

- چونکە بەڵێنم دابووێ کە سەری بدەم.
- ئاە! زۆرچاکە. ئەمەیان شتێکی دیکەیە.

دەستی بە داگرتنەوەی سەبیلەکەی کرد، دایک وکوڕ بە پلیکانەکاندا سەرکەوتن تا شەپقەکانیان بێنن.

کە کەوتنە ڕێگا، جان لێی پرسی:- دایکە دەتەوێ قۆڵی من بگریت؟

جاران قەت نەیدەهێشت دایکی قۆڵی بگرێت، وا ڕاهاتبوون شان بەشانی یەکدی ڕێبکەن. دایکی قاییل بوو و قۆڵی گرت. ماوەیەک بە بێدەنگی ڕێیان کرد، ئەوسا جان بە دایکی گوت:- تۆ پێت وایە پییر بەڕاستی بێت؟

دایکی لەبن لێوانەوە گوتی:- داماوە!

- بۆچی، داماوە؟ لە پاپۆڕی "لورین" دا هەرگیز داماو نابێ.

- نـا.. مـن ئەوە دەزانـم، بەڵام بیـر لە زۆرشـتی دی دەکەمەوە.

سەری دانەواندبوو، دەفیکرێکی قووڵەوە چووبوو، پێ بە پێی کورەکەی ڕێی دەکرد، ئەوسا بە تۆنێکی غەریب، وەکو کەسـێک بـیەوێ پاشـماوەی بیرێکـی دوور ودرێـژی نهێنـی تەواو بکات، گوتی:

- کە ژیان شتێکی دزێوە! کە جارێ ڕووی تێکردیت و خۆی جوان نواند، ئەوا وای بە حاڵی ئەو کەسـەی ڕادەستی دەبێت، دەبێ پاشان باجێکی گەورە بدات.

جان، بە ڕاوێژێکی نەوی گوتی:- دایکەگیان، مەگەڕێوە سەر ئەم باسە.

- شتی وا دەبێ؟ من هەمیشە بیری لێدەکەمەوە.

- قەینا، لە بیرت دەچێتەوە.

خـات رولانـد، بێـدەنگ بـوو، ئەوسـا بە کەسـەرێکی قووڵەوە گوتی:

- ئـاه! چەنـد بەخـتەوەر دەبـووم ئەگەر شـووم بە پیاوێکی دی بکردبایە!

زۆر ڕقـی لە رولانـد هەسـتا، خەتـای هەمـوو هەڵەکـانی خۆی، کڵۆڵی ونەگبەتیەکانی خـۆی خسـتە ئەسـتۆی، دزێوی، گەوجیەتـی و ڕەزا قورسـی رولانـد، خسـتیە ئەسـتۆی شەپرێوی ئەو، بێ شەخسیەتی ئەو، ئەوەنـدە ڕەزا قورس و بێ شەخسیەت بوو، ناچار بوو هەڵـی بخەڵەتێنێت، یەکێک لە کوڕەکانی هیوابڕاو بکات و ئەم ئیعترافە بە سوێ و ئازارە بـۆ کـوڕی دووەمـی بکـات. ئەو ئیعتـرافەی کە خوێنـاوی جـگەری خـواردەوە، دڵـی زامـدار کـرد، دڵـی دایـک. لە بـن

لێوانەوە گوتی: - چەند کارەساتە کچێک شوو بە پیاوێکی وەکو مێردەکەی من بکات.

جان، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. بیری لەو کەسە دەکردەوە کە تا ئێستا وای دەزانی باوکیەتی، وادیار بوو ئەو بیرە ئاڵۆزەی کە ماوەیەکی زۆر بوو دەربارەی شەپرێوی و بێ شەخسیەتی بابی، دەربارەی تەوس وتوانجە بەردەوامەکانی براکەی و گوێ نەدانی خەڵکی بەم وتەنانەت قێزوبێزی کارەکەرەکەش لەم، هەیبوو، هەر هەموویان زەمینەیان بۆ روحی خۆشکرد کە ئیعترافە نەنگینەکەی دایکی قەبووڵ بکات. کەمترین باجی ئەو رەوشە ئەمەبوو کە کوڕی پیاوێکی دی بێ، هیچ کاردانەوەیەکی سەبارەت بەو شۆکەی دوێنێ نەبوو، نە هەڵچوونێ، نە ڕق و کینەیێی، نە توورەبوونێکی نەنواند کە خات رولاند بترسێنێت، چونکە دەمێک بوو لە دڵی خۆیا بەو ئازارەوە دەتلایەوە کە کوڕی ئەم پیاوە خوێن تاڵ وگەمژەو ساویلکەیە بوو.

گەیینە ماڵی خاتوو روزمیلی. ماڵی لە شەقامی سانت ئەدرس بوو، لە قاتی سێیەمی تەلارێکی گەورەی تایبەت بە خۆیدا ئاکنجی بوو. پەنجەرەکانی دەیانڕاونیە بەندەری هاڤەر، سەرانسەری بەندەرەکە دیاربوو.

وەختایەک ژنەی تاین، خات رولاندی بینی کە لە پێشەوە وەژوورکەوت، لە جیاتی وەکو جاران دەست بێنێ وتەوقەی دەگەڵدا بکات، هەردوو باسکی بۆ گرتەوەو دەستی لە ملی وەرێنا، چونکە لە دڵی خۆیدا هۆی هاتنەکەی خەملاندبوو.

موبیله وشتەکانی ناو هۆڵەکە مەخمەڵی بوون، هێشتا پەردەیان بەسەرەوە بوو، دیوارەکان بە کاغەزێن ڕەنگاوڕەنگی گوڵ گوڵی، دیوارپۆش کرابوون، چوار تابلۆی هەڵکۆڵراو، کە مێردە کاپتنەکەی کڕی بوونی، بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون، ئەم تابلۆیانە، چوار دیمەنی دەریایی ڕۆمانسیانەیان دەنواند، تابلۆی یەکەم ژنە ماسیڤانێکی نیشاندەدا، کە لە کەنارەکەدا وەستابوو و دەستەسڕەکەی تەکان دەدا و ئەو بەلەمەی کە مێردەکەی هەڵگرتبوو، لە هەتەر و ئاسۆی چاوی ون بوو. لە تابلۆی دووەمدا هەمان ئافرەت لە سەر کەنارەکە کەوتبووە سەرچۆکان و هەردوو باسکی لە سەر سینگی تێک ئاڵاندبوون، لە دوورەوە، لە ژێر ئاسمانی شین و پرشنگدارا، بەسەر دەریایەکی بەپێل و شەپۆلانی ناواقیعیەوە، دەیڕوانیە بەلەمی مێردەکەی کە خەریک بوو غەرق دەبوو. دوو تابلۆکەی دی دوو دیمەنی چوون یەکی ناو چینێکی کۆمەڵایەتی باڵایان نیشاندەدا، ئافرەتێکی گەنجی زەری ڕوخسار، هەردوو ئانیشکی نابوونە سەر قەراخی کەشتیەکی گەورەی ناو دەریایەک وخەیاڵاوی و بە چاوانی حەسرەتباری نمناکی ڕوندکانەوە دەیڕوانیە کەنارەکە کە زۆر دوورکەوتبووەوە. ئاخۆ کێی لە دوای خۆی بەجێ هێشتبوو؟ تابلۆی چوارەم هەمان ئافرەتی گەنج بوو، لە سەر قەنەفەیەکی نزیک پەنجەرەیەکی کراوەدا کە دەیڕوانیە ئۆقیانووسەکە، دانیشتبوو و بورابووەوە، نامەیەک لە دەستی بەر بووبووەوە سەر فەرشەکە. کەواتە مردبوو، حەیفێ! میوان، بە شێوەیەکی گشتی بەو دیمەنانە خەمبار دەبوون، یەکسەر و بێ هیچ شەرح و شرۆڤەیەک، بێ هیچ

چەند وچوون و گەنگەشەیەک لێیان حاڵی دەبوون، بەزەییان بەو دووژنە بەلەنگازەدا دەهاتەوە، ئەگەرچی هۆکاری خەمینی ژنەکەی نێوان ئەو دووانەیان نەدەزانی. بەڵام هەر ئەو گونگی و ئاڵۆزیەش زەمینەی بۆ خەیاڵیان خۆشدەکرد، ڕەنگە دەزگیرانەکەی لە دەست دابێت! هەر چوار تابلۆکە، باڵکێش بوون، هەرکە میوان وەژوور دەکەوت، یەکسەر نیگای دەچووە سەر تابلۆکان، تابلۆی چی! ئەفسوونیان دەبوو، مەستی جوانیان دەبوو.

جان، لە بەر ئەوەی زوو زوو دەهات، دەنا نەیدەتوانی چاویان لێ بگوازێتەوە، هەمیشە لە هەر چوار گرتەکەی ئەو دوو ژنە ڕادەما، کە بە ڕادەیەک لێکدی دەچوون لە تۆ وایە خوشکن .

هەستت دەکرد، جۆرە پاکییەک لەو نیگارە ڕوونەوە، کە لە شێوەی نەحتا وبە سەلیقەی مودێرن دروستکرابوو هەڵدەقوڵێت وجۆرە گەورەیی وشکۆیەک بەموبیلە و کەلوپەلەکان دەبەخشێت.

قەنەفەکان، بەرێک وپێکی دانرابوون، هەندێکیان لە پاڵ دیوارەکان و هەندێکی دیکەیان لە دەوری مێزە چکۆلەکەدا دانرابوون، پەردە سپیەکان زۆر پاک وخاوێن و بەتەرتیب و بێ هیچ چرچ و لۆچێک هەڵواسرابوون، ئەوەندە ساف و ڕاست هاتبوونە خوارەوە، کە لە دڵی خۆدا حەزت دەکرد، کەمێک چرچیان تێبخەیت، زەڕەیەک گەرد وتۆز بە زەنگە شووشەییەکەوە نەبوو، سەعاتێکی زێڕکفت دانرابوو کە لە دوورەوە لە کاڵەکێکی زەردی گەییو دەچوو.

جووته ژن، که له سەر کورسیەکانی خۆیان دانیشتبوون، کەمێک خۆیان ڕاستکردەوە و خات رولاند پرسی: - ئەمڕۆ نەچوویتە دەرێ؟

- نەخێر، کەمێک ماندووم.

ئەوسا بەجۆرە منەتبارییەکەوە بۆ جان و دایکی، باسی هەموو ئەو خۆشیانەی کرد کەله سەیران و ماسیڤانیەکەدا، بینی بووی وگوتی:

- دەزانن من ئەم بەیانیە ڕوبیانەکانی خۆم خوارد. بەلەزەت بوون. ئەگەر حەزتان لێبوو با سەیرانێکی دیکەی وەکو ئەمە بکەین.

جان، قسەکەی پێبڕی وگوتی:- ڕات چییە، پێش ئەوەی سەیرانی دووەم بکەین، کۆتایی بە سەیرانی یەکەممان بێنین!

- چۆن؟ من پێموایە تەواو بووە، کۆتایی هاتووە.

- ئۆە! خانمەکەم. من لای خۆمەوە، لە تاوێرەلانەکەی سان جوان دا، نێچیرێکم گرت، دەمەوێ بۆ ماڵی خۆمی بگوازمەوە.

ئیدی، بە دەم جۆرە نازفرۆشییەکەوە، خۆی لە گێلی داو، گوتی:

- تۆ؟ چیت گرت؟

- ژنێک! من و دایکم بۆ ئەوە هاتووین، لێت بپرسین کە ئاخۆ ئەم بەیانیە ڕای خۆت نەگۆڕیوە.

- نەخێر، قوربان، من ڕای خۆم نەگۆڕیوە، من..

هەنگێ جان، دەستی بۆ کردەوە، روزمیلی بەگەرم وگوڕی و گورج دەستی لە نێو دەستی نا. جان پرسی:- لە نزیکترین کاتدا، وانییە؟

- هەرکاتێ دەتەوێ.

- له زەرفی شەش هەفتەدا.
- نازانم، تۆ چ دەڵێی خەسووی سبەینێ؟

خات رولاند، بە دەم زەردەیەکی کەمێک ڕەشبینانەوە بەرسڤی دایەوە:

- من، هیچ ناڵێم، هیچ پێشنیازو بیرۆکەیەکم لانییە. سوپاست دەکەم کە بە جان ڕازیت، چونکە تۆ زۆر بەختەوەری دەکەیت.
- هەرچیمان لە دەست بێ لە ڕای شادمانی خۆمان دەیکەین دایکەگیان.

خاتوو روزمیلی، بۆ یەکەمجار عاتیفی هاتە بەرچاو، هەستا و پڕ بە هەردوو باسکی باوەشی بە خات رولاندا کرد و وەکو منداڵ لە هەمێزی گرت، ئەم مجامەلە و هاوسۆزیە تازەیە، دڵی نەخۆشی ژنەی بەلەنگازی هێنایەجۆش. نەیتوانی گوزارش لە هەستەکانی بکات. ئەمەی هەم بەلاوە ناخۆش و هەم بەلاوە خۆشبوو. ناخۆش بوو کە کورە گەورەکەی لە دەست دابوو، خۆش بوو کە کچێکی گەورە جێگاکەی بۆ پڕ کردبووەوە.

وەختایەک ڕوو بەڕوو لە سەر کورسیەکانیان ڕۆنیشتبوون، دەستی یەکیان گرت، دەست لە ناو دەست و بەدەم زەردەخەنەوە بەجۆرێ تەمەشای یەکدییان دەکرد، دەتگوت " جان " یان لە بیر چووە.

پاشان، باسی ئامادەکردنی تەدارەکی زەماوەندەکەیان کرد. دوای ئەوەی بڕیار لە سەر هەموو شتێک درا وڕێکخرا، روزمیلی لە ناکاوا شتێکی بچووکی وەبیر هاتەوە وپرسی:- هەڵبەتە ڕاوێژتان بە جەنابی رولاند کردووە، وانییە؟

دایک و کور، هەردووکیان سوور بوونەوە، دایکەکە بەرسڤی دایەوە :– ئۆە! نەخێر.

پاشان، کەوتە دوو دڵی، هەستیکرد، وەڵامەکەی پێویستی بە شەرحە، بۆیە لە سەری ڕۆیی:

– ئێمە، هەموو شتێک بەبێ پرس و ڕای ئەو دەکەین. گرینگ ئەوەیە هەر قەرارێکمان دا ئەوی لێئاگادار دەکەینەوە.

خاتوو روزمیلی بزەیەکی بۆکرد وبە هیچ ئاوایەک مەندەهۆش نەبوو، ئیدی ئەمەی بەلاوە ئاسایی بوو و بە نیشانەی ئەوەی زانی کە ئەم پیاوە بایەخی نییە.

وەختایەک خات رولاند و کورەکە زڤرینەوە، خات رولاند بە دەم ڕێگاوە گوتی: با بچین بۆ ماڵەکەت، دەمەوێ ئیسراحەتێ بکەم.

خات رولاند، هەستی دەکرد، کەسێکە بێ پەنا وپاسار، بێ پشت و پشتیوان، چونکە لە ماڵەکەی خۆیدا دەترسا.

بە دوو قۆڵی خۆیان بە ماڵەکەیێ جاندا کرد. هەرکە هەستی کرد دەرگاکەی لە دواوە داخرا، ئاە و ئۆخەیەکی قووڵی هەڵکێشا، وەکو ئەوەی داخستنی دەرگاکە، دڵنیایی پێ بەخشی بێت، لە بری ئەوەی وەکو بەتەما بوو ئیسراحەت بکات، کەوتە کردنەوەی دەرگای دۆلاب و کۆمەدیەکان، تا لە جل وبەرگ و چەرچەف و دەسماڵ و گۆرەوییەکان دڵنیا ببێتەوە.

تەرتیبی شتەکانی گۆڕی، تا تەرتیبێ وەدۆزێ کە جوانتر بێتە بەرچاوی، بەرچاوی بەڕێوەبەری ماڵەکە، وەختایەک شتەکانی بە دڵی خۆی تەرتیب کرد، خاولی و شۆرت و کراسەکانی لە سەر مێزە چکۆلەکەی خۆی دانا،

ئیدی شتەکانی بە سێ ڕیزی سەرەکی دانان، جل و بەرگی ژێرەوە، چەرچەفێن ماڵەکە، پەردەی سەر مێزەکان، ئەوجا کەمێک دوور کەوتەوە، تا تەمەشای ئاکامی کارەکەی بکات و، گوتی:- جان، کوا وەرە تەمەشا بکە بزانە ئەمە چەند جوانە!

جان، هەستا، بۆ ئەوەی دڵی دایکی خۆشبکات، دڵبەندی خۆی بەکارەکەی دەربڕی. دوای ئەوەی جان دانیشتەوە، خات رولاند لە ناکاوا بە ئەسپایی لە کورسیەکەی نزیک بووەوەو لە پشتەوە گەردنی ڕامووسی، دەستێکی لە ملی وەرێنا وبەوحاڵەوە بە دەستەکەی دیکەی شتێکی دیکەی لە کاغەزێکی سپیەوە پێچراوی لە سۆپاکە نا. جان پرسی:- ئەمە چییە؟

کە خات رولاند بەرسڤی نەدایەوە، یەکسەر تێگەیی. فۆرمی چوارچێوەکەی ناسییەوە و گوتی:- کوا بێنەی.

بەڵام خات رولاند، وای نواند کە گوێی لێنەبووە. ڕووی بۆ لای دۆلاب وکۆمەدیەکە وەرگێرا. جان هەستا، وێنە کۆن و بە ئازارەکەی هەڵگرت، بە ناو ماڵەکەدا ڕۆیی تا لە چاوی مێزەکەیدا هەڵی بگرێت، خستیە چەکمەجەی مێزەکەیەوە و دایخستەوە و بە کلیل دوو بای پێدا دا. خات رولاند بە سەری قامکەکانی فرمێسکی چاوەکانی سڕی، ئەوسا بە راوێژێکی نیمچە لەرزان گوتی:

- هەنووکە، چاوێ دەگێڕم تا بزانم کارەکەرە تازەکە موبەقەکەی تەرتیب کردووە یان نا، مادام وەدەرکەوتووە دەتوانم تەمەشای هەموو شتەکان بکەم تا بزانم چۆنن.

## (٩)

جەنـابی مارشـاند، نامەکـانی، مامۆسـتایان: ماروسـل، ریموسـو، فـلاش و بـوریکلی، پێشـکەش بە ئەنجـوومەنی کۆمپانیـای ئەتڵەنتـی کـرد، نـامەی چـی! یەکپـارچە مەدح و ستایشی دکتۆر پییر رولاندی قوتـابی خۆیان بـوو، جەنـابی بـولان، قـازی دادگـای بازرگـان و جەنـابی لوینـانی کەشـتی سـازی نێـودار و جەنـابی ماریڤـالی سـەرۆکی شـارەوانی هاڤەر، کە دۆستی تایبەتی کاپتن بوسیر بوو، هەر هەموویان پشتیوانیان لە ناوەڕۆکی نامەی مامۆستاکان کرد.

کۆمپانیـای نـاڤبری بە ڕێـکەوت هێشـتا دکتـۆری بـۆ کەشتیەکە دانەمەزراندبوو. پییر شانسـی هەبوو، دوای چەند ڕۆژێک دامەزرا. بەیانیەک، وەختایەک لە خۆگۆڕین بووەوە، جـــوزفینی کـــارەکەر زەرفێکـــی دایـــی کە فرمـــانی دامەزراندنەکەی تیـابوو. ئەوەنـدە خۆشـحاڵ بـوو، لە تـۆوایە کەسێکی مەحکـووم بە ئیعـدامە وحوکمەکەیـان بـۆ سـووک کردووە، کە بیری لە سەفەر، لە ژیانی ئارامی ناو دەریای بە پێـل و شـەپۆلان، لە ژیـانی دەربەدەری و سـەرگەردانی دەکردەوە، هەستی دەکرد، ئازارەکەی دەداتە کزی و سووک دەبێ...

ئەو ئێستا لە ماڵی بابیا کەسێکە نـامۆ، بێدەنگ، سرک و بەگومـان. لەو سـاوەی کە نهێنییە دزێوەکە، قێزەونەکە، ئەو نهێنیـیەی کە بە براکەیـی گوتبـوو، هەسـتی دەکـرد هەمـوو پەیوەنـدییەکانی دەگەڵ ماڵبـات و خانەوادەکەیـدا پچـڕاوە. پەشـیمان بـوو لەوەی کە بە جـانی گوتبـوو. هەسـتی دەکرد کەسێکی بێزراو، خـراپ و قێزەونە، هەرچەنـدە ئەو خەبەرە کەمێـک بـاری دەروونـی سـووک کـرد. سـەیری دایکـی و

براکەی نەدەکرد. چاویان لە یەکدی دەدزییەوە. هەمیشە لە خۆی دەپرسی: " ئاخۆ دایکیان چی بە جان گوتووە؟ ئایا ئیعترافی کردووە یان حاشا ودرۆ؟ ئەدی براکەم قەناعەتی بە چییە؟ چ گومانێکی لە دایکیەتی؟ چ گومانێکی لە من هەیە؟ " ئەم لەگەزەی بۆ هەڵنەهات، زۆر پەست بوو. وێڕای ئەمەش لە غیابی رولاندا، مەگەر بە دەگمەن دەنا قسەی دەگەڵ نەدەکردن. دەیویست خۆی لە پرسیاران دوور بگرێت.

کە نامە و فرمانی دامەزراندنەکەی وەرگرت، هەر هەمان ڕۆژ پیشانی خانەوادەکەی دا. بابی کە کابرایەکی گەشبین بوو و بە هەموو شتێک دڵی خۆشدەبوو لە چەپڵەی دا. جان کە زۆری پێخۆش بوو، بە ڕاوێژێکی جدی گوتی:

- پڕ بەدڵ پیرۆزباییت لێدەکەم، چونکە من دەزانم هەڤرکانی زۆرهەن کە هەوڵ بۆ ئەو کارە دەدەن، وادیارە نامەی مامۆستاکانت، دەوری خۆیان دیتووە.

دایکی، سەری ماچ کرد و لەبن لێوانەوە گوتی:- زۆر خۆشحاڵم کە سەرکەوتیت.

دوای نانی نیوەڕۆ چوو بۆ نووسینگەی کۆمپانیاکە، تا لە زۆرشت بپرسێت، پرسیاری ناوی دکتۆرەکەی کەشتی بیکاردی کرد کە قەراربوو سبەی دەربچێت، تا پرسیاری هەموو ورد و درشتێکی ژیانە تازەکەی خۆی و ئەو زروفە تایبەتیەی لێبکات کە ڕوو بەڕووی دەبووەوە.

دکتۆر بیرت، لە سەر کەنار بوو، پییر چوو بۆلای، لە ژوورێکی بچکۆلەی کەشتیەکەدا، گەنجێکی موو زەردی ڕیشن کە لە براکەی دەچوو، پێشوازی کرد. ماوەیەکی زۆر قسەیان کرد. لە دوورەوە گوێی لە دەنگ و هەرا و

هەنگامەیەکی زۆر بوو، کەل وپەل و شتومەک لە پاپۆڕەکە بـــار دەکـــرا، ئیـــدی دەنگـــی کەل وپەلەکـــان دەگەڵ دەنـــگ وجووڵەی پێی کرێکارەکان و جووڵەی سلینگ و ڕافیعەکان کە سـەندوقانیان دەگواستەوەو بار دەکرد تێکەڵ دەبـوون، هەروەها دەگەڵ شاوری سەر کرێکاران و هەراو هەنگامەی ڕاکێشان و کۆکردنەوەی زنجیران ئەو سلینگە زەبەلاحانەی کە کەشتیە زەلامەکەیان دەلەراندەوە تێکەڵ دەبوو.

پییـر، دوای ئەوەی هـاوڕێکەی بەجێهێشـت و کەوتەڕێ، خەمێکی تازە دایگرت، وەکو ئەو مژ ودوومـانەی لە دەریـاوە بەرز دەبێتەوە، تێی ئاڵا، لەوپەڕی دنیـاوە دەهـات. ئەم چڕە تەمە جۆرە نهێنـی وجنێوێکی لە توێی خۆیدا هەڵگرتبوو، لە دیار ودەڤەرێکی شەڕانی دووره دەستەوە دەهات.

هەرگیـز، لە هەڕەتـی کەسـەرداری خۆشـیا، بەم ئـاوایە نەکەوتبووە گێژاوی نائومێدی یەوە وهەستی بەم بێ نەواییە نەکردبـوو. دوا کـول وکۆڤـانی ڕەویـیەوە. هـیچ شـتێک بە خانەوادەکەیەوەی نەدەبەستەوە.

هێشتا ئەوەی تاقی نەکردبووەوە کە چۆن هەرچی سـۆز و میهری هەیە لە دڵی خۆیی دەربێنـێ، ئەوەی نەجەڕباندبوو وەختـایەک سـەگێکی وێـڵ و سـەرگەردان دەگـرن، چـۆن سـەری دنیای لێدێتەوە یەک، هەنووکە ئازارە ئەخلاقیەکەی لە کـۆڵ بووبـووەوە، بەڵکـو وەکـو حەیـوانێکی بـێ لانە وکاشانەی لێهاتبوو، هەستی بە سـەرگەردانی و نیگەرانیەکی غەریزی دەکرد، هیچ ساپیتەیەک نەبوو پەنای بەرێتێ. ئیدی هـیچ پەنـایەک نەبـوو لە بـاران و بـا وبـاهۆز و هێـزە شەڕانیەکانی دنیای بپارێزێت و داڵدەی بدات.

وەختایەک پێی نایە سەر ئەم پاپۆرە، وەختایەک خۆی بەم ژوورە بچووکەدا کرد کە بە سەر شەپۆلانەوە دەهەژی، ئیدی هارۆژا، ئەوێک کە بەوە ڕاهاتبوو هەمیشە لە ناو جێگای نەرم و ئاراما بنووێت هارۆژا، دژی ئەوە هارۆژا کە لە ئێستا و هێوە ئیدی ئەو ئارامیەی جاران نەما.

جاران هەستی دەکرد چوار دیوارێکی بتەوی بە ئەرزەوە بەند، دەی پاراست، هەستی بە ئاسوودەیی جەستە لەو شوێنەدا دەکرد، لە خانوویەکدا بوو کە بەرگەی بای دەگرت، ئیدی ئێستا هەموو ئەو شتانەی کە لەو ماڵە گەرم و داخراوەدا خۆشی دەویست، ئەو ماڵەی لە هەموو شتێکی دەپاراست، گۆڕابوو بە مەترسی و ئازارێکی بەردەوام. ئیدی ئەرزێک نەما هەنگاوی بە سەردا بنێ، هەموو شتێک دەریایەکی بەپێل وشەپۆلانە، دەهاژێنێ و هەرچیەکی بێتەبەرێ قووتی دەدا. لە هەر چوار نکاڵیا بستە ئەرزێک شک نابات پیاسەیەکی لە سەر بکات، غار بدات، خۆی لە کوچە و کۆڵانەکانیا ون بکات، ئەوەی هەیە ونیە، لەوحە دارێکی چەند مەترییە، تا وەکو زندانییەک لە نێو زندانیانی دیدا، ڕاوێچکەی بەسەردا بکات. نە دار و درەخت، نە باغ وباغچە، نە ڕێگا وبان و نە ماڵان هیچیان نەمان، ئەوەی هەیە و نییە، هەر ئاو و هەورانە، بە بەردەوامی، لە پەستا و بێ پسانەوە هەست دەکات پاپۆڕەکە لە ژێر پێیدا دەهەژێ، بە توونـدی تەکان دەدات. دەبێ لە ڕۆژانی هەستانی گەرداودا خۆی بە لەمپەڕانەوە، بە دەرگاکانەوە، خۆی بە قەراخ قەرەوێڵە باریکەکانەوە بگرێت بۆ ئەوەی نەکەوێت وغل نەبێتەوە. لە ڕۆژە ئارامەکاندا کە گوێی لە دەنگ و لەرەی ناخۆشی پەروانەی پاپۆڕەکە دەگرت، هەستی بەوە

دەکـــرد پـــاپۆڕەکە بە بەردەوامـــی دەیڕفێنـــێ، ڕفانـــدنێکی سیســـتەماتیک کە ڕقـی پیـاوی هەڵدەسـتاند.. ئیـدی خـۆی بە مەحکوومێکی کـارێن قورس دەهـاتە بەرچـاو، مەحکوومێکی ئاوارە، سەرگەردان و تەنیا، چونکە دایکی ڕادەستی گەمە و ڕابواردنی پیاوێک بووبوو.

بە خـــاوی وبێتـــاقەتی بەرەوپـــێش ڕۆیـــی، تـــرس ودوودڵییەکـــی ترســـناکی لە دڵـدا بـــوو، هەمـــان تـــرس و نائومێدی خەڵکانی موهاجیر بوو.

لە دڵـی خۆیـدا، هەسـتی بە هـیچ ڕقێکـی بـێ بنەمـا، لە خەڵکی دی، لەو خەڵکە نەناسەی کە بە بەردەمیا دەڕۆیشـتن، نەدەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە، حەزێکی خەمنـاک هـانی دەدا قســـەیان دەگەڵـــدا بکـــات، پێیـــان بڵێـــت: دەڕوات، فەرەنســـا بەجێدێڵێت. گوێی لێبگرن، دڵخۆشی بدەنەوە.

لە دڵی خۆیدا ئەوەی بە پێویستیەکی نەنگین دەزانـی کە دەست پان بکاتەوە، شەرم و شەرمەزارییە، هەست بکات کە یەکێـــک، خەفەت بـــۆ ڕۆیشـــتنی ئەو بخـــوات. بیـــری لە ماروفسکو، پیاوە پیرە پولونیەکە کردەوە، کە تـاقەکەس بوو کە بەجدی خۆشـی دەویسـت و ئەم بە دڵ هەسـتی پێدەکرد، ئیدی بڕیاری دا یەکسەر بۆلای بڕوات وبیدینێت. وەختایەک خـۆی بە دووکـانەکەدا کـرد، یـارۆی دەرمانسـاز کە خەریـک بوو شـتێکی لە دەسـکاونگێکی مەڕمەڕ دا دەکوتـا، بە ئاسـتەم ڕاچڵەکـی، دەسـتبەردازی کـارەکەی بـوو. گـوتی: - چیـیە دیارنیت، کەس ناتبینی؟

پییر، بۆی گێڕایەوە کە بە زۆرشـتانەوە، بێ ئەوەی هـیچ یەکێک لەو شتانەی پێ بڵێ، خەریک بووە. ئەوسا دانیشت و پرسی:- ئێ، کاروبارت لە چیدایە، دەڕوات؟

- كاروبار باش نييه، ناڕوات. هەڤرکییەکە لەوەدا نییە، نەخۆشان هەم کەمن و هەم زۆر دەسکورت و بێنەوان. لەم گەڕەکە کرێکار نشینەدا جگە لە دەرمانی هەرزان بایی، هیچ دەرمـــانێکی دی نــایەتە فرۆشـــتن، دکتـــۆرانش، دەرمـــانی گرانبایی، ئەو جۆرە دەرمانانەی لە سەدا پێنج سەد قازانج دەکەن بۆ نەخۆشـان نانووسـن.. کـابرا کۆتـایی بە قسـەکانی هێنا وگوتی:

- ئەگەر ئەم بایە لەم کونەوە بێ، دەبێ لە زەرفی سێ مانگی دیکەدا دووکانەکەم دابخەم، دکتۆرگیان، دەبێ بکەومە قۆندەرە بۆیاغکرن.

پییـر، هەستیکرد، دڵی دەگوشـرێت، لە ناکاوا بڕیـاری دا قسەی خۆی بکات، بۆیە گوتی:

- ئـۆە! مـن.. مـن.. مـن نـاتوانم یارمەتیـت بـدەم، لە سەرەتای مانگی داهاتوودا، دەڕۆم، هاڤەر بەجێ دێڵم.

ماروفســکو، ئەمەی زۆر لەبەر گـران بـوو، بە ڕادەیەک لەبەری گران بوو کە چاویلکەکەی داکەند وگوتی:- تۆ.. تۆ.. چیت گوت؟

- گوتم دەڕۆم، هاوڕێی داماوم.

یارۆی پیرەمێر حایر مابوو، هەستی دەکرد دوا ئومێدی هەرەسـی هێنـا، لە ناکـاوا هـاڕوژا، بەڕووی ئەو کـابرایەدا کە خۆشـی دەویسـت، متمـانەی زۆری پـێ هەبـوو، کەچـی بەو ئاســـــانیە دەســـــتبەرداری بـــوو،بە ڕوویـــا هەڵشـــاخی، بەدەمەلاڵکێوە گوتی:- قابیلە تۆش خیانەتم لێناکەیت؟

پییـر، بە ڕادەیەک بەزەیـی پێیـدا هـاتەوە حەزی دەکـرد دەست لە ملی بکات، گوتی:

- من خیانەتم لێنەکردوویت، لێرە ئیش وکارم دەست ناکەوێ، ئیدی بە دکتۆری دەگەڵ یەکێک لە پاپۆڕەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەنتی دا دەڕۆم.

- ئۆە! کاکە پییر! خۆتۆ بەڵێنت دابوومێ کە یارمەتیم بدەیت!

- چارچییە! دەبێ فریای خۆ بکەوم، ژیانی خۆم دابین بکەم. تاقە پولێک لە دارای دنیادا شک نابەم.

ماروڤسکو، دووپاتی کردەوە:

- ئەمە خراپە، کارێکی زۆر خراپت کردووە. ئیدی هیچ چارێکم نییە، دەبێ لە برسانا بمرم. ئیدی ئەوە ئاکام و ئاقیبەتم دەبێ، ئەمە زۆر خراپە. تۆ دەستبەرداری پیرەمێرێک دەبیت کە دوای تۆ کەوتووە، هەموو ئومێدێکی بە تۆیە، بە ڕاستی ئەمە کارێکی خراپە.

پییر ویستی بۆی ڕوون بکاتەوە، دڵنیای بکات، بە هەنجەت و بەڵگەی دروستەوە بۆی بسەلمێنێت، جگە لەو کارەی کردوویەتی هیچ چارێکی دیکەی نەبووە. یارۆی پولونی خرۆشیاگ، گوێی لەو هەنجەتانە نەگرت، ئەمەی بەجۆرە ڕاکردن و هەڵاتنێک دەزانی، بۆیە قسەکەی پێبڕی و بەدەم ئاماژەکردنەوە بۆ بویەرە ڕامیارییەکان گوتی:

- تۆش وەکو هەر فەرەنسیەکی دیکە وایت، ئێوە بەڵێنەکانتان نابەنەسەر.

هەنگێ پییر، بەبێزارییەوە هەستا، بەجۆرە فرناخیەکەوە گوتی:

- تۆ کابرایەکی زاڵمی بابە ماروفسکو. هەڵبەتە لە خۆڕایی ئەم کارەم نەکردووە، بێگومان سەدەم و ئەنگیزەی

خـۆی هەیە، تـۆ پێویسـتە ئەمە بزانیـت. بەهێڤـی دیـدار.
ئومێدەوارم ئاقڵانەتر بیر بکەیتەوە.

لە دووکـانەکە وەدەرکەوت، لە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: "
کەواتە کەس نییە، دڵسۆزانە خەفەتم بۆ بخوات " لە مێشکی
خۆیدا بیری لە هەموو ئەو کەسانە کردەوە کە دەیناسین و
ناسیاوی دەگەڵیاندا هەبوو، لە ناو هەموو ئەو سیمایانەدا کە
لە یادگەیدا کەڵەکە بووبـوون، سـیمای ئەو کیـژەی هـاتەوە
بەرزەین کە لە قاوەخانەکەدا کاری دەکرد و گومانی ئەمی
سـەبارەت بە دایکـی، هاڕووژانـدبوو. دوو دڵ بـوو لەوەی
بچێت بـۆلای، لە دڵـی خۆیـدا جـۆرە ڕقێکی خۆڕسـکی لـێ
هەڵگرتبوو، ئەوسا لە ناکاوا بەخۆی گوت: " وێرای هەموو
شتێک هەق بەو بوو " ملی ڕێگای گرت وبۆلای ئەو ڕۆیی.

قاوەخانەکە بەڕێکەوت لە خەڵکا جمەی دەهات، پڕبوو لە
خەڵکێن جگەرەکێش. ئەمانە تێکەڵەیەک بوون لە بورژوایان
و کرێکـاران، ئەمـڕۆ ڕۆژی پشـوو بـوو، هاواریـان دەکـرد،
پێـدەکەنین، بانگیـان دەکـرد. خـاوەن کـارەکە بەخۆیشـی بە
مشتەرییەکان ڕادەگەیی، لەم مێزەوە بۆ ئەو مێز ڕایدەکرد،
بوتڵە بیرە بەتاڵەکانی کۆدەکردەوە و بەپڕی دەی هێنانەوە.

وەختایەک پییر، لە نزیکی باڕەکەوە شوێنێکی دۆزییەوە،
چاوەڕوانی کرد بە ئومێدی ئەوەی کارگەرە ژنەکە بیبینێت و
بیناسێتەوە. بەڵام ژنەی تاین، دووجاران بە بەردەمیا بوری
بێئەوەی تیچاوێکی تێبکات. بە سووکە لەنجەیەکی جوان ڕێی
دەکـرد، لاقەکـانی، لە ژێـر تەنـوورەکەیەوە، مشـک ئاسـا
دەجـولان. کـار گەیـیە ئەوەی کە پییر، بە پـارچە دراوێـک لە
مێزەکەی دا، ژنەی تـاین ئـاوڕی دایەوە وگـوتی:- ئەمـرت بە
چییە قوربان؟

ژنەی تاین تەمەشای پییری نەکرد، بیری لەلای حیسابی ئەو مەشرووبانە بوو کە بۆ مشتەرییەکانی دانابوون. پییر گوتی:- ئەمە چییە؟ خەڵکی بەم ئاوایە سڵاو لە دۆستانی خۆ دەکەن؟

چاوانی تێبڕی، بە ڕاوێژێکی لەزگین گوتی:

- ئاە! ئەمە تۆی. حاڵت چۆنە. ئەمڕۆ دەرفەتم نییە. بیرەت دەوێ؟

- بەڵێ، پێکێک بیرە.

وەختایەک، پێکە بیرەکەی بۆ هێنا، پییر گوتی:

- هاتووم خاترخوازیت لێبکەم، دەڕۆم، کۆچ دەکەم.

ژنەی تاین، بە خەمسارديەوە بەرسڤی دایەوە:- ئەها، بۆ کوێ دەڕۆیت؟

- بۆ ئەمریکا.

- دەڵێن وڵاتێکی جوانە.

هیچی تر نەگوترا. بەڕاستی کەرە کە لەم ڕۆژەدا و لەم قاوەخانە قەوغایەدا دەیدواند!

پییر، بەرەو دەریاکە وەڕێکەوت، وەختایەک گەیییە شۆستە و لەنگەرگایە لاوەکییەکە، کەشتیی مرواری بینی کە خۆی بە بەندەرەکەدا دەکرد وباوکی وکاپتن بوسیری بەسەرەوە بوو. باباگری دەریاوان سەوڵی لێدەدا و، دوو پیاوەکەی دی لە دواوە دانیشتبوون، شاد و بەکەیف، سەبیلیان دەکێشا. دکتۆر کە بینیانی تێدەپەڕین، لە دڵی خۆیدا گوتی: " کە خەڵکی سائەقڵ خۆش دەژین! "

لە سەر کورسییەکی دیار دیواری شەپۆلگیرەکە دانیشت، دەیویست حەیوان ئاسا بخەوێ. دەمەو ئێوارێ کە

بۆ ماڵ گەڕایەوە، دایکی بێئەوەی زاتی ئەوە بکات چاوی لە چاوان ببڕێت گوتی:

- تۆ زۆرشتت بۆ ئەم سەفەرە پێویستە، من تیا ماوم، هەندێ جل بەرگی ژێرەوەم بۆ ڕاسپاردویت، بۆ مەسەلەی جل وبەرگیش سەری بەرگ درووەکەم دا، هیچ شتێکی ترت پێویستە کە من لە بیرم نەبێت؟

لەزگ بوو دەم هەڵێنێ و بڵێت: " نا، هیچ شتێکم پێویست نییە " بەڵام زوو قسەکەی گێڕایەوە و هەستی کرد کە پێویستە بە ئەدەبەوە و بە ڕاوێژێکی زۆر نەرم قەبووڵی بکات، وەڵامی دایەوە:- جارێ نازانم، دوایی پرسیار لە کۆمپانیاکە دەکەم.

پرسیاری کرد، لیستێکیان بە شتە زەروورییەکان بۆکرد. دایکی بۆ یەکەمجار بەدەم وەرگرتنی لیستەکەوە لە دەستی، تەمەشای کرد،گوزارشتێکی زۆر زەلیلانەی لە قووڵایی چاوەکانیا بەدی دەکرد، گوزارشتێکی زۆر شیرین، زۆر خەمین، پڕ پاڕانەوە، گوزارشتی سەگێکی بێچارەی لێدراو کە داوای ئەمان بکات.

بۆ سبەی کاتێ لە ماڵ وەدەردەکەوت، ڕوو بەڕووی دایکی بووەوە کە لە سەر قاڵدرمەکان چاوەڕوانی دەکرد، دایکی بە دەنگێکی نەوی کە بە ئاستەم دەبیسترا، لەبن لێوانەوە گوتی:

- ناتەوێ یارمەتیت بدەم و لەگەڵتا بێم تا لەسەر پاپۆڕەکە دەگیرسێیتەوە؟

- نا، سوپاس، هەموو شتێک تەواوبوو.

دایکی لەبن لێوانەوە گوتی:- زۆر حەزدەکەم ژوورە بچکۆلەکەت بدینم.

- پێویســـت ناکـــات، هەم زۆر ناشـــیرینە و هەم زۆر بچووکە.

پییـر، بەلایـا ڕەت بـوو. دایکـی زۆر هـیلاک ومانـدوو، ڕەنگزەرد ومردەلۆخ، پشتی بە دیوارەکەوە دابوو.

لەکاتی نـانخواردنی ئێوارێدا، رولاند کە لە یەکەم ڕۆژی گەیشـتنی کەشـتیەکەوە سـەردانی لـورینی کردبـوو، جـگە لە باسی ئەم کەشتیە جوانە، باسی هیچی دیکەی نەکرد، سەری لەوە سـوڕمابوو کە ژنەکەی هـیچ شـتێکی لەمەڕ کەشـتیەکە نەدەپرسـی، ئەو کەشـتیەی کە کـوڕەکەی بە زووتـرین کـات لەگەڵیا دەڕۆیی.

پییـر، لەو چەنـد ڕۆژەی دواییـدا، بە هـیچ جـۆرێ لەگەڵ ماڵباتەکەیا نەمایەوە. ئەعسابی تەواو نەبوو، زوو هەڵدەچوو، زۆر تـوورە و تـرۆ بـوو، قسـەکانی ئەوەنـدە زبـر وڕەق و نـاخۆش بـوون، دەتگـوت قـامچیە و بە سـەر وگـوێلاکی هەموویانـــدا دەدرێ. بەڵام لە ناکـــاوا کەمێـــک پـــێش سەفەرەکەی، تەواو گۆڕا، دایە نەرمکێشـی، بەدەم مـاچکردنی داک و بـاوکییەوە و پێش ئەوەی بڕوات لە ناو کەشـتیەکەدا بخەوێ، بۆ یەکەمجار گوتی:

- سـبەینێ دێـن، لە سـەر کەشـتیەکە دوعـاخوازیم لێبکەن؟

رولاند هاواریکرد: - هەڵبەتە، ئەدی مەعنای چی، وانییە لویز؟

لویز، بە دەنگ و ڕاوێژێکی زۆر نەوی گوتی: - هەڵبەتە، بێگومان.

پییر، لە سەری ڕۆیی و گوتی:

- کەشتیەکە لە سەعات یازدەی تەواودا دەردەچێت. دەبێ لە سەعات نۆ ونیوا لەوێندەر ئامادەبین.

بابی هاواریکرد:

- زۆرچاکە، ئێمە زۆر زوو دەڕین، بە سواری مرواری دەڕۆین، لە لەنگەرگا لاوەکییەکەدا چاوەڕوان دەکەین، تا کە تۆ لەبەندەرەکە دەرچوویت، بۆجاری دووەم بتبینینەوە. واباش نییە لویز؟

- بەڵێ، بێگومان.

رولاند، لە سەری ڕۆیی وگوتی:

- ئیدی بەو شێوەیە لە نێو قەرەباڵغی ئاپۆڕای خەڵکەکەدا، کە عادەتەن لە کاتی دەرچوونی پاپۆڕانی ئەتڵەنتیدا لە لەنگەرگای بەندەرەکەدا کەڵەکە دەبن، ونمان ناکەیت و لێت ون نابین.. ئەوەندە قەرەباڵغ دەبێ، کەس لەو قەرەباڵغیەدا کەس وکاری خۆی نادۆزێتەوە. دەڵێی چی؟

- هەڵبەتە، ئەمە باشە، ڕازیم.

دوای یەک سەعات، لە سەر قەرەوێڵە باریکەکەی خۆی، قەرەوێڵەی تەسک و تروسکی دەریاوانان، درێژ وباریک عەینی تابووت، لێی پاڵکەوت. ماوەیەکی زۆر بەو دەقەوە مایەوە، چاوەکانی کرابوونەوە، بیری لەو شتانە دەکردەوە کە لە ژیانیا ڕوویان دابوو، بەتایبەتی ئەو بارە دەروونییەی لەم دوو مانگەی دواییدا بەسەری هاتبوو.

زۆر ماندوو بوو، ئەوەندە خۆی و خەڵکی ئازار دابوو وەکو چەقۆی کولی لێهاتبوو، وای لێهاتبوو زاتی نەدەکرد کەس تووڕە بکات.

ئیدی لەبەر هەر هۆیەک بوو، دەستبەرداری هەڵچوون و تووڕە بوونەکەی بوو، کە وەکو ژیانی بڕوات. لە شەڕ، لە

هێرش و پەلامار، لە ڕق وبوغز، بێزار وبێتاقەت بوو، توانای ئەو شتانەی نەما. هەوڵی دا دڵی خۆی بەفەرامۆشی و لەبیر بردنەوە بەنج بکات، وەکو چۆن ئینسان خەوی لێدەکەوێت. بە ئاستەم گوێی لە هەرا وهەنگامەی تازەی کەشتیەکە بوو، هەرا و زەنایەکی سووک، کە بە ئاستەم هەستی پێدەکرا، هەرا و هەنگامە سووکەکە ئاوێتەی ئارامی شەوی بەندەرەکە بوو. هەستی بە ئازارێک دەکرد، وەکو ئازاری ئەو بریندارانە بوو کە برینەکانیان خەریکە سارێژ دەبێت.

خەوێکی قووڵی لێکەوت، لە جم وجوڵی دەریاوانەکان خەبەری بووەوە. ڕۆژهەڵات، قیتارەکە گەیە ویستگەی بەندەرەکە. ڕێبوارانی پاریسی هێنابوو. هەنگێ لە نێو ئاپۆرای خەڵکە مژوول و نیگەرانەکەدا ون بوو، ئەو خەڵکەی لە ژوورەکانی خۆیان دەگەڕان، یەکدییان بانگ دەکرد، پرسیاریان دەکرد، بە شێوەیەکی ڕەوتەنی وەڵامی یەکتریان دەدایەوە، هەموو ترسی، سەرەتا و دەستپێکی سەفەریان پێوە دیاربوو. دوای ئەوەی سڵاوی لە کاپتنەکە کرد و تەوقەی دەگەڵ برادەرەکەیدا، نوێنەری بەندەرەکە کرد، خۆی بەهۆڵەکەدا کرد، کە چەند ئینگلیزێک لە گۆشە و کەنارەکاندا نووستبوون.

دیواری هۆڵەکە لەمەڕمەڕی سپی بوو، هێڵێکی باریکی زێڕین بە هەر چوار دەوریا کێشرابوو، لە قووڵایی ئاوێنەیەکدا، ڕەنگی دەدایەوە، مێزە درێژەکانی کەوتبوونە نێوان دوو ڕیز کورسی خولاوەوە کە بە مەخمەڵێکی سوور داپۆشرابوون. ئەم هۆڵەی کە بەسەر ئاوەوە دەگەڕا، جوان بوو، هەموو دەوڵەمەندانی کیشوەرە جیاوازەکانی دنیا پێکەوە لێرەدا نانیان دەخوارد. خۆشیەکەی، وەکوخۆشی

ئوتێله گەورە و شانۆ و شوێنە گشتیەکان بوو. ئەو خۆشیە بەهەیبەتەی کە چاوی ملیونێرانی تێر دەکرد.

دکتۆر، ڕۆیی، تا سەرێکی ئەو بەشەی کەشتیەکە بدات کە تایبەت بوو بە ڕێبوارانی نمرە دوو، وەختایەک بیری کەوتەوە کە دوێنێ ئێوارە، حەشامەتێک خۆیان بە کەشتیەکەدا کرد، چووە خوارەوە، بۆنێکی تیژ وناخۆش، بۆنی خەڵکانی هەژار و چڵکن و پڵکن، بۆنی گۆشتی ڕووت، کە زۆر لە بۆنی کوڵکە وخوری حەیوانات ناخۆشتر بوو، لووتی کزاندەوە. پییر، لە کەلێنێکی خوارەوە، کەلێنێکی تاریک و نزم، وەکو ڕاڕەوی کانە خەڵوز سەدان پیاو وژنی بینی کە لە سەر ئەرزەکە ڕاکشابوون. دەم وچاوەکانی جیانەدەکردەوە. بەڵام بە شێوەیەکی تەم ومژاوی حەشاماتە پیس و شرپۆشەکەی دەبینی. ئەو حەشیمەتە کڵۆڵەی کە ژیان دای پڵۆسی بوون، شەکەت و ماندوو، چەوساوە و پلیشاوە، ژنە مردەلۆخ و منداڵە لەڕ ولاوازەکانیان بەگەڵ خۆ دابوو، ڕوویان دەکردە شوێنێکی نادیار بەو ئومێدەی لەوێندەر لە برسا نەمرن. دکتۆر لە کاتێکا بیری لە کار وژیانی ڕابردووی ئەو هەژارانە، لە کارە بەفیڕۆ چووەکانیان، لە هەوڵە نەزۆکەکانیان، لە کۆششە بێهودە و دووبارەکانیان دەکردەوە، بیری لەو ڕەنجە بێوەریان دەکردەوە کە دەیاندا و ئەوجاش دەڕۆیشتن تا سەر لە نوێ دەست پێبکەنەوە، دەڕۆیشتن، بێئەوەی بە خۆشیان بزانن بۆ کوێ، بە دەم ئەو بیرانەوە، ئارەزووی ئەوەی لا پەیدا بوو کە هاواریان بەسەردا بکات: "جارێ خۆتان وژن و منداڵەکانتان بڕۆن خۆتان بە ئاو بشۆن." دڵی بە حاڵیان

سووتا، نەیدەتوانی تەمەشای دیمەنەکان بکات، بۆیە پشتی تێکردن و ڕۆیی.

بابی وداکی و براکەی وخاتوو روزمیلی لە ژوورە چکۆلەکەیدا چاوەڕوانیان دەکرد. پێی گوتن:- هێشتا زۆر زووە.

خات رولاند، بە دەنگێکی لەرزۆک بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، ویستمان برێک زیاتر لەلات بمێنینەوە و پتر بت ببینین. پییر تەمەشای کرد، خات رولاند وەکو ئەوەی تازیەبار بێ جلکی ڕەشی لەبەر بوو، لە ناکاوا قژەکەی، کە تا مانگی ڕابردووش ماش و برنج بوو، بەدی کرد کە هەنووکە بە تەواوی سپی بووبوو. چووە سەر قەرەوێڵەکەی، زۆری پێناخۆش بوو کە ئەم چوار کەسە لە ژوورە بچووکەکەیدا دانیشن. لە دەرگاکەوە کە کرابووەوە، خەڵکانێکی زۆر دەبینران، دەتگوت ڕێبوارانی ڕۆژانی جەژنن، چونکە دۆست وبناژۆیانی، ئەوانەی سەفەریان دەکرد، بەناو کەشتیە گەورەکەدا بڵاو بووبوونەوە. ئیدی بە ناو پاڕەوەکان، بە ناو هۆڵەکان و بە هەموو شوێنێکا دەسووڕانەوە. هەر خەڵک بوون سەریان دەکێشایە ناو ژوورەکە، لە دەرێ ڕا. دەنگان دەهاتنەگوێ: " ئەمە ژووری دکتۆرە ". هەنگێ پییر دەرگاکەی پێوەدا. بەڵام کە هەستیکرد دەگەڵ کەس وکارەکەیدا حەپسە، حەزی کرد دەرگاکە بکاتەوە، چونکە لەرەلەری کەشتیەکە بێزار وبێدەنگی کردبوون. خاتوو روزمیلی، ویستی بێدەنگیەکە بشکێنێ، گوتی:- ئەم پەنجەرە چکۆلانە بەحاڵ هەوایان لێ دێتە ژوورەوە.

پییر بەرسڤی دایەوە: - ئەمە دەلاقەیە.

ئاماژەی بۆ ئەستوورییەکەی کرد تا شووشەکە بەرگەی هەر بەرکەوتنێکی توونـد بگرێت، ئەوسـا بە دوور ودرێژی باسی چۆنیەتی داخستنەکەی کرد. رولاندش پرسی:

- لێرە دەرمانخانەت هەیە؟

دکتۆر، سەندوقێکی کردەوە، ریزێک شووشەی نیشاندا، سەرو پارچە کاغەزی سپی چوارگۆشەیان پێوە لکابوو کە بە لاتینی ناوی دەرمانەکانیان لێنووسرابوو. یەکێک لە شووشەکانی دەرهێنا تا تایبەتمەندی دەرمانەکەی ناوی بخوێنێتەوە، ئەوسا شووشەی دووەم و پاشان شووشەی سێیەمی دەست دایە و، ئیدی محازەرەیەکی دوور ودرێژی دەربارەی کاریگەریە مالیجەییەکانیان دا، وادیاربوو، ئەوانەی دەوروبەری زۆر بە جدی گوێیان لێدەگرت. رولاند بەدەم سەر لەقاندنەوە گوتی:- ئەمە چەند بە سوودە!

بەئەسپایی لە دەرگا درا، پیر گوتی:- فەرموو.

کاپتن بوسیر وەژوورکەوت، دەستی گوشی و گوتی:

- بۆیە درەنگ هاتم، تا کۆبوونەوە و مەجلیسە خێزانییەکەتان لێ تێکنەدەم.

ناچار، ئەویش لەسەر قەرەوێڵەکە ڕۆنیشت، سەرلەنوێ بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان. بەڵام کاپتن لە ناکاوا گوێی هەڵخست، لەو دیو لەمپەڕەکەوە، دەستورێکی هاتەگوێ، گوتی:

- وەختی ڕۆیشتنمان هاتووە. ئەگەر بمانەوێ بە مرواری بڕۆین و لەوسەری بەندەرەکە چاوەڕوان بکەین و بەسەر دەریاوە دوعاخوازیت لێبکەین دەبێ بڕۆین.

بابە رولاند ئەوەی زۆر پێخۆش بوو، بە تایبەتی کە حەزی دەکرد سەرنجی ڕێبوارەکانی کەشتی لورین

ڕاکێشێت، بۆیە بلەز هەستا وگوتی:- دەی بە دوعا کوڕەکەم.

ئەم لاو ئەولای پییری ڕامووسی و ئەوسا دەرگاکەی کردەوە. خات ڕولاند لەجێی خۆی نەجولا، چاوی داخستبوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. مێردەکەی باسکی گرت و گوتی:- دەی، با لەزێکەین، زۆر درەنگە ها.

خات ڕولاند هەستا، بەرەولای کوڕەکەی چوو، ڕوومەتە سپیە مۆم ئاساکانی، یەک لە دوای یەک لێ بردە پێشەوە، بێئەوەی هیچ قسەیەک بکات هەردوو ڕوومەتی ( دایکی ) ماچ کرد. ئەوسا تەوقەی دەگەڵ خاتوو ڕوزمیلی و براکەیدا کرد ولێی پرسی:- کەی زەماوەندەکەت دەکەی؟

- جارێ بە تەواوەتی نازانم. دەیخەینە ئەو کاتەی کە تۆ دێیتەوە.

ئەنجام هەموویان لە ژوورەکە وەدەرکەوتن وسەرکەوتنە سەر ئەو پردەی کە لە خەڵکی و کۆڵبەر و دەریاوانەاندا جمەی دەهات.

هەڵم، لە ژێر پاپۆڕە زەبەلاحەکەوە، کە دەتگوت لەوەستان بێزار و بێتاقەت بووە، بەرز بووەوە.

ڕولاند، کە هەمیشە پەلەپەلی بوو، گوتی: - بە دوعا.

پییر، کە لە قەراخ یەکێک لەو لەوحە دارانەی لە نێوان شۆستەکە و لورین دا ڕایەڵ کرابوو وەستابوو، گوتی: - بە دوعا.

سەر لەنوێ تەوقەی دەگەڵ هەموویاندا کردەوە. ماڵباتەکەی دوور کەوتنەوە، باوکیان هاواریدەکرد:- خێرا، خێرا، خۆ بگەیەننە گالیسکەکە!

گالیسـکەیەک چـاوەڕوانی دەکـردن، تـا بیـانگەیەنێتە پێشـەوەی بەنـدەرەکە کە باباگری کەشـتی مـرواری ئامـادە کردبـوو تـا بەنـاو دەریـا بـکەون. دنیـا کڕوکـپ، سـروەیەک نەدەهات، ڕۆژێکی وشک و ئارامی پاییز بوو، دەریا مەنگ و سارد و پتەو وەکو پۆڵا دەهاتە بەرچاو.

جان، دەستی دایە سەوڵێک، دەریاوانەکەش دەستی دایە سەوڵەکەی دی و دەستیان بە سەوڵ لێدان کرد. ئاپۆڕایەکی بێ شومار، جەمـاوەرێکی شپرزە و پڕ هەرا وزەنـا و غەڵبە غەڵب، لە سەر دیوارە شەپۆل شکێنەکە و لە سـەر هەردوو شۆسـتەکەی ئەم لا و ئەولای بەنـدەرەکە وەسـتابوون و چاوەڕوانی " لورین " یان دەکرد. مرواری بەبەینی ئەم دوو شەپۆلە بەشەریەدا ڕەت بوو و، بلەز لە بەندەرەکە دەرچوو.

کـاپتن بوسـیر، لە نێـوان هەردوو ژنەکەدا دانیشـت، لەمپەڕەکەی گرت، گوتی:

- هەرئێستا خۆمان دەگەیەنینە ڕێگای کەشتیەکە.

هەردوو سـەوڵ لێـدەرەکە، بە هەمـوو هێـز و توانـای خۆیانەوە کەوتنە سەوڵ لێدان، بۆ ئەوەی بگەنە دوورترین شوێن.

رولاند لە ناکاوا هاواریکرد:

- ئـا ئەوەتـا، مـن هەردوو بـورج و هەردوو دووکەڵکێشەکەی دەبینم، وا خەریکە لە ئەستێلی بەندەرەکە دەردەچێت.

بوسیر گوتی:- کوڕینە هیمەتێ بکەن. دەی بتان ڕەژم.

خات رولاند، دەستەسڕەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و نایە سەر چاوی.

رولاند، کە لەلای کۆڵەگەکەوە وەستابوو گوتی:

- ئەوەتا لە بەردەم بەندەرەکەدا دەجوڵێت.. وەستا.. کەوتەوە جوڵە.. ناچار بوو هانا بۆ کەشتیەک بەرێ کە ڕای بکێشێت.. ئەوە کەوتە ڕێ.. ئافەرین! ئەوە خۆی بەنێوان هەردوو شۆستە لاوەکییەکاندا کرد.. گوێتان لە ئاپۆڕای خەڵکەکەیە کە چۆن هاوار دەکەن.. ئافەرین!... ئەوە کەشتی بنتونە کە ڕایدەکێشێت.. ئێستا بەشی پێشەوەی دەبینم... ئا ئەوەتا... ئا ئەوەتا... خودایا، ئەم کەشتیە چییە! خودایا! تەمەشای کەن تەمەشا..!

خاتوو روزمیلی و بوسیر ئاوریان دایەوە، هەردوو پیاوەکە دەستبەرداری سەوڵ لێدان بوون، خات رولاند، تاقەکەس بوو کە لە جێی خۆی نەجوڵا.

کەشتیە زەبەلاحەکە، لەلایەن کەشتیەکی ڕاکێشانی بەهێزەوە ڕادەکێشرا، کەوتبووە پێشی کەشتیە زەبەلاحەکەوە، لە چاو کەشتیە زەبەلاحەکەدا لە کرم دەچوو. کەشتیەکە بە هێمنی و بە شکۆوە لە بەندەرەکە دەردەچوو. هەموو گەلی هاڤەر لە سەر شۆستەکە و لە سەر کەنارەکان ولە سەر پەنجەرەکان کەڵەکە بووبوون، لە ناکاوا حەماسی نیشتمانپەروەری گرتنی و بەدەم هاوارەوە کەوتنە هورا کێشان: " بژی لورین " ! هورایان دەکێشا و چەپڵەیان بۆ ئەم سەفەرە جوانە لێدەدا، چەپڵەیان بۆ لە دایکبوونی ئەم شارە دەریاییە گەورەیە لێدەدا، کە جوانترین کچانی خۆی بە دەریا بەخشی بوو، ئەنجام کەشتیە زەبەلاحەکە دوای ئەوەی لە ڕاڕەوە تەنگەکەی نێوان هەردوو دیوارە گرانیتەکە تێپەڕی، هەستی بە ئازادی کرد، دەستبەرداری ئەو کەشتیە بوو کە ڕایدەکێشا، ئیدی هەرخۆی وەکو دێوێکی زەبەلاح بەسەر ئاوەکەدا کەوتەڕێ. رولاند، لە پەستا و بێ پسانەوە هاواری

دەکرد:- ئا ئەوەتا.. ئا ئەوەتا.. ! ڕاستەوڕاست بەرەو ئێمە دێت.

بوسیر، بە ڕوو گەشیەوە گوتی:- چیم پێگوتن، قسەکەی من دەرنەچوو؟

جان بە دەنگێکی زۆر نەوی بە دایکی گوت: - تەمەشاکە دایکەگیان. خەریکە نزیک دەبیتەوە.

خات رولاند، دەستەسڕەکەی لە سەر چاوانی لابرد، ئەو چاوانەی ڕوندک لێڵی کردبوون. لورین، لەوەتای لە بەندەرەکە دەرچوو بوو، بە هەموو خێراییەکی خۆیەوە بە ناو ئەم کەشە جوان و ئارامەدا دەهات. بوسیر کە ڕووی دووربینەکەی کردبووە کەشتیەکە، گوتی:

- ئاگاداربن، جەنابی پییر، لە دوای دواوەیە و بەتاقی تەنیا، بە ئاشکرا دیارە.

کەشتیەکە، بەرز وەکو کێو، خێرا وەکو قیتار، بەلاماندا تێپەڕی، چیوای نەمابوو خۆی لە مرواری بدات. خات رولاند، سەرگەردان و شێتانە هەردوو باسکی بۆ درێژ کرد، کوڕەکەی بینی، پییری کوڕی، کە شەپقە بە نەوارەکەی لە سەر کردبوو، بە هەردوو دەستی کۆمەڵێک ماچی هەوایی، ماچی دوعاخوازی بۆ دایکی فڕێکرد.

بەڵام پییر دەڕۆیی، لە چاو ون دەبوو، ئێستا بەرەبەرە بچووک دەبووەوە، وەکو پارچەیەکی بچووک بەسەر بینایەکی گەورەوە، مەحوو دەبووەوە. خات رولاند، هێشتا هەر هەوڵی دەدا کە بیبینێ، بیناسێتەوە، بەڵام ئەوەندە دوور کەوتبووەوە، کە فەرقی نەدەکرد.

جان دەستی گرت وگوتی:- بینیت؟

- بەڵێ، چەند کوڕێکی باشە!

بۆشـــار گەڕانەوە. رولانـــد بە دڵنیـــاییەکی پڕجۆشـــەوە گوتی:

– مخابن! زۆر بلەز ڕۆیی.

کەشتیەکە هەر تاو نا تاوێ شووتێکی لێدەدا، دەتگوت لە ئوقیانووســـەکەدا دەتـــوێتەوە. خـــات رولانـــد ئـــاوڕی لای کەشـــــتیەکەی دایەوەو کەوتە تەمەشـــــاکردنی، کە بەرەو خاکێکی نادیاری ئەوپەڕی دنیا دەڕۆیی وبەرە بەرە لە ئاسۆ ئـاوا دەبـوو. کـوڕەکەی، کـوڕە بەلەنگـازەکەی لەسـەر ئەم کەشتیە بوو، ئەم کەشتیەی کە هیچ شتێک نەیدەتوانی ڕای بگرێـت، و چیتـر نەی دەبینـی و لەهەتەری چـاوی دەرچـوو بـوو، کـوڕەکەی، پییـر لەگەڵ ئەم کەشـتیەدا دەڕۆیـی، وای هەسـت دەکـرد نیـوەی دڵـی لەگەڵ کوڕەکەیـدا ڕۆیـی، وای هەسـتکرد ژیانیشـی تەواو بـوو، وای هەسـتکرد کە هەرگیـز جـارێکی دی نـای بینێتەوە. مێردەکەی پرسـی:– مـادامێکی زووتر لە مانگێکی دەگەڕێتەوە بۆچی دەگریت.

بە دەمەلاڵکێوە گـوتی: – نـازانم، بـۆیە دەگـریم، چـونکە گەلەک کەسەردارم.

وەختـایەک گەیشـتنەوە سـەر وشـکانی بوسـیر یەکسـەر بەجێـی هێشـتن، تـا بـۆ نـانخواردن بـۆلای دۆسـتێکی خـۆی بـڕوات. جـان و خـاتوو روزمیلـی پـێش کەوتـن. رولانـد بە ژنەکەی گوت:– جانی کوڕمان، لە هەموو حاڵێکا هەر قۆز و جوانە.

خات رولاند گوتی:– وایە.

جا چونکە خـات رولاند لە ناخـا زۆر پەشـێو وپەرێشـان بوو، خۆیشی نەیدەزانی چ دەڵێت، لە سەری ڕۆیی وگوتی:– من زۆر خۆشحاڵم کە خاتوو روزمیلی دەخوازێت.

کابرای سائەقڵ، حەپەسا و، گوتی:- ها! ئا! چۆن؟ خاتوو روزمیلی دەخوازێت؟

- هەڵبەتە، بەتەمابووین ئەمرۆ پرس بە تۆش بکەین.
- سەیرە! دەمێکە ئەم تەگبیرەتان کردووە؟
- نەخێر! تەنیا چەند ڕۆژێکە. جان دەیویست جارێ بزانێ ئاخۆ خاتوو روزمیلی پێی ڕازی دەبێت، ئەوسا شیرەت وڕاوێژ بە تۆ بکات.

رولاند، هەر دوو دەستی هەڵگلۆفتن وگوتی:

- زۆرچاکە، زۆرچاکە، تەواو، من زۆر ڕازیم.

وەختایەک لە شۆستەی بەندەرەکە وەدەرکەوتن و گەیینە شەقامی فرانسوای یەکەم، ژنەکەی جارەکی دی ئاوڕی دایەوە، تا دوا چاو بە دەریا دوورە دەستەکەدا بگێڕێت، بەڵام جگە لە تەنکە دووکەڵێکی زۆر دوور، کە لە دووری دوورەوە لە تەنکە تەمێک دەچوو، هیچی دیکەی نەبینی.

**تێبینی**: لە ڕۆژی 2021/2/7 دا لە پاچڤەی ئەم ڕۆمانە بوومەوە کە لەم دەقەوە کراوە بە کوردی:

غی دو موباسان

پییر وجان/ روایة/ نزار أباظة، بول کواتلان/ دارطلاس للدراسات و الترجمة و النشر/ الطبعة الاولی/ 1989.

# فەرهەنگۆك

ئا

**ئەداو ئەتوار:** رەوشت و ئاكار

**ئارایشتكار :** ئارایشتگەر ، مكیاجكار

**ئەوك :** قورگ، گەروو، بەرمل

**ئاسیو :** ئازار، بەڵا ، زیان، زەرەر

**ئاشخانە :** مووبەق، چێشتخانە

**ئەنگو:** ئێوە، هەوە، هون

**ئەگەرنا:** دەنا، ئەگینا، ئەگین، گەرنا

**ئێژی :** دەڵێی

**ئەفسووناوی :** سیحراوی، جادوویی

**ئیكلام :** كڕنۆش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن

**ئامێز :** باوەش، هەمێز

**ئەزبەنی :** گەورەم، قوبان

**ئاران:** گەرمەسێر، گەرمیان، زستانەوار

**ئۆین:** پیلان، دەسیسە، فێڵ و مەكر

**ئۆینباز :** بەمەكرو فێڵباز، پیلانگێڕ

**ئێشك:** پاس، كێشك

**ئاكنجی:** نیشتەجێ

**ئالودە:**گیرۆدە، خووپێگرتوو

**ئاوەز:** هۆش، فام، ئەقڵ

**ئاشپەز:** شیوكەر، چێشت لێنەر، چێشتچی

**ئەنگێزە:** هۆ، هاندەر، سۆنگە

**ئەستەم:** زەحمەت، ئاسێ ، دژوار

**ئەسەح:** ئەكید، خویا، مەعلووم

**ئیرەیی:** حەسوودی

**ئەستێڵ:** حەوز

**ئیستەرەم:** دەمەوێ

**ئەستەڕ:** بەر، بەری کەواو...

**ئاپۆرا:** حەشامات، قەرەباڵغی، حەشیمەت

**ئاشووب:** پەشێوی و ئاژاوە

**ئەوزار:** ئامراز، ئامێر، وەسیلە

**ئاغەڵ:** جێی داکردنی مەڕو بزن لە دەمی سەرمادا

**ئەسکەمیل:** کورسی

**ئاوەز:** ئەقڵ

**ئاخێز:** نیوە هەستان

**ئەوقات:** پارێزەر

**ئۆل:** ئاین

**ئیسقایی:** نەخۆشی ئاوبەند

**ئیکۆنە:** شەمایل، وێنەو پەیکەری پیاوانی ئاینی ومەزەبی

**ئاریشە:** کێشە، گرفت

**ئاودڕکە:** ئاودڕ، ئەو شوێنەی ئاو دایدڕیبێ

**ئاڵچاخ و دەنی:** سووک و بێ ئابڕوو، خوێڕی

**ئاوردوو:** سوتەمەنی،شەواتەک،ئێزنگ وقەڵاشکەری

**ئاسین:** قۆڵەکراس، قۆڵەکەوا، سۆرانی

**ب:**

**باوەژن:** زڕدایک، هۆی دایک، باجی

**بیرازکردن:** دارکاری کرن

**بایەقوش:** کوند، کوندە پەپو، بوەکوێرە

**باب:** باوک

**باڵانما:** باڵانوێن، ئاوێنەی باڵاڕوان

**بەلەز:** خێرا، بەپەلە، گورج

**بایس** : هۆ، باعیس ، سەبەب

**بلوور:** شووشە

**بێنەوا:** هەژار، بێچارە، داماو

**بە تۆبزی:** بە زۆر، بە خورتی

**بە روحم** : بە بەزەیی ، دلۆڤان

**برنجە:** جۆرە کانزایەکە، زەردی سەماوەر(قصدیر)

**بەلەنگاز:** بێچارە،نەدار، بەسەزمان

**بەرۆک:** یاخە، یەخە

**بەکاوەخۆ:** بە هێواشی

**بەرسڤ:** وەڵام

**بەرک:** گیرفان، باخەڵ

**بالیفۆکە:** سەرینی بچووک، گۆشە

**بوری:** تێپەڕی

**بیلبتون:** بە تەواوەتی

**بەو ئاوایە:** بەو جۆرە، بەو شێوەیە

**باریە:** لۆسە

**بەستێن:** رۆخ، کەنار، گوێ چەم، دەم چەم

**بێشە:** دارستان، لێر

**بەرکۆشە:** بەرهەڵبێنە

**بن پیاڵە:** ژێر پیاڵە

**بۆرەقنە:** ئاماڵ بۆر، مەیلەو بۆر، بۆرباو

**بوێر** : ئازا، دلێر

**بێوەی:** بێ زیان، سەلامەت

**باڕ** : بێچووە مەلی بەهارە

**بێزوو:** بێزگ، مەگیرانی

**بێزگەوان:** بێزووکەر

**بەلانس**: هاوسەنگی

**بارتەقا**: باتەقا، هەنبەر، بەرانبەر

**باجەوان**: باجگر

**بەسوێ**: بە ژان، بە ئازار

**بەردەبار**: پیاوی زاناو بە تەگبیر

**بێدادی**: نەهەقی

**بەیتال**: پزیشکی ئاژەڵان

**بویەر**: ڕووداو

**باژێرۆک**: شارۆچکە

**باشار**: دەربردن، خۆراگرتن

**بەرایی**: پێشایی، بەراهی

**بەڵەد**: شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن

**بەفرە ژیلکە**: بەفری زۆر دەنک ورد

**بەلەک**: پووز

**بە خورتی** :بە تۆپزی

**بالیف**: سەرین، پشتی

**بەگەنکردن**: پەسندکردن

**باندۆر**: کاریگەریی

**بایس**: هۆ،باعیس، سۆنگە

**بەرخودان**: مقاوەمەت

**بارخانە**:کەلوپەلی بازرگانی، باری لەسەر یەک هەڵچنراو

**بەرجەوەن**: دیمەن

**بۆدڕ**: بۆنی توندی ماسی و تەگە

**بۆدراو**: برژاو، خاوەبرژ

**بەڵغ**: بەڵغ، کەڕوو

**باسریشک**: بەفرو باران پێکەوە

**پ:**

**پێشخزمەت:** نۆکەری بەردەستان

**پارک:** باخ

**پسمام** : کوڕە مام، ئامۆزا

**پواز:** سنگێکە لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا نەیەتەوە یەک

**پۆڕ:** باڵندەیەکی خۆش گۆشتە، لە مریشک گەورەترە

**پێشکار:** خزمەتکار

**پەیڤ** : وشە، وتە ، قسە

**پەز:** مەڕ، مێگەلە مەڕ و بزن

**پەری** : فریشتە

**پاژ:** بەش

**پرتەو:** تیشک ، روناکی

**پێکڤە:** پێکەوە, بە هەڤرا

**پڕ:** زۆر، تەژی

**پۆستین:** فەروە، کەوڵی تیسکن

**پەژمردە:** چەرمسی، ژاکاو

**پایدۆس:** دەست لە کار هەڵگرتن

**پۆلکە:** گاگۆز

**پەسیو:** پەسیڤ، هەلامەت

**پیتاک:** باربوو، کۆکردنەوەی دارایی

**پێل:** شەپۆل

**پەسلان:** قیامەت، ئەو دنیا

**پاتاوە:** پێڵاو، کاڵە.

**پاتۆق:** شوێنی کۆبووەوە

**پۆڕ:** قژ

**پێشداوەری:** حوکمی پێشوەختە

**پانکردنەوە:** ماستاوساردکردنەوە، ڕووپامایی

**پەشم:** قسەی قۆڕو بێ مانا
**پزیشکیار:** یاریدەدەری پزیشک
**پەتۆ:** بەتانی
**پووت:** ١٦کیلۆگرام
**پاڵدوو:** پاڵوو، کەژووی بن کلکی بارەبەر

**ت:**
**تەمەشاڤان:** بینەر، سەیرکەر
**تەماشاخانە:** شانۆ، نمایشسەرا
**تەژی:** پڕ، لیپاو لیپ، سەر ڕێژ
**تا:** لا، لایەن
**تێشت:** نانی بەیانی، قاوەڵتی، بەرقلیان، تاشتی
**تالووکە:** مەترسی، خەتەر
**تەبارە:** دەغڵی گەیشتووی نەدوراو، قایمە دەغڵ
**تەژەو ناقۆلا:** گەورەو ناشیرین
**تاین:** یارۆ، فلاَن، ناڤبری
**تاژی:** سەگی ڕاو، تانجی
**تەشقەڵە:** گەڕ، بیانووپێگرتن
**تەیرو تو:** باڵندەو مەلان
**تەوازۆ:** تەوازی، عوزرخوایی، داوای بوردن
**تخوب:** سنوور، کەوشەن، تخووم
**تەوێڵ:** ناوچەوان، هەنیە، ئەنی، توێڵ،جەمین
**تۆرینۆک:**تووڕەو دڵناسک
**تەختەبەن:** تەختە خەو
**تەقوو:** بەڵکوو ،هاتوو
**تاقەتکردن:** شاردنەوە، داکردن

**تۆلاز:** مێباز، چاو لەوەڕێن

**تیلمە:** تیلماسک

**تیلاگ:** لاسەر

**تاوەگاز:** تاوانگاز، بە هەتاو سووتاو

**تەڵفیزی:** تەڵفیسی، تەوس، گاڵتەو گەپ

**تەریدە** : ڕێگر ، چەتە

**توولەک:** وەرینی مووی لەش

**تۆسن:** سەرکێش، نا ڕام

**تەڤگەر:** نەسرەوت، بزووتنەوە

**تەمراندن:** کوژاندنەوە

**تاری** : تاریک

**تۆماکۆ** : تووتن

**تەشبریق** : هەورە تریشقە، بروسکە

**تووک:** نزای خراپ ، دوعای شەڕ

**تاخ:** گەڕەک

**تاس:** سەر ڕووتاوە، دەغسەر

**تەرز:** جۆر، نەوع

**تەخلیت:** نە ئەسڵ، تەقلید، کۆپی

**ج:**

**جەگەن:** گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەڵکاودا دەڕوێ

**جنگن:** شەڕانی، دڕ، نەگونجاو, جنگز

**جنگز:** شەڕانی، بەدفەڕ

**جەلۆ:** هەرزە پیاو، سەرسەری

**جندەخانە:** سۆزانی خانە، قەحپەخانە

**جەڕباندن:**تاقی کردنەوە، تەجرەبە کردن

**جورنە:** حەوزۆکەی گەرماو

**جما**: جولا، بزوا

**جڤاکی**: کۆمەڵایەتی

**جوابی کرد** : دەری کرد ، ئیزنی دا

**جمکانە** : دووانە، جمک، لفانە

**جەندەک**: تەرم

**جلە شینە**: قەوزەی سەر ئاو

**جانکوش**: مجێوری کڵێسا، خزمەتکاری کڵێسا.

**چ**:

**چەلەنگ**: چوست و چالاک، گورج و گۆڵ، شۆخ و شەنگ

**چینی**: جۆرێ سواڵەتی هەرەباشە، وەکو کاشی

**چتۆ**: چۆن، چلۆن، کوو

**چرین**: وتن ( بۆ گۆرانی و قام)

**چێل**: مانگا

**چەنگ**: ئامێرێکی موسیقایە، هارپ

**چەکمە**: جەزمە، پووت

**چەمەنزار**: مێرگ، مێرغوزار، سەوزەزار

**چما**: بۆچی، ئەڕا، لەبەرچی

**چقڵ**: درک، دڕو، دڕی

**چەرچی**: فرۆشیاری گەڕیدە، دەستفرۆش

**چوغورد**: چوغور، چغر، چڕ

**چمک**: سووچ، گۆشە

**چوارنکال**: هەرچوارلا

**چێبوو**: دروست بوو

**چەمووش**: سڵ، رەوەک، لەقەهاوێژو گازگر

**چەرموو**: سپی

**چەرچی**: دێوەرە،فرۆشیاری گەرۆک، دەستفرۆش

چاوساغ: دەسکێش، جاسووس، سیخوڕ

چەلیپا: خاچ، سەڵیب

چاوگ: دەستە چیە

ح:

حایرمان: سەرسام بوون

حەسار: حەوش

حەنەک: جەفەنگ،قسەی گاڵتەو گەپ

**حەشەری:** بەر بەتاو، ژنی بە ئاڵۆش

**حەژمەت:** مەینەت، خەفەت، کەسەر، داخ، خەم

حەجامات: خوێن بەردان

حەوجە : پێویست

**حەوێق:** بەرزایی ئاسمان

**حەسحەس:** پاسەوانی شەوی ناوشار، جەزایرچی

خ:

خەنی لە خۆتان: خۆشی لە خۆتان

خشکۆک: دەلال، جوانکیلە، جوان، قەشەنگ

**خەنەقاندن:** خنکاندن ، لە سێدارەدان

خوبزە: خولام، نۆکەر، خزمەتکار، خزمەتچی

**خورجین:** هەگبەی لە بەن، جانتای لە بەن، خورج

خا: خات، خاتوون، خانم ، یا

**خاپاندن:** فریودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن

خاپینۆک: فریبۆک، فێڵباز

**خانەدان:** نەجیمزادە، ئەسڵزادە

**خودان:** خێو، خاوەن، ساحێب

**خولک:** خولق

خۆرتی: بە تۆبزی، بە زۆری
خشت: ڕێک، بێ کەم و زیاد
**خاکی**: بێ هەوا، بێ فیز
خەرگە: پەڕۆی کۆن و پیس
خوابەختەکی: خۆو بەخت، بە هەڵکەوت
خەبتین: خەبات کردن
**خشکۆک**: جوان، خشیک
**خویا**: ئاشکرا، دیار ، ڕوون
خۆرانگاز: تاوە سووت، سووتاو لەبەر خۆر
**خەفیە** :جاسووس، خەوەرچین، هەواڵدز
خۆڵەکەوە: خۆڵەمێش
**خەمرە**: کوپەی زۆر گەورە
خەنۆل: خەندەران، دەم بە پێکەنین، ڕووخۆش
خزاگ:عەرەبانەیەک کە بەسەر بەفرا ڕایدەکێشن
**خەنەتیلکە**: قرێژە بەرد، قەوزەی سەر بەرد،خەنە تیفک
خوارۆخ: زۆرخۆر، پرخۆر
**خەپلە**: خڕخەپان، کوڵەبالای قەڵەو
خەلەک: ئەڵقە
خەرەنگەز: مۆزەشینە، مێشەکەرانە، مێشێکی سەوزی گەورەیە بە وڵاخی بەرزەوە دەدات



داماو: بێنەوا، بەلەنگاز، بێچارە
دەڤەر: ناوچە، ئاقار، شوێن، جێ
**دێرکەوتن**: دواکەوتن
دلپاقژ: دڵپاک، بێ فرو فێڵ، بێ گزی
**دەربار**: دیوەخان و بارەگای پاشا

دەهری : زۆر تورە
داگەڕان: هاتنە خوارەوە
دڵنەواز : دڵگیر، مایەی دڵخۆشی
**دلۆڤان:** بە بەزەیی، دڵنەرم، میرەبان
دیدەوانی: ئێشکگرتن ( بە تایبەتی ئێشکی سەر قەڵات و بورجان)
**داپیرە:** دایە گەورە، نەنک
**دەلیڤە:** دەرفەت ، هەل
درەخت: دار
دەربارییان: دەست وپێوەندانی دیوەخان و بارەگای پاشایەتی
**دڕوو:** دڕک، چقڵ، دڕی
دڵڕەش: بێ بەزەیی، ستەمکار، دڵرەق، ڕکوونی
**دامە:** مۆر
**دنگ:** دینگ، ئامرازی چەڵتووک کوتان
دەڵەکدان: پاڵنان
دڕدۆنگ: دوودڵ، بە گومان
**دوونیەتی:** خوێڕیەتی، بچووکی
**دەڵەچە:** مەرایی کەر، ماستاوچی
دۆنکی: داردەستی حەسحەسی ناو بازاڕ
دیرۆکنووس: مێژوو نووس
**دەرەڤی:** هەڵەهات، رایدەکرد
دەرۆزە: گەدایی، سواڵ
**داشۆ:** کاکە، براگەورە
**دەهری** : زۆر تورە
**دەخەبتن** : خەبات دەکەن
دۆغری : راست ، دروست
داغان : رووخان، وێرانکردن

**دەغوول:** دەسبڕ,خاپینۆک، فێڵباز، گزیکار

**دوئێل:** مبارەزە

**دۆتمام:** کیژەمام، ئامۆزا (بۆ کچ)

**دەسەنە:** بەخشین،

**دوڕ:** ناوەند، ناوەڕاست

**دێر،** درەنگ، جێگەی رەبەنانی فەڵە

**دەست قلپ:** ماڵ بەفیڕۆدەر

**دەستە خوشک:** دۆستی خۆشەویستی ژن بۆ ژن

**دارکرۆک:** دارکوتکە، دارکونکەرە

**دەرەک:** پۆلیسی دەرێی شار

**ڕ:**

**رەقسین:** سەما، هەڵپەڕین

**ڕنەک:** قەشەو

**ڕدێن:** ریش

**روندک:** فرمێسک، رونتک، ئەسر، ئەسرین

**رۆحانی:** پیاوی ئاینی

**راز:** نهێنی

**ڕەژوو:** زوخاڵ ، خەڵوز

**ڕک :** کووڕ، ڕژد

**رابوون:** هەستان

**ڕازان:** ڕاکشان، پاڵکەوتن، خەوتن، نووستن

**ڕۆخانە:** روبار، چۆم، چێم، ڕوو

**ڕند:** جوان، خوشیک، خوشکۆک

**رمبوودە:** ئالوودە، هۆگر

**رادەست:** خۆ بە دەستەوەدان.

**رەند:** مێرخاس، مەرد، پیاوانە

ڕەقیب: نەیار، خەنیم
ریسک: مغامەرە
ریوەڵە: بچکۆلەی لاواز، بێ نموود
ڕۆنیشت: دانیشت
ڕووپامایی: مەرایی، دەڵەچەیی، بن ریشەیی
راموسان: ماچ
ڕەهەنە: ڕەهەندە، عەودال , ئاوارە، چۆڵگەڕ
ڕەبەن: سەڵت، زوگورت، راهب
ڕەبەنیتە: راهبە، ژنە فەڵەی تەرکە دنیا، ڕەبەنی ژن
ڕاوگە: جێگەی ڕاو وشکار
ڕێڤینگ: ڕێبوار، ڕێوی

ز:
زڕکیژ: کچی مێرد بۆ باوەژن، یان کچی ژن بۆ باوەپیارە
زێدە: زیادە
زەلام: گەورە، ناقۆلاو تەژە
زار: دەم، دەو
زوڕییەت: وەچەو نەوەو نەتیرە
زێد: زاگە
زاگە: زێد، شوێنی لە دایکبوون، مەفتەن
زوخاڵ: ڕەژوو، خەڵووز
زگرەش: ڕکوونی، بوغزن، کینە لە دڵ
زەوجین: زەماوەند
زڤرینەوە: گەڕانەوە
زەیسان: زەیستان، ژنی تازە زاو
زەیەوان: زێوان، نیگابانی گۆڕ و گۆڕستان
زرانی: ئەژنۆ
زارۆک : بچیکان ، منداڵان

**زەردەکەن**: بزە، زەردەخەنە

زەروو: زالو

زیانۆک: بە زیان، زەرەردەر، زیاندەر

**زگورد**: زگورت، ڕەبەن، پیاوێک ژنی نەهێنابێ

**ژ:**

ژیوان: پەشیمان

ژارخەن: پێکەنینی ژەهراوی

**ژارۆ**: داماو، فەقیر، بەسەزمان

ژنەوتن: بیستن، ژنەفتن

**س:**

سەرزەنشت: سەرکۆنە، لۆمە

**سەڵت**: ڕەبەن، بێ ژن و منداڵ، عازەب

سەندەڵ: قاپقاپ، تەقتەقیلە

سپلە: پێنەزان، بێ ئەمەک، بێ وەفا، نمەک حەرام

**سۆز**: پەیمان، بەڵێن

**ستران**: گۆرانی، قام, لاوک، لاوژە، کلام

ستێران: ئەستێرە، ئەستێران

سپێدە: بەرەبەیان

**سەوزەزار**: مێرگ، مێرگوزار، چەمەنزار

**سەمت**: لا, ئالی، ڕەخ

سەربوردە: بەسەرهات، سەرگوزەشتە، سەربهورد

سەرگوروشتە: سەربوردە،

**سخێف**: جنێو

سەختگیر:توند و بەزەبت و رەبت

سیوات: خوێنەواری

**سائەقل**: شێتۆکە

**سەربۆز:** سەر ماش و برنج
**سیاناو:** قوڕاو
**سێوی:** هەتیوو، منداڵی بێ داک و باب
**سیکتر:** دەرکردن، ترۆکردن
**سونگی:** قەمە
**سەهەندە:** بزۆز، نەسرەوت، زرینگ، ئاژاوەچی
**سێبەندی:** بێ شەرم و حەیا،
**سابرێن:** نێری، تەگە
**سەرۆ:** ئیلهام، سرووش
**سازڤان:** مۆزیکوان
**سەرناڤ:** ناونیشان
**ستان:** شار، پارێزگا
**ستاندار:** پارێزگار،متەسەڕیف
**ساردخانە:** مەیتخانە
**سۆل:** پێڵاوی سووکەڵەی بێ پانییە ،نەعل
**سەردولکە:** گۆرانی هەڵگوتن بە مردوودا
**ساڤالۆک:** منداڵی تازەزاوی جوانکیلە
**سەلبەند:** رێگەی بە بەرد فەرشکراو
**سیسەم:** تەختە خەو، تەختە بەن
**سوێ:** ئازار، ژان
**سیخار:** زوقم
**ساقەتە:** لاسکی گیا
**سوتلی:** قەپاتمە، ژنی بێ مارەیی بۆ ڕابواردن
**سەدەم:** هۆ، سۆنگە

**ش:**

**شرندە:** ژنی دەمدرێژی شەڕانی بێحەیا
**شرپۆش:** شرۆڵە، بێ بەرگ و بار

شەپیور: بۆقی، کەڕەنا
شام: شیو، شیڤ، خواردنی ئێواران
شکەفت: ئەشکەوت
شکەستەنی: ناسک، شتێ زوو بشکێ
شتاقیان، هیچیان، کەسیان
شنگ: هێز, تاقەت, توانا
شەقاو: هەنگاو
شلینگ: پارەیەکە
شاپ: شەق
شەکەت: ماندوو, هیلاک
شوورە: دیوار
شەربار: پڕشەڕ، شەڕانی
شەنگوڵ: بە دەماخ, کەیف خۆش
شەبەیخوون: پەلامارو هێرشی شەوانە
شەلاق: شەلاخ، قامچی
شەم: مۆم، شەمالک
شەمدان: مۆمدان، شەمان، جێگەی مۆم
شۆڤار:زمان شڕ، نێوان تێکدەر، جاسووس
شوو: مێرد ، هاوسەری ژن
شەکەت: ماندوو. هیلاک
شاشک: مێزەر، پێچی مێزەر، شاشیک
شیرەت: راوێژ، ئامۆژگاری
شیرەتکار: راوێژکار
شادەتنامە: کارنامەی خوێندن
شۆخی : سوعبەت ، گاڵتە
شیڤ: شێو، شام، نانی شێوان، نانی ئێوارە
شێلەو بێلە: فێڵ و تەڵەکە

**شەواک:** گەمژە، گێلۆکە

**شەمایل:** وێنەی گەورە پیاوانی ئاینی ومەزەبی، ئیکۆنە

**شیان:** توانین

**شەوەکی:** بەرەبەیان، شەبەقی

**شیبا:** نەرمە بای شەوانە

**شەوات:** ئاگر بەربوونەوە

ع:

عاسا: دار عاسا، داردەست

عەیار: زیتەڵ، زۆرزان

عەبەنووس: دارێکی رەش و رەق و بەنرخە

عەیان: دیار، ئاشکرا، لەبەرچاو

عەگید: ئازا، پاڵەوان، جامێر

غ:

غاڕ: ئەشکەوت

غوڕابی خەو: شیرنە خەو، خەوی قورس

**غەوارە:** غەریبە، بێگانە

**ف:**

فەرمایشت: فەرموودە، قسە

فەرخە: بێچوە مەل و جانەوەران

**فشقیات:** حەنەک، گاڵتەوگەپ، ئاخافتنی بێ تام

فراڤین: نیوەرۆژە، خواردنی نێوەرۆ

**فەرسەخ:** فەرسەق

فڕناخ: لووت بەرز، بە دەعیە، روحزل

**فاما:** فامیدە، تێگەیشتوو، زیرەک

**ڤالا**: بەتاڵ، خاڵی، پووک، ئاواڵە، کراوە

**فەڕەنگی**: ئەوروپایی

**ڤەمراندن**: کوژاندنەوەی ئاگر، تەمراندن

**ق:**

**قالیچە**: مافووری بچووک

**قرمز**: سوور

**قەڕاڵ**: پاشا

**قەڕاڵنشین**: پاشانشین، ئیمپراتوریەت

**قورباقە**: بۆق

**قاوەڵتی**: تاشتی، بەرقلیان، نانی بەیانی، تێشت، قاوەتوون

**قووچانی**: هەڵهات

**قشتیلە**: بچووکی جوانکیلە

**قالۆر**: قاوغ

**قاپ**: قاچ

**قاوغ**: قەپێلک، قاپۆرە

**قوشقی**: تووڕە، وەڕەز، سڵ ، ڕەوەک

**قەرقەشە**: تەشقەڵە، شەڕو ناخۆشی

**قۆپی**: زەلکاوی قامیشەڵان

**قەڵەمرەو**: سنوور و کەوشەنی ژێر دەسەڵاتی کەسێک یان دەوڵەتێک

**قوو**: باڵندەیەکە لە قاز سپی ترو زلترە

**قەلایی**:کانزایەکی سپی نەرمە مسی پێ سپی دەکەنەوە

**قژاوڵە**: تاق تاقکەرە

**قاوش**: هۆڵ، شوێنی نووستنی بە کۆمەڵ

**قەساس**: سزا، تۆڵە

**قەرەبەخت**: بەخت ڕەش، بەدبەخت، نەگبەت

**قامک**: پەنجە، ئەنگوست، پل، کلک

**قامبێژ**: گۆرانی بێژ

**قەساو**: قەساب

**قەلەزراو**: ترسنۆک

**قەتاندن**: بەسەربردن، گوزەراندن، بەڕێکرن

**قاقڕ**:زەوی رووتەن کە گیای لێ نەڕوێ

**قومات**:بابۆڵەی ساوا تێوە پێچان

**قاشوانێ**: گۆبازی، قاشوان

**قەپاتمە**: سۆیتەلی، ژنی بێ مارەیی بۆ رابواردن

**قەموور**: کووڕ، پشت کۆم

**قەستە سەر**: دوژمنی زۆر سەرسەخت، خەتەر

**قەبە** : گەورە

**قۆشەن**: لەشکر

**قرێر**: بڕیار، قەرار

**قەوماو**: بویەر، رووداو

**قاوەتوون**: تاشت, تێشت, قاوەڵتی، نانی بەیانی

**قیڕات**: گەرماپێو

**قەڵبەزەن**: تەزویرچی پارە

**قرێژە بەرد**: خەنە تیلکە،وردە شینایی پێکەوە نووساوی سەر بەردان

**ك**:

**کوت ومت**: ەقاودەق

**کوانگە**: کوانوو، ئاگردان

**کارمامز**: بەچکە ئاسک

**کودەڵە**: بێچووە بەراز

**کوختە**: کۆخ, خانووی چکۆلەو خراپ

**کوڵکە**: موو، توک

**کولۆ**: کوللە

**کەچرەوی:** لە ڕێ لادان، تەحریفیەت
**کەوەیی:** شینکی، شینباو، خۆڵەمێشی
کێوە: بۆ کوێ
کەپەک: سۆس
**کۆمەک:** یارمەتی، هاریکاری
**کلۆر:** ناوبەتاڵ
کوریژگە: کوڕی بچووک
کەپوو: لووت، دفن
**کەونارا:** زۆرکۆن، شوێنەوار
کەسک: سەوز
کۆمیدی: پێکەنیناوی
**کامکردن:** نەوس تکان
کەزی: پرچ، زلف
کڵاوخود: کڵاوی ئاسنینی شەڕڤان
کڵاوقژ: پۆڕی دەسکرد
کەرب: رق و کینە
کان: مەعدەن
**کێوستان:** کۆسار, کۆجاڕ
کۆڵۆنی: موهاجیرنشین، نشیمەن، موستەعمەرە
کەمدوو: کەم قسە
**کۆسار:** کۆجاڕ، کێوستان
**کەوی:** ماڵی، دەستەمۆ
کەڤر: بەرد
کەڤرۆک: بەردەڵان
کەندەکار: کەسێک کە لە دار نەخش دەکەنێ
کێشکچی: پاسەوان، نیگابان
کۆ : سڵ، سڵکردنەوە

کەپوو : لووت، دفن

کارگە : وەرشە

کەرپووچ : خشتی سوورەوەکراو

کوند: بوەکوێرە، کوندە پەپوو، بایەقوش

کەودەن: گەوج

کاژستان: بێشەی دارکاژان

کرێت: ناشیرین، کاری خراپ

**کەتواری**: ریالیستی، واقیعی

کەوشەن : مەرز، سنوور ، ئاقار، تخووب

کنوکۆ : چوونە بنج و بناوان ، تۆژینەوە

کسۆک: سەگ

کەستەک:سندە گڵ، کلۆ قوڕی وشکەوە بوو

کۆشیار: چالاک، پڕکۆشش

**کینەکێش**: ڕک هەڵگر، ڕکونی

کەت: تەختەخەو

کەرەمکە: بفەرموو

کەوە ڕۆژ: ڕۆژی بێ هەتاو، سپییە ڕۆژ

کۆما: کۆمەڵێک

کەڵەباب: کەڵەشێر، دیکل

کسۆک: سەگ، توتکە سەگ

کۆلاشدم: دووپشک

**گ:**

گۆساخ: چاوقایم، رووقایم

گەدا: پارسەک، سواڵکەر، دەرۆزەکەر

گورزە: باقەی گەورە

گەرەکمە: دەمەۆ ، دەخوازم

گەمە: یاری، وازی، کایە

گەنج: زێرو زیو، ماڵی دنیا
گەردنبەند: ملوانکە
گازکردن: بانگکردن
گۆرین: یارۆ، ناشبری
گوند: دێ، ئاوایی
گومناو: ناوبزر، نەناسراو
گۆزینگ : قولەپێ
گەڵۆز: ناولینگ
گول: گەڕ و گول
گاگۆز: پۆڵکە
گارد: پاسەوانی تایبەت
گۆنگ : ئاڵۆز
گەنگەشە: موناقەشە
گووراو : مەخلووق
گووفەک: زبڵدان، سەرانگوێلک
گازی: بانگکردن
گڕۆز: ورکن
گڵکۆ: گۆڕ، ئارامگە
گمێز: پێشاو
گاڵدان، دنەدان
گازن: گلەیی، گازاندە
ل:
لە کەیفان: لە خۆشیان
لە بیلادەوە: لە ئیجادەوە، لە بنەرەتەوە
لیرەوار: دارستان، جەنگەڵ، بێشەڵان
لاپرەسەن: فزوڵ، فزوڵی
لۆسە: باری
لەزگ بوو: خەریک بوو، وەخت بوو

لێ: بەڵام

لێبڕا: بڕیاری دا

لۆسە: باریە

لاق: قاچ، لنگ

لەزکرن: خێراکردن، پەلەکردن

لایدە: بێگانە

لەهەنبەر: بەرانبەر

لێ : بەڵام

لەیستۆک : بووکەشووشە، بووکەڵە

لەگەز : مەتەڵ

لەش بەبار: نەخۆش

لەگین:رەنگە، لەوەیە

لەوتاوە : پیس بووە

لەز : خێرا ،پەلە

لەبڕ : یەکسەری، بەقۆنتەرات

لاشەڕ : بێوەی، سەلامەت ، دوورە شەڕ

لاکەوە: لاچۆ ، برۆ کەنار

لە نک: لە کن، لە جەم، لە دەف، لەلا

لەگام: چەورە، زگ لەوەڕێن

لێژگە: لێژایی، نشێو

لالۆ: برای دایک، خاڵە، خاڵۆ

لەیزتۆک: ئامێری گەمە

م:

موغازە: فرۆشگە، دوکان

مێریڤان: دلۆڤان، میهرەبان

مشوور: تەگبیر، بەخەم کردن

مژوول: سەرقاڵ, سەرگەرم

مڵ وموش: مڵومۆ، گەران و بۆنکردنی زەمین بۆ پەیداکردنی خواردن
مۆڵ: زۆر، فرە، زەحف
مژمژە: مەساسە
میرغەزەب: جەلاد
مەزرا: کێڵگە
مقاش: ماشە
مەگیرانی: بێزوو
مەرزو بۆ: وڵات، نیشتمان
مقەوا: کارتۆن
مەنهۆڵ: زێراب
مەزڵ: قۆناغ، جێی مەبەست
میرەبان : دلۆڤان ، میهرەبان
ماڵبات: خانەوادە ، بنەماڵە
مدارا :سەبرو حەوسەڵە , دڵڕاگرتنی دۆست و ئەحباب
مووبەق : ئاشخانە
موغەیری: موغاری، بوغاری، کوانووی نێو دیوار
منجڕ :نەژنەو ،سوور لەسەر شتێک
مسکێن : رەعییەت، بەرحوکمی ئاغا
مەعلان : پسپۆڕ ، لێزان
مخابن: بە داخەوە
مراک : کەوچک ، کەچک
مینا، میناک: وەک، وەکو
مەخفەر: پۆلیسخانە، قەرەوڵخانە
مادونی: مۆڵەت، ئیجازە
مەرگی مفاجا: سەکتەی دڵ
مەحزەر: نووسینگەی مارەو تەڵاقان
مەژی : مێشک

مامۆژن: ئامۆژن، ژن مام
مراک: کەوچک، کەچک
مافور: قالی
مەتەرێز: مەتەرێس، سەنگەر
مامێر: ڕەبەنیتەی بەتەمەن
ماسێر: ڕەبەنیتەی گەنج
متوو: هۆگر
مرداو: قۆپی
مەکرۆ: مەکرباز، فێڵباز
ماڵنج: ماڵە

ن:
نەزاکەت: ئەدەب، سەلاری
نیگابان: پاسەوان
نەیجەزار: قامیشەڵان
نسیبەت: بەڵا، موسیبەت
نەترە: ورە
ناچیز: هیچ، زۆر کەم
نەژاد: ڕەگەز، ڕەچەڵەک، ئەسڵ
ناحەز: ناشیرین
نێچیرڤان : ڕاوچی
نشیمەن: بارەگا ، شوێنی دانیشتن
نەزاکەت : لوتف و ئەدەب
نک : کن ،لا، جەم ، دەف
ناڤبری : ناوبراو
نەژنەو :نەبیست، منجڕ
نووچە :هەواڵ، خەبەر

نمەد : لباد، نیوداشت: نە کۆن و نەتازە
نها : ئێستا، هەنووکە، نهوو
ناڤسال : میانە سال
نووکە : هەنووکە ، نهو، نها، ئیستا
نەخاسما: بە تایبەتی
نوخان: ناخون، نینۆک
نەسرانی: فەڵە، مەسیحی
ناباب: ناباو، دژەباو، ناپەسند لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە

و:
وەمێنی:بمێنێتەوە
وەکرد: کردەوە
وەشێرت: شاردەوە
وێنا: تەسەور
وار: هەوار، شوێن، مەڵبەن
واز : کراوە، پێچەوانەی داخراو
وێدەدەم: دەدەمێ
وەقف کردن : تەرخان کردن
وەردەوەدان : لە جارێ پتر کێڵان
وەردیان : زیندانەوان
وەشانخانە: بڵاوەخانە، دارالنشر
وەشانکار: بڵاوکەرەوە، ناشر
وڕاوە: وڕێنە
ودم:مومبارەکی، پیرزی
وشکەبار:میوەی وشکەوەکراو
وەکوژاندن : تەمراندن، کوژاندنەوە
وێمدە : بمدەیە

**واز:** ئیشتیاو ئارەزووی خواردن

**وەزەن:** ئازار

وشترالوک:حوشتر خۆرە، عاگول

**وازوازی:** دەمدەمی مجێز

**ه:**

هانکە هانک: هەناسە برکێ

**هەژگ:** لکەداری وشکەوە بوو، چرۆچیلکەی ئاوردوو

هەرۆکیف: هەرەشەو گورەشە

**هەڵدێر:** جێگەی زۆر بەرزو قیت لە شاخ و کێودا

**هەزاربەهەزار:** شاخی زۆر بەرزو عاسی

**هەڵزنان:** هەڵگەڕان بۆ سەرەوە

هایم: سەرگەردان، وێڵ

**هەنبەر:** بەرانبەر

**هەترەش:** زەندەق، زراو

هەنووکە: ئیستا، نها، نهوو

هۆشن: بەهۆش

**هەتەر:** مەودای حوکمی چاو

**هۆڤی:** کێوی، وەحشی

**هۆدە:** ژوور، ئۆتاغ، دیوو

**هزرو** هزرین : بیرو بیرکردنەوە

**هەیف** : مانگ

هەیڤەشەو: مانگە شەو

هەدا : سەبر ، حەوسەڵە

**هەراوزەنا** : هەراو هەنگامە

**هەڕەمە** : تێکەڵ و پێکەڵ، گەنم ودانەوێڵەی تێکەڵکراو

هاپۆ : مام

**هەڵەشە** :لەسەر، بێ ئەقڵ

**هەرەت** : تاف

**هەتوان** : مەرهەم ، مەڵحەم

**هەڤرک** : ملەکەر، ململانێ, ڕکبەڕکێ

**هەڕوو** : هەرە ، بڕۆ

**هەنگێ** : هەینێ ، ئەوسا

**هەشتاو** : پەلە ، لەز، خێرا

**هاوکوف**:دوو کەسی لە یەک ئاستی کۆمەڵایەتی

**هاودەستی**:هاوبەش لە کەین و بەینان

**هەیڤۆک**: هەیڤک، مانگیلە، مانگی یەک شەوە

**هێورین**: حەوانەوە

**هاماج**: ئۆتمۆسفیر

**هەڵاوێردن**: جیاکرنەوە

**هاتە** وەشاندن ، بڵاوکرایەوە

**هزرڤان**: بیرمەند، زانا

**هەنیە**: تەوێڵ، ناوچەوان

**هەلاکەت**: گیانەڵڵا، ئاویلکە، ئاوزینگ، حاڵی مردن

**هەڵاژیان**: ڕاکشان

**هاژۆتن**: لێخوڕین

**هەڵماساو**: ئاوساو

**ی**:

**یاڵ**: تووکی سەر ملی شێرو یەکسم

**یەکهاوی**: یەکجۆر، یەکدەست، بێگۆڕان

**یارۆ** : فلان

**یاتاخ** : پێخەف , نوێن

**یەختە**: خەسێنراو، گون دەرهێنراو

**یونیفۆرم**: جلکی فەرمی یەکچەشن

بیل ئامی ( دۆستی ئازیز ) تەنیا سەربردەی گەنجێکی قۆزی مێباز نییە کە لە پێناوی سەروەت وسامان و پۆست و پایەدا کۆ لە هیچ ناکاتەوەو لە هیچ فێڵ ودەهۆ و تەڵەکەبازییەک ناسڵەمێتەوە، بەڵکو کارەساتێکی بەئازار و پڕ سوێی کۆمەڵگەیەکە کە لە ڕەگ و ڕیشەوە گەندەڵ و کرمۆڵ بووە، کە هیچ پرەنسیپ و بەهایەکی تیا نەماوەو گەندەڵی وگومڕایی وکەچڕەوی، جێگای هەموو بەهایەکی دی گرتووەتەوەو، کۆمەڵگەیەک سەرباری ئەوەی ئەزموونی چەندین شۆڕشی پێشەنگ وڕۆشنبیرانەی هەیە، هێشتا لە زەلکاو وچڵکاوی دەورانی پێش شۆڕشی مەزنا، دەورانی لویسەکانا، دەورانی سۆزانیانی دەرباری ودەورانی هەڵپەو بەرژەوەندخوازی هۆڤیانەی ئەشراف وئەرستۆکراتاندا، لنگە فرتێ دەکات. جا مۆپاسان وەکو فلوبیری مامۆستای لە قاودەری ئەم کۆمەڵگەیەیە.

# بەشی یەکەم

## ( ١ )

جۆرج دوروا ( Georges Duroy ) وەختایەک باقی ئەو پێنج فرانکیەی کە دابووی بە دەغیلەدارەکە وەرگرتەوە، لە خوارنگەکە وەدەرکەوت.

چونکە کوڕێکی خۆش بەژن و بالآ بوو و ، بە عادەتی سەردەمانی عەسکەری خۆی سینگی دەرپەڕاند، سکی بەناوا برد، بە جوولەیەکی عەسکەریانە وخۆمانی بایەکی بە سمێڵەکانی دا و نیگایەکی لەزگینی چواردەوری خوارنگەکە وئەو مشتەریانەی کرد کە هێشتا شێوەکەیان تەواو نەکردبوو، نیگایەکی تیژ، وەکو نیگای هەڵۆیەک کە هیچ شتێک وهیچ شوێنێک نەبوێرێت.

ژنەکان سەریان هەڵێنا وچاویان بڕییە ئەو، سێ کناچەی کرێکار، سازڤانێکی ناڤساڵ، شڕۆڵە، سەر وقژ پەشێواو، بە کلاوێکی تەپوتۆزاوی وکراسێکی دەڵبی لەبەردا بوو و ، دوو ژنی بورژوا دەگەڵ شووەکانیان، کە لە مشتەریانی هەمیشەیی ئەم خوارنگەیە بوون، بەبوها و نرخی جێگیر وهەرزان.

جۆرج دوروا، کاتێ گەییە سەر شۆستەکە هەڵوێستەیەکی کرد و لە خۆی پرسی باقی شەوەکە چۆن بەسەر بەرێت. ڕۆژی ٦/٢٨ بوو، تەنیا سێ فرانک وچل سێنتی پێ بوو کە دەبوایە تا سەری مانگ بەشی بکات. بە حیسابی خۆی دەیتوانی تا کۆتایی مانگ شام بە بێ فراڤین،

یان دوو کەڕەت فراڤین بەبێ شام بخوات. لە دڵی خۆیدا حیسابی کرد کە پارەی هەر ژەمە فراڤینێک بیست و دوو سووەو و پارەی هەر ژەمە شامێک سی سووە، ئەگەر تەنیا دوو ژەم فراڤین بخوات، ئەوا یەک فرانک و بیست سێنتی بۆ دەمێنێتەوە. ( سوو: دراوێکی بچووکی فەرەنسیە کە لە ساڵی ١٧٩٣ هەر بیست سوویەک دەیکردە یەک فرانک و هەر سوویەک دەیکردە پێنج سێنت) ، و دەتوانێ بەو پارەیە دوو بابۆڵەی کالْباس و دوو پەرداخ بیرەی بولڤارەکان بکڕێت. ئەمانە کار و لەزەتی شەوانەی بوون، ئەوسا بە کوچەی نوتردام دولورتدا نشێو بووەوە.

هەمیشە بەجۆرێ ڕێی دەکرد، دەتگوت هێشتا جل وبەرگی فەرمی عەسکەری سوارەی لە بەردایە، سینگی دەردەپەڕاند، لاقی کەمێک لێکدی بڵاودەکردنەوە لە تۆوایە تازە لە ئەسپ دابەزیوە، بەکش وفش وفیزەوە بەجادە و کۆڵانە جەنجاڵ و قەرەباڵغەکاندا ڕێی دەکرد، شانی لەم و لەو دەدا، دڕی بە خەڵکانی سەر ڕێگای خۆی دەدا، تا کەس ڕێگا لە ڕێکردنەکەی نەگرێت، کڵاو قووچە کۆنەکەی، دەنایە لاتیلاکەی سەری و پاژنەکانی بە توندی دەکێشان بە شۆستەکەدا. بەجۆرێ ڕێی دەکرد، دەتگوت شەڕی دەگەڵ هەموو کەسێکدا هەیە؛ دەگەڵ ڕێبوارلندا، دەگەڵ ماڵەکاندا، دەگەڵ هەموو شارا، بە پۆزی سەربازێکی خۆش قیافەوە کە تازە جلکی ئەهلی لەبەر کردبوو.

هەرچەندە جاکەت و پانتۆڵەکەی لە شەست فرانک زیاتری نەدەهێنا، بەڵام وێڕای ئەوەش، زۆر جوان بوو و بەڕاستی لێی دەهات. باڵای بەرز، ئەندامی ڕێک وپێک، قژی قاوەییەکی کاڵ، خەنەیی دەینواند، سمێڵەکانی بۆ سەرەوە

بادابوو، چاوەکانی شینی کاڵ، بیلبیلەکانی بچووک، قژی لوولێکی ئاسایی بوو، لە ناوەندی سەرییەوە، شەق بووبوو، بەو ڕواڵەتانەوە، لە قارەمانانی خۆشەویستی ناو ڕۆمانانی فۆلکلۆری دەچوو.

شەوێکی هاوینی پاریس بوو، لەو شەوانە بوو کە بەشەر هەناسەی تەنگ دەبوو، شار وەکو گوڵخانەیەکی گەورە لەم شەوە خەفەکەرەدا ئارەقەی دەڕشت، زێرابەکان بۆن بۆگەنیان لێ بەرز دەبووەوە، چێشتخانە ژێر زەمینییەکان، لە پەنجەرە بچووکەکانیانەوە، کە هاوئاستی ڕێگاوبانەکان بوون، بۆنی ناخۆشی چڵکاوی شۆردنی ئامانان و پاشماوەی ساس و خواردنیان، لێ بەرز دەبووەوە و بە جادە وکۆڵانەکاندا بڵاو دەبووەوە.

نیگابان وپاسەوانانی ئەپارتمان و ماڵان، بەبێ چاکەت لە سەر کورسییە حەسیرییەکانیان، لەبەر دەرگای گالیسکە ڕەوەکاندا دانیشتبوون و پایپیان دەکێشا، ڕێبواران بەهەنگاوی ماندوو، سەرکوت وکڵاو بەدەست، ڕێیان دەکرد.

کاتێ جۆرج دوروا، جادەکەی تەی کرد و گەییە بولڤارەکە، دیسان وەستا. تیا مابوو کێوە بچێت. حەزیدەکرد بڕوات بو شانزەلیزەو پاشان بۆ شەقامی " بوادوبولونی " تا لە ژێر درەختەکاندا کەمێک هەوای فێنک، بەر سەر وڕووی بکەوێ و فێنک ببێتەوە. هەروەها ئارەزووی دەکرد، ماجەرا و بویەرێکی عاشقانەی لێهەڵکەوێ.

بەڵام چۆن بویەر و ماجەرایەک؟ خۆیشی نەیدەزانی، سێ دانە مانگ بوو، شەو و ڕۆژ بەتەمای ئەو بویەرە بوو. هەڵبەتە ناوبەناو لەسایەی قۆزی و جوانی سەر وسیما و لەش و لار و قەلافەتی ڕێک وپێکی، لێرە ولەوێ عەشق و

ڕابواردنێکی ڕەوتەنی تێژتێپەڕی بەنەسیب دەبوو، بەڵام ئەو دڵی بەمە دانەدەکەوت و چاوەڕوانی شتی باشتر و زیاتر لەمانەی دەکرد.

بە گیرفانی بەتاڵ وخوێنی هاتکە جۆشەوە، کاتێ تووشی کیژان دەبوو، بەجارێ گڕی دەگرت. کیژان کەبەلایدا دەبوورین، لەبن لێوانەوە دەیانگوت: " دەگەڵ منا دێیەماڵەوە کوڕی قۆز؟ " بەڵام جۆرج زاتی نەدەکرد وەڵامیان بداتەوە، چونکە لەلایەکەوە، لات پاڵەوانی خوا بوو و لەلایەکی دیکەوە شتێکی جیاواز لەم ڕامووسان و عەشقبازیە بازاڕیەی دەویست.

وێڕای ئەمەش، حەزیدەکرد، سەری ئەو شوێنانەش بدات کە ئەم جۆرە کچانە، بەکۆمەڵ ڕوویان تێدەکرد، دەچووە هۆڵێن نمایشێن کۆمیدی عەوام پەسند، سەری ئەو کافی وکوچانەی دەدا کە مەکۆ و پاتوقی ئەوجۆرە کیژانە بوو، حەزیدەکرد لەلایانەوە بوەستێ، بەشێوەیەکی خۆمانی بیاندوێنێت، بۆنی عەترە تیژەکانیان بکات، هەست بە نزیکی وان بکات. هەرنەبێ ژن بوون و ئامادەی عەشقبازی بوون. هەڵبەتە بەهیچ جۆرێ، بەشێوازی پیاوانی خودان ژن و منداڵ یان بە حەقارەتی غەریزییەوە، ئەو کیژانەی بەسووک نەدەژمارد.

بەدوای ئاپۆڕای خەڵکە ماندوو و پەرێشانەکەی گەرمادا، پێچی کردەوەو خۆی بە بولڤاری مادلندا کرد. کافە گەورەکان، مێز وکورسییەکانیان، لە سەر شۆستەکە ڕیز کردبوون وپڕبوون لەو مشتەرییانەی کە لە ژێر ڕوناکی توندی گڵۆپەکاندا کە چاوی بە ڕێشکەوپێشکە دەخست، مژوولی خواردنەوەی ساردی سارد بوون.

سەر مێزە خڕ یان چوارگۆشەکانی بەرانبەریان، پڕبوون لە پەرداخێن تەژی ڤەخارنێ سوور، زەرد، کەسک و قاوەیی. سوراحی و شەربەی پڕ لە سەهۆڵ و ئاوی ساردیان لە بەردەما بوو.

دوروا، هەنگاوەکانی سووک کرد، گەرووی وشک و نووساوی، ئارەزووی ڤەخارن و ساردی دەکرد.

تینویەتی، تینویەتی شەوانی هاوین، ئەمانی لەبەر بڕی بوو، زۆری بۆهێنابوو، بیری لەوە دەکردەوە، کە نووشین و خواردنەوەی نۆشابە و ڤەخارنێکی فێنک، چ لەزەتێکی خۆش بە زار وگەروو دەبەخشێت. بەڵام ئەگەر تەنیا دوو پێک بیرەی بخواردباوە، ئەوا دەبوایە دەستبەرداری شامی سبەی ئێوارە ببوایە، بەخۆی ئاشنای برسیەتی کۆتایی مانگان بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: " ئەگەر دە سەعاتێک هەڵبکەم و خۆم بگرم، ئەوا دەتوانم بیرەکەم، سبەینێ لە کافەی ئەمریکاییەکان بخۆمەوە، شەیتان بە نەحلەت بی ها، چەندم تینووە! " ئەوسا بە عەزرەتەوە ڕوانیە ئەو خەڵکانەی لەبەردەم مێزەکانیان دانیشتبوون و بە کەیفی دڵی خۆیان ڤەخارنی ساردیان دەخواردەوە.

بە سەروسیمایەکی زیتەڵ وکەمێک بێپەرواوە بەبەر کافەکاندا دەڕۆیی و بە نیگایەکی لەزگین، بەسەروسیما و جل و بەرگی خەڵکەکەدا، گیرفانی دەخوێندنەوە و بەمەزەندە دەیزانی چەندیان پارە لە بەرکدایە. تووڕەییەکی بێ ئامان، سەبارەت بەم خەڵکە ئاسوودەو خۆشگوزەرانە، لە ناخیا سەری دەکرد. ئەگەر پیاو دەستی بە بەرکیاندا بکردایە، لە سکەی زێڕەوە بیگرە تا سکەی زیو و تا دراوی وردەی لەگیرفانیاندا دەدۆزییەوە. هەر یەکێکیان بە کێمانی بیست

فرانکیان پێ بوو، بەلای کەمەوە سەد کەسێک لە کافەکەدا بوون، کۆی پارەکانیان دەیکردە چوار هەزار فرانکێک.

لەبن لێوانەوە گوتی: " بەراز باوکانەی چەپەڵ ! " درێژەی بە ڕێکردنە بەفیزەکەی دا. ئەگەر یەکێک لەوانەی لە گۆشەیەکی تاریکی کۆڵانێکا بەگیر بهاوردایە، بێ هیچ سڵکردنەوەیەکی ئەخلاقی دەستی دەنایە بینی، ڕێک وەکو چۆن لە کاتی عەسکەریدا و لە کاتی مانۆڕاندا، ملی مامر و کەڵەبابی گوندییانی هەڵدەکێشا.

یادی ئەو دووساڵە عەسکەرییەی وەبیرهاتەوە کە لە ئەفریقیا بەسەری بردبوو، ئەو شەڕە چەقۆیەی وەبیر کەوتەوە کە دەگەڵ عەرەبە بێنەواکانی گوندەکانی باشووردا کردبووی. یادی ئەو زێدەگاڤی و دزییەی بیر هاتەوە کە دەگەڵ هاوقیتارەکانیا دژی یەکێک لە تیرە عەرەبەکان کردبوویان، بەو یادە بزەیەکی کەوتە سەر لێوان، ئاکامی ئەم زێدەگاڤی و دزییە، کوژرانی سێ عەرەب و بەدەستهێنانی بیست مریشک، دووپەز، کەمێک زێڕ و شەش مانگ پێکەنین و ڕابواردنی هاوڕێکانی بوو.

ئەنجامدەرانی ئەم بویەرە، هەرگیز نەدۆزرانەوە. کەسیش نە سۆراخی کردن و نە تاقیب. ئیدی عەرەبەکان بەجۆرە نێچیرێکی ئاسایی سەربازەکان دەژمێردران.

لە پاریسدا ڕەوشەکە جۆرێکی دی بوو. تەنانەت خەڵکانی شمشێر بەقەد و دەمانچە بەدەستیش نەیاندەتوانی گەندە دزی بکەن و لە تاقیب و سزای دادگا بخەلەسن و وەکو بەرزەکی بانان، بە کەماڵی ئازادی بسوڕێنەوە. هێشتا هەرزەیی وسەرسەریاتی ودڵڕەقی و بێ ئینسافیەکانی دەورانی دەرەجە دارییەکەی لە وڵاتی داگیرکراوا، لە بیر

مابوو. هەڵبەتە خۆزی بەو دووساڵە خزمەتە دەخواست کە لە بیابان و ساردا بەسەری بردبوو.حەیفێ کە لەوێندەر نەمابووەوە! بەڵام کە باش بیری کردبووەوە، هەستی کردبوو کە لە پاریسدا، ڕەوشێکی باشتری لەپێش دەبێت، هەنووکە!... ئاە، بەڵێ، ئەمە ئەو ڕەوش و پێگەیە بوو کە بە نەسیبی بووبوو!

زمانی لەزاریا جوڵاند، تەقەیەک لە دەمی بەرز بووەوە، لە تۆوایە گەرەکیە بەم کارە خۆی تاقی بکاتەوەو بزانێت مەلاشووی چەند وشکە.

حەشاماتێکی شەکەت وفەرتووس بە دەوریا دەخولانەوە، ئەو هێشتا بەخۆی دەگوت: " هیچ و پووچانە! گیرفانی ئێلەکەکانیان پڕە لەپارە". بەدەم فیکە لێدانەوە، شانی لە خەڵکی دەدا، خەڵکەکە بەدەم بۆڵاندنەوە ئاوڕیان دەدایەوەو خێسەیان لێدەکرد، ژنەکان لەبن لێوانەوە دەیانگوت: " چ حەیوانێکی بێ تەربێتە! "

بە بەردەم شانۆی ڤودڤیلدا تێپەڕی ( ڤودڤیل: شانۆیەکە لە پاریس، کە لەوێدا شانۆی کۆمیکی سووک و بازاڕی پێشکەش دەکرا، جاران و ئێستاش، بەم جۆرە شانۆنامانەش دەگوترا ڤودڤیل ). لەبەر کافەی ئەمریکاییدا وەستا. تینویەتی زۆری بۆهێنا، لەخۆی پرسی: هەقی نییە بڕوات پەرداخێ بیرە بخواتەوە؟ پێش ئەوەی بڕیار بدات، تەمەشایەکی سەعاتە ڕووناکەکەی ناوەندی شەقامەکەی کرد، سەعات نۆ و چارەک بوو. خۆی ئەخلاقی خۆی دەناسی: هەرکە پەرداخە بیرەکەی لەبەردەمدا دابنەن، یەکسەر هەڵیدەدات. پاشان تا سەعات یازدە چ بکات؟

بەبەر کافەکەدا تێپەڕی. بەخۆی گوت: " دەچم بۆ بولڤاری مادلن و پاشان زۆر بەهێواشی دەگەڕێمەوە. "

وەختایەک گەییە سیلەی مەیدانی ئۆپرا و بولڤاری مادلن، تووشی پیاوێکی گەنجی قەڵەو بوو کە بە ئاستەم وەبیری هاتەوە کە ئەم پیاوەی لە جێیەک دیتووە.

بەدەم بیرکردنەوەوە، دوای کەوت و لەبن لێوانەوە دووبارەی کردەوە " شەیتان بە نەعلەت بی، لە کوێ دیتوومە؟ "

ئیدی بەو دەقەوە، زەینی خۆی وەردەوە دەدا، بێئەوەی وەبیری بێتەوە، پاشان لە ناکاوا، زەین وەهانایەوە هات، هەمان پیاو، گەنجتر و لاوازتر لە ئێستا، بە ئونیفۆرمی عەسکەری سوارەوە، لەبەرچاوی بەرجەستە بوو. بەدەنگی بەرز گوتی: " عەجەب، فورستیە، ئەمە تۆی! " پێی هەڵگرت، خۆی گەیاندێ و دەستێکی بە شانیا دا. کابرای قەڵەو ئاوڕی پاشی دایەوە، لێی ڕاما و گوتی: - کارێکت بەمن هەیە قوربان؟

دوروا، دەستی بە پێکەنین کرد: - نامناسیتەوە؟

- نەخێر.

- من جۆرج دورروام، لە فەوجی شەشەمی سوارە بووم.

فورستیە، هەردوو دەستی بردە پێشێ و گوتی: - ئاە، هاوڕێ، حاڵت چۆنە؟

- زۆرباشم، ئەدی حاڵی تۆ؟

- ئاە، حاڵم زۆر خراپە، تەسەور بکە، سینەم وەکو کاغەزی گرمۆڵەی لێهاتووە، کۆکە ئامانم نادات، ئەو دڵ یەشەیەی کە لە بورژیڤال، لە کاتی گەڕانەوەم بۆ پاریس

تووشی بووم، دەست بەردارم نابێت و چوار ساڵە پێوەی دەناڵێنم.

- عەجەب، بەڵام ڕواڵەتت وا نانوێنێت.

فورستیە، باسکی هاوڕێکەی گرت وگریی دڵی بۆ کردەوە، باسی نەخۆشیەکەی کرد، باسی چوونە نک دکتۆرانی جۆراوجۆر، ڕاوبۆچوونی دکتۆران وئامۆژگارییەکانیان، باسی دژواری پەیڕەوی کردنی ئامۆژگارییەکانی ئەوانی کرد، بەو حاڵەوە کە تیای بوو، ئامۆژگاریان دەکرد زستانان لە باشوور بەسەر بەرێت، بەڵام چۆن دەیتوانی؟ ژنی هێنابوو و لە کاری ڕۆژنامەڤانیدا، دەور وپێگەیەکی زۆرباشی هەبوو.

- من لاپەڕەی سیاسی ڕۆژنامەی " لاڤی فرانسز " ئامادە دەکەم، هەواڵی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی سینا، بۆ ڕۆژنامەی سالو دەنووسم، جارجاریش، هەندێک ڕاڤە و شرۆڤەی ئەدەبی بۆ ڕۆژنامەی لاپلانیت دەنووسم. ئیدی جێ پێی خۆم لە ژیاندا کردووەتەوە.

دوروا، حایر وحەپەساو تەمەشای دەکرد. زۆر گۆڕابوو، ئێستا ڕەفتار و سەروسیمای پیاوێکی سەلارو سەنگین و ئارامی پێوە دیاربوو، ورگی، لە ورگی پیاوێک دەچوو کە لەباری خۆراکییەوە، باش بەخۆی ڕابگات. جاران لاواز و باریکەلە، گورج و گۆڵ، کەمێک گێژ، جنگز و شەڕانی بوو و، هەمیشە سەرحاڵ و بەکەیف و بەدەماخ بوو.

سێ ساڵ بوو لە پاریس دەژیا، لەم سێ ساڵەدا بووبوو بە پیاوێکی دی. قەڵەو و جدی، چەند داوێکی سپی کەوتبووە

لاجانگەکانی، هەرچەندە تەمەنی لە بیست و حەوت ساڵان هێوەتر نەچووبوو.

فورستیە پرسی:- دەتەوێ بۆ کوێ برۆیت؟

دوروا، بەرسڤی دایەوە:- بۆ هیچ کوێ، دەمویست پێش ئەوەی بۆ ماڵ بگەڕێمەوە، پیاسەیەک بکەم.

- ئێ، حەزدەکەیت، پێکەوە سەرێکی نووسینگەی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز بدەین؟ دەبێ هەڵەگیری چەند نموونەیەکی چاپی بکەم، پاشان دەچین بۆ شوێنێک و بیرەیەک پێکەوە دەخۆینەوە.

- لاریم نییە.

کەوتنەڕێ، چونکە هاوڕێی قوتابخانە و هاوڕێی سەردەمی عەسکەری بوون، زۆر زوو هۆگری یەکدی بوونەوەو زۆر خۆمانە دەستی یەکدییان گرتبوو.

فورستیە پرسی:- لە پاریس چ کارێک دەکەی؟

دوروا، شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی: - هیچ، خەریکە لە برسا دەمرم. وەختایەک خزمەتی عەسکەریم تەواو بوو بۆ ئێرە گەڕامەوە، تا پارە و پایەیەک پەیدا بکەم یان لە پاریسدا بژیم، ئێستا شەش هەیڤە کە لە دایەرەی هێڵی ئاسنی باکوور دامەزراوم، بە ساڵی هەزار وپێنج سەد فرانک و تەواو.

فورستیە لەبن لێوانەوە گوتی:- زۆر خراپە، ئەمە پارە نییە، زۆر کەمە.

- ڕاست دەکەی، بەڵام چبکەم، چارم ناچارە، چ کارێکی دیکەم لەدەست دێت؟ بە تاقی تەنیام، کەس ناناسم و ناشتوانم ڕوو لە هیچ کەسێک بنەم. وە نەبێ ئەهلی کار نەبم و خۆم لە کار بدزمەوە. بەڵام ئەوزاری کارکردنم نییە.

فورستیە، بەچاوی کەسێکی کارامەی ئەهلی کار، نیگایەکی سەراپای کرد وپاشان بە تۆنێکی پڕ متمانەوە لەبەر خۆیەوە گوتی: - دەزانی هاوڕێ، لێرەدا هەموو شتێک وەستاوەتە سەر متمانە بەخۆبوون. پیاو ئەگەر کەمێک وریا و زرینگ بێ، زۆر ئاسانتر دەتوانێ ببێت بە وەزیر تا بە سەرۆکی نووسینگە. پیاو دەبێ کارێک بکات کە خەڵکی قەبووڵی بکەن، نەک لێیان بپارێتەوە. باشە چۆن نەتتوانیوە کارێکی باشتر لە کارمەندی دایەرەی ڕێگای ئاسنی باکوور پەیدا بکەیت؟

دوروا گوتی: - لەهەموو دەرگایەکم دا، شتێکی باشترم پەیدا نەکرد. بەڵام حاڵی حازر چاوم لە کارێکی دیکەیە. پێشنیازی ئەوەیان بۆ کردووم کە چاودێری و تیماری ئەسپانی مەیدانی ئەسپ تاودانی پلیرن بکەم. قەرارە ساڵێ سێ هەزار فرانکم بدەنێ.

فورستیە لەناکاوا وەستا!

- ئەم کارە مەکە، گەوجانەیە، بە کێمانی دەبێ دەرامەتی ساڵانەت دە هەزار فرانک بێت، نەک سێ هەزار فرانک. بەم کارەت ئایندەی خۆت بە تاڵان دەدەیت. لە دایەرەی ڕێگای ئاسن، بەلای کەمەوە کەس ناتبینێ، کەس ناتناسێت، ئەگەر وریا و زرینگ بیت، دەتوانی خۆت لەوێندەر دەرباز بکەیت و ڕێگای خۆت بدۆزیتەوە. بەڵام کە لە تەویلەی ئەسپاندا گیرسایتەوە و بوویت بە مەیتەر، ئیدی کارت لە کار دەترازێ. ڕێک وەکو ئەوەیە لە خوارنگەیەکدا کە هەموو پاریسیان بۆ نانخواردن دەچنە ئەوێندەر و تۆ لەوێ بەرپرسی پێشخزمەتان بیت. وەختایەک مەشقی

سوارکاریت بە پارەداران یان کوڕەکانیان کرد، ئیدی ئەوانە ناتوانن بەوچاوە سەیرت بکەن کە هاوتای خۆیانیت.

بێدەنگ بوو، چەند ساتێک لە فکران ڕاچوو و پاشان پرسی: - خوێندنی ئامادەییت تەواو کردووە؟

- نەخێر، دووجار بەشداری تاقیکردنەوەم کرد و دەرنەچووم.

- مادامێکی تا دوا ساڵی ئامادەیی لە خوێندن بەردەوام بوویت، شادەتنامە گرینگ نییە. ئەگەر باسێک دەربارەی سیسرون یان تیبر بێتە ئاراوە، تۆ ناحەپەسیت، کەم دابێژێک ئەوانە دەناسیت، وایە؟

- با، کەم تا زۆرێک.

- دەی باشە، کەس لەوە زیاتر دەربارەی ئەوانە نازانێ، تەنیا پازدە بیست نەفەرێکی گەوج نەبێ، کە نەیانتوانیوە بەرەی خۆیان لە ژێر پێیان دەربێنن. خۆڕانان و خۆ هەڵکێشان کارێکی قورس نییە، خاترجەم بە، پیاو تەنیا دەبێ وریا بێ و ئاگای لەخۆ بێ کە دەستی نەکەوێتەڕوو و نەیەڵێ خەڵکی پێی بزانن کە هیچ نازانێت. پیاو دەبێ کەڵەکباز بێ، خۆی لە ڕوو بەڕوو بوونەوەی کێشە وئاریشان ببوێرێ و خۆی لەجێی خوڕان نەدات و کۆسپ و تەگەران ببەزێنێ. دەتوانێ بە کۆمەکی قاموس و واژەنامەیەک هەموو کارەکانی دی ڕایی بکات. خەڵکی هەموو وەکو کەر بێ هەست و وەکو گا گێلن.

فورستیە، وەکو بەشەرێکی بە جورئەت و ئارام کە زۆر بەچاکی شارەزای نهێنی و نهێنگەکانی ژیان بێ قسەی دەکرد و بەدەم قسانەوە، لێو بەخەندە، تەمەشای ئەو

حەشاماتەی دەکرد کە بەلایاندا تێدەپەڕین، لێ لە ناکاوا دەستی بە کۆکین کرد، لە جێگای خۆی هەستا، تا کۆکینەکەی بوەستێتەوە، ئەوسا بە نائومێدییەوە گوتی: - ناخۆش نییە، پیاو نەتوانێ لە شەڕی ئەم هەوی دڵ یەشەیە نەخەلەسێت؟ تازەش پێمان ناوەتە ناو هاوینەوە. کە زستان هات دەچم بۆ مانتون، نزیکی سنووری ئیتالیا، بزانم مالیجەیەکی خۆم ناکەم. قیروسیا لە کار وژیان، بە دەرەک، سەلامەتی لە هەموو شتێک گرینگترە.

گەیینە بولڤاری پولونییر، لە بەردەم دەرگایەکی شووشەیی گەورە، لە دیوی ناوەوە ڕۆژنامەیەک کرابووەوە و بە جامخانەکەیانەوە چەسپاندبوو. سێ کەس لەبەر دەرگاکە وەستابوون و ڕۆژنامەکەیان دەخوێندەوە.

لە سەرووی دەرگاکەوە، تابلۆیەکی گەورە، کە بە پیتێن ئاگرین نووسرابوو، بە شوولەی گاز ڕوناک کرابووەوە، هەڵواسرابوو، لە سەر تابلۆکە نووسرابوو: لاڤی فرانسز. ئەو خەڵکانەی بەدەم پیاسەوە بەبەر جامخانەکەدا ڕەت دەبوون، لە ناکاوا دەکەوتنە بەر ڕوناکییەکە، دەتگوت لە ڕۆژی ڕوناکدان، سەروسیمایان بەدیار دەکەوت، پاش ئەوەی لەوێندەر ڕەت دەبوون، دووبارە لە تاریکیەکەدا نقوم دەبوون.

فورستیە، دەرگاکەی دەڵەک دا وگوتی: " وەرە ژوورەوە ". دوروا وەژوور کەوت، بە قاڵدرمەیەکی بە شکۆ و تەپوتۆزاویدا، کە لە شەقامەکەوە دەبینرا، سەرکەوتن بۆ سەرەوە، خۆیان کرد بە هۆڵێکدا کە دوو کارمەندی لێ دانیشتبوون، سڵاویان لە فورستیە کرد، پاشان خۆیان بە

هۆدەیەکی گەورەدا کرد کە لە هۆڵی چاوەڕوانی دەچوو، یەکپارچە گەرد وتۆز بوو، دیوارەکانی بە قوماشی مەخمەڵی کەسکی ناشیرین پۆشرابوون، یەکپارچە پەڵە بوو، لێرەولەوێ کون بووبوو، دەتگوت مشک خواردوویەتی.

فورستیە گوتی: لێرە ڕونە، پێنج خولەکی دی دەزڤڕمەوە.

لە یەکێک لەو سێ دەرگایەوە کە بەسەر ئەم هۆڵەدا دەکرانەوە، وەژوور کەوت.

بۆنێکی سەیر، تایبەتی و لە وەسف نەهاتگ، بۆنی هۆڵێن نووسین لە ژوورەکەدا شەپۆلی دەدا. دوروا، بەبێ جووڵە لە ژوورەکەدا مایەوە، کەمێک ترساو وحەپەساو دیار بوو. ناو بەناو خەڵکانێک بلەز، بە هەشتاو لە دەرگایەکەوە وەژوور دەکەوتن، بەبەردەمی ئەودا تێدەپەڕین و پێش ئەوەی فریای دیتنیان بکەوێت، لە دەرگایەکی دیکەوە وەدەر دەکەوتن.

هەندێجار، پیاوانی گەنج بوون، زۆر گەنج، بە ڕواڵەت زۆر مژوول بوون و کاغەز بەدەست دەڕۆیشتن، هێندە بلەز ڕێیان دەکرد کاغەزەکەی دەستیان، وەک ئەوەی باڵ بگرێ، بەدەم بایەکەوە دەکەوتە باڵەفڕە. هەندێجار کرێکارانی چاپخانە، کە لە ژێر باڵاپۆشە پەڵەپەڵاویەکانیانەوە، کراسی سپی خاوێنیان لەبەر و پانتۆڵی باش و جوانی وەکو هی دەوڵەمەندانیان لەبەربوو، دەهاتن ودەچوون. ئەمانە هەموو شریتی پانی کاغەزیان بەدەستەوە بوو، یان نموونەی پیت چنی، کە هێشتا مەرەکەبەکەیان هیشک نەبووبووەوە. جارێکیش پیاوێکی وردیلە هاتە ژوورێ. سەروسیمایەکی

زۆر پەرداخی هەبوو، چاکەتێکی ناوقەد تەنگ و پانتۆڵێکی بەدەن چەسپی لەبەر و، جووتێ پێڵاوی زۆر نووک باریکی لە پێیان بوو، پێدەچوو، پەیامنێری تایبەتی ئەنجوومەنە ئەشرافیەکان بێ و خەبەر و باسی ئەو شەوەی دەگەڵ خۆی هێنابێ.

کەسانی دیکەش وەژوو دەکەوتن، هەموویان سیمای جدی، ئارام، کڵاوی قووچی، لێوار پانیان لەسەر بوو، دەتگوت ئەو کڵاوانە بۆ ئەوە بوو کە لە خەڵکانی دیکەیان جیا بکاتەوە.

دوای کەمێک، سەر و سەکوتی فورستیە پەیدا بوو بازووی پیاوێکی باڵابەرزی لاوازی گرتبوو و دەگەڵ خۆیدا دەیهێنا، پیاوەکە تەمەنی سی چل ساڵێک دەبوو، جلکی ڕەشی لەبەردا بوو، بۆینباخی سپی بەستبوو، ڕەنگی ڕوخساری ڕەشتاڵە بوو، سمێڵە نووک باریکەکانی بۆ سەرەوە بادابوو، ئەمە سیما و ڕواڵەتێکی گۆساخ ولەخۆ ڕازی پێدەدا.

فورستیە پێی گوت: - خودا حافیز، مامۆستای ئازیز.

پیاوەکە دەستی گوشی و گوتی: - خودا حافیز، دۆستی ئازیز.

پاشان بەدەم فیکەلێدانەوە، دار عاساکەی لەبن باڵی ناو، بە قاڵدرمەکاندا داگەڕا.

دوروا، پرسی: - ئەمە کێ بوو؟

- جاک ریڤاڵ بوو، واریقات نووس، خەباتکار و تەنز نووسێکی بە نێوبانگە. هاتبوو، هەڵەگیری نموونە چاپکراوەکانی بکات. ئەو و گارن و مونتیل، باشترین و بەناوبانگترین وتارنووسی ئێمەن لە پاریس دا. جاک ریڤاڵ،

هەفتەی دوو وتار بۆ ئەم ڕۆژنامەیە دەنووسێت و ساڵێ سێ هەزار فرانک وەردەگرێت.

وەختایەک کە خەریک بوون دەڕۆیشتن، تووشی پیاوێکی کورتەباڵای قەڵەو بوون، قژی درێژ و سەروسیمای چلکن و شێواو، بە هانکەهانک بە قاڵدرمەکاندا هەڵدەگەڕا.

فورستیە، بە ئەسپایی سڵاوی لێکرد و بە دوروای دۆستی گوت: - ئەمە نوربردوڤارنە، شاعیرە، نووسەری "خۆرێن مردوو" ە، ئەمیش یەکێکە لەوانەی پارەیەکی باش وەردەگرێت. بۆ هەر چیرۆکێک، سێسەد فرانک وەردەگرێت و، درێژترین چیرۆکیشی لە دووسەد دێڕ زیاتر نابێت. ئێستا وەختی ئەوەیە بچین بۆ کافەی ناپولتین، من خەریکە لە تینووان خەفە دەبم.

هەرکە لە دەور مێزەکە دانیشتن، فورستیە بانگی کرد: دوو پەرداخ ئاوجۆ ( بیرە ). لە کاتێکدا دوروا، بەخاوی و هەرجارەی قومێکی لە بیرەکەی خۆی دەخواردەوەو وەکو ئەوەی ئاوی حەیات بخواتەوە، بە لەزەتەوە بیرەکەی لە دەمیا دەگێڕا و تاماوەکەی هەڵدەمژی، فورستیە، یەکبین پێکەکەی هەڵدا.

فورستیە، وادەهاتە بەرچاو کە لە فکران ڕاچووبێ، پاشان لە ناکاوا گوتی: - بۆچی نایەیتە ناو کاری ڕۆژنامەڤانیەوە؟

دوروا، هایم و حەیران نیگایەکی ئەو کرد و گوتی:

- بەڵام... مەسەلەکە ئەمەیە کە... من قەت هیچم نەنووسیووە، سەروکارم دەگەڵ قەڵەمدا نەبووە.

- چ قەیدیە، تاقیبکەوە، هەموو کارێک لە هەنگاوێکی بچووکەوە دەست پێدەکات. من دەتوانم بتکەم بە شاگردی

خۆم، بتنێرم نووچە و هەواڵانم بۆ کۆ بکەیتەوە، سەری ئێرە و ئەوێ بدەیت، دیمانە دەگەڵ ئەم و ئەودا بکەیت. لە هەوەڵەوە مانگی دووسەد و پەنجا فرانکت دەبێ، جگە لە کرێی گالیسکە کە بەم لاو بەولاتدا دەبات. دەتەوێ لەمبارەیەوە قسان دەگەڵ بەرێوەبەری رۆژنامەکەدا بکەم؟

- هەڵبەتە مەمنوونیش دەبم.

- کەواتە، تۆ کارێک بکە، سبەی شەو بۆ شام وەرە بۆ ماڵەکەی من، تەنیا پێنج شەش کەسێکم میوانن، خاوەنی رۆژنامەکە، جەنابی والتیر وژنەکەی، جاک ریڤال و نوربردوڤان، کە تۆزێ لەمەپێش هەردووکیانت بینی، لە گەڵ خانمێکی دۆستی ژنەکەم، رازیت؟

دوروا، دوودڵ، سوور بووبووەوە و تیامابوو چ بڵێت. ئەنجام لەبن لێوانەوە گوتی:

- کێشە ئەمەیە من جلکی شایستە بەم میوانیەم نییە.

فورستیە، حەپەسا : - جلکت نییە؟ جل وبەرگ و رواڵەت، زۆر گرینگە بۆکار. دەزانی لە پاریسدا، پیاو ئەگەر شوێن و ماوای خەوتن و حەوانەوەی نەبێ، زۆر گرینگ نییە، بەلام جل و بەرگ یەجگار پێویستە.

ئەوسا لە ناکاوا، دەستی بە گیرفانی ئێلەکەکەیدا کرد، چنگێ دراوی دەرهێنا، دوو لوی زێری هەڵگرت و لەبەردەم دۆستە دێرینەکەیدا رایگرت، دوای ئەوە بە راوێژێکی جدی و دۆستانە گوتی:

- کەی بووت، وێمدەوە. دەستێک جلکی ماقوول بەکرێ بگرە، یان بە قیستی مانگانە بیکرە وبەم پارەیە پێشەکیەکەی بدە، بە هەرحاڵ، باش بەخۆت را بگە و لە

بیرت نەچێ کە سبەینێ سەعات حەوت و نیو بێی بۆ ماڵی ئێمە، ژمارە هەڤدە، کۆڵانی فونتێن.

دوروا، بە پەشۆکاوی پارەکەی وەرگرت و بەکاوەخۆ گوتی:

- تۆ زۆر میهرەبانیت. زۆر سوپاس، دڵنیابە هەرگیز ئەم هەڵوێستەی تۆ ژبیر ناکەم...

فورستیە، قسەکەی پێ بڕی: " زۆرچاکە، تەواو. بیرەیەکی دی دەخۆیەوە؟ ئەوسا گازیکرد: " گارسۆن، دوو بیرە! "

دوای ئەوەی هەردووکیان بیرەکانیان خواردەوە، فورستیە پرسی:

- حەزت لێیە، سەعاتێک پێکەوە پیاسە بکەین؟

- زۆرم پێخۆشە.

بەدەم پیاسەوە بەرەو بولڤاری مادلین ڕۆیشتن.

فورستیە پرسی: ئێ ئێستا چ بکەین؟ دەڵێن ئەو کەسەی کە لە پاریسدا دەسووڕێتەوەو هیچ کارێکی نییە بیکات، هەمیشە ئەوزارێکی سەرگەرمی بۆخۆی دەدۆزێتەوە، بەڕای من ئەمە دروست نییە. من کە شەوان دەمەوێ پیاسەیەک بکەم و بایەکی باڵی خۆ بدەم، نازانم کێوە بچم. پیاسەیەکی ناو بێشەی بولونی، بەبێ ئەوەی ژنێکت دەگەڵ بێت، هیچ لەزەتێکی نییە، ژنیش هەمووکاتێ دەست ناکەوێ. ئەم کافانەی تەپڵ و سازانەش، تەنیا بەکەڵکی دەرمانسازەکەی سەری کۆڵانەکە و ژنەکەی دێت، من هیچ کەیفم پێ نایەت. ئەدی چارە؟ هیچ، پێوسیت بە پارکێکی هاوینە هەیە، وەکو پارکی مونسو کە شەوان کراوە بێت، پیاو بڕوات لە ژێر درەختەکاندا دانیشێت، نۆشابەیەکی سارد بخواتەوە و گوێ

له موزیقای نایاب بگریت. ئه‌م جۆره شوێنانه بۆ ڕابواردن نییه، بۆ پیاسه‌کردن و کات به‌سه‌ر بردنه. ده‌بێ ده‌رگاوانانێ بێنه دامه‌زراندن، تا ژنانی شۆخ و شه‌نگوڵ ڕووبکه‌نه ئه‌وێنده‌ر. پیاو ده‌توانێ به شه‌قام و ڕاڕه‌وه چه‌وڕێژه‌کاندا، که له‌به‌ر تیشکی گلۆپاندا ده‌دره‌وشێنه‌وه، پیاسه بکات و هه‌رکاتێ ویستی له‌سه‌ر ته‌ختێک ڕونیشێت و له دوور یان له‌نزیکه‌وه گوێ له موزیقا ڕاده‌ێرێت. جاران، له‌باخی موزاردا، شوێنێکی وامان هه‌بوو، به‌ڵام شانۆیه‌کی بچکۆله‌ی ناجدی هه‌بوو، به ئاهه‌نگ و ڕیتمی توندی سه‌ما و ڕه‌قسه‌وه، شوێنێکی بچووک و ته‌نگ بوو، نه‌ک شوێنێکی ئارام وگه‌وره.

پارک و باخێکی گه‌وره بۆ ئه‌م کاره پێویسته، زۆر گه‌وره. ئه‌وکاته باڵکێش ده‌بێت. ده‌ته‌وێ بۆ کوێ بڕۆیت؟

دوروا، دوودڵ بوو، چ شوێنێک بڵێت، ئه‌نجام بڕیاری خۆی دا و گوتی: - فولی بیرجیر، تا ئێستا نه‌مدیتووه، حه‌زده‌که‌م سه‌رێکی ئه‌وێنده‌ر بده‌م.

فورستیه گوتی: - فولی بیرجیر؟ ئه‌وه‌نده گه‌رمه ده‌کوڵێین. به‌ڵام به‌هه‌رحاڵ، وێڕای ئه‌وه‌ش شوێنێکی خۆشه.

نیوه پێچێکیان کرده‌وه‌و ڕێگه‌ی کوچه‌ی ' فوبور مونمارتر ' یان گرته‌به‌ر. ڕووکاری ڕوناکی شانۆیه‌که، چوارڕیانی ئه‌وکوچه‌یه‌ی ڕوناک ده‌کرده‌وه که ده‌هاته‌وه سه‌ر شانۆکه. ڕیزێک گالسیکه چاوه‌ڕوانی ته‌واوبوونی نمایشه‌که بوون.

فورستیه چووه ژووره‌وه، دوروا گوتی بیرمان چوو بلیت بکڕین.

فورستیە، بە کەش وفشەوە گوتی: - مادام دەگەڵ منیت، پێویست بە کڕینی بلیت ناکات.

کاتێ گەیینە شوێنی نیشاندانی بلیتان، سێ کۆنترۆڵچی سڵاویان لە فورستیە کرد، نەفەرەکەی ناوەڕاست تەوقەی دەگەڵدا کرد. فورستیە پرسی: - شوێنێکی باش لە یەکێک لە لۆجەکاندا دەست دەکەوێ؟

- هەڵبەتە جەنابی فورستیە.

کۆپینەکەی لە یارۆی کۆنترۆڵچی وەرگرت. دەرگا ئەستوورەکەی، کە چەرمی بەسەردا درابوو دەڵەک دا و، خۆیان بە هۆڵەکەدا کرد. تەنکە دووکەڵی سیغار، وەکو تەمێکی تەنک، بەشە دوورەکانی هۆڵەکە، شانۆکە و لۆجەکانی ئەوبەری داپۆشی بوو. ڕشتەی باریک و سپی دووکەڵ، لە هەموو ئەو سیغار و جگەرانەوە کە خەڵکەکە دەیانکێشان، بەردەوام دەچوو بە ئاسمانا، لە بنمیچەکەدا کۆ دەبووەوە، لە دەوری گومەزە گەورەکە و ئاوێزە مەزنەکە و، لە سەر ڕاڕەو و لۆژەکانی نهۆمی سەری سەرەوە، ئاسمانێکی هەورینی چێدەکرد.

لە هۆڵە گەورەکەی چوونە ژوورەوەدا، کە بەرەو ڕاڕەوە پانەکەی پشتێنەی سالۆنەکە دەچوو، ئەو شوێنەی کە تاقمێک کیژێن مکیاج کردە و جەماعەتێک پیاوێن بیجامە لەبەر تێکەڵاو بووبوون، تاقمێک ژن لەبەردەم پێشخوانەکە وەستابوون و چاوەڕوانی هاتنی میوانی تازە بوون. لە پشت ئەم پێشخوانەوە، سێ فرۆشیاری ژن، کە میکیاجێکی زۆر تۆخ و بازاڕیان کردبوو، وەستابوو و ڤەخارن و عەشقیان بە مشتەریان دەفرۆشت.

ئەو ئاوێنە گەورەو بەرزانەی لە پشتیانەوە بوون، سەروسیمای ڕێبواران و پشتەوەی ئەم فرۆشیارانەیان دەنواند.

فورستیە، وەکو پیاوێک کە گوایە هەقە خەڵکانی دی ڕێز و حورمەتی بگرن و مدارای بکەن، بلەز ڕێگای لە نێو ئاپۆڕای حەشیمەتەکەدا بۆخۆی کردەوە.

لە یەکێک لە کیژانی پێشکاری کردنەوەی دەرگای لۆجەکان نزیک بووەوەو گوتی: - بێزەحمەت لۆجی ژمارە هەڤدە.

- لێرەوە جەناب.

پێشکارەکە، ڕێنوێنی کردن و کردنی بە کابینەیەکی دارینی بچووکدا کە بەردەمەکەی ڕوو لە هۆڵەکە بوو. دیوارەکانی بە قوماشی سوور پۆشرابوون. چوار کورسی بەهەمان ڕەنگی قوماشی دیوارەکان تیابوو، بەڵام هێندە لە نزیکی یەکترەوە دانرابوون کە پیاو بە زەحمەت دەیتوانی بە بەینیاندا تێپەڕێت. جووتە برادەر دانیشتن . ئیدی بە هەردوو ئالی چەپ و ڕاستیاندا، لۆجی وەکو لۆجەکەی ئەوان بە شێوەی نیوە بازنەیی، تا کەناری شانۆکە ڕیزکرابوون. خەڵکانی دی لە نێو ئەم لۆجانە دانیشتبوون کە تەنیا سەر و سینگیان دیاربوو.

سێ پیاو بە جلکی وەرزشی بەدەن چەسپەوە، یەکێکیان باڵابەرز، دووەمیان دەستەباڵا و سێیەمیان کورتە باڵا، لە سەر شانۆکە بە نۆرە حەرەکاتی ئاکرۆباتیان دەکرد.

هەوەڵجار پیاوە باڵا بەرزەکە، بە هەنگاوی کورت و لەزگین هاتە پێشەوە، بە حەرەکەتێکی دەست، وەکو ئەوەی بیەوێ ماچی هەوایی بۆ هەمووان بنێرێت، سڵاوی کرد.

له ژێر جله تەسک و بەدەن چەسپەکانیەوە، ماسوولکەکانی سینگ و بەرۆک و لاقی دیاربوون، بۆ ئەوەی ورگە زلەکەی نەبینرێ سینگی پڕبا دەکرد و دەری دەپەڕاند ؛ سەر وسیمای لە سەروسیمای شاگردی ئارایشگەران دەچوو، قژەکەی لە ناوەندی سەریەوە، زۆر بەڕێکی بە دوولادا دابەش کردبوو. بە جوولەیەکی هاوسەنگ خۆی هەڵدایە سەرەوە، بە دوودەست میلەی تەنافی پەتبازیەکەی گرت، بە ئاسمانەوە، وەکو چەرخ بە دەوری شانۆکەدا، کەوتە سووڕانەوە، پاشان بە زەبری هێزی بازووان و مەچەک و بە کۆمەکی میله جێگیرەکەی تەنافی پەتبازیەکە، بەدەنی بە حەواوە، بە ئاسۆیی و بەبێ جووڵە ڕاگرت.

دوای چەند چرکەیەک خۆی هەڵدایە خوارەوەو بەدەم زەردەخەنەوەو بەدەم ستایش وئافەرینی ئورکستەرەکە و تەمەشاڤانانەوە، چوو لە قەراخ شانۆکەدا ڕاوەستا و لە هەر هەنگاوێکا، ماسوولکە توند و تورتەکانی لاقی، بە ڕووی تەمەشاڤانەکاندا دەنواند.

نەفەری دووەم کە باڵای کورت تر، بەڵام چوارشانەتر بوو، هاتە پێشەوە، هەمان حەرەکاتی لە نێو ستایش و ئافەرین و هاندانی تەمەشاڤاناندا دووبارە کردەوە.

لێ دوروا، ئاگای لە نمایشەکە نەبوو و، سەری بۆ پاشەوەو ڕوو لە ڕاڕەوە بازنەییەکە وەرگێڕابوو و تەمەشای ئاپۆڕای پیاوان و ژنە هەرزەکانی دەکرد.

فورستیە گوتی: - تەمەشای ڕیزەکانی پێشەوە بکە، جگە لە خەڵکانی دەوڵەمەند و ژن و منداڵەکانیان کەسی

دیکەیان تیا نییە، لەو کەڵلەپووتە بێ ئاوەزانەن کە تەنیا بۆ تەمەشای نمایشان هاتوون. هەندێک لە پیاسەچیانی بولڤارەکان و چەند هونەرمەندێک و ژمارەیەک کیژێن سووک وهەرزە دانیشتوون، لە پشتمانەوەش، سەیرترین تێکەڵەی خەڵکی پاریس دەبینی. ئەم پیاوانە، چتۆ بەشەرێکن؟ باش سەیریان بکە. لە هەموو جۆر و لە هەموو چینێکیان تیایە، بەڵام زۆربەیان لات ولەوێرن. زۆریان کارمەندی ئاسایی، کارمەندی بانک، موغازەچی، وەزارەتخانە، پەیامنێر، دەلاڵێن موحیبەت، ئەفسەران بە جلکی مەدەنیەوە، گەنجانی لە خۆڕازی و بە فیز بە جلکی شەوەوە، کە شامیان لە کاباریەکان خواردووە و تازە لە ئۆپرا گەڕاونەتەوە و پێش ئەوەی بۆ شانۆی ئیتاڵییان بڕۆن، سەرێکی ئێرەیان داوە، جگە لەمانە، دەستەیەک خەڵکانی گومانلێکراوش هەن کە ناتوانی بیانخەیتە خانەی هیچ چین و دەستەیەکەوە. بەڵام ژنان، هەر هەموویان یەک چینن، ئەو ژنانەی کە شێویان کە خوارنگەی ئەمریکایی دەخۆن، نرخیان یەک یان دوو " لوی " یە ( لوی: پارەیەکی فەرەنسیە ) لە غەریبەیەک دەگەڕێن کە بتوانن پێنج لوی لێ بکێشنەوەو بە مشتەرییە هەمیشەییەکانیان بێژن ئەمشەو وەختیان نییە. شەش ساڵە هەموو ئەمانە دەناسن، هەموو شەوێک بە درێژایی ساڵ، پیاو لە شوێنانی دیارکراودا دەیان بینێت، هەڵبەتە تەنیا ئەو کاتانە نەبێت، کە بەهۆی نەخۆشییەوە، کە بە ناچاری دەبێت لە نەخۆشخانەی سن لازار یان لورسین بخەون.

دوروا، ئیدی گوێی لە قسەکانی فورستیە نەدەگرت. یەکێک لەو ژنانە، ئانیشکی نابووە سەر قەراخ لۆجەکەی ئەوان و تەمەشای ئەوی دەکرد. ژنێکی قەڵەوی گەنمڕەنگ بوو کە بە سپیاو پێستی خۆی سپی کردبوو، چاوەکانی ڕەش کردبوون، پێڵوەکانی ڕەنگ کردبوو، برۆ وژێر برۆکانی هەڵگرتبوو. مەمکە گەورەو قەڵەوەکانی، گوشاریان لە سەر کراسە ئاوریشمە ڕەشەکەی دەکرد ودەیانویست بێنە دەرەوە، لێوە سوورەکانی بە جۆرێ سوور کردبوو، دەتگوت زامێکە و بە دەم و چاوییەوەیە، حاڵەتێکی حەیوانی پێدەبەخشی، کە لە هەمان کاتدا دەیتوانی هەندێ پیاو ببزوێنێت.

بە ئاماژەیەکی سەر، گازی یەکێک لە دەستە خوشکەکانی کرد کە بەوێدا ڕەت دەبوو، کرد. دەستە خوشکەکەی پێست و چاو و برۆیەکی کاڵ و ڕۆشنی هەبوو، قژی خەنەیی بوو، بە ئەندازەی ئەو قەڵەو بوو، بەدەنگێک کە هەموان گوێیان لێبێ گوتی: - وەرە تەمەشای ئەم کوڕە قۆزە بکە: ئەگەر وەعدی دە ˚ لوی ˚ م بداتێ، دەست بە ڕوویەوە نانەم.

فورستیە، بەدەم زەردە خەنەیەکەوە ئاوڕی پاشی دایەوە، بەدەست یەکێکی بەلاقی دوروا دا کێشا و گوتی:

- مەبەستی تۆ بوو. وادیارە مایەی سەرنجی ژنانیت، پیرۆزباییت لێدەکەم.

کۆنە دەرەجەداری عەسکەری، سوور بووەوە و، لە هەمان کاتدا، بەبێ ئەوەی بەدەستی خۆی بێت، سەری قامکانی بەو دوو ˚ لوی ˚ یە زێڕەدا هێنا کە لە گیرفانی ئێلەکەکەیدا بوو.

پەردە دادرابووەوە. ئورکسترەکە هەنووکە خەریک بوو ئاهەنگی ڤالسی لێدەدا.

دوروا گوتی:- چۆنە پیاسەیەک بە ناو ئەم ڕاڕەوە بازنەییەدا بکەین؟

- بەدڵی تۆ.

لە لۆجەکەیان هاتنە دەرێ، یەکسەر شەپۆلی پیاسەکەران ڕایماڵین. کەوتنە ناو ئاپۆڕای حەشیمەتەکەوە، ئاپۆڕاکە بە خێرایی ڕایدەماڵین و، جگە لە ئاپۆڕایەکی کڵاو بەسەر، هیچ کەسێکی دیکەیان لەبەردەم خۆیانەوە نەدەبینی. کیژان دوو بەدوو، بە ئاسانی ڕێگایان لە نێو ئاپۆڕای تێکرژاوی پیاواندا دەکردەوەو لە نێو ئانیشکان و سینگ و پشتاندا، وەکو ئەوەی لە ماڵی خۆیاندا بن، زۆر بە ئاسانی، وەکو چۆن ماسی بە نێو ئاودا دادەخزێن، بەو ئاوایە دادەخزین و ڕێی خۆیان دەکردەوە.

دوروا، شاد و شەنگوڵ، خۆی بە لێشاوی ئاپۆڕاکە سپاردبوو. هەوای جەوەکە زۆر ناخۆش و نادروست بوو، ئیدی لە دووکەڵی جگەرە و بۆنی لەش و عەتری جۆراوجۆردا پەنگابووەوە، بەڵام دوروا، گوێی لێنەبوو، شاد و بێخەم ئەم هەوا پیسەی هەڵدەمژی. لێ فورستیە هانکەهانکی پێکەوتبوو، ئارەقەی دەردەدا و دەکۆکی، بە دوروای گوت: - با بڕۆینە ناو حەوشەکە.

بەدەستە چەپا پێچیان کردەوەو خۆیان بە حەوشەیەکی سەرگیراودا کرد، کە دوو حەوز و فوارەی گەورە و ناشیرین تا ڕادەیەک هەواکەیان فێنک دەکردەوە. هەندێک پیاو و ژنان لە ژێر دار و دەوەنێن سوورە چێو و سەرووی کێویدا کە لە ئینجانە وگوڵدانی دارینی گەورەدا ڕوێنرابوون

و، لەپشت مێزێن ئاسنینەوە ڕۆنیشتبوون و ساردەمەنی و ڤەخارنی تەزییان دەخواردەوە.

فورستیە گوتی: پێکی بیرەی دیکە دەخۆیتەوە؟

- بەڵێ، بەوپەڕی خۆشحاڵی.

لە دەوری مێزێک دانیشتن و کەوتنە تەمەشای ئەو خەڵکانەی لە هاتوچۆدا بوون. ناو بەناو کیژێک بەدەم بزەیەکی دەستکردەوە، لە بەردەم مێزەکەیان دەوەستا و دەیگوت: " پێکێکم دەدەنێ؟ " . کە فورستیە دەیگوت: " بەڵێ، پێکێک لە ئاوی ئەو حەوزە " ئەوجا بەدەم بۆڵەبۆڵەوە و لەبن لێوانەوە دەیگوت: " بڕۆ، هەی گاجووت " و لێیان دوور دەکەوتەوە. لەوکاتەدا سەر وپۆتراکی ئەو ژنە قژ ڕەشەی کە چەند خولەکێک لەوەپێش ئانیشکی دادابووە سەر قەراخ لۆجەکەی وان، دووبارە پەیدا بوو کە قۆڵی بە قۆڵی دۆستە قژ زەردەکەیدا کردبوو و پیاسەیان دەکرد. ئەم دووانە لە ڕاستیا جووتێکی جیاوازیان پێکدەهێنا.

ژنە قژ ڕەشەکە، کە چاوی بە دوروا کەوت بزەیەکی بۆکرد، وەکو ئەوە بوو، نیگاکانیان، پێشوەختە، ڕاز ونیازێکی تایبەتی و نهێنیان ئەنجام دابێت، کورسیەکی ڕاکێشا و بە ئارامی لە هەنبەر دوروا دانیشت و دەستە خوشکەکەشی لە سەر کورسییەکی دی دانیشاند وئەوسا بەدەنگی بەرز وبە ڕاشکاوی ئەمری کرد: " گارسۆن، دوو شەربەتی هەنار! "

فورستیە حایر و حەپەساو گوتی: " خۆت ناڕەحەت مەکە! "

ژنە قژ ڕەشەکە، بەرسڤی دایەوە: ئەم برادەرەی تۆ دڵی بردووم. بەڕاستی کوڕێکی جوان و قۆزە. لەوە دەچێ، ناچار بە کاری شێتانەم بکات!

دوروا، تەواو پەشۆکابوو و نەیدەزانی چ بڵێت... سمێڵە قیتەکەی با دەدا و گێلانە دەگرژییەوە. گارسۆنەکە شەربەتەکانی هێنا ولە سەر مێزەکەی دانا، جووتە ژن، شەربەتەکانیان یەکبین هەڵدا، ئەوسا هەستان و ژنە قژ ڕەشەکە، سەرێکی دۆستانەی لەقاند و بە باوەشێنەکەی دەستی، سووکێ کێشای بە باسکی دوروا دا وگوتی: " سوپاس گورپەی ئازیزم، لەوە دەچێ زمانت قووت دابێت. "

هەردووکیان بە ناز و کریشمە لەوێندەر دوور کەوتنەوە.

هەنگێ فورستیە، لە قاقای دا:

– هاوڕێی ئازیز، بە خۆتیش دەزانی، کە بە ئاسانی دڵی ژنان دەبەی؟ دەبێ، ئاگات لەم بەهرەیەت بێ. ئەنجام ئەم بەهرەیە، ڕەنگە بتگەیەنێتە جێگایەکی باش.

کەمێک بێدەنگ بوو، پاشان دووبارە، بە ڕاوێژ و تۆنی خەڵکانی خەیاڵپەرەوە، کە بە دەنگی بەرز قسان دەگەڵ خۆدا دەکەن گوتی:– پیاو دەتوانێ لە ڕێگای ژنانەوە زۆر بلەز بگاتە شوێنانی بەرزی بەرز.

چونکە دوروا، حەپەساو، لێو بەخەندە، هەر بێدەنگ بوو و هیچی نەدەگوت، پرسی:– تۆ هەر دەمێنیتەوە؟ من دەڕۆم، شەکەت بووم.

دوروا، لەبن لێوانەوە گوتی:– بەڵێ، کەمێکی دی دەمێنمەوە، هێشتا هەر ئێوارەیە.

فورستیە هەستا :– زۆرچاکە، کەواتە تا سبەینێ خواحافیز. خۆ لە بیرت نەچووە؟ ژمارە هەڤدە، کۆڵانی فونتێن، سەعات حەوت و نیو.

- باشە، سبەی. سوپاس.

تەوقەیان دەگەڵ یەکدا کرد و یارۆی ڕۆژنامەوان ڕۆیی.

هەرکە فورستیە لە نێو حەشامەتەکەدا ون بوو، دوروا هەستی بە ئازادی خۆی کردو ، دووبارە بە خۆشحاڵییەوە، دوو سکە زێڕەکەی ناو گیرفانی سەح کردەوە، ئەوسا هەستا و بەنیگای جسوجۆئامێزەوە، بە نێو ئاپۆڕاکەدا کەوتەڕێ. زوو بەزوو هەر دوو ژنە قژ ڕەش و قژ زەردەکەی دۆزینەوە، کەبە کەش وفشەوە بە نێو ئاپۆڕای پیاوەکاندا پیاسەیان دەکرد.

یەکڕاست بەرەولای وان ڕۆیی، لێ وەختایەک گەییە نزیکیان، دیسان جورئەتی نەکرد.

ژنە قژ ڕەشەکە گوتی:- زمانت دۆزییەوە؟

دوروا، بە پچڕپچڕی گوتی: ئەوەی ڕاستی بێ... بەڵام نەیتوانی هیچ قسەیەکی دی بکات.

هەرسێکیان وەستابوون، ڕەق ڕاوەستابوون، ڕێگەی خەڵکەکەیان گرتبوو.

ژنە قژ ڕەشەکە گوتی:- دێی بۆماڵی من؟

دوروا، کە لە خۆشیا دەلەرزی، بلەز گوتی:- بەڵێ، بەڵام تەنیا یەک " لوی " م لە گیرفاندایە.

- قەیدی ناکا.

ژنە قژ ڕەشەکە، وەکو نیشانەی دۆستایەتی، دەستی خستە ژێربالی دوروا. وەختایەک لە تەمەشاخانەکە ( نمایشگە ) وەدەرکەوتن، دوروا، لە بیری ئەوەدا بوو کە دەیتوانی بەو بیست فرانکەی بۆی دەمایەوە، دەستێ جلکی باش بۆ میوانیەکەی سبەی شەو بەکرێ بگرێت.

( ٢ )

- بێ زەحمەت ماڵی جەنابی فورستیە؟
- نهۆمی سێیەم، بە دەستە ڕاستدا.

دەرگاوانەکە، بە ڕاوێژێکی مەحەبەت ئامێز و بە ڕوویەکی خۆش کە نیشانەی ڕێز و حورمەت بوو سەبارەت بە کرێچییەکەی نهۆمی سێیەم وەڵامی دابووەوە. جۆرج دوروا، بە قاڵدرمەکاندا هەڵگەڕا، کەمێک ناڕەحەت و بڕێک نیگەران و هەراسان بوو. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیا جلکی شەوی فەرمی لەبەر کردبوو و لە سەر و وەزعی خۆی ڕازی نەبوو. هەستی دەکرد، سەراپای پڕە لە عەیب و ئیراد: هەر لە پووتە بێ ڕەونەقەکانیەوە، کە هەرچەندە ناسک و جوان بوون، چونکە پێیەکانی بچووک بوون، بەڵام نوێ نەبوون، بیگرە تا دەگاتە کراسەکەی کە هەر ئەو ڕۆژە بەیانیەکەی لە موغازەکانی لۆڤەر بەچوار فرانک و نیو کڕی بوونی و تازە دەقی یەخەکەی خەریک بوو دەشکا، هەرهەمووی ئیراد و عەیب بوو. ئەو کراسانەی کە هەموو ڕۆژێک لەبەری دەکردن، ئەوەندە کۆن بووبوون، کە نەیتوانی بوو سوود لە باشترینیان وەربگرێت.

پانتۆڵەکەی زۆر دەڵب بوو، نەک پڕ بەبەری نەبوو، بەڵکو وادەهاتە بەرچاو، لە هەر هەنگاوێکا لەلاق و لەتەرییەوە بئاڵێت. بەهەرحاڵ ئەو جلکە پڕ چرچ ولۆچانەی بەکرێ وەری گرتبوون، قەت دەگەڵ ئەو لەش و لارەدا کە بە ڕێکەوت لەبەری کردبوون، تێکیان نەدەکردەوە. تەنیا چاکەتە درێژەکەی خراپ نەبوو، هەرچەندە ئەویش لە ناو قەدەوە، زۆر بەدەن چەسپ بوو.

بەدەم دڵە خورپە و نیگەرانیەوە، بەخاوی بە قالدرمەکاندا سەر دەکەوت و لە خەم و پەژارەی ئەوەدابوو، نەبا سەر ووەزع و ڕواڵەتی مایەی پێکەنین بێ و ڕووی ئەو مەجلیسەی نەبێت، لە ناکاوا تووشی پیاوێک بوو کە بە جلکی فەرمی تەواوەوە، تەمەشای ئەوی دەکرد. ئەوەندە نزیکی یەک بوونەوە، کە دوروا ویستی کەمێک خۆی لادا تا ئەو پیاوە ڕەت بێت. بەڵام حایر و حەپەساو لەجێی خۆی ڕەق ڕاوەستا: خۆی بوو، لە باڵا ڕوانێکا ( ئاوێنەی گەورە ) کە لە نهۆمی یەکەمەوە تا خواری خوارەوە بەرز بوو و هەموو ڕاڕەوەکە و پلیکانەکان و شتەکانی دیکەی نیشان دەدا و دەنواند، خۆی بینییەوە. کە بینی سەر ووەزعی زۆر لەوە ڕێک وپێکترە کە وێنای کردبوو، زۆر دڵی خۆش بوو، شادی لە سەراپای نیشت.

چونکە لە نشیمەنەکەی خۆیدا، جگەل ە ئاوێنەیەکی بچووکی ڕدێن تاشینی نەبوو، نەیتوانی بوو سەراپای خۆی تێدا ببینێت، چونکە هەموو وردەکاری جلەکانی و خۆ ڕازاندنەوەکەی بەتەواوەتی لەو ئاوێنە بچووکەدا بەدیار نەکەوتبوو، زیاد لە پێویست خەم و پەژارەی سەر ووەزعی خۆی بوو، بێهودە هەراسانی ئەوە بووبوو کە نەبا ببێت بە گەپجاڕی ئامادەبووان.

هەنووکە کە لە ناکاوا سەراپای خۆی لە باڵانماکەدا (نەینکا مەزن) بینی بوو، هەوەڵجار خۆی نەناسی بووەوە، خۆی بەکەسێکی دی زانی بوو، بە پیاوێکی دەوڵەمەند و پڕ پۆشتە و پەرداخ، کە زۆر خۆشپۆش و کەشخە هاتبووە بەرچاوی.

هەنووکە دوای ئەوەی بە دیقەت لە سەراپای خۆی ڕامابوو، ئیدی دڵنیا بووبوو کە ڕواڵەت و سەروسیمای پەسندە و هیچ ئیرادێک هەڵناگرێت.

ئەوسا وەکو ئەو ئەکتەرانەی کە مەشق لە سەر دەورەکانیان دەکەن، لە ئاوێنەکەدا ڕوانیە جووڵە و ڕەفتارەکانی خۆی. بزەیەکی کرد، دەستی بە مەبەستی تەوقەکردن بردە پێشەوە، هەندێک جووڵەی نواند، هەستەکانی خۆی دەربڕی: سووکە مەشق و ڕاهێنانێکی سەبارەت بە خوشحاڵی، بە جۆر و ڕادەی بزەکردن و نیگاکردن بۆ ئەوەی پیاو ببێتە مایەی سەرنج و پەسندی خانمان، کرد، بە شێوەیەک کە خانمان حاڵی بکات گوایە ستایشیان دەکات، ئارەزوویان دەکات.

دەرگای سەر پلیکانەکان ڤەبوو، ترسا یەکێک لە میوانەکان دۆستی خۆی بێ و ئەو بەو حاڵەوە بدینێت کە خەریکە قسان دەگەڵ خۆیدا دەکات و ئەدا و ئەتوار دەنوێنێت، بۆیە بلەز بە قاڵدرمەکاندا هەڵگەڕا.

وەختێک گەییە پاگەردی (سەحن) نهۆمی دووەم، ئاوێنەیەکی دی بینی، کەمێک پێی سووک کرد، تا بەدەم سەرکەوتنەوە، خۆی لە ئاوێنەکەدا بدینێ و تەمەشای ڕواڵەت و قەدوباڵای خۆی بکات. بەڕاستی سەرو ڕوخسار و قەد وباڵای باش هاتە بەرچاو. باش ڕێی دەکرد. متمانەیەکی زۆر، ڕۆحی سەرڕێژ کرد. بێگومان بەم سەر ووەزع و بەو نیازەوە کە لە دڵی خۆیدا بەتەمای بوو، بەو متمانە و ورەیەوە کە هەیبوو، لە ئایندەدا سەرکەوتوو دەبێت. حەزی دەکرد پلیکانەکانی دوا نهۆم بە غاردان ببڕێت و سەربکەوێت. وەختایەک گەییە بەردەم ئاوێنەی سێیەم،

وەکو خووی هەمیشەیی، سمێڵی بادا، کڵاوەکەی داکەند تا قژەکەی ڕێک بخات، وەکو زۆرجار بە خۆی گوتبوو، لە بن لێوانەوە دووبارەی کردەوە: " ئەمەش ئەو دەعوەتە دڵگیرەی کە چاوەڕوانی بوویت " ئەوسا دەستی برد و پلی بە زەنگەکەوە نا.

دەرگا زوو بە زوو کرایەوە و دوروا خۆی لە هەنبەر پێشخزمەتێکدا بینییەوە کە دەستێک جلکی ڕەشی فەرمی پۆشتەی لەبەردا بوو، ڕدێنی پاک تاشی بوو و ڕەفتار و سەروسیمای ئەوەندە ڕێک وپێک بوو کە دوروا، جارێکی دی، بێئەوەی خۆشی بزانێت بۆ، تەواو هەراسان بوو و پەشۆکا: وادیاربوو، لە نائاگایی خۆیدا، جل وبەرگ و سەر و ڕوخساری خۆی، دەگەڵ هی یارۆی پێشخزمەتەکەدا بەراورد دەکرد. یارۆی پێشخزمەت کە پێڵاوی بریقەداری لە پێدا بوو، باڵاپۆشەکەی دوروا، کە دابووی بەسەر دەستیا، تا پەڵەکانی نەیەنە دیتن، لەدەست وەرگرت و پرسی: - بڵێم کێ هاتووە؟

- جۆرج دوروا.

پێشخزمەتەکە، لە پشت دەرگای چوونە ژوورەوەی هۆڵەکەوە بە دەنگی بەرز ناوی ئەوی ڕاگەیاند.

لێ دوروا، لە ناکاوا پەشۆکا، کەوتە هانکە هانک، لە ترسا قەڵەمی دەست وپێی شکا، گۆت بوو. دەیویست یەکەم هەنگاو بنێتە ئەو دنیایەوە کە حەزی لێدەکردو خەونی پێوە دەبینی وخەیاڵی پێوە لێدەدا. وێڕای ئەمەش، هەر چووە پێشێ. ژنێکی گەنجی قژزەرد، لە وەتاغێکی گەورەدا، کە وەکو گوڵخانە پڕبوو لە دار و درەخت و زۆر ڕوناک بوو، بەتاقی تەنیا وەستا بوو و چاوەڕوانی دەکرد.

دوروا، هایم و حەیران لە جێگای خۆی ڕەق ڕاوەستا. ئەم خانمەی بە ڕووی ئەوەوە پێدەکەنێ کێ بوو؟ پاشان بیری کەوتەوە کە فورستیە ژنی هێناوەو، بیری ئەمەی کە ئەم ژنە خشیک و قژ زەرد و لەبارە ژنی دۆستەکەیەتی، دووبارە دووچاری پەشۆکانی کرد.

بە دەمە لاڵکێوە گوتی: " خانم، من... " ژنە گەنجەکە دەستی بۆ بردە پێشێ و گوتی: " دەزانم ئاغا، شارل دیدارەکەی دوێشەوتانی بۆم گێڕاوەتەوە و، زۆر خۆشحاڵم کە بە بیریا هاتووە، تکا لە ئەنگۆ بکات، کە ئەمشەو شام لەگەڵ ئێمەدا بکەیت. "

دوروا، سووری سوور بووەوە، تیامابوو کە چ بڵێت، هەستیکرد ژنە گەنجەکە، خەریکە سەراپای دەداتە بەر نیگا و دەیەوێ هەڵی بسەنگێنێ و قەزاوەتی دەربارە بکات. حەزی دەکرد تەوازی بۆ بێنێتەوەو سەبارەت بە سادەیی و ساکاری جل وبەرگ وسەر وسیمای، هەندێک ڕوونکردنەوە بدات، لێ هەرچی سەری هێناو و سەری برد، هیچی بەبیردا نەهات و زاتی نەکرد سەبارەت بەم مەسەلە گرینگە سەری قسان بکاتەوە.

بۆیە لە سەر ئەو موبیلەی کە ژنە گەنجەکە نیشانی دابوو، ڕۆنیشت. هەستی کرد مەخمەڵە نەرمەکەی ژێری چرچ و لۆچ بوو، ڕوچووە ناوی، موبیلەکە بە نەوازشەوە ئەوی لەخۆ گرت، پشتی و دەسکەکانی حاڵەتێکی خۆشی وسەرمەستیان بەو بەخشی، هەنگێ وای هاتە بەرچاو کە پێی ناوەتە ژیانێکی تازە ودڵگیرەوە، بۆخۆی کەسایەتیەکی پەیدا کردووەو لە ژیانی مەینەتبارو پڕ تاڵاوی ڕابردوو،

ڕزگاری بووە، نیگایەکی خانم فورستیەی کرد و سەیری کرد بۆ یەک ساتیش چاوی لەم نەگواستووەتەوە.

ژنە گەنجەکە، کراسێکی کشمیری شینی کاڵی لەبەربوو. ناوقەد و سینگ و مەمکی، تەواو بەرجەستە کردبوو و لە قاڵبی دابوون، سەری قۆڵەکانی ویەخەکەی، لە تۆڕو ئۆیەی سۆی بوون، قژەکەی کە لە سەر سەری کۆکردبووەوە، لە دواوە کەمێک لوول کرابوو، گەردانەیەکی نەرمی زێڕین، لە ملی هاڵابوو.

نیگای ژنە گەنجەکە، دوورِوای دڵنیا دەکرد، ئەم نیگایە بێئەوەی بزانێ بۆ، نیگای ئەو کیژەی دوێشەوی، کە لە فولی برجر تەعاروفی دەگەڵ کردبوو، وەبیر دێنایەوە. بەم جیاوازیەوە کە چاوانی خانم فورستیە کەوەیی بوون و بە وردە دەماری لاجوەردییەوە کە حاڵەتێکی سەیریان پێدەبەخشی، کەپووی بچووک ، لێوەکانی ئەستوور، چەناگەی نەختێک گۆشتن، ڕوخسارێکی وەسوەسە ئەنگێز، سەرڕێژ لە میهرەبانی و سەرکێشی. یەکێک بوو لەو ڕوخسار ژنانەیەی کە هەر هێڵ و خەتێکی لوتف و جوانیەکی تایبەتی نیشاندەدا، چەمک و مانایەکی تایبەتی هەیە و هەر جووڵەیەکی لە تۆوایە دەیەوێ بڵێت شتێکی لە خۆیدا وەشێردووەتەوە.

خانم فورستیە، پاش سووکە هەڵوێستەیەک پرسی: - لە مێژە لە پاریسیت؟

- نە خانم، چەند مانگێکە. لە هێڵی ئاسن کار دەکەم، لێ فورستیە پێی گوتووم کە دەتوانم بە کۆمەکی وی، لە واری ڕۆژنامەڤانیدا ڕێگەیەک بۆخۆ بکەمەوە.

ژنەی گەنج، بزەیەکی ئاشکرا و میهرئامێزتری کرد، پاشان دەنگی هەندێک نزم کردەوەو لەبن لێوانەوە گوتی: " دەزانم " .

دووبارە دەنگی زەنگی دەرگا بەرز بووەوە. پێشخزمەتەکە ڕایگەیاند: - " خانم دومارل . "

خانم دو مارل، گورج و گۆڵ خۆی بە ژوورا کرد، سەراپای لە جلە تۆخ و سادەکەیا، قاڵبی گرتبوو. تەنیا ئەو گوڵە سوورەی کە لە قژە ڕەشەکەی دابوو، بە تەواوەتی سەرنجی ڕادەکێشا و وادەهاتە بەرچاو کە ڕوخساری بەرجەستە کردووە، تایبەتمەندییە ئەخلاقی و بەدەنیەکانی ئاشکرا کردبوو وحاڵەتی شادمانی و زیتەڵی پێویستیان بەو بەخشیوە. کچێکی بچکۆلەشی بە کراسێکی کورتەوە دەگەڵدا بوو. خانم فورستیە بەرەوپیریان ڕایکرد: - سڵاو کلوتیلد.

- سڵاو مادلین.

جووتە ژن یەکدییان ڕامووسی، ئەوجا کچەکە بە ئەرخایەنی و متمانەوە وەکو خەڵکی گەورە هەنیەی بۆ ماچکردن بردە پێشەوە و گوتی: - سڵاو دۆتمام.

خانم فورستیە، ئەوی ڕامووسی و پاشان میوانەکانی بەیەکدی ناساندن:

- جەنابی جۆرج دوروا، یەکێکە لە هاوڕێکانی شارل.

" خانم دو مارل، دەستە خوشک و خزمی دووری منە. "

ئەوسا لە سەری ڕۆیی: - دەزانی ئێمە لێرەدا، نە هیچ تەشریفاتێکمان هەیە و نە شەرم و لەڕوو دامان، تەواو خۆمانیەن.

پیاوەی گەنج، سەری دانەواند.

دووباره دەرگای هۆڵەکە کرایەوە، پیاوێکی کورتەباڵای قەڵەو وەژوور کەوت، کە قۆڵی لە قۆڵی ژنێکی شۆخ و شەنگ و باڵابەرزدا بوو کە هەم لە پیاوەکە باڵابەرزتر بوو و هەم زۆر لەو گەنجتر بوو، ڕەفتارو جموجوڵی زۆر سەلارانە و بە ویقار بوو. جەنابی ڤالتر هەم نوێنەری ئەنجوومەن بوو و هەم سەرمایەدار، هەم ئەهلی گۆڕینەوەی پارە وپول ودارایی بوو، هەم جوولەکەی خەڵکی باشوور، هەم بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز. هاوسەرکەشی کیژی باسیل راڤالوی بانقداری بناڤ ودەنگ بوو.

دوای ئەوانە، دوا بەدوای یەک جاک ریڤالی زۆر پۆشتە وپەرداخ و نوربر دووڤارن، کە پشت یەخەی جلەکانی، بەهۆی تەماسی قژە درێژەکەیەوە، سوابوو ودەبریقایەوە، وەژوور کەوتن. قژەکەی تاسەر شانەکانی هاتبوو و ، وردە کرێژانی پێوە دەبینرا. بۆینباخە، خراپ بەستراوەکەی لەوە ناچوو نوێ بێت. بە ڕەفتاری دڵپەسەندی تایبەتی پیرەمێرانی خۆش قیافەوە، چووە پێشێ، دەستی خانم فورستیەی گرت و ماچی کرد و بەم جووڵەیە قژە درێژەکەی ڕژایە سەر بازووی ڕووتی ژنە گەنجەکە.

فورستیە، لە دوای هەمووانەوە وەژوورکەوت و عوزرخوازی (تەوازی) بۆ ماتەڵ بوونەکەی هێنایەوە. ماجەرای موریل، ئەوی لە ئیدارەی ڕۆژنامەکە ماتەڵ کردبوو. جەنابی موریل کە نوێنەری توونڕەوی ئەنجوومەن بوو، دەربارەی داوا و قەراری ئیعتیباری دەوڵەت بۆ بە کۆڵۆنی کردنی جەزایر، پرسیارێکی لە وەزیر کردبوو.

پێشخزمەتەکە بەدەنگی بەرز گوتی:- خانم شێڤ ئامادەیە.

هەمووان بۆ هۆڵی نانخواردن چوون. دوروا – یان لە نێوان خانم دوماریل و کیژەکەیدا، دانیشاند. دوروا، جارێکی دی هەستی بە ناڕەحەتی کرد، دەترسا، لە چۆنیەتی بە کاربردنی داب و نەریتی چەقۆ و چەتاڵ و پەرداخاندا، نەشارەزایی و نابەڵەدی نیشانبدات. ژمارەی پەرداخەکان چواردانە بوو کە یەکێکیان شینێکی کاڵ بوو. لە مەیاندا چی دەخۆنەوە؟

تا ئەو کاتەی مژوولی سوپ خواردن بوون، کەس قسەی نەکرد، دوای سوپ خواردن توربردو ڤارن پرسی: " ئەرێ بویەری دادگاییەکەی گوتیەتان خوێندەوە؟ چەند بویەرێکی خۆش وعەنتیکەیە! "

باسەکە سەبارەت بە مەسەلەی زیناکاری بوو ولەگەڵ وەرگرتنی مافی بێدەنگ بوونا، کە ڕووداوەکەی ئاڵۆزتر کردبوو. سەبارەت بەو بویەر و ڕووداوانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەبوونەوە گفتوگۆیەکان خۆمانە و دۆستانە نەبوون، وەکو ئەو قسانە نەبوون کە لە نێوان ئەندامانی یەک ماڵباتدا دەکرێن، بەڵکو وەکو باسی نەخۆشییان بوو لە نێو دوو پزیشکدا، یان گەنگەشەی نێوان دوو میوەفرۆش و بەقاڵ بوو دەبارەی سەوزە و میوە. نەکەس توورە دەبوو و نەبە بیستنی واریقاتەکان سەری دەسوڕما، هەموو لە بیری ئەوەدا بوون. سەدەم و هۆکارە قووڵ و پەنهانەکانی ڕووداوەکان بدۆزنەوەو پەیدا بکەن، ئەوەش بە جۆرە کونجکاوییەکی پیشەیی و بێ موبالاتیەکی ڕەها سەبارەت بە تاوانە کراوەکە. هەوڵیاندەدا هۆکاری

ڕووداوەکە ڕوون بکەنەوە، هەموو ئەو هۆکارە دەروونیانە لە بنج وبناوان بکەن کە بووبووە بایسی سەرهەڵدانی بویەرەکە وئەنجامی زانستیانەی حاڵەتە دەروونییەکە ڕوون بکەنەوە. ژنەکانیش سەریان لەم باس وخواس و بویەرانە دەخورا. دوای ئەوە، بویەر وڕووداوێن دیکە هێنرانە بەر باس و گفت وگۆیان، لە هەموو ئالی و ڕوویەکەوە خرانەبەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە. ئەم شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنانە، بەدیدی کردەیی و ڕەوشی سەوداگەرانی نوچە و هەواڵان تاوتوێ دەکران و ئەنجام دەدران، ئەوانەی کە کارەسات و مەینەتیەکانی ژیانی خەڵکان دێر بەدێر دەکڕن و دەفرۆشنەوە، ڕێک وەکو ئەو کاسبکارانەی کە کاڵاکانیان، لەکاتی پیشاندانیان بە مشتەرییەکانیان، ئەم دیو و ئەودیو دەکەن.

پاشان بابەتی دوئێلێک هاتە ئاراوەو جاک ریڤال سەری قسەی دامەزراند. ئەم بابەتە، لە چوارچێوەی پسپۆڕی ئەودا بوو، هیچ کەسێکی دی مافی ئەوەی نەبوو، لە بارەیەوە قسان بکات.

دوروا، زاتی نەدەکرد تاقە وشەیەک بڵێت، تەنیا جارجارێک تەمەشایەکی سەر وسینگی دراوسێکەی دەکرد. دەنکە ئەڵماسێک بە زنجیرێکی کورتی زێڕەوە، بەگوێی خانم دو ماریلدا شۆڕ بووبووەوە، دەتگوت دڵۆپە ئاوێکە وبە سەر بەدەنێکەوە گیرساوەتەوە. جارجارێ بابەتێکی بیر دەکەوێتەوە و بزەیەک دەنیشتە سەر سەر هەردوو لێوی، سەروسیمایەکی جوان و میهرەبانی لە ڕادەبەدەری هەبوو، وەکو کچۆڵەیەکی کارامەی لەخۆڕا دیتوو، بەبێ پەروا

سەیری هەموو شتێک دەکات و بە کەمێک گومان و دوودڵییەوە دەربارەی ئەو شتانە قەزاوەت دەکات.

دوروا، بێهودە، لە وشەیەک دەگەڕا کە بەخێرهاتنی ئەوی پێبکات، لێ هیچ وشەیەکی بۆ نەدەهات، بۆیە کەوتە نەوازشی کیژەکەی. ئاوی بۆ لە پەرداخەکەی کرد، خواردنی لە قاپەکەی کرد. منداڵەکە کە لە دایکی جدیتر بوو، بە ڕاوێژێکی سەلارانە سوپاسی کرد و بەڕێز و ئەدەبەوە، سەری لەهەنبەر هەر خزمەتێکی ئەودا دادەنەواند و دەیگوت:" زۆر سوپاس، لوتفتان کەم نەبێ قوربان." بە سەروسیمایەکی مەندەوە گوێی لە قسە و ئاخافتنی گەورەکان دەگرت.

خواردنەکان فرە خۆش وبەتام بوون وهەمووان بە لەزەتەوە دەیانخوارد. جەنابی ڤالتر، وەکو دێو خواردنەکەی هەڵمەقووت دەکرد، کەم و زۆر قسەی نەدەکرد، لە ژێر شووشەی عەینەکەکەوە، بە تامەزرۆیی دەیڕوانیە ئەو خواردنانەی کە خزمەتکارەکە بۆی دێنا و بۆی تێدەکرد. نوربردو ڤارن، لە پڕ خۆریدا، هیچی لەو کەمتر نەبوو، جارجار پشکە ساسێک لە دەمیەوە دەچکایە سەر کراسەکەی.

· فورستیە، جدی و خەندە بەلێو، چاوی لە هەموو شتێک بوو و ناوبەناو دەگەڵ هاوسەرەکەیدا، نیگایەکی بەماناوەی یەکدییان دەکرد. وەکو دوو شەریک کارە دژوارەکانیان بە هاوکاری یەکدی ئەنجام دەدا وکار وکاسبیەکەشیان سکەی خۆی وەرگرتبوو.

ڕوخسارەکان دەگەشانەوە، دەنگەکان بەرزتر و قووڵتر دەبوون. هەرساناساتێ سفرەچی و خزمەتکارەکە بە گوێی

میوانەکانیا دەچپاند: " حەزتان لە شەرابی کورتونە یان شاتۆلارۆزتان پێخۆشە؟ " .

دوروا، زیاتر حەزی لە شەرابی کورتون بوو و تامی ئەم شەرابەی لە دەم خۆشبوو، بۆیە هەموو جارێک ڕێگەی بە سفرەچییەکە دەدا کە پەرداخەکەی بۆ لێوانلێو بکات، ئۆخژنێکی خۆش لە سەراپای دەنیشت، سەرمەستیەکی لەزەتبەخش، لە ورگیەوە بۆ کەللەی دەچوو، بە ئازای بەدەنیا بڵاو دەبووەوەو سەراپای دەگرتەوە. هەستی بە ئارامی و چالاکییەکی تەواو دەکرد، ئارامی و ئاسوودەییەکی بەدەنی و دەروونی، فیکری و سۆزداری.

زۆر حەزیدەکرد، قسەیەک بکات، ڕاوبۆچوونێک دەرببڕێت، سەرنجی ئامادەبووان ڕاکێشێت، هەمووان گوێی لێبگرن، بایەخی بدەنێ، وەکو ئەو خەڵکانەی کە خەڵکی بەتاسە وبایەخەوە گوێ لە بچووکترین قسەیان دەگرن.

بەڵام قسەکان هیچ کاتێ لە دوایی نەدەهاتن، پرس و بابەتی تازە دەهاتنە پێشەوە. بەیەک وشە، بەیەک پەیڤی ناچیز، لە بابەتێکەوە دەچوونە سەر بابەتێکی دی. دوای قسەکردن دەربارەی هەموو نووچە و واریقاتەکانی ڕۆژ و خستنەڕووی هەزاران پرسیار و پەڕینەوە لە بویەرێکەوە بۆ بویەرێکی دی، دووبارە گەڕانەوە سەر پرسیارە گرینگەکەی جەنابی موریل دەربارەی بە کوڵۆنی کردنی جەزایر.

جەنابی ڤالتر، لە نێوان دوو خواردندندا، هەندێک شۆخی و حەنەکی کرد، چونکە ئەو مجێزێکی بە گومان و عامیانەی هەبوو. فورستیە بابەتی وتارەکەی سبەینێی خۆی بۆ هەمووان باسکرد. جاک ریڤال خوازیاری دەوڵەتێکی عەسکەری و عورفی بوو، کە لە کۆڵۆنیەکاندا، زەوی بەو

ئەفسەرانەی کە پتر لە سی ساڵیان لە کۆلۆنیەکاندا خزمەت کردبوو، بدرێت.

ئیدی بۆ پاکانەی ئەم هەڵوێستەی خۆی دەیگوت: بەم شێوەیە کۆمەڵگەیەکی زندوو و پرچالاکی دێننە ئاراوە، چونکە ئەو خەڵک و ئەفسەرانە، لە میانی ئەو ساڵانەدا، ئەو وڵاتەیان بە تەواوی ناسیوە و پەیوەندییان دەگەڵدا پەیدا کردووە و زمانی خەڵکی ئەوێندەر فێربوون و شارەزای هەموو پرسە گرینگ وکێشە وئاریشە لۆکاڵییەکانی ئەوێندەر بوون، کە خەڵکانی تازە بچن بۆ ئەوێ، ڕوو بەڕووی ئەو بابەتە دەبنەوە و بۆیان چارەسەر ناکرێت.

نوربردوڤارن، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- بەڵێ، شارەزای هەموو شتێک دەبن، جگە لە کشتوکاڵ و جووتیاری. زمانی عەرەبی فێردەبن، بەڵام هەرگیز نازانن چەوەندەر چۆن داچێنن و بەرهەم بێنن و گەنم چۆن تۆو بدەن. لە شمشێر بازیشدا مەعلان دەبن، بەڵام لە پەین کردنی زەوی وزار و جۆری پەین و زەویەکەدا، تەقەی سەریان دێ. بە پێچەوانەوە پێویستە دەرگای وڵاتە تازە داگیرکراوەکان، بەڕووی هەموو خەڵکیدا بکرێتەوە. خەڵکانی فاما و بەئاوەز جێگای خۆیان لەو وڵاتانەدا دەکەنەوە و ئەوانی دی دەستەوستان دەبن، ئیدی ئەمە سوننەت و یاسای کۆمەڵایەتیە.

سووکە بێدەنگیەک باڵی بەسەردا کێشان. هەموو بزەیان کەوتەسەر لێو. جۆرج دوروا، زاری هەڵێنا و بەدەنگێک کە بووە بایسی سەرسامی خۆیشی، چونکە هەرگیز ئەو جۆرە دەنگەی لە زاری خۆی نەژنەوتبوو، گوتی:

- ئەوەی لەوێندەر کەمە، زەوی بەپیت و بە بڕشتە. موڵک و زەوی بەپیت و بڕشتی وەکو ئێرە یەجگار گران دەکەوێ، پاریسییانی دەوڵەمەند، وەکو سەرمایەگوزاری ئەو موڵک و زەوییانەیان کڕیوە. ئاوەدان کەرەوانی ڕاستەقینە، ئەوانەی کە لە دەستکورتیدا نانیان نییە بیخۆن و خۆیان ڕەهەنەی ئەوێندەر کردووە، بۆ سارا و بیابانەکان دوور خراونەتەوە، بۆ ئەو سارا و بیابانانەی لەبەر کەم ئاوی هیچی لێ ناڕوێت.

هەموو تەمەشایان دەکرد. هەستیکرد سوور هەڵدەگەڕێت. جەنابی ڤالتر پرسی:- جەناب ئێوە شارەزای جەزایر هەن؟

دوروا، بەرسڤی دایەوە: بەڵێ جەناب. بیست و هەشت مانگی خزمەتەکەم لەوێندەر بەسەر بردووە و لە سێ دەڤەری جۆراوجۆر ژیاوم.

نوربردوڤارن، کە لە ناکاوا بابەتەکەی موریلی لە یادبردبوو، دەربارەی وردەکاری داب و نەریتێک کە لە زاری ئەفسەرێکی ژنەوتبوو، لەوی پرسی، ئەم داب و نەریتە دەربارەی جەماوەرێکی سەیر و بچووک بوو بە ناوی مذاب ( تواوە ) لە ناو جەرگەی سارادا، لە وشکترین بەشی ئەم دەڤەرە گەرمەسێرەدا.

دوروا، کە دوو چەلان ئەو شوێنەی بینی بوو، کەوتە باسی داب و نەریت و خوو خدەی ئەم دەڤەرە سەیرە، ئەو شوێنەی کە هەر دڵۆپە ئاوێک بە ئەندازەی کێش و سەنگی خۆی زێڕی دێنا، شوێنێ بوو کە هەریەکێک لە ئاکنجیانی، بەهەموو خزمەتگوزاریە گشتیەکانیا ڕادەگەیی، شوێنێ بوو

که سەرڕاستی وڕاستگۆیی لە هەڵسوکەوت و سەوداو مامەڵەدا، لە هەر وڵاتێکی شارستانی، بەرقەرارتر بوو.

بە ئاو وتاوێکی زۆرەوە قسەی کرد، نەشئەی شەراب و مەیلی شادکردنی ئامادەبووان، هێنابوویە جۆش، چەندین چیرۆک و سەربهوردی دەربارەی بویەر و بەسەرهاتێن دەورانی سەربازی خۆی، ژیانی عەرەبان و بویەری شەڕ گێڕایەوە. تەنانەت توانی کۆمەڵێک وشەی تەڕ وبڕ و ڕەنگین بۆ وەسفی ئەم سەرزەمینە ڕووتەن و بێ ئاوە بەکاربەرێ، سەرزەمینانی پەرت و دوورە دەست کە لە ژێر گڕی سەرکێشی خۆرا دەسووتا. هەموو ژنەکان چاویان بڕی بووە زاری وی. خانم ڤالتر، لەبن لێوانەوە گوتی: " تۆ دەتوانی ئەم بیرەوەریانەت بکەی بە زنجیرەیەک وتاری دڵگیر وبڵاوی بکەیتەوە. " هەنگێ جەنابی ڤالتر، لە سەرووی شووشەی عەینەکەکەیەوە، تەمەشایەکی دوروای کرد، بە هەمان شێوە کە بۆ تەمەشای خواردنەکان لە خوارەوەی شووشەی چاویلکەکەیەوە تەمەشای دەکرد.

فورستیە، دەرفەتی هێنا وگوتی:- سەرۆکی ئازیزم، پێشتر باسی جەنابی جۆرج دوروام بۆ جەنابتان کردبوو و داوام کردبوو کە ئەو وەکو یارمەتیدەری من بۆ ئامادەکردنی نووچە و هەواڵێن ڕامیاری دابمەزرێنن. لەوەتای مارامبۆ لەلای مە ڕۆییوە، کەس نییە بڕوات نوچەی گەرماوگەرم و نهێنیم بۆ کۆبکاتەوەو ئەنجام لاپەڕەی ڕاڤەی سیاسی ڕۆژنامەکەمان لاواز بووە و وەکو پێویست نییە.

بابا ڤالتر، مەسەلەکەی زۆر بەهەند وەرگرت، چاویلکەکەی داکەند تا بەباشی ولە نزیکەوە دوروا هەڵسەنگێنێت. ئەوسا گوتی:

- گومانی تیانییە کە جەنابی دوروا، بیری نوێ و تازەی پێیە. ئەگەر سبەینێ سەعات سێی پاش نیوەڕۆ بێت بۆ لای من تا لەمبارەیەوە قسان بکەین، ئیدی هەموو کارەکانی دی دەبڕینەوە.

پاشان، دوای سووکە هەڵوەستەیەک ڕووی کردە یارۆی گەنج و لە سەری ڕۆیی:

- بەڵام لە پێشدا زنجیرەیەک وتاری کورت و پوختمان دەربارەی جەزایر بۆ بنووسە. لەم وتارانەدا، بەدەم گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانتەوە، مەسەلەی کۆلۆنیەکانیش، بەوجۆرەی کە ئێستا دەتگێڕایەوە، تێکهەڵکێش بکە. ئەم مەسەلەیە بابەتی ڕۆژە، هەواڵی گەرمی ڕۆژە ودڵنیام دەبێتە مایەی پەسندو خۆشی خوێنەران. لێ لەزێکە! یەکەم وتارم سبەی یان دوو سبەی دەوێت، لەم ماوەیەدا کە باسی کۆلۆنیەکان، لە ئەنجوومەندا، دەخرێتە بەر گەنگەشە، دەتوانین بەبڵاوکردنەوەی ئەم گوتارانە سەرنجی خەڵکی بۆلای خۆمان ڕاکێشین.

خانم ڤالتر، بەو ڕاوێژ و گفت ولفتە جدی و دڵگیرەی لە قسەکردنا بەکاری دەبرد و سەرنجی هەمووانی بۆلای خۆی ڕادەکێشا، گوتی:

- دەتوانی ناونیشانێکی جوانیش بۆ گوتارەکانتان هەڵبژێری، بۆ نموونە: " بیرەوەری سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە ئەفریقا "، تۆ چ دەڵێی جەنابی نوربر؟

شاعیری بەتەمەن کە زۆر درەنگ شۆرەتی پەیدا کردبوو و حەزی لە تازە کوڕان نەدەکرد و لێیان دەترسا، بە ڕاوێژێکی سارد گوتی: - بەڵێ، زۆر عالە، بەو مەرجەی کە بابەتەکانیش باڵکێش بن، چونکە نووسینی ئەو شتانە

کاریکی قورسه و، دۆزینەوەی شێوازی تایبەتی بۆ ئەو شتانە، قورسترە، وەکو چۆن لە موزیقادا ڕیتم و ئاهەنگ زۆر گرینگە.

خانم فورستیە، بە نیگایەکی خەنۆڵ و لایەنگرانە دوروای خستبووە ژێر پەڕوباڵی خۆی، نیگای کەسێکی کارامە و ئەزموودار کە دەیەوێ بڵێ: " تۆ سەرکەوتوو دەبیت " . خانم دو مارل، چەند جارێک سەری بۆ لای ئەو وەرگێڕابوو، دەگەڵ هەر جووڵەیەکدا، ئەڵماسی گوارەکەی کەوتبووە جۆلانە، لە تۆ وایە ئەم دڵۆپە ئاوە ناسکە دەیویست لە هەر ئان و ساتێکا لە گوێی جیابێتەوە و بکەوێت.

کچە چکۆلەکەشی، هەر ئارام و بێ جووڵە دانیشتبوو چاوی لە قاپەکەی بڕی بوو.

لەم کاتەدا یارۆی خزمەتکار و سفرەچی، بەدەوری مێزەکاندا سوڕایەوە وشەرابی جوهانیسبورگی لە پەرداخە شینەکان کرد. فورستیە، پەرداخەکەی هەڵبری و بەدەم ڕێزەوە بۆ جەنابی ڤالتر گوتی: " بە سەلامەتی و بەهیوای سەرکەوتنی هەمیشەیی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز ".

هەموو سەری ڕێز و نەوازشتیان بۆ خاوەن ڕۆژنامەکە دانەواند.

جەنابی ڤالتر، بزەی دەکرد و دوروا، کە سەرمەستی سەرکەوتن بوو، پێکەکەی بەیەک بین هەڵدا، وای وێنا دەکرد ئەگەر لە جیاتی پەرداخێ یەک جلیکانەشی لەبەردەستدا بوایە بەیەک بین دەیخواردەوە، دەیتوانی گایەک بخوات، یان شێرێک بخنکێنێ، هەستی بە هێزێکی میتامرۆڤانی لە ئەندامانی لەشیا دەکرد، لە ناخی خۆیا هەستی بە بڕیارێکی

نەگۆڕ و ئومێدێکی بێ پایان دەکرد. وای هەستدەکرد لەماڵی خۆیدایە، ئیدی لە نێو ئەم خەڵکەدا شوێنێکی بۆ خۆی کردبووەوە، پێگەیەکی پەیدا کردبوو. بە ئاسوودەیی و ئەرخایەنییەکی تازەوە، چاوی بە ئامادەبوواندا دەگێڕا. بۆ یەکەمجار، زاتی کرد کە بە خانمەکەی تەنیشتی بڵێت:

- خانم، گوارەکەتان زۆر جوانە، بە عەمراتم گوارەی لەم گوارانەی تۆ جوانترم نەدیتووە.

خانم دوماریل، ئاوڕێکی لای ئەوی دایەوە و بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

- ئەمە بیرۆکەی خۆم بوو کە ئەڵماسەکان بەم سادەییە بکەم بەم زنجیرانەوە. ئینسان وا هەست دەکات، بە ڕاستی دڵۆپەیەک ئاونگە، وانا؟

دوروا، نیگەرانی ئەو پرکێشیە بوو کە کردبووی، دەترسا کە نەبا قسەیەکی گەوجانە بکات، بۆیە بەترس و لەرزەوە و لە بن لێوانەوە گوتی: - زۆرجوانە، بەڕاستی باڵکێشە.... بەڵام نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت، کە گوێیەکانی تۆ ئەو جیلوەو جوانیەیان پێبەخشیوە.

خانم دوماریل، بە نیگایەک سوپاسی کرد، بە نیگایەک لەو نیگا ناسک و قووڵە ژنانانەیەی کە تا قووڵایی دڵی بەشەر ڕۆدەچن.

دوروا، کە سەری وەرگێڕا، نیگای لە نیگای خانم فورستیە هەڵەنگوت، نیگای میهرەبان و پرسۆز بوو، لێ هەستیکرد، جۆرە شەیتەنەت و دنەدانێکیان تیا دەبینێ.

هەنووکە، هەموو پیاوەکان پێکەوە، بە دەست جووڵان و بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. باسەکەیان باسی نەخشەی گەورەی ڕێگای ڕێی ئاسنی شار بوو. ئیدی ئەم قسانە تا لە

خواردنی میوه و محەلەبی و شیرینی بوونەوە، هەر درێژەی کێشا، ئەوەش دوای ئەوەی هەرکەسە وباسی سستی و خاوی هاتوچۆی لە پاریس دا کرد، باسی کێشەی دەست و پێگیری تراموای کرد، باسی سەریەشەی گالیسکەی بارهەڵگری ناو شارو بێئەدەبی عەرەبانچیەکانیان کرد.

پاشان هەمووان لە ژووری نانخواردن هەستان و چوون بۆ هۆڵی چاوەڕوانی تا قاوە بخۆنەوە. دوروا، هەر بۆ سوعبەت و شۆخی قۆڵی بە قۆڵی کچۆڵەکەی خانم دوماریلدا کرد. کچۆڵەکە بە ئارامی و سەلاری سوپاسی کرد و خۆی لەسەر نووکی پێ بەرز کردەوە تا بتوانێ دەستی بگەیەنێتە ئانیشکی دوروا.

وەختێ چووە ناو هۆڵەکەوە، دووبارە هەستی کرد، چووەتە ناو گوڵخانە و گوڵگەشتێکەوە. دارخورمای گەورە کە لق وپۆپیان بە هەر چوارنکاڵی هۆڵەکەدا هاوێشتبوو، تا بن میچەکە ڕۆیی بوو و لەوێندەرەوە وەکو فوارە بڵاو بووبوونەوە.

لەم لاو لەولای موغەیرییەکەوە، درەختێن کایوچو، بەقەدی لوولەی وەکو ئەستوون، گەڵا بەرز و سەوزە تۆخەکانیان چین چین نیشتبوونە سەریەک، دوو دەوەنی نەناسراو، لوولەیی و غەرقی گوڵ، یەکێکیان پەمەیی و ئەوی دییان سپی، بەدیار پیانۆکەوە بوون، کە سەیرت دەکردن لە دەستکرد دەچوون، ئەوەندە جوان بوون پیاو باوەڕی نەدەکرد سروشتی بن.

هەوا فێنک بوو، سەرڕێژ بوو لە عەترێکی خۆش و نامەعلووم کە نەدەزانرا چ عەتر و بۆنێکە و چ ناوێکی هەیە.

دوروا، که هەنووکە بە تەواوی خۆی بەرزەفت کردبوو، بە دیقەت کەوتە تەمەشای ئاپارتمانەکە. مەزن نەبوو. جگە لە دار ودەوەنان هیچ شتێکی دیکە باڵکێش نەبوو، سەرنجی ڕانەدەکێشا، هیچ ڕەنگێکی زەق بەرچاو نەدەکەوت، بەڵام پیاو لە ناویدا هەستی بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەکرد، دڵگیر بوو، پیاو لە بەدەنی خۆیدا هەستی بە حاڵەتێکی وەکو نەوازش دەکرد.

دیوارەکانی بە قوماش وپارچەێن قەیمی تەخت وەنەوشەیی و گوڵ وردی ئاوریشمنی زەردڕەنگ داپۆشرابوو. گوڵەکانی هەر بە ئەندازەی مێشێک دەبوون. پەردەێن ئەستووری کەوەیی یان بە ڕەنگی جلکی سەربازی، کە قەراخەکانی بە گوڵە مێخەکی سوور گوڵدۆزی کرابوون، دەرگاکانیان دادەپۆشت. کورسی هەمەجۆر و ئەندازەجیا لە گۆشە وکەناری ئاپارتمانەکەدا دانرابوون: کورسی پشت بەرز، قەنەفەێن دەسکداری بچووک و گەورە و تەپڵەک و چوارپایە کە ڕووکەشەکانیان لە پارچەی ئاوریشمی مۆدی لویسی شازدەیەم یان مەخمەڵی جوانی ئوتریشت بوو، کە تەختەکانیان زەردباوی گوڵ هەناری بوو.

- قاوە دەخۆیتەوە، جەنابی دوروا؟

خانم فورستیە، بە دەم بزەیەکی دۆستانەوە، کە هەرگیز لە لێوەکانی نەدەبڕا، قاوەیەکی داێ.

- بەڵێ خانم، زۆر مەمنوونم.

دوروا فینجانەکەی لێوەرگرت و کاتێ بەوپەڕی نیگەرانی هەستایە سەر پێ، تا بە مقاشە زیوەکە کڵۆ قەندێک لە نێو قەندانەکە، کە کچۆڵەکە لەبەردەمیا ڕایگرتبوو،

هەڵیگرت، ژنە گەنجەکە بە دەنگێکی نەوی پێی گوت:- تا دەتوانی دڵی خانم ڤالتر ڕابگرە.

پێش ئەوەی دوروا، فریای ئەوە بکەوێ بە تاقە وشەیەک وەڵامی ئەو بداتەوە، ئەو لەوێندەر دوور کەوتەوە

سەرەتا قاوەکەی خواردەوە تا نەبادا دەستی بلەرزێت و برژێتە سەر مافوورەکە، پاشان بە خەیاڵێکی ئاسوودەتر، کەوتە گەڕان بە دووی هەنجەتێکا کە لە هاوسەری سەرۆکە تازەکەی نزیک ببێتەوە تا سەری گفت وگۆی لەگەڵدا بکاتەوە.

لە ناکاوا بینی خانم ڤالتر فینجانە خاڵییەکەی بەدەستەوەیە و چونکە لە مێزەکەوە دوور بوو نەیدەزانی لە کوێی دابنێت. دوروا، بلەز بەرەولای ئەو ڕۆیی و گوتی:- کەرەمی دەکەی خانم؟

- سوپاس، ئاغا.

فینجانەکەی لە دەستی وەرگرت، بردی لە سەر مێزەکەی دانا و گەڕایەوە تەنیشت ئەو.

- خانم، خۆزگە دەتزانی کاتێ لەو بیابانە کاکی بەکاکی وبێ ئاو و ڕووتەنەدا خەریکی خزمەتی عەسکەری بووم، چەند لەزەتم لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز دەبینی و چ سەرگەرمیەکی گەورە بوو بۆ من. تاقە ڕۆژنامەیەکە کە خەڵکی لە دەرێی فەرەنسادا دەتوانن بیخوێننەوە، چونکە لە هەموو ڕۆژنامەکانی دی ئەدەبی ترو، بەزەوق و سەلیقەترە و یەکهاوی و یەک نەوا نییە و پیاو ماندوو ناکات. بابەتەکانی هەمەجۆرن و هەموو خوێنەرێک بابەتی دڵخوازی خۆی تیا دەبینێتەوە.

خانم ڤالتر، بە خەمساردییەکی دۆستانەوە بزەیەکی بۆ کرد وبە سەنگینی گوتی:

- جەنابی ڤالتر بە زەحمەتێکی زۆر توانیویەتی ڕۆژنامەیەک بێنێتە ئاراوە کە جەوابگۆی هەر زەوق و سەلیقەیەکی نوێ بێ.

ڕوویان کرایەوە، دوروا، بە ئاسانی و ئاسایی قسەی دەکرد، دەنگی زولاڵ و خۆش، نیگای باڵکێش و دڵڕفێن و سمێڵە قیتەکانی تا حەزکەی جوان بوون. سمێڵەکانی بەسەر لێوی خوارەوەیدا لوول بووبوو و جوان بوون، ڕەنگی سمێڵی خورماییەکی ئامال خەنەیی بوو، کە دەگەییە کۆتایی کەمێک کاڵتر دەبووەوە.

دەربارەی پاریس، دەوروبەری پاریس، کەناراوەکانی ڕوباری سین، شارانی حەمامێن ئاوی مەعدەنی، خۆشییەکانی پشووی هاوینە و زۆر بابەتێن ڕۆژانەی دی قسەیان کرد، کە ئینسان چەندیان دەربارە بدوێ نە تەواو دەبن و نە مێشک ماندوو دەکەن.

پاشان، چونکە جەنابی نوربردوڤارن بە خۆ وپەرداخێ لیکورەوە بەرەو ئەوان دەهات، دوروا، لە ڕووی ڕێز و نەزاکەتەوە لەوێ دوورکەوتەوە.

خانم دوماریل کە خەریک بوو قسەی دەگەڵ فورستیەدا دەکرد، بانگی کرد و گوتی:

- ئێ، برادەر، کەواتە بە تەمای پێ بنەیتە دنیای ڕۆژنامەڤانی؟

ئەوسا دوروا، ئاماژەیەکی بۆ بەرنامە و نەخشە و ڕێکارەکانی ئایندەی خۆی کرد، پاشان، باسی ئەو بابەتانەی بۆ کرد، کە دەگەڵ خانم ڤاڵتردا باسی کردبوو، لێ

ئەمجارەیان زیاتر بەسەر بابەتەکەدا زاڵ بوو و خۆی وەکو کەسێکی زاڵ نیشاندا. هەر هەموو ئەو بابەتانەی لە خەڵکانی دی بیستبوونی، هەر هەموویانی دەدایەپاڵ خۆ. بەدرێژایی ماوەکە چاوی بڕی بووە چاوانی بەرانبەرەکەی، دەتگوت دەیویست قووڵییەکی زیاتر بەو بابەتانە ببەخشێت کە باسی دەکردن.

خانم دوماریل ' یش کۆمەڵێک چیرۆک و نوکتەی بەجۆش و خرۆشی، ئاسایی ژنێکەوە کە خۆی دەناسێت و دەزانێت بە زەوق و سەلیقەیە و دەیەوێت هەمیشە بە شۆخی وحەنەکچیاتی خۆیەوە وەمێنێ، بۆ ئەو گێڕایەوە. هەنووکە کە ڕوویان کرابووەوە، دەستی لە سەر بازووی پیاوە گەنجەکە دادەنا و، بۆ گێڕانەوەی قسەێن بێ تام و بێبایەخ دەنگی نەوی دەکردەوە، کە لە ئەنجامدا مۆرک و شەقڵێکی ڕازگۆیانەی دڵسۆزانەی وەردەگرت. دوروا لە دڵی خۆیدا، چونکە دەیتوانی دەستی ئەم ژنە گەنجە کە وەختی خۆی بۆ ئەم تەرخان کردبوو، بگرێت، خەریک بوو لە خۆشیان باڵ بگرێت، حەزی دەکرد، تا زووە خۆی بە سەر سپردەی ئەو نیشانبدات، داکۆکی لەو بکات، ئەوە بنوێنێ چەند بە قەدرە وبەو هەڵوەستانەی کە لە نێوان وەڵامدانەوەکانیا دەیکرد، ئەوەی تێبگەیەنێت چەند گوتەکانی ئەوی بەلاوە گرینگن.

لێ خانم دوماریل لە ناکاوا بێ هیچ هۆیەک بانگی کرد:

لورین!

کچۆڵەکە لێیان نزیک بووەوە.

- وەرە لێرە دانیشە گیانەکەم، لەوێ لەبەر پەنجەرەکەدا سەرمات دەبێت.

دوروا، لە ناکاوا شێت ئاسا، حەزیکرد کچۆڵەکە ماچ بکات، وەکو ئەوەی کەمێکی ئەم ماچە بگاتە دایکی کچۆڵەکەش.

بە ڕاوێژێکی باوکانە و بە نەزاکەتەوە پرسی:- مادموازل، ڕێگەم دەدەی ماچت بکەم؟

کچۆڵەکە، چاوە حایر و حەپەساوەکانی بڕییە ئەو. خانم دوماریل بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- بەڵێ بۆ ئەمڕۆ قەیدی نییە، بەڵام بۆ جاری دی نا.

دوروا، بلەز دانیشت، کچۆڵەکەی لە باوەشی نا و لێوی بە قژە ناسک وپڕ شەپۆلەکەیدا هێنا.

دایکی بەسەرسامی گوتی:

- سەیرە! کە سڵی نەکردەوە. ئەو تەنیا ڕێگە بە خانمان دەدات ماچی بکەن. کەس لە هەنبەر تۆدا خۆی پێناگیرێت جەنابی درووا.

دوروا، بێئەوەی هیچ وەڵامێک بداتەوە سوور بووەوەو، بە ئەسپایی کچۆڵەکەی لە سەر لاقەکانی وەکو بێشکە ڕاژەند.

خانم فورستیە هاتە نک وان و حایر و حەپەساو و بەدەنگی بەرز گوتی:

- عەجەب، دەبینم لورین ڕام بووە. ئەمە لە پەڕجوو دەچێت!

' جاک ریڤال ' هات بۆلای وان، لێ دوروا هەستا کە بڕوات، دەترسا کە بە قسەیەکی خەشیمانە، ئەو زەحمەتەی

کە کێشاویەتی و ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستی هێنابوو، بەبا بدات.

خوداحافیزی لە هەمووان کرد، بە نەرمی تەوقەی دەگەڵ ژنەکاندا کرد و بە توندی دەستی پیاوەکانی گوشی. هەستی کرد دەستی جاک ریڤال وشک و گەرمە و دڵسۆزانە وەلامی دەست گوشینەکەی ئەو دەداتەوە، دەستی نوربردوڤان سارد و نمناکە، لەنێو قامکاندا دەخزێت، دەستی بابا ڤالتر سارد و سستە، نەهێزیان تیایە و نەهەست، دەستی فورستیە شیرتێن و نەرم و قەڵەوە.

دۆستەکەی بە ئەسپایی پێی گوت: - سبەینێ سەعات سێی پاش نیوەڕو، لە بیرت نەچێت.

- هەڵبەتە لەبیرم ناچێت، خەمت نەبێ.

کە گەییە سەر قاڵدرمەکە، هێندە خۆشحاڵ بوو، حەزیدەکرد بە غاردان داگەڕێت. هەردوو پلیکانەی بە هەنگاوێک دەبڕی، لێ لە ناکاوا لە بالآڕوانەکەی قاتی دووەما چاوی بەخۆی کەوت، پیاوێک بە هەشتاو، بە هەڵەداوان بەرەو ڕووی دەهات، شەرمەزار و خەجاڵەت یەکسەر وەستا، دەتگوت هەڵەیەکی گەورەی کردبوو.

پاشان، ماوەیەکی زۆر لە خۆی ورد بووەوە و ڕاما، حایر مابوو کە کوڕێکی ئەوەندە جوان و قۆزە، ئەوسا بە ڕووخۆشی بزەیەکی بە ڕووی خۆیدا دا. پاشان ڕوخسەتی لە وێنەکەی خۆی وەرگرت و بەڕێزو حورمەتەوە، وەکو چۆن کڕنۆش بۆ گەورە پیاوان و ناوداران دەبرێت، بەو ئاوایە کڕنۆشی بۆخۆی برد.

( ٣ )

که گەییە ناو کۆڵان وسەرجادەکە، تیامابوو کە چی بکات. پڕ بەدڵ حەزی دەکرد کە غاربدات، خەیاڵپەروەری بکات، بەدەم هەڵکێشانی هەوای پاک و خۆشی شەوانەوە، بیر لە ئایندە بکاتەوە، بەڵام بیرۆکەی نووسینی ئەو زنجیرە گوتارەی کە بابا ڤالترداوای لێکردبوو بەرۆکی بەرنەدەدا، بۆیە لێبرا بۆماڵ بگەڕێتەوەو یەکسەر دەست بەکار بکات.

بە هەنگاوی هەڕاو خۆی گەیاندە بولڤارە بازنەییەکە و درێژەی بە ڕێگەی خۆی دا تا گەییە کوچە و گەڕەکی بورسو، کە لەوێ دادەنیشت. ساختمانەکە شەش نهۆم بوو و بیست خانەوادەیەکی کرێکار و کارمەند یان کاسبکار لەو ساختمانەدا ئاکنجی بوون. وەختایەک بە پلیکانە پیسەکاندا سەردەکەوت، کە ناچاربوو بۆ ئەوەی بەرپێی ڕوناک بکاتەوە تەڵە شقارتان پێبکات، ئیدی کە چاوی بەو هەموو کاغەز وئاغزە جگەرە و بەرماوەی خوراک و ئەو شتانە کەوت کە بەسەر پلیکانەکانەوە بڵاو بووبوونەوە، دڵی تێک هەڵدەهات. پڕ بەدڵ حەزیدەکرد، کە هەرچی زووە لەوێندەر باربکات و وەکو خەڵکانی دەوڵەمەند، لە ئاپارتمانێکی خاوێن و جواندا، کە مافووری تیا ڕاخرابێت، ئاکنجی ببێت. بۆنی قورسی خواردن، تەوالێت و ڕتوبەت و شێ، بۆنی کۆنی چەوری و دیوارە کۆنە پیسەکان کە هیچ هەواکێش و هەوا گۆڕکێیەک نەیدەتوانی بیرەوێنێتەوە، لە سەرێ تا خواری پلیکانەکان پەنگابووەوە و شەپۆلی دەدا.

پەنجەرەی ژوورەکەی دوروا کە لە نهۆمی پێنجەمدا بوو، ڕووەو هەڵدێرێکی قووڵ، خەرەندێکی گەورە کە سکەی

قیتاری ڕۆژئاوای پێدا دەڕۆیی، دەکرایەوە، ڕێک لەو شوێنەدا کە تونێلەکە تەواو دەبوو، نزیکی وێستگەی باتینیول. دوروا پەنجەرەکەی ڤەکرد و ئانیشکەکانی نانە سەر قەراخە ژەنگ گرتووەکەی.

لە خوارەوە، لە بنەبانی چاڵێکی تاریکدا، سێ چرای سووری ڕێنمایی بە بێ جووڵە، وەکو چاوانی درشتی حەیوانێک دەدرەوشانەوە. چراێن دیکەش لەوانە دوورتر دەبینران. هەرتاونا تاوێ دەنگی شووتی دوور ودرێژ یان کورت لە ناو جەرگەی شەوەکەوە دەنگی دەدایەوە. هەندێکیان لەیەک نزیک بوون و هەندێکی دیکەیان بە ئاستەم دەبیستران، بەتایبەتی ئەوانەی لە خواری خوارەوە لە تخوبی ئانییرەوە دەهاتن. شووتەکان وەکو دەنگی بەشەران بەرز و نزمیان هەبوو. یەکێکیان نزیک بووەوە، ناڵە سکاڵا ئامێزەکەی، کە سات بە سات بەرزتر دەبووەوە، هاتەگوێ، دوای ئەوە پلاجکتورێکی گەورە کە تیشک و ڕوناکییەکی زەردباوی هەبوو، بە گرمە گرم وبلەز دەهاتەپێشێ، بە دیارکەوت.

دوروا، کەوتە تەمەشاکردنی ئەو ڤارگۆنانەی کە وەکو دەنکی تەزبیح بە دووی یەکدا دەهاتن و لە ژێر تونێلەکەدا ون دەبوون.

ئەوسا بەخۆی گوت: " با بچمە سەر کارەکەم ". چرایەکی لە سەر مێزەکەی دانا، لێ لەو دەمەدا کە دەیویست دەست بە نووسین بکات، بیری کەوتەوە کە جگە لە دەفتەرێکی تایبەت بە نامەنووسین، هیچ کاغەزێکی دیکە لەماڵەکەیدا نییە.

قەیدی نییە، ئەم کاغەزانە بەکار دێنێت. نووکی قەڵەمەکەی بە شووشەی مەرەکەبەکەدا کرد و بە خەتێکی خۆش لە سەرووی لاپەڕەکەوە نووسی: " بیرەوەری سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە ئەفریقا " .

ئەوسا کەوتە گەڕان لە ڕستەیەک، کە سەرەتای بابەتەکەی دەست پێبکات.

هەنیەی لە ناو لەپی نابوو و چاوانی بڕیبوونە کاغەزە سپییەکەی بەردەمی. چ بنووسێت؟ ئێستا هیچ یەکێک لەو چیرۆک و بابەتە باڵکێشانەی، کە سەعاتێ لەوەپێش بۆ ئەوانی باسکردبوون، نەدەهاتەوە بیر، نە حیکایەتێ، نە ڕووداوێ، هەرهیچی لە بیر نەمابوو. لە ناکاوا بەخۆی گوت: " چۆنە لە چوونەکەمەوە بۆ ئەفریقا دەست پێبکەم. " و نووسی:

" ساڵی ١٨٧٤ بوو، دەوروبەری پازدەی مانگی شەش بوو، هەمان ئەو ڕۆژانە بوو کە فەرەنسای شەکەت و ماندووی کارەساتەکانی ئەو ساڵە ترسناکە، تازە خەریک بوو ئیسراحەتی دەکرد و ئاهێکی بەبەر دەهاتەوە... ".

ئەوسا دەستی لە نووسین هەڵگرت، نەیدەزانی چۆن گوزارشت لەو بابەتە بکات کە مەبەستی بوو، چۆن سوابوونی لە کەشتیەکە، سەفەرە دەریاییەکەی و هەوڵێن هەڵچوون و سۆز و گودازەکانی خۆی شرۆڤە بکات.

دوای دە خولەکێک بیرکردنەوە، گەییە ئەم ئەنجامگیرییەی کە نووسینی پێشەکییەکانی سەفەرەکەی هەڵبگرێت بۆ سبەینێ و با هەنووکە بچێتە سەر ئەسڵی بابەتەکە واتە بچێتە سەر وەسفی جەزایر.

لە لاپەڕەیەکی دیکەدا نووسی: " جەزایر شارێکی سەراپا سپیە... "

ئیدی وەستا، تیامابوو چی دیکە بنووسێت، شارێکی جوان و ڕۆشنی هێنایە بەرچاوی خۆی کە خانووە یەک نهۆمیەکانی وەکو سۆلاڤ و تاڤگە لە بەرزایی چیاوە بەرەو دەریا هەڵدەڕژان، لێ هیچ وشەیەکی بۆ وەسفی ئەوشتانەی دیتبوونی و هەستی پێکردبوون، شک نەدەبرد و بۆ نەدەهات.

دوای هەوڵێکی زۆر، لە دوای ڕستەکەی پێشووەوە نووسی: " ژمارەیەک لە دانیشتووانی شار عەرەبن... " ئەوسا قەڵەمەکەی لە سەر مێزەکە دانا و لە جێی خۆی هەستا.

لە سەر قەرەوێڵەکەی، چاوی بە جلکە هەمیشەییەکانی کەوت کە لە سەری داینابوون، ئەوەندە کۆن و شڕپیو بوو، لە جلکی ناو مردووشۆرخانە دەچوون. کڵاو ئاوریشمینەکەی، بەتەنیا لەسەر کورسییەکی حەسیری بینی کە دەتگوت دەمی بۆ سەدەقە و خێرات کردبووەوە.

کاغەزە دیوارپۆشەکانی ژوورەکەی قاوەییەکی گوڵ گوڵی بوو، بە ئەندازەی ژمارەی گوڵەکان، پەڵەیان پێوە بوو، پەڵەی کۆن، گوماناوی، کە ماهیەت و جەوهەریان نەدەناسرایەوە، ئایا پەڵەی کوشتنی مێرووان بوون، هی ڕۆن بوون، جێ پەنجەی پیس بوون، یان کەفی ڕژاوی تەشتی جلشۆرین بوون؟ ئەمانە هەموو نیشانەی دەستکورتی بوون، دەستکورتی و نەداری پاریسی. تووڕەییەکی توند دژی ئەم ژیانە هەژارانەیە دایگرت.

بەخۆی گوت دەبێ یەکسەر وبلەز خۆی لەم ژیانە ڕزگار بکات. دەبێ لە سبەیەوە کۆتایی بەم ژیانە پڕ مەینەت و ڕەنج بێوەرە بێنێت.

لە ناکاوا، شەوق و زەوقی کارکردن زۆری بۆهێنا. دووبارە لە پشت مێزەکەوە دانیشت و کەوتە گەڕان و بیرکردنەوە لە وشە و ڕستەێ ئەوتۆ کە بتوانێ لە ڕێگەیانەوە، دیمەن و وێنەیەکی جوان و دڵگیری جەزایر بنوێنێت و نیشانبدات. وێنە و دیمەنی شارێک کە بە دەروازەی چوونە ژوورەوەی ئەفریقای ڕازئامێز و دوورەدەست دەژمێردرا، ئەفریقای عەرەبێ بیابانگەڕ و ڕەش پێستێ نەناسراو، ئەفریقای گومان ئەنگێز و هێشتا کەشف نەکراو، کە هەندێجار گۆشەیەکیمان لە پارکە گشتیەکاندا نیشان دەدەن. حەیواناتی دوور لە تەسەور و نائاسایی کە دەڵێی بۆ ئەفسانان و حیکایەتێ جن و پەرییان خوڵقێنراون، وشترمر، ئەم پەلەوەرە سەیرە، ئاسک و مامزان، ئەم بزنە بەهەشتیانە، زەڕافەێ سەیر و کومێدی، وشترێ ئارام، ئەسپێ زەلام، کەرکەدەنی ناحەز، غوریلا، بەشەرێ سامناک.

هەستی دەکرد، هەندێ بیری تەم ومژاوی بۆدێت، پێدەچوو بتوانێ بە زمان بیاندرکێنێ، بەڵام بە هیچ جۆرێ نەیدەتوانی بە وشەیان بسپێرێت و بیانخاتە سەر کاغەز. ئەم بێ توانایییە زۆری پەست کرد، دووبارە لە جێی خۆی هەستا، دەستەکانی لە ئارەقەدا هەڵکشابوون و دڵی بە توندی لێی دەدا.

له ناکاوا چاوی به لیستی خیساباتی جلشۆرەکە کەوت کە دەرگاوانەکە ئێواری بۆی هێنابوو، نائومێدییەکی بێ پایان سەرودڵی گرت، هەرچی خۆشحاڵی و متمانە و دڵنیاییەکی سەبارەت بە ئاینده لەلا چێبووبوو، لە کەفلەکونێکا، ڕەوییەوەو بوو بە هەڵم و چوو بە ئاسماندا. هەموو شتێک تەواو، هیچ ناکرێ و ناگاتە هیچ کوێیەک، هەستی کرد کەسێکی بودەڵە، بێ دەسەڵات و هیچ لەبارا نەبووە و هیچ بە هیچ ناکات.

دووبارە گەڕایەوە بەر پەنجەرەکە و ئانیشکی لە قەراخیا دانان. ڕێک لەو دەمەدا قیتارێک بە دەم هەرا وهەنگامەیەکی زۆرەوە لە تونێلەکە هاتەدەرەوە. قیتارەکە، بە نێو دەر ودەشت و کێڵگە و مەزراکاندا بەرەو دەریا نشێو دەبووەوە. دورروا، لە ناکاوا دایک وباوکی بیرکەوتنەوە. ئەم قیتارە بەچەند کیلومەترێ لای ماڵەکەی ئەواندا تێدەپەڕی. خانوویەکی بچووکی لەبەرچاوی خۆیدا بەرجەستە کرد، کە بەقەد پاڵی گردێکەوە بوو و دەیڕوانیە شاری روان و خەرەندی مەزنی سین و کەوتبووە سەر ڕێگای گوندی کانتلو.

باوک ودایکی لەوێندەر مەیخانەیەکی بچووکیان هەبوو، مەیخانەیەک بوو کە گوندییان وجووتیارانی دەوروبەر ڕۆژانی یەکشەممە بۆ فراڤین بۆ ئەوێندەر دەهاتن . ئەمانە ویستبوویان کوڕەکەیان بۆخۆی ببێ بەبەشەر و، نابوویانە بەر خوێندن وتا قۆناغی خوێندنی ئامادەیی لەگەڵیا ڕۆیشتبوون. دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کردبوو و بێئەوەی شادەتنامەی بەکالوریا وەربگرێت و بە دەست

بێنێت، بەو ئومێدەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێت بە ئەفسەر، سەرهەنگ ویا تەنانەت جەنەڕاڵ، پەیوەندی بە سوپاوە کردبوو. لێ پێش ئەوەی پێنج ساڵ خزمەت تەواوبکات تا ببێت بە ئەفسەر، لە ژینگەی عەسکەری بێتاقەت و بێزار بووبوو و ڕووی کردبووە پاریس تا پارەو پول و پێگە و پایەیەک بۆ خۆی بەدەست بێنێت.

دوای تەواوکردنی ئەم دەورەیەی خزمەتی عەسکەری، وێڕای پاڕانەوەو تکا ورجای باوک ودایکی، کە ئومێدیان سەبارەت بەو بە باچووبوو، کە لە عەسکەری و سوپادا وەمێنێ، وازی لە عەسکەری هێنابوو. ئیدی دوای هەندێک ئومێدان بە ئایندە کەوتبوو کە بۆ خۆیشی تەم ومژاوی و ناڕوون بوو، ئومێدانێک کە بیگەیەنێتە پلەوپایەیەک، ئومێدانێک کە بە خۆی بەشداری لە بەدیهاتنیان بکات.

هەڵبەتە لە ماوەی خزمەتی عەسکەریدا هەندێک سەرکەوتنانی بە نەسیب بووبوو و، هەندێ پارە وپولی پێکەوە نابوو و بەخاپاندنی کیژی سەرپەرشتیاری دایەرەی دارایی، کە دەیویست واز لە هەموو شتێک و ڕەدووی ئەم بکەوێت، جێگای خۆی لە چینێکی بالاتر لە چینی خۆی کردبووەوە، یان بە فریودانی هاوسەری ئەو پارێزەرەی کە بەرەلای کردبوو، لە ڕووی نائومێدیەوە ویستبووی خۆی غەرق بکات.

هاوڕێکانی سەبارەت بەو دەیانگوت: " کەسێکی شەیتانە، کەڵەکباز و هەلپەرستە، دەزانێ کوێ گاڵ دێنێ و کوێ پەموو، خۆی لە جێی خوڕان نادات، دەزانێ چۆن بەڕەی خۆی لە ئاو دەربێنێ ".

له ڕاستیا بەڵێنی بەخۆی دابوو، کەسێکی ڕێوی سیفەت، فێڵباز و تەڕدەست و بەباشار بێ.

تەبیعەتی فێڵبازانەی گوندییانەی، کە بە هۆی تەماسی دەگەڵ ژینگەی سەربازخانە و ژیانی سوپاییدا سیقال بووبوو، مامەڵەی دەگەڵ ئەو حیزە دزیانەی کە لە ئەفریقادا دەکران، گیانی فڕوفێڵی لە ناخیا ڕیشاژۆ کردبوو، لاف وگەزافێن سوپایی سەبارەت بە مەسەلەێن وەک ئابڕوو و شانازی و سەربەرزی و نیشتمانپەروەری و... کە لە نێو ئەفسەران و دەرەجەداراندا باو و ئاسایی بوو، کردبوویان بە کەسێک، ڕێک لەو قوتووی عەتارە دەچوو کە هەموو شتێکی تیا دەست دەکەوت.

بەڵام ئارەزووی گەیشتن بە پلەوپۆست و پایە وپارە بە سەر هەموو کەڵکەڵەکانی دیکەیدا زاڵ بوو.

بێئەوەی بە خۆی بحەسێت، دەستی کردبوو بە خەیاڵڕێسی و دوای خەون و خەیاڵ کەوتبوو.

هەموو شەوێک بە خەیاڵ، چیرۆک وسەربهوردێکی عاشقانەی شکۆمەندی ئەوتۆی دەئافراند کە لە چاوتروکانێکا، ئەویان بە هەموو ئاوات و ئارەزووەکانی دەگەیاند. زەماوەندی دەگەڵ کیژی بابایەکی بانکدار یان موڵکدارێکی دەوڵەمەندا دەکرد کە لە شەقامێکا تووشی بووە و ئاشق و شەیدای ئەم بووە.

دەنگی شووتی تیژی مەکینەیەکی قیتار کە بەبێ فارگۆن لە تونێلەکەوە وەدەرکەوت تا بەرەو وێستگاکەی بڕوات، وەکو کەروێشکێکی دێوئاسا کە لە لانەکەی دەرپەڕێ، ئەوی لە خەون وخەیاڵان هێنایە دەرێ و بێداری کردەوە.

هەنگێ، دووچاری ئومێدێکی ئاڵۆزو بە تەمتوومان بوو کە هەمیشە رۆح ودڵ و دەروونی پڕدەکرد لە شادمانی، ماچێکی هەوایی فڕێکرد، ماچێکی بەناو جەرگەی شەوا کرد، ماچێکی عاشقانەی بۆ ژنێک فڕێکرد، کە پڕ بە دڵ ئارەزووی دەکرد، ماچێک بۆ ئەو سەروەت و پێگەیەی کە بە هێڤی بوو بیگاتێ. ئەوسا پەنجەرەکەی داخست و بەدەم داکەندنی جلەکانیەوەو لە بن لێوانەوە گوتی:

- سبەینێ باشتر خۆم ئامادە دەکەم. ئەمشەو بیرم ئازاد نییە. زۆریشم مەشروب خواردووەتەوە، پیاو ناتوانێ لەم حاڵ و بارەدا بە دروستی کاربکات.

خۆی بە نێو جێگاکەیدا کرد، چراکەی کوژاندەوە و تەقریبەن یەکسەر خەو بردییەوە.

بەیانی زوو لە خەو ڕابوو. وەکو ئەو بەیانیانەی کە خەبەرێکی پڕ ئومێدی خۆش یان نیگەرانییەک چاوەڕوانی ئینسان بێت. کە لە جێگاکەی هاتە دەرێ، ڕۆیی پەنجەرەکەی کردەوە تا خۆی گوتەنی فینجانێک هەوای تازە و تەزی هەڵبدات.

خانووەکانی ئەوبەری گەڕەکی روم کە خەرەندە قووڵەکەی سکەی ڤیتارەکە لە یەکدی جیا دەکردنەوە، لە بەر گزینگی خۆری بەیانیدا دەدرەوشانەوە، دەتگوت بە بۆیەیەکی سپی بریقەدار بۆیە کرابوون. بە دەستەڕاستا، لە دووری دوورەوە، بەرزاییەکانی ئارجانتوی، گردەکانی سانواو ئاشەکانی ئورگیمون، لە نێو تەنکە تەمە شینباوەکەی بەیانیدا دەبینران. مژ ودوومانەکە لە قوماشێکی ناسکی سەرئاو، دەچوو کە بە ئاسۆیاندا دادابێتەوە.

دوروا، مودەتێک بەدەم تەمەشای دەشتە سەوز وجوان و دووره دەستەکەوە وەستا و لەبن لێوانەوە بەخۆی گوت:
" لە ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا، هەوای ئەوێندەر زۆر خۆشە. "
ئەوسا بیری کەوتەوە کە دەبێ بلەز دەست بەکارکردن بکات، دە سوش ( سو: دراوێکی بچووکی فەرەنسییە ) بدات بە کوڕی دەرگاوانەکە تا بڕوات بۆ ئیدارە وخەبەریان بداتێ کە نەخۆشە و ناتوانێ بڕوات بۆ دەوام و بۆ سەر کارەکەی.

لە پشت مێزەکەی دانیشت، نووکی قەڵەمەکەی لە شووشە مەرەکەبەکە هەڵکێشا، هەنیەی لەناو لەپی نا، بیری لە بابەتێک دەکردەوە کە بینووسێت، بێهودە بوو، هیچ بیرێکی بۆ نەدەهات.

وێڕای ئەمەش نائومێد نەبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: " من فێری نووسین نیم، ئەمە کارێکە کە دەبێ وەکو هەموو کارێکی دی فێری ببیت. دەبێ لە سەرەتاوە یەکێک یارمەتیم بدات، دەچم بۆلای فورستیە، ئەو لە زەرفی دە خولەکدا وتارەکەم بۆ دەخاتە سەر کاغەز.

خۆی گۆڕی، جلکی لەبەر کرد. کە گەییە سەرجادەکە، هەستیکرد جارێ زووە بچێت بۆماڵی دۆستەکەی کە بێگومان ئێستا لە خەو ڕانەبووە. بۆیە لەژێر دار و درەختانی بولڤارە بازنەییەکەدا، بە ئارامی کەوتە پیاسە و ڕاوێچکە.

هێشتا سەعات نەبووبوو بە نۆ کە گەییە پارکی مونسو، هەوای ئەوێندەر، بەهۆی ئاودانی گوڵەکان و چیمەنەکەوە، زۆر تازە و تەڕ بوو. لە سەر تەختێک ڕۆنیشت و دووبارە لە خەون و خەیاڵان ڕاچوو. پیاوێکی گەنج و زۆر پۆشتە

وپەرداخ، بە دەم پیاسەوە بە بەردەم ئەودا دەبووری و دووبارە دەگەڕایەوە، بێگومان چاوەڕوانی ژنێک بوو.

دوای کەمێک، ژنێک بە هەنگاوێن هەڕاو و ڕوو بەتوڕ پەیدا بوو، دوای تەوقەیەکی خێرا دەگەڵ پیاوە گەنجەکەدا، قۆڵی کرد بە قۆڵیا و لەوێ دوور کەوتنەوە.

حەز و ئارەزوویەکی ئاشقانە دڵی دورروای پڕکرد، ئارەزووی ژنێکی بە شەخسیەت، بۆنخۆش و شۆخ و ناسک . لە جێی خۆی هەستا، بەدەم بیرکردنەوەوە لە فورستیە، کەوتەڕێ. فورستیە ئەم شانسەی هەبوو؟ ڕێک لەو کاتەدا گەییە بەرماڵی دۆستەکەی کە ئەو خەریک بوو لە ماڵ دەهاتە دەرێ.

- بەم بەیانییە چ دەکەی لێرە؟ کارێکت بە من هەبوو؟

دوروا، کە بەم دیدارە کوت وپڕ و چاوەڕوان نەکراوە، پەشۆکابوو، بە زمانەلاڵکێوە گوتی:

- چی بێ لە تۆ نهێنی... حاڵ و مەسەلەکە ئەمەیە... ناتوانم وتارەکەم بنووسم، دەزانی کامە، ئەو وتارەی کە جەنابی ڤالتر داوای لێکردم دەربارەی جەزایر بینووسم. هەڵبەتە ئەمە بۆ کەسێکی وەکو من، کە بە عەمراتم هیچ شتێکم نەنووسیوە، زۆریش سەیر نییە. بۆ ئەم کارەش، وەکو هەرکارێکی دی بنیادەم پێویستی بە فێربوون و مەشق و ڕاهێنان هەیە. دڵنیام زۆر زوو دەعەلمم، بەڵام نازانم چۆن دەست پێبکەم، چی بکەم. بیرۆکەی زۆر و باڵکێشم لە مێشک و لە خەیاڵدایە، بەڵام نازانم چۆن دەریان ببڕم.

بە دوودڵی و گومانەوە لە ئاخافتن وەستا. فورستیە، بزەیەکی تەوسامێزی بە سەر لێوەوە بوو:

- من لەو شتانە تێدەگەم، ئەزموونم هەیە.

دوروا، دووبارە گوتی: - بەڵێ، ئەوشتانە لەوەیە لە هەوەڵی کارا، بۆ هەرکەسێک پێش بێت. بەهەرحاڵ هاتووم... هاتووم تۆ یارمەتیم بدەیت... دەتوانی لە زەرفی دە خولەکدا بەڕێم بکەیت، فەند وفێڵی کارەکەم پیشان بدەی. دەتوانی دەرسێکی باشم دەربارەی دروستنووسی و باشنووسی پێ بدەیت، دەنا بەبێ کۆمەکی تۆ لە عۆیەی ئەم کارە نایەم.

فورستیە، لێو بەخەندە دەستێکی بە شانی هاوڕێ کۆنەکەیدا دا و گوتی:

- بڕۆ دەست ودامێنی ژنەکەم بکەوە. ئەویش بەهەمان توانای منەوە جێ و ڕێی ئەم کارەت نیشاندەدات. ئەوم بۆ ئەم کارانە پەروەردە کردووە. من ئەم بەیانییە، هیچ دەرفەت و دەرەتانێکم نییە، دەنا بەدڵ و بەگیان یارمەتیم دەدایت.

دوروا، لە ناکاوا هەراسان بوو، کەوتە دوودڵی، نەترەی بەردا.

- بەڵام من ڕووم نایە بەم بەیانی زووە، بچمە سەرێ..

- بۆچی، لە خەو ڕابووە، حاڵی حازر لە نووسینگە و ئۆفیسەکەی منە، خەریکە هەندێ نووسین بۆمن ڕێکدەخات.

دوروا، دووبارە گوتی: - نا.. ناچم.. شتی وا نەبووە و نابێ..

فورستیە، شانەکانی گرت، واداری کرد، کەمێک ڕووی وەرگێڕێ و ئەوسا بەرەو پلیکانەکان دەڵەکی دا.

- که من پێت دەڵێم برۆ، مانای وایە قەیدی ناکات هەی کەللەپووت. یانی دەتەوێ قاڵدرمەی سێ نهۆمان ببڕم و لەگەڵ تۆدا بێمە سەرێ و بە ژنەکەم بڵێم کە چ گرفتێکت هەیە؟

هەنگێ دوروا، بڕیاری خۆی دا: - مەمنوونم، خۆم دەڕۆم. پێی دەڵێم تۆ ناچارت کردووم بڕۆم و سەروداڵی بگرم.

- باشە، دڵنیابە ناتخوا. بەڕاست مەوعیدەکەی سەعات سێی پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆت لە بیر نەچێت.

- نا، نا، خەمت نەبێ.

فورستیە بە هەشتاو ڕۆیی و دوروا، بە خاوی بە پلیکانەکاندا هەڵگەڕا، لەزەینی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە چ شتێک بەو ژنە گەنجە بڵێت، نیگەران بوو لەو بەرخوردەی کە دەبوا لە گەڵ ئەوی کردبایە.

کارەکەرەکە هات، دەرگاکەی لێکردەوە، بەرکۆشەیەکی شینی بەستبوو و گسکێکی بەدەستەوە بوو.بێئەوەی چاوەڕوانی پرسیاربکات گوتی: - ئاغا چووەتە دەرێ.

دوروا، بەڕژدی گوتی:

- بە خانم فورستیە بڵێ، دەتوانێ من ببینێت، پێیان بڵێ مێردەکەی ناردوومی بۆلای ئەو، ئێستا لە خوارەوە دیتم.

کارەکەرەکە ڕۆیی، دوای کەمێک هاتەوە، ئەمجارەیان دەرگایەکی سەمتی ڕاستی کردەوە و گوتی:

- خانم چاوەڕوانتانە بەڕێز.

ژنەی گەنج، لە سەر کورسییەکی دەسکدار، لە پشت مێزی کارکردنەوە ڕۆنیشتبوو. هۆدەیەکی بچووک بوو، کە هەرچوارنکاڵی دۆلابی تەختەی ڕەشی پڕ لە کتێبان بوو. کتێبەکان زۆر بە ڕێک وپێکی ڕیزکرابوون و بەرگی چەرمینی کتێبەکان، بە ڕەنگە جۆراوجۆرەکانیان، بە ڕەنگێن سوور و زەرد، کەسک ، وەنەوشەیی و شین، دیمەنێکی جوان و تایبەتیان، بە ڕیزی ڕێک وپێکی ئەم کتێبانە دەبەخشی و پیاو بە دیتنیان دڵی دەکرایەوە.

ژنەی گەنج، لێو بە خەندە ئاوڕی لەو دایەوە، جلکی ماڵەوەی سپی ئۆیەداری لەبەردا بوو، وەختایەک دەستی بە مەبەستی تەوقەکرن بەرەولای ئەو درێژ کرد، بازووە ڕووتەکەی لە میانی ئاسینە دەڵبەکەی ماکسیەکەیەوە بە دیارکەوت. بە دوروای گوت:

– " بەم بەیانییە زووە؟ " ئەوسا لەسەر قسەکەی ڕۆیی: " مەبەستم سەرزەنشتکردنی تۆ نییە، هەر ویستم پرسیارێک بکەم. "

دوروا، بەدەمەلالکێوە گوتی:– خانم، ببورە، من نەمدەویست بێمە سەرێ و بێزارتان بکەم، لێ مێردەکەتان کە لە خوارەوە بینیم، واداری کردم کە بێمە سەرەوە. ئەوەندە شەرمەزار و خەجاڵەتم کە لە ڕووم نایەت بڵێم بۆچی هاتووم.

خانم فورستیە، کورسییەکی بۆ دانا و گوتی:– دانیشە و قسە بکە.

ژنەی گەنج، قەڵەمێکی پەڕی قووی بە دەستەوە بوو کە زۆر بە ناسکی لە نێو قامکەکانیا دەیجوڵان، کاغەزێکی گەورە لە سەر مێزەکەی بەردەمیا بوو کە تا نیوەی

نووسرابوو، که دەگەڵ هاتنی دوروا دا واز لە نووسینی هێنرابوو.

لە بەردەم ئەم مێزی کارەدا زۆر بە ئاسوودەیی دانیشتبوو، دەتگوت لە ژووری پێشوازیدایە و خەریکی ڕاپەڕاندنی کارێن ڕۆژانەی ماڵێیە. بۆنی نەرم وخۆشی جلەکانی ماڵەوەی، بە ناو ژوورەکەدا شەپۆلی دەدا. بەدەنە گەنجانە و نەرم ونۆڵەکەی لە ماکسیەکەیدا چەسپی بوو.

چونکە دوروا، دووبارە بێدەنگ بوو، خانم فورستیە دووبارە گوتی:- فەرموو بڵێ بزانم چی ڕوویداوە؟

دوروا، بە دوودڵی و لەبن لێوانەوە گوتی:

- "حاڵ و حیکایەتەکە ئەمەیە... نا، بە ڕاستی ڕووم نایەت بیڵێم... ئەوەی ڕاستی بێ دوێشەو تا درەنگانێ و ئەمڕۆ لەبەیانی زووەوە، زۆرم هەوڵدا ئەو وتارە بنووسم کە جەنابی ڤالتر داوای لێکردبووم... بەلآم نەمتوانی شتێکی جوان بنووسم، هەرچیەکم نووسی هەر هەموویم دڕی و فڕێمدا... من فێری نووسین نیم... هاتبووم داوای یارمەتی لە فورستیە بکەم... هەڵبەتە بۆ جاری یەکەم..."

خانم فورستیە، کە شاد و بە دەماخ، لە کانگای دڵەوە پێدەکەنی، قسەکەی ئەوی بڕی و گوتی:

- تۆی بۆلای من ناردووە؟... گەورەیی کردووە...

- بەڵێ، خانم. پێی گوتم کە ئێوە لەو باشتر من لەم ئاریشە و ئاستەنگە ڕزگار دەکەن... بەلآم من پرکێشیم نەدەکرد، نەمدەویست ئەزیەتت بدەم، حاڵی عەرزم هەی؟

ژنەی گەنج هەستا و گوتی:- ئەم هاوکارییەی نێوان من و تۆ زۆر دڵگیرە. من بەم بیرۆکەیەی تۆ زۆر خۆشحاڵم. وەرە ئێرە لە پشت مێزەکەوە، لە جێگاکەی من دانیشە.

چونکە لە ڕۆژنامەکەدا دەست و خەتی من دەناسنەوە. هەنووکە بەیەکەوە وتارێک تەرتیب دەکەین، بەڵام وتارێکی سەرکەوتوو.

دوروا، لە پشت مێزەکەوە دانیشت، کاغەزێکی لەبەردەم خۆیدا دانا، قەڵەمێکی بەدەستەوە گرت و بە دەم چاوەڕوانیەوە وەستا.

خانم فورستیە وەستابوو و تەمەشای ئامادەسازییەکانی ئەوی بۆ نووسین دەکرد، ئەوسا جگەرەیەکی لەسەر سۆپاکە هەڵگرت، جگەرەکەی پێکرد و گوتی:- من بەبێ جگەرەکێشان ناتوانم کاربکەم. دەی ئێستا دەتەوێ چی بگێڕیتەوە؟

دوروا، حایر و حەپەساو تەمەشای ئەوی کرد و گوتی:- من نازانم، هەر بۆ ئەوەش بۆلای تۆ هاتم.

ژنەی گەنج دووبارە گوتی:- باشە، تەرتیبی دەکەم، با بیرێکی لێبکەمەوە.

دوروا، بە پەشۆکاوی لە فکران ڕاچوو: سەرەنجام بە دوودڵییەوە گوتی:- دەمەوێ باسی سەفەرەکەم، لە هەوەڵێ ڕا تا کۆتایی بکەم..

خانم فورستیە، لەوبەری مێزەکەوە و ڕوو بە ڕووی ئەو ڕۆنیشت و چاوی لە دورچاوی ئەو بڕی:

- دەی چاکە، هەوەڵجار بۆمنی بگێڕەوە، هەر بۆ من، حاڵی هەیت، زۆر لە سەرخۆ، هێواش، بەبێ ئەوەی هیچ بپەڕێنیت، ئەوسا من، ئەوەی پێویست بێ لە قسەکانی تۆی هەڵیدەبژێرم.

لێ چونکە دوروا نەیدەزانی لە کوێوە دەست پێبکات، خانم فورستیە وەکو قەشەیەکی گوێگر لە ئیعترافاتی

گوناحی گوناحکار دەستی بە پرسیاران کرد، پرسیاری زۆر وردی کرد، لەو بابەتە پرسیارانەی کە هەموو وردەکارییەکی فەرامۆشکراوی وەبیر دەهێنایەوە، ئەو خەڵکانەی کە ناسیاوی دەگەڵدا پەیدا کردبوون و ئەو کەسانەی کە بەرەوتەنی تووشیان بووبوو.

پاش ئەوەی چارەکە سەعاتێک بەو جۆرەی دواند و قسەی لێدەرهێنا، لە ناکاوا قسەکەی پێ بڕی و گوتی: " با دەست بە نووسین بکەین. وای دابنە، کە تۆ بۆچوون و هەستی خۆت بۆ بابایەکی دۆست دەگێڕیتەوە، ئەمە دەکاتە کارێک کە قسەی خۆش بکەیت، باسی جۆراوجۆر بگێڕیتەوەو ئەگەر بکرێ قسەکانت ئاسایی و حەنەک ئامێز بێ. دەی ئێستا دەست پێبکە:

" هنری گیان، دەتەوێ بزانی جەزایر چۆن جێگایەکە، زۆرچاکە، دەیسا گوێ بگرە با بزانی. لە کوختە گڵێنەدا کە ماڵ و ماوای منە بیرەوەرییەکانی خۆمت، کە ڕۆژ بە ڕۆژ و سەعات بە سەعات تۆمارم کردوون، بۆ دەنێرم. هەندێجار بابەتەکان بڕێک بێ پەردە و گۆساخانە دەبن، گرینگ نییە، دەتوانی ئەو پەرەگرافانە نیشانی ئەو خانمانە نەدەیت کە دەیانناسیت... "

خانم فورستیە، هەڵوەستەیەکی کرد، تا جگەرەکەی کە کوژابووەوە، دووبارە پێیکاتەوە. دەنگی خشەخشی قەڵەمەکە لە سەر کاغەزەکە بڕا. بە دوورواى گوت: - با بەردەوام بین...

" جەزایر وڵات و دەڤەرێکی فەرەنساوی مەزنە، هاوسنووری چەند وڵاتێکی گەورە و نەناسراوی دیکەیە کە پێیان دەڵێن سارا، ئەفریقای ناوەندی و... ".

جەزایر، دەروازەی سپی و دڵنەوازی ئەم کیشوەرە سەیرەیە. بەڵام بەرلە هەرکارێک دەبێ ، سەفەری ئەوێ بکەی، کە ئەم کارە نە ئاسانە و نە بۆ هەموو کەس دەلوێت. دەزانی من ڕاهێنەری سوارکاری و پسپۆڕی بەخێوکردنی ئەسپم، من ئەسپەکانی سەرهەنگ تەعلیم دەدەم و ئاگادارییان دەکەم، پیاو دەتوانێ سوارچاکێکی باش و دەریاوانێکی خراپ بێ، ئەم قسەیە پڕ بە پێستی منە، دەڵێی لە ئیجادی بۆ من گوتراوە.

مێجەر سمبرتات بیر دێتەوە کە پێمان دەگوت دکتۆر ئیپیکا؟ هەرکاتێ دەمانویست مۆڵەتێکی بیست و چوارسەعاتی وەربگرین، یادی بەخێر دەچووینە نک وی و مۆڵەتی نەخۆشیمان وەردەگرت.

لە سەر کورسییەکەی ڕۆدەنیشت، لاقە ئەستوورەکانی لە نێو پانتۆڵە سوورەکەیدا لێکدی بڵاو دەکردنەوە، ئانیشکەکانی بەرز دەکردنەوەو بە دەستەکانی پردی دروست دەکرد و بە دەم جووینی سمێڵە سپیەکەیەوە بە چاوەخڕەکانی تەمەشای دەکردین.

ڕەچەتەکەیت خۆ لە بیرە.

ئەم سەربازە تووشی ئینتەلا بووە. دەرمانی ڕشانەوەی ژمارە سێی بدەنێ، دوازدە سەعات مۆڵەتی بدەنێ با ئیسراحەت بکات، ئیدی چاک دەبێتەوە.

ئەم دەرمانی ڕشانەوەیە، زۆر ناخۆش بوو، کەس بەرگەی نەدەگرت. ناچاربووین هەڵیدەین، ئیدی ئەمر وەدەستوور بوو. هەرکەسێک کە دەرمانی دکتۆر ئیپیکای خواردباوە، دەبوایە دوازدە سەعاتان پشوو بدات.

ئیدی دۆستی ئازیز هەرکەسێک بیەوێ بۆ ئەفریقا بێت، دەبێ بۆ ماوەی چل و هەشت دانە سەعات تەحەمولی جۆرە دەرمانێکی ڕشانەوەی دیکە بکات کە بریتیە لە سەفەر بە کەشتیانی کۆمپانیای " ترانس ئاتلانتیک ".

خانم فورستیە لە خۆشی ئەم بیرۆکەیەدا کە بۆی هاتبوو، دەستەکانی لێکدی دەماڵین. لەجێی خۆی هەستا و دەستی بە ڕاوێچکان کرد. دوای پێکردنی جگەرەیەکی دی ئەوسا درێژەی بە بابەتی وتارەکە دا، ئەو دووکەڵەی کە لە نێوان لێوە خڕەوە بووکانیەوە دەری دەدا، هەوەڵجار لە شێوەی ئەستوونێکی چڕدا دەهاتەدەرێ، پاشان بڵاو دەبووەوەو ئیدی لە شێوەی داوی جاڵجاڵۆکەدا، بە ئاسمانی ژوورەکەدا دەمایەوە، هەندێجار، بە دەست پاشماوەی سووکی دووکەڵەکەی دەتاراند و دوور دەخستەوە، هەندێجاریش بە پەلە وبە قامکی ئیشارەت، دووکەڵەکەی لە ناوەندەوە دەکرد بە دوولەتەوەو بە نیگایەکی پڕ ویقارەوە دەیڕوانیە لەتەکانی ئەم دووکەڵە هەڵم ئاسایە کە بە خاوی دەڕەوایەوەو دەسڕایەوە.

دوروا، سەری هەڵدەبڕی، تەمەشای ئەم ئەدا و ئەتوار و ڕەفتار و جم وجوڵانەی جەستە و دەم وچاوی ئەم ژنە گەنجەی دەکرد، کە بێئەوەی بیریان لێبکاتەوە ئەنجامی دەدان.

ئێستا ژنەی گەنج، خەریک بوو قۆناغەکانی سەفەرەکەی دێنایە بەرچاوی خۆی، وێنەی هاوڕێکانی دوروای کە هیچ ئاشنایەتیەکی دەگەڵیاندا نەبوو، بەخەیاڵی خۆی دەکێشا و، سەربهوردێکی ئاشقانەی دەگەڵ هاوسەری نەقیبێکدا کە

دەچوو پەیوەندی بە مێردەکەیەوە بکات، لە خۆیەوە دروست کرد.

دووبارە چوو دانیشت، هەندێ پرسیاری دەربارەی تایبەتمەندییەکانی جەزایر، کە کەم و زۆر زانیاری دەربارەی نەبوو، لە دوروا کرد. لە زەرفی دە خولەکێکدا بە ئەندازەی دوروا، زانیاری بەدەست هێنا و دەستی بە شرۆڤەی جوگرافیایی، سیاسی و کۆلۆنیایی وڵات کرد تا خوێنەران بۆ پەی بردن بەو مەسەلە و پرسە جدیانەی کە لە وتارەکانی دواتردا دەهاتن، ئامادە بکات.

ئەوسا، کەوتە وەسفی گەشت و دیدارێک بۆ دیار ودەڤەری ئوران، لەو گەشتەدا باسی ژنان، عەرەبێن سارانشین، جوولەکە و ئەسپانیانیش دەهاتەکردن.

بە دوروای گوت: تەنیا ئەم شتانە بۆ خوێنەر و بەلای خوێنەرانەوە باڵکێش و سەرنج ڕاکێشن.

وتارەکەی، بە مانەوەیەک لە سەعیدا، لە کەناری دەشتێکی بەرزا و بە سەربهوردێکی عاشقانە لە نێوان دەرەجەدار جۆرج دوروا و کیژێکی ئەسپانیایی کرێکاردا کە لە کارخانەیەکی ئالفا ڕیسی دا لە عین الحجر کاری دەکرد، خەتم کرد. ( ئەلفا: ڕووەکێکە کە لە ئەفریقای باکوور و ئەسپانیادا بەکار دەبرێ و گوریس و کندڕ و قوماش و کوتاڵی ئەستوور و زەمیلە و سەبەتەی لێ دروستدەکرێ. )

ئیدی ژوان و دیداری ئەو دوانەی لە کێوانی بەردەلانی ڕووتەندا کە لە نێو هەرا وهەنگامەی لوورەی چەقەڵان، کەمتیاران و سەگوەڕدا، ئەنجام دەدرا، وەسف دەکرد.

ئەوسا بە دەنگێکی زوڵاڵ گوتی: " پاشماوەکەی بۆ ژمارەی سبەیەنێ! "

هەستایە سەرپێ و گوتی: وتار بەمجۆرە دەنووسرێ برادەری ئازیز. هەنووکە بێ زەحمەت ئیمزای خۆتی لێبدە.
دوروا، دوودڵ بوو.
- دەی ئیمزای بکە، چاوەڕوانی چیت؟
دوروا دەستی بە پێکەنین کرد و لە پاینی لاپەڕەکەدا نووسی: " جۆرج دوروا. "
خانم فورستیە، دووبارە بەدەم جگەرەکێشانەوە بە ژوورەکەدا کەوتە ڕاوێچکە، دوروا تەمەشای ئەوی دەکرد و نەیدەزانی چۆن سوپاسی بکات، هیچ وشەیەکی بۆ نەدەهات. خۆشحاڵ بوو دەگەڵ ئەو ژنە گەنجەدایە و، دڵی سەرڕێژ بوو لە منەتباری. زۆر دڵی بەم دۆستایەتیە دڵسۆزانەیەی کە ئیجاد بووبوو، خۆشبوو. وای دەهاتە بەرچاو هەرچی و هەرچیەک لەم ژوورەدا دەبینێ بەشێکە لەم ژنە جوانە، هەموو شتێک، تەنانەت دیوارەکان کە یەکپارچە دۆلاب و ڕەفەی کتێبان بوون، کورسییەکان، قەنەفەکان و ئەو هەوایەی کە دووکەڵی جگەرە تیایدا پەنگی خواردبووەوە، تایبەتمەندی خۆیان هەبوو، تایبەتمەندییەکی باش، جوان، باڵکێش کە لەوەوە سەرچاوەیان دەگرت.
خانم فورستیە لە ناکاوێکا پرسی:- ڕاتان دەربارەی خانم دوماریلی دەستە خوشکی من چییە؟
دوروا، حایر و حەپەساو گوتی:- ها... بەڕای من... زۆر دڵرفێنە.
- وانییە؟
- با، هەڵبەتە.
حەزی دەکرد، ئەمەش بڵێت: " بەلاّم بە ئەندازەی تۆ نا " لێ زاتی نەکرد.

خانم فورستیه، درێژەی بە قسەکەی دا:

- ئەگەر دەزانی چەند خۆشە، چەند زیرەک و هۆشنە! قەرەجە، قەرەجێکی ڕاستەقینەیە، بۆیە مێردەکەی زۆر گوێی ناداتێ. مێردەکەی تەنیا عەیبەکانی دەبینێ و گوێ بەباشیەکانی نادات.

دوروا، کەزانی خانم دوماریل بە مێردە، سەری سوڕما، لە کاتێکا ئەمە بابەتێکی زۆر ئاسایی بوو.

پرسی:- سەیرە، کەواتە بەمێردە؟ شووەکەی چ کارەیە؟

خانم فورستیە، بە نەرمی و لەهەمان کاتدا شانەکان و برۆکانی هەڵتەکاند؛ جووڵەیەکی پڕمانای نامەفهووم بوو.

- موفەتیشی ڕێگای ئاسنی باکوورە. مانگی تەنیا هەشت ڕۆژ لە پاریس دەمێنێتەوە. ژنەکەی ناوی ئەمەی ناوە " بێگاری هەفتە " یان " هەفتەی پیرۆز " کە زیاتر بیناسیت، هەنگێ بۆت دەردەکەوێت کە چەند ژنێکی نازدار و میهرەبانە. ڕۆژێک لەم ڕۆژانەدا بچووە دیدەنی.

دوروا، شوێنەکەی لێخۆش هاتبوو، بەتەمای ڕۆیشتن نەبوو، وای هاتە بەرچاو کە بۆ هەمیشە لێرە دەمێنێتەوە، وەکو ئەوەی لە ماڵی خۆیدا بێ.

لێ دەرگاکە بە بێدەنگی ڤەبوو و پیاوێکی باڵابەرز کە کارەکەرەکە خەبەری هاتنی ئەوی ڕانەگەیاندبوو، خۆی بە ژوورەکەدا کرد. بە دیتنی ئەو پیاوە لە ژوورەوە، لە جێی خۆی هەستا. خانم فورستیە برێک نارەحەت هاتە بەرچاو، بە ڕاوێژێکی ئاسایی، هەرچەندە شانەکانی و ڕوخساری سوور بووبوونەوە، گوتی:

- وەرە ژووری ئازیز. با یەکێک لە هاوڕێ زۆر باشەکانی "شارل" ت پێ بناسێنم، بەڕێز جۆرج دوروا، ڕۆژنامەڤانی ئایندە.

ئەوسا بە ڕاوێژێکی جیاوان، ڕوو لە دوروا، لە سەری ڕۆیی:- باشترین و دڵسۆزترین دۆستی ماڵباتەکەمان، کۆنت دوڤودریک.

جووتە پیاو، سەرێکیان لە هەنبەر یەکدیدا دانەواند و چاویان لە دوڕ چاوی یەکدی بڕی. دوروا، بە پەلە دوعای خزمەتی خواست.

کەس خوڵکی مانەوەی نەکرد. بە دەمەلاڵکێوە چەند وشەیەکی بە ناوی سوپاسگوزارییەوە درکاند، تەوقەی دەگەڵ ژنە گەنجەکەدا کرد، جارێکی دی لە هەنبەر کابرای ناڤبریدا، کە ڕوخسارێکی سادە و بێ موبالاتی ئەشرافانەی هەبوو، سەرێکی دانەواند. زۆر بە شپرزەیی و پەرێشانی وەک ئەوەی کەرێتییەکی لێ سادر بووبێ، لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

کە گەییە ناو گەڕەک و کۆلانەکە، هەستی بە نیگەرانی و خەمبارییەکی زۆر کرد. هەستی خەمبارییەکی گونگ دایگرت. بێ هەدەف ڕێی دەکرد و لە خۆی دەپرسی کە هۆی ئەم خەمە ناگەهانە چییە، هیچ هۆیەکی نەدۆزییەوە، بەلام ڕوخسار و چارەی جدی کۆنت دوڤودریک، کە پیاوێکی ناڤسالی، موو بۆز بوو و، سیمایەکی ئارام و خۆپەسندی تایبەت بە خەڵکانی زۆر دەوڵەمەند و لە خۆڕادیتووی هەبوو، بە بەردەوامی دەهاتە بەرچاوی.

لە ناکاوا، بۆی دەرکەوت کە هۆی ئەم خەمباری ونائومێدییەی، هاتنی ئەم پیاوە نەناسە بوو کە ئەو

دۆستایەتیە بە لەزەتەی کە تازە بۆی دروست بووبوو، لێ تێکدابوو... یەکێک بوو لەو نائومێدی و دڵساردیانەی کە دەشێت بە سەدەمی قسەیەکی ڕەق و ناخۆشەوە، بیرکردنەوە لە کێشەو ئاریشەیەکی پێشبینی کراو، یان بەهۆی بیرکردنەوەوە لە بابەتێکی بچووک، سەروڵی پیاو بگرێت.

هەروەها. وای هەستدەکرد، بێئەوەی بە خۆ بزانێ چما، کە ئەو پیاوە، بەدیتنی ئەم لەوێ، پەست و ناڕەحەت بووە.

تا سەعات سێی پاش نیوەڕۆ هیچ کارێکی نەبوو بیکات و هێشتاش نیوەڕۆ نەبووبوو. شەش فرانک و نیوی لە باخەڵا بوو. چوو بۆ خوارنگەی دوڤال تا نان بخوات. پاشان ئەوەندە بەم بولڤار و بەو بولڤاراندا سوڕایەوە تا سەعات بوو بە سێ. سەری سەعات سێ بە قاڵدرمەکانی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز دا هەڵگەڕا.

شاگردانی ڕۆژنامەکە، دەست لە سەر سینگ لە سەر تەختێک ڕۆنیشتبوون و چاوەڕوان بوو. پەردەدار و دەرگاوانێک لە پشت مێزێکی بچووکەوە، کە لە مێزی مامۆستای سەرپۆلان دەچوو، ڕۆنیشتبوو و ئەو نامانەی پۆلێن دەکرد کە بۆ ڕۆژنامەکە هاتبوون. ئیدی دیکۆر ئاراییەکی ئەوتۆ کرابوو کە هەر موراجعێکی سەرسام دەکرد. جل و بەرگ و زەبت و ڕەبت و زاکونی و هەموو دیکۆرئاراییەکانی دی بە تەواوەتی دەگەڵ ژووری چاوەڕوانی ڕۆژنامەیەکی گەورەدا تێکی دەکردەوە.

دوروا گوتی:- قەراری دیدارم دەگەڵ جەنابی ڤالتر دا هەیە.

دەرگاوانەکە گوتی:- جەنابی بەڕێوەبەر لە کۆبوونەوەدان. فەرموو دانیشن.

بە دەست هۆڵی چاوەڕوانیەکەی، کە خەڵکانی دیکەشی لێدانیشتبوون، نیشاندا.

پیاوانی بەسام و هەیبەت، بە نێوبانگ، میداڵ بەسینگ و بەرۆکەوە لەوێ ڕۆنیشتبوون، هەروەها خەڵکانی بێ سەروبەر و نارێک و پێک کە قۆپچەی پاڵتۆکانیان لە خوارێ ڕا تا سەرەوە داخستبوو، وایان داخستبوو کراسەکانیان دیار نەبوو، بەرۆکیان یەکپارچە پەڵە بوو، کە وەکو نەخشەی جوگرافیا، وشکانیان و ئاو دەریایان وەبیر دێنایەوە. سێ ژنیش لە ناو ئەمانەدا ڕۆنیشتبوون. یەکێکیان جوان و ڕازاوە و ڕووبە خەندە و خەنۆڵ بوو، بە کڵاو ئاڕایشتێکەوە کە لە درەختی نەرگیل دەچوو، ژنەکەی تەنیشتی بە پێچەوانەوە خەمین و گرژ و مۆن بوو، دەم وچاوی یەکپارچە چرچ ولۆچ، بە ئاڕایش و مکیاجێکی کۆنەوە، لەو ئەکتەرە قەدیمیانە دەچوو کە دەوریان تەواو بووبوو، تەمەنی گەنجیان لە دەست چووبوو و تەواو ژاکابوو.

ژنی سێیەم کە جلی عەزیەتباری لە بەربوو، بە ڕەفتار و سەر و وەزعی بێوەژنێکی غەمگینەوە لە سووچێکا ڕۆنیشتبوو.

بیست خولەکێک بووری و نە کەسێک کرایە ژوورەوە و نە کەسێک لە ژوورەوە هاتە دەرەوە.

هەنگێ بیرێک بە مێشکی دوروا دا هات و دووبارە چوو بە سەروەختی پەردەدار و دەرگاوانەکەوە.

- جەنابی ڤالتر مەوعیدی سەعات سێی بۆ من دانابوو. بێزەحمەت بزانە دۆستم جەنابی فورستیە بۆ دەوام نەهاتووە.

هەنگێ ئەویان بە ڕاڕەوێکی درێژدا بۆ ژوورێکی گەورە برد کە چوار کەس لە دەوری مێزێکی کەسکی گەورە دانیشتبوون و سەرقاڵی نووسین بوون.

فورستیە لە لای موغەیرییەکەوە وەستابوو، بەدەم جگەرەکێشانەوە یاری (بیل بووکە) ی دەکرد ( بیل بووکە: یارییەکە لە بابەتی بیلیارد ). لەم یارییەدا زۆر مەعلان بوو، هەرجارێ گۆیەکی درشتی، کە لە داری شمشاد دروستکرابوو و ئامال زەرد بوو، بکردایە بە نووکی کلکی تەشییەکەوە، دەستی بە ژماردن دەکرد: " بیست و دوو، بیست و سێ، بیست و چوار، بیست وپێنج. "

دوروا گوتی: " بیست و شەش. " و دۆستەکەی بێئەوەی جوڵەی سیستەماتیکی دەستی تێکبدات، سەری هەڵبڕی.

- سەیرە، ئەمە تۆی! دوێنێ پەنجاو حەوت چەلان گۆیەکەم کرد بە نووکی کلکی تەشییەکەوە. لێرەدا تەنیا سن پوتین، دەرەقەتم دێ و لێم دەباتەوە. سەرۆکت بینی؟ ئەم نوربرە پیرە کاتێ یاری دەکات زۆر کومیدی دەبێت، بە جۆرێ زاری دادەچەقێنێ لە تۆوایە گەرەکیەتی گۆیەکە قووت بدات.

یەکێک لەو کەسانەی خجڵی نووسین بوو، ڕوویکردە ئەو و گوتی:

- فورستیە، یەکێک هەیە بیل بووکەیەکی هەیە دەیەوێ بیفرۆشێت، شتێکی زۆر عەنتیکەیە، لە داری

دورگەکانی هندی ڕۆژئاوایە. دەڵێ هی شابانۆی ئەسپانیا بووە. داوای شەست فرانکی لێدەکات، پارەیەکی زۆر نییە.

فورستیە پرسی: " کابرا جێگای کوێیە؟ " و چونکە لە حەرەکەتی سی و حەوتەمیندا سەر نەکەوتبوو، دەستی لە یارییەکە بەردا و دەرگای کۆمەدییەکی کردەوە. دوروا، بینی نزیکەی بیست دانە بیل بووکەی زۆر نایاب و عەنتیکە، بەڕیز دانرابوون و ژمارە گوزاری کراون، وەکو شتی زۆر بەنرخ هەڵگیراون. ئەوسا فورستیە ئەوزاری یارییەکەی، کە هێشتا بەدەستییەوە بوو، لە جێی خۆی دانا و دووبارە پرسی:

- ئەم شتە بە نرخ و نایابە لە کوێ دەبینرێ؟

پەیامنێرەکە بەرسڤی دایەوە:- لەلای بلیت فرۆشەکەی تەماشاخانەی ودڤیلە. ئەگەر بتەوێ سبەینێ بۆتی دەهێنم.

- زۆرباشە، بیهێنە، ئەگەر بەڕاستی جوان بێ دەیکڕم، پیاو تا بیل بووکەی زۆربێ هێشتا هەر کەمە.

ئەوسا ڕوویکردە دوروا و گوتی:

- وەرە لە گەڵم، بۆلای سەرۆکت دەبەم، دەنا دەبێ ئەوەندە چاوەڕێ بکەی تا وەکو گیا لە جێی خۆت بڕوێیت.

دووبارە خۆیان بە ژووری چاوەڕوانیدا کرد، هەمان خەڵک بە هەمان دەقی پێشووەوە لەوێندەر ڕۆنیشتبوون. هەرکە فورستیە وەژوورکەوت ژنە گەنجەکە و ئەکتەرە پیرە قەدیمیەکە بەرزەپێ هەستان و بەپیرییەوە هاتن.

فورستیە، ئەو دوانەی یەک لە دووی یەک بردنە لای پەنجەرەکەوە، هەرچەندە هەوڵیان دەدا بە ئەسپایی قسە بکەن، دوروا، گوێی لێبوو کە فورستیەی برادەری بە تۆ ( واتە خۆمانە ) دەیدواندن.

ئەوسا لە دوو دەرگای ئەستوورەوە تێپەڕین و خۆیان بە ئۆفیسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکەدا کرد.

ئەو کۆبوونەوەیەی کە ماوەیەی یەک دانە سەعات بوو تا ئێستا بەردەوام بوو، بریتی بوو لە کۆبوونەوەیەک بۆ یاری وەرەق، بە هاوبەشی چەند کەسێک لەو ئاغایانەی کە دوروا شەوی بووری دیتبوویانی. جەنابی ڤالتر، وەرەقەکانی بەدەستەوە بوو و بەدیقەت، بە تەمەرکوزێکی زۆر و بە حەرەکەتێکی حیلەبازانە یاری دەکرد، وەختایەک ڕەقیبەکەی، وەرەقە بۆرباوەکانی بە تەڕدەستی و نەرمی یاریچیەکی مەعلان و کارامە فڕێ دەدا، ئەو هەڵی دەگرتەوەو بەرز و نزمی دەکردەوە. نوربردوڤارن، لە سەر کورسی بەڕێوەبەرایەتی دانیشتبوو و خەریک بوو گوتارێکی دەنووسی. جاک ریڤال لە سەر قەنەفەیەک ڕاکشابوو، بەدەم چاو نوقاندنەوە جگەرەی دەکێشا. بۆنی چەرمی موبێلەکان، پاشماوەی دووکەڵی جگەرە، چاپخانەکە و هەوای پەنگاوە، ژوورەکەی پڕ کردبوو، هەمان بۆنی ژووری نووسین بوو کە هەموو ڕۆژنامەڤانان پێی ئاشنان و لەلایان غەریب نییە.

لە سەر مێزێکی تەختەی ڕەش، کە هەندێ نیگاری بە مس لە سەر نەخشێنرابوو، یەک دنیا کاغەز لە سەریەک کەڵەکە بووبوو، هێندە زۆر بوو پیاو باوەڕی بەچاوی خۆی نەدەکرد: نامە، کارت، ڕۆژنامە، گۆڤار، فاتورەی حیسابی فرۆشیارەکان و هەموو جۆرە کاغەزێکی چاپکراو.

فورستیە، تەوقەی دەگەڵ یەک بە یەکی یاریچیەکاندا کرد، لە پشتیانەوە وەستا و بێئەوەی تاقە قسەیەک بکات، تەمەشای یارییەکەی دەکرد، پاشان هەرکە بابا ڤالتر بردییەوە، پێی گوت:- ئەمە دوروای برادەرمە.

بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە، لە ناکاوا و لە سەرووی شووشەی چاویلکەکەیەوە، تەمەشایەکی دوروای کرد و پاشان لێی پرسی:- وتارەکەت بۆ هێناوم؟ دەگەڵ ئەو وتارەی ئەمڕۆدا کە دەربارەی مورل نووسراوە، کارێکی جوان دەردەچێت.

دوروا، چەند بەرپەڕێکی، کە چوارقەدی کردبوون، لە بەرکی دەرهێنا و گوتی:- فەرموو قوربان.

بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە خۆشحاڵ بوو و دەم بە خەندەوە گوتی:

- زۆرچاکە، زۆرباشە. تۆ کەسێکی بە وەعید و بەڵێنی. فورستیە پاشان باسی ئەم وتارەم بۆ بکە.

لێ فورستیە بلەز بەرسڤی دایەوە:

- پێویست ناکات جەنابی ڤالتر، من خوێندوومەتەوەو هەندێ شتیشم فێر کردووە. وتارێکی زۆر باڵکێشە.

بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە هەنووکە خەریک بوو وەرەقێکی لە بەرێزێکی باڵابەرزی لاواز، کە نوێنەری چەپی ناوەڕاستی ئەنجوومەن بوو، وەردەگرت، بەبێ موبالاتی لە سەری ڕۆیی: " کەواتە باشە. " فورستیە دەرفەتی نەدا دەست بە دەستێکی دیکەی یارییەکە بکات، دانەوییەوە و زاری لە پەناگوێی نا و گوتی: " لە بیرتانە قەولت بەمن دا کە ئاغای دوروا لە جیاتی مارانبو وەکو یاریدەدەری من دابمەزرێنی، قابیلیت ئەو بەهەمان مەرج گل بدەمەوە؟

- بەڵێ لاریم نییە.

فورستیە، باسکی دۆستەکەی گرت و دەگەڵ خۆیدا بردی و ئاغای ڤالترش دووبارە دەستی بە یارییەکە کردەوە.

نوربردوڤارن، سەری بەرز نەکردەوە، پێدەچوو دوروای نەدیتبێت یان نەیناسیبێتەوە. جاک ریڤال بە پێچەوانەوە، دۆستانە و بەگەرمی، وەکو هاوڕێیەکی باش کە بشێت لە تەنگانەدا ڕووی لێبنرێت، بەو ئاوایە دەستی گوشی.

جارێکی دی بە هۆڵی چاوەڕوانیا تێپەڕین، چونکە هەمووان سەریان هەڵبڕی و تەمەشای ئەو جووتەیان کرد، فورستیە ڕووی کردە ژنە گەنجەکە و، بە دەنگێکی بەرز کە هەمووان گوێیان لێبێ گوتی: " جەنابی بەڕێوەبەر، چەند خولەکێکی دی دەتبینێ. جەنابیان حاڵی حازر، دەگەڵ دوو کەسی ئەندامی کومیسونی بودجەدا، کۆبوونەوەی هەیە.

ئەوسا بە هەشتاو و بەسەر وسیما و ڕواڵەتێکی زۆر سەرقاڵەوە، وەکو ئەوەی بڕوات وتارێکی زۆر بە پەلە و گرینگ بنووسێت، لە هۆڵی چاوەڕوانیەوە وەدەرکەوت.

هەرکە گەیشتەوە ژووری نووسین، فورستیە یەکسەر چوو بە سۆراخی یاری بیل بووکەوە، بەدەم یارکردنەوە و بەدەم بڕینی ڕستەکانییەوە تا ژمارەی سەرکەوتنەکانی بژمێرێت، بە دوروای گوت:

- ئێ، ئیدی کاری تۆ ئەمەیە: هەموو ڕۆژێ سەعات سێی دوانیوەڕۆ دێی بۆ ئێرە و من پێت دەڵێم کە دەبێ بۆ کوێ بڕۆیت و دیدار دەگەڵ چ کەسانێک بکەیت، ئەم دیدارانە یان پێش نیوەڕۆ ئەنجام دەدرێن یان بە ڕۆژەوە یان بە شەوان. یەک: یەکەم کارم ئەمەیە، کە کارتێکت دەدەمێ کە بیبەی بۆلای سەرۆکی ئیدارەی یەکەمی پۆلیسی گشتی، دوو: کە بەیەکێ لە کارمەندەکانی خۆیەوەت گرێ بدات، تا بۆ وەرگرتنی هەر هەوال وَ نووچەیەکی گرینگ هاوکاری دەگەڵ ئەودا بکەیت. سێ: هەروەها هەواڵەکانی

ئیدارەی پۆلیسی گشتی ( ئەمن وئاسایش )، هەڵبەتە هەواڵە فەرمی و نیمچە فەرمیەکان. بۆ وەرگرتنی وردەکاریانی زیاتر، دەچیت بۆلای سن پوتین کە ئاگاداری هەموو شتێکە، ئاگای لە خشەی مار و مێرووانە. چوار: یا ئێستا ویەکسەر برۆ بۆلای یان سبەینێ. هەڵبەتە دەبێ فێری ئەوەبیت قسان لەو کەسانە دەربێنی کە تۆیان بۆ نک دەنێرم. پێنج: خۆت بە هەموو کونێکا بکەی، شەش: هەقی ئەم کارە مانگانە دووسەد فرانک وەردەگریت، سەبارەت بە هەواڵە گەرمەکان بۆ هەر دێڕێک دوو سوو وەردەگریت، حەوت: جگە لەوەی بۆ هەر دێڕێک دوو سوو وەردەگریت، سەبارەت بەو وتارانەش کە داوات لێدەکرێ سەبارەت بە بابەتێن جۆراوجۆر بیانووسیت، دوو سوو وەردەگریت، هەشت:

ئەوسا بێئەوەی هیچ قسەیەکی دی بکات، دەستی بە یارییەکەی کردەوە و بەخاوی لە سەر ژماردن بەردەوام بوو: نۆ، دە، یازدە، دوازدە، سیازدە. کە گەیبە سەر ژمارە چواردە نەیتوانی گۆیەکە بخاتە سەر کلکی تەشییەکە.

– شەیتان بە نەحلەت بێ، ئەم ژمارە سیازدەیە بۆمن شوومە، هەموو جارێ لەو ژمارەیەدا شکست دێنم. دڵنیام مردنەکەشم دەکەوێتە ڕۆژی سیازدەی مانگێکەوە.

یەکێک لە ڕۆژنامەنووسەکان کە لە کاری نووسین بووبووەوە، بیل بووکەیەکی لە کۆمەدییەکە دەرهێنا، پیاوێکی وردیلە بوو، هەرچەند تەمەنی سی ساڵان بوو، لێ بە ڕواڵەت منداڵ دیاربوو، پاشان چەند ڕۆژنامەڤانێکی دیکەش خۆیان بە ژوورەکەدا کرد، چوون بە لای کۆمەدییەکەوە و هەرکەسە و بیل بووکەی خۆی دەرهێنا.

خێرا بوون بە شەش کەس کە بەڕیز لە پەنا دیوارەکەدا وەستابوون و بە حەرەکات و جووڵەی سیستەماتیک و چوون یەک، گۆیە سوور و زەرد یان ڕەشەکانی خۆیان، هەر گۆیە و بەگوێرەی جۆری ئەو دارەی لێی دروستکرابوو، بەحەوادا هەڵدەدا. ئیدی کە ڕکابەری کەوتە نێوانیانەوە، ئەو دووکەسەش کە لە پشت مێزەکەوە سەرگەرمی نووسین بوون، لەجێی خۆیان هەستان و هاتن تا داوەری سەبارەت بە گەمەکەی ئەوان بکەن.

فورستیە بە یازدە خاڵی زیاتر، براوە دەرچوو. پیاوە وردیلەکە دۆڕابوو، پێشخزمەتەکەی گازکرد و ڕایسپارد نۆ پەرداخ بیرە بێنێ. پاشان دووبارە، لە سەر ساردی تەزی دەستیان بەیاری کردەوە.

دوروا، پێکە بیرەکەی دەگەڵ هاوکارە تازەکانیا خواردەوە و ئەوسا لە فورستیەی دۆستی پرسی:- ئێستا چ بکەم؟

فورستیە گوتی:- ئەمڕۆ کارم پێت نییە، ئەگەر حەزدەکەی بڕۆی، دەتوانی بڕۆیت.

- ئەدی.... وتارەکە... وتارەکەمان... ئەمشەو بڵاو دەبێتەوە؟

- بەڵێ، بەڵام هەقت نەبێت، خۆم نموونە چاپکراوەکان هەڵەچن دەکەم، بەشەکەی دیکەی بۆ سبەینێ ئامادە بکە و وەکو ئەمڕۆ سەعات سێ وەرە بۆ ئێرە.

دوروا، دەستی هەموو ئامادەبووانی گوشی، بە بێئەوەی ناویان بزانێت، پاشان بە دڵێکی شاد وبە ڕوحێکی بارسووکەوە، لە پلیکانە جوانەکانی ڕۆژنامەکەوە داگەڕا.

( ٤ )

جۆرج دوروا، هێنده به خه‌یاڵی وتاره‌كه‌ی و بڵاوبوونه‌وه‌ی وتاره‌كه‌یه‌وه خه‌وت، كه خه‌وێكی زۆر خراپی كرد، خه‌وی زڕا، به‌یانی زوو له خه‌و ڕابوو. پێش ئه‌وه‌ی سه‌روسه‌كوتی ڕۆژنامه‌فرۆشانی ده‌سگێڕ په‌یدا ببێت، خۆی به كوچه و كۆڵانه‌كاندا كرد، سه‌ری ئه‌م ده‌كه و ئه‌و ده‌كه‌ی دا.

ئه‌وسا بۆ وێستگه‌ی قیتاری سن لازار ڕۆیی، ده‌یزانی ڕۆژنامه‌ی لاڤی فرانسز زووتر له گه‌ڕه‌كه‌كه‌ی ئه‌و، ده‌گاته ئه‌وێنده‌ر. چونكه هێشتا زۆر زوو بوو. به‌سه‌ر شۆسته‌كه‌دا كه‌وته ڕاوێچكه وپیاسه. ژنه ڕۆژنامه‌فرۆشه‌كه‌ی بینی كه هات جامخانه‌ی كۆشكه‌كه‌ی كرده‌وه، كه‌مێ دواتر پیاوێكی بینی كه ده‌سته‌یه‌كی گه‌وره‌ی ڕۆژنامه‌ی قه‌دكراوی به سه‌ر سه‌ره‌وه بوو و ده‌هات. به‌غار به‌ره‌وپیری چوو، به‌ڵام ڕۆژنامه‌یه‌كی دی بوو: لوفیگارو، لوگیل بلاس، لوگلوا، لیڤنمان و دوو بلاڤۆكی دیكه‌ی به‌یانیان بوو، به‌ڵام لاڤی فرانسزی پێ نه‌بوو.

ترسی لێنیشت: ' باشه ئه‌گه‌ر بڵاوكردنه‌وه‌ی وتاری (بیره‌وه‌ریه‌كانی سه‌ربازێكی سواره‌ی ماموری خزمه‌ت له ئه‌فریقا ) یان خستبێته سبه‌ی چی؟ یان به‌ڕێكه‌وت، له دوا ساتدا، بابا ڤالتر به دڵی نه‌بووبێ و ڕه‌فزی كردبێت؟

وه‌ختایه‌ك به‌ره‌ولای كوشكه‌كه زڤڕییه‌وه، سه‌یری كرد، به‌بێئه‌وه‌ی ئه‌و به گه‌یشتنی ڕۆژنامه‌كه‌ی زانیبێ، خه‌ڵكی خه‌ریكی كڕینی ڕۆژنامه‌كه‌ن، به‌په‌له چووه پێشه‌وه، سێ سووی له سه‌ر پێشخوانه‌كه دانا و نوسخه‌یه‌كه‌ی له

ڕۆژنامەکە هەڵگرت و چاوێکی لەزگینی بە مانشێتەکانی یەکەمدا گێڕا. هیچ هەواڵێک لە وتارەکەی ئەو نەبوو. دڵی کەوتە پەلەپەل، ڕۆژنامەکەی کردەوە و کاتێ لە پاینی یەکێک لە ستوونەکاندا بینی ناوی " جۆرج دوروا " بەخەتی درشت چاپ بووە، لە ناخی دڵەوە هاڕوژا. ناوی لە ڕۆژنامەکەدا هاتبوو، چ شادی و خۆشییەکی گەورە بوو.

بێئەوەی بیر لە هیچ شتێکی دیکە بکاتەوە، ڕۆژنامەکەی خستە ژێر باخەڵی و کڵاو بەدەست کەوتەڕێ، پڕ بەدڵ حەزی دەکرد، ڕێبوارەکان ڕابگرێت و پێیان بڵێت: " ئەم ڕۆژنامەیە بکڕن، ئەم ڕۆژنامەیە بکڕن! وتارێکی منی تیا بڵاوبووەتەوە. " حەزی دەکرد تا زاری دەگرێت، وەکو هەندێک لەو خەڵکانەی کە دەمەوئێواران لە ناو بولڤارەکاندا هاواردەکەن، هاوار بکات: " لاڤی فرانسز " بخوێننەوە، وتارەکەی جۆرج دوروا بخوێننەوە: " بیرەوەرییەکانی سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە ئەفریقا " بخوێننەوە. و لە ناکاوا خولیای ئەوەی کەوتەسەر کە بەخۆی ئەم وتارە لە شوێنێکی گشتی، لە کافەیەکا کە لەبەرچاوانی هەمووانداب، بخوێنێتەوە. ئیدی بۆ کافەیەک گەڕا کە پڕبێ لە مشتەری، ڕێگای زۆری بڕی. سەرەنجام لەبەردەم مەیخانەیەکدا وەستا کە پڕبوو لە مشتەری، مێزێکی هەڵبژارد و داوای پێکێک عارەقی نەی شەکەری کرد، بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە کەس بەو بەیانی زووە عارەق ناخواتەوە. ئەوسا گارسۆنەکەی گازکرد و گوتی: " گارسون، نوسخەیەکی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزم بۆ بێنن. "

پیاوێک بە بەرهەڵبێنەیەکی سپیەوە، بلەز هات:

– قوربان ئەو ڕۆژنامەیەمان نییە، تەنیا ڕۆژنامانی لوراپل، لوسیکل، لولانترن و لوپتی پاریزین ˚ مان بۆ دێنن.

دوروا، بە ڕاوێژێکی توورە گوتی: ئێرەش بووبە مەیخانە، بڕۆن نوسخەیەکم بۆ بکڕن.

یارۆی پێشخزمەت ڕۆیی نوسخەیەکی کڕی و بۆی هێنا. دوروا دەستی بە خوێندنەوەی وتارەکەی خۆی کرد، چەندین جار، هەربۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکەکە ڕابکێشێ و واداریان بکات کە بزانن ڕۆژنامەکە چی بڵاو کردووەتەوە، بە دەنگی بەرز گوتی: ˚ زۆر چاکە، زۆرچاکە ˚ ئەوسا ڕۆژنامەکەی لە سەر مێزەکە بەجێهێشت و ڕۆیی.

خاوەن مەیخانەکە هەستی بەوە کرد و بانگی کرد:– برادەر، برادەر، ڕۆژنامەکەت لە بیر چوو.

دوروا، بەرسڤی دایەوە:– بۆ ئێوەم بەجێهێشتووە، خوێندمەوە. ئەمڕۆ بابەتێکی زۆرجوانی بڵاو کردووەتەوە.

ناوی بابەتەکەی نەگوت، بەڵام هەر بەو دەقەوە کە لەوێندەر دوور دەکەوتەوە سەیری کرد یەکێک لە مشتەرییەکان، ڕۆژنامەکەی سەر مێزەکەی ئەوی هەڵگرت.

لە دڵی خۆیدا گوتی: ˚ ئێستا کێوە بچم؟ ˚ لێبڕا سەرێکی دایەرە بدات، مووچەی ئەم مانگەی وەربگرێت و پاشان ئیستیقالە بدات. لە بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن سەرۆکەکەی و هاوکارەکانی بە هەواڵی ئیستیقالەکەی وبڵاوبوونەوەی وتارەکەی سەریان دەسوڕمێ، لە خۆشیا خەریک بوو باڵ بگرێت، بە تایبەتی حایرمانی سەرۆکەکەی زۆری خۆشحاڵ دەکرد.

بەخاوی ڕێی دەکرد تا زووتر لە سەعات نۆ و نیو نەگاتە دایەرە. چونکە ژمێریاری سەعات دە دەکرایەوە.

شوێنی کارەکەی ژوورێکی گەورەی نیمچە تاریک بوو، بۆیە دەبوایە بە درێژایی زستان چرای گازی تیا بسووتێ. پەنجەرەکانی بەسەر حەوشێکی چکۆلەی چۆڵا و ڕووبەڕووی ساختمانەکانی دیکەی دایەرەکە دەکرانەوە. هەشت کارمەند لەم ژوورەدا مژوولی کاربوون، ئەمە جگە لە یاریدەدەری دایەرەکە کە بەرمەجێل و چەپەرێکی لەبەر مێزەکەی دانابوو و لەوانی دیکەی جیادەکردەوە.

دوروا، یەکەمجار چوو بۆ سەر سەندووقەکە و سەد و هەژدە فرانک و بیست و پێنج سانتیمی مانگانەکەی خۆت وەرگرت، پاشان بە سەروسیمای سەرکەوتووانەوە خۆی بە ژوورێکی گەورەدا کرد کە ڕۆژانێکی زۆری تیا بەسەر بردبوو.

هەرکە وەژوور کەوت، جەنابی پوتیل، یاریدەدەری دایەرەکە بانگی کرد:- جەنابی دوروا، ئاخری هاتی؟ جەنابی سەرۆک چەند جارێک داوای کردوویت. دەزانی ئەو، ئەمەی قەبووڵ نییە، دوو ڕۆژ دوا بە دوای یەک نەخۆش بکەوی و ڕاپۆرتی پزیشک نەیەنیت.

دوروا، کە لە ناوەندی ژوورەکەدا وەستابوو و خۆی بۆ کاردانەوەی هاوکارەکانی ئامادە دەکرد، بەدەنگی بەرز گوتی:- ئەوەی ڕاستی بێ، من باکم بە هیچ نییە و گوێم لە هیچ نییە!

هاوکارەکانی حایر وحەپەساو سەریان هەڵبڕی و لەو ڕامان. ڕوخساری پەشۆکاوی جەنانی پوتیل لە سەروو چەپەر و بەرمەجیڵەکەوە بە دیارکەوت.

چونکە نەخۆشی ڕۆماتیزمی ( باداری ) دەگەڵدا بوو، بۆ ئەوەی خۆی لە ڕەوتی بایەکە بپارێزێت، خۆی لەم ژوورە چکۆلەیەدا حەپس کردبوو. تەنیا دوو کونی کردبووە چەپەرەکەی دەوری تا لەوێوە چاودێری کارمەندەکانی بکات.

بێدەنگیەکی ئەوتۆ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو، کە گوێت لە دەنگی فڕینی مێش و مەگەزانیش دەبوو، یاریدەدەری دایەرەکە سەرەنجام بە دوودڵی پرسی:- چیت گوت؟

- گوتم باکم بە هیچ نییە. من ئەمڕۆ تەنیا بۆ ئەوە هاتووم کە ئیستیقالە بدەم. بەمانگانەی پێنج سەد فرانک لە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی لاقی فرانسز دامەزراوم، جگە لە پاداشتی هەر دێڕە نووسینێک، لەمڕۆوە دەستم بەکار کردووە.

وێڕای ئەمەش بەڵێنی بەخۆی دابوو، بە دوور ودرێژی بەتانی مەسەلەکەدا بچێت و درێژەی بداتێ تا لەزەتی زیاتر بدینێت، لێ نەیتوانی لە هەنبەر خۆڕانان و خۆ نواندندا خۆی بگرێت و هەموو قسەکانی بە کەڕەتێک نەکات.

وێڕای ئەوەش کاریگەری قسەکانی زۆر قووڵ بوو. کەس لە جێی خۆی نەدەجوڵا، تەکانی نەدەخوارد. ئەوسا دوروا گوتی:- جارێ دەچم بۆلای جەنابی پیرتویس تا

ئاگاداری بکەمەوە وپاشان دێم خوداحافیزی و خاترخوازی لە ئێوەش دەکەم.

ئەوسا چوو بۆلای سەرۆکی دایەرەکە، سەرۆک کە ئەوی بینی گوتی:

- ئاە ئەنجام سەر وسەکوتت دەرکەوت. دەزانی کە من نامەوێ...

دوروا قسەکەی پێبڕی:- پێویست ناکات بەمجۆرە هاوارم بەسەردا بکەیت...

بەڕێز پیرتویس کە پیاوێکی قەڵەو و زەلام و بەکەلەش بوو، دەم وچاوی سوور دەتگوت پۆپنەی کەڵەبابە، لە سەرسامیا هەناسەی سواربوو.

دوروا، لە سەری ڕۆیی:- دڵم لە دام و دەزگایەکەت هەڵدێ. من لەمڕۆوە لە ڕۆژنامەیەکدا دەست بەکار بووم کە پێشنیازی کارێکی باشیان بۆ کردووم. دەگەڵ ڕێزما بۆ جەنابت، من بە دوعا.

ئەوسا لە ژوورەکە وەدەرکەوت، تۆڵەی خۆی کردبووەوە، دڵی خۆی کردبوو بە تەرزە. چوو بەلای هاوکارەکانی جارانییەوە و تەوقەی دەگەڵ یەک بەیەکیاندا کرد، بەڵام ئەوان لەترسی ئەوەی نەبا کارەکانیان بکەوێتە مەترسییەوە، هیچ قسەیەکیان نەکرد، چونکە لەپشت دەرگا نیمچە کراوەکەوە، گوێیان لە هەموو ئەو قسانە بووبوو کە ئەو دەگەڵ سەرۆکی دایەرەکەیاندا کردبووی.

بەگیرفانی پڕەوە خۆی گەیاندە سەر جادەکە. لە خوارنگەیەکی باشدا کە دەیناسی و نرخەکەی گونجاو بوو، لایدا و فراڤینێکی تێر وتەسەلی خوارد. پاشان نوسخەیەکی

ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزی، کە دووبارە کڕی بوویەوە، لە سەر مێزەکە بەجێهێشت و وەدەرکەوت. سەری چەند موغازەیەکی داو هەندێک خوردە پێویستیانی کڕی، تەنیا بۆ ئەوەی کڕی بوون تا بۆی بێننە بەر دەرگای ماڵەوەو ڕادەستی بکەن: " بە ناوی جۆرج دوروا. من ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزم. "

پاشان ئەدرەسی کۆڵانەکە و ژمارەی خانووەکەی دابوو بە فرۆشیارەکە و پێی گوتبوو: " ئەمانە بدەنە دەست دەرگاوانەکە. "

چونکە هێشتا زوو بوو وەختی زۆری بە دەستەوە مابوو، خۆی بە دوکانێکی فۆتی کۆپیدا کرد کە کارتی شەخسی چاپ دەکرد و لە زەرفی چەند خولەکێکدا وێی دەدایەوە، داوای کرد سەد کارتی بە ناونیشانی کارە تازەکەیەوە بۆ ڕاکێشن، پاشان ڕۆیی بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە.

فورستیە، ئەمجارەیان وەکو سەرۆکێک چۆن پێشوازی کارمەندێکی خۆی دەکات بەو ئاوایە ڕەفتاری دەگەڵ کرد.

- هاتی، زۆر باشە، ئەوەی ڕاستی بێ چەند کارێکم پێت هەیە. دە خولەکێک سەبر کە تا من لە کارەکەم دەبمەوە.

درێژەی بە نووسینی ئەو نامەیە دا کە دەستی بە نووسینی کردبوو. پیاوێکی کورتەباڵای ڕەنگزەرد، قەڵەوی کەچەڵی سەرساف، بە کەڵلەیەکی سپی بریقەدارەوە لەوبەری مێزێکی گەورەوە دانیشتبوو و شتی دەنووسی. چونکە کەسێکی زۆر نزیک بین بوو، بە تەواوی سەری بەسەر کاغەزەکەدا دانەواندبووەوە.

فورستیە بەو کابرایەی گوت:- سن پوتین، تۆ کەی دەچی بۆ هەڤپەیڤین دەگەڵ ئەو پیاوانەدا؟

- سەعات چوار.

- ئەم دوروا گەنجەش دەگەڵ خۆتا ببە و فەند و فێڵی کارەکەی فێربکە.

- باشە.

ئەوسا فورستیە رویکردە دۆستەکەی ( دوروا ) و لە سەری رۆیی:

- بەشی دووەمی بیرەوەرییەکانی جەزایرت هێناوە؟ وتارەکەی ئەمرۆ بەیانیت، زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکراوە.

دوروا، پەشۆکا و بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- نا، وام وێنا دەکرد ئەمرۆ دوانیوەرۆ وەختم دەبێت- کاری زۆرم هەبوو کە دەبوایە ئەنجامیان بدەم، نەمتوانی...

فورستیە، بە سەروسیمایەکی ناڕازییەوە شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

- ئەگەر ئاگادار و پابەندی وەخت نەبیت، ئایندەی خۆت دەخەیە تالوکەوە. بابا ڤالتر، چاوەڕوانی وەرگرتنی بەشی دووەمی وتارەکە بوو. دەڕۆم پێی دەڵێم سبەینێ دەیهێنێ. بەڵام ئەگەر وا وێنا بکەی بە بێئەوەی هیچ کارێک بکەی، پارەت دەدەنێ، ئەوا سەهووی.

دوای هەڵوەستەیەک لە سەری ڕۆیی:- ئاسن بە گەرمی دەکوترێ ها.

سن پوستین هەستا و گوتی:- من ئامادەم.

فورستیە، پاڵی بە پشت کورسییەکەیەوە دا، بۆ دەرکردنی دەستوورەکانی، قەڵافەتێکی کەم دابێژێک فەرمی لە خۆ گرت و بە دوروای گوت:

- دەی، دوودانە ڕۆژە کە جەنەڕاڵی چینی، لی تینگ فایو هاتووەتە پاریس و لە ئوتێلی کونتینانتال لایداوە و ڕاجای هندی " تاپوسا هیب ڕامادرایوپالی " ش لە ئوتێلی بریستولە. بڕۆن دیمانە و هەڤپەیڤین لە گەڵ ئەوانەدا بکەن.

ئەوسا ئاوڕی لە سن پوتین دایەوە و درێژەی دایێ:

- ئەو بابەتە سەرەکی وگرینگانەت لە بیر نەچن کە پێمگوتیت. لە جەنەڕاڵی چینی و لە ڕاجەی هندی بپرسە کە ڕایان سەبارەت بە سیاسەت و کارەکانی ئینگلستان لە ڕۆژهەلاتی دوورا چییە و باوەڕیان دەربارەی ڕەوشی بە کۆلۆنی کرن و داگیرکردنی ولاتان و بەتایبەتی سەبارەت بە دەستوەردانی فەرەنسا لە کاروباری کۆلۆنیەکاندا، چییە.

سووکە هەلوەستەیەکی کرد و پاشان وەک بلێی قسە دەگەڵ خۆیدا بکات لە سەری ڕۆیی:

- بۆ خوێنەرانی ئێمە زۆر گرینگە بزانن کە خەڵکی چین وهند، چ بیر وبۆچوونێکیان سەبارەت بەم مەسەلانە هەیە، ئەم بابەتە بۆڕای گشتی مەسەلەیەکی گەرمی ڕۆژە.

ئەوسا ڕوو لە دوروا گوتی:- باش دیقەت بدە، بزانە سن پوتین چۆن کاردەکات، ئەو پەیامنێرێکی بە ئەزموون و زۆر کارامەیە، هەوڵبدە بە خێرایی و لە زەمەنی پێنج خولەکدا، ئەو سەرەداوانە بدۆزییەوە کە بۆ خالّی کردنی بیرە دەروونی و پەنهانەکانی بەرانبەرەکەت پێویستن.

پاشان درێژەی بە نووسینی نامەکەی دا، بە ئاشکرا ئەوەی پێوە دیاربوو کە بە نیازە فاسیلەی نێوان خۆی و دۆستە کۆن و هاوکارە تازەکەی بپارێزێت و سنوورێکی بۆ دابنێت.

هەرکە لە دەرگا وەدەرکەوتن، سن پوتین دەستی بە پێکەنین کرد و بە دوورەوای گوت:

- چەند وەستایە لە خۆڕانان، دەیەوێ وا خۆی بنوێنێ کە زۆر گرینگە، لەبەرچاوی کێش! لەبەرچاوی ئێمە. ئێمە بە خوێنەرانی ڕۆژنامە دەزانێ.

کاتێ گەیینە ناو بولڤارەکە، یارۆی پەیامنێر پرسی:- حەزت لێیە شتێک بخۆیتەوە؟

- بەڵێ بە کەماڵی ئارەزوو. دنیا زۆر گەرمە.

خۆیان بە کافەیەکدا کرد و داوای ڤەخارنی ساردیان کرد. ئەوسا سن پوتین دەستی بە قسان کرد. هەرچییەکی سەبارەت بە ڕۆژنامەکە و هاوکارەکانی لە لابوو، بەوپەڕی وردی وەکو هێلکەی پاککراو خستە دەستی دوورەواوە.

- بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە؟ کابرایەکی جوولەکەی ڕاستەقینەیە. دەزانی جوولەکە ناگۆڕێن، نەژادێکی سەیرن!

ئەوسا کەوتە باسی تایبەتمەندییەکانی ڕژدی و چرووکی وان، ڕژدی و تەمەعکاری ڕۆڵەکانی دیار و دەڤەری ئیسرائیل، پاشکەوت کردنی دە سانتیمی، سەوا و مامەڵە و چەنەچەنی بازاڕی و حەیابەرە بۆ سووکە کەمکردنەوەیەکی نرخ. ڕەوشی سووتخۆری و قەرزدان بە قازانج.

- وێڕای هەموو ئەم قسانەش، پیاوێکی خۆش مامەڵەیە کە باوەڕی بە هیچ نییە وکڵاو لە سەری هەمووان دەنێ. ڕۆژنامەکەی کە هەم نیمچە فەرمییە هەم کاتولیک، هەم لیبراڵە و هەم کۆماریخوازە، هەم سەڵتەنەتخوازە، هەم چێشتی مجێورە و هەم چوارشەمە بازاڕ، تەنیا بۆ ئەوەی

دامەزراندوە کە سەرپۆشێک بێ بۆ سەواومامەڵەکانی لە سەنتەری بۆرسە و چالاکییەکانی دیکەی. لەم کارەدا وەستایەکی لە زەبر و مەعلانە، بە ناوی کۆمەڵێک کۆمپانیاوە کە خاوەنی تاقە پولێکی قەڵب نین، ملیۆنان فرانک دەخاتە تەنکەی باخەڵی..

بەدەم قسانەوە کە بە دوروای دەگوت" دۆستی ئازیزم" لە سەری ڕۆیی:

– ئەم پیاوە ئاڵچاخە، لە قسەکردنا شێوازی بالزاکی هەیە. تەسەورکە ئەو ڕۆژە من و ئەم نوربرە پیرەی عەسری بەرد و ریڤالی دۆنکیشۆت ئاسا، لە ئۆفیسەکەی ئەو بووین کە " مونتلن " ی بەڕێوەبەری کاروباری دارایی ڕۆژنامەکە بەخۆی و جانتا چەرمەکەیەوە وەژوور کەوت، ئەو جانتا چەرمییەی هەموو خەڵکی پاریس دەیناسنەوە.
ڤالتر سەری هەڵبڕی و پرسی:– خەبەر و باسی تازە؟

مونتلن، ساوێلکانە گوتی: " ئەو شازدە هەزار فرانکەم، کە قەرزارباری کاغەزفرۆشەکە بووین، دایەوە. "

سەرۆک، لە ناکاوا لە جێی خۆی ڕاپەڕی، ڕاپەڕین نە گاڵتە.

– چیت گوت؟
– قەرزەکەی پریڤام دایەوە.
– مەگەر شێت بووی؟
– بۆ؟
– بۆ... بۆ... بۆ....

چاویلکەکەی لە چاوی داکەند، شووشەکانی سڕی. ئەوسا بزەیەکی کرد، لەو بزە سەیرانەی کە هەرجارێ

بیویستبا فیڵێک بکات یان قسەیەکی توند گۆناکانی چرچ دەبوون، ئەوسا بە ڕاوێژێکی تەوسامێز و قەناعەت بەخشەوە گوتی: " بۆ؟ چونکە دەمانتوانی چوار پێنج هەزار فرانکی پێ دابشکێنین. "

مونتلن بە حایرمانەوە گوتی: " بەڵام جەنابی سەرۆک، هەموو حیساب و کیتابەکە دروست و بێ کەم وکوڕی بوو، بەخۆم زۆر بە وردی پێیدا چوومەوە و خۆشتان پێی ڕازی بوون... "

هەنگێ سەرۆک بە جدی گوتی: " هەموو کەسێک وەکو تۆ ساویلکە نییە جەنابی مونتلن، ئەوە چاک بزانە کە پیاو تا دەتوانێ ئاستی قەرزەکانی بەرز بکاتەوە، تا بتوانێ سوڵح دەگەڵ خاوەن قەرزەکانیا بکات. "

سن پوتین وەکو کەسێکی پسپۆڕ و شارەزا سەرێکی لەقاند و لە سەری ڕۆیی:

- ها؟ بەڕای تۆ ئەم ڕستانە بالزاکی نین؟

دوروا، هیچ بەرهەمێکی بالزاکی نەخوێندبووەوە، لێ بە ڕاوێژێکی قەناعەت ئامێزەوە گوتی:- سەیرە، بۆ.

پاشان سن پوتین دەربارەی خانم ڤالتر قسەی کرد، ژنێکی بێ شعورە، نوربردو ڤارن، پیرەمێرێکی نائومێدو داماو و ناسەرکەوتووە و ریڤال هیچ شتێکی تازەی لە هەگبەدا نییە. دوای ئەمانە چووە سەر فورستیە.

- ئەمە شانسی هەبووە کە ئەم ژنەی بەدەستکەوتووە. نانی ژنەکەی دەخوا.

دوروا پرسی:- بۆ ژنەکەی چ کارەیە؟

سن پوتین، دەستەکانی لێکدی هەڵسوون و گوتی:

دامەزراندوە کە سەرپۆشێک بێ بۆ سەواومامەڵەکانی لە سەنتەری بۆرسە و چالاکییەکانی دیکەی. لەم کارەدا وەستایەکی لە زەبر و مەعلانە، بە ناوی کۆمەڵێک کۆمپانیاوە کە خاوەنی تاقە پولێکی قەڵب نین، ملیۆنان فرانک دەخاتە تەنکەی باخەڵی..

بەدەم قسانەوە کە بە دوروای دەگوت" دۆستی ئازیزم " لە سەری ڕۆیی:

- ئەم پیاوە ئاڵچاخە، لە قسەکردنا شێوازی بالزاکی هەیە. تەسەورکە ئەو ڕۆژە من و ئەم نوربرە پیرەی عەسری بەرد و ریڤالی دۆنکیشۆت ئاسا، لە ئۆفیسەکەی ئەو بووین کە " مونتلن " ی بەڕێوەبەری کاروباری دارایی ڕۆژنامەکە بەخۆی و جانتا چەرمەکەیەوە وەژوور کەوت، ئەو جانتا چەرمییەی هەموو خەڵکی پاریس دەیناسنەوە.

ڤالتر سەری هەڵبڕی و پرسی:- خەبەر و باسی تازە؟

مونتلن، ساوێلکانە گوتی: " ئەو شازدە هەزار فرانکەم، کە قەرزارباری کاغەزفرۆشەکە بووین، دایەوە. "

سەرۆک، لە ناکاوا لە جێی خۆی ڕاپەڕی، ڕاپەڕین نە گاڵتە.

- چیت گوت؟
- قەرزەکەی پریڤام دایەوە.
- مەگەر شێت بووی؟
- بۆ؟
- بۆ... بۆ... بۆ....

چاویلکەکەی لە چاوی داکەند، شووشەکانی سڕی. ئەوسا بزەیەکی کرد، لەو بزە سەیرانەی کە هەرجارێ

بیویستبا فیلێک بکات یان قسەیەکی توند گۆناکانی چرچ دەبوون، ئەوسا بە ڕاویژێکی تەوسامێز و قەناعەت بەخشەوە گوتی: " بۆ؟ چونکە دەمانتوانی چوار پێنج هەزار فرانکی پێ دابشکێنین. "

مونتلن بە حایرمانەوە گوتی: " بەلام جەنابی سەرۆک، هەموو حیساب و کیتابەکە دروست و بێ کەم وکوڕی بوو، بەخۆم زۆر بە وردی پێیدا چوومەوە و خۆشتان پێی ڕازی بوون... "

هەنگێ سەرۆک بە جدی گوتی: " هەموو کەسێک وەکو تۆ ساویلکە نییە جەنابی مونتلن، ئەوە چاک بزانە کە پیاو تا دەتوانێ ئاستی قەرزەکانی بەرز بکاتەوە، تا بتوانێ سولح دەگەڵ خاوەن قەرزەکانیا بکات. "

سن پوتین وەکو کەسێکی پسپۆڕ و شارەزا سەرێکی لەقاند و لە سەری ڕۆیی:

- ها؟ بەڕای تۆ ئەم ڕستانە بالزاکی نین؟

دوروا، هیچ بەرهەمێکی بالزاکی نەخوێندبووەوە، لێ بە ڕاوێژێکی قەناعەت ئامێزەوە گوتی:- سەیرە، بۆ.

پاشان سن پوتین دەربارەی خانم ڤالتر قسەی کرد، ژنێکی بێ شعورە، نوربردو ڤارن، پیرەمێرێکی نائومێدو داماو و ناسەرکەوتووە و ریڤال هیچ شتێکی تازەی لە هەگبەدا نییە. دوای ئەمانە چووە سەر فورستیە.

- ئەمە شانسی هەبووە کە ئەم ژنەی بەدەستکەوتووە. نانی ژنەکەی دەخوا.

دوروا پرسی:- بۆ ژنەکەی چ کارەیە؟

سن پوتین، دەستەکانی لێکدی هەڵسوون و گوتی:

- یەکێکە لە حیلەبازەکانی ڕۆژگار، ڕێوییەکی ناسک و فێڵبازەو، ماشوقەی هەوەسبازی پیرەمێرێکە بەناوی ڤودریک، کۆنت دو ڤودریک، کە ئەو هەم جیازی بۆ کردووە و هەم مێردی بۆ دۆزیوەتەوە...

دوروا، لە ناکاوا هەستی کرد ئازای بەدەنی تەزی، دەماری گرژ بوو. حەزی دەکرد ئەم کابرا هەرزەگۆیە بەر دەمرێژی جنێو و زللە بدات، لێ جڵەوی خۆی گرت و تەنیا بە سادەیی پرسی:

- تۆ ناوی ڕاستیت سن پوتینە؟ ئەمە ناوی خۆتە؟

" سن پوتین " ش بە هەمان سادەیی بەرسڤی دایەوە:

- نا، من ناوم تۆماسە. لە بارەگای ڕۆژنامەکەدا بە سن پوتین بانگم دەکەن.

دوروا، پارەی ڤەخارنەکەی دا و گوتی:

- وابزانم خەریکە درەنگ دەبێ، دەبێ بڕۆین بە سۆراخی ئەو دوو پیاوە گەورەیەوە.

سن پوتین، لە قاقای پێکەنینی دا:

- کە پیاوێکی ساویلکەی! تەسەور دەکەیت من هەروا دەڕۆم و لەم چینی و هندی یە دەپرسم ڕاتان سەبارەت بە ئینگلستان چییە؟ چما خۆم نازانم ئەوان دەبێ چ قسەیەک بکەن کە ببێت بە مایەی دڵخۆشی خوێنەرانی لاڤی فرانسز. من تائێستا لەگەڵ پێنج سەد کەسا لەم چینی، هندی، ئێرانی، شیلیایی، ژاپۆنیانەدا هەڤپەیڤینم کردووە . بە باوەڕی من وەڵامی هەموویان هەمان وەڵامە. دەتوانم دوا وتارم دەربارەی یەکێک لەو خەڵکانە لەبەردەم خۆما دابنەم و وشە بەوشە کۆپی بکەمەوە. ئەوەی کە دێتە گۆڕان و فەرق

دەكات، بۆ نموونە قەلافاتیان، ناویان، پۆستەكانیان، تەمەنیان و یاوەرەكانیانە و هیچی دی. لەم ڕووەوە نابێ بچووكترین هەڵە بكرێت، چونكە سبەی ڕۆژنامەی لوفیگارو یان لوگلوا حەیا و ئابڕووم دەبات، بۆ ئەم كارەش دەبێ بڕۆی بۆلای دەرگاوانی ئوتێلی بریستوک و ئوتێلی كونتینال، ئەوانە لە زەرفی پێنج خولەكدا، زانیاری تەواوم دەخەنە بەردەست. جگەرەیەک دەكێشین و بە پێیان بۆ ئەوێندەر دەڕۆین و، پاشان بڕی سەد سوو كرێی گالیسكە، لە ڕۆژنامەكە وەردەگرین. دەبینی گیانە، وەختایەک پیاو، شارەزای فەند و فێڵی كاران بوو، چتۆ كار دەكات؟

دوروا گوتی:- بەم پێیە بێ، كاری پەیامنێری دەبێ دەرامەت و دەسكەوتێكی باشی هەبێت.

پەیامنێرەكە بە ڕاوێژێكی گونگ گوتی:

- بەڵێ، بەلام هیچ شتێک بە ئەندازەی ئامادەكردنی نووچە وكورتە هەواڵ بەسوود نییە، چونكە ئاگادارییانی بانگەشەیی، بە ڕواڵەتی فریبۆكەوە، لەبن دێڕ و لە توێی ئەم هەوالانە جێدەكەنەوە.

هەستان، لە كافەكە هاتنە دەرەوەو بەرەو بولڤاری مادلین وەڕێكەوتن. سن پوتین لە ناكاوا بە هاوڕێكەی گوت:- دەزانی، ئەگەر كاری زەروویت هەیە دەتوانی بڕۆیت، من پێویستم بە تۆ نییە.

دوروا، تەوقەی دەگەڵ كرد و ڕۆیی:

خەمی نووسینی بەشی دووەمی وتارەكەی بوو. دەستی بەبیركردنەوە لە وتارەكە كرد، بەدەم ڕێكردنەوە، بابەت و بیرۆكەی جۆراوجۆر و بۆچوونی كورت و باڵكێشی بۆ

دەهات و لە زەینی خۆیدا کەڵەکەی دەکردن. گەییە کۆتایی شەقامی شانزەلیزە، خەڵکانێکی کەم بە شەقامەکەوە بوون، چونکە لەم ڕۆژە گەرمانەدا زۆربەی خەڵکی پاریس دەرچووبوون.

خۆی کرد بە خوارنگەیەکی بچووکی نزیکی مەیدانی ئوتوڤال دا و نانی خوارد، ئەوسا بە پێیان بۆ ماڵەکەی خۆی ڕۆییشتەوە و لە بەردەم مێزەکەیدا ڕۆنیشت. لێ هەرکە چاوی بە کاغەزە سپییەکەی بەردەمی کەوت، هەرچییەکی لە زەینا کەڵەکە بووبوو هەرهەمووی فڕی و چوو بە حەوادا، دەتگوت مێشکی بووبوو بە هەڵم. هەوڵیدا بیرەوەرییە پەراگەندەکانی جەم وجۆر بکات و بیخاتە سەر کاغەز: وەختایەک دەیویست بیاننووسێت، یان لە دەستی دەردەچوون یان لە زەینیا تێکەڵ وپێکەڵ دەبوون و نەیدەزانی چۆنیان بداتە دەم یەکەوەو لە قاڵبێکا دایان بڕێژێتەوە، چۆن فرمۆڵەیان بکات و لە کوێوە دەست پێبکات.

دوای یەک سەعات هەوڵ و تەقەلا و ڕەشکردنەوەی پێنج بەرپەڕان بە ڕستە و دەستەواژەێن بێ سەروبەر و نیوەچڵ بەخۆی گوت: " هێشتا وەکو پێویست لەگەڵ ئەم کارەدا ڕانەهاتووم. دەبێ بڕۆم دەرسێک وەربگرم. " یەکسەر دیمەنی گوزەراندنی پێش نیوەڕۆیەکی دی دەگەڵ خانم فورستیەدا، بەو دۆستایەتیە دڵنەوازەوە، ئۆخژنێکی بە لەزەتی بە دڵ و دەروونی بەخشی. لە ترسی ئەوەی دووبارە دەست بەکاربکاتەوە و ئەمجارە سەرکەوتوو بێ، بلەز ڕۆیی و لێی خەوت.

سبەی بەیانی کەمێک درەنگ وەخەبەر هاتەوە. پێشوەختە لەزەتی لەم دیدارە وەردەگرت و خۆی بۆ ساز دە کرد .

سەعات لە دە بووری بوو کە لە زەنگی دەرگای ماڵی دۆستەکەی دا. پێشخزمەتەکە بەرسڤی دایەوە:- ئاغا سەرقاڵی کارە.

دوروا، پێشبینی ئەوەی نەکردبوو کە مێردەکەی لە ماڵەوە بێت. وێڕای ئەوەش مکووڕی کرد و گوتی: " پێیان بڵێ من هاتووم و کاری بە پەلەم هەیە. "

دوای پێنج خولەک چاوەڕوانی، پێشخزمەتەکە، ئەوی بۆ ئەو ژووری کارە برد کە بەیانیەکی دڵگیری تیا بەسەر بردبوو.

ئەو شوێنە کە دوێنێ ئەو لێی دانیشتبوو، ئێستا فورستیە لێی دانیشتبوو، بیجامەی لەبەر و نەعلی لە پێدا بوو، شەوکڵاوێکی ئینگلیزی بچووکیشی لە سەر بوو. هاوسەرەکەشی بە هەمان ماکسی سپی ناوماڵەوە، ئانیشکی دادابووە سەر موغەیرییەکە و خەریک بوو جگەرەی دەکێشا.

دوروا، لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا و لەبن لێوانەوە گوتی:- ببورن، وابزانم لە ناوەختا هاتووم.

دۆستەکەی بە ڕووگرژی ڕووی تێکرد و بەدەم پرتەوبۆڵەوە گوتی:

- دیسان چیت دەوێ؟ خێرا بیڵێ، ئێمە کاری بەپەلەمان هەیە.

دوروا، بە نیگەرانی و بەدەمەلاڵکێوە گوتی:- نا، هیچم ناوێ، داوای بوردن دەکەم.

لیٛ فورستیە کە تەواو بێزار بووبوو، بە تووڕەیی گوتی:

- شەیتان بە نەعلەت بێ ها، بە خۆڕایی خۆت ماتەڵ مەکە، خۆ بۆ ئەوە نەهاتووی کە بەیانی باشمان لێبکەیت.

هەنگێ دوروا، بە پەشۆکاویەوە هاتە قسان وگوتی:

- باشە، نا... مەسەلەکە ئەمەیە کە... دیسان تیا ماوم چۆن وتارەکەم بنووسم... و تۆ... ئێوە جاری پێشوو ئەوەندەتان لوتف بەرانبەرم نواند کە... ئیدی زاتم وەبەرخۆ نا کە بێم...

فورستیە قسەکەی پێبڕی:

- تۆ هەموومانت خاپاندووە! بە گێلمان دەزانی وانا، بەڕاستی و هەموو ئەقڵێکتەوە، بە تەمای من کارەکانت بۆبکەم و تۆش سەری مانگ بڕۆی بۆلای کاشێرەکە و مووچەکەت وەربگریت، وایە؟ بە ڕاستی کابرایەکی ڕوودار و بێشەرمی.

ژنەی گەنج بەبێ ئەوە چ قسەیەک بکات، خەریکی جگەرەکێشانی خۆی بوو. دیسان خەندەیەک بەسەر لێویەوە بوو، لێ خەندەیەک کە وادیاربوو، وەکو پەردەیەکی مەحەبەت ئامێز، بیر و هزرە تەوسامێزەکانی دادەپۆشی.

دوروا، سوور بووەوە و کەوتە دەمەلاڵکێ: ' داوای بوردن دەکەم... وام وێناکردبوو.. وام زانی... ' ئەوسا لە ناکاوا بە دەنگێکی زولاڵ و خۆیا لە سەری ڕۆیی:- هەزاران جار سوپاسی ئێوە دەکەم، خانم کە دوێنێ ئەو سەفەرنامە دڵنەوازەتان پێ ئیملا کردم.

دوای ئەوە سڵاوێکی لە فورستیە کرد و گوتی:- سەعات سێی دوانیوەڕۆ لە بارەگای ڕۆژنامەکە دەبم.

و ئەوسا چووە دەرێ. بە هەنگاوی هەڕاو بۆماڵ گەڕایەوەو بەدەم خوتە وبۆڵەوە گوتی: " زۆرچاکە، ئەمەیان خۆم دەینووسم، خۆم بەتەنیا، دەی بینن... "

هەرکە گەییە ماڵەوە، بەدەم هەڵچوونی تووڕەبوونەوە، دەستی بە نووسین کرد. درێژەی بە نووسینی ئەو سەربهوردە دا کە دوێنێ خانم فورستیە دەستی پێکردبوو، بویەر و سەربهوردەکەی بە شێوازی ڕۆمانێن بازرگانی و بازاڕی، بویەری سەیر وسەمەرە، وەسفی جەڵەبی، و داڕشتن و ئینشای مەکتەبلیەکی تەمەڵ و ڕستە و دەستەواژانی دەرەجەدارێکی عەسکەری خستەسەر کاغەز. لە زەرفی یەک سەعاتدا چیرۆکە هەواڵێکی نووسی کە زیاتر لە قسەی بێسەروبەر و وڕاوە ئاسای کەسێکی شێت دەچوو، بەوپەڕی لە خۆ ڕادیتنەوە، بۆ بارەگای ڕۆژنامەکەی برد.

یەکەم کەس تووشی سن پوتین بوو، کە وەکو هاوڕێیەکی دڵسۆز و گیانی بەگیانی تەوقەی دەگەڵ کرد و پرسی:

– گوت و بێژەکەمت دەگەڵ جەنەڕاڵە چینییەکە و مهاراجە هندیەکەدا خوێندەوە؟ جوانە، نا؟ هەموو پاریسییەکانی سەرگەرم کرد. باوەڕبکە هەر نەشم بینین.

دوروا، کە گوت وبێژەکەی نەخوێندبووەوە، نوسخەیەکی ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و دەستی بە خوێندنەوەی کرد. ناونیشانی گوت وبێژەکە " چین و هند " بوو، لەوکاتەدا کە ئەو خەریکی خوێندنەوە بوو، سن پوتین خاڵە جوانەکانی بۆ ئەو دەگێڕایەوە.

فورستیه بە هانکە هانک و بەسیما و ڕواڵەتی مژوول و سەرقاڵەوە بلەز وەژوورکەوت و گوتی:- ئا، باش بوو، کارم بە هەردووکتان هەیە. ئەوسا زنجیرەیەک زانیاری سیاسی بۆ دیاریکردن کە بۆ هەمان شەو دەیویست.

دوروا، وتارەکەی خۆی دایێ و گوتی:- ئەمە پاشماوەی سەفەرنامەکەی جەزایرە.

- زۆرچاکە، کوا ویمدە : دەچم بە سەرۆکی نیشاندەدەم.

هەر ئەوەندە و تەواو.

سن پوتین، هاوکارە تازەکەی دوای خۆی خست، کە گەیینە ڕاپەوەکە پێی گوت:- سەری سەندوقدارت دا؟

- نە، بۆچی؟

- بۆچی؟ بۆ ئەوەی کە پارەکەت وەربگریت... دەبێ هەمیشە مانگانەکەت لە پێشەوە وەربگریت، چونکە پیاو نازانێت کە چ بویەرێک ڕوودەدات.

- زۆرچاکە... من ئەمەم لە خوا دەوێت.

- با بڕۆین بە سەندوقدارەکەت بناسێنم. پیاوێکی سەختگیر نییە. لێرە پارەی باش دەدەن.

دوروا، ڕۆیی دووسەد فرانکی مانگانەکەی وەرگرت، جگە لە بیست و هەشت فرانک پاداشتی وتارەکەی دوێنێ ی، کە دەگەڵ ئەو مووچەیەی کە لە وێستگەی ڕێگای ئاسن وەری گرتبوو، کۆی پارەکەی دەگەییە سێ سەد و چل فرانک.

هەرگیز ئەوەندە پارەی بەخۆوە نەبینی بوو، هەستی کرد تا ماوەیەکی نادیار دەوڵەمەندە.

پاشان سن پوتین، ئەوی بۆ قسە و گفت وگۆیان بۆ بنکە و مەکۆی چوار پێنج ڕۆژنامەی هەڤرک برد، بەو نیازەی کە ئەوانە زانیارییە سیاسییە داواکراوەکانیان لەلابێ و ئەو بتوانێ لە میانی چەنەبازی و گەنگەشەێن دۆستانەوە، چەند سەرەداوێک لەوانەوە بەدەست بێنێت.

دوروا، شەوێ هیچ کارێکی نەبوو بیکات، بیری لەوە کردەوە بڕوات سەرێکی فولی برجر بدات. لەوێ زاتی وەبەرخۆی نا و بە سکرتێری کۆنترۆڵی بلیتی گوت:

– من نێوم جۆرج دوروایە، پەیامنێری ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزم. دوو سێ شەو لەمەوبەر دەگەڵ جەنابی فورستیە دا بۆ ئێرە هاتم قەولی دامێ کارتی هاتنە ژوورەوەی هەمیشەییم بۆ وەربگرێت. نازانم بیری ماوە ئەم کارەم بۆ بکات یان نا.

یارۆی کۆنترۆڵچی، تەمەشای تۆماری ناوەکانی کرد، ناوی ئەوی تیا نەبوو، چونکە پیاوێکی میهرەبان بوو گوتی:– وێڕای ئەمەش وەرە ژوورەوە قوربان، بەخۆت بڕۆ بۆلای بەڕێوەبەری تەمەشاخانەکە و داواو کاریەکەتی پێ بڵێ، بەخۆی کارەکەت بۆ ڕایی دەکات.

وەژوور کەوت، یەکسەر چاوی بە ڕاشل، ئەو ژنەی کە ئەو شەوە بردبوویە ماڵەوە، کەوت.

ژنەی گەنج بەرەوپیری هات:– سڵاو گیانە، ئەحواڵت چۆنە؟

– زۆرباشم، تۆ چۆنی؟

– منیش خراپ نیم. دەزانی لەو شەوە بە دواوە دووجاران خەوم پێوە دیتوویت.

دوروا، که دڵی بەم قسەیەی ئەو خۆش بووبوو لێو بەخەندە گوتی:

- ئێ، ئێ، باشە تەعبیری ئەم خەوانە چییە؟

- تەعبیرەکەی ئەمەیە کە تۆم خۆشدەوێ گەوجەگیان و هەرکاتێ بتەوێ دەتوانین یەکدی بدینین.

- بۆ ئەمشەو ئامادەیت؟

- هەڵبەتە ئامادەم.

- بەڵام گوێ بگرە... ئەوەی دەیویست بیڵێ برێک شەرمئاوەر بوو، بە دوودڵی لە سەری ڕۆیی: مەسەلەکە ئەمەیە کە ئەمشەو تاقە پولێکم پێ نییە، چووم بۆ یانە و هەموو پارەکانم لەوێ دۆڕاند.

ژنە گەنجەکە، لێی مۆڕ بووەوە، بە حوکمی پیشەکەی، کە شارەزای فروفێڵ و درۆ دەلەسەی پیاوان بوو لەمەڕ پارە و پول، بۆنی درۆی لە قسەکانی دوروا کرد.

- درۆ دەکەی! دەزانی هیچ ماقووڵ نییە بەمجۆرە ڕەفتار دەگەڵ مندا بکەی.

دوروا، بە نیگەرانی بزەیەکی کرد و گوتی:

- ئەگەر بە دە فرانک قایلی، لاریم نییە، تەنیا ئەوەندەم پارە پێ ماوە.

ژنەی گەنج، بەبێ موبالاتی و خەمساردی سۆزانیەکەوە کە بیەوێ کەمێک لەزەت بۆخۆی بکرێت، بە ئەسپایی گوتی
– بە دڵی تۆ گیانەکەم: من تەنیا خۆتم دەوێ.

چاوە شەیداکانی برینە سمێڵەکانی کابرای گەنج، بازووی گرت و ئاشقانە خۆی پێوە قەرساند.

- باجارێ بڕۆین شەربەتێکی هەنار بخۆینەوە. پاشان پیاسەیەک بەیەکەوە دەکەین، حەزدەکەم سەرێکی ئۆپرا

بدەین، هەروا بۆ ئەوەی تۆ بە خەڵکی نیشانبدەم. پاشان بەپەلە بۆ ماڵ دەگەڕێینەوە، باشە؟

تا درەنگانێ لە ماڵی ژنەی گەنجدا نووست. وەختایەک لەوێندەر هاتە دەرەوە، نزیکی نیوەڕۆ بوو. یەکسەر بیری کەوتەوە بڕوات نوسخەیەکی لاڤی فرانسز بکڕێت. بەدەستی هاڕوژاو و لەرزۆک ڕۆژنامەکەی هەڵدایەوە. وتارەکەی بڵاو نەبووبووەوە. لە سەر شۆستەکە وەستا، بە نیگەرانی تەمەشای هەموو لاپەڕە و ستوونەکانی کرد، بەو ئومێدەی سەرەنجام ئەو ناونیشانە بدۆزێتەوە کە بە دوویدا دەگەڕا.

لە ناکاوا هەستی بە بارێکی قورس لە سەر دڵی کرد. دوای ماندوویەتی شەوێکی عاشقانە، ئەم نیگەرانیەشی هاتەسەر و هێندەی دی ماندووی کرد، هەستێکی کارەسات ئامێزی لەلا چێبوو.

بۆ ماڵەکەی خۆی چووەوە، هەربە جلەکانییەوە خۆی بەسەر تەختەکەدا دا و خەوی لێکەوت.

دوای چەند سەعاتێک، وەختێ خۆی بە بارەگای ڕۆژنامەکەدا کرد، داوای دیداری لە گەڵ ئاغای ڤالتردا کرد:

- ئەمڕۆ بەیانی قوربان سەرم سوڕما کە سەیرم کرد، بەشی دووەمی وتارەکەم دەربارەی جەزایر لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو نەبووبووەوە.

سەرۆک سەری هەڵبڕی و بە ڕاوێژێکی توند گوتی:

- دام بە فورستیەی دۆستت و داوام لێکرد بیخوێنێتەوە، بە دڵی نەبوو، پێویستە دووبارە بینووسیتەوە.

دوروا، بێئەوەی هیچ قسەیەک بکات، بە تووڕەیی لە ئۆفیسەکەی ڤالتر وەدەرکەوت و لەپڕ خۆی بە ژووری

هاوڕێکەیدا کرد:- بۆچی نەتهێشتووە، ئەم بەیانییە وتارەکەم لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو ببێتەوە؟

فورستیە، پشتی بە پشتی کورسییەکەیەوە دابوو، پێیەکانی نابوونە سەرمێزەکە وجگەرەی دەکێشا. پێڵاوەکانی ئەو وتارەیان پیس کردبوو کە خەریک بوو دەینووسی. بە ڕاوێژێکی ئارام و بەدەنگێکی شەکەت و نارەسا، کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دەهات گوتی:

- سەرۆک بە دڵی نەبوو، دایە من کە وێتدەمەوە تا دووبارە بینووسیتەوە، وەرە، ئەوەتا لێرەیە.

بە قامکان، چەند پەڕە کاغەزێکی نیشاندا کە لە ژێر سەنگێکی تایبەت بە پاراستنی کاغەزاندا دانرابوو.

دوروا، حایر وحەپەساو، هیچ قسەیەکی بۆ نەهات. کە کاغەزەکانی هەڵگرت وخەریک بوو دەیخستنە گیرفانییەوە، فورستیە دووبارە گوتی:- ئەمڕۆ هەوەڵجار دەڕۆیی بۆ مەرکەزی پۆلیس.

ئەوجا ناوی ئەو شوێنانە و ئەو نووچە و هەواڵانەی، کە دەبوایە سەریان بدات و کۆیان بکاتەوە، بۆ دیاری کرد. دوروا لە ئۆفیسی دۆستەکەی وەدەرکەوت، بێئەوەی ئەو وشە نێشدارە بدۆزێتەوە کە بە تەما بوو بەوی بڵێت.

سبەی وتارەکەی هێنایەوە، لێ دووبارە دایانەوە بەسەریدا. پاش ئەوەی سێ چەلان نووسی و هەرسێ جارەکە بەسەریاندا دایەوە، هەستیکرد، پێی لە بەڕەی خۆی زیاتر ڕاکێشاوە وتەنیا فورستیە دەتوانێ فریای بکەوێ و لەمبارەیەوە یارمەتی بدات.

ئیدی چ قسەیەکی دەربارەی " بیرەوەرییەکانی سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە ئەفریقا " نەکرد و

بەڵێنی بەخۆی دا کە کەسێکی نەرمکێش و سیاسەتباز بێ. پێویستی بەوجۆرە هەڵوێستە بوو، ئیدی بە ئومێد و چاوەڕوانی پێگەیەکی باشترەوە، بەجدی ملی بۆ کاری پەیامنێری و کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاریان دا.

بەرەبەرە شارەزای پشت پەردەی تەمەشاخانان ودنیای سیاسەت بوو. ڕێگای ڕاڕەو وهۆڵەکانی ئەنجوومەنی شۆرا و دەوڵەتڕانانی بۆ کرایەوە. ئاشنایی دەگەڵ کاراکتەرانی ناوداری سەر بە دەوڵەت و قەد و قەڵافەتی گرژ ومۆنی سکرتێران و بەرپرسێن ئۆفیساندا پەیدا کرد.

ئیدی هاتوچۆی بەردەوامی دەگەڵ وەزیران، دەگەڵ دەرگاوان و پەردەداران، جەنەڕاڵ، پۆلیس و ئەمن، شازادان، گەوادان، ڕوسپییانی قەپاتمە، سەفیران، قەشە و کەشیشان، بەڕێوەبەرانی قەحپەخانان، خوێڕی و بەڕەڵایان، ئەشراف، یۆنانیان، عەرەبانچی، دەگەڵ گارسۆنێن کافەکان و خەڵکانی دیدا دروستکرد. ئیدی چونکە بووبوو بە دۆستی ئەم خەڵکانە، بۆیە بە شێوەیەکی یەکسان ڕەفتاری دەگەڵ هەمووواندا دەکرد. بە یەک چاو سەیری دەکردن، چونکە هەموو ڕۆژێک و لە هەر کاتێکا بیویستبایە دەی بینین، بەبێ جیاوازی، دەربارەی یەک شت، ئەوشتەش کارەکەی بوو، گوت و بێژی دەکرد. خۆی بەو شەراب ناسانە بەراورد دەکرد کە نموونەێن جۆراوجۆری شەراب و یەک لە سەر یەکیان دەچەشت، نەیاندەتوانی جیاوازی لە نێوان شەرابی شاتۆمارگۆ و شەرابی ئارجانتوی دا بکەین.

لە ماوەیەکی کەمدا بوو بە یەکێک لەو پەیامنێرە دیارانەی کە متمانە بەو هەواڵ و زانیاریانە دەکرا کە ئەو

کۆی دەکردنەوە. پەیامنێرێکی فیڵباز، گورج و گۆڵ، زیرەک و لەزفام، بابا ڤالتر گوتەنی، کە کەسێکی دوورناس بوو، بوو بە کۆڵەکەیەکی گرینگ بۆ ڕۆژنامەکە.

وێڕای ئەمەش، چونکە تەنیا دە سانتیمیان لە بری هەر دێڕە نووسینێکا دەدایە و مووچەی مانگانەشی تەنیا دووسەد فرانک بوو، مەسرەفی هاتوچۆی بۆ بولڤاران و چوونی بۆ کافە و خوارنگاکان یەجگار زۆر بوو، هەمیشە نەداربوو و ئەسپێ لە باخەڵیا سەوزەڵێ خانمی دەگوت. زۆر لەم ژیانە هەژارانەیە بێزار بوو.

وەختایەک هەندێ لە هاوکارەکانی دەبینی کە هەمیشە ڕەوش و بارودۆخیان باش و لەبار بوو، گیرفانیان پڕ بوو، بەخۆی دەگوت دەبێ فێڵ و تەڵەکەیەک بۆ گەیشتن بەم ڕەوشە هەبێت، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی پەی بەوە ببات کە ئەوانە لە چ ڕێگەیەکی ڕازئامێزەوە توانیویانە ژیانێکی خۆش بۆخۆیان فەراهەم بکەن. ئیدی بەجۆرە بەغیلیەکەوە وای مەزەندە دەکرد کە ئەوانە بە شێوازی نهێنی وگوماناوییەوە، لە ڕێگای کارێن نایاساییەوە، بە شێوازی نهێنی و قەدەغە گەییونەتە ئەو حاڵ و ئەحواڵە، بەڵێ ئەویش دەبێ پەی بەو ڕازە ببات، لە کارەکانی واندا بەشداری دەکرد، خۆی دەکرد بە دۆستی ئەو هاوڕێیانەی کە دەرامەتی ژێراوژێریان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکرد.

زۆر شەوان، لەبەر پەنجەرەکەدا دەوەستا، بەدەم تەماشای هاتوچۆی قیتارانەوە، بیری لەو ڕێگایانە دەکردەوە کە دەیتوانی بۆ گەیشتن بە ئاوات ومەبەستەکانی، پەنایان بباتەبەر.

( ٥ )

دوو هەیڤان بووری بوو، سەرەتاکانی سێپتەمبەر بوو و دوروا هێشتا بەو سەروەت و سەرکەوتنە لەزگینە نەگەیی بوو کە ئارەزووی دەکرد. بەتایبەتی لە بێ بایەخی ئیتیکی و مۆراڵی پێگە و پۆستەکەی نیگەران و ناڕازی بوو و سەری لەوە دەرنەدەکرد لە چ ڕێگەیەکەوە و چۆن دەتوانێ بە پلیکانەی سەرکەوتن و سەروەتدا سەربکەوێ. خۆی لە چوارچێوەی ئەم پیشە ناچیزەی پەیامنێریەدا، بەحەپس دەزانی، ئیدی لە نێو ئەم چوار دیوارەدا گیرۆدە و گرفتار بووبوو و هەرچی دەکرد نەیدەتوانی دەرباز ببێت. ڕێز و حورمەتیان دەگرت، بەڵام ڕێز وحورمەتێک لە قەد پلە و پۆستەکەی. تەنانەت فورستیەش، کە ئەم کاری زۆری بۆ ڕایی دەکرد، وەکو جاران بۆ شێو دەعوەتی ماڵەوەی نەدەکرد، وەکو ژێر دەستێک مامەڵەی دەگەڵدا دەکرد، هەرچەندە وەکو دۆستێکی دڵسۆز و خۆمانە قسەی دەگەڵ دەکرد.

دوروا، جارجار ئومێدێکی لاپەیدا دەبوو، وتارۆکەیەکی دەنووسی، بەهۆی نووسین و ئامادەکردنی کورتە هەواڵانەوە، دەستی لە سەر نووسین و قەڵەمڕانی ڕاهات و زۆر لەوسا باشتر بوو کە لە نووسینی وتاری دووەمی سەفەرنامەی جەزایردا تووشی بووبوو. ئیدی لە خەمی ڕەفزکردن و بڵاونەکردنەوەی وتارەکانی، خەلەسی بوو. بەڵام ئەم کارە لە گەڵ نووسینی وتاراندا بە مەیل و سەلیقە و گوزارشتی شرۆڤەی مەسەلە سیاسیەکاندا، جیاوازیەکی یەجگار زۆری هەبوو، بە ئەندازەی جیاوازی نێوان ڕانینی گالیسکەیەک بە شەقامەکانی بێشەی بولونی وەکو

گالیسکەچی، یان وەکو ئەرباب و خاوەن گالیسکەکە. ئەوەی کە دەبووە بایسی شەرمەزاری ئەو، ئەوەبوو کە دەرگای ماڵە ئەشرافەکانی لە ڕوودا داخرابوو، وەکو هاوتایەکی ئەوان هاتوچۆی لە گەڵیاندا نەبوو و، نەیتوانی بوو تێکەڵی ژیانی تایبەتی ژنانی ئەو کۆڕ و کۆمەڵانە ببێت، ئەگەرچی هەندێک لە ژنانی هونەرمەند و ئەکتەری ناودار لە ماڵی خۆدا پێشوازییان دەکرد و دۆستانە هەڵس وکەوتیان دەگەڵ دەکرد.

لە ڕووی ئەزموونەوەو بە تەجرەبە هەستی بەمە دەکرد کە هەموو ئەم ژنانە، چ ئەرستۆکرات و ئەشراف یان هونەرمەند و ئەکتەر، جۆرە ڕێز و حورمەتێکی هەنووکەییان بۆ ئەو هەیە، بەڵام بەبێ ئارامی، ئەسپێکی پێوەند کراو، هەستی دەکرد کە ئەم نەوازش و ڕێز و حورمەتانە، ئەو شتە نییە کە بتوانێ ئایندەی دیاری بکات.

ماوەیەکی زۆر بوو کەوتبووە سەر ئەم بیرەی بڕوات سەرێکی خانم فورستیە بدات، بەڵام کە دوا دیداری خۆیانی بیردەکەوتەوە، سارد دەبووەوە و ژێوان دەبووەوە، ئەمە جگە لەوەی کە لە دڵی خۆیدا بە تەمابوو مێردەکەی خوڵک و دەعوەتی ئەم بکات. هەنگێ خانم دوماریلی بیرکەوتەوە، بەبیری هاتەوە کە خانم دوماریل، خوڵکی کردبوو کە بچێتە دیدەنی، بۆیە ڕۆژێک دوانیوەڕوانێ کە کاری نەبوو و دەستی بەتاڵ بوو، سەرێکی ماڵی وانی دا.

خانم دوماریل، گوتبووی من تا سەعات سێی پاش نیوەڕوانێ لە ماڵەوەم. کاتێ لە زەنگی دەرگای ماڵەکەی ئەوی دا، سەعات دوو و نیوی دوا نیوەڕوانێ بوو.

خانم دوماریل له کوچەی ڤیرنوی،نهۆمی چوارەم دادەنیشت.

که دەنگی زەنگی دەرگا بەرز بووەوە، کارەکەرێکی وردیلە هات و دەرگای ڤەکرد. قژەکەی تێکڕژابوو و خەریک بوو کڵاوەکەی لەسەر دەکرد.

- بەڵێ خانم لەماڵەوەیە، لێ نازانم لە خەو ڕابووە یان نا.

دەرگای هۆڵەکەی، کە کلیل نەدرابوو، کردەوە و ئەوی بردە هۆڵەکە.

دوروا، وەژوورکەوت. هۆڵەکە برێک گەورە بوو، بەڵام ناوماڵ و موبیلەیەکی ئەوتۆی تیانەبوو، کەمێک داڕژوا و داپژاو بوو. قەنەفەکان کە بەرگەکانیان کۆن و تاڵکێش بووبوون، لە پاڵ دیوارەکەدا بەڕیز دانرابوون. ئەم تەرزە ڕیزکردنە نیشانەی ئەوە بوو کەبە گوێرەی زەوق و سەلیقەی کارەکەرەکەیە نەک بەگوێرەی زەوق و سەلیقەی ناسکی خانمێک کە دڵی بە ماڵ و ژیانی خۆشە. چوار تابلۆی هەژارانە، کە یەکەمیان بەلەمێک بوو بەسەر ڕووبارەوە، دووەمیان کەشتییەک بوو لە ناو دەریادا، سێیەمیان ئاشێک بوو لە دەر ودەشتا و چوارەمیان دارشکێنێ بوو لە جەنگەڵدا، ئەم تابلۆیانە زۆر بە ناڕێک و پێکی بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون، هەر چوار تابلۆکە خوار بوون. پیاو دەیتوانی بە مەزندە پەی بەوە ببات کە ئەم تابلۆیانە زۆر لە مێژە، بە بەرچاوی بێ موبالاتی خانمی ماڵەکەوە بەو شێوەیە ماونەتەوە.

دوروا، بەدەم چاوەڕوانییەوە لە سەر قەنەفەیەک ڕۆنیشت. چاوەڕوانی درێژەی کێشا. ئەوسا دەرگایەک

ڤەبوو و خانم دوماریل بەهەشتاو وەژوور کەوت. جلکی ماڵەوەی لەبەر بوو، بریتی بوو لە ماکسیەکی ژاپۆنی ئاوریشمی پەمەیی کە دیمەنی زێڕین، گوڵێن شین و باڵندەێن سپی لە سەر گوڵدۆزی کرابوو. کە چاوی بە دوروا کەوت گوتی:- تەسەورکە، تا ئێستا خەوتبووم. چەند باشت کردووە کە هاتیە دیدەنیم! قەناعەتی تەواوم کردبوو کە فەرامۆشت کردووم.

بەخۆشحاڵییەوە هەردوو دەستی بۆلای ئەم درێژ کرد و، دوروا کە ڕەوشی شێواوی ماڵەکە ئاسوودە و ئەرخایەنی کردبوو، هەردوو دەستی ئەوی گرت و بە چاولێکەری نوربر دوڤارن، یەکێکیانی ماچکرد.

خانم دوماریل، داوای لێکرد دانیشێت، ئەوسا سەراپای بە نیگا دابێژت وگوتی: " چەند گۆڕاوی! ڕەنگ و ڕووت گەشاوەتەوە. وادیارە ئاو وهەوای پاریست پێدەکەوێت. ئێ، خەبەر وباسی تازە، بۆم باسکە. "

یەکسەر، وەکو دوو دۆستی کۆن دەستیان بە قسە وباسان کرد، هەستیان دەکرد زۆر زوو، هۆگری یەکدی بوون، جۆرە دۆستایەتی و مەحەبەت و متمانەیەکی ئەوتۆیان لە نێواندا چێبوو کە لە زەرفی پێنج خولەکدا، لە نێوان کەسانێکا دروست دەبێ کە خولق و خووی یەکسانیان هەبێت.

ژنەی گەنج لە ناکاوا قسەکەی بڕی و بە حایرمانەوە گوتی:- چەند خۆشە، بەڕادەیەک دەگەڵ تۆدا ئاسوودەم، دەڵێی دە دانە ساڵە دەتناسم. بێگومان دەتوانین ببین بە دوو دۆستی گیانی بەگیانی. حەزدەکەی؟

دوروا، به دەم بزەیەکەوە کە خۆیاتر لە وشە بوو گوتی:
" بەڵێ، بێگومان. "

ژنەی گەنج بەم جلە ناسک و ئاڵاو واڵاوە لەبەر چاویا زۆر ئارەزوو بزوێن بوو، هەڵبەتە بە ئەندازەی ئەوسای ماکسییە سپیەکەی لەبەردا بوو جوان و ناسک نەبوو، بەڵام دڵگیرتر و هەوەس بزوێنتر بوو.

دوروا، وەختایەک خۆی لە نزیکی خانم فورستیەدا دەبینی، بەو بزە هەمیشەیی و پڕ لوتفەیەوە کە هەم پیاوی بۆلای خۆی ڕادەکێشا و هەم دووری دەخستەوەو وای بەخەیاڵدا دەهات لە هەمان کاتدا دەڵێت: " خۆشم دەوێی. " و هەروەها " ئاگاداربە " و هیچ کاتێ پیاو پەی بە حەقیقەتی ئەو نەدەبرد. بەتایبەتی حەزی دەکرد دوای بکەوێ یان بە ئەسپایی هەوای گەرم و بۆنداری دەوروبەری ئەو کە لە بەدەنیەوە هەڵدەستا، بۆن بکات.

لەلای " خانم دوماریل " هەوەس و ئارەزوویەکی تووندی لەلا دروست دەبوو، هەوەس و ئارەزوویەکی ئاشکرا، کە بە دیتنی ئەو لەم جلە ئاوریشمە تەنکەدا، دەستەکانی دێنایە لەرزین.

خانم دوماریل، لە سەر قسەی خۆی دەڕۆیی و لە میانی قسە و ڕستەکانیەوە، تەبع و تەبیعەتی سادە و ئاسانگیری خۆی کە خووی پێوەگرتبوو، ئاشکرا دەکرد، وەکو کرێکارێک کە کارێکی دژوار کە قورس و مەحاڵ دێتە بەرچاو و بەئاسانی ئەنجامی دەدات و دەبێتە مایەی سەرسامی خەڵکی. دوروا، بەدەم گوێگرتنەوە بەخۆی دەگوت: " پێویستە قسەکانی وێ ئەزبەر بکرێن، وەکو گوارە لەگوێ بکرێن، دەکرێ لەمیانی قسەکانی ئەوەوە، بابەتی

جوان و باڵکێش دەربارەی ژیانی ڕۆژانەی پاریس و پاریسیان هەڵێنجرێ و بکرێن بە ئامیان و هەوێنی نووسینی خەبەرێن جوان و دڵگیر. "

لەم کاتەدا، کەسێک بە نەرمی لە دەرگای دا، لە هەمان دەرگای دا کە خانم دوماریل لێوەی وەژوور کەوتبوو. خانم دوماریل بە دەنگی بەرز گوتی: " وەرە ژووریَ گیانەکەم. " کچەکەی هاتە ژوورەوە، یەکڕاست چوو بۆلای دوروا و تەوقەی دەگەڵدا کرد.

دایکی بە حایرمانەوە ولەبن لێوانەوە گوتی: " چەند جوان بووە، بە ڕاستی نەمناسییەوە. " دوروا، پاش ئەوەی کیژۆڵەکەی ماچکرد، لەلای خۆیەوە داینا و بەڕاوێژێکی جدی، بەمیهر و مەحەبەتەوە هەندێ پرسیاری دۆستانەی دەربارەی ئەو کارانەی لەو شەوەوە تا نها کردبوونی، لێکرد. کچۆڵەی تاین بە دەنگێکی ناسک بەلاَم بە سەروسیمای سەلار و سەنگینی خەڵکانی گەورەوە وەلاَمی پرسیارەکانی ئەوی دایەوە.

زەنگی سەعاتەکە سێ چەلانی لێدا. دوروا هەستا.

– پێمان لێ مەبڕە، زوو زوو سەرمان بدە، وەکو ئەمڕۆ دەتوانین دۆستانە بۆخۆ قسە بکەین. من زۆرم پێخۆشە. چۆنە ئێستا لە ماڵی فورستیەدا ناتبینم؟

دوروا بەرسڤی دایەوە:- هیچ هۆیەکی تایبەتی نییە. کاری زۆرم بەسەرا ڕژاوە و دەبێ ئەنجامیان بدەم. هیوادارم لە یەکێک لەم ڕۆژانەدا لەوێ یەکدی ببینین.

بە دڵێکی پڕ لە ئومێدەوە، بێئەوەی بزانێ بۆ، لەوێ ڕۆیی.

باسی ئەم دیدارەی بۆ فورستیە نەکرد.

بەڵام ڕۆژانی دواتریش، بیرەوەری ئەو دیدارەی هەر لە زەیندا مایەوە، شتێکی زیاتر لە بیرەوەری لەلا مایەوە، جۆرە هەستێکی حوزوری خەیاڵی و زندووی ئەم ژنە بوو. وای دەهاتە بەرچاو شتێکی ئەوی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، وێنەی ئەندامی ئەو لە بەر چاوی و دڵنەوازی بوونی مەعنەوی ئەو لە دڵیا مابووەوە. وەکو چۆن هەندێ کات دێنە پێشێ، وەکو ئەو کاتانەی پیاو چەند سەعاتێکی خۆش و دڵگیری دەگەڵ کەسێکا بەسەر بردبێ، بەو ئاوایە کەوتبووە ژێر باندۆر وکاریگەری ئەم دیمەن و وێنەیەوە. ڕێک وەکو کەسێک بە شێوەیەکی سەیر، گونگ، ئاشوفتە، شەرمەندە و ئەفسووناوی ڕموودەی کەسێک بووبێ، ڕموودە بوونێکی ڕازئامێز.

دوای چەند ڕۆژێک دووبارە چووە دیدەنی خانم دوماریل.

کارەکەرەکە، بۆ هۆڵەکەی برد، لورین یەکسەر خۆی بەهۆڵەکەدا کرد، نەک هەر دەستی درێژ کرد، بەڵکو هەنیەشی بردە پێشەوە تا دوروا ماچی بکات. ئەوسا گوتی:- دایکە پێی گوتووم تکات لێبکەم چاوەڕوانی بکەیت. یەک چارەک پتری پێناچێت، چونکە دەیەوێ خۆی بگۆڕێت. من لای تۆ دەبم.

دوروا، کە جۆری قسەکردن و پروتۆکۆلی پێشوازی کچۆڵەکەی زۆر بەلاوە شیرین بوو وکەیفی پێدەهات گوتی:

" زۆرچاکە، مادموازیل، زۆرم پێخۆشە چارەکە سەعاتێک لەگەڵ تۆدا بم. لێ با ئەوەت پێ بڵێم کەمن بە هیچ جۆرێ کەسێکی جدی نیم، ڕۆژ تا ئێوارێ خەریکی یاریم، بۆیە من پێشنیاز دەکەم با پێکەوە یاری - گورگم بە هەوا - بکەین. "

( گورگم بە هەوا: يارييەکی منداڵانەيە لە ناو خۆياندا يەکێک هەڵدەبژێرن و دەبێ بە گورگ. ئەم گورگە بە غار دوای منداڵەکان دەکەوێ، تا يەکێکيان دەگرێ، هەنگێ لە گورگايەتی دەکەوێ وکەسە گيراوەکە دەوری گورگ دەبينێ. )

کچۆڵەکە، لە هەوەڵەوە ڕاچڵەکی، ئەوسا وەکو ژنێکی گەورە و تەواو کە لەم پێشنيازە هەم ڕاچڵەکی بێ و هەم سەری سوڕمابێ، بزەيەکی کرد ولەبن لێوانەوە گوتی:- ئاپارتمانەکە جيگای ئەم جۆرە ياريانەی تيانييە.

دوروا، دووبارە گوتی:- بۆمن فەرق ناکات. من دەتوانم لە هەموو شوێنێک ياری بکەم. دەی وەرە بمگرە. ئەوجا کەوتە سووڕانەوە بە دەوری مێزەکەدا و کچەکەی هاندەدا دووی بکەوێ. لێ کچۆڵەکە خەندە بەلێو، بە جۆرە ڕەزامەندييەکی شەرمنانەوە بە دووی ئەودا غاری دەدا و دەستی درێژ دەکرد تا بيگرێت، بەڵام وەکو پێويست و بەدڵ گەمەی نەدەکرد.

دوروا، دەوەستا، دادەنەوييەوە، وەختايەک کچۆڵەکە دەگەييە نزيکی و لێی نزيک دەبووەوە، وەکو بووکەڵە دەردەپەڕی و بەچەند هەنگاوێکی هەڕاو خۆی دەگەياندە ئەو ديوی مێزەکە، کچۆڵەکە خەريک بوو وردە وردە حەزی دەچووە گەمەکە. سەرەنجام پێکەنی، هاروژا، کەوتە غاردان بە دووی ئەودا. هەرجارێ کە لێی نزيک دەبووەوە و وای وێنا دەکرد، هەر ئێستا دەستی دەگاتێ و دەيگرێت، قريوەيەکی شادمانی بۆ دەکرد. دوروا، بەدەم جوڵەجوڵی خۆيەوە کورسييەکانی دەجوڵاند و دەيخستنە سەر ڕێگاکەی ئەو تا نەيگاتێ، ناچاری دەکرد بۆ خولەکێک بە دەوری

کورسیەکەدا بخولێتەوە، ئەوسا وازی لەو کورسیە دێنا و دەچوو بەلای کورسیەکی دیکەدا. لورین ئیدی گەرم بووبوو و بەدڵ و بەگیان خۆی بەم لەزەتە دەسپارد کە بۆ ئەو و بەلای ئەوەوە تازە بوو. بە ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوەوە، دەگەڵ هەر پێچ کردنەوەیەکدا، دەگەڵ هەر فەندەڵ فێڵێکدا، کە وایدەزانی هاوگەمەکەی دەگرێت، بەوپەڕی شادییەوە، هەڵدەبەزییەوە و بۆ پێشەوە تەکانی دەدا.

لە ناکاوا، ڕێک لەو دەمەدا کە وێنای کرد، گەییوە بە دوروا، دوروا لە باوەشی کرد، بەرزی کردەوە و هاواری کرد: "گورگەکە منی گرت!"

کچۆڵەکە، کە سەرمەستی خۆشحاڵی بوو، بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بکات، لاقەکانی تەکان دەدا ولەکانگای دڵەوە پێدەکەنی.

خانم دوماریل، خۆی بە هۆڵەکەدا کرد، حایر و حەپەساو گوتی:- ئا ئا! لورین... لورین گەمە دەکات... بەڕاستی تۆ جادووگەری جەناب.

دوروا، کچۆڵەکەی لە عاردی دانا، دەستی دایکی ماچکرد، هەردووکیان لەسەر یەک قەنەفە ڕۆنیشتن و کچۆڵەکەیان لە نێوان خۆیاندا دانیشاند. ئەوان دەیانویست پێکەوە قسە بکەن، لێ کچۆڵەکە کە بە تەبیعەت بێدەنگ و کەمدوو بوو، سەرمەستی لەزەت وشادمانی منداڵانە، پەیتا پەیتا قسەی دەکرد. ئەنجام دایکی ناچاربوو، کچۆڵەکە بۆ ژوورەکەی خۆی بنێرێت.

کچۆڵەکە بێ هیچ نارەزایەتیەک ملی دا، لێ ڕوندک لە چاوانیا قەتیس ما.

هەرکە کچۆڵەکە ڕۆیی، خانم دوماریل، دەنگی نزم کردەوە و بە ئەسپایی گوتی:

– تۆ ئاگادار نیت، بەڵام من نەخشەیەکی گەورەم لە خەیاڵدایە، لە بیری تۆدا بووم. نەخشەکەم ئەمەیە: چونکە هەموو هەفتەیەک لە ماڵی فورستیەدا شێو دەخۆم، هەندێجار، بۆ ئەوەی چاکەی دەعوەتەکانی وان بدەمەوە، بۆ خوارنگەیان دەبەم، من حەز ناکەم هیچ کەسێک بۆ ماڵەوە دەعوەت بکەم، بۆ ئەم کارە ئامادەنیم، ئەمە جگە لەوەی نە سەر لە کاری ماڵەوە دەردەکەم و نە لە چێشت لێنان و ئاشپەزی، سەرم لەو شتانە دەرناچێت. حەز دەکەم ئازادانە بژیم، بۆیە جارجارێک بۆ خوارنگەیان دەعوەت دەکەم. بەڵام هەرکە من و ئەوان، هەرسێکمان بین زۆر خۆش نییە دۆستەکانی منیش لە گەڵ ئەواندا نایان کێڵێ. بۆیە ئەم قسانە بە تۆ دەڵێم تا دەربارەی دەعوەتی نائاسایی دڵنیابیت و دڵت هیچ نەکات. خۆ لە مەبەستم حاڵی دەبی، وانییە؟ بۆیە من دەعوەتت دەکەم کە ڕۆژی شەممە دەعوەتی ئێمەی، سەعات حەوت ونیو لە خوارنگەی ڕیچ. دەزانیت لە کوێیە؟

دوروا، بە خۆشحاڵییەوە دەعوەتەکەی قەبووڵ کرد.

خانم دوماریل، درێژەی بە قسەکانی دا:– ئیدی بۆ خۆمان بە چوار قۆڵی دەبین، دەزانی ئەم دەعوەت و کۆڕ و کۆبوونەوانە بۆ ژنانی وەکو مە، کە فێری ئەم جۆرە نانخواردنانەی دەرەوە نین، چەند خۆشە، وەکو جەژن و ئاهەنگێکی بچکۆلە وایە.

خانم دوماریل، کراسێکی خورمایی تۆخی لە بەر کردبوو، کە بە شێوەیەکی پڕناز وعیشوە، سەرانسەری بەدەنی لە قاڵب دابوو. دوروا هەم سەری سوڕمابوو و هەم

شەرمی دەکرد، کەم دابێژێک لە عەزابا بوو، لێ پەی بە سەدەم و هۆیەکەی نەدەبرد، سەری لەم هەڤدژییەی نێوان خۆش پۆشی و خۆڕازاندنەوەی خاوەن دەعوەتەکە و ماڵە داڕژا و وداپژراوەکەی دەرنەدەکرد.

هەرشتێک پەیوەندی بە بەدەنیەوە هەبوایە و هەرشتێک لە نزیکەوە وراستەوخۆ تەماسی دەگەڵ پێست وجەستەیدا هەبوایە، ناسک وجوان ودڵگیربوو، ئەوەندەی بایەخی بە خۆی و بە جەستەی خۆی دەدا، بایەخی بە ژینگە و دەوروبەری خۆی نەدەدا.

وەختایەک ئەوی بەجێهێشت وەکو جارەکەی پێشوو، هەمان هەستی حوزوری هەمیشەیی ئەو، هاوزەمان دەگەڵ جۆرە خەیاڵ و وەهمێکدا لە زەینیا مایەوە و مەیی. بەبێ قەراری و دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەی دەکرد کە قەرار بوو لە خوارنگەی ڕیچ پێکڤە شام بخۆن.

هەرچەندە شیان و ئیمکاناتی مادیی هێشتا ئەوە نەبوو کە دەستێ جلکی شەوانەی شایستە بۆ خۆی بکڕێت، دووبارە دەستێ جلکی بەکرێ هێنا و چەند خولەکێک زووتر لە کاتی دیاریکراو گەییە خوارنگەکە.

بردیان بۆ نهۆمی دووەم، ژوورۆچکەیەکیان نیشاندا کە دیوارەکانی بە پەردەێ قرمز داپۆشرابوون، تاقە یەک پەنجەرەی تیابوو کە ڕوو لە گوڵگەشت و بولڤارەکان دەکرایەوە.

مێزێکی چوارگۆشە بۆ چوار کەس ئامادەکرابوو. پەردەی سەرمێزەکە هێندە سپی وبریقەدار بوو، ئاوی چاوی دەبرد، دەتگوت کرێمی لێدراوە، پەرداخەکان، چەقۆ وچەتاڵەکان، تەباخی تایبەتی گەرم ڕاگرتنی خواردنەکە،

لەبەر ڕوناکی دوازدە شەمانی نێو دوو شەمدانی بەرزدا، دەدرەوشانەوە.

لە دەرێی پەنجەرەکەدا، پەڵەیەکی کەسکی گەورە دەبینرا، کە ڕەنگدانەوەو سێبەری گەڵای درەختێک بوو کە لەبەر تیشکی تووندی کابینە تایبەتەکانی خوارنگەکەدا دەدرەوشایەوە.

دوروا، لە سەر قەنەفەیەکی پایە کورتدا ڕۆنیشت، بەرگ و پەردەی سەر قەنەفەکە لە هەمان پارچەی قرمزی قەد دیوارەکان بوو. سپرینگە سواوەکانی قەنەفەکە، لەژێر قورسی بەدەنیا، بەجۆرێ ڕۆچوون، وای زانی کەوتووەتە چاڵێکەوە. لە سەرانسەری خوارنگەکەدا دەنگی تێکەڵ و پێکەڵ و ژاوەژاو دەهاتە گوێ. هەمان دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی تایبەتی ئەو خوارنگە گەورە و جەنجاڵانە بوو کە بە سەدەمی پێکدادانی قاپ و کەوچک و چەقۆ و چەتاڵان، دەنگی پای هاتوچۆی بلەزی پێشخزمەت و شاگردان بەسەر کومباری ڕاڕەوەکان و دەنگی کرانەوەی دەرگای کابینە و ژوورە تایبەتیەکانەوە دروست دەبوو.

یەک سات بەر لە داخستنی ئەم دەرگایانە، چپە و گفت وگۆی ئەو مشتەرییانەی لەم ژوورۆچکانەدا مژوولی نانخواردن بوون دەهاتە گوێ. فورستیە، کە وەژوور کەوت، بە شێوازێکی خۆمانە و یەکماڵی و دڵسۆزانەی ئەوتۆوە، کە هەرگیز لە ئۆفیسی ڕۆژنامەکەدا ئەمەی لێ نەبینی بوو، هات بەلایەوە و تەوقەی دەگەڵدا کرد و گوتی:- خانمەکان پێکەوە دێن. ئەم شام خواردنانە زۆرخۆشە.

ئەوسا تەمەشایەکی مێزەکەی کرد، داوای لە گارسۆنەکە کرد، چرا گازیەکەی قەد دیوارەکە بکوژێنێتەوە،

تاکێکی پەنجەرەکەی داخست تا تەوژمی بایەکە لێی نەدات، شوێنێکی دوور لە تەوژمی بایەکەی هەڵبژارد و ڕۆنیشت.

- دەبێ زۆر ئاگام لە خۆ بێت. مانگێک بوو حاڵم باش بوو، ئەوە چەند ڕۆژێکە دووبارە گرفتار بوومەتەوە. پێموایە سێ شەممەی ڕابردوو، کە لە تەمەشاخانەکە هاتمە دەرەوە، سەرمام بوو.

گارسۆن باشیەکە، دەرگای کردەوەو جووتە ژنی گەنج وەژوور کەوتن، هەڵبەتە، تۆڕ بە ڕوخسار، بە پەنهانی، بەدزییەوە، بە ڕەفتاری ڕازئامێزەوە، کە خانمان لەو شوێنانەدا دەینوێنن هاتنە ژوورەوە، ئەو شوێنانەی کە ژوانگەی دیداری پەنهانی و گومان لێکراون.

کە دوروا، سڵاوی لە خانم فورستیە کرد، ژنەی گەنج، بە سەریا بۆڵاندی کە چیتر نەهاتووەتە دیدەنی، ئەوسا لێو بەخەندە، ڕوویکردە دۆستەکەی و لە سەری ڕۆیی:- دەی دیارە، خانم دوماریل بە سەر مندا پەسند دەدەی. بۆ دیتنی ئەو وەختت بە زیادەوە هەیە.

وەختایەک ئەو دووانەش ڕۆنیشتن، گارسۆن باشیەکە، لیستی شەرابەکانی نیشانی فورستیە دا. خانم دوماریل گوتی:- ئەم پیاوانە هەر شەرابێکیان دەوێ بۆیان بێنن، بەڵام ئێمە هەردووکمان شامپانی دەخۆینەوە، شامپانی زۆر عال و تەزی، هەڵبەتە سووکیش بێ نەک جۆرێکی دی.

وەختێ گارسۆن باشییەکە ڕۆیی، بەدەم پێکەنینێکی هەیەجان ئامێزەوە گوتی:- ئەمشەو دەمەوێ مەست بم. ئاهەنگێک بەرپا دەکەین، ئاهەنگ نە گاڵتە.

فورستیە، کە دەتگوت گوێی لەو نەبووبوو پرسی:- بۆ ئێوە ناخۆش نییە ئەم پەنجەرەیە دابخەم؟ قەیدی نییە ئەم

پەنجەرەیە دابخەم؟ چەند ڕۆژێکە سینگ یەشەکەم سەری هەڵداوەتەوە.

- نا، بە هیچ جۆرێ.

چوو تاکە نیمچەکراوەکەی پەنجەرەکەشی داخست و ئەوسا بە ڕوخساری ئاسوودە و ئارامەوە دانیشتەوە.

ژنەکەی قسەی نەدەکرد، پێدەچوو لە فکران ڕاچووبێ، سەری داخستبوو و لێو بەخەندە چاوی بڕی بووە پەرداخەکان، لەو جۆرە زەردەخەنانەی کە بە ڕواڵەت وەعد دەدەن و بەکردەوە ئەنجامی نادەن.

ئەو سەدەفانەی ئوستاند ( ئوستاند: بەندەرێکە لە باکووری بەلجیکا، کەوتووەتە کەنار دەریای باکوورەوە ) کە پێشخزمەتەکە دەیهێنانە سەرمێزەکە، نەرم و ناسک بوو، لە گوێچکی بچووک دەچوون کە لە قاڵبی سەدەفەکان نرابێ و وەکو ئاوی نەبات سوێر مەزە لە نێو دەما، لەن ێوان زمان و مەڵاشوودا، دەتوایەوە.

دوای سوپ، گارسۆنەکە قزڵ ئالای پەمەیی ڕەنگی لە بەردەمیاندا دانا، کە لە ڕەنگی پێستی کیژانی گەنج دەچوو، ئەوسا میوانەکان دەستیان بەقسان کرد.

هەوەڵجار قسە وباسەکەیان لە سەر هەرا وهەنگامەیەک بوو کە ژنێکی ئەشرافی نابوویەوە. یەکێک لە دۆستانی مێردەکەی، لە کاتی شێو خواردنا، ئەوی لەیەکێک لەم ژوورە تایبەتیانەی خوارنگایاندا غافلگیر کردبوو.

فورستیە، زۆر بەم ڕووداوە پێکەنی، جووتە ژنە گەنجەکە گوتیان کە ئەم کابرا هەڵەوەرە بێ ئابڕووە، شۆڤارێکی بودەڵەو خوێڕی بووە. دوروا پشتگیری قسەکانی ئەوانی کرد و بەدەنگی بەرز گوتی کە ئەرکی پیاو لەوجۆرە

هەڵوێست و حاڵانەدا، چ ڕۆڵی لە مەسەلەکەدا هەبێ، چ ڕازڤان بێ و یان تەنیا شایەد بێ، ئەمەیە کە وەکو مردوویەک دەمی تێکنێ و بێدەنگ بێ. ئەوسا لە سەری ڕۆیی:

– ئەگەر بمان توانیبا، ڕازی یەکدی بپارێزین، ژیان چەند جوان و خۆش دەبوو. ئەوەی زۆربەی کات یان هەمیشە ژنان لە هەندێ کاران دەکات، ترسە لە کەشف بوونی ڕازەکانیان.

ئەوسا لێو بە خەندە لە سەری ڕۆیی:– مەگەر وانییە؟ گەلێکیان ئەگەر نەترسابان، ئابڕوویان بە یەکجارەکی دەرژێ و ناویان دەزڕێ و ناچار دەبن لە پێناوی شادمانییەکی کورت مودەتدا، ڕوندکی خەم و پەشیمانی بڕێژن، ئامادە بوون لە هەنبەر ڕابواردن و هەوەسێکی ناگەهانی، لەزەتێکی تیژ تێپەڕ و خێرای یەک سەعاتە و خەونێکی عاشقانەدا ڕادەست بن!

هێندە بە ئەرخایەنی و متمانەوە ئەو قسانەی دەکرد کە بۆ ئەوانی دیکەش سیرایەتی دەکرد، دەتگوت داکۆکی لە حاڵەتێکی تایبەتی، حاڵ و هەڵوێستێکی تایبەت بەخۆی دەکات، وەکو ئەمە بوو کە بڵێت: " ئەگەر ئەم شتە لە گەڵ مندا ڕوویدات، هەرگیز لە قاو نادرێ. ئەگەر باوەڕ ناکەن وەرن تاقیم بکەنەوە. "

جووتە ژنە گەنجەکە چاویان تێبڕی بوو، بەچاو پشتیوانیان لە قسەکانی ئەو دەکرد، بەڕای وان قسەکانی دروست بوون و بێدەنگیەکەیان خۆی لە خۆیدا، ئیعترافکردن بوو بەوەی کە ئەخلاقی بتەوی پاریسیان، ئەگەر دڵنیابن

ڕازیان بڵاو نابێتەوە و ناویان نازڕێ، ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر لە هەنبەر وەسوەسەدا بەرگە بگرێ.

فورستیە کە لاقێکی لەژێر خۆیدا دانابوو و بە نیمچە پاڵکەوتنێکەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو و دەستماڵ سفرەکەی تەپاندبووە یەخەی ئێلەکەکەیەوە تا جلەکانی پیس نەبن، بەدەم پێکەنینێکی گوماناوییەوە گوتی:

- ئەرێ، هەڵبەتە ژنان، ئەگەر دڵنیابن ئابڕوویان ناڕژێ، زۆر کاران دەکەن! وای بەحاڵی مێردەکانیان، داماو خۆتان مێردینە.

ئەوسا هاتنەسەر باسی عەشق. دورواو، بێئەوەی عەشق بە شتێکی ئەبەدی بزانێت، باوەڕی وابوو، عەشق دەشێت تا ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێت وببێت بە پەیوەندییەکی دۆستانەی مەحەبەت ئامێز ومتمانەدار لە نێوان دووکەسدا، پەیوەندی فسیولوجی و بەدەنی جگە لە دووپاتکردنەوەی پەیوەندییانی پێشووتر هیچی دیکە نییە. بەڵام زۆر لە حەسوودی و غیرەی بە ئازار، کارەساتبار، هەروا هەنگامە و قەرقەشە بەرپاکردن و هەندێک حەقارەت کە زۆربەی کات دەگاتە لێکدابڕان و دەست لێکدی بەردان، پەست و توورە دەبوو.

وەختایەک لە قسەکانی بووەوە، خانم دوماریل ئاهێکی هەڵکێشا وگوتی:

- بەڵێ، ئەمە تاقە شتی بایەخداری ژیانە و، ئێمەمانان هەمیشە بە هەنجەت و داوا و چاوەڕوانییە نابەجێ و نەشیاوەکانمان تێکی دەدەین.

خانم فورستیە کە یاری بە چەقۆکەی دەکرد گوتی:- بەڵێ... بەڵێ... زۆرچاکە ئینسان خۆشەویست بێ.

وادەهاتە بەرچاو بیروخەیاڵی بۆ شوێنانی دوور فڕیوە و بیر لە شتانێک دەکاتەوە کە زاتی گوتنیانی نییە.

چونکە هێشتا خواردنە ئەسڵیەکە نەهێنرابوو، ئیدی بە خواردنەوەی قومێک شامپانی یان ڕووە برژاوەکەی نانەکان خۆیان دەخافڵاند. بیری عەشق بەخاوی و بە شێوەیەکی لە پارێزنەهاتگ دەخزایە بوونیانەوە، بەرەبەرە ڕوحیانی لە سەر مەستیدا نقوم دەکرد، وەکو ئەم شەرابە زەلاڵ و هەڵچووەی کە دڵۆپ دڵۆپ دەچۆڕایە گەروویانەوە، خوێنی دەهێنانە کوڵ و جۆش و روحیانی ئاشوفتە دەکرد.

ئەنجام گارسۆنەکە خواردنی هێنا، بریتی بوو لە مەخلەمە، نەرم و زوو هەرس، لە سەر گیای مارچێوەی وردکراو و ناسک تەخت کرابوو. ( مارچێوە: گیایەکی بەهارەیە هەم خۆراکییە هەم دەرمانی. )

فورستیە گوتی: " بەهبە، عەجەب خواردنێکی بەلەزەتە! " و بەهێواشی دەستی بەخواردن کرد. گۆشتە نەرم و مارچێوە وردکراوەکەی کە کرابوو بە هەویر، زۆر بە تاسوقەوە دەخوارد.

دوروا، لە سەر قسەکانی بەردەوام بوو:- من، کاتێ کە ژنێکم خۆشدەوێ، هەرچییەکی لە دەوروبەر بێ لەبەرچاوم دەسڕێتەوە.

ئەم قسەیەی بە یەقینی تەواوەوە دەکرد و لە هەمان کاتدا لە خۆشی مەجلیسەکە و خواردنە بەلەزەتەکە، تەواو وەجۆش هاتبوو.

خانم فورستیە، وەکو یەکێک کە ئەم بابەتانەی بەلاوە گرینگ نەبێ لەبن لێوانەوە گوتی:

- هیچ شادمانییەک لە یەکەمین تەوقەی ئەڤینداری بالآتر نییە، وەختێ یەکێک لە یەکێک دەپرسێت: " خۆشت دەوێم؟ " و ئەوی دی وەلآم دەداتەوە: " بەڵێ خۆشم دەوێی.
"

خانم دوماریل، کە پێکەکەی تا دواچۆڕ هەڵدابوو، بەدەم دانانی پەرداخە بەتاڵەکەوە لە سەر مێزەکە، بە شادییەوە گوتی:- من باوەڕم بە عەشق وڤیانی ئەفلاتوونی نییە.

هەمووان، بەنیگای هاڕوژاوەوە، بە دەم پشتیوانی کردنی ئەم بۆچوونەوە، دەستیان بە نوکتەبازی کرد.

فورستیە، لاقەکانی لەسەر قەنەفەکە ڕاکێشان و دەستەکانی لێکدی بڵاوکردنەوەو لە پشتەوە خستنیە سەر گۆشەکانی سەر قەنەفەکە و بە ڕاوێژێکی جدی گوتی:- ئەم ڕاشکاویەت ئەوە دەسەلمێنێ کە تۆ ژنێکی ئەهلی کرداریت نەک ئەهلی قسان. باشە دەشێت ئەو پرسیارەت لێبکرێ کە بۆچوونی جەنابی دوماریل لەم ڕووەوە چییە؟

ژنەی گەنج، بە پەستیەوە شانەکانی هەڵتەکاندن و ئەوسا بە ئەسپایی بە ڕوون و ڕەوانی گوتی:

- جەنابی دوماریل، لەمبارەیەوە هیچ بۆچوونێکی نییە. ئەو جگە... جگە لە پاشملەگۆیی و ئیرادگرتن، هیچی دی لە دەست نایەت.

قسان لە تیۆرییانی بەرزەوە دەربارەی عەشق و ڤیان، هاتە سەر دنیای بەرینی بێ پەروایی شەرمامێز.

نۆرە، نۆرەی قسانی مانادار و بەتوێکڵان بوو، هەڵدانەوەی ڕووبەندان بەکۆمەکی وشە و پەیڤان، وەکو هەڵکردنی تەنوورە، لە دەمی بەکاربردنی، فێڵ و کەڵەکی گوفتاری، پرکێشیانی ناسک بە چەمک و مانایانی

پەنهانییەوە، قسەی بە دوتوێکڵ و دووزەردێنە، ئەو وێنە ڕووتانەی کە لە ڕێگەی دەربڕینی پۆشراوەوە بەرجەستە دەکران ودیمەنی خێرایان لە بەرچاوا بەرجەستە دەکرد کە بە زمان نەدەهاتە دەربڕین و عەشقی پەنامەیەکی و ناڕاستەوخۆ بە خەڵکانی ئەهلی ڕابواردن، نیشاندەدەن، جۆرە تەماسێکی ناپاک و پەیوەندی جەستەیی، لە میان هەموو هەستە پەنهانە نەنگینەکانەوە، بە تاسەی هاوئامێزییەکی جەستەییەوە.

خواردنی سەرەکی دووەم، کەوی برژاو و هەوێردە بوو. ئەوسا نۆکی فەرەنگی، ئەوسا جگەری قیمەکراویان دەگەڵ کاهودا، لە قاپێکی زەڵاتەی گەورەدا، تێکەڵ کردبوو، لە قەوزەی سەوز دەچوو. لە هەموو ئەم خۆراکانەیان خوارد، بەبێئەوەی هەست بە تامیان بکەن، یان هەست بکەن کە خەریکە شتێک دەخۆن، ئەوەندە سەرقاڵی ئەو قسانە بوون کە دەیانکرد، حاڵ و هەوای عەشق ئەوەندەی سەرمەست کردبوون، ئاگایان لە تام ولەزەتی خواردنەکان نەمابوو.

ژنەکان، نها، قسەی بێ پەردەیان دەکرد، خانم دوماریل، بە جورئەتێکەوە کە زیاتر لە هاڕوژاندن دەچوو قسەی دەکرد و خانم فورستیە، بە پارێزێکی دڵگیرەوە، هەوڵیدەدا، لە گوفتاریا، لە پێکەنین و بزەکانیا، لە هەموو ئەو ڕەفتارانەیدا کە پێدەچوو بە زمان دەریان ببڕێ، میانەڕەو بێ و میانەڕەوی بکات.

فورستیە، کە نها، نیمچە پاڵکەوتنێک پاڵکەوتبوو، پێدەکەنی، خواردنی دەخوارد، ڤەخارنی دەخواردەوە و

هەندێک جار قسەی هێندە بێپەردەی دەکرد کە ژنەکان لە ناخا یان بە ڕواڵەت ڕادەچڵەکین وسوور دەبوونەوە و بۆ ماوەی دوو سێ چرکە تەریق دەبوونەوە و سەریان دەبەرخۆ دەنا. وەختێک قسەیەکی سووک و نەنگین و گۆساخانەی دەکرد، یەکسەر لە دوای قسەکەی دەیگوت: " حاڵتان باشە؟ ئەگەر بەمجۆرە لە سەری بڕۆن، کاری گەوجانەتان لێ سادر دەبێت. "

میوە وشیرینی و محەلەبی و جەلیان هێنا و پاش ئەوانە قاوەشیان هێنا. ئەو لیکورەی کە دوای ئەوە خواردیانەوە، هێندەی دی ڕوحی هاڕوژاوییانی، هێنایە جۆش.

خانم دوماریل، وەکو لە هەوەڵی دانیشتنەکەدا ڕایگەیاندبوو، مەست بووبوو، خۆشی بەهەمان ناسکی پڕشادمانی ژنێکەوە کە هەوڵدەدا، لە بەردەم میوانەکانیا خۆی شاد و شەنگوڵ نیشانبدات و دڵیان خۆشبکات، دانی بەم مەستیەی خۆیدا دەنا.

خانم فورستیە نها بێدەبگ بووبوو، دوروا، کە بە تەواوی هاڕوژابوو، لە ترسی ئەوەی نەبا دەستەکەی بکەوێتەڕوو، زیرەکانە بێدەنگی هەڵبژاردبوو.

هەموو دەستیان بەجگەرەکێشان کرد، فورستیە لە ناکاوا کەوتە کۆکین. کۆکەکەی هێندە توند بوو، کە گەرووی خەریک بوو بدڕێ. ڕوخساری سوور هەڵگەڕابوو، ئارەقە نیشتبووە سەر هەنیەی و سەری وە ژێر دەسماڵ سفرەکەیدا کردبوو. وەختایەک کۆکەکەی هێور بووەوە، بە قەلافەتێکی تووڕەوە، بەدەم خوتە وبۆڵەوە گوتی: " ئەم دەعوەت و ئاهەنگانە بۆ من باش نییە، بۆ من نابێت، زۆر

گەوجانەیە. هەرچی خۆشییەکی بینی، بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە، کە دەستبەرداری نەدەبوو، لە کونە لووتییەوە هاتە دەرەوە.

– با بڕۆینەوە بۆماڵەوە.

خانم دوماریل، زەنگی لێدا و بە گارسۆنەکەی گوت لیستی حیسابەکە بێنێت. لیستی حیسابەکە زوو بەزوو هێنرا. ویستی بیخوێنێتەوە، لێ ژمارەکان لەبەرچاویا دەخولانەوە، کاغەزەکەی دایە دوروا و گوتی:

– هانێ، لە جیاتی من حیسابەکە بدە، چاوم هیچ نابینێت، بە تەواوەتی مەستم.

لە هەمان کاتدا جزدانی پارەکەشی دایە دەست دوروا.

کۆی حیسابەکە سەد و سی فرانک بوو. دوروا حیسابی کرد، ئەوسا دوو ئەسکەناسی لە جزدانەکەی خانم دوماریل دەرهێنا و دایە گارسۆنەکە و باقی پارەکەی لێوەرگرتەوە و بە دەنگی نەوی پرسی:– چەند بەخشیش بۆ گارسۆنەکان دابنەم؟

– بەکەیفی دڵی خۆت، من نازانم.

دوروا، پێنج فرانکی خستە قاپەکەوە، کە جزدانەکەی دەدایەوە بە خانم دوماریل، پرسی: - دەتەوێ بتگەیەنمەوە ماڵێ؟

– ئا، ئەدی چی، ناتوانم ماڵەکەی خۆم بدۆزمەوە.

تەوقە و خاترخوازیان لە گەڵ فورستیە و ژنەکەیدا کرد و دوای کەمێک دوروا، دەگەڵ خانم دوماریل دا، لە نێو ئەو گالیسکەیەدا کە بۆ ماڵی دەبردنەوە، بەتەنیا مایەوە.

دوروا، لەم کابینە چکۆلە سەرگیراوەدا کە جارجار ڕوناکی گڵۆپی سەرجادەکان دەیدا لە ناوی و ڕۆشنی دەکردەوە، خۆی لەژنەی گەنج تەواو نزیک کردەوە، لە سەر جلەکانیەوە هەستی بەگەرمی بەدەنی ژنەی تاین دەکرد، تیامابوو چ بڵێت، هیچ قسەیەکی بۆ نەدەهات. هەرهیچی هیچ، مەیل و ئارەزووی لە باوەشگرتنی ژنەی تاین، زەینی ئیفلیج کردبوو.

بەخۆی گوت: ئەگەر زات وەبەرخۆ بنەم و دەستی بۆ ببەم، چ دەکات؟ یادی ئەو قسە بێ پەردانەی کە لە سەر مێزی خواردنەوەکە کرابوون جورئەتی پێدەبەخشی، بەڵام لەهەمان کاتدا، ترسی ئابڕووچوون، قەڵەمی دەست و پێی دەشکاند.

خانم "دوماریل" ش هیچ قسەیەکی نەدەکرد، بێ جووڵە لە سووچێکی گالیسکەکە دانیشتبوو. دوروا، ئەگەر پرشنگی چاوەکانی، کە هەرجارێ تیشکی گڵۆپی شەقامەکە دەهاتە ژوورێ، نەدیتبا، وای دەزانی خەوی لێکەوتووە.

لە دڵی خۆیدا دەیپرسی: " ئاخۆ بیر لەچی دەکاتەوە؟ " هەستیدەکرد نابێ هیچ قسەیەک بکات، بچووکترین وشەیەک کە بێدەنگییەکەی بشڵەقاندبا، دەیتوانی، هەلی سەرکەوتنی لە دەست بدات. بەڵام جورئەت و زاتی هەڵوێستێکی ناگەهانی و زبریشی لە خۆیدا نەدەبینی.

لە ناکاوا هەستیکرد، لاقی خانم دوماریل، تەکانی خوارد، تەکانێکی وشک و تووڕە، زادەی بێ سەبری، ڕەنگە زادەی داوای ئەنجامدانی کارێک بووبێ. ئەم جووڵە کەم و بەئاستەم هەست پێکراوە، سەراپای هێنایە لەرزە، لە ناکاوا

ئاوڕی لێدایەوەو لە باوەشی گرت. بە دەم لە دەمی گەڕا و بە دەست لە بەدەنی.

خانم دوماریل، هاوارێکی سووکی کرد، ویستی لە جێی خۆی هەستێت، ئەو لە خۆی دوور بخاتەوە، بەڵام وادیاربوو هیچ هێزێکی بەرگری تیانەمابوو، بۆیە سووک وباریک ڕادەست بوو.

گالیسکەکە، زوو بە زوو گەییە بەرماڵەکەی خانم دوماریل و وەستا.

دوروا، کە غافڵگیر بووبوو، فریا نەکەوت قسەیەکی عاشقانەی بەگوێدا بدات، سوپاسی بکات و عەشقی وەفادارانەی خۆی بۆ دەربڕێ. وێڕای ئەمەش، خانم " دوماریل " ش نەدەجوولا، هەڵنەدەستا و دابەزێت، دەتگوت گێژومەنگی ئەو شتەبوو کە ڕوویدابوو. هەنگێ دوروا، ترسا عەرەبانچییەکە، گومان لە بێ جووڵەییەکەی ئەوان بکات، لە گالیسکەکە دابەزی و دەستی درێژ کرد تا یارمەتی ژنەی گەنج بدات، کە دابەزێت.

خانم دوماریل، بەلارەلار و بێئەوەی چ قسەیەک بکات دابەزی. دوروا، لە زەنگی دا، وەختێ دەرگا کرایەوە، بەپاوێژێکی لەرزۆک پرسی: " دەتوانم کەی بتبینم؟ "

خانم دوماریل، لەبن لێوانەوە و هێندە بە ئەسپایی، کە بە ئاستەم دەنگی دەبیسترا، گوتی: " سبەی نیوەڕۆ وەرە پێکەوە فراڤین بخۆین. " ئەوسا لە هاماجی نیوە تاریکی ڕاڕەوەکەدا دیار نەما و دەرگا گەورەکەی ئەپارتمانەکەی لە دوای خۆیەوە داخست، دەنگی داخستنی دەرگاکە وەکو تەقینی تۆپ و لەناو ئاپارتمانەکەدا دەنگی دایەوە.

دوروا سەد سووی بە گالیسکەچییەکە دا و پاشان بە هەنگاوێن لەزگین وسەرکەوتووانە و، بەدڵی سەرڕێژ لە خۆشحاڵی، بەپێیان کەوتەڕێ.

سەرەنجام توانی بووی بۆ خۆی ماشقەیەک پەیدا بکات، ژنێکی سەر بە چینە باڵاکان، لە چینێکی خۆشگوزەرانی پاریسی، چەند بە ئاسانی و بەجۆرێکی باوەڕ نەکردەنی بەم ژنە گەیی بوو.

تا ئەو کاتە وای وێناکردبوو، تەنیا بۆ ئاشنا بوون و وەدەست هێنانی دڵی یەکێک لەم بوونەوەرە جوان و دڵڕفێنانە، پێشەکی و زەمینەسازییەکی یەجگار زۆر پێویستە، چاوەڕوانی زۆر و لەبن نەهاتگ، مجامەلە و ئەتەکێتزانی تایبەتی و زیرەکانە، پەیڤ و گفت و لفتی عاشقانە، دیاری وسەوقاتی دان پێویستە، کەچی نها لە ناکاوا، بەکەمترین هەوڵ، یەکەم کەس کە بەردەستی کەوتبوو، ڕادەستی ئەو بووبوو، بە خێراییەکی ئەوتۆ ڕادەستی بووبوو کە هێشتا باوەڕی نەدەکرد، گێژ وحەپەسا بوو.

بەخۆی گوت: " مەست بوو. سبەینێ مەسەلەکە بەجۆرێکی دی دەبێ، دەمخاتە گریان. " لەم بیرە نیگەران بوو. ئەوسا دووبارە بەخۆی گوت: " بەڵام نا، گرینگ نییە. ئێستا کە بەدەستم هێناوە، دەزانم چۆن دەیپارێزم، لە دەستی نەدەم. "

لە سەرابێکی تێکەڵ وپێکەڵدا، کە ئومێد و هیواکانی تیایدا سەرگەردان بووبوو، ئومێد بە شۆرەت و پێگە. بەسەرکەوتن، بە عەشق و ڤیان، ئابلۆقەی دابوو، لە ناکاوا بینی کۆمەڵێک لە ژنانی خۆشپۆش و تەڕپۆش، جوان،

دەوڵەمەند و دەسترۆ، وەکو چۆن لە کۆتایی نمایشدا هەموو ئەکتەرەکان دێنە سەر شانۆ، بەو ئاوایە، لێو بەخەندە، لە بەرانبەریا تێدەپەڕن و یەک لە دووی یەک لە نێو هەورێن زێڕینی خەونەکانیا ئاوا دەبن و دیار نامێنن.

خەویشی پڕبوو لەم خەونانە.

سبەینێ وەختایەک خەریک بوو بە پلیکانەکانی ماڵەکەی خانم دوماریل دا سەردەکەوت، هەندێک نیگەران و دوودڵ بوو. چۆن مامەڵە دەگەڵ ئەمدا دەکات؟ ئەگەر هەر پێشوازیشی نەکات چی؟ ئەگەر دەرگای ماڵەکەی لێنەکاتەوە؟ ئەگەر وابنوێنێ هیچ شتێک ڕووی نەداوە؟.... بەلام نا، نەیدەتوانی هیچ قسەیەک بکات، مەگەر تەنیا ئەوەی بەچاوا بداتەوە کە لە نێوانیاندا بووری بوو. بۆیە داشی سوار بوو و بەتەواوەتی بەسەر ڕەوشەکەدا زاڵ بوو. کارەکەرێکی ئەندام وردیلە دەرگاکەی لێکردەوە. هەمان سەروسیمای ئاسایی جارانی هەبوو. ئیدی دڵی ئاسوودە بوو، پێدەچوو بەت ەمای ئەوەبێ، کارەکەرەکە بەڕوویەکی گرژ ومۆنەوە ببینێ.

لە کارەکەرەکەی پرسی:- خانم حاڵی چۆنە، باشە؟

کارەکەرەکە بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ ئاغا، وەکو هەمیشەیە.

ئەوسا دوورِوای بۆ هۆڵەکە ڕێنوێنی کرد.

دوروا، یەکڕاست چوو بۆلای موغەیرییەکە تا لە ئاوێنەکەی سەروو موغەیرییەکەوە، تەمەشایەکی سەروقژی خۆی بکات، لە کاتێکا خەریک بوو لە بەر ئاوێنەکەدا بۆینباخەکەی ڕێکدەخست، چاوی بە ژنە گەنجەکە کەوت کە

لە ئاستانەی دەرگای هۆڵەکەدا وەستابوو و تەمەشای ئەمی دەکرد.

دوروا، وای نواند ئەوی نەبینیوەو هەردووکیان بەمجۆرە بۆ چەند ساتێک بەر لەوەی ڕوو بەڕووی یەکدی ببنەوە، لە ئاوێنەکەدا کەوتنە تەمەشاکردنی یەکدی.

سەرەنجام دوروا، ئاوڕی لای ئەوی دایەوە. ژنەی گەنج لە جێی خۆی نەجووڵابوو، دەتگوت چاوەڕوانی دەکرد. دوروا، بەرەولای ئەو تەکانی دا و بەدەمەلاڵکێوە گوتی: " چەندم خۆش دەوێی! کە خۆشم دەوێی! "

خانم دوماریل، دەستەکانی لێک بڵاوکردنەوەو کەوتە باوەشی ئەوەوە، خۆی پێوە نووساند، ئەوسا سەری هەڵبڕی و یەکدییان راموسی.

دوروا، لە دڵی خۆیدا گوتی: " لەوە دەستەمۆترە کە وێنام دەکرد. کەواتە ڕەوشەکە باشە، هیچ شتێک لە گۆڕێ نییە. " ئەوسا کەوتە تەمەشاکردنی ئەو، بەبێئەوەی هیچ شتێک بڵێت بزەیەکی بەڕوویدا دا و لە هەمان کاتدا هەوڵیدەدا، لە نیگایدا عەشق و ڤیانێکی بێپایان دەرهەق بەو بنوێنێت.

خانم دوماریلش زەردەی دەهاتێ، لەو زەردەو بزانەی کە ژنان خواست و ڕەزامەندی و مەیلی ڕادەستبوونی خۆیانی لە میانەوە نیشاندەدەن. سەرەنجام لەبن لێوانەوە گوتی:- هەردووکمانین. " لورین " م نارد بۆ نیوەڕۆژە بچێت بۆماڵی یەکێک لە هاوڕێکانی.

دوروا، ئاهێکی هەڵکێشا، دەستی ماچ کرد و گوتی:- سوپاس، دەتپەرستم.

خانم دوماریل، بەجۆرێ باسکی ئەوی گرت کە دەتگوت مێردیەتی، ئەوی بۆلای قەنەفەکە برد و بە دوو قۆڵی لە سەری ڕۆنیشتن.

دەبوایە سەری قسان بە وشەێن زیرەکانە وئەفسووناوی بکاتەوە، لێ چونکە هیچی بۆ نەهات بەدەم دەمەلاڵکێوە گوتی: - ئێ، خۆ زۆر لە دەستی من ناڕەحەت نیت؟

خانم دوماریل، دەستی خستە سەر زاری و گوتی:- بێدەنگ بە!

چاویان بڕی بووە چاوی یەکدی و قامکە تینوو و بەجۆشەکانیان تێک هاڵابوون. ماوەیەک بەو دەقەوە مانەوە.

- چەند بیر وتاسەت دەکەم.

خانم دوماریل، دووبارە گوتی: " بێدەنگ بە. "

لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، دەنگی ڕیزکردنی قاپ و چەقۆ، لە سەر مێزەکە هاتەگوێ.

دوروا، هەستایە سەر پێیان.

- نامەوێ بەم ڕادەیە لێتەوە نزیک بم. دوورنییە خۆم پێ زەوت نەکرێ و کۆنترۆڵی خۆم لە دەست بدەم.

لەو کاتەدا دەرگا کرایەوە و کارەکەرەکە گوتی:- خانم، خواردن ئامادەیە.

کابرای گەنج بە ویقارەوە دەستی دایە دەستی ئەو. ڕوو بەڕووی یەکدی دانیشتن و دەستیان بە نانخواردن کرد، تەمەشای یەکدییان دەکرد و بەردەوام بەڕووی یەکدا دەگرژینەوە. جگە لە خۆیان بیریان لە هیچ شتێک یان هیچ کەسێکی دی نەدەکردەوە، غەرقی جەزمە و تاسە و شەوقی

خۆشەویستیەکی عاشقانە بوون کە خەریک بوو دەستی پێدەکرد. خواردنیان دەخوارد، بەبێ ئەوەی خواردنەکە بدینن. دوروا هەستی کرد، پێیەک، پێیەکی بچووک لە ژێر مێزەکەوە سۆراغی ئەو دەکات. پێیەکەی خستە نێوان هەردوو پێی خۆیەوە و توووند گرتی.

کارەکەرەکە، بێ خەم و خەیاڵ دەهات، دەچوو، قاپەکانی دەگۆڕی، خواردنی تازەی دەهێنا، بێئەوەی وا بنوێنێ کە ئاگاداری هیچ شتێکە.

وەختایەک لە نانخواردن بوونەوە، گەڕانەوە بۆ ناو هۆڵەکەو لە سەر هەمان قەنەفە لە تەنیشت یەکدییەوە ڕۆنیشتن.

دوروا، بەرە بەرە خۆی لەو هەڵدەسوو و هەوڵیدەدا لە ئامێزی بگرێت، لێ خانم دوماریل، بە نەرمی ئەوی لە خۆی دوور دەخستەوە و دەیگوت:- ئاگاداربە، نەبا یەکێک بێتە ژوورەوە.

دوروا لە بن لێوانەوە گوتی:- کەی دەتوانم تۆ بە تەنیا بدینم و بەوپەڕی ئازادی بڵێم چەندم خۆشدەوێی؟

ژنەی گەنج، بەلای ئەوا دانەویەوە و دەمی لە پەناگوێی نا و گوتی:

- لەم ڕۆژانەدا، دێم بۆ ماڵەکەی تۆ و سەرێکت لێدەدەم.

دوروا، هەستیکرد سوور دەبێتەوە:- ئاخر دەزانی... ماڵەکەی من... زۆر... زۆر پەڕپووت و هەژارانەیە.

خانم دوماریل، لێو بەخەندە گوتی:

- قەیدی نییە. من بۆلای تۆدێم نەک بۆلای ماڵەکەت، دێم تۆ بدینم نەک ماڵەکەت، بۆ دیتنی تۆ دێم نەک ماڵەکەت.

ئەوسا دوروا، بە ڕژدییەوە لێی پرسی کەی دێت. خانم دوماریل، ڕۆژێکی لە هەفتەی ئایندەدا دیاریکرد، لێ دوروا بە دەمە لاڵکێوە، بەچاوانی درەخشانەوە لێی پاڕایەوە کە بەرواری دیدارەکەی هەندێ پێشتر بخات، لە هەمان کاتدا بە ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوەوە، نقوم لەو خۆزیا و هەوەسەی کە لە سۆنگەی ئەم نیوەڕۆژە دوو قۆڵییەوە، لە لای دروست بووبوو، بە توندی دەستەکانی خانمی دەگوشی.

خانم دوماریل، کە دەیبینی ئەم پیاوە گەنجە بەو هەموو تاسە و تامەزرۆییەوە لێی دەپاڕێتەوە، زۆری لەزەت دەبینی، لە خۆشیان گەزگەز بالای دەکرد و جارجار بەناز و کریشمەوە بەرواری دیدارەکەی ڕۆژێک دێنایە پێشەوە. بەلام دوروا، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە: " سبەی... دەبلێ سبەی.... "

ژنەی تاین، سەرەنجام قاییل بوو و گوتی:- باشە، سبەی، سەعات پێنج.

دوروا، ئاهێکی ئۆخەی هەڵکێشا، ئەوسا بە ڕەفتارێکی دڵسۆزانەوە، وەکو ئەوەی ساڵەهای ساڵ بێ یەکدی بناسن، بە ئارامی، سەرگەرمی گوت وبێژ بوون.

دەنگی زەنگێک، ڕای چڵەکاندن و بلەز لێکدی دوور کەوتنەوە. خانم دوماریل لەبن لێوانەوە گوتی: " دەبێ لورین بێ. "

منداڵەکە، لە ئاستانەی دەرگاکەوە بە دیارکەوت. هەوەڵجار لە جێی خۆی چەقی، ئەوسا بەدەم لێک سوونی

دەستەکانیەوە و بەدەم دیتنی دورواوە، بە خۆشحاڵی گوتی:
" ئا، بیل ئامی ".
( بیل ئامی، Bil Ami : بەمانای دۆستی جوان، دۆستی ئازیز دێت، بەڵام چونکە لەدەقەکەدا، وەکو ناوی تایبەتی بەکاربراوە، پێویست ناکا پاچڤە بکرێت، بۆیە هەر بە بیل ئامی هێڵراوەتەوە. )
خانم دوماریل، دەستی بە پێکەنین کرد.
- سەیرە! بیل ئامی! لورین چ ناوێکی لێناوی. منیش لێرە بە دواوە، بەبیل ئامی بانگت دەکەم!
دوروا، کچۆڵەکەی لە سەر ئەژنۆکانی دانیشاند و مژوولی ئەو یاریانە بوو کە لەوەوە فێریان بووبوو.
بیست دەقیقەیەکی بۆ سەعات سێ مابوو، هەستا، تابۆ مەکۆی ڕۆژنامەکە بڕوات. لە سەر قاڵدرمەکان و لە درزی دەرگا نیمچە وازەکەوە بە ئەسپایی گوتی: " سبەی، سەعات پێنج. "
خانم دوماریل، بە زەردەخەنەوە بەرسڤی دایەوە: " باشە " و دەرگاکەی داخست.

هەرکە لە کاری ڕۆژانە بووەوە، کەوتە بیرکردنەوە لەوەی کە بۆ پێشوازی ژنەی گەنج چۆن ژوورەکەی برازێنێتەوە کە نەداری و دەستکورتیەکەی تۆزێ بشارێتەوە. وای بەبیرا هات هەندێ پێداویستی جوانکاری ژاپۆنی بکرێت و بە دەرزی دەنبوس بەدیوارەکانیەوە بنێت، بەپێنج فرانکان، کۆمەڵێک پارچە و ئەتەمینی بچووکی پڕ نەخش و نیگار، باوەشێنی بچووکی دەستی و دیمەن و مەنزەرانی کڕی، هەوڵیدا بەوشتانە، پەڵە و لەکەی سەر

کاغەز دیوارییەکان کە لە هەموو کاتێ پیستر دەهاتنە بەرچاو، داپۆشێت و بشارێتەوە.

کۆمەڵێک وێنە ودیمەنی ناسکی، کە بریتی بوون لە بەلەمی نێو ڕوباران و، پەروازی مەلان بە ئاسمانی سووربەوەوە، خانمانێک بە جل وبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و لە بانێژە و بەرهەیوانانەوە، جم وجوڵی پیاوانی ڕەش پێستی کورتەباڵای ناو بەفرانی بە شووشەکانی پەنجەرەکەوە چەسپاند.

ژوورەکەی کە تەنیا جێگای دانیشتن و نووستنی تیا دەبووەوە، لە کەفلەکونێکدا شێوەی فانۆسێکی کاغەزینی ڕەنگاوڕەنگی بەنەخش و نیگاری جۆراوجۆری وەرگرت. جوان هاتە بەرچاوی، پاشماوەی شەوەکەی بە بڕینی باڵندەی سەر ئەو کاغەزە ڕەنگاوڕەنگانەی کە کڕی بوونی و بە چەسپاندنیان بەدار و دیوار وبن میچەکەوە بردەسەر.

ئەوسا بە دەم شووتی دوور ودرێژی قیتارانەوە خەوی لێکەوت. سبەی دوای نیوەڕۆ، بە پاکەتێ نان شیرینی و بوتڵێک شەرابەوە، لە ڕۆژان زووتر بۆماڵ گەڕایەوە. بۆ کڕینی دووقاپ و دوو پەرداخ ناچاربوو دوبارە بڕواتە دەرەوە. ئەوشتانەی لە سەر مێزی تەوالێتەکە دانا، خاولییەکی لە ژێریان ڕاخست تا پەڵەکانی سەرمێزەکە بشارێتەوە و دەست شۆرەکەشی لە ژێر مێزەکەدا شاردەوە.

ئەوسا بەدەم چاوەڕوانییەوە ڕۆنیشت.

خانم دوماریل، یەک چارەک دواکەوت، ئەوسا گەییە جێ، کە چاوی بەوێنەکان و شتە ڕەنگاوڕەنگەکانی قەد

دیوارەکان و بن میچەکە کەوت بە سەرسامی گوتی:- سەیرە، ماڵەکەت زۆر دڵگیرە، بەڵام خەڵکانێکی زۆر لە سەر قاڵدرمەکان بوون.

دوروا، خێرا لە باوەشی گرت و بە هەشتاو پەرچەمەکەی سەر هەنیەی لەو دیو ئەو تۆڕەوە کە لە سەر ڕوخساری دانابوو ماچ کرد.

دوای یەک سەعات و نیو، دوروا، خانمی گەیاندە وێستگەی گالیسکانی کرێ لە شەقامی ڕوم. وەختایەک لە نێو گالیسکەکە ڕۆنیشت، دوروا بەچپە پرسی: ˝ سێ شەممە، ئەم کاتانە؟ ˝

˝ خانم دوماریل ˝ ش گوتی:- باشە، سێ شەممە ئەم کاتانە.

پاشان کە دنیا تاریک بووبوو، سەری دوروای بە هەر دوو دەستان گرت، لە پەنجەرەی گالیسکەکەوە بۆلای خۆیی ڕاکێشا و ماچی کرد. وەختایەک یارۆی گالیسکەچی، ئەسپەکانی بەر قامچی دا وگالیسکەکەی خستەڕێ، خانم بە دەنگی بەرز گوتی: ˝ خاترێ تە بیل ئامی ˝ و ئەسپە سپیەکەی ژێر گالیسکەکە هەڵیکردە چوارناڵە و گالیسکە کۆن و شەق و شڕەکە دوور کەوتەوە.

بە درێژایی سێ هەفتەی لەوە بە دواوە دوروا هەر دوو سێ ڕۆژ چەلێک، هەندێجار پێش نیوەڕویان وهەندێجار پاش نیوەڕوان، خانم دوماریلی لە ژوورەکەی خۆیدا دەبینی.

ڕۆژێک کە چاوەڕوانی ژنەی تاینی دەکرد، دەنگەدەنگ و بۆڵە بۆڵێکی بەرز لە سەر قاڵدرمەکانەوە بەرز بووەوە، دوروا بەرەو دەرگای ژوورەکەی چوو. منداڵێک دەگریا،

دەنگی تووڕەی پیاوێک پرسی: " دیسان چی بووە، کە کوڵی گریانی لە جۆش ناکەوێ؟ " دەنگی زیقاوڵە و ناخۆشی ژنێک بەرسڤی دایەوە: " ئەو ژنۆکە سەڵیتەیەی کە دێت بۆلای ڕۆژنامەوانەکەی نهۆمی سەرەوە، خۆی لە نیکولای داوە و پەرتی کردووەتە سەر سەحنی قاڵدرمەکە. وەکو ئەوەی خەڵکی ناچاربن تەحەمولی ئەم هەرزانە بکەن بەو ڕووداریە لەو سەر قاڵدرمانە خۆ لە منداڵی خەڵکی دەدەن.

دوروا، بەنیگەرانی چووە ژوورەوە، چونکە گوێی لە دەنگی ورشە ورشی جلک و هەنگاوی خێرابوو کە لە نهۆمی خوارترەوە بە هەشتاو بە پلیکانەکاندا هەڵدەگەڕا.

دوای کەمێک، لە دەرکە درا، خێرا دەرگاکەی کردەوەو خانم دوماریل بە هانکەهانک خۆی هەڵدایە ژوورەوە، هەراسان و شپرزە گوتی:- گوێت لێبوو؟

- نا، لە چی؟

- لەوەی چۆن سووکایەتیان بەمن دەکرد؟

- کێ؟

- ئەو نەگبەت و بەدبەختانەی ماڵیان لە نهۆمی خوارەوەیە

- نا، چی بووە، کا بۆمی باس بکە.

ژنەی گەنج، بێئەوەی بتوانێ یەک وشە بڵێت، دەستی بە هەنسک هەڵدان کرد.

دوروا، ناچاربوو، کڵاوکەی لە سەری دابکەنێت، یەخەی کراسەکەی بکاتەوە و لەسەر تەختەکە پاڵی بخات و دەستەسرێکی تەڕ لە سەر لاجانگەکانی دابنێت. ژنەی تاین هێشتا هەر هەنسکی هەڵدەدا. کەمێک دواتر هێور بووەوە،

تەقییەوە و هەرچیەکی لەدڵدا بوو هەرهەمووی هەڵڕشت، بە ڕژدی داوای لە دوروا کرد کە هەر ئێستا بچێتە خوارەوەو ئەوانە دارکاری بکات و تەنانەت بیان کوژێت.

دوروا، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە: " ئاخر ئەمانە کرێکار وگوندین. تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت ئەگەر ئینسان دەگەڵ ئەمانەدا تێبگیرێت، ڕێی دەکەوێتەلای پۆلیس ودادگا، ئاخر باش نییە ئینسان خۆی دەگەڵ ئەوانەدا تووش بکات. "

خانم دوماریل، بیری لە شتێکی دی کردەوە: " نها چی بکەین؟ من ناتوانم چیتر بۆ ئێرە بێم. " دوروا، بەرسڤی دایەوە: " ئەمە زۆر ئاسانە، ماڵەکەم دەگوازمەوە. "

ژنەی گەنج لە بن لێوانەوە گوتی: " بەڵام ئەم کارە زۆری پێدەچێ. "

پاشان لە ناکاوا، چارەیەکی دی بە مێشکیا هات و بە دڵڕەقیەکی کوت وپڕ گوتی:

- نا، گوێ بگرە، خۆم تەگبیری دەکەم، ئەمە دابنە بۆ من و تۆ هەقی هیچت نەبێت، سبەی بەیانی " ئابی یەکی بچووکت " بۆ دەنێرم.

مەبەستی لە " ئابی بچووک " ئەو بروسکانە بوو کە لە سەر کاغەزی شینباو لە پاریسەوە بۆ ئەملا و ئەولا فرێ دەکران.

زۆر دڵی بەم بیرۆکە نوێباوەی خۆش بوو وێڕای ئەوەش نەیدەویست بیرۆکەکەی بە دڵدارەکەی بڵێت و هەزار و یەک ناز و کریشمەی پێفرۆشت.

لە هەمان کاتدا، کە لە ڕۆیشتنیا بە پلیکانەکاندا دادەگەڕا هێندە پەست و نیگەران بوو کە هەستی دەکرد زرانیەکانی

دەلەرزن و بە هەموو کێشی خۆیەوە، خۆی دابوو بە سەر بازووی دڵدارەکەیدا. لە سەر پلیکانەکان تووشی کەس نەبوون.

***

سبەی بەیانی دوروا درەنگ لە خەو ڕابوو. تا نزیکی سەعات یازدە هێشتا لە نێو جێدا بوو، کە پۆستەچی، ئەو بروسکەیەی بۆ هێنا کە خانم دوماریل، بەڵێنی دابوو بۆی فڕێ بکات.

بروسکەکەی کردەوە و خوێندییەوە:

" قەراری دیدارمان وەکو هەمیشە سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆیە، ژمارەی ١٢٧، کونستانتینویل. تاقیبی ئەو شوقەیە دەکەی کە خانم دوروا بە کرێی گرتووە.

" کلو، ماچت دەکەم. "

سەری سەعات پێنج، خۆی بە ساختمانێکی گەورەی موبیلەکراوا کرد و چوو بە سۆراخی دەرگاوانەکەوە:

- خانم دوروا، لێرە شوقەی بەکرێ گرتووە؟
- بەڵێ قوربان.
- دەتوانی بێزەحمەت شوقەکەیم نیشانبدەی؟

کابرای دەرگاوان کە ئەزموونی دەگەڵ ئەم جۆرە هەڵوێستانەدا کە، دەبوا زۆر وریابێ، هەبوو، نیگایەکی دوروای کرد، کلیلێکی لە نێو ڕیزی کلیلیەکان هەڵبژارد:- تۆ جەنابی دوروای؟

- بەڵێ قوربان، ئەوم.

بە کلیل دەرگای شوقەیەکی دوو ژووری نهۆمی خوارەوەی، کە ڕوو بە ڕووی ژوورەکەی خۆی بوو، کردەوە.

دیوارەکانی هۆڵەکە، بە کاغەز دیواری مەیلە وتازەی، بەنەخش و نیگاری گەڵا ولق وپۆپێن درەختانەوە، پۆشرابوو. قەنەفەیەکی تیابوو کە لە داری ئاکاژو دروستکرابوو، بەرگەکەی سەوزێکی گوڵ زەرد بوو، مافورێکی گوڵداری تەنکی تیا ڕاخرابوو، ئەوەندە تەنک بوو کە پیاو لە سەر مافوورەکەوە هەستی بە ڕەقی ئەرزەکە دەکرد.

ژووری نووستنەکە هێندە بچووک بوو کە تەختە خەوەکە سێ چارەکی ژوورەکەی پرکردبوو. تەختەخەوێکی گەورە بوو، تەختەخەوی تایبەتی ئەو ماڵانە بوو کە بە کەل و پەل و ناو ماڵەوە بەکرێ دەدرێن و درێژییەکەی لەم دیوارەوە دەگەییە ئەو دیوار، پەردەی ئەستووری شینباو بە هەر چوار دەوریدا درابوو، لێفەیەکی ئاوریشمی سووری بە پەڵەپەڵەی گوماناوی پێدا درابوو.

دوروا، نیگەران و ناڕازی لە دڵی خۆیدا گوتی: " ئەم ماڵە زۆرم لە سەر دەکەوێ. دووبارە دەبێ قەرز بکەم. چ کارێکی گەوجانەی کردووە. "

دەرگا کرایەوەو کلوتیلد، بە بازوانی کراوە وبەدەم خشەخشی جلکانەوە، وەکو تەشبریق وبا وەژوور کەوت. زۆر شاد و سەرحاڵ بوو.

– شوێنێکی جوانە، نا، بڵێ بزانم بە دڵتە، پلیکانەشی نییە و پەنجەرەکانیشی ڕوو لە جادە وکۆڵانن. ئینسان دەتوانێ لە پەنجەرەکەوە هات وچۆ بکات، بەبێئەوەی دەرگاوانەکە بدینێ. ئیدی ڕێک بەدڵی مە دەبێت.

دوروا، بە ساردییەکەوە ئەوی ڕامووسی و لێ پرسیارێک لە سەر زمانی بوو، نەیدەوێرا لێی بکات.

ژنەی گەنج، کارتۆنێکی گەورەی لە سەر مێزە نزمەکەی ناوەندی ژوورەکە دانابوو. بەستەکەی کردەوە، سابوونێک، شووشەیەک قوڵۆنیا، کیسەیەکی خۆ شۆردن، پاکەتێک تەوقەی سەر، ئاچەرێکی بوتڵ کردنەوە و فێرێکی ئاسنینی چکۆلە بۆ لوولکردنی پەرچەمەکەی، لە کارتۆنەکە دەرهێنا.

بەخۆشحاڵییەکی ئەوتووە ئەوشتانەی ڕیز کرد ودانان، لە تۆ وایە دەیەوێ لەوێدا بژی. بە دەم ڕاکێشانی چەکمەجەکانەوە قسەشی دەکرد:- دەبێ هەندێک جلکی ژێرەوەش بێنم، تا ئەگەر پێویست بوو بەکاریان بێنم. لەگینە وەختایەک بۆ شت کڕین بێمە دەرێ، بەڕێکەوت ڕێژنە ئاوێکم پێدا بڕژێت. هەنگێ دەتوانم بێم بۆ ئێرە و خۆم وشک بکەمەوە. هەریەکەمان کلیلێک لای خۆمان هەڵدەگرین، جگە لەو کلیلەی کەلای دەرگاوانەکەیە، کە ئەگەر کلیلەکەی خۆمان ژبیر کرد، کلیلەکە لەو وەربگرین. ئەم شوقەیەم بۆ سێ هەیڤان بەکرێ گرتووە، هەڵبەتە بەناوی تووە، چونکە نەمدەتوانی بە نێوی خۆمەوە بەکرێی بگرم.

هەنگێ دوروا، پرسیارەکەی خۆی کرد:- پێم ناڵێی دەبێ کەی کرێکەی بدرێ؟

ژنەی گەنج بە سادەیی گوتی:- کرێکەی دراوە، گیانەکەم.

دوروا، گوتی:- کەواتە دەبێ بیدەمەوە بە تۆ؟

- نا، ئازیزی دڵەکەم، ئەمە پەیوەندی بە تووە نییە، خۆم حەزمکرد ئەم کارە شێتانەیە بکەم.

دوروا، وای نیشاندا گوایە تووڕە بووە:- نا، ئەمە تۆ چ دەڵێی. من ئەمە قەبووڵ ناکەم.

کلوتیلد، بە قەڵافەتێکی پاڕانەوە ئامێزەوە، بەرەو نک ئەو هات، دەستەکانی خستنە سەر شانەکانی ئەو و گوتی:- تکا دەکەم جۆرج. من ئەم کارەم زۆر لەلا خۆشە، حەز دەکەم وەکوماڵی خۆم بێ، لانەی عەشق و ڤیانمان بێ، تەنیا هی من بێ! تۆ نابێ لە مە دڵگران بیت. بۆچی ناڕەحەت بوویت؟ من ئەم کارەم لەبەر خاتری عەشقەکەمان کردووە. دەبڵێ چکۆلەکەم، تۆش ڕازیت...

بەنیگا، بە زار و بە هەموو بوونییەوە، لە دوروا دەپاڕایەوە. دوروا، بە سەروسیمایەکی تووڕەوە کەمێکی دی ناڕەزایی نواندن تا کلوتیلد دووبارە لێی بپاڕێتەوە، ئەوسا ملی دا و قاییل بوو کە کارێکی باشی کردووە.

وەختایەک کلوتیلد لەوێ ڕۆیی، جۆرج دەستەکانی لێکدی ماڵین و کەوتە گەڕان بە بنج وبناوانی دڵیا تا بزانێ ئەمڕۆ ئەم بۆچوونە لە کوێندەرەوە دزەی کردووەتە ناو دڵی:- هەر خۆمانین، ژنێکی گەلەک میهرەبانە.

دوای چەند ڕۆژێک بروسکەیەکی بچووکی دیکەی گەیشتە دەست کە دەیگوت: "مێردەکەم ئەمشەو، دوای سەردانێکی شەش هەفتەیی بۆ شارستانەکان دەگەڕێتەوە. بۆیە دەبێ هەشت دانە ڕۆژ یەکدی نەبینین. چەند کارێکی زەحمەتە، ئازیزەکەم! کلوی تۆ."

دوروا، مات ومەندەهۆش ما. قەت وێنای نەکردبوو کە مێردی هەیە. پڕ بەدڵ حەزیدەکرد ئەگەر بۆ تاقە جارێکیش بووە، ڕوخساری ئەم پیاوە بدینێت و ناسیاوی دەگەڵ پەیدا بکات.

بەبێ قەرارییەوە چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە مێردەکەی کلوتیلد بڕواتەوە بۆ سەردانی شارستانەکان، لەم ماوەیەدا دووجار سەری فولی برجری دا و هەردوو شەوەکەی لە ماڵی ڕاشیل بەسەر برد.

پاشان بروسکەیەکی کورتی دیکەی بە دەست گەیی کە دەقەکەی تەنیا چوار وشە بوو: " ئەمڕۆ. سەعات پێنج. کلو. "

هەردووکیان زووتر لە کاتی دیاریکراو، گەیینەجێ . ژنەی گەنج، بەوپەڕی تاسەمەندی و شەیداییەوە خۆی خستە باوەشی ئەوەوە، دەم و چاوی ماچ باران کرد، ئەوسا گوتی:

- ئەگەر حەز دەکەی، دەتوانی دوای ئێرە، بۆ شام خواردن بۆ جێیەکم ببەی. ئەمشەو ئازادم.

بەڕێکەوت هەوەڵی مانگ بوو و هەرچەندە لە پێشەوە بەرنامەی خەرجکردنی مووچەی مانگانەکەی حیساب کردبوو و بەو پارە و پولەی کە لێرە ولەوێ بەدەستی دێنا ڕۆژ بەڕۆژ دەژیا، ئەو ڕۆژە بەڕێکەوت پارەی تەواوی پێبوو، لەوە ڕازی بوو کە دەرفەت و دەرەتانێک هاتبووە پێش کە بتوانێ شتێک بۆ ماشقەکەی خەرج بکات.

کلوتیلد گوتی:- ئەرێ گیانەکەم، بۆ هەرکوێت بوێ دەڕۆین.

نزیکی سەعات حەوت لە ماڵ وەدەرکەوتن و گەیینە بولڤاری بازنەیی. کلوتیلد، توووند بازووی ئەوی گرتبوو، بەدەم ڕێوە بەگوێیدا دەچپاند: " مەگەر هەر خوا بزانێ چەند خۆشحاڵم کە ئاوا بازووت بگرم و لە گەڵتا ڕێ بکەم و خۆم بە تۆوە بگرم. "

جۆرج پرسی:- دەتەوێ بڕۆین بۆ خوارنگەی بابالانویل؟

- نا، ئەوێ زۆر ئەرستۆکراتیانەیە. حەزم لە شوێنێکی سادە وخۆشە، خوارنگەیەکی گشتی کە کارمەندان و کرێکاران بۆ نانخواردن بۆ ئەوێ بێن. دەزانی زۆر حەزم لە نمایشێن بووکەڵە بازییە. خۆزگە دەمانتوانی بچینە هەوارگە!

چونکە دوروا، ئەو شوێنەی نەدەزانی، هێندە بە بولڤاردا سووڕانەوە تا بەدەم پیاسەوە گەیینە مەیخانەیەکی چکۆلە، کە لە هۆڵێکی ئەلاحەدەدا، خواردنی بە مشتەریان دەدا. کلوتیلد، لە پشت جامخانەکەوە دوو کیژی گەنجی قژ هۆنراوەی بینی بوو کە دەگەڵ دوو سەربازدا لە سەر مێزێک دانیشتبوون.

سێ عەرەبانچی کە کۆتایی هۆڵە درێژ و باریکەکەدا خەریک بوون شێویان دەخوارد. نەفەرێکیش کە خۆیا نەبوو چ کارەیە، بەدەم پایپ کێشانەوە، لاقی لە ژێر مێزەکە ڕاکێشابوون و دەستەکانی لە گیرفانەکانی نابوون. لە سەر کورسییەکەی پاڵی دابووەوە و سەری نابوو بە میلەکانی پشت کورسیەکەیەوە. چاکەتەکەی وەکو مۆزەخانەی پەڵە و لەکەێن جۆراوجۆر وابوو، گیرفانەکانی هەڵئاوسابوون، لە هەر گیرفانێکیەوە، دەمی بوتڵێک، تیکە نانێک، شتێکی لە ڕۆژنامە پێچراوەوە، سەری داوێک کە لە دەوری پێچرابوو، دەبینرا. قژەکەی پڕ، ئاڵۆزکاو، بۆز و چڵکن بوو. کڵاوەکەی لە ژێر کورسییەکەیدا و لە سەر ئەرزەکە کەوتووبوو.

هاتنی کلوتیلد بەو سەر وسیما ڕازوە و ئەرستوکراتیانەوە، سەرنجی هەر هەموویانی ڕاکێشا.

کیژەکان و دۆستە سەربازەکانیان بێدەنگ بوون، سێ عەرەبانچییەکە کۆتاییان بە قسەکانیان هێنا و کابرا شرۆڵەکەش پایپەکەی لە دەمی دەرهێنا، تفێکی ڕۆکردە بەرپێی خۆی و سووکە ئاوڕێکی لای ئەوانی دایەوە.

خانم دوماریل، لە بن لێوانەوە گوتی: " جێیەکی دڵگیرە! زۆر ئاسوودە دەبین، کە جارێکی دی بۆ ئێرە هاتین جلکی ژنانی کرێکار لەبەر دەکەم. " بە بێ هیچ دوو دڵییەک لەپشت مێزێکەوە ڕۆنیشت کە لە چەوری خۆراک و ئەو ڤەخارنانەی بە سەریا ڕژابوو و گارسۆنەکە کلینکسێکی پێدا هێنابوو، دەبریقایەوە. دوروا کەمێک نارەحەت، کەمێک تەریق، تەمەشای دەوروبەری دەکرد و لە عەلاگەیەک دەگەڕا کە کڵاوەکەی پێدا هەڵواسێت، چونکە عەلاگەی بەدی نەکرد، کڵاوەکەی لە سەر کورسییەک دانا.

نەفەرێک راگوی مەڕیان ( راگو: خواردنێکە کە لە گۆشتی ڕانی گوێرەکە یان مەڕ، لەگەڵ گێزەر، پەتاتە و فاسولیای تەڕ و ئەوشتانە دروست دەکرێ ) لەگەڵ قاپێک گۆشتی نەرمەی سوورەوەکرا و وزەلاتەدا خوارد. کلوتیلد، بەردەوام دەیگوت و دەیگوتەوە: " ئێرەم زۆر پێخۆشە، منیش زەوق و سەلیقەیەکی سەیرم هەیە، ئێرەم زۆر لە کافەی ئانگلە پێ خۆشترە. " ئەوسا درێژەی دایە: " ئەگەر دەتەوێ خۆشیەکەم تەواوبێ، بمبە بۆ یەکێک لەم کافانەی ساز وزەربە. یەکێک لەم نزیکانە پێ دەزانم. ناوی لارن بلانچە.

دوروا، بە سەرسامی پرسی: کێ بۆ ئەوێی بردوویت؟

له کاتێکا که هیشتا ژنەی گەنجی بە نیگا دادەبێژت، سەیری کرد سوور بووەوە، دیاربوو ئەم پرسیارە بیرەوەرییەکی هەستیاری لە زەینیا زندوو کردبووەوە، کەمێک پەشۆکا. دوای ئەم ناز ونوزە ژنانەیە، بلەز گوتی: ˚ دۆستێک... ˚ دوای بێدەنگییەکی کەم لە سەری ڕۆیی: ˚ مردووە. ˚ بەخەمبارییەکی تەواو ئاساییەوە سەری لەبەر خۆی نا.

دوروا، بۆ یەکەمین جار کەوتە بیرکردنەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە سەبارەت بەژیانی ئەم ژنە نەیدەزانین. لە دڵی خۆیدا گوتی گومانی تێدا نییە کە لە ڕابردوودا دڵداری دیکەی هەبوون. بەڵام دڵدارەکانی چ جۆرە پیاوانێک بوون؟ لە چ چینێک بوون؟ جۆرە غیرە و حەسوودی و هەستێکی دوژمنانەی دەرهەق بەم ژنە گەنجە لەلا هاڕوژا، دژمنایەتیەک سەبارەت بە هەموو ئەو شتانەی کە نەیدەزانین، سەبارەت بەهەموو ئەو شتانەی کە لە دڵ و لە ژیانی ئەم ژنەدا هیچ پەیوەندییەکی بەمەوە نەبووە. . هەر بەو دەقەوە تەمەشای کلوتیلدای دەکرد، دەرهەق بەو ڕاز ونهێنیانەی کە لەپشت ئەم ڕوخسارە جوان و مەندەوە پەنهان بوو، کە لەگین بوو نها بە کەسەرەوە، بیر لە کەسێک یان کەسانێکی دی بکاتەوە، تووڕە بوو، ئەو بیرانەی بە ئاسانی پێ قووت نەدەچوو. چەندی حەزدەکرد، دزە بکاتە ناو ڕوح و دەروونی ئەم ژنەوەو بکەوێتە گەڕان و پشکنین بە ناویا و پەی بە هەموو شتێک ببات و هەموو شتێک لە بنج و بناوان بکات و بزانێت.

کلوتیلد، دووبارەی کردەوە:- حەز دەکەی بۆ لارن بلانچم ببەی؟ ئاهەنگ و خۆشیەکەمان بەمە تەواو دەبێ.

جۆرج بەخۆی گوت: " سەلا لە ئەقلت ڕابردوو چ بایەخێکی هەیە؟ شێت بووم کە بیر لەو شتانە دەکەمەوە. کە کەرم." بە دەم بزەوە بەرسڤی دایەوە: بێگومان گیانەکەم.

کە گەیینە ناو کوچە و کۆڵانەکە، کلوتیلد، بە دەنگی نەوی و بەڕاوێژێکی گۆنگ کە لە کاتی دەردە دڵدا بەکاری دەبرد گوتی: - تا نها نەوێراوم ئەم جۆرە کارەت لێ داوا بکەم، خۆزگە دەتزانی چەندم حەز لەم پیاسەیەی کوڕانە لەو شوێنانەی کە ژنان بۆی ناچن. لەکاتی کەرنەڤالاندا، جلکی کوڕانی مەکتەبلی لەبەر دەکەم. ئەو جلانەم زۆر پێخۆشە، زۆرم لێدێن.

وەختایەک خۆیان بە کافەی ساز و زەربەکەدا کرد، کلوتیلد، حایر و حەپەساو، پەشێو و پەرێشان و لە هەمان کاتدا شاد و خوشحاڵ خۆی بە جۆرجەوە نووساند، بە نیگای چالاک و چەلەنگ دەیڕوانیە کیژەکان و دەلالەکان، جارجارێ وەکو ئەوەی بیەوێ لە هەنبەر خەتەر و تالوکەیەکی گریمانەییدا ورەی خۆی بەرز بکاتەوە و زات وەبەرخۆی بنێت، کە مامورێکی پۆلیسی بە ویقار و بێ جووڵەی دەبینی دەیگوت: " ئەم ماموورە چ سەر و سیمایەکی بەسام و بەهەیبەتی هەیە." پاش ئەوەی چارەکە سەعاتێک لەوێندەر مانەوەو ئارەزوو و حەزەکەی دامرکایەوە، جۆرج گەیاندییەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

دوای ئەوە زنجیرەیەک پیاسە لە هەموو ئەو شوێنە گوماناوییانەی کە ڕەمەکی مەردم سەیرانیان تیا دەکرد، دەستی پێکرد، دوروا، بۆی دەرکەوت ماشقەکەی، زۆری کەیف بەم جۆرە پیاسە خوێندکاریانە دێت.

به کراس و کڵاوی ئاساییەوە دەهات بۆ ژوانگەکەیان، بەجلکی خەڵکی ئاساییەوە دەهات، لێ وێڕای سادەیی و خاکەسارییەکەی، دەستبەرداری ئاڕایشی سەروسیمای، موستیلە وموووچەوانە وگوارە ئەڵماسەکانی نەدەبوو و، کە دوروا تکای لێدەکرد ئەو شتانە دەگەڵ خۆیدا نەیەنێت، دەیگوت: " ئەوە تۆ چ دەڵێی! هەموویان وا وێنا دەکەن، ئەم شتانە ئەسڵ نین. "

خۆی لەو قەناعەتەدا بوو، کە بە تەواوەتی سیما گۆڕکێی کردووە و، هەرچەندە ئەم سیما گۆڕکێیە وەکو ئەو کەوە وابوو کە سەری لەبن بەفران دەنێ وچونکە خۆی کەس نابینێت، وا دەزانێ کەسیش ئەو نابینێ، بەو ئاوایە سەری گوماناویترین مەیخانانی دەدا.

داوای کردبوو دورواش جلکی کرێکاری لەبەر بکات، لێ دوروا بەگوێی نەکردبوو ودەستبەرداری سەروسیمای بەتەرتیبی خۆی نەبووبوو، تەنانەت ئامادە نەبووبوو کڵاوە قووچەکەشی، بە کڵاوێکی ئاسایی بگۆڕێت.

کلوتیلد، بەم جۆرە لە هەنبەر مکووڕی دڵدارەکەیا، دڵخۆشی خۆی دابووەوە: " خەڵکی وا دەزانن کارەکەرێکی بەختەوەر و بەشانسم و توانیومە ئەربابە دەوڵەمەندەکەم شەیدا و شیفتەی خۆم بکەم. " زۆری کەیف بە گێڕانی ئەم دەور و ڕۆڵە دەهات.

ئیش و کاریان بووبوو بەوەی بۆ مەیخانە بەدناو وسووکەکان بچن و لە دەخمە و ژێرخانە دووکەڵاویەکاندا، لە سەر کورسییانی شەق وشڕ لە پشت مێزی تەختەی کۆن دانیشن. دووکەڵی توندی هەور ئاسا کە لە ماسی سوورەوە کراوەوە بۆ شام بەرز دەبووەوە، هۆڵەکەی

دەتەنی: پیاوانێک بە جلکی کرێکارییەوە و بەدەم نۆشینی پەرداخی بچووکی عەرەقەوە، بەدەنگی بەرز قسەیان دەگەڵ یەکدیدا دەکرد، گارسۆنەکە کە ئەم جووتە سەیر و سەمەرەیەی دەبینی، دەهات بەدەمیانەوە، دوو پێک عەرەقی بۆ دادەنان و بەسەرسامی، سەراپای بە نیگا دادەبێژتن.

ژنەی گەنج، بە ترس و لەرزەوە و لە هەمان حاڵدا شاد و خۆشحاڵ قوم قوم مەشروبەکەی دەخواردەوە و بە نیگای نیگەران و هەراسانەوە دەیڕوانییە دەوروبەری. لە گەڵ خواردنەوەی هەر قومێکدا، ئەم هەستەی لە نک چێدەبوو کە خەریکە خەتایەک دەکات و هەر دڵۆپێک لەم ڤەخارنە توند و سووتێنەرە کە لە گەرووی دەچووە خوارەوە، لەزەتێکی توندی لە جەم دەهاڕوژاند، لەزەت و شادی ئەنجامدانی کارێکی نادروست و قەدەغە بوو.

ئەوسا بە دەنگێکی نەوی دەیگوت: " با لێرە بڕۆین. " هەڵدەستان. ژنەی گەنج، چاوی دەبڕییە ئەرزەکە، بە هەنگاوی کورت و خێرای ئەکتەرێکی سەر شانۆوە، بە نێو مەی نۆشانێکا تێدەپەڕی کە ئانیشکیان دادابووە سەر مێزەکانیان و بەنیگای گوماناوی و بە سەر وسیمای ناڕازییەوە تەمەشایان دەکرد. وەختایەک لە دەرگای مەیخانەکە وەدەردەکەوت، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا، دەتگوت لە خەتەر و مەترسییەکی گەورە دەرباز بووە.

هەندێجار، پەشۆکاو و هەراسان لە دوروای دەپرسی:- ئەگەر لەم شوێنانە، بێڕێزی و سووکایەتی بە من بکەن، تۆ چ دەکەی؟

دوروا، بە قەڵافەتێکی ئازایانەوە دەیگوت:- مەعلوومە ئیدی، داکۆکیت لێدەکەم.

کلوتیلد، بە لەزەتێکی گونگەوە، ڕەنگە زادەی دیمەنی ئەو بێڕێزییە خەیاڵییە و داکۆکییە خەیاڵیە بووبێ کە بیری لێ دەکردەوە. ڕەنگە زادەی ئەو شەڕ و فەرتەنە خەیاڵی و گریمانەییە بووبێ، کە لە نێوان خەڵکی و دڵدارەکەیدا ڕووی دەدا، بە شادی و خۆشحاڵییەوە باسکی دڵدارەکەی دەگوشی.

بەڵام ئەم گەشت و گوزارەی کە هەفتەی دوو یان سێ جار دووبارە دەبووەوە، بەرە بەرە خەریک بوو دوروای بێتاقەت و ماندوو دەکرد. بە تایبەتی کە ماوەیەک لەوەپێش بە زەحمەت دەیتوانی نیو لوی پێویست بۆ چوون بۆ ئەم جۆرە شوێنانە و بۆ کرێی گالیسکە فەراهەم بکات.

ژیانی ڕۆژانەی بە زەحمەت دەگوزەراند، تەنانەت زەحمەت تر لەو کاتەی کە کارمەندی ڕێگای ئاسنی باکوور بوو. چونکە لە مانگەکانی هەوەڵی کارە تازەکەیدا، بەو ئومێدەی کە بەو زووانە پارە وپولێکی فرەی دێتە دەست، هێندەی دەست بڵاوی و زێدە مەسرەف کردبوو، کە ئیدی دەرفەتی قەرزکردن و فەراهەم کردنی پارە وپولی بۆ خۆی نەهێشتبووەوە.

ئاسانترین ڕێگە، واتە قەرز وەرگرتن لە سەندوقی ڕۆژنامەکە بوو، دەرفەتی ئەوەشی بۆ خۆی نەهێشتبووەوە، نەک هەر مووچەی چوار مانگی خۆی، بەڵکو پاداشتی وتارەکەیشی بە سەوزی و لە پێشەوە خواردبوو. ئەمە جگە لەوەی سەد فرانکی فورستیەش قەرزدار بوو، سێسەد فرانک بە جاک ریڤال کە پیاوێکی دەست ودڵ کراوە و تێر بوو قەرزدار بوو، جگە لە کۆمەڵێک قەرزداری بچووکی بیست فرانکی یان سەد سووی ئەم و ئەو.

جارێک بە مەبەستی وەرگرتنی سەد فرانک ڕاوێژی دەگەڵ سن پوتیندا کرد، کە لە مەسەلەی پارە پەیدا کردنا، زۆر شارەزا بوو، بەڵام سەری نەگرت و نەگەییە هیچ کوێ. حاڵی حازر زیاتر لە جاران بە دەست بێ پارەییەوە دەیناڵاند، چونکە لە جاران پتر پێویستی بە پارە بوو. لە ڕادە بەدەر لە زەمین وزەمان پەست و تووڕە بوو، کە لەگێن بوو لە هەر ئان وساتێکدا، لە هەر شوێنێکا و بە بچووکترین هەنجەت بتەقێتەوە.

هەندێجار لە خۆی دەپرسی چۆن لە مانگێکدا نزیکەی هەزار فرانکی خەرج کردووە، لە کاتێکا هیچ زیادە مەسرەفێکی نەکردووە، یان فیعل و ئەفعالی بێهودەی نەبووە، بەڵام کە بە وردی حیسابی دەکرد، سەیری دەکرد بە خواردنی فراڤینێک بە هەشت فرانک و شامێک لە کافەیەکی بولڤاردا بە دوازدە فرانک و دە دوازدە فرانک خەرجی پەراگەندە، زۆر بە ئاسانی مەسرەفی مانگانەکەی دەگەییە هەزار فرانک. ئەمە جگە لەوی کە حیسابی جل وبەرگ و پێڵاو، هەقی جلشۆردنی هەر نەدەکرد.

لە بەر ئەمە ڕۆژی ١٢/١٤ نە تاقە سوویەکی لە بەرکیدا بوو و نە هیچ ڕێگەیەکی بۆ پەیداکردنی پارە شک دەبرد.

لە ئەنجامدا، بە هەمان شێوازی جاران، نانی نیوەڕۆی نەخوارد دوای نیوەڕۆشی بەنیگەرانی و تووڕەیی لە ئۆفیسی ڕۆژنامەکە بە نووسین ڤڕێ کرد.

نزیکەی سەعات چوار کاغەزێکی بچووکی شینباوی لە ماشقەکەیەوە پێگەیی کە پێشنیازی بۆ دەکرد: " شام پێکڤە بخۆین و پاشانیش بۆ پیاسە وگەڕان بڕۆین. "

یەکسەر وەڵامی دایەوە: " شام مەحاڵە." دوایی بیری کردەوە ئەوپەڕی گەوجاتییە، ئەگەر چاوپۆشی لەو ساتە خۆشانە بکات کە دەتوانێ دەگەڵ ئەودا بەسەری ببات. ئەوجا نووسی: " بەڵام سەعات نۆ لە هێلانەکەی خۆماندا چاوەڕوانت دەکەم."

بۆ ئەوەی پارەی ناردنی بروسکەکەی لە کۆڵ بێتەوە، بروسکەکەی دا بەیەکێک لە شاگرد و بەردەستەکانی ڕۆژنامەکە کە بیگەیەنێتە دەست کلوتیلد، ئەوسا لەفکران ڕاچوو کە بۆ شێوی شەو چ بکات.

سەعات حەوت، هێشتا هیچ چارەیەکی نەدۆزیبووەوە وبرسیەتیش ئازاری دەدا. هەنگێ بڕیارێکی نائومێدانەی دا، چاوەڕوانی کرد تا هەموو هاوکارەکانی لە مەکۆی ڕۆژنامەکە وەدەربکەون وبڕۆنەوە. وەختایەک هەرخۆی بە تەنیا مایەوە، لەزەنگی سەرمێزەکەی دا، پێشخزمەتی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە کە کێشکی دایەرەی ڕۆژنامەکەی دەگرت، بلەز بە سۆراخیەوە هات.

دوروا، بە پێوە وەستابوو و بە شپرزەیی وتووڕەیی گیرفانەکانی خۆی دەگەڕا، بە ڕاوێژێکی پڕ نیگەرانییەوە بەکابرای پێشخزمەتی گوت:- ئەرێ فورکار، جزدانەکەم لەماڵەوە دەبیر کردووەو بۆ شام دەبێ بڕۆم بۆ لوگزانبورگ، پێتە پەنجا سوم بۆ کرێ گالیسکە بە قەرز بدەیتێ؟

یارۆی پێشخزمەت و پەردەدار، سێ فرانکی لە گیرفانی ئێلەکەکەی دەرهێنا و پرسی:- جەنابی دوروا، لەوەی پترت نەگەرەکە؟

- نا، نا. ئەوەندەم بەسە. مەمنوونم.

پارەکەی لەو وەرگرت وبە هەڵەداوان بە قاڵدرمەکاندا داگەڕا، ئەوسا چوو بۆ مەیخانەیەکی چکۆلە کە لە ڕۆژانی دەست تەنگیدا، ڕووی دەکردە ئەوێندەر و، شامێکی هەرزان بایی خوارد.

سەعات نۆ لە پاڵ سۆپا داگیرساوەکەدا چاوەڕوانی ماشقەکەی بوو.

کلوتیلد، شاد وخۆشحاڵ، دەم وچاوی لە بەر سەرماکەی دەرەوە ئاڵ وئاودار بووبوو، بەجۆش و خرۆشەوە گوتی:- ئەگەر حەزت لێبێ، جارێ دەڕۆین پیاسەیەک دەکەین، هەواکەی زۆر خۆشە، هەوای پیاسە و گەڕانە، دوایی سەعات یازدە بۆ ئێرە دەگەڕێینەوە.

دوروا، بە ڕاوێژێکی ناڕازی گوتی:- چ پێویست دەکات بڕۆینە دەرێ؟ شوێنەکەمان باشە، عەیبی نییە.

ژنەی گەنج بێئەوەی کڵاوەکەی دابکەنێت، لە سەری ڕۆیی:

- دەوەرە هەیڤە شەوێکە، شتی وا نابێتەوە. بەڕاستی پیاسە و ڕاوێچکە لە شەوی وادا خۆشە، بە پارەش دەستناکەوێت.

- ڕەنگە وابێ، بەڵام من ئەمشەو ئارەزووی گەڕانم نییە.

بە قەڵافەتێکی تووڕەوە ئەم قسەیەی کردبوو. ژنەی گەنج لەم قسەیە ڕەنجابوو، پرسی:

- ئەوە تۆ چیتە؟ ئەمە چ ڕەفتارێکە؟ بە کورتیەکەی من حەز دەکەم پیاسەیەک بکەم و بایەکی باڵ بدەم. من نازانم ئەم کارە چ عەیبێکی تیایە کە بەمجۆرە تووڕە دەبیت؟

دوروا، بە بێتاقەتی هەستایە سەرپێیان وگوتی:- توورەم ناکات، تەنیا کەمێک بێتاقەتم دەکات.

کلوتیلد، لەو ژنانە بوو، کە قەبووڵی نەدەکرد، هیچ داوایەکی ڕەت بکرێتەوە، توورە دەبوو، لە هەنبەر بێ ئەدەبیدا، پەست دەبوو. بە ڕاوێژێکی تەوسامێز و توورەییەکی پەنهانەوە گوتی:

- من لە کەسی قەبووڵ ناکەم بەمجۆرە قسەم لەگەڵ بکات. خۆم بەتەنیا دەڕۆم، خواحافیز.

دوروا یەکسەر هەستیکرد کە ڕەوشەکە باش نییە. بەغار بۆلای ئەو چوو، دەستەکانی گرت و ماچی کرد و بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- بمبورە گیانەکەم، بمبورە. ئەمشەو زۆر توورە و تۆرینۆک بووم. هۆیەکەشی هەندێک ئاریشەیە کە بۆم هاتووەتە پێش، هەندێ کێشەی بواری کارەکەمە.

کلوتیلد، بەڕاوێژێکی نەرمتر، لێ هێشتا هێور نەبووبووەوە بەرسڤی دایەوە:

- ئەم بابەتە پەیوەندی بەمنەوە نییە و ئامادە نیم تەحەمولی بێتاقەتی و توورەیی تۆ بکەم.

دوروا، لە ئامێزی گرت و بەرەولای قەنەفەکەی برد.

- گوێ بگرە گیانەکەم، بەڕاستی نەمدەویست ئازارت بدەم، بەخۆیشم نازانم بۆچی بەوشێوەیە قسەم کرد.

کلوتیلدی وادار کرد لە سەر قەنەفەکە دانیشێت و خۆیشی لەبەردەمیا و لەسەر ئەرزەکە چۆک دابدات:

- دەم بوری؟ ها! پێم بڵێ دەم بوری ها!؟

ژنەی گەنج، بە ڕاوێژێکی سارد گوتی: " باشە، لێ ئەمە دووبارە نەبێتەوە " .

ئەوسا هەستا و درێژەی بە قسەکەی دا: " نها بلا بچین پیاسەیەک بکەین. "

لێ دوروا، بە هەمان دەقەوە مایەوە، بە دەم نەوازشتی ئەژنۆکانی کلوتیلدەوە لەبن لێوانەوە گوتی:

– تکا دەکەم، با لێرە بین، نەچینە دەرەوە. تکادەکەم بە قسەم بکە. ئەمشەو زۆر حەزدەکەم، تەنیا بۆخۆم بی، لێرە لەبەر ئەم ئاگرە خۆشە. تکا دەکەم قابیل بە، بەقسەم بکە.

کلوتیلد، بە ڕاوێژێکی ڕوون و ڕەوان و زبر گوتی:

– نا، من ڕژدم لە سەر ئەوەی ئەمشەو بچمە دەرەوە، ڕادەستی هەوا و هەوەسەکانی تۆش نابم.

دوروا، دووبارە بە مکوڕییەوە گوتی:– تکا دەکەم ئاخر لە خۆڕا ئەم داوایە ناکەم، هەنجەتم هەیە، هەنجەتی زۆر جدی...

کلوتیلد، دووبارە گوتی: – نا، ئەگەر تۆ ناتەوێ بێی، مەیە. خۆم بەتەنێ دەڕۆم، خوداحافیز.

بە تەکانێک لاقەکانی لە دەست دوروا دەرهێنا و بەرەو دەرگاکە ڕۆیی. دوروا بەغار دووی کەوت و دووبارە باوەشی پێدا کرد: – گوێ بگرە کلو، کلو گیان، گوێ بگرە، ئەم چاکەیەم دەگەڵ بکە...

لێ کلو، بێئەوەی تاقە قسەیەک بکات، بە جووڵەی سەر داواکەی ئەوی ڕەتکردەوە. ڕێگەی نەدا ماچی بکات و خۆی لە باوەشی ڕاپسکاند تا لەوێندەر وەدەربکەوێت.

دوروا، بەدەمەلالکێوە گوتی:– کلو، کلوگیان، ئاخر هەنجەتم هەیە.

کلوتید، هەڵوەستەیەکی کرد، ئەوسا چاوی لە دوڕ چاوی بڕی و گوتی:– درۆ دەکەی... چ هەنجەتێکت هەیە؟

دوروا، سوور بووەوە و نەیزانی چ بڵێت. ژنەی گەنج دووبارە بە تووڕەیی گوتی:

- بزانە درۆکەت چۆن دەرکەوت... حەیوانی هیچ...

بە تەکانێکی تووڕە و بە چاوانی تەژی ڕووندکەوە، خۆی لە باوەشی ئەو دەرکێشا.

دوروا، شانەکانی ئەوی گرت و بە نیگەرانی و، ئامادە بۆ ئەوەی دان بە هەموو شتێکدا بنێت، بە ڕاوێژێکی نائومێدانەوە گوتی:- هەنجەتەکەم ئەمەیە کە تاقە یەک سووم لە بەرکدا نییە...

ژنەی گەنج، ڕەق ڕاوەستا، چاوی لە دوڕ چاوانی ئەو بڕی تا حەقیقەتیان تیا بخوێنێتەوە.

- چیت گوت؟

دوروا، سووری سوور بووەوە: گوتم تاقە یەک سووم پێ نییە. تێدەگەی؟ نە بیست سوو، نە دە سوو، نە تاقە پولێک تا ئەگەر چووینە کافەیەک بتوانم پەرداخێک شەربەت بۆ تۆ بکڕم. تۆ ناچارم دەکەیت دان بەم شتە نەنگینانەدا بنەم. بە ڕاستی نەدەکرا لە گەڵ تۆدا بێمە دەرەوە و لە سەر مێزێک دانیشتباین و شتێکمان خواردبا و هەنگێ بە تۆم گوتبا پارەم پێ نییە....

کلوتید، کە بە هەمان دەقەوە تەمەشای ئەوی دەکرد، دووبارە گوتی:- یانی ئەو شتانەی دەیڵێی ڕاستن... ها؟

دوروا، خێرا هەموو گیرفانەکانی هێنانە دەرێ، گیرفانەکانی پانتۆڵەکەی، ئێلەکەکەی و چاکەتەکەی و ئەوسا لەبن لێوانەوە گوتی:- دەی نها، قەناعەتت کرد؟

کلوتیلد، لە ناکاوا، بەجۆش و خرۆشێکی لە وەسف نەهاتگەوە دەستەکانی بڵاوکردنەوە لە ملی ئەوی وەرێنان،

به پچرپچری گوتی:- ئاه ئازیزه بێ نەواکەم... گیانەکەم... خۆزگە زووتر ئەمەم زانیبا! باشە چۆن حاڵت بەم حاڵە گەیی.

دوروای لە سەر قەنەفەکە دانیشاند، خۆیشی لە باوەشیا دانیشت و بەدەم ڕامووسانی سەر ورووبەوە، ناچاری کرد باسی ئەوەی بۆ بکات کە چۆن حاڵی بەم حاڵە گەییوە.

ئیدی چیرۆکێکی خەمناکی سەبارەت بەخۆی دروستکرد. گوتی چونکە بابی دووچاری کەسری دارایی بووبوو، ناچاربوو یارمەتی بدات. نەک هەر پاشەکەوتێکی هەبووبوو، پێی داوە، بەڵکو قەرزێکی زۆریشی بۆ کردووە. ئەوسا لە سەری ڕۆیی:- بەلای کەمەوە دەبێ تا شەش هەیڤان برسیەتی بکێشم. چونکە هەرچیم هەبوو و نەبوو خەرجم کردووە. ئیدی چ دەکرێ، ئەوە حاڵەکەیە، ئیدی ژیان ئەم جۆرە قەیرانانەشی تێدەکەوێ. بە هەرحاڵ پارە وپول ئەوەش نایەنێ کە پیاو بیری خۆی پێوە مژوول بکات.

کلوتیلد، دەمی لە پەنا گوێی نا وگوتی:- من قەرزت دەدەمێ، قەبووڵ دەکەی؟

دوروا، بەوپەڕی لە خۆڕادیتنەوە گوتی: - میهرەبانی خۆتە گیانە، لێ تکایە با چیتر باسی ئەمە نەکەین دەنا نارەحەت دەبم.

کلوتیلد، بێدەنگ بوو، ئەوسا ئەوی بەخۆوە گوشی و لەبن لێوانەوە گوتی:

- هەرگیز پەی بەوە نابەیت، چەندم خۆشدەوێی.

ئەو شەوە، یەکێک بوو لە شەوە عاشقانە هەرە باش و خۆشەکانیان.

ژنەی گەنج، لە کاتی ڕۆیشتنیدا، دەم بەخەندە گوتی:

- دەزانی وەختایەک کەسێک بکەوێتە هەلۆیستێکی وەکو ئەمەی تۆوە، چەند خۆشحاڵ دەبێت، ئەگەر پارەیەک لە گۆشە کەناری گیرفانێکی خۆیدا بدۆزێتەوە، بۆ نموونە سکەیەک خزابێتە بەینی ئەستەر و بەری جلەکانیەوە.

دوروا، بە دڵنیایی تەواوەوە گوتی:- خوا لە زارت بڕونێ.

کلوتیلد، بە بیانووی ئەمەی کە شەوێکی هەیڤە شەوی خۆشە گوتی گەرەکییەتی بە پێیان بۆ ماڵ بگەڕێتەوە، بە دەم تەمەشاکردنی ئەوەوە تەواو هاڕوژابوو.

شەوێکی هێمن و تەزی بوو، زستان خەریک بوو دەستی پێدەکرد. ڕێبواران و ئەسپان بلەز دەجووڵان، ئێدی سەرما تاوی پێدەدان، دەنگی پاژنەی پێڵاوان، لە سەر شۆستەکە دەنگی دەدایەوە.

وەختێ دەیانویست لێکدی هەڵبڕێن، کلوتیلد پرسی:- دەتەوێ دوو سبەی جارێکی دی یەکدی ببینینەوە؟

- زۆریش.
- شەوێ، ئەم وەختانە؟
- ئەم وەختانە.
- خوداحافیز گیانەکەم.

بە خۆشی و میرەبانی یەکدیان ڕاماووسی.

دوروا، بە هەنگاوی هەڕاوەوە بۆ ماڵ زڤڕییەوە، لە خۆی دەپرسی کە سبەی دەگەڵ کێ و بە چ کارێک بەرێتە سەر. کە دەرگای ژوورەکەی کردەوە، دەستی بە گیرفانی ئێلەکەکەیدا کرد تا شقارتە دەربێنێ، کە قامکی بەر دراوێک کەوت، لە سەرسامیا، ڕاچڵەکی. چراکەی پێکرد، دراوەکەی

دایەبەر تیشکی چرایەکە. دراوێکی بیست فرانکی بوو. هەستیکرد خەریکە عەقڵی تێکدەچێت.

بە دەم ئەم دیو وئەودیو کردنی دراوەکەوە لە خۆی دەپرسی، ئاخۆ چ پەرجوویەک ئەمەی لێکەوتووەتەوە، قابیلە خۆی لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوە.

ئەوسا لە ناکاواو بە مەزەندە زانی چی ڕوویداوە. زۆر پەست و تووڕە بوو. ماشقەکەی باسی ئەوەی کردبوو کە چەند خۆشە پیاو لە کاتی دەستکورتی دا، دراوێک لە ژێر ئەستەڕی جلێکیا وەدۆزێ. کەواتە ئەم سەدەقەیە هی ئەوە، ئەو ئەم خێر و سەدەقەیەی پێکردووە. چەند عەیبە.

بەخۆی گوت: " ئاە بەڵێ دوو سبەی دەیبینم! پیشانی دەدەم چ کارێکی کرێت و دزێوی کردووە! "

بە دڵێکی پڕ لە قین و بە هەستێکی بریندارەوە، چووە ناو جێگاوە.

سبەی، درەنگ لە خەو ڕابوو. برسی بوو، هەوڵیدا دووبارە بخەوێتەوە و تا سەعات دووی دوانیوەڕۆ لە خەو ڕانەبێت. ئەوسا بە خۆی گوت: " نا، ئەم ڕەوشە بەم حاڵەوە ناچێتە سەر، دەبێ ڕێگەیەک وەدۆزم و پارەیەک پەیدا بکەم. " ئەوسا بەو ئومێدەی بە دەم ڕێگاوە، چارەسەرێک وەدۆزێ، لە ماڵ وەدەرکەوت.

هیچ چارەیەکی بە بیرا نەهات، لێ کە بەبەر هەر خوارنگەیەکدا دەبووری دەمی لە برسا ئاوی دەکرد. کە بوو بە نیوەڕۆ، چونکە هێشتا هیچ چارێکی نەدۆزی بووەوە، لە ناکاوا بڕیاری دا: " چ قەیدییە! دەچم بەم بیست فرانکەی کلوتیلد فراڤین دەخۆم. ئەمە نابێتە بایسی ئەمەی کە سبەی پارەکەی نەدەمەوە. "

به دوو فرانک و نیو فراقینی له خوارنگه‌یه‌کدا خوارد. وه‌ختایه‌ک گه‌ییه باره‌گای ڕۆژنامه‌که، ئه‌و سێ فرانکه‌ی که له په‌رده‌داره‌که‌ی وه‌رگرتبوو، دایه‌وه: " فوکار وه‌ره، ئه‌مه ئه‌و پاره‌یه‌ی که دوێشه‌و بۆ کرێ گالیسکه به قه‌رز دابووتمێ. "

تا سه‌عات حه‌وتی شه‌و کاری کرد. پاشان خۆی به خوارنگه‌یه‌کدا کرد وبه‌و سێ فرانکه‌ی له پاره‌که‌ی کلوتیلد هه‌ڵی گرتبوو، شامی ( شێو، شێڤ، نانی ئێوارێ ) خوارد. دوو په‌رداخ بیره‌شی خوارده‌وه، مه‌سره‌فی ئه‌و ڕۆژه‌ی گه‌ییه نۆ فرانک و سی سانتیم.

به‌ڵام چونکه سبه‌ینێش، نه‌یتوانی هیچ پاره‌یه‌ک په‌یدا بکات، دووباره شه‌ش فرانک و نیوی له دراوه بیست فرانکییه‌که‌ی کلوتیلد هه‌ڵگرت، وه‌ختایه‌ک گه‌ییه ژوانگه‌که‌یان، جگه له چوار فرانک وبیست سانتیم هیچی دی له به‌ڕکا نه‌مابوو.

وه‌کو سه‌گ هار بووبوو، به‌ڵێنی به‌خۆی دا یه‌کسه‌ر ڕه‌وشی خۆی یه‌کلایی بکاته‌وه. به ماشقه‌که‌ی ده‌ڵێت: " ده‌زانی ئه‌و دراوه بیست فرانکییه‌ی که دوێشه‌و خستبووته گیرفانمه‌وه، دۆزیمه‌وه، ئه‌مڕۆ ناتوانم بتده‌مه‌وه چونکه هه‌ر وه‌کو خۆمم و پاره‌م پێ نییه، ده‌رفه‌تیشم نه‌بوو، پاره‌یه‌ک په‌یدا بکه‌م. لێ ئه‌مجاره که یه‌کدیمان دیته‌وه، پێتی ده‌ده‌مه‌وه. "

کلوتیلد، میهره‌بان وبه هه‌شتاو، به‌ترس و له‌رزه‌وه هات، به ترس و له‌رزه‌وه له خۆی ده‌پرسی ئاخۆ دڵداره‌که‌ی چۆن ڕه‌فتاری ده‌گه‌ڵ ده‌کات و چ کاردانه‌وه‌یه‌کی ده‌بێت؟ و

ماوەیەکی زۆر و بەپێداگرییەوە ماچی کرد، تا لە هەوەڵین ساتی دیدارەکەیاندا ڕێگەی گلەیی و گازنی لێبگرێت.

دوورواش بە خۆی دەگوت: "وەختی ئەوە هاتووە کە مەسەلەکە باس بکەم. هەر ئێستا ڕێگایەک دەدۆزمەوە."

نە ڕێگای دۆزییەوەو نە هیچ قسەیەکی کرد، لە هەنبەر ئەو پەیڤ و وشانەدا کە دەبوایە دەربارەی ئەم بابەتە هەستیارە بیکردبایە، پاشەکشەی کرد.

کلوتیلدش هیچ قسەیەکی سەبارەت بە چوونە دەرەوە نەکرد و، بەوپەڕی میهرەبانی بەرخورد و مامەڵەی لەتەکدا کرد.

نیوەشەو بوو کە لە یەکدی جیابوونەوە و قەراریان دا کە چوارشەممەی ئایندە یەکدی ببینن، چونکە کلوتیلد، بۆ چەندین شەو، لە شوێنانی جۆراوجۆر دەعوەتی شام بوو.

سبەی نیوەڕۆ، وەختایەک دوروا دەیویست پارەی فراڤینەکەی بدات، دەستی بە گیرفانیا کرد تا ئەو چوار فرانکە دەربێنێ کە لە بەرکیا مابوو، بەڵام سەیری کرد بووە بە پێنج و یەکێکیان زێڕە.

لە سەرەتاوە، وای بۆچوو، دوێنێ کە باقی پارەکەیان داوەتەوە، بە سەهو ئەم دراوەیان داوەتێ، بەڵام دوایی تێگەیی مەسەلەکە چییە، سەبارەت بەم خێر و سەدەقەیە، هەستی بە بچووکی کرد، سەرودڵی بە تەواوەتی گیرا.

داخی دەخوارد کە بۆ شتێکی نەگوتووە! ئەگەر بە توندی قسەیەکی کردبا، ئەم مەسەلەیە تازە نەدەبووەوە.

بە درێژایی چوار ڕۆژی دواتر، لە هەموو دەرگایەکی دا، هەرکارێکی لە دەست هاتبوو، کردبووی تا پێنج لوی بە

دەست بێنێ، بەڵام بێهودە. ناچار دراوە زێڕەکەی کلوتیلدشی خەرج کرد.

وێڕای ئەمەش، کاتێ دووبارە یەکیان بینییەوەو سەرباری ناڕەزایی و تووڕەبوونی ئەو: " تکایە دەستبەرداری شۆخییەکانی شەوانی پێشوو بە، دووبارەی مەکەوە، چونکە ئەم کارە زۆرم ناڕەحەت دەکات. "

کلوتیلد، فێڵێکی دۆزییەوە کە بە دزییەوە دراوێکی بیست فرانکی، بخاتە گیرفانی پانتۆڵەکەیەوە.

وەختێ دراوەکەی لە گیرفانیا دۆزییەوە، جنێوێکی دا، بەڵام خستیە گیرفانی ئێلەکەکەیەوە تا لەبەر دەستیا بێت، چونکە تاقە یەک پولیشی پێ نەبوو.

ئیدی بەمجۆرە دڵخۆشی خۆی دەدایەوە: " دەی هەمووی لە یەک جێ دەدەمەوە. ئەم پارەیەم بەقەرز لێوەرگرتووە. "

سەرەنجام کاشێر و ژمێریاری ڕۆژنامەکە، ملی بۆ پاڕانەوە و داواکانی ئەو دا و قەبووڵی کرد ڕۆژی سەد سووی بداتێ، بەڵام ئەم پارەیە بە زەحمەت بەشی خواردنی ڕۆژانەی دەکرد و بەشی دانەوەی قەرزەکانی کلوتیلدی نەدەکرد.

بەڵێ، وەختایەک کلوتیلد دووبارە خولیا و کەڵکەڵەی ئەوەی کەوتەوە سەر کە شەوان سەری هەموو جێگا گوماناوی و نەشیاوەکانی پاریس بدات، ئیدی دوروا دوای گەڕانەوە لە گەشت و گەڕانە سەرکێشانەکانیان، وەکو جاران لە دۆزینەوەی دراوێکی زێڕ لە گیرفانەکانیا، ڕۆژێ لە پێڵاوەکانیا، ڕۆژێکی دی لە کیفی سەعاتەکەیا، زۆر تووڕە نەدەبوو. یانی کلوتیلد، کە هەندێک هەوا و هەوەس و

خولیای هەبوو کە ئەو(دوروا ) جارێ نەیدەتوانی بیانهێنێتە دی، باشتر نەبوو خۆی ( کلوتیلد ) پارەکەی بدات و لێیان مەحروم نەبێ؟

حیسابی هەموو ئەو پارانەی کە لەوی وەردەگرت، لەلای خۆی ڕادەگرت، بەو ئومێدەی ڕۆژێ لە ڕۆژان هەمووی بداتەوە.

شەوێک کلوتیلد، پێی گوت: " تۆ دەزانی تا ئێستا نەچووم بۆ فولی برجر؟ دەکرێ بۆ ئەوێندەرم ببەیت؟ "

دوروا، لە ترسی ئەمەی کە نەبا تووشی راشیل ببێت، هەندێک سڵەمییەوە، بەڵام پاشان بەخۆی گوت: " چ قەیدییە! شتەکە لە شاردنەوەدا نەماوە، خۆ من زەماوەندم لە گەڵیا نەکردووە. هاوسەری نیم. ئەگەر لە گەڵ ئەما بمبینێ، خۆی لە هەموو شتێک حاڵی دەبێت و نایەت قسەم لەگەڵدا بکات. خۆ دەتوانین بچین لۆجێک بگرین و لەوێ دانیشین. "

بیانوویەکی دیکەشی بەدەستەوە بوو کە بۆ ئەم بڕیارەی هاندەدا. زۆر بە ئاسانی دەیتوانی لەم تەمەشاخانەیدا لۆجێک بۆ ماشقەکەی بگرێ بێئەوەی پارە بدات. ئەمە خۆی لە خۆیا، جۆرە چاکە دانەوەیەک بوو، لە هەنبەر ئەو کۆمەکە مادیەدا کە لەوی وەردەگرت.

بە کلوتیلدی گوت لە ناو گالیسکەکەدا دانیشێت تا ئەو بڕوات لۆجێک بگرێت، نەیدەویست کلوتیلد ئەو ببینێ کە بلیتەکەی بە خۆڕایی، بە بێ پارە دەدەنێ، ئەوسا بە دوویا هات و بە دوو قۆڵی خۆیان بە تەمەشاخانەکەدا کرد و کۆنترۆڵچیانی بلیتش سڵاویان لێکرد.

حەشیمەتێکی فرە لە ڕاڕەوە بازنەییەکەدا دەخولانەوە. بە زەحمەتێکی زۆر توانیان بە ناو ئاپۆڕای ئەو پیاو وژنانەدا

که له مشتەری دەگەڕان، ڕەت ببن. ئەنجام گەیینە لۆجەکەیان که کەوتبووە نێوان ئورکستەرەکه و ڕاڕەوە بازنەییەکەوە.

لێ خانم دوماریل، تەمەشای شانۆکەی نەدەکرد، تەنیا سەیری ئەو ژن و کیژانەی دەکرد که له دوای ئەوەوە له ڕاڕەوەکەدا دەسووڕانەوە، هەر ساناساتێ ئاوڕێکی پاشی دەدایەوەو تەمەشای ئەوانی دەکرد، زۆری حەزدەکرد دەستیان لێبدات، یەخە و بەرۆکیان سەح بکاتەوە، دەست بە قژ و گوێیاندا بێنێ تا بزانێ ئەم بوونەوەرانە له چ مەعدەنێکن.

له ناکاوا گوتی: ژنێکی قەڵەوی قژ ڕەش له نێو حەشیمەتەکەیە که بەردەوام سەیری ئێمە دەکات. له دڵی خۆدا وام هەست دەکرد ڕەنگە هەر ئێستا بێت بۆلامان و سڵاومان لێبکات. بینیت؟

دوروا بەرسڤی دایەوە: " نا، بێگومان بە سەهو چووی. " بەڵام خۆی له یەکەم ساتەوە، هەستی بەو نیگایانە کردبوو. ڕاشیل بوو که به نیگای تووڕە و ، به نیازی قسەی تووندەوە، به دەوروبەری ئەوانا دەسووڕایەوە.

هەمووی چەند خولەکێک لەوەپێش، دوروا له ناو ئاپۆڕاکەدا بەلای ئەوا ڕەت بووبوو و " ڕاشیل " ش به چپەوەو به چاولێداگرتنێکەوە که مانای ئەمە بوو: " تێدەگەم " سڵاوی لێکردبوو. لێ دوروا، له ترسی ئەوەی نەبا ماشقەکەی هەستی پێبکات، بەرسڤی سڵاوە مێهر ئامێزەکەی ئەوی نەدابۆوەو به لووتبەرزی و سارد وسڕی بەلایدا ڕەت بووبوو. ڕاشیل که دووچاری حەسوودی و غیرەیەکی

نائاگایانە بووبوو، گەڕابۆوە و خۆی پێدا کێشابوو و بە دەنگێکی بەرزتر گوتبووی: " سڵاو جۆرج. "

دوروا، دیسان وەڵامی نەدابووەوە. ئیدی ڕاشیل بۆ ئەوەی وەڵامی سڵاوەکەی وەربگرێتەوەو ئەو ناچار بە ناسینی خۆی بکات، بەردەوام بە دەوروبەری لۆجەکەی ئەواندا دەسووڕایەوە و چاوەڕوانی ساتی گونجاو بوو.

هەرکە بینی خانم دوماریل، تەمەشای ئەو دەکات، بە نووکی قامکان بە شانی دوروایدا کێشا:- سڵاو، حاڵت باشە؟

بەڵام دوروا، ئاوڕی لێنەدایەوە.

ڕاشیل، دووبارە گوتی:- ئەوە چییە لە پێنج شەممەی ڕابردووەوە گۆڕت گوم کردووە و ڕووت لەم ناوە نەکردووە؟

دوروا، هیچ وەڵامێکی نەدایەوەو بەجۆرێ خۆی لە گێلی دا کە ئامادە نەبوو، تەنانەت بە تاقە وشەیەکیش دەگەڵ ئەم ژنەدا، خۆی بخاتە مەترسییەوە.

ڕاشیل، لە قاقای پێکەنینی دا. پێکەنینێکی تووڕە وگوتی: " چییە، لاڵش بووی؟ ناشێ ئەم خانمە زمانی گەستبێت؟

دوروا، بە تووڕەیی و بەڕاوێژێکی دژمنانەوە گوتی:

- کێ ڕێگەی پێداوی قسە لەگەڵ مندا بکەی؟ بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە دەنا بەگرتت دەدەم.

هەنگێ ڕاشیل، بە نیگایەکی گڕگرتووەوە، بە سینگ دەرپەڕاندنەوە هاواری کرد:

- ئاوها! هەی گەوجی بێ سەروبەر. پیاو کە لە گەڵ ژنێکا خەوت بەلای کەمەوە سڵاوێکی لێدەکات. ئەگەر ئەمڕۆ لە گەڵ ژنێکی دیکەدای، مانای وانییە، ئیدی خۆتم لێنەناس و نەبان بکەی. ئەگەر لەو چەند خولەکەی پێش ئێستادا کە بە

لاتا ڕەت بووم، ئاماژەیەکت بۆ کردبام، دەستبەردارت دەبووم و لە کۆڵت دەبوومەوە. بەڵام کە خۆت لە گێلی دەدەی، دەبێ باجەکەی بدەی. ڕاوەستە بۆم چێشتێکت بۆ لێنەم بستێ ڕۆنی لە سەر بێ! کە من ببینی ئیدی ڕووت نەیەت سڵاوم لێبکەی...

هێشتا پێوەبوو، لە سەر هات و هاواری خۆی بەردەوام بێ، لێ خانم دوماریل بلەز دەرگای لۆجەکەی ڤەکرد و لە کاتێکا حایر وسەرگەردان چاوی بۆ دەرگای چوونە دەرەوەی تەمەشاخانەکە دەگێڕا، لە نێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا ون بوو.

دوروا، بە غار دووی کەوت و هەوڵیدا خۆی پێ بگەیەنێت.

هەنگێ ڕاشیل، کە ئەوانی بەو شپرزەییەوە و لە حاڵی هەڵاتنا بینی، بە دەنگێکی سەرکەوتووانە هاواریکرد:

- ئەهای ئەم ژنە بگرن. بیگرن، دڵدارەکەی لێدزیوم.

ئاپۆڕای ناو ڕاڕەوەکە لە قاقایان دا. دووان لە پیاوەکان بە شۆخی و حەنەکەوە شانەکانی کلوتیلدیان گرت و ویستیان بۆ ناو خەڵکەکەی بگێڕنەوەو ماچی بکەن. لێ دوروا، کە خۆی گەیاندنێ، بەتووڕەیی و بەتۆبزی خانم دوماریلی لە چنگیان دەرهێنا و گەیاندییە سەرجادەکە.

کلوتیلد، بلەز خۆی هەڵدایە ناو ئەو گالیسکەیەی کە لەبەر تەمەشاخانەکەدا وەستابوو و دورواش بە دوایا. کە گالیسکەچییەکە پرسی: " بۆ کوێ بڕۆم؟ " دوروا گوتی: " بەکەیفی خۆت، بۆ هەرکوێت دەوێ. "

گالیسکەکە بە خاوی کەوتە ڕێ و بە هۆی ناهەمواری سەلبەندی جادەکەوە هەر هەڵتەک هەڵتەکی بوو. کلوتیلد پەست و تووڕە، هەردوو دەستی بە دەم و چاوییەوە گرتبوو، هانکە هانک خەریک بوو دەخنکا، دوروا نەیدەزانی چ بکات یان چی بڵێت. ئەنجام کە گوێی لە دەنگی گریانی کلوتیلد بوو، بەدەم دەمەلاڵکێوە گوتی: " کلو گیان، گوێ بگرە، ڕێم بدە با شتەکەت بۆ ڕوون بکەمەوە! خەتای من نییە... کاتی خۆی سووکە ئاشنایەتیەکم دەگەڵ ئەم ژنەدا پەیدا کردبوو... ئەوسای کە من و تۆ هێشتا یەکترمان نەدەناسی... "

کلوتیلد، لە ناکاوا، دەستەکانی لە سەر ڕوخساری لابرد، بە تووڕەیی و خرۆشی ژنێکی عاشق و خیانەت لێکراوەوە، بە هانکەهانک، بە پچڕپچڕ و بە پەلەپەل گوتی: " هەی بەدبەخت... نەگبەت... کە شتێکی سووک و چرووکی!... یانی شتی وادەبێ؟ بە ڕاستی عەیبە!... ئاه، ئەی پەروەردگار!... بەڕاستی مایەی شەرمەزارییە!... "

ئەوسا، کە تۆزێ خۆی کۆنترۆڵکرد و دەیتوانی بە شێوەیەکی لۆژیکی قسان بکات، بە تووڕەییەکی زیاترەوە گوتی: " یانی بە پارەی من لە گەڵ ئەودا دەخەوتی ها؟ سەلا لە ئەقڵی من کە لە پێناوی ئەم هەرزەیەدا پارەم بە تۆ دەدا... هەی خوێڕی!..."

کەمێک بێدەنگ بوو، وا دەهاتە بەرچاو کە لە وشەیەکی توندتر بگەڕێ، وشەکەی لە سەر زمان بێ و بۆی نەیەت، ئەوسا لە ناکاوا وەبیری هاتەوەو بە جووڵەیەک وەکو ئەوەی بیەوێ تفی لە چارە بکات، گوتی: " ئاه، هەی بەراز...

بەرازی چەپەڵ... بەرازی بەد فەڕ و نەگریس... بەپارەی من هەقەکەیت دەدا... بەراز... بەرازی سووک و چرووک... "

چونکە هیچ وشەیەکی دی بۆ نەدەهات، هەمیشە دووبارەی دەکردەوە: " هەی بەراز... بەرازی چەپەڵ... "

لە ناکاوا، بەرەو دەرێ خۆی دانەواندەوە، ئاسینی عەرەبانچییەکەی گرت و گوتی: " بوەستە! " ئەوسا دەرکی گالیسکەکەی کردەوە و خۆی هەڵدایە خوارەوە.

جۆرج ویستی دوای بکەوێ، بەلام خانم دوماریل، بە دەنگێکی ئەوەندە بەرز هاواری بە سەردا کرد: " بۆت نییە دابەزی! " کە چەند ڕێبوارێک لە دەوری خڕبوونەوەو دوروا، لە ترسی ئەوەی نەبا هەرا و هەنگامە و قەرقەشە بەرپا ببێت و ئابڕوویان بچێ، نەیوێرا لە جێی خۆی ببزوێ.

کلوتیلد، جزدانەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لەبەر ڕۆشنایی فانۆسی گالیسکەکەدا بۆ پارەی وردە گەڕا، ئەوسا دوو فرانک و پەنجا سانتیمی نایە قولی دەستی کابرای عەرەبانچی و بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: " هانێ، ئەوە کرێیەکەت... ئەم چەپەڵەش ببە بۆ گەڕەکی بورسو لە محالی باتینیول. "

ئەو خەڵکەی لەوێندەر خڕ بووبوونەوە، دەستیان بە گاڵتە وپێکەنین کرد. یەکێک لە پیاوەکان گوتی: " هەر بژی، بچکۆل! " گەنجێکی بەڕەڵلا کە لە نێوان تەگەری گالیسکەکەدا وەستابوو، لە پەنجەرەکەوە سەری بردە ژووری و گوتی: " شەو باش، کوڕی باش! "

ئەوسا گالیسکەکە کەوتەڕێ، دەنگی پێکەنینی ڕێبوارەکان، هێشتا هەر نەنیشتبووەوە.

( ٦ )

جۆرج دوروا، بۆ سبەی بەیانی، ڕۆژێکی خەمینی دەست پێکرد، بەبێتاقەتی خۆی گۆڕی، ئەوسا لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی ڕۆنیشت و لە فکران ڕۆچوو. هەستی کرد ئازای بەدەنی کوتراوە، وەکو ئەوەبوو دوێنشەو کوتەکێکی باشی خواردبێ.

سەرەنجام زەرورەتی پەیداکردنی پارە ناچاری کرد مشورێکی خۆی بخوات وچوو بە سۆراخی فورستیەوە.

فورستیە کە لە ئۆفیسەکەی خۆیا لەلای موغەیرییەکەوە دانیشتبوو، کە ئەوی بینی پرسی:

– ها خێرە بەم بەیانی زووە لە خەو هەستاویت؟

– شتێکی خراپم لێقەوماوە. قەرزێکی زۆرم لە سەر کەڵەکە بووە.

– هی قومار؟

– بەڵێ، هی قومار.

– زۆرە؟

– پێنج سەد فرانک.

تەنیا دووسەد و هەشتا فرانک بە کلوتیلد قەرزدار بوو.

فورستیە بە ناباوەڕییەوە پرسی:- ئەم پارەیە بەکێ قەرزداری؟

دوروا، نەیتوانی بەپەلە وەڵام بداتەوە.

– بە... بە جەنابی کارڤیل.

– ماڵی لە کوێیە؟

– کوچەی.... کوچەی...

فورستیە دەستی بە پێکەنین کرد: کوچەی سەعات دووی پاش نیوەڕۆ بۆی بگەڕێ نا؟ من ئەم ئاغایە دەناسم.

ئەگەر کارەکەت بە بیست فرانک ڕاپی دەبێ، من دەتوانم بتدەمێ، لەوە زیاترم پێ هەڵناسووڕێ. "

دوروا، سکەیەکی زێڕی بیست فرانکی لە فورستیە وەرگرت، ئەوسا لە هەموو دەرگایەکی دا، ڕووی لە هەموو ناسیاوەکانی نا، ئەنجام نزیکی سەعات پێنجی دوا نیوەڕۆ، توانی هەشتا فرانک کۆبکاتەوە.

دەبوایە دووسەد فرانکی دی پەیدا بکات. بڕیاری تەواوی دا بەدەم هەڵگرتنی ئەو پارەیەوە کە کۆی کردبووەوە، لەبن لێوانەوە بەخۆی گوت: " نابێ لەبەر خاتری ئەم سەڵیتەیە خۆم سەغڵەت بکەم. هەرکاتێ بووم، پارەکەی دەدەمەوە. "

پازدە دانە ڕۆژ، ژیانێکی هەژارانە، ڕێک و پێک و دوور لە هەر فیعلێکی بەسەر برد، بڕیاری بنجبڕی دابوو. پاشان ئاگری عەشقبازی حەجمانی لەبەر بڕی، دەتگوت چەندین ساڵە، ژنێکی لە هەمێز نەگرتووە، وەکو چۆن دەریاوانێک بە دیتنی وشکانی کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەدات، بەو ئاوایە بەدیتنی هەر ژنێک ئازای ئەندامی دەکەوتە لەرزین.

شەوێک، بە ئومێدی دیتنی ڕاشیل، چوو بۆ فولی برجر، هەرکە وەژوورکەوت چاوی بەو کەوت، چونکە ڕاشیل، پاتوقی ئەوێندەربوو. بۆ هیچ شوێنێکی دیکە نەدەڕۆیی.

بە ڕوخساری خەنۆڵەوە بەرەولای ئەو ڕۆیی، دەستی بەمەبەستی تەوقەکردن بۆ درێژکرد، بەڵام ڕاشیل، سەراپای بە نیگا دابێژت وپرسی:- چیت لە من دەوێ؟

دوروا، ویستی پێبکەنێت:- بەسە، ئەم ئەتوارەت لە چییە!

ڕاشیل پشتی تێکرد و گوتی:- من هاتوچۆی گەوادان ناکەم.

هەوڵیدابوو، پیسترین جنێوی پێبدات. دوروا، سووری سوور بووەوە و بە تاقی تەنیا بۆماڵ گەڕایەوە.

فورستیە کە نەساغ بوو و تەواو لاواز وبێتاقەت بووبوو و بەردەوام دەکۆکی وتەمەنی لە ڕۆژنامەکەدا بردبووە سەر، دەتگوت هەمیشە لە کارێن قورس و دژوار و تاقەتبەر دەگەڕێ تا بە ملی ئەویدا بدات. تەنانەت ڕۆژێک، لە دەمی توورەییدا و پاش کۆکە کۆکێکی درێژ کە خەریک بوو دەیخنکاند، چونکە دوروا زانیارییەکی پێویستی بۆ ئامادە نەکردبوو، بەدەم خوتە وبۆڵەوە پێی گوت: " نەعلەت لە شەیتان، تۆ لەوە بێ شعورتری کە وێنام دەکرد. "

دوروا، لەزگ بوو بەر زللەی بدات، بەڵام جڵەوی خۆی گرت و لەبن لێوانەوە گوتی: " ئەم حەقەت لە قولی مستان دەبەن. " و لەوێندەر ڕۆیی. بیرۆکەیەکی بلەزی بە مێشکا هات و لە دڵی خۆیدا گوتی: " ڕاوەستە بۆم، بزانە چۆن کڵاوی قورمساغیت لە سەر دەنەم دۆستی ئازیز. " و خۆشحاڵ بەم بیرۆکەیە، دەستەکانی لێکدی هەڵدەسوون لە بارەگای ڕۆژنامەکە وەدەرکەوت.

لە سبەینێوە بڕیاری دا نەخشەکەی جێبەجێ بکات. سەرێکی خانم فورستیەی دا تا بزانێ ڕەوش چۆنە.

سەیری کرد لە سەر قەنەفەیەک پاڵکەوتووە و خەریکە کتێب دەخوێنێتەوە. ژنەی گەنج تەوقەی دەگەڵ کرد و بێئەوەی لە جێی خۆی بجمێ سەری بۆلای ئەو وەرگێڕا وگوتی: " سڵاو بیل ئامی " دوروا، هەستێکی لەلا چێبوو، وەکو ئەوە بوو زللەیەکی لێدرابێ. پرسی: " بۆ بەم ناوە بانگم دەکەیت؟ "

ژنەی گەنج، لێو بەخەندە گوتی:

– هەفتەی ڕابردوو خانم دوماریلم بینی و بۆی گێڕامەوە کە لە ماڵی ئەوان بەم ناوە بانگت دەکەن.

دوروا، بە دیتنی قەڵافەتی میرەبان و دۆستانەی ژنەی گەنج خەیاڵی ئاسوودە بوو. ئیدی بۆ دەبوا بترسێت؟

خانم فورستیە، لە سەر قسەکەی ڕۆیی:

– ئەو غافڵ ناکەیت ومەرایی دەکەیت، نازی هەڵدەگریت، بەڵام سەبارەت بە من، مەگەر بەڕێکەوت بیرت بکەومەوە و بێیتە دیدەنیم، بۆ نموونە حەوت شەمموان، یان شتێکی لەو بابەتە.

دوروا، لە لایەوە ڕۆنیشت. سەراپای بەنیگا دابێژت، بە کونجکاوی کەسێکی توحفە دۆستەوە تەمەشای دەکرد. ژنێکی لەبەر دڵانی ڕەنگ زێڕین بوو، تەڕ و بڕ، خوا دایناب‌وو بۆ نەوازش. لە دڵی خۆیا گوتی: " بێگومان لە یارۆ باشترە. " گومانی لە ڕاوکردنی نەبوو، وای هاتەبەرچاو، هەرکە دەستی بەرێتێ، بەئاسانی دەیگرێت، ڕێک وەکو ئەوەی پیاو میوەیەک لە دار بکاتەوە.

لێبڕاوانە گوتی:– بۆیە نەدەهاتمە دیدەنیت چونکە مەسڵەحەت وابوو نەیەم.

– چۆن؟ چما؟

– چما؟ ناتوانی مەزەندەی لێبدەیت؟

– نا، بەهیچ جۆرێ.

– چونکە عاشقی تۆم... ئاه، کەمێک، تەنیا کەمێک... و نامەوێ، بە تەواوەتی و دەربەست عاشقتان ببم.

ژنەی گەنج، لەم قسەیەی ئەو نە سەرسام بوو، نە نارەحەت بوو و نەخۆشحاڵ. درێژەی بە بزە بێ موبالاتەکەی دا، پاشان بەکاوەخۆ گوتی:

- ئاه، وێڕای ئەمەش دەتوانی بێیت. هیچ کەسێک ماوەیەکی زۆر عاشقی من نابێت و لەگەڵما نامێنێتەوە.

دوروا، کە پتر لە ڕاوێژی ئەو سەری سوڕمابوو تا لە قسەکانی، پرسی:- بۆچی؟

- چونکە بێفایدەیە، من زۆر زوو ئەم بابەتە لە بەرانبەرەکەم حاڵی دەکەم. ئەگەر زووتر دەربارەی ترسی خۆت قسەت دەگەڵ کردبام، زۆر زوو خاترجەمم دەکردیت و بە پێچەوانەوە داوام لێدەکردیت، چەندت دەتوانی بێیتە دیدەنیم.

دوروا، بە ڕاوێژێکی خەمناک گوتی:

- ئاخر هەر ئەم قسانە دەبنە بایسی وەی پیاو کۆنترۆڵی خۆی لە دەست بدات.

ژنەی گەنج ئاوڕی لای ئەوی دایەوە وگوتی:

- دۆستی ئازیز، بەلای منەوە پیاوی عاشق لە جوملەی زندواندا نییە. ئەو جۆرە پیاوانە گەوج دەبن، نەک هەر گەوج، بەڵکو ترسناکیش دەبن. من پەیوەندی خۆم دەگەڵ ئەو پیاوانەدا کە عاشقم دەبن یان وا دەنوێنن پەیوەندییەکی زۆر نزیک وڕاستگۆیانەیان لەگەڵما هەیە، دەبڕم، چونکە یەکەم بێتاقەتم دەکەن، دووەم وەکو سەگی هار لەگینە لە هەر ئان وساتێکا پەلامارت بدەن، یان گوماناوی دێنە بەرچاوم. بۆیە دەیانخەمە کەرەنتینەی ئەخلاقییەوە تا نەخۆشییەکەیان چاک ببێتەوە. ئەم قسانەت چاک لەبیر بێ، وەکو گوارە لەگوێیان .بکە. من زۆرچاک دەزانم کە عەشق بۆ تۆ و لەلای تۆ جگە لە جۆرە هەوەس وئیشتیایەک هیچی دی نییە، بەڵام بۆ من ولەلای من، جۆرە... جۆرە پەیوەندییەکی ڕوحییە کە لە نیاز و مەرامی

پیاواندا جێی نابێتەوە. ئەوەی نیاز و مەرامی ئێوەیە جەستەیە، بەڵام مەرامی من ڕوحە. بەڵام... ڕێک بڕوانە چاوانی من...

ئیدی بزەکەی ئاوا بووبوو، قەڵافەتێکی سارد و مەندی هەبوو، لە کاتێکا تەکەزی لەسەر هەر وشەیەک دەکردەوە گوتی:- من هەرگیز، هەرگیز نابمە ماشقەی تۆ، ئەمە چاک بخە مێشکی خۆتەوە. بۆیە ئەگەر بتەوێ سوور بی لە سەر پاراوکردنی هەوا و هەوەسەکانت نەک هەر کارێکی بێهودە دەکەی، بگرە زۆریش خراپ لە سەرت دەکەوێ... و هەنووکە کە شتەکە ڕوون بووەوە... حەز دەکەی دۆستی یەکدی بین، دۆستانی باش، دۆستانی ڕاستەقینە و بێڕیا؟

دوروا، تێگەیی، هەر هەوڵێک لە هەنبەر ئەم فرمانە بێ چەند وچوونە، بێفایدەیە. بەپەلە و ڕاستگۆیانە بڕیاری خۆی دا و خۆشحاڵ بوو لەوەی کە بتوانێ لە ژیانیا ئەو جۆرە ئاڵنگارەی (متحدی) هەبێت، هەردوو دەستی بەرەولای ئەو درێژ کردن:- من بەهەموو هەبوونمەوە، دەربەست دەخزمەتودام، خانم، بەکەیفی دڵی تۆ.

ژنەی گەنج، کە ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی باتینی ئەوی لە ڕاوێژی دەنگیا خوێندبووەوە، هەردوو دەستی بۆ درێژ کرد.

دوروا، هەردوو دەستی، یەک لە دوای یەک ماچکرد، ئەوسا سەری هەڵبڕی و بە سادەیی گوتی: " پەنا بەخوا، ئەگەر لە ژیانما تووشی ژنێکی وەکو تۆ ببام، بێ هیچ سڵەمینەوەو دوو دڵییەک دەمخواست و زەماوەندم لەگەڵیا دەکرد. "

ژنەی گەنج ئەمجارەیان تەواو کەوتە ژێر باندۆرەوە، زۆر لەم پێشوازی و نەوازشە گەرمەی، کە ژنان وەکو

تاریف و ستایشی ڕاستگۆیانە، زۆر حەز دەکەن لە زاری پیاوانیەوە بژنەون، خۆشحاڵ بوو، هەنگێ نیگایەکی خێرا و سوپاسگوزارانەی دوروای کرد، لەو نیگایانەی کە پیاوان کۆیلە دەکەن.

پاشان، چونکە دوروا، هیچ بابەتێکی نەدۆزییەوە، تا سەرلەنوێ گفتوگۆی لەبارەوە بکەن، ژنەی تاین، سەری قامکی نایە سەر بازووی ئەو و بە ڕاوێژێکی شیرین و خۆش گوتی:

- من ئیدی لە ئێستاوە ئەرکی دۆستانەم دەرهەق بە تۆ دەست پێدەکەم. تۆ کەسێکی دەست و پێ سپیت، گیانە...

سووکە هەڵوەستەیەکی کرد و ئەوسا پرسی:- دەتوانم ئازادانە قسە بکەم؟

- بەڵێ.
- بە تەواوی؟
- بەتەواوی.
- دەیسا زۆر چاکە، کەواتە بچۆرە دیدەنی خانم ڤالتر کە زۆر قەدری تۆی لەلایە، کارێ بکە کە بچیتە دڵییەوە. بە ئارەزووی دڵی خۆت تاریف و ستایشی بکە، هەرچەندە ژنێکی پاک داوێنە، باش گوێ بگرە، تەواو داوێنپاکە. ئاه! نەخەڵەتابی بیر... لەو ڕووەوە بیری خراپت بەمێشکا بێت ها. ئەگەر کەسێکی سەرڕاست و دروستکار و ڕاستگۆ بیت، شتی چاکتر چاوەڕوانت دەکات. من دەزانم کە لە ڕۆژنامەکەدا هێشتا کارێکی ناچیزت هەیە، بەڵام خەمت نەبێ، هیچ مەترسە. ئەوانە بەیەک چاو تەمەشای هەموو نووسەر و پەیامنێرەکان دەکەن، بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ هەموویاندا دەکەن، بڕۆ وباوەڕت بە قسەکانی من هەبێت.

دوروا، بە زەردەخەنەوە گوتی: " مەمنوونم، تۆ فریشتەی... فریشتەی پاسەوان. " ئەوسا، دەربارەی بابەتێن جۆراوجۆر کەوتنە قسان.

ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە، چونکە دەیویست بۆ ژنەی گەنجی بسەلمێنێ کە، زۆر حەزی لە هاونشینی ئەوە، ئەو کاتەی کە دەیویست بڕوات، دووبارە پرسی:- کەواتە قەرارمان ئەوەیە کە دۆستی یەکدی بین؟

- وایە.

چونکە بۆی دەرکەوتبوو، کە تاریف وستایشەکەی تۆزێ لەمەوبەری بەدڵی ژنەی گەنج بوو، هەر بۆ دووپاتکردنەوەیان لە سەری ڕۆیی:- لە بیرتان نەچێ، ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان بێوەژن کەوتی، ناوی من لە ڕیزی پێشەوەی خوازگاراندا بنووسە.

زۆر بە پەلە لە ژوورەکە وەدەرکەوت تا دەرفەتی تووڕەبوون بە خانم نەدات.



دوروا، چوونی بۆ ماڵی خانم ڤالتر، لەبەر گران بوو، چونکە لەلایەکەوە ئەو ڕێگایەی پێنەدرابوو و لەلایەکی ترەوە نەیدەویست کارێکی ناشیانەی لێ سادر بێت. جەنابی ڤالتر، لەو ڕازی بوو، بایەخی بەکارەکانی دەدا و لە ڕووی متمانەوە، بۆ کارە دژوارەکانی ڤڕێ دەکرد، باشە بۆ سوود لەم متمانەیەی ئەو وەرنەگرێ و هاتوچۆی ماڵی وان نەکات؟

ئیدی بەیانییەکی زوو لە خەو ڕابوو، چوو بۆ بازاڕی میوەفرۆشان و بایی دە دوازدە فرانک، هەرمێی دەرەجە یەکی کڕی، لە قەرتاڵەیەکی تایبەتی هەڵگرتنی میوەی نا، تا

بیسەلمێنێ کە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتووە. قەرتاڵەکەی دەگەڵ کارتەکەی خۆیدا بۆ ماڵی خاوەن ڕۆژنامەکە برد و دای بە دەرگاوانەکە. لە سەر کارتەکەی نووسی بوو:

جۆرج دوروا

بەوپەڕی خاکەڕاییەوە تکا لە خانم ڤالتر دەکات، ئەم قەرتاڵە میوە ناچیزەی، کە ئەم بەیانییە لە نۆرماندی یەوە بۆی هاتووە، لێ قەبووڵ بکات.

سبەینێ لە سەندوقی نامەکانیا، لە بارەگای ڕۆژنامەکە، زەرفێکی بینی کە کارتی خانم ڤالتری تیابوو: کە بە سوپاسی زۆرەوە بۆ هەستی دڵسۆزانەی جەنابی جۆرج دوروا، ڕایگەیاندبوو کە ڕۆژانی شەمموان لە ماڵەکەیدا، پێشوازی لە دۆستان و ناسیاوان دەکات.

ڕۆژی شەممەی هەفتەی دواتر، چوو بۆ ماڵی خانم ڤالتر.

ئاغا ڤالتر، لە ساختمانێکدا، لە دوو خانووی جیادا، لە مالزوب دەژیا، کە یەکێک لە خانووەکانی بەکرێ دابوو، ئیدی ئەهلی کار دەزانن چۆن پارە پەیدا دەکەن... ژووری دەرگاوانەکە، لە نێوان دوو دەرگای گەورەی گالیسکە ڕەوەکەدا بوو، ئیدی هەم بۆ خاوەن ماڵ و هەم بۆ کابرای کرێچی دەرگای تایبەتی خۆیانی دەکردەوە. بە جلکی ڕازاوەی پایەبەرزانی کڵێسا، بە دوگمەی زێڕین و یەخەی ئەرخەوانی و گۆرەوی سپییەوە، جۆرە ویقار و شکۆیەکی تایبەت بە ماڵە ئەرستۆکراتانی، بە هەردوو دەرگای چوونە ژوورەوەی خانووەکە دەدا.

هۆڵەکانی پێشوازی لە نهۆمی یەکەمدا بوون، لەگەڵ ژوورێکی چاوەڕوانیدا کە پەردەێن ئەستوور بە

دەرگاکانیەوە هەڵواسرابوون. دوو پێشخزمەت لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوەیا، لە سەر کورسی دانیشتبوون و وەنەوزیان دەدا. یەکێکیان باڵاپۆشەکەی لە جۆرج وەرگرت و ئەویتریان دارعاساکەی لێوەرگرت، پاشان دەرگاکەی ڤەکرد، پێشی میوانەکە کەوت، لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی هۆڵەکە وەستا، خۆی کەنارخست تا میوانەکە وەژوور بکەوێت و بە دەنگی بەرز ناوەکەی لە ئاپارتمانە چۆڵەکەدا ڕاگەیاند.

جۆرج، حایر وحەپەساو، تەمەشایەکی هەر چوارنکاڵی کرد، تا سەرەنجام لە ئاوێنەیەکدا چاوی بە کۆمەڵێک کەوت کە ڕۆنیشتبوون و زۆر دوور دەهاتنە بەرچاو. هەوەڵجار ڕێی لێگوم بوو، ئاوێنەکە بە هەڵەی برد، پاشان بە دوو هۆڵی چۆڵی دیکەدا بووری و گەییە ژوورێکی بچووکی پێشوازی کە دیوارەکانی بە پەردەێن ئاوریشمینی شینی گوڵ زێڕین داپۆشرابوون و چوار ژن لە دەوری مێزێکی خڕ، کە پیاڵەی چای بەسەرەوە بوو، دانیشتبوون و بە ئەسپایی قسانیان دەکرد. دوروا، وێڕای ئەو متمانەیەی کە لە ژیانی پاریسی خۆیدا بەخۆی پەیدای کردبوو، بەتایبەتی لە پیشەی ڕۆژنامەوانیەکەیدا کە وای دەخواست دەگەڵ خەڵکانی گەورە و پایەدارا لە تەماسا بێ، لە ڕەوشی ئەم ماڵە و ڕاڕەوەکانی و تێپەڕین بە هۆڵە چۆڵەکانیا، کەمێک پەشۆکاو و دەستەپاچە بوو.

بەدەم چاوگێڕانەوە بۆ خانمی ماڵێ، کەوتە دەمەلاڵکێ:
خانم، من ڕێگەم بە خۆ داوە...

خانم ڤالتر، دەستی بەرەو ئەو هێنا، دوروا دەستی گرت و لە هەنبەریا سەری دانەواند. خانم ڤالتر گوتی: زۆر

لوتفت کرد جەناب کە هاتیتە دیدەنیم. ' ئەوسا کورسییەکی پێ نیشاندا. دوروا، لە کاتی دانیشتنا بەو خەیاڵەی کە نشینگەکەی بەرزە، تەقریبەن لە کورسییەکە ڕۆچوو.

میوانەکان بێدەنگ بووبوون. یەکێک لە ژنەکان دووبارە دەستی بە قسان کردەوە. باسەکە دەربارەی سەرما بوو کە خەریک بوو توونـد دەبوو، بەڵام نە ئەوەنـدە سارد کە ڕێ لە تیفۆی گیرۆ بگرێت و نە ئەوەنـدە تووند کە بشێت خلیسکانێی سەربەفران بکرێ. ئیدی هەرکەسە و ڕای خۆی دەربارەی هەوای سەهۆڵبەندانی پاریس دەردەبڕی، ئەوسا هەرکەسە و ناوی وەرزی دڵخوازی خۆی برد و کۆمەڵێک بەڵگەی سواو و پواوی بەگەڵ دەخست کە وەکو گەرد وتۆزی ئاپارتمانانی چۆڵ، لە دڵ و دەروونانی کۆن و کۆنەپەرستانەیان نیشتبوو.

دەنگی هێواشی دەرگاکە کردیە کارێک دوروا ئاوڕی لای دەرگاکە بداتەوە و، لە نێو دوو ئاوێنەی باڵاڕوانا، ژنێکی قەڵەوی بینی کە خەریک بوو نزیک دەبووەوە. هەرکە ئەو گەییە ژوورە تایبەتیەکەی پێشوازی، یەکێک لە خانمەکان لە جێی خۆی هەستا، تەوقەی دەگەڵ هەمووانـدا کرد و چووە دەرێ. دوروا، نیگای بەگەڵ خست، کە بە هۆڵە چۆڵەکاندا تێدەپەڕی مەنجوخانی سەر جلە ڕەشەکانی دەدرەوشانەوە.

کاتێ کە جم وجوڵی هاتوچۆی میوانەکان کپ بووەوە، هەر هەمووان، لە خۆڕا و بێئەوەی بچنەسەر باس و خواسێن دی، کەوتنە باسکردنی مەڕاکش، جەنگی ڕۆژهەڵات و گرفتارییەکانی ئینگلستان لە ئەفریقای باشوور.

خانمەکان، بەو زانیاریە پەراگەندانەوە کە لێرەولەوێ بەرگوێیان کەوتبوو، گەنگەشەیان دەکرد، دەتگوت دەقی

نمایشنامەیەکی ئەشرافی و لەبار دەگێڕنەوە کە چەندین جار پیشاندرابوو.

میوانێکی دی وەژوور کەوت، ژنێکی کورتەباڵای قژ زێڕینی لوول کراوبوو، کە ئەو هاتە ژوورەوە، خانمێکی بەژن زراڤی کەڵەگەتی ناڤساڵ، جێیەکەی خۆی دایە و ئەو مەرەخەس بوو.

نها، دەربارەی چانسی ئاغای لینە لە ئاکادیمیای فەرەنسادا، دەدوان. میوانە تازەکە قەناعەتی تەواوی بەوە هەبوو کە ئاغای کابانون لوبا، بە سەر ئەودا زاڵ دەبێ. ئاغای کابانون لوبا، سیناریۆیەکی جوانی لە دۆنکیشوتەوە وەرگرتبوو، کردبووی بەزمانی فەرەنسی و بە شیعر بۆ شانۆی ئامادە کردبوو.

- ئایا دەزانی ئەم نمایشنامەیە لە زستانی ئایندەدا لە ئۆدیون پێشکەش دەکرێ؟

- بەڕاست، بێگومان دەچم بۆ دیتنی، ئەم کارە ئەدەبییە تازەیە.

خانم ڤالتر، بە کاوەخۆ، بێ خۆ شلوێ کرن وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە یان بۆچوونی خۆی دەردەبڕی، بێئەوەی دەربارەی ئەوەی دەیویست بیڵێ، کەمترین دوودڵی بنوێنێ، بۆچوونەکانی پێشوەختە ئامادەبوون.

کە سەیری کرد دنیا خەریکە تاریک دەبێت، لە زەنگی دا تا پێشخزمەتەکە چرا بێنێت، لە هەمان کاتدا گوێی لە گوت وبێژی میوانەکان دەگرت کە وەکو جۆگایەکی جوان وبە ئارامی دەڕۆیی. لە ناکاوا بیری کەوتەوە کە بیری چووە بڕوات بۆ وەرگرتنەوەی ئەو کارتی دەعوەتانەی بۆ ئاهەنگ و میوانداری شێڤی ئایندە دابووی بە چاپکردن.

کەمێ قەڵەو و هێشتا جوان بوو، لەو تەمەنە ترسناکەدا بوو کە بەرەو ئاوابوون دەچوو. بە زەبری چاودێری، پارێز و مدارای تەندروستی، جوانی ڕوو لە نەمانی خۆی دەپاراست. لە هەرکارێکا ئاقڵانە کاری دەکرد، لەو ژنانە بوو کە ڕوحی وەکو باخێکی فەرەنساوی خەملیو، ڕێک وپێک بوو. ئینسان بەبێ ئەوەی تووشی هیچ بویەرێکی ئاوارتە و چاوەڕوان نەکری پیاسەی تیا دەکرد و جۆرە جوانییەکی تایبەتی تیا بەدی دەکرد. ژنێکی بە ئاوەز بوو، ئاوەزێکی ناسک، ڕاز پۆشانە کە بۆ ئەو و لەودا جێگەی سەرگەرمی، خێرخوازی و، چاکەکاری دەگرتەوە، ئاوەزێکی ئاوەدان وکراوە بۆ هەموو کەس و هەموو شتێک.

هەستیکرد کە دوروا تا نها هیچی نەگوتووە و کەسیش قسەی دەگەڵ ئەودا نەکردووە و کەمێک ئازارمەند دێتە بەرچاو. چونکە خانمەکان هێشتا هەرباسی ئەکادیمیایان دەکرد و لەوە نەدەچوو، بیانەوێ بەو زووانە بابەتەکە بگۆڕن، پرسی:- تۆ جەنابی دوروا، کە دەبێ لە هەموو کەس شارەزاتر بی، تۆ ڕات چییە و کێت پێ پەسندترە؟

دوروا، بێ هیچ دوو دڵییەک گوتی:

- من لەم مەسەلەیەدا خانم، من هیچ کاتێ شیان وشایستەیی کاندیدەکان کە هەمیشە جێگای ئیراد و مشت ومڕە، لە بەرچاو ناگرم، بەڵکو بیر لە تەمەن و ڕەوشی سەلامەتی و نوژدارییان دەکەمەوە. لە ناو و عینوانیان ناپرسم، دەربارەی نەخۆشییەکانیان پرس .وجۆ دەکەم. هەرگیز لەخەمی ئەوەدا نیم بزانم ئاخۆ پاچڤەیەکی شیعریی بەرهەمێکی لوپ و دوڤیگایان کردووە یان نا، بەڵکو حەزدەکەم لە ڕەوشی جگەری، دڵی، گورچیلەکانی و مۆخی

ئاگادار‌بم. بەلای منەوە گەشە و نەش و نمای نائاسایی و نارێکی ئەندامێن بەدەن، بەرزبوونی ڕادەی ئالبومین لە خوێنا، بەتایبەتی دەست پێکردنی نیشانە و نەخۆشی عەسەبی و، تێکچوونی هاوسەنگی لە ڕێکردنا، پتر لە چل بەرگ بێهودەگۆیی و هەرزەبێژی لەمەڕ نیشتمان بە شیعر و نەزمێن نەباو، بەنرختر و گرینگترە.

ئەو بۆچوونەی ئەو، بێدەنگییەکی سەیری بە دووی خۆیدا هێنا.

خانم ڤالتر، بەدەم زەردەخەنەیەکەوە پرسی: " بۆچی ئەم بۆچوونەت هەیە؟ "

دوروا، بەرسڤی دایەوە: " چونکە من تەنیا لە جسوجۆی شتێکدام کە بۆ خانمان لەزەتبەخش بێت. بەڵێ خانم، ئەکادیمیا بۆ ئێوە ناکاتە هیچ، مەگەر ئەو کاتەی یەکێک لە ئەندامانی بمرێت. تا زیاتریان لێ بمرێت، مەسەلەکە بۆ ئەنگۆ باڵکێش تر دەبێت. بەڵام بۆ ئەوەی ئەندامان زوو زوو بمرن، دەبێ لە نێو بەتەمەن و نەخۆشەکانەوە بێنە هەڵبژاردن. "

چونکە ئامادەبووان هێشتا حایر مابوون، لە سەری ڕۆیی: " منیش وەکو ئێوەم، زۆر حەزدەکەم لە کورتە هەواڵەکانی پاریس دا، هەواڵی کۆچی دوایی ئەندامێکی ئەکادیمیا بخوێنمەوە. چونکە یەکسەر لەخۆ، دەپرسم: " کێ جێگەی دەگرێتەوە؟ " ئیدی بۆخۆم و لای خۆمەوە، ڕیزێک ناو بەلیست دەگرم. ئەمە گەمەیەکە، گەمەیەکی بچووکی بێوەیە کە دوای کۆچی دوایی هەریەکێک لە نەمرەکان، لە دیوەخانی هەرماڵێکی پاریسی دا دەکرێت: " گەمەی مەرگی ئەندامانی گروپی چل نەفەری. " ( مەبەست لە نەمران، ئەندامانی ئەکادیمیای فەرەنسایە کە ژمارەیان چل نەفەرە و

دوای ئەوەی هەڵدەبژێردرێن، ناویان بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە.)

خانمەکان کە هێشتا کەمێک حەیران بوون، دەستیان بە زەردەخەنە کرد، چونکە سەرنج و قسەکەی ئەو زۆر بەجێ و دروست بوو.

دوروا، لە جێی خۆی هەستا و ئەم ئەنجامگیرییەی بە گوێیاندا دا:

" ئێوەی خانمان، ئەوان دیاری دەکەن و، تەنیا لەبەر ئەوە هەڵیاندەبژێرن، کە بەچاوی خۆتان مەرگیان بدینن، بۆیە پیرەکان هەڵبژێرن، زۆر پیرەکان، زۆرهانەکان، دان عەمرەکان هەڵبژێرن و هەقتان بەسەر هیچ شتێکی دیکەوە نەبێت. "

ئەوسا، بە رێز وحورمەتی تەواوەوە، کۆڕ و مەجلیسەکەی بەجێهێشت.

دوای ڕۆیشتنی ئەو یەکێک لە خانمەکان گوتی: " گەنجێکی خۆش و روح سووکە، ئەمە کێیە؟ "

خانم ڤالتر بەرسڤی دایەوە، یەکێکە لە پەیامنێرەکانی ڕۆژنامەکە، کە هێشتا وردەکاران ئەنجام دەدات، بەڵام دڵنیام کە زۆر زوو، دەگاتە پلەوپایەی گەورە و بەرز.

دوروا، بە خۆشحاڵی و بە هەنگاوێن سووک بلڤاری " مالزب " ی تەی کرد. لە ئاکامی ئەم دیدارە ڕازی و خۆشحاڵ بوو، لەبن لێوانەوە بەخۆی گوت: " دەستپێک و سەرەتایەکی باش بوو. "

ئەوشەوە لە گەڵ ڕاشیلدا ئاشت بووەوە.

هەفتەی دواتر، بە دوو هەواڵی خۆش بۆ ئەو دەستی پێکرد. یەکەمیان ئەمە بوو کە بوو بە سەرۆکی بەشی

ئامادەکردنی کورتە هەواڵانی ڕۆژنامەکە و دووەمیان ئەمە بوو کە بۆشام دەعوەتی ماڵی خانم ڤالتر بوو. یەکسەر، پەیوەندییەکی لە نێوان ئەم دوو هەواڵەدا بەدیکرد.

ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز پێش هەموو شتێک ڕۆژنامەیەکی پولساز بوو، خاوەنی ڕۆژنامەکە، کە هەم خاوەنی ڕۆژنامەکە بوو هەم نوێنەری ئەنجوومەن بوو، سوودی لەم دوو دەسەڵاتە وەردەگرت، جگە لە پارە پەیداکردن هیچ ئامانجێکی دیکەی نەبوو. ئیدی خۆشخوویی کردبوو بە چەکێک و بەقازانجی خۆی بەکاری دێنا و هەمیشە لە ژێر پەردەی خەندانی پیاوێکی میهرەباندا، خەڵکانی دەکرد بە ئالەتی دەستی خۆی، بەڵام لە کارەکانیا، ئیدی لە هەر بوارێکدا بوایە تەنیا سوودی لە خەڵکانی فێڵباز وئەو بێ پەروایانە دەبینی کە بەخۆی تاقی کردبوونەوە و لە هەموو ڕوویەکەوە هەڵیسەنگاندبوون.

بەڕای ئەو دوروا، لەو گەنجانە بوو، کە دەکرا سوودی لێوەربگیرێت، هەر بۆیەش کردی بە سەرۆکی بەشی کورتە هەواڵی ڕۆژنامەکە.

سکرتێری ئەم کارە، تا ئەو کاتە ئاغای بوارنار بوو کە سکرتێری ئەنجوومەنی نووسەرانیش بوو، ڕۆژنامەوانێکی کارامە و دروستکار و کارمەندێکی ورد بوو. مودەتی سێ دانە ساڵ، سکرتێری دەستەی نووسەران و یازدە ڕۆژنامەی جۆراوجۆر بوو، بێئەوەی ڕەوشی کار وبۆچوونەکانی بگۆڕێت. ئەو وەکو ئەوەی لە خوارنگەیەکەوە بۆ یەکێکی دی بڕوات، بێئەوەی گوێ بە جیاوازی تامی خواردنی هەریەکێک لەو خوارنگایانە بدات، بەو ئاوایە لە ئەنجوومەنێکەوە بۆ یەکێکی دی دەڕۆیی.

پەیوەندی بەهیچ ئایدۆلۆجیا و باوەڕێکی مەزەبی وسیاسییەوە نەبوو. لە هەر ڕۆژنامەیەکدا کاری بکردایە گوێڕایەڵ وملکەچی یاسا وڕێساکانی ئەو دەبوو و ئەزموونە دوور ودرێژ و بەهادارەکانی خۆی دەخستە خزمەتییەوە. وەکو نابینایەک کە هیچ کوێ نەبینێت و وەکو کەڕێک کە هیچ دەنگێک نەژنەوێ و وەکو لاڵێک کە هەرگیز دەبارەی هیچ شتێک تاقە قسەیەک نەکات، کاریدەکرد.

ویڕای هەموو ئەمەش لە کارەکەیدا پیاوێکی دڵسۆز و سەرڕاست و دروستکار بوو، ئەگەر کارێکی بەلاوە ئابڕوومەندانە نەبوایە نەیدەکرد. وەفاداری کارەکەی بوو.

ئاغا ڤالتر، هەرچەندە ئەوی زۆر بەدڵ بوو، لێی ڕازی بوو، بەڵام حەزیدەکرد بەرپرسیارێتی بەشی کورتە هەواڵان، کە بەڕای خۆی جەوهەری ڕۆژنامەکە بوو، بەکەسێکی دیکە بسپێرێت. لە ڕێگای ئەم هەواڵانەوە بوو کە دەکرا دەنگۆ و بانگەشە بڵاوبکرێتەوە، خەبەر وهەواڵان بڵاوبکرێتەوە، کار لە ڕای گشتی وڕەوشی ئابووری بکرێت. پیاو دەبێ بزانێ چۆن لە نێو دوو ئاهەنگ و کۆڕی ئەشرافیدا، بێئەوەی چ کەسێک پێ بحەسێت، خەبەرێ، دەنگۆیەک، بانگەشەیەک، بەبێ ئەوەی بەزمان باسی بکات، بڵاو بکاتەوە. دەبێ بەڵەد بێ بە هێما و ئاماژە، ئەوەی گەرەکییەتی، لە خەڵکانی بگەیەنێ، خەبەران بەجۆرێ بەدرۆ بخاتەوە، کە ببێتە بایسی بەهێزبوونی بانگەشە، یان بەجۆرێ پشتیوانی لێبکات کە هیچ کەسێک باوەڕ نەکات.

هەرکەسێک دەبێ هەموو ڕۆژێ، لە نێو کورتە هەواڵەکانەوە، بەلای کەمەوە، خەبەری دڵخوازی خۆی هەڵێنجێ و بدۆزێتەوە. تا لە ئەنجاما هەموو کەسێک ئەم

خەبەرانە بخوێنێتەوە. دەبێ لە خەمی هەموو شت و هەموو کەسێکا بێ، لە خەم و بیری هەر ژینگە و هەر کارێکا بێ، چ لە پاریس و چ لە شارستانانی دەوروبەرا، چ لە نێوان سوپاییان ونیگارکێشان، لە نێوان ئەندامانی کڵێسا و زانکۆییان، لە نێوان قازیان و لەشفرۆشاندا بێ.

ئەو کەسەی کە ئەم گروپە پەیامنێر و ڕیپۆرتێرانەی لە بەردەستا بێ دەبێ هەمیشە وریا و ئاگادار بێ، بەدگومان، دووربین، ئاقیبەت بین، حیلەباز، زیرەک و سازشکار بێ، هەموو فێڵ و تەڵەکەیەک بزانێ، دەبێ خاوەن مەزەندەیەکی دروست بێ و لەیەکەم نیگاوە هەواڵی ڕاست و درۆ لێکدی جیابکاتەوە، تا بکارێت بڕیاربدات کە چ هەواڵێک بڵاوبکاتەوەو چ هەواڵێک وەلاوە بنێت، و بزانێ تا چ ئەندازەیەک کار لە ڕای گشتی دەکات و ئەنجام بە شێوەیەک بڵاوی بکاتەوە کە زۆرترین کاریگەری هەبێت.

ئاغای بوارنار کە ئەزموونێکی دوور ودرێژی لەم کارەدا هەبوو، لە ڕووی ئیدارییەوە، زۆر بەتوانا نەبوو، بە تایبەتی ئەو حیلەبازی و حیلەگەرییە خۆرسکەی نەبوو کە ڕۆژ بە ڕۆژ پێشبینی بیرە باتینییەکانی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەلە بکات و بەدڵی ئەو بکات.

دوروا، دەبوایە کاری ئەم بەشە بگەیەنێتە ڕادەی کەماڵ و نووسینی ئەم لاپەڕەیەی، کە نوربردوڤارن گوتەنی " لە ئاوی قووڵی حکومەت و لە تەنکاوی سیاسەتدا کەشتیرانی دەکرد " بە شێوەیەکی زۆرباش تەواو بکات.

تەگبیرکەر ونووسەرانی ڕاستەقینەی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز دە دوازدە نەفەرێکی نوێنەری ئەنجوومەن بوون، کە هەموو ئەو مامەڵە و سەوداگەرییە بەسوود و پڕ

قازانجانەی کە بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە دەیهێنایە ئاراوە، یان پشتیوانی لێدەکردن، سوودمەند بوون. لە ئەنجوومەندا پێیان دەگوتن: " گرووپی ڤالتر " و بەغیلیان پێ دەبردن، چونکە دەگەڵ ئەوا یان بەهۆی ئەوەوە پارەیەکی مۆڵیان لە بەرکی خۆ دەنا.

فورستیە، ڕیپۆرتەری سیاسی، داردەستی ئەم مامەڵەچییانە و جێبەجێکەری ئەو پێشنیازانە بوو کە لە لایەن ئەوانەوە دەکران. بیرۆکە و کەرەستەی وتارە سەرەکییەکانی لەوانەوە وەردەگرت، ئەویش دەچوو بۆ ماڵی خۆی تا خۆی گوتەنی لە هاماج و جەوێکی ئاراما، بیری خۆی جەم وجۆر بکات و دەقی وتارەکە فورمۆڵە بکات وبەجوانی دایبڕژێتەوە.

بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکە شەقڵ و داڕشتنێکی ئەدەبیانەی هەبێ، دوو نووسەری ناوداریان، هەڵبەتە بە شێوازی جیاوازەوە، کردبوو بە بەرپرسیاری ئەم کارە: جاک ریڤال، بەرپرسی هەواڵێن ئەدەبی و، نوربردوڤارن شاعیر و ڕیپۆرتەری هونەری، یان بە گوتەی نووسینگەی تازە، بەرپرسی چیرۆکان.

هەڵبەتە، بەکرێیەکی کەم، هەندێ خەڵکی دیکەشیان لە نووسەرانی هەمەکارە بەکرێ گرتبوو، لەوانە: ڕەخنەوانانی هونەری، بۆ بەشێن نیگارکێشی، موزیقا و شانۆنامە، ڕیپۆرتەری هەواڵ و بویەرێن تاوانکاری و ڕیپۆرتەر بۆ پێشبڕکێی ئەسپان و مەسەلەێن سوارکاری و، " پات پلانچ " شیان، بۆ ئامادەبووان لە میوانداری و دەعوەت و ئاهەنگی ئەرستوکراتی و نووسینی هەواڵ و نووچە دەربارەی مۆد، ژیانی ئەشرافی، داب و ئەتەکێت و ڕەوشی ئیدارەدانی ماڵ

ڕاگرتبوو که جارجارێک هەندێ هەواڵ دەربارەی ژیانی تایبەتی هەندێک لە ژنانی خانەدانی بڵاودەکردەوە.

لاڤی فرانسز، لە سەر دەستی خەڵکانی جۆراوجۆر، جێگەی خۆی لە حاندی باڵا و پاینی کۆمەڵگەدا کردبووەوە.

دوروا، کە کرابوو بە بەرپرسی بەشی کورتە هەواڵان، ئەوەندە کەیفی ساز بوو، بە کلکان گوێزی دەشکاند، کە ناوی خۆی بە پیتی درشت، لە سەر کارتی دەعوەت بینی، لەخۆشیان لە کەوڵی خۆی نەدەحەجمی: " خانم و ئاغای ڤالتر، داوا لە ئاغای جۆرج دوروا دەکەن، بە بەشداری لە ئاهەنگی نانی ئێوارە لە ماڵی خۆیاندا، ڕۆژی پێنج شەممەی ١/٢٠ گەورە و سەربەرزیان بکات. "

هەواڵی ئەم لوتف و مەرحەمەتە تازەیە کە تەواوکەری هەواڵەکەی پێشوو بوو، هێندە سەرمەستی کرد کە کارتەکەی وەکو نامەیەکی دڵداری ماچکرد. پاشان ڕۆیی بە سۆراخی یارۆی سەندوقدارەوە تا مەسەلەی گرینگی دارایی دەگەڵدا حەل وفەسڵ بکات.

سەرۆکی بەشی کورتە هەواڵان، بودجەیەکی لەبەردەستدا بوو کە دەیتوانی، هەر لەجێوە، هەقی ئەو هەواڵە باش و خراپانەی کە پەیامنێرەکان بۆیان ئامادە دەکرد، وەکو ئەو میوە نەوبەرانەی کە باخەوانان دەیخەنە بازاڕەوە بدات.

ئیدی بۆ ئەوەی دوروا دەست بەکاربێ و کارەکەی بکەوێتە سەر سکە، بودجەیەکی مانگانەی هەزار و دووسەد فرانکی خرایە بەردەست کە پێوەبوو، زۆربەی هەرە زۆری بۆخۆی هەڵبگرێت.

یارۆی سەندوقدار، لە هەنبەر مکوڕبوون و پێداگری ئەودا، ڕازی بوو، بڕی چوارسەد فرانکی وەکو پێشەکی بداتێ. لە هەوەڵەوە بەتەمابوو، پێش هەموو شتێک ئەو دووسەد و هەشتا فرانکەی کە قەرزاری خانم دوماریل بوو، بداتەوە، بەڵام کە بیری کردەوەو حیسابی خۆی کرد، سەیری کرد کە تەنیا سەد وبیست فرانکی بۆ دەمێنێتەوەو ئەم بڕە بە هیچ جۆرێ بەشی ئیدارەدان و بەڕێوەبردنی کارە تازەکەی ناکات، بۆیە دانەوەی ئەم قەرزەی خستەوە کاتێکی دی.

مودەتی دوو ڕۆژان هەر مژوولی گواستنەوە بوو بۆ شوێنی کارە تازەکەی کە لە هۆڵە گەورەکەی ئەنجوومەنی نووسەراندا بوو، مێزێکی گەورەی تایبەت بەخۆی هەبوو، چەکمەجەی بۆ کاغەزێن زیادە و نامەکان هەبوو. مێزەکەی ئەو لە لایەکی هۆڵەکە بوو و، مێزەکەی بوارنار لەلایەکی دی بوو، کە هەرچەندە تەمەنی هەبوو، بەڵام قژی ڕەش بەسەرییەوە مابوو و هەمیشە سەری بەسەر کاغەزەکانی بەردەمییەوە دانەواندبوو.

مێزێکی درێژ لە ناوەڕاستی هۆڵەکە بوو، تایبەت بوو بەو نووسەرانەی کە ئۆفیسی جێگیر وکاتی دیاریکراوی کاریان نەبوو، ئەم مێزە هەندێجار لەجیاتی تەختیش بەکار دەبرا و پەیامنێر و ڕیپۆرتەرەکان لە سەری ڕۆدەنیشتن و لاقیان لە سەرییەوە شۆڕ دەکردەوە یان چوارمشقی دادەنیشتن، ئەمانە هەندێجار دەبوون بە پێنج شەش کەس و زۆر بەجدی گەمەی بیل بووکەیان دەکرد.

دورواش بەرەبەرە حەزی چووبووە ئەم گەمەیە وبە ڕێنوێنی سن پوتین فێری دەبوو و دستی لە سەر ڕادەهات.

فورستیە، کە نەخۆشییەکەی ڕۆژ بەڕۆژ توندتر دەبوو، بیل بووکەیەکی هەبوو کە تازە کڕی بووی و بۆخۆی قورس بوو، دای بە دوروا. دوروا، بەدەستە بەهێزەکەی گۆیە ڕەش و قورس و دارینەکەی لە کۆتایی پەتەکەیەوە بەرەو سەر وخوار هەڵدەدا و بەدەنگی نەوی دەکەوتە ژماردن: " یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش. "

ڕۆژێ کە لە ماڵی ڤالتر، بۆ شام دەعوەت بوو، بۆ یەکەمجار بیست چەلانی دوا بەدوای یەک گۆیەکەی کرد بە نووکی باریکی تەشییەکەوە. بەخۆی گوت: " بۆمن ڕۆژێکی باشە، بەخت ڕووی تێکردووم. " چونکە مەعلانی لەم یارییەدا، لە ئیدارەی ڕۆژنامەکەدا، بەجۆرە بالآییەک دەژمێردرا.

زووتر لە کاتی ئاسایی لە دایەرە وەدەرکەوت تا فریای خۆگۆڕین بکەوێ، خەریک بوو بە شەقامی لەندەندا ڕێی دەکرد، چاوی بە ژنێک کەوت کە لە پێش ئەوەوە ڕێی دەکرد و شێوەی ڕێکردن و بەژن و بالآی لە خانم دوماریل دەچوو. هەستی کرد دەم وچاوی گڕی گرتووەو دڵی بە پەلەپەل لێدەدا. پانایی ڕێگاکەی بڕی تا ژنەکە لەولاوە ببینێت. ژنەکەش وەستا تا لە شەقامەکە بپەڕێتەوە. بە سەهو چووبوو، خانم دوماریل نەبوو، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

زۆرجار لە خۆی پرسی بوو ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕوو بەڕووی ببێتەوە دەبێ چۆن ڕەفتاری دەگەڵدا بکات. سڵاوی لێبکات یان خۆی لە گێلی بدات و وابنوێنێ ئەوی نەدیتووە؟

بەخۆی گوت: لێ ئەو نابینم.

دنیا سارد بوو، سەری جۆگاکان بەستبووی و سەر شۆستەکان لەبەر تیشک و ڕوناکی چرا غازیان، وشک و کەوەیی بوو.

وەختایەک گەییە ماڵەکەی خۆی بە خۆی گوت: " پێویستە لێرە باربکەم، شوێنەکەم بگۆڕم، ئێرە ئیدی بۆمن بە کەڵک نایەت.

هەستی بە چالاکی وچەلەنگی خۆی دەکرد، حەزی دەکرد لە سەر بانان غار بدات و لە هەمان کاتدا کە لە تەختە خەوەکەیەوە بەرەو پەنجەرەکە دەڕۆیی ودەزڤڕییەوە، بە دەنگی بەرز دەیگوت:

"بەخت ڕووی تێکردووم! بەخت و یەغباڵ! پێویستە نامەیەک بۆ باوکم بنووسم."

جارجار نامەیەکی بۆ بابی دەنووسی، بە زۆری نامەکەی لە مەیخانەیەکی بچووکی کەنار جادەیەک دەنووسی، ئەم نامەیە هەمیشە ژیانی لەلا دەمەزەرد دەکردەوە، هەندێجاریش ئەو نامەیەکی بۆ دەهات کە ناونیشانەکەی ئەمی بەپیتی درشت و دەستێکی لەرزۆک لە سەر نووسرابوو. نامەیەک کە هەمیشە بە هەمان پەیڤ و ڕستان دەستی پێدەکرد:

" کوڕی ئازیزم، بۆیە ئەم نامەیەم بۆ فڕێ کردووی تا بزانی حاڵی من ودایکت باشە. هیچ دەنگ وباسێکی تازە لەم دیار و مەحاڵەی لای ئێمە نییە. لە گەڵ ئەمەشا خەبەرم زانیوە.... "

دوروا، هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوو ئاگای لە ڕەوشی زێد وزاگەی خۆی، بارودۆخی هاوسێکانیان، ڕەوشی مووچە و مەزراو بەروبووم هەبێت.

بەدەم بەستنی بۆینباخە سپیەکەیەوە لە بەر ئاوێنە بچووکەکەیدا، هەمیشە بە خۆی دەگوت: " پێویستە سبەی نامەیەک بۆ بابم بنووسم. پیرەمێردی میرەبان ئەگەر ئەمشەو منی بەم جل وبەرگ و سەر وسیمایەوە دیتبا، بیزانیبا لە کوێ دەعوەت کراوم لە سەرسامیا دەمی دادەچەقی. ئەمشەو خواردنێک دەخۆم کە ئەو بە عەمراتی نەیخواردووە." لە ناکاوا مووبەقە ڕەش و دووکەڵاوییەکەی پشت هۆڵی مەیخانە چۆڵەکەیانی، بە قاپلەمە وتاوەکانەوە کە بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون هاتەوە بەرچاو، گورپەکەیان لە بەر موغەیرییەکە خەوتبوو، مێزێکی چەور و چڵکن کە بە هۆی کۆنی وئەو خواردنانەی بە سەریا ڕژابوو، ڕەنگی دیار نەبوو، کاسەی سووپ کە هەڵمی لێ هەڵدەستا لە ناوەندی مێزەکەدا بوو، مۆمێک لە نێوان دوو قاپدا هەڵکرابوو. باب و دایکی هێنانەوە بەرچاوی خۆی کە لەمبەر و لەوبەری مێزەکەدا دانیشتوون و وەکو دوو گوندی، بەخاوی، شۆربا و سووپەکەیان کەوچک کەوچک دەخوارد. بەهەموو حەرەکات و سەکەناتێکیان ئاشنابوو، تەنانەت دەیزانی هەموو شەوێ کە ڕوو بەڕووی یەکدی و بە دەم شۆربا خواردنەوە دادەنیشن، چ بەیەکدی دەڵێن.

دووبارە بەخۆی گوت: " پێویستە ڕۆژێ بڕۆم سەرێکیان بدەم."

بەڵام چونکە لە خۆگۆڕین و خۆ ئامادەکردن بووبووەوە، چراکەی کوژاندەوە و بە قاڵدرمەکانا داگەڕا.

بە درێژایی بولڤارە بازنەییەکە، ژنانی خۆفرۆشی کەنار جادەکە، بەرەو ڕووی دەهاتن. لێ ئەو بە قێز وبێزەوە، وەکو ئەوەی سووکایەتیان پێکردبێ، لە خۆی دوور

دەخستنەوەو دەیگوت: " لاکەون، بڕۆن بەلای کاری خۆتانەوە! " ئەویان بە چتۆ پیاوێک دەزانی؟ ئەم خۆفرۆشانە نەیاندەتوانی پیاوانی جۆراوجۆر لێکدی هاوێر بکەن؟ هەست کردن بەوەی کە جلکی ڕەشی شەوی لەبەرا بوو و دەچوو بۆ میوانی ماڵێکی زۆر دەوڵەمەند، فرە بە نێوبانگ و زۆر گرینگ و هەستکردن بەوەی کە بووە بە کەسێکی دی، کەسێکی سەر بە دنیای پارەداران و خوشگوزەرانان، کەسایەتیەکی دیکەی تازەی بەو دەدا.

بە دڵنیاییەوە خۆی بە ڕاڕەوەکەدا کرد. چلچرا وئاوێزەیەکی بەرز ڕاڕەوەکەی بە تەواوەتی ڕوناک کردبووەوە. دوروا بە ڕەفتارێکی ئاسایی و پڕ متمانەوە، داردەستەکەی و باڵاپۆشەکەی دایەدەست ئەو دوو پێشخزمەتەی کە هاتبوونە پێشوازی.

هەموو هۆڵەکان ڕوناک بوون. خانم ڤالتر، لە هۆڵی دووەما کە لە گشت هۆڵەکانی دی مەزنتر بوو، پێشوازی میوانەکانی دەکرد. بە بزەیەکی باڵکێشەوە پێشوازی لە دوروا کرد. دوروا، تەوقەی دەگەڵ دوو میوانی دیدا کرد کە لە پێش ئەودا هاتبوون، ئاغای فیرمن و ئاغای لاروچ ماتیو، کە هەردووکیان نوێنەری ئەنجوومەن و لە پەیامنێرە نەناسراوەکانی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز بوون، کە ناویان لە پاینی وتارەکانیاندا نەدەنووسرا. ئاغای لاروچ لە ڕۆژنامەکەدا دەسەلاتی تایبەتی هەبوو، ئەم دەسەلاتە زادەی ئەو دەسەلاتە بوو کە لە ئەنجوومەندا هەیبوو. کەس گومانی لەوە نەبوو کە لە ئایندەدا دەبێت بە وەزیر.

پاشان فورستیە وهاوسەرەکەی هاتن، هاوسەرەکەی جلێکی پەمەیی لەبەر کردبوو، لە هەموو کاتێ جوانتر بوو.

دوروا وەختایەک بینی ئەو ناسیاوی نزیکی دەگەڵ دوو نوێنەرەکەی ئەنجوومەندا هەیە زۆری پێ سەیر بوو. مودەتی پێنج خولەک دوورا لە خەڵکەکە و لە نزیکی موغەیرییەکەوە، بە چپە قسەی دەگەڵ ئاغای لاروچ ماتیودا کرد. شارل ماندوو و شەکەت دیار بوو. نزیکەی مانگێک بوو زۆر لاواز بووبوو. هەمیشە دەکۆکی و دەیگوت: "پێویستە قەراری خۆم بدەم وبڕۆم زستان لە باشوور بەسەر بەرم."

نوربردوڤارن و جاک ریڤال پێکڤە گەیشتن. ئەوسا دەرگایەک لەوسەری ئاپارتمانەکەوە کرایەوە، ئاغا ڤالتر دەگەڵ دوو کیژی گەنجی کەڵەگەتی بەژن زراڤ، یەکێکیان شازدە ساڵان و ئەوی دی هەژدە ساڵان بوو، وەژوور کەوت. کیژە گەورەکە ناحەز و بچووکەکە خشیک وشەنگوڵ بوو.

دوروا، دەیزانی کە ڤالتر بابی خانەوادەکەیە، وێڕای ئەوەش زۆر سەری سوڕما. چونکە هەمیشە بەجۆرێ بیری لە کچەکانی سەرۆکەکەی دەکردەوە، وەکو ئەوەی کیشوەرێکی دوورە دەست بن و کەس نەیگاتێ. ئەمە جگە لەوەی وای وێناکردبوون کە بچووک و منداڵن، کەچی هەنووکە دوو ژنی گەورەی دەبینی. دیتنی ئەوان بەم شێوە چاوەڕوان نەکراوە، سووکە ئاشووبێکی لە زەینا دروستکرد.

دوو کیژە گەنجەکە، دوای تەعاروف، تەوقەیان دەگەڵ دوروادا کرد و چوون لە پشت مێزێکی بچووکەوە کە بێگومان، تایبەتی ئەوان بوو، دانیشتن و کەوتنە یاریکردن بەو بەکرە ئاورێشمانەی کە لە نێو سەبەتەیەکی بچووکدا بوون.

به دەم چاوەڕوانی هاتنی میوانانی دیکەوە، هەموو بێدەنگ بوون، لەو بێدەنگیە ناخۆشانەی کە پێش شام لە نێوان خەڵکانێکا کە پاش مەشغەڵەتی جۆراوجۆری ڕۆژانە لە دەوری یەکدی خڕدەبنەوەو هاوفیکرش نین، دروست دەبێت.

دوروا، کە هیچ کارێکی نەبوو و، تەواو بێتاقەت بووبوو، هەروا چاوی بڕییە دیوارەکەی بەرانبەر. ڤالتر لە دوورەوە و بە دڵ، هەر بۆ ئەوەی خۆی بە سەروەت و سامانەکەیەوە هەڵکێشێت گوتی: " چییە تەمەشای تابلۆیەکانم دەکەی؟ وشەی " یەکانم " ی زۆر بەخەستی ئەدا کرد. " نها نیشانتانی دەدەم. " چرایەکی هەڵگرت و لە تابۆکانی نزیک کردەوە، تا جوانکاری و وردەکارییەکانیان باشتر بێنە دیتن.

– ئەمانە بەرجەوەن و دیمەنانن.

تابلۆیەکی گەورەی گیومە، لە ناوەندی دیوارەکەدا هەڵواسرابوو، کەناراوێکی نورماندی بوو لە ژێر ئاسمانێکی بەتۆف وزریانی دا. لە خوار ئەم مەنزەرەیەوە تابلۆیەکی دی هەبوو کە دیمەنی بێشەیەک بوو، دەسکاری هارپینی بوو، ئەوسا پێدەشتێکی جەزایر بوو، کە دەسکاری گیومە بوو، وشترێک لە ئاسۆی تابلۆکەدا، لە سەر هەردوو دەست ولاقە درێژەکانی وەستابوو، لە ساختمانێکی مێژوویی سەیر دەچوو.

ئاغا ڤالتر چوو بۆلای دیوارێکی دی و بەڕاوێژێکی جدی وەکو سەرۆکی تەشریفات و ئەتەکێتی پێشوازی گوتی: " نیگار و تابلۆیانی بەنرخ. " چوار تابلۆ بوون: " دیدارێکی خەستەخانە " بەرهەمی جروکس، " ژنی دروێنەوان " بەرهەمی باستین لوپاج، " بێوەژن " بەرهەمی بورگرو، "

ئیعدام " بەرهەمی جان پول لوران. دوایەمین تابلۆ دیمەنی کەشەیەکی خەڵکی واندەی نیشاندەدا کە لە پاڵ دیواری کڵێساکەی خۆیدا، بە دەستی مەفرەزەیەک لە شۆڕشگێڕەکان، گوللەباران دەکرا.

لە کاتی باسکردنی تابلۆکانی دیدا، بزەیەکی سەلارانە نیشتە سەرلێوی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە: " ئەمانە تابلۆی هاکەزایین. زیاتر بۆ سەرگەرمین. " لە هەوەڵەوە تابلۆیەکی بچووکی دەسکاری جان برۆ هەلواسرابوو، ناوی تابلۆکە " هەوراز و نشێو " بوو، بریتی بوو لە وێنەی ژنێکی جوانی پاریسی کە بە پلیکانەکانی ترامواکەیەکی دوو نهۆمی لە حاڵی حەرەکەیا، هەڵدەگەڕا. سەری لە ئاستی نهۆمی دووەم بوو و ئەو پیاوانەی کە لە سەر کورسییەکانی ئەم نهۆمەدا دانیشتبوون، بە خۆشحاڵییەکی تامەزرۆیانەوە، دەیانڕوانییە ئەم ڕوخسارە جوان و گەوجانەیەی کە بەرەولای ئەوان دەهات. لە هەمان کاتدا ئەو پیاوانەی کە لە قاتی خوارەوە وەستابوون، بە ناچاری و لە هەمان کاتدا بە تامەزرۆیی تەمەشای پاوپوزی ئەم ژنە گەنجەیان دەکرد. ئاغا ڤالتر، چراکەی هەڵبڕی بوو و بەدەم بزەیەکی بێشەرمانەوە، خێراخێرا دەیگوت و دەیگوتەوە: " ها؟، بە لەزەت نییە؟ بە لەزەت نییە؟ "

ئەوسا چراکەی لە تابلۆی " نەجات " دەسکاری لانبر نزیک کردەوە. تابلۆکە بریتی بوو لە مێزێکی چۆڵ کە بێچوە پشیلێک لە ناوەڕاستیا دانیشتبوو و بە سەرسامی و دوودڵی تەمەشای مێشێکی دەکرد کە کەوتبووە ناو پەرداخێ ئاوەوە. دەستێکی هەڵبڕی بوو و ئامادە بوو بە

حەرەکەیەکی لەزگین پڕ بداتە مێشەکە و بیگرێت. لێ هێشتا بڕیاری یەکجارەکی نەدابوو، تیامابوو چ بکات؟

ئەوسا ئاغا، تابلۆیەکی دەسکاری دیتای نیشاندا بەناونیشانی " پەند " تابلۆکە سەربازێکی نیشاندەدا کە لە سەربازگەکەیدا خەریک بوو سەگێکی فێری تەپڵ ژەنی دەکرد و، لە سەری ڕۆیی: " بەمە دەڵێن زەوق و سەلیقە! "

دوروا، بە سیمایەکی تەئید ئامێزەوە پێدەکەنی و بە لەزەتەوە دەیگوت: " زۆر جوانن، گەلەک دڵگیرن، دڵ... "

لە ناکاوا، کە گوێی بە دەنگی خانم دوماریل زرینگایەوە کە خەریک بوو دەچووە هۆڵەکەوە، قسەکەی خۆی خواردەوە.

خاوەنی ڕۆژنامەکە، بە هەمان دەقەوە، چراکەی لە تابلۆکان نزیک دەکردەوە و ڕوونکردنەوەی دەدا:

ئێستا ئاماژەی بۆ تابلۆیەکی شینباوی بەرهەمی موریس لولوار دەکرد: " لەمپەڕ "، ئەم تابلۆیە بریتی بوو لە کەژاوەیەک کە لەجێی خۆی وەستابوو، دوو پیاوی شرپۆش لە سەر جادەیەک بوون، دووپیاوی زەلامی بەهێز و هەرقل ئاسا، دەستیان نابووە یەخەی یەکدی.

ژنێکی جوان و دڵڕفێن، لە پەنجەرەی کەژاوەکەوە سەری هێنابووە دەرێ و تەمەشای شەڕەکەی ئەوانی دەکرد، بێ خەم وخەیاڵ وبێ ترس و بێباک چاوی بڕی بووە کوتەک کارییەکەی ئەم دوو پیاوە.

ئاغای ڤالتر دووبارە گوتی: " لە هۆڵەکەی دواتر تابلۆیانی دیکەش هەن، لێ ئەو تابلۆیانە بەرهەمی نیگارکێش و شێوەکارانی نەناسراوترن و سەربە هیچ ڕێبازێک نین. ئێرە هۆڵی دانیشتنی منە، حاڵی حازر تابلۆی نیگارکێشانی

گەنج، زۆر گەنج دەکرێم و لە بەشە تایبەتەکانی ئاپارتمانەکەیان هەڵدەواسم، چاوەڕوانی ڕۆژێ دەکەم کە شۆرەت و ناوبانگ پەیدا بکەن. " ئەوسا بە دەنگی نەوی لە سەری ڕۆیی: " نها کاتی کڕینی تابلۆیانە. نیگارکێشان خەریکە لە برسا دەمرن. تاقە پولێکیان نییە کە سکی خۆیانی پێ تێر بکەن، "

بەڵام دوروا، هیچی نەدەبینی، گوێی لە قسەکانی سەرۆکەکەی دەبوو بێئەوەی لەمانا و مەبەستیان تێبگات، خانم دوماریل لەوێ بوو، لە پشتی ئەوەوە بوو. دەبێ چ بکات؟ ئەگەر سڵاوی لێکردبا ئاخۆ ژنەی گۆڕین، ڕووی لێوەرنەدەگێڕا یان قسەی ناشیرینی پێنەدەگوت؟ ئەگەر نەدەچوو بەلایا و هیچ قسەیەکی دەگەڵ نەدەکرد، ئاخۆ ئەوانی دی لە دڵی خۆدا چییان دەگوت؟

بەخۆی گوت: " ئەوەندەی بتوانم خۆم دەخافڵێنم. " هێندە شپرزە و ناڕەحەت بوو کە بۆ دەمێک وای بەبیرا هات کە بە درۆوە خۆی نەخۆش بخات و داوای بوردن لە خانە خوێیەکەی بکات و لەوێندەر بڕوات.

تەمەشاکردنی تابلۆکان تەواو بووبوو، بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە ڕۆیی چراکە لە جێگای خۆی دابنێتەوەو خێرهاتنی خانم دوماریل کە تازە هاتبوو، بکات وئەحواڵپرسی دەگەڵدا بکات. دوروا، دووبارە خۆی بە تەمەشاکردنەوەی تابلۆکانەوە خافڵاند، دەتگوت لە جوانی و ستایشی تابلۆکان تێر نابێت. بیری شێوا بوو. دەبێ چ بکات؟ گوێی لە دەنگەکان بوو قسەکانی جیا دەکردەوە. خانم فورستیە بانگی کرد: " ئاغای دوروا بێ زەحمەت! " دوروا بە هەشتاو بۆلای ئەو چوو. ژنەی گەنج دەیویست واسیتە

بۆیەکێک لە دەستە خوشکەکانی بکات کە قەرار بوو ئاهەنگێک سازبکات ودەیویست هەواڵی ئەو ئاهەنگە لە ستوونی کورتە هەواڵانی ڕۆژنامەکەدا چاپ وبڵاو ببێتەوە.

دوروا، بەدەم دەمەلاڵکێوە گوتی: " هەڵبەتە خانم، هەڵبەتە... "

خانم دوماریل، نها بە تەواوی گەیی بووە نزیکی ئەو، جورئەتی نەدەکرد پشتی تێبکات و لەوێندەر دوور بکەوێتەوە.

لە ناکاوا هەستیکرد خەریکە شێت دەبێت. ژنەی گەنج بەدەنگی بەرز گوتی:

– سڵاو بیل ئامی. نها ئیدی من ناناسیتەوە؟

دوروا، بلەز ئاوڕێکی دایەوە. کلوتیلد، لێو بەخەندە، بە نیگایەکی سەرڕێژ لە میهر ومەحەبەت ڕوو بە ڕووی وەستابوو، هەر بەو حاڵەوە دەستی بەرەو ئەو ڕاگرت.

دوروا، بە دەستێکی لەرزۆک تەوقەی دەگەڵ کرد. هێشتا دەترسا ئەم ماستە موویەکی تیابێ. ژنەی گەنج بە ئارامیەکی تەواو گوتی:– کەوتوویە کوێوە؟ ناتبینم.

دوروا، هەرچی کرد و کۆشا، نەیتوانی خۆی هێور بکاتەوە، بەدەمە لاڵکێوە گوتی:

– زۆر سەرقاڵم خانم، نامپەرژێتە سەر هیچ. جەنابی ڤالتر لە ڕۆژنامەکەدا کارێکی تازەی پێ سپاردووم کە زۆری مژوول کردووم.

ژنەی گۆرین، بە هەمان دەقەوە چاوی لە دوڕ چاوانی ئەو بڕی بوو، بێئەوەی دوروا جگە لە نیاز پاکی و خێرخوازی شتێکی تریان تێدا ببینێ، گوتی: " دەزانم لێ ئەمە مانای وا نییە دۆستەکانت لە بیر بکەی. "

خانمێکی قەڵەو کە خۆی بە کوڕ و مەجلیسەکەدا کرد ئەو جووتەی لێکدی هاوێر کرد، ئەم خانمە کراسێکی یەخە کراوەی لەبەر بوو بە بازووە سوور و ڕوخسارە سوورەکەیەوەو، بە ئاڕایش و سەرووەزعێکی ڕواڵەتبازانە، هێندە بە سەنگینی ڕێی دەکرد کە پیاو بە دیتنی ئەو دەیتوانی هەست بە قەڵەوی و گەورەیی لاقەکانی بکات.

چونکە زۆر بەڕێز و حورمەتەوە مامەڵەیان دەگەڵ دەکرد، دوروا لە خانم فورستیەی پرسی:- ئەم خانمە کێیە؟

- ویکنتس دو پرس مور، ئەو کەسەیە کە وتارەکانی بە ناوی خوازراوی " پات پلانچ " بڵاو دەکاتەوە. (موپاسان، لەو نووسەرانە بوو کە تەنانەت لە هەڵبژاردنی ناوەکانیشا تەنزی بەکار دەبرد، بۆ نموونە: خانم پرس مور بە مانای " دیوار کون کەر " دێ و " پات پلانچ " بە مانای " پەنجە سپی " دێ. )

دوروا، مات وحەیران، حەزیدەکرد لە قاقای پێکەنین بدات:

- پات پلانچ، پات پلانچ! دەوەرە دەی! من وام وێنا دەکرد کە ژنێکی گەنجی وەکو تۆ بێ. کەواتە ئەمە پات بلانچ – ە؟ ئاە، چەند ژنێکی باشە! چ ژنێکی باشە!

پێشخزمەتێک هاتە بەر دەرگا وگوتی:- خانم شام ئامادەیە.

کۆڕی شامەکە ئاسایی و شاد بوو، لەو کۆڕ و ئاهەنگ و میوانیانە بوو کە لە سەر مێز سەبارەت بە هەموو شتێک و هیچ شتێک قسە دەکرێت.

لە سەر مێزەکە دوروایان لە بەینی روز و، کیژە گەورەکەی ڤالتر کە ناحەز بوو، وخانم دوماریل

دانیشاندبوو. ئەم هاونیشینەی خانم دوماریل کەمێک ناڕەحەتی دەکرد، هەرچەندە خانمی گۆرین زۆر ئاسوودە دیاربوو و بەگەرم وگوڕی قسەی دەکرد. دوروا، لە هەوەڵێ ڕا ناڕەحەت و دوودڵ بوو، لە سازڤانێک دەچوو ئاهەنگ و ڕیتمی سازەکەی گوم کردبێ. وێڕای ئەوەش بەرە بەرە متمانەی بە خۆی پەیدا دەکردەوە و نیگای پرسیار ئامێزیان لێکدی هەڵدەنگوت و وەکو جاران بەجدی و کەم دابێژێک هەوەسامێز ئاوێتە بەیەکدی دەبوون.

لە ناکاوا هەستیکرد، شتێک لە ژێر مێزەکەوە بە نەرمی بەر لاقی کەوت. بە کاوەخۆ پای بردە پێشەوەو بەرپای ژنەی گەنج کەوت، بێئەوەی ژنەی گۆرین، پای بەرێتە دواوە. لەو دەمەدا قسەیان دەگەڵ یەکدیدا نەدەکرد، هەریەکەیان ئاوڕی لای هاومێزەکەی خۆیان دابووەوە.

دوروا، بە دڵێکی لەرزۆک و پڕ خورپەوە ئەژنۆی پتر بردە پێشەوە. ژنەی گەنج بە سووکە گوشارێکی ئەژنۆ وەڵامی دایەوە. هەنگێ بۆی بەدیارکەوت کە عەشقەکەیان دووبارە سەری هەڵداوەتەوە.

دوای ئەوە چییان بە یەکدی گوت؟ شتێکی گرینگ نەبوو، لێ هەرجارێ کە نیگای یەکدییان دەکرد، لێویان دەلەرزی.

دوروا، لە هەمان کاتدا، هەر بۆ مجامەلە جارجار قسەیەکی دەگەڵ کیژی سەرۆکەکەیدا دەکرد. ئەویش بە هەمان شێوازی دایکی وەڵامی دەدایەوەو هەر قسەیەکی بویستبا، بێ هیچ دوو دڵییەک دەیکرد.

ویکنتس دوپرس مور کە لە دەستە ڕاستی جەنابی ڤالترەوە ڕۆنیشتبوو، پۆزی شازادە خانمانی لێدەدا و،

دوروا، که کەیفی بە دیتنی ئەوەوە دەکرد، ، بە ئەسپایی لە خانم دوماریلی پرسی:

- تۆ ئەوەی دی دەناسی، ئەوەی گوتارەکانی بە نێوی خوازراوی " دومینو روز " ەوە بڵاو دەکاتەوە؟

- بەڵێ، بە تەواوەتی: لابارون دولیڤار!

- ئەویش لە هەمان قۆماشە؟

- نە، بەڵام بە هەمان ئەندازە کومێدییە. باڵابەرز، لاواز، شەست ساڵان، بەقژی لوول کراوی دەستکردەوە، ددانەکانی عەمەلین، بە هەمان نەفەسی تایبەتی دەورانی تازەکردنەوەی سەڵتەنەت و بە هەمان ئاڕایشی سەرو وەزعەوە.

- ئەرێ ئەم عاجباتیانەی دنیای ئەدەبیان لەکوێ ڕاو کردووە؟

- خەڵکانی تازە پێیا کەوتوو، هەمیشە پاشماوەی ئەرستۆکراتەکان دەدۆزنەوە و دەگرنەخۆ.

- هەر لەبەر ئەمە؟ هیچ هۆیەکی تری نییە؟

- هیچ.

ئەوسا گەنگەشە و باسێکی سیاسی لە نێوان بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە و دوو نوێنەری ئەنجوومەندا، نوربرد دوڤارن و جاک ریڤال دەستی پێکرد و تا کاتی خواردنی میوە وشیرینەمەنی بەردەوام بوو.

وەختایەک بۆ هۆڵەکە زڤڕینەوە، دوروا، دووبارە لە خانم دوماریل نزیک بووەوە و چاوی لە چاوی ئەو بڕی و پرسی: " حەز دەکەی ئەمشەو بتگەیەنمەوە ماڵەکەی خۆت؟ ".

- نە.

- بۆچی؟
- چونکە ئاغای لاروچ ماتیو کە هاوسامانە، هەرجارێ کە من لێرە دەعوەت بم دەمگەیەنێتەوە.
- ئەدی کەی بتبینم؟
- سبەینێ وەرە ڤراڤین پێکەوە بخۆین.

بێئەوەی هیچ قسەیەکی دی بکەن، لێکدی هاوێر بوون.

دوروا، کە کۆڕ ومەجلیسەکەی بەلاوە ڕوتینی بوو، زۆر نەمایەوە. کاتێ کە خەریک بوو بە پلیکانەکاندا دادەگەڕا، تووشی نوربردوڤارن بوو کە ئەویش خەریک بوو مەجلیسەکەی بەجێدەهێشت. شاعیری پیر باسکی ئەوی گرت. نها کە لە ڕۆژنامەکەدا هیچ ڕکابەری وهەڤرکییەکیان لە نێواندا نەبوو، هاوکارییان لە بواری تەواو جیاوازدا بوو، جۆرە نیازپاکییەکی باوکانەی سەبارەت بە دوروا دەنواند. لێی پرسی:- پیاسەیەکم لەگەلا دەکەی؟

دوروا بەرسڤی دایەوە:- بەسەرچاو مامۆستای ئازیز.

بە ئەسپایی و هێدی هێدی بە بولڤاری مالزورب دا کەوتنەڕێ. ئەوشەوە پاریس چۆڵ بوو، شەوێکی سارد بوو، لەو شەوانە بوو کە لە شەوانی دی درێژتر دێتە بەرچاو، ستێرانی ئاسمان بەرزتر دیارن. هەوا دەتگوت بەدەم کزەی ساردی خۆیەوە، شتێکی دوورەدەستی دەگەڵ خۆیدا دێنا.

لە ساتەکانی هەوەڵەوە کەسیان قسەیان نەکرد. پاشان دوروا بۆ ئەوەی بێدەنگییەکە بشڵەقێنێت، گوتی:

- ئەم لاروچ ماتیویە، کەسێکی زۆر بە ئاوەز و خوێنەوار دیارە.

شاعیری دان عەمر لەبن لێوانەوە گوتی: " وای دەبینی؟

دوروا، به سەرسامی ودوودڵی گوتی: " بەڵێ، من وای بۆ دەچم یەکێک بێ لە نوێنەرە بە وەج و بەدیمەنەکانی ئەنجوومەن. "

– دەشێت. لە شاری کوێرانا، یەکەڵە چاو پاشایە. ئەمانە هەرهەموویان خەڵکانی بودەڵەن، چونکە لە نێو دوو دیاردەدا پەروەردە بوون – پارە وسیاسەت – ئەمانە خەڵکانی فشەکەرن، هەڵەوەڕی فەزڵ فرۆشن، کە دەربارەی هیچ بابەتێک گەنگەشەیان دەگەڵ نایەتەکردن، هیچ بابەتێک کە بابەتی حەزی من و تۆ بێ. زانایی و هۆشمەندییان لە قوڵایی زێراباندایە، بە گوتەیەکی دی لەو شوێنەدایە کە گەمارو پیسی تیا کۆدەبێتەوە، وەکو ڕوباری سن لە ناوچەی ئانییر.

– ئاە، دۆزینەوەی پیاوی هزرڤان و خوێنەوار کارێکی دژوارە، پیاوێک کە بتوانێ هەستی ئاسۆیانی کراوە و هەوای ئازاد و تەڕ وتازە، وەکو ئەوەی لە کەناری دەریادا هەیە، لە ناخی بنیادەما دروست بکات. من چەند دانەیەکم لەوانە دەناسی، بەڵام حەیفێ مردوون.

نوربردوڤارن، بە دەنگێکی ساف و زوڵاڵ، بەڵام پارێزکارانە قسەی دەکرد، کە ئەگەر جڵەوی بۆ شل کردبا لە بێدەنگی شەوەکەدا، دەنگدانەوەیەکی تایبەتی دەبوو، تووڕە و خەمبار دەهاتە بەرچاو، لەو خەمبارییانەی کە هەندێجار لە گیانی هەستیار دەئاڵێت و وەکو زەوی ژێر سەهۆڵبەندان دەیانهێنێتە لەرزە.

درێژەی بە قسەکەی دا:

– بە چ دەچێ، بلیمەتی، کەمێک زیاتر یان کەمتر فەرق ناکات، چونکە ئاکامی هەموو شتێک هەر نەمانە.

یارۆی دان عەمر بێدەنگ بوو. دوروا کە ئەو شەوە سەرحاڵ و چالاک بوو، بەدەم بزەوە گوتی:

– ئەمشەو زۆر ڕەشبینی مامۆستاگیان.

یارۆی شاعیر بەرسڤی دایەوە:– هەمیشە شتەکان بە ڕەشی دەبینم کوڕی خۆم، پەلە مەکە تۆش چەند ساڵێکی دی دووچاری هەمان حاڵ دەبیت. ژیان وەکو گردێکە ئینسان تا ئەو کاتەی لە سەرکەوتن و هەڵگەڕاندایە خۆشحاڵە، لێ کاتێ کە دەگاتە سەرێ و، لەناکاوا چاوی بە سەرەولێژگە و بە کۆتایی کارەکە دەکەوێت کە مردنە. کاتێ مرۆڤ بەرەو سەرێ دەڕوات کات بەخاوی دەڕوات، بەڵام لە کاتی هاتنەخوارەوەدا، کات زور بە خێرایی دەڕوات. مرۆڤ، لە تەمەنی تۆدا شاد و خۆشحاڵە. ئارەزووی زۆرشتی هەیە کە پێیانیش ناگات. لە تەمەنی مندا ئیدی چاوەڕوانی هیچ ناکات... تەنیا مەرگ نەبێت.

دوروا، دەستی بەپێکەنین کرد: بەقسەکانی تۆدا گیانم هاتە لەرزین.

نوربردوڤارن، دووبارە گوتی:

– نا، ئەمڕۆ لە قسەکانم تێناگەی، بەڵام پاشان، ئەم قسانەی ئێستای منت بیر دەکەونەوە. ڕۆژێک دێ و، ئەو ڕۆژە بۆ زۆرکەس بەخێرایی دێ، کە پێکەنین تەواو بووە، چونکە لەپشت هەر شتێکەوە کە مرۆڤ تەمەشای دەکات، مەرگ دەبینێت. ئەم وشەیە بۆتۆ هیچ ناگەیەنێت، تۆ و مەرگ؟ لە تەمەنی خەڵکانی وەک تۆدا ئەم وشەیە هیچ مانایەکی نییە. بەڵام لە تەمەنی خەڵکانی من ئاسادا وشەیەکی ترسناکە. بەڵێ، بەشەر لە ناکاوا پەی بە چەمک و مانای ئەو وشەیە دەبات، بێئەوەی بزانێت چما و دەربارەی

چی، ئەوسا لە ژیاندا دیمەن و بەرجەوەنی هەموو شتێک دەگۆڕێ. من پازدە ساڵ دەبێ ئەمە لە خۆما دەبینم، هەست دەکەم لە کاردایە، دەڵێی حەیوانێکی قرتێنەر لە بوونمایە. بەرەبەرە مانگ بەمانگ و سەعات بە سەعات، پەیم بەبوونی بردووە کە خەریکە بەرەو هەرەس و داڕوخانم دەبات، تا وەکو ساختمانێکی کۆنە لە ناکاوا هەرەس بێنم. وەهای گۆڕیوم کە ئیدی خۆم ناناسمەوە. ئیدی من لێبوومەتەوە، هەرگیز پیاوە سەرحاڵ و چالاک و چەلەنگ و بەتین وتاوەکەی دەورانی سی ساڵیم نیم. شایەدی سپی بوونی قژە ڕەشەکەم بووم کە چەند بەخاوی و ژێراوژێر ڕەنگی دەگۆڕا، پێستی ساف، ماسولکەکانم، ددانەکانم و هەموو ئەو بەدەنەی کە جاران هەمبوو، لێمی سەندووتەوە، جگە لە ڕوحێکی نائومید، کە بەو نزیکانە ئەویشم لێ دەسێنێتەوە، هیچی تری بۆم نەهێشتووەتەوە. بەڵێ، ئەم حەیوانە ناڕەسەنە، پارچە پارچەی کردووم. کاری نابووتکردنی دوور ودرێژی بوونمی، بەنەرمی و ژێراوژێر، بە شێوازێکی نەفرەت ئەنگێز ئەنجام داوە. هەنووکە لە هەر کارێکا کە دەیکەم، مردن دەبینم. هەر هەنگاوێ دەنەم لەو، لە مەرگ نزیکم دەکاتەوە. هەر جووڵەیەکی من، هەر هەناسەیەکی من خێرایی بە کارە نەحس و شوومەکەی ئەو دەبەخشێت. هەناسەدان، خەوتن، خواردن، خواردنەوە، کارکردن، ڕامان و بە خەیاڵەوە چوون، هەرکارێ کە دەیکەین، ئەنجامەکەی مردنە. ئەنجام زننەگی کردنیش مردنە! ئاە، تۆ ئاخری پەی بەم شتانە دەبەی، ئەگەر تەنیا یەک چارەکە سەعات بیری لێبکەیتەوە، دەیبینی. ئیدی چاوەڕوانی چیت؟ عەشق؟ چەند ماچ وڕاموسانێکی دیکەیە و ئیدی لە تاقەت دەکەوی. ئێ،

دوایی؟ پارە؟ بۆ چ کارێک؟ بۆ خەرج کردن لە ژنان؟ بەدەست هێنانی شادمانی دڵگیر؟ بۆ زۆر خواردن، قەڵەو بوون و شەو تابەیانیناڵین بەدەست ئازاری جومگەکانتەوە؟ چیتر؟ شۆرەت؟ وەختێ بەشەر نەتوانێ بە عەشقەوە بەدەستی بێنێت، بە کەڵکی چی دێت، بەچی دەچێ؟ ئێ، دوای ئەمانە چی؟ دیسان ئاقیبەتی هەموو شتێک مەرگە. من حاڵی حازر، یەک لەباری خۆم، ئەوەندە لە نزیکەوەی دەبینم، کە زۆربەی جار حەز دەکەم دەست بەرمە پێشێ و لە خۆمی دوور بخەمەوە. زەوی دادەپۆشێ، ئاسمان پڕ دەکات. لە هەموو شوێنێک دەیبینم. ئەو حەیوانە بچووکانەی لە سەر جادەکان پلیشاونەتەوە، ئەو گەڵایانەی لە لق وپۆپی درەختەکانەوە، دەڕژێن، ئەو مووە سپیانەی بە ڕدێنی بابایەکی دۆستەوە دەی بینم، هەموو ئەمانە دڵم نابووت دەکەن، هاوارم بەسەردا دەکەن: " لێرەیە! " هەرچییەکم حەز لێیە، هەر کارێ دەکەم، هەرچییەک دەبینم، هەرچییەک دەخۆم و دەخۆمەوە، هەرچییەکم حەز لێیە، هەیڤ، هەڵاتنی هەتاو، پانایی دەریا، ڕۆخانانی جوان و هەوای فێنکی شەوانی هاوین، کە ڕوح فێنک دەکاتەوە، ئاوپرژێنی دڵ دەکات، هەرهەموو ئەمانەم لێدەسەنێتەوە!

شاعیری دان عەمر، بە هەناسەبڕکێیەکی کەم و بە هێمنی ڕێی دەکرد، بە دەنگی بەرز خەون و خەیاڵەکانی دەگێڕایەوە، ئەوەی بیر نەمابوو کە کەسێک گوێ لە قسەکانی دەگرێت.

دووبارە گوتی: " هیچکەسێکیش دوای مردن ناگەڕێتەوە، هەرگیز... قاڵبی پەیکەرەکان هەڵدەگرن، چەند جاریان بوێ، بەو قاڵبە هەمان شت دروست دەکەنەوە، بەڵام بەدەنی من،

ڕوخسارم، هزرم، خواست و خولیاکانم هەرگیز تازە نابنەوە. وێڕای ئەمەش، میلیۆنەها و ملیاردەها بەشەر لەدایک دەبن کە لە سەر ئەو چەند سانتیمە چوارگۆشەیەی دەم وچاویان، کەپوویەک، چاوانێ، هەنیەیەک و گۆنا و دەمێکی وەکو هی من هەیە، روحێکی وەکو ڕوحی منیان هەیە، بێئەوەی من هەرگیز بۆ ژیان بگەڕێمەوە، بێئەوەی من هەرگیز بۆ ژیان بگەڕێمەوە، بێئەوەی هەرگیز بەشیکی دیاریکراو لە بوونی من ولەم بوونەوەرە بێ شومار و جیاوازانەدا، یەجگار جیاوازانەدا، هەرچەندە بە ڕواڵەت دەشوبهێنە یەکدی، دووبارە ببێتەوە. بەشەر دەستەو دامێنی کێ بکەوێ، بکەوێتە خاک وپای کێ؟ هاواری ناکامی و نائومێدی داوای کۆمەک بەرێتەبەر کێ؟ ئاخر باوەڕ بەچی بکەین، متمانە بەکێ بکەین. من باوەڕم بە هیچ ڕێبازێک نییە، بەو قانوونە ئەخلاقیە مندالانەیە وبەو بەڵێنە خۆپەرستانانەیان. تەنیا مەرگە کە هیچ گومان و دوودڵییەک هەڵناگرێ.

شاعیری دان عەمر وەستا، بە هەردوو دەست یەخەی پاڵتۆکەی دوروای گرت و بە ئەسپایی گوتی:

– پیاوی گەنج، بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەوە. ڕۆژان، هەیڤان و ساڵان بیر لەم مەسەلانە بکەرەوە. ئەوسا بوون بە جۆرێکی دی دەبینی. هەوڵبدە خۆت لە چنگی هەموو ئەو شتانەی گیرۆدەیان کردوویت ڕزگار بکە، ئەم هەوڵە زەحمەتە بۆ دەرچوون لە جەستە یان لە بەرژەوەندییەکانتان، لە هزر وبیرەکانتان و لە هەموو بەشەریەت بدەن، بۆ ئەوەی تەمەشای شوێنێکی دیکە بکەی،

هەنگێ تێدەگەی شەڕی نێوان ڕۆمانتیکەکان و ناتوارلیستەکان[1] چەند بێبایەخە و هەروەها باسی بودجە.

بە هەنگاوی هەڕاو کەوتە ڕێکردن.

- هەروەها هەنگێ پەی بەبێ هیوایی ڕەهای خەڵکانی بێ ئومێد دەبەی. وێڵ و سەرگەردان، دەگەڵ دوو دڵیاندا دەست وپەنجە نەرم دەکەی. بەهەموو لایەکا هاوار دەکەی: " کۆمەک " و هیچکەسیش وەڵامت ناداتەوە. دەستەکانت درێژ دەکەی تا کۆمەکت بکەن، خۆشیان بوێی، دڵخۆشیت بدەنەوە، ڕزگارت بکەن، لێ کەس بەدەنگ و هاوارتەوە نایەت. بۆچی بەم جۆرە ڕەنج دەبەین؟ لەبەر ئەوەی بێگومان بەجۆرێ خوڵقێنراوین کە جەستەمان دەتوانێ زەمانێکی زیاتر بژی و ڕوحمان زەمانێکی کەمتر، بەڵام ئەوەندەمان بیرکردووەتەوە، ئیدی هیچ هیچ هاوئاهەنگێک لە نێوان هۆشمەندی پەرەسەندوومان و هەلومەرجی نەگۆڕی ژیانمان نەماوە. تۆ تەمەشای ئەم خەڵکە بودەڵەیە بکە: ئەگەر کارەساتێکی گەورەیان بەسەر نەیەت، لە ژیانی خۆ ڕازین، بێئەوەی بەنەگبەتی و بەدبەختی خەڵکانی دی ناڕەحەت بن. حەیوانیش واهی نین.

دووبارە وەستا، چەند چرکەیەک لە فکران ڕاچوو، ئەوسا بە قەڵافەتێکی شەکەت وملکەچانەوە لە سەری ڕۆیی:- من کەسێکی لە دەست چووم. نە بابم هەیە، نە داک، نە برا، نە خوشک نە ژن، نە منداڵ و نە خوا.

---

[1]- ئاماژەیە بۆ کێشماکێشی نێوان لایەنگرانی رومانتیزم کە ڤیکتۆر هۆگۆ دامەزرێنەری بوو و ناتورالیستەکان کە زولا و برناردن رووسن پییر، لایەنگر و پەیڕەوانی بوون.

دوای سووکە بێدەنگییەک دووبارە گوتی: من تەنیا کێش وقافیەم هەیە. ئەوسا سەری ڕوو لە ئاسمان هەڵبڕی کە مانگی چواردە بە حەوێقی ئاسمانەوە دەدرەوشایەوە وگوتی:

" من لە جسوجۆی واژەی ئەم مەسەلە ئاڵۆزەم ".

" لە ئاسمانێکی تاریک و خاڵیدا کە ئەم گۆیە ڕەنگزەردە مەلەی تیا دەکا. "

گەیشتنە پردی کنکورد. بەبێدەنگی بەسەریا پەڕینەوە. ئەوسا بەقەراخ پالەبوربون دا ( پالە بوربون: کە لە خوار مەیدانی کنکورەوەیە، بەر لە شۆڕش، لە ساڵی ١٧٢٢ دا بۆ دوشس دو بوربون دروست کراوە و حاڵی حازر بارەگای ئەنجوومەنی شورای نەتەوەیی فەرەنسایە. ) درێژەیان بە ڕێی خۆ دا. نوربردوڤارن، دووبارە دەستی بەقسان کردەوە:

– ژن بێنە دۆستی من. تۆ نازانی تەنیایی لەم تەمەنەی مندا چ مانایەکی هەیە. تەنیایی حاڵی حازر، دووچاری نیگەرانییەکی ترسناکم دەکات، تەنیایی لە ماڵەوە، لە پاڵ سۆپادا، لەکاتی شەوا. واهەستدەکەم تەنیا من لەم دنیایەدا هەم، بەڵام مەترسی نادیار، شتێن گونگ و ترسناک، وەکو دیوار دەوریان داوم کە من لە دراوسێکەم کە نایناسم، بە ئەندازەی ئەو ئەستێرانەی کە لە پەنجەرەکەوە دەیانبینم، دوورم دەخاتەوە. جۆرە دەرد ودڵە ڕاوکەیەک بەرۆکم دەگرێت، دەرد ودڵەڕاوکەی ترس و، بێدەنگی دیوارەکان دەمترسێنن. بێدەنگی ئەو ژوورەی کە بەشەر بە تەنیا تیایدا دەژی، زۆر قووڵ و گەلێک خەمناکە. تەنیا بێدەنگییەکی دەوری جەستەی بەشەر نییە، بەڵکو بێدەنگییەکە کە گەمارۆی ڕوحیشی داوە، کە دەنگی کورسییەک دێ، پیاو لە

ناخی ناخەوە دڵی دادەلەرزێ، چونکە لەم ماڵە خەمناکەدا، چاوەڕوانی هیچ دەنگێک نییە.

دیسان بێدەنگ بوو و دووبارە لە سەری ڕۆیی:- کە بەشەر پیر دەبێ، منداڵان نیعمەتن، منداڵ بۆ تەمەنی پیری نیعمەتن.

گەیی بوونە ناوەڕاستی شەقامی بورگونی. شاعیری دان عەمر، لە بەردەم خانوویەکی بەرزا وەستا، لە زەنگی دا، تەوقەی دەگەڵ دوروادا کرد و گوتی: - ئەم هەلەق ومەلەقە پیرەمێردانەیە لە بیر خۆت بەرەوەو، بە گوێرەی تەمەنی خۆت بژی، دەی خاترا تە.

لە ڕاڕەوە تاریکەکەی خانووەکەدا ون بوو.

دوروا، بە دڵێکی گیراوەوە درێژەی بە ڕێگەی خۆی دا. وای هاتە بەرچاو چاڵێکی پڕ ئێسقانیان نیشانداوە، چاڵێک کە بیەوێ و نەیەوێ، خۆشی بێ و ترشی بێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر دەبێ تێی بکەوێت. لەبن لێوانەوە گوتی: " شەیتان بە نەعلەت بێ، ماڵەکەی نابێ شوێنێکی خۆش بێ... هیچ حەزناکەم، شەریکایەتی بیرکردنەوەکانی بکەم. "

لە ناکاوا وەستا، تا ڕێگەی ئەو ژنە بۆنخۆشە بکات کە تازە لە گالیسکە دابەزی بوو و دەیویست بچێتە ماڵەکەی خۆیەوە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەوپەڕی تاسە وتامەزرۆییەوە بۆنە دڵگیرەکەی ئەوی هەڵمژی. لە ناکاوا دڵ ودەروونی پڕ بوو لە شادی و ئومێد، یادی خانم دوماریل، کە سبەینێ ژوانیان هەبوو، سەراپای داگرت.

هەموو شتێک بە ڕووییەوە پێدەکەنی، ژیان بە میهرەبانییەوە دەهاتە پێشوازی، بەڕاستی هاتنەدی ئارەزوان خۆشە. بە سەرمەستی خەوت، بەیانی زوو لە خەو ڕابوو و

بڕیاریدا پێش ئەوەی بەرەو ژوانگەکەیان بڕوات، پیاسەیەک بە شەقامی بوادوبولونیدا بکات.

دوێشەو بایەکەی خستبوو، هەوا خۆشتر بووبوو. هەتاو هەمان گەرمی خۆش ودڵگیری مانگی نیسانی هەبوو. هەموو ئەوکەسانەی کە عادەتیان وابوو، لە بێشەدا پیاسە بکەن، ئەم بەیانییە دەعوەتی ئاسمانی ساف و جەوە دڵگیرەکەیان قەبووڵ کردبوو و لە ماڵ هاتبوونە دەرەوە.

دوروا، بە کاوەخۆ ڕێی دەکرد و پڕ بە سییەکانی هەوای سووک و خۆشی ئەو ڕۆژە بەهارییەی هەڵدەمژی. لە تاقی سەرکەوتنی ئەتوال تێپەڕی و بە سەمتی پێچەوانەی حەرەکەتی ئەسپ سوارەکانەوە خۆی بە شەقامە گەورەکەدا کرد. تەمەشای ئەو پیاو و ژنانەی دەکرد کە سواری ئەسپ بووبوون و بە یورغە یان چوارناڵە دەڕۆیشتن. پیوان وژنانی دەوڵەمەند و ئەرستوکراتی کە ئێستا وەکو جاران حەسوودی پێنەدەبردن و خۆزیای پێنەدەخواستن. ئێستا هەموو ئەوانەی کەم و زۆر بەناو دەناسی، ئاگای لە ڕادە وئاستی دەوڵەمەندییان هەبوو، هەروەها مێژووی پەنهانی ژیانشیانی دەزانی، چونکە کارە تازەکەی وای لێکردبوو، کە ببێ بە ئەرشیڤداری ژیانی خەڵکانی بناڤ و دەنگ و واریقات و بویەرە بە هەراوهەنگامەکانی پاریس و پاریسیان.

ژنانی ئەسپ سوار، بە ئەندامی شووش و باریک و بە جلکی ڕەش و کەمەر تەنگەوە تێدەپەڕین. ئیدی ئەو حاڵەتی قۆرە دەماغی و لووت بەرزیەی کە ژنانی ئەسپ سوار هەیانبوو، بە قەڵافەت و سیمایانەوە دیاربوو. دوروا، بە ناوبردنی ناو، عینوان و تایبەتمەندییەکانی گراوێکانی جارانی یان ئەوانەی ئێستای لەبن لێوانەوە، دەتگوت لە کڵێسا دا

وێرد و دوعایان دەخوێنێ، زۆر دڵی خۆش دەبوو، هەندێجار لە بری ئەوەی بڵێت:

بارون دو تانکلە.

پرنس دولاتور ئانگران

لە بن لێوانەوە دەیگوت: و لە نێو ژنانی هاوڕەگەزباز!

لویز میشو، لە تەمەشاخانەی ڤودڤیل

روز مارکتن، لە ئوپرا.

زۆری لەزەت، لە گەمەکردن بەو ناوانە دەبرد، دەتگوت لە ژێر پەردەی بە ڕواڵەت جدی و سەنگینی ئەواندا، بەدناوی هەمیشەیی وقووڵی تیرەی بەشەری دەبینی، ئەم بابەتە خۆشحاڵی دەکرد، دەی هاڕوژاند، دڵخۆشی دەدایەوە.

ئەوسا بە دەنگی بەرز گوتی: " هەی فێڵبازینە! " چاوی بۆ ئەو سوارانە گێڕا، کە مقۆمقۆی نەنگینی زیاتریان بە دواوە بوو. ناوی زڕاویان بووبوو بە داستانی سەر زاران.

زۆری لەوانە بینی کەوا گومان دەکرا لە قومارا فێڵ دەکەن و کۆڕی قومار سەرچاوەی گەورەی دەرامەت و داهاتیان بوو، تاقە سەرچاوەی دەرامەت و هەڵبەتە گوماناویان بوو.

ژمارەیەکی دی کە زۆر ناسراو بوون، بە دەرامەتی موڵکی ژنەکانیان ژیانیان دەگوزەراند، هەموو خەڵکی ئەمەیان دەزانی، ئەمە لە کەس شاراوە نەبوو، هەندێکی دیکە بە سەرچاوەی دەرامەتی گراوی و ماشقەکانیان دەژیان وئەمە مەعلومی خاس وعامی خەڵک بوو. خەڵکانێکی زۆر قەرزەکانیان دابووەوە( کارێکی ئابڕوومەدانە بوو )بێئەوەی هیچ کەسێک بزانێ پارەی ئەم کارەیان چۆن بەدەست هێناوە(ڕازێکی تەواو گوماناوی بوو) خەڵکانێکی مامەڵەچی

بینی کە سەروەتە زۆرەکەیان، لە هەوەڵی ڕا، بە دزی وفزی پەیداکردبوو و، لە هەموو ماڵە ئەشرافی و ئەرستۆکراتەکاندا بە باوەشی کراوەوە، پێشوازی دەکران. ئەوسا پیاوانێکی بینی هێندە مایەی ڕێز و حورمەت بوون، هێندە خۆشناو وناوبانگ بوون، کە خەڵکانی ڕەش وڕووت هەموو ڕۆژێک بەرخوردیان دەگەڵ دەکردن وفەند وفێڵی بێ شەرمانەیان، لە نەخشە و پلانی ئابووری گەورەی نەتەوەییدا، لەو کەسانەی کە ئاگاداری بنج وبناوانی کاران بوون، نە شاراوە بوو ونە بە ڕاز دەژمێردرا.

هەرهەموویان لووت بەرز، قۆرە دەماغ و لە خۆبایی و چاوحیز بوون. چ ئەوانەی مووی لا جانگیان درێژ کردبووەوە و چ ئەوانەی سمێڵیان بەردابووەوە.

دوروا پێدەکەنی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت و دەیگوتەوە: دزینە، فێڵبازینە.

لە هەمان ساتدا گالیسکەیەکی سەرکراوەوجوان دوو ئەسپی سپی ناوقەد باریکی لە ژێرا بوو، بە یورغە نزیک بووەوە، یاڵ و کلکی ئەسپەکان، بەهۆی خێراییەوە، لە هەواکەدا سەمایان دەکرد. ژنێکی گەنجی قژ زەرد و ئەندام وردیلە گالیسکەکەی داژۆت و دوو کوڕێژکەش لە دوایەوە دانیشتبوون. یەکێک بوو لە سوتلی و ڕووسپییە بە نێوبانگەکانی پاریس. دوروا. وەستا، حەزیدەکرد سڵاوی لێبکات وئەم تازە پێیا کەوتووەی دنیای عەشق، کە لەو سەعاتە تایبەتیەی گەشت وگەڕانە ئەشرافیە ڕیا بازانە دا، بەو گۆساخی و کەشخەییەوە کە لە ڕێگای خۆفرۆشییەوە بە دەستی هێنابوو، خۆنوێنی دەکرد، مەدح وستایش بکات.

پێدەچوو بە شێوەیەکی هەندێک گۆنگ و ئاڵۆز، هەست بەوە بکات کە جۆرە لێکچوونێک لە نێوان خۆی و ئەودا هەیە، پەیوەندییەکی ئاسایی، کە هەردووکیان لە یەک قوماش و لە هەمان تەبیعەتن و، سەرکەوتنەکانی خۆشی بە هەمان ڕێگەکانی ئەو ژنە گەنجەوە بەدەست هاتوون.

بە هەنگاوی سووکتر وبەدڵێکی سەرڕێژ لە شادی، بە هەمان ڕێگای خۆیدا گەڕایەوەو کەمێک زووتر لە قەرار و مەدارەکەیان گەییە بەر ماڵی ماشقەکەی.

کلوتیلد، بەباوەشی کراوەوە پێشوازی کرد، ماچی کرد، لە تۆ وایە هیچ شتێک لە نێوانیاندا ڕووی نەداوە، تەنانەت ئەو تۆزە پارێزە ئاقڵانەیەشی، کە جاران لە ماڵەکەی ئەودا ڕەچاوی دەکرد، لەبیر خۆ بردەوە. ئەوسا بەدەم ماچکردنی سمێڵە بادراوەکانیەوە گوتی:

– دەزانی چ گرفتێکم بۆ هاتووەتە پێشێ گیانەکەم؟ خۆم بۆ مانگێکی هەنگوینی خۆش دەگەڵ تۆدا ئامادەکردبوو و هەنووکە مێردەکەم بۆماوەی شەش هەفتە لێم بووە بەمووی لووت، مۆڵەتی شەش هەفتەی وەرگرتووە. بەڵام من نامەوێ شەش هەفتە بە بێ تۆ بەسەر بەرم، بەتایبەتی دوای ئەو سووکە ساردییەی کە کەوتە بەینمانەوە. نەخشەیەکم بۆ دۆزیوەتەوە. دووشەممە تۆ دەعوەتی شام دەکەم، پێشتر باسی تۆم بۆ کردووە، بە یەکترتان دەناسێنم.

دوروا، بە دوو دڵی، کەمێک پرینگایەوە، چونکە قەت لە گەڵ ئەم پیاوەدا، کە ژنەکەی داگیرکردبوو، یەکیان نەبینی بوو. دەترسا بە هۆی ڕەفتاری، گوتاری، نیگایەکەوە، یان نیگەرانییەکەوە دەستەکەیان بکەوێتەڕوو. بە دەمەلاڵکێوە

گوتی: ˝ نە، حەز ناکەم ناسیاوی لە گەڵ مێردەکەتدا پەیدا بکەم. ˝ ژنەی گۆرین کە بەوپەڕی سەرسامی لە بەردەمیا وەستابوو و، بە نیگایەکی ساکارانە سەراپای دادەبێژت، بە مکووڕی پرسی: ˝ باشە بۆ؟ ئەم کارە چی تیایە؟ شتی وا ڕۆژانە ڕوودەدات، هەرگیز تەسەورم نەدەکرد تۆ ئەوەندە ساویلکە بیت. ˝

دوروا، کە ئەم قسەیە تەنگەی گرتبوو گوتی:- باشە، دووشەممە، بۆ شام دێم.

ژنەی گۆرین گوتی:- بۆ ئەوەی میوانییەکە شەقڵی ئاسایی وەربگرێت، فورستیە و ژنەکەشی دەعوەت دەکەم، هەرچەندە حەزناکەم کەس بۆ ماڵەوە دەعوەت بکەم.

دوروا، تا دووشەممە زۆر بیری لەم دیدارو دەعوەتە نەکردەوە، لێ لەو دەمەدا کە خەریکبوو، بە پلیکانەکانی ماڵی خانم دوماریلدا سەردەکەوت، هەستی بە شپرزەیی وپەشۆکانێکی سەیر دەکرد، نەک لەبەر ئەوەی کە تەوقە دەگەڵ ئەم مێردەدا بکات، شەرابەکەی بخواتەوەو نمەکی ماڵەکەی بکات و دووچاری عەزابی ویژدان ببێ، بەڵام لە شتێک دەترسا کە خۆیشی نەیدەزانی چییە.

بۆ هۆڵی پێشوازی براو وەکو هەمیشە لەوێ بەدەم چاوەڕوانییەوە دانیشت. پاشان دەرگای ژوورەکە کرایەوە و پیاوێک بە ڕدێنێکی سپیەوە، بە قەڵافەتێکی سەنگینەوە، میداڵ و نیشان بەبەرۆکەوە، بە نەزاکەتێکی گومان ئامێزەوە بەرەو ڕووی هات:- ژنەکەم زۆری بۆم باسکردوویت، ئاغا، منیش بە دیدارتان خۆشحاڵم.

دوروا، که هەوڵی دەدا زۆر جدی و بەڕێز بێتە بەرچاو، بەرەو ڕووی چوو، زۆر بە گەرمی تەوقەی دەگەڵ خانەخوێیەکەیدا کرد. پاشان کە دانیشت، هەرچی کرد وکۆشا، قسەیەکی بۆ نەهات کە سەری قسانی پێبکاتەوە.

ئاغای دوماریل، پارچە چیلکەیەکی خستە سۆپاکەوە و پرسی:- لەمێژە خەریکی کاری ڕۆژنامەوانیت؟

دوروا بەرسڤی دایەوە:- نا، چەند مانگێکە.

- ئەها! کەواتە زۆر بەخێرایی چوویتە پێش.

- " بەڵێ تا ڕادەیەک خێرا. " ئەوسا، بە هەوای خۆی، بێئەوەی بیر لەو شتە بکاتەوە کە دەیگوت، دەستی بەقسان کرد، قسەیەک لێرەو یەکێک لەوێ، لەو قسە ڕۆتینیانەی کە عادەتەن لە نێوان دووکەسی نەناسدا دەکرێن. بەرە بەرە خاترجەم دەبوو وتەنانەت ڕەوشەکەشی بەلاوە ئاسایی دەبوو، تەمەشای سەروسیمای سەلار وسەنگینی ئاغای دوماریلی دەکرد و هەرچەندە پێکەنینی دەهات، بەخۆی گوت: " کڵاوی قورمساغیم لە سەر ناویت، دۆستی ئازیز. " خۆشحاڵییەکی جدی ئاوێتە بە گەندەڵییەک داخزییە دڵ و دەروونییەوە، شادمانی و خۆشحاڵی دزێک کە لە کارەکەیا سەرکەوتوو بووبێ و بە سەر دزییەکەیەوە نەگیرابێ، و جۆرە ئۆخژنێکی ڕیاکارانەی لە دڵ و دەروون گەڕابێ. لە ناکاوا حەزیکرد، ببێ بە دۆستی ئەم پیاوە، متمانەی بەدەست بێنێ، واداری بکات، مەسەلە تایبەتیەکانی ژیانی خۆی بۆ ئەم بگێڕێتەوە.

خانم دوماریل، لە ناکاوا وەژوور کەوت، لە هەوەڵەوە نیگایەکی خەندانی هەردووکیانی کرد، ئەوسا چوو بۆلای

دوروا کە زاتی نەکرد، لە بەردەم ئاغای دوماریل دا، وەکو هەمیشە دەستی خانم دوماریل، ماچ بکات.

ژنەی گەنج، شاد وئارام بوو، وەکو کەسیک بە هەموو شتێک ڕاهاتبێ، ئەم دیدارە دەگەڵ حیلەبازی و ڕاشکاوی ئەودا تێکی دەکردەوە و ئاسایی دەهاتە بەرچاو. " لورین " ش هاتە ژوورەوە، شەرمنتر، بەپارێزتر لە هەموو جارەکانی دی چوو بۆلای دورواو هەنیەی بردە پێشەوە تا ماچی بکات، لە حوزووری بابی دەترسا. دایکی گوتی: " چی بووە؟ ئەمڕۆ بە بیل ئامی بانگی ناکەیت؟ " کچۆڵەی تاین سووری سوور بووەوە، وەکو یەکێک بێ حورمەتییەکی گەورەی کردبێت، نهێنییەکی درکاندبێ کە نەدەبوو بیدرکێنێت، یان ڕازێکی تایبەتی وکەمێک گوناح ئامێزی بە خەڵکی گوتبێت.

وەختایەک فورستیە و ژنەکەی هاتن، هەمووان کە شارلیان بەو حاڵ و ڕەوشە بینی ترسان. لە زەرفی یەک هەفتەدا زۆر لاواز بووبوو، ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، بەردەوام دەکۆکی. فورستیە دووپاتی کردەوە کە پێنج شەممەی ئاییندە لە سەر داوای دکتۆر بۆ کان دەڕۆن.

زۆر زووش هەستان و کوڕەکەیان بەجێهێشت. دوروا سەرێکی لەقاند و گوتی:- " بە باوەڕی من حاڵی زۆر بێ حاڵە، باوەڕ ناکەم زۆر بژی. "

خانم دوماریل، قسەکەی بۆ سەلماند: " حەیفێ! زۆری بە بەرەوە نەماوە، ڕەنگی مردووی لێنیشتووە! بەختی هەیە کە ئەو ژنەی بەنەسیب بووە. "

دوروا پرسی:- ژنەکەی زۆری پێڕا دەگات؟

- هەموو کارەکانی بۆدەکات. ئاگای لە هەموو شتێک هەیە، خەڵکانێکی زۆر دەناسێت، بێئەوەی نیشانی بدات زۆر

ئەم و ئەو دەبینێت، هەرچییەکی بوێ، وەکو خۆی دەیەوێ وهەرگاڤێ بیەوێ بەدەستی دێنێ. لە هەر ژنێکی دی زیرەکترو، تیژفامتر، بەفێڵ وتەگبیرترە. بۆ پیاوێک بیەوێ پایە وپێگەیەک بە دەستبێنێ، گەنجینەیەکە لەو گۆرە.

جۆرج دووبارە گوتی:- هەڵبەتە دوای مردنی ئەو دووبارە شوو دەکاتەوە.

خانم دوماریل، بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، تەنانەت پێم سەیر نییە ئەگەر لە ئێستاوە کەسێکی بۆخۆ دانابێ، بۆ نموونە نوێنەرێکی ئەنجوومەن... مەگەر ئەوەی... ئەو پیاوە نەیەوێ... چونکە... چونکە... لەوەیە لەمپەڕ و کۆسپی ئەخلاقی زۆری لە ڕێگا بێ... ئێ ئیدی، لەوەی پتر هیچ نازانم.

ئاغای دوماریل، بە پەستی و بێ حەوسەڵەییەوە و بەدەم بۆڵەبۆڵەوە گوتی:

- تۆ هەمیشە ئینسان دەخەیە گومانەوەو، منیش حەزم لەم بابەتە نییە. نابێ هەقمان بەسەر کاری خەڵکییەوە هەبێت، خوادەکات ویژدانی خۆمان بۆ دەپارێزرێ، ئەوەمان بەسە. ئەم قسەیە دەبێ یاسا و ڕێسایەکی گشتی بێ بۆ هەموو کەسێک.

دوروا، بەدڵێکی پەشێواوو هزر وبیرێکی پەریشان لەماڵی وان وەدەرکەوت. سبەینێ چوو بۆ دیدەنی فورستیە وهاوسەرەکەی. تازە لە کۆکردنەوە وبەستنی جانتاکانیان بووبوونەوە. شارل، لە سەر قەنەفەیەک ڕاکشابوو و هەناسەی زۆر توند بوو، بە دەم هانکەهانکەوە دەیگوت: " دەبوایە مانگێ لەمەوپێش ئەم سەفەرەمان بکردبایە. " ئەوسا زنجیرەیەک ئامۆژگاری سەبارەت بە ڕۆژنامەکە بە دوروا

دا، هەرچەندە، هەرچەندە پێشتر قەراری هەموو شتێکی دەگەڵ ئاغای ڤالتر دا کردبوو.

وەختایەک جۆرج دەیویست بڕوات، دڵسۆزانە تەوقەی دەگەڵ دۆستەکەیدا کرد وگوتی: " دەی، هاوڕێ، بە هیوای دیدار! "

بەڵام کاتێ کە خانم فورستیە ئەوی تابەر دەرگا بەڕێکرد، بە هەڵچوونەوە پێی گوت: " خۆ ئەو پەیمانەت لە بیر نەکردووە کە بەیەکمان دابوو؟ ئێمە دۆست و ئاشناین، وانییە؟ ئەگەر هەر پێویستیەکت بە من هەبوو، بێ هیچ دوو دڵییەک، یەک نامە یان بروسکەیەک بەسە، بۆ ئەوەی یەکسەر بگەمە خزمەتتان. "

ژنەی گەنج بە ئەسپایی گوتی: " مەمنوونم، لە بیرت ناکەم. "

نیگای، بە شێوەیەکی قووڵتر ودڵگیرتر، پێی گوت: " مەمنوونم. "

دوروا، لە کاتێکا دەچووە خوارێ، لە سەر پلیکانەکان تووشی ئاغای دوڤیدریک بوو کە بە خاوی دەچووە سەرێ. جارێک لە هەوەڵەوە لە ماڵی فورستیەدا ئەوی بینی بوو. کۆنت غەمگین بوو- پێدەچوو خەمباری سەفەرەکەی ئەوان بووبێ؟

دوروا، بۆ ئەوەی وێڵ وماریفەت بنوێنێ، ڕاستگۆیانە سڵاوی لێکرد. فیدریک، خاکیانە ولە هەمان کاتدا بە کەمێک فڕناخییەوە، سڵاوەکەی سەندەوە.

فورستیە و ژنەکەی شەوی پێنج شەممە حەرەکەتیان کرد.

( ٧ )

سەفەر و ڕۆیشتنەکەی شارل، پایە و پێگەیەکی گرینگتری بۆ دوروا لە ئەنجوومەن و دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەدا ئیجادکرد. چەند وتارێکی بنەڕەتی و سەرەکی بەناو وئیمزای خۆیەوە بڵاوکردەوە، ئەمە جگە لەوەی کە بەشی کورتە هەواڵەکانیشی بەڕێوە دەبرد، چونکە سەرۆک حەزیدەکرد هەرکەسە، مەسئولیەتی ئەو شتە هەڵگرێت کە دەینووسی. هەندێ باس و گەنگەشان هاتنەپێشەوە، کە بە زیرەکی توانا و شایستەیی خۆی سەلماندو، پەیوەندی وتەماسی هەمیشەیی دەگەڵ بەرپرسان و پیاوانی دەوڵەتدا، بەرەبەرە قاڵی کردەوە کە ئەویش شرۆڤەکارێکی سیاسی لەزەبر و ڕۆشنبینی لێدەرچێت.

تەنیا یەک کۆسپ لە ئاسۆی کارەکەیدا هەبوو. ڕۆژنامەیەکی بچووکی دژبەر، بەردەوام هێرشی دەکردە سەر ئەو، یان لە ڕاستیا ئەوی کردبوو بە بیانوو بۆ هێرشکردنەسەر بەشی کورتە هەواڵەکانی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز یان لە ڕاستیا خودی ئاغای ڤالتریان مەبەست بوو. ئەم ڕۆژنامەیە ناوی لایلوم بوو. هەموو ڕۆژێک وتارێن تەنز ئامیز و بەتەوس و توانج و پڕ پەلاری بڵاو دەکردەوە.

ڕۆژێک جاک ریڤال پێی گوت: کە بنیادەمێکی بە سەبر وحەوسەڵەی.

دوروا، بە دەمە لاڵکێوە گوتی: " دەتەوێ چ بکەم، خۆ ڕاستەوخۆ هێرش ناکاتە سەر من. "

بەڵێ، ڕۆژێ کە خۆی بەهۆڵی ئەنجوومەن و دەستەی نووسەراندا کرد، بوارنار، نوسخەیەکی ئەو ڕۆژەی " لاپلوم " ی دایە دەست.

– فەرموو، دیسان وتارێکی ناخۆش بەلای تووە.

– ئاه! دووبارە چییە؟

– هیچ، باسی خانمێکە بە نێوی ئوبرا، کە لە لایەن مامورانی دژە گەندەڵییەوە دەستگیر کراوە.

جۆرج، ڕۆژنامەکەی لە دەست هاوکارەکەی وەرگرت و وتارەکەی، کە مانشێتەکەی " دوروا، ڕادەبوێرێ " بوو، خوێندەوە:

" ڕیپۆرتەری بە ناوبانگی لاڤی فرانسز ئەمڕۆ پێی ڕاگەیاندین کە خانم ئوبر، کە ئێمە هەواڵی دەستگیر کردنیمان لەلایەن مامورانی دژە گەندەڵییەوە، بڵاوکردبووەوە، هیچ بوونێکی واقیعی نییە و زادەی خەیاڵ و خەیاڵدانی ئێمەیە. بەڵێ، خانمی ناڤبری لە ژمارە هەژدە، جادەی ئیکوروی، گەڕەکی مونمارتر دەژی. ئێمە چاک دەزانین کە کارمەندانی بانکی ڤالتر چ بەرژەوەندییەکیان لەوەدایە کە داکۆکی لە بەرژەوەندییەکانی سەرۆکی پۆلیس بکەن، کە چاوپۆشی لە ئاین و ئۆینەکانی وان دەکات. لێ ئامدەکار و ڕیپۆرتەری ئەم بەشە، واچاکترە، چەند دانەیەک لەم هەواڵە باشانەی کە هەرا وهەنگامە وئاشوب دەنێتەوەو سەرەداوەکانیان لە دەستی ئەودایە، بە ئێمەش بدات: هەواڵ وخەبەرانێکی پەیوەست بە مردنەوە کە بۆ سبەی بە درۆ دەخرێتەوە، ئەو پێکدادانانەی کە لە ئیجادی ڕوویان نەداوە، ئەو گوتارە گرینگانەی کە لەلایەن دەسەڵاتداران و پایەدارانەوە دراون و بەڵام ئەوان هیچ وتارێکیان نەداوە، ئەنجام ئەو خەبەرانەی کە پەیوەستن بە " بەرژەوەندییەکانی ڤالتر " ەوە یان تەنانەت چەند هەواڵ و نووچەیەکی نهێنی سەبارەت بە ژنانی هەرزە و بەڕەڵلا، یان دەربارەی هەندێ

لەو بەروبوومە باشانەی کە سەرچاوەیەکی زۆر باشە بۆ هەندێک لە هاوکارەکانی ئێمە. "

دوروا، زیاتر حەپەسا بوو تا تووڕە، تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە لەم گوتارەدا شتێکی زۆر ناخۆش هەیە دژی ئەو.

بوارنار دووبارە گوتی:- کێ ئەم خەبەر و نووچەیەی بە تۆ دابوو؟

دوروا، هەرچەندە بیری لێدەکردەوە، نەدەچووە سەری. ئەوسا لە ناکاوا بیری کەوتەوە:

- " ئا، بەڵێ، سن پوتین بوو " پاشان جارێکی دی وتارەکەی خوێندەوەو لە ناکاوا سووری سوور بووەوەو زۆر لەو تۆمەتی پوولەکی بوونە تووڕە بوو کە درابووە پاڵ ئەو.

بە دەنگی بەرز گوتی: " بە چ هەقێ ئیدیعا دەکات کە من پارەم وەرگرتووە تا... "

بواربار، قسەکەی پێبڕی:

- شەیتان بە نەعلەت بێ ها. بە ڕاستی ئەمە بۆ تۆ ناخۆشە. سەرۆکیش سەبارەت بەم بابەتە زۆر هەستیارە. زۆرجار ئەم شتانە لە ستوونی کورتە هەواڵەکاندا، ڕوودەدەن...

لەو کاتەدا سن پوتین، خۆی بەهۆڵەکەدا کرد، دوروا بە ڕاکردن بەرەو لای ئەوچوو:- وتارەکەی " لاپلوم "ت دیتووە؟

- بەڵێ، من ئێستا لە ماڵی خانم ئوبر بووم ولەوێندەرەوە دێم. ئەو ژنە هەیە، بەڵام دەستگیر نەکراوە. ئەم دەنگۆیە هیچ بنج وبناوانێکی نییە.

هەنگێ دوروا بە هەشتاو بۆ ئۆفیسەکەی سەرۆک ڕۆیی. ئاغای ڤالتر بڕێک بە ساردی بە نیگایەکی گوماناوی پێشوازیکرد. پاش ئەوەی گوێی لە ڕوونکردنەوەکانی دوروا گرت، گوتی: بەخۆت برۆ بۆلای ئەم ژنە و بەجۆرێ خەبەرەکە بەدرۆ بخەنەوە، کە ئەم جۆرە شتانە دەربارەی تۆ نەنووسن. مەبەستم ئەو وتارانەیە کە لەمە بەدواوە دەنووسرێن. ئەم بویەرە بۆ ڕۆژنامەکە، بۆ من وبۆ تۆش زۆر ناخۆشە. بابایەکی ڕۆژنامەوان، وەکو چۆن ژنی تزار نابێ ببێتە مایەی گومان، بەو ئاوایە نابێ ببێتە مایەی گومان.

دوروا، سن پوتینی وەکو دەلیل و ڕێنما دەگەڵ خۆیدا برد، سواری گالیسکەیەک بوون. بە گالیسکەچییەکەی گوت: ژمارە هەژدە، شەقامی ئیکوروی، گەڕەکی مونمارتر.

ساختمانێکی بەرز بوو، ناچاربوون شەش نهۆمان ببڕن. پیرەژنێک کە چاکەتێکی خوری دەڵبی لەبەر بوو دەرگای لێکردنەوە، کە سن پوتینی بینی گوتی:- تۆ ئێستا لێرە نەبووی، چیترت لە من دەوێ؟

سن پوتین گوتی:

- ئەم پیاوەم کە مامور و سەرپەرشتیاری پۆلیسە هێناوە، چونکە دەیەوێ بزانێت پرس و دۆزەکەی تۆ چییە وچۆنە.

هەنگێ ژنەی عەمەلمەندە، بردنیە ژوورەوە و دەستی بە قسان کرد:

- دوای تۆ دووکەسی دی هاتنە ئێرە و گوتیان ئێمە ڕۆژنامەوانین و لە ڕۆژنامەوە هاتووین، نازانم کام ڕۆژنامە.

" ئەوسا ڕوویکردە دوروا و لە سەری ڕۆیی: " ئەم پیاوە دەیەوێ بزانێ مەسەلەکە چی بووە؟ "

- بەڵێ، ئایا هیچ مامورێکی دژە گەندەڵی تۆی دەستگیر کردووە؟

پیرەژن، هەردوو دەستی بەرزکردنەوەو گوتی:

- هەرگیز برای ئازیز، هەرگیز. مەسەلەکە بەمجۆرەیە: قەسابێکم هەیە کە گۆشتی باش بە خەڵکی دەدا، بەڵام تەرازووبازە. زۆرجار ئەوەم لێ بینیوە و هیچم نەگوتووە. ڕۆژێ داوام لێ کرد بایی دوو لیور گۆشتی نەرمەم بداتێ بۆ مەخلەمە، چونکە قەراربوو کچەکەم و زاواکەم بێن بۆ ماڵم، سەیرم کرد خەریکە چنگێ چەرمە چەقاڵتە و ئێسقانم بۆ دەکێشێت. ڕاستە دەکرا " راگۆ " ی لێ دروست بکرێت، بەڵام بۆ مەخلەمە نەدەبوو. بۆیە وەختێک دەڵێم نەرمەم دەوێ، دەبێ نەرمەم بداتێ، نەک چەرمە چەقاڵتە. گۆشتەکەم لێوەرنەگرت، ئەویش بەمنی گوت مشکە پیر، منیش وەڵامم دایەوە، پیرە دز، بە کورتیەکەی سەرتان نەیەشێنم، لێمان بوو بەشەڕ وقەرقەشە وخەڵکانێک لە بەر دووکانەکەی خڕ بوونەوەو بە کەماڵی ئیسراحەت پێمان پێدەکەنین. سەرەنجام مامورێکی پۆلیس، کە چاوی بەو قەرەباڵغی وجەنجاڵییە کەوت پێی گوتین بڕۆین بۆ پۆلیسخانە ومەسەلەکەی لەگەڵدا باس بکەین. چووین بۆ پۆلیسخانە، دوای تۆزێک مەرەخەسیان کردین. ئیدی لەوساوە بۆ ئەوەی شەڕمان نەبێتەوە، من نە گۆشتی لێدەکڕم و نە بە بەر دووکانەکەیدا دەڕۆم.

پیرەژنەکە بێدەنگ بوو. دوروا پرسی:- هەر ئەوەندە؟

- بەڵێ جەنابی ڕێزدار، ئەمە حاڵ و حیکایەتەکە بوو.

پاشان پەرداخێ شەرابی بۆ دوروا هێنا کە وەرینەگرت، پیرەژن لێی دووپات کردەوە کە لە وتارەکەیدا، ئاماژە بە ساختەچیاتی و تەرازووبازیی قەساوەکە بکات.

وەختایەک بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە گەڕانەوە، دوروا وەڵامی وتارەکەی " لاپلوم " ی دایەوە:

" جووجە ڕۆژنامەوانێکی گومناوی بێ ناونیشان لە ڕۆژنامەی لاپلوم دا کە پەڕێکی لە کلکی خۆی دەرکێشاوە، دەربارەی پیرەژنێک کە ئیدیعا دەکات کە گوایە لە لایەن پۆلیسی دژە گەندەڵییەوە دەستگیرکراوەو من ئەو قسەیە ڕەتدەکەمەوە، ئەوە زیاتر ڕووی دەمی لەمنە و منی مەبەستە. من بە خۆم چوومە دیدەنی خانم ئوبر کە بەلای کەمەوە تەمەنی لە سەرووی شەستساڵەوەیە، خانم بەخۆی باسی ئەو دەمەقاڵەیەی بۆکردم کەلەگەڵ قەسابی سەرکۆڵانەکەیان تووشی بووبوو، دەمەقاڵەکەیان لەسەر ئەوەبوو پیرەژن داوای گۆشتی نەرمە و قیمەی لێکردبوو، کابرای قەساب چەرمە چەقاڵتەی دابووێ، ئەوسا کاریان گەیی بووە پۆلیسخانە. پیرەژن بەخۆی حاڵ و حیکایەتەکەی بۆ گێڕامەوە، ئەسڵی مەسەلەکە هەر ئەوەندە بوو. بەڵام سەبارەت بە ئیدیعاکانی دیکەی نووسەرەکەی لاپلوم، نە گوێیان دەدەمێ و نە بەلامەوە گرینگن. بەتایبەتی بابەتێک کە بە ناوی خوازراوەوە یان بەبێ ناو بڵاو دەکرێتەوە، هیچ کەسێک زەحمەتی وەڵامدانەوەی ناداتە بەرخۆی. "

ئاغای ڤالتر وجاک ریڤال کە تازە گەیی بوونە ڕۆژنامەکە، وەڵامەکەی دوروایان خوێندنەوەو بەلایانەوە

قەناعەتبەخش بوو و بڕیاریان دا هەر ئەو ڕۆژە، لە دوای ستوونی کورتە هەواڵەکانەوە بڵاوبکرێتەوە.

دوروا، زووتر لە کاتی ئاسایی بۆماڵ گەڕایەوە، کەمێک شپرزە و نیگەران بوو. بەرانبەرەکەی چ وەڵامێک دەداتەوە؟ ئەم هێرشە توندانە چ مەبەست و مانایەکیان لە پشتە؟ ئەم موراڵە توندەی ڕۆژنامەوانەکان، ئەم مەسەلە ناچیز وگەوجانەیە لەوە بوو ڕەگ و ڕیشە پەیدا بکات. شەوێ خراپ خەوت.

وەختێ سبەی بەیانی نووسینەکەی لە ڕۆژنامەکەدا خوێندەوە، بەچاپکراوی توندتر لە دەستنووسەکە هاتە بەرچاوی. هەستیکرد دەیتوانی هەندێک ڕستەی نووسینەکەی خۆی نەرمتر دابڕێژێت.

ئیدی هەموو ئەو ڕۆژەی بە نیگەرانی بەسەر برد وشەویش خراپ خەوت. بەیانی زوو هەستا و چوو بە سۆراخی ژمارەی ئەو ڕۆژەی لاپلومەوە، کە دەبوا وەڵامی نووسینەکەی ئەوی بڵاوکردباوە.

دنیا دووبارە سارد بووبوو، هەموو شوێنێک بەستبووی، جۆگەکانی کەنار شەقامەکە، کە هێشتا ئاوێکی کەمیان پێدا دەڕۆیی، بە قەراخ هەردوو شۆستەکەی ئەمبەر و ئەوبەری جادەکەدا دوو نەواری بەستەڵەکیان ئیجاد کردبوو.

ڕۆژنامانی بەیانی هێشتا نەگەیی بوون. دوروا ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە کە قەرار بوو یەکەمین وتاری بە ناونیشانی: " یادگارییەکانی سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە ئەفریقا " لە لاڤی فرانسزدا بڵاو ببێتەوە. دەست

وپێی خەریک بوو لە سەرما دەتەزین، بەتایبەتی سەری قامکەکانی کە ژانیان دەکرد. کوشکێکی شووشەبەندی ڕۆژنامەفرۆشی لەوێ بوو، کەوتە هەروەڵە بە دەوری کوشکەکەدا. ژنەی فرۆشیار لە ناو کوشەکەکەدا لەبەر سۆپایەکی دەستی ڕۆنیشتبوو، لە پەنجەرە بچووکەکەی کوشکەکەوە، تەنیا سەری کەپووی و گۆنا سوور هەڵگەڕاوەکانی لە ژێر کڵاوێکی خورییەوە بەدی دەکران.

ئەنجام دابەشکەری ڕۆژنامەکە هات وبەشی کوشکەکەی خستە ژوورەوە. فرۆشیارەکە نوسخەیەکی کراوەی لاپلومی دایە دەست دوروا. بۆ ناوی خۆی گەڕا، لێ هەوەڵجار هیچی نەبینی. خەریک بوو، هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشێت کە لە ناکاوا چاوی بە بابەتێک لە نێوان دوو ناونیشانی لاپەڕەکەدا کەوت.

" جەنابی دوروا، بە درۆ قسەکەی ئێمە بە درۆ دەخاتەوە. وێڕای ئەمەش دان بەوەدا دەنێت کە خانم ئوبر هەیە و مامورێکی پۆلیس بۆ پۆلیسخانەی بردووە. تەنیا دوو وشەی " دژە گەندەڵی " ماوە کە لە دوای وشەی " مامور " ەوە بێت تا ڕاستی بویەرەکە بگوترێ و ڕوون ببێتەوە.

بەڵام ویژدانی کاری هەندێ ڕۆژنامەوان لە ئاستی توانا و بەهرەی خۆیاندایە. ئەمەش ناو و ئیمزای منە: لویس لانگرومون " .

هەنگێ دڵی دوروا بە توندی کەوتەلێدان، بۆماڵ زڤڕییەوە تا جل وبەرگ لەبەر بکات، بێئەوەی بە دروستی بزانێ دەیەوێ چ بکات. چونکە سووکایەتی پێکرابوو،

سووکایەتیەکی ڕاستەوخۆ و زەق کە هیچ گومان و دوو دڵییەکی هەڵنەدەگرت. لە سەرچی؟ لە سەر شتێکی هیچ. لەبەر خاتری پیرەژنێک کە لەگەڵ قەسابەکەیدا دەمەقاڵەی بووبوو.

بلەز خۆی گۆڕی، هەرچەندە تازە سەعات هەشتی بەیانی بوو، چوو بۆ ماڵی ئاغای ڤالتر.

ڤالتر کە دوروای بینی، بە سەروسیمایەکی جدی گوتی: ناتوانی پاشگەز ببیتەوە؟

دوروا، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە، لە سەری ڕۆیی:

- یەکسەر بڕۆ بە سۆراخی ریڤالەوە، ئەو دەتوانێ فریات بکەوێ.

دوروا، بە شپرزەیی و دەمەلاڵکێوە چەند وشەیەکی گۆنگی گوت و ئەوسا لەماڵی ڤالتر وەدەرکەوت و چوو بە سۆراخی ریڤالەوە کە هێشتا لەخەودا بوو. کە گوێی لە زەنگی دەرگا بوو، لە جێگا دەرپەڕی ودوای خوێندنەوەی بابەتەکەی لاپلوم گوتی: "چارنییە، دەبێ بڕۆین. چ کەسێکی دی وەکو شایەدی دووەم هەڵدەبژێریت؟"

- من نازانم.

- بوارنار چۆنە؟

- بوارنار، باشە.

- لە بەکارهێنانی شمشێردا چۆنی، هیچ ئەزموونێکت هەیە؟

- نەخێر.

- ئەدی دەمانچە؟

- شارەزاییەکی کەمم هەیە.

- زۆرچاکە، تا من دەڕۆم باقی کارەکان تەرتیب دەکەم، تۆش مەشق وڕاهێنان لە سەر تیرەندازی دەکەی. دەقەیەک سەبرکە.

خۆی بە تەوالێت و دەست شۆرییەکەدا کرد و دوای کەمێک بە ڕدێنی تاشراو و سەروچاوی شۆراو وجل وبەرگی بە تەرتیبەوە هاتەدەرێ.

- ئێستا لە گەڵ مندا وەرە.

لە قاتی خوارەوەی خانوویەکی بچووکدا دەژیا. دوروای برد بو ژێرزەمینێکی گەورە کە هەموو پەنجەرەکانی ڕوو لە جادەکەی داخرابوون و هۆڵی شمشێربازی و تیرەندازیان ئامادە کردبوو.

دوای هەڵکردنی چەند چرایەکی گازی کە سەردابێکی کۆتایی ژێرزەمینەکەی ڕوناک دەکردەوە، شوێنێک بوو کە پەیکەرێکی ئاسنینی سوور وشینی لێ دانرابوو، دوو دەمانچەی تازە کە لە ژێرەوە پڕ دەکرانەوە لە سەر مێزێک دانرابوون، بە دەنگێکی مەیلەو عەسکەرییانە وەکو ئەوەی ئێستا لە مەیدانی دوئێلدا بن، دەستی بە فەرماندان کرد.

- ئامادە؟

- تەقەبکە! یەک، دوو، سێ.

دوروا، بە بێتاقەتی، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوی دەکرد، دەستی دەبردە سەرەوە، نیشانەی دەگرتەوەو تەقەی دەکرد، چونکە زۆربەی گوللەکانی نیشانەیان دەپێکا، ئاخر لە تەمەنی نۆلاویدا بە دەمانچە کۆنەکەی بابی، زۆری نیشانە لە کۆتران گرتبووەوە، جاک ریڤال، گوتی: زۆرچاکە، زۆرچاکە - سەر دەکەوی - سەر دەکەویت.

ئەوسا، کە خەریک بوو دەڕۆیی و دوروای بەجێدەهێشت، گوتی:

– تا نیوەڕۆ لە مەشق و ڕاهێنان بەردەوام بە. ئەوەش فیشەک، خەمی بەکارهێنانی فیشەکت نەبێت. بۆ فراڤین دێمەوە بۆلات و هەر هەواڵێکم بە دەست بکەوێ، پێتی دەڵێم.

و ڕۆیی.

ئەم مەسەلانە چەند گەوجانە بوو! چ شتێکی دەسەلماند؟ ئایا کەسێکی کەڵەکباز، دوای شەڕێکی تەن بەتەن، کەڵەکبازییەکەی کەمتر دەبێتەوە؟ کابرایەکی ئابڕوومەند، کە بووبێ بە گەپجاڕی کەسێکی بوودەڵە، بەوەی گیانی خۆی بخاتە تالووکە ومەترسییەوە چی بەچی دەکات، چی دەستدەکەوێ؟ نها کە روحی لە دنیای تاریکدا دەخولایەوە، ئەو قسانەی نوربردوڤارنی بیر کەوتنەوە کە دەربارەی حەقارەتی ڕوحی بەشەران، پووچی و بێهودەیی هزر وخولیاکانیان و گەوجانەبوونی یاسا مۆڕاڵییەکانیان دەیکرد.

بە دەنگی بەرز گوتی: بە ڕاستی ئەم پیرەمێردە قسەێن دروست وبەجێ دەکات.

ئەوسا هەستی بە تینوویێتی کردو، چونکە دەنگی چکانەوەی ئاوی لە دواوە دەهاتەگوێ، خێرا ئاوڕێکی پاشی دایەوە و چاوی بە دوشێک کەوت، چوو لەوێ ئاوی خواردەوە و دووبارە لە فکران ڕاچووەوە. ئەم ژێرزەمینە زۆر خەمناک بوو، خەمناک وەکو گۆڕ. دەنگی تەگەری گالیسکان لە سەر جادەکەی سەرێ ڕا، لە دەنگی دەستڕێژی دووره دەست دەچوو. ئاخۆ سەعات چەند بوو؟ سەعات لێرەدا، وەکو تێپەڕبوونی زەمان لە زنداندا، دەبووری،

بێئەوەی هیچ شتێک ئەم بوورینی زەمانە نیشانبدات یان دیاری بکات، مەگەر تەنیا هاتنی یارۆی زندانەوان و هێنانی جیرەی ڕۆژانە ئەوەی نیشانبدایە.

زۆری چاوەڕوان کرد، ماوەیەکی زۆر.

ئەوسا لە ناکاوا گوێی بە دەنگی پێ وقسە زرینگایەوە، سەر وکەللەی جاک ریڤال لە گەڵ بوارناردا پەیدا بوو. کە دوروای بینی بە دەنگی بەرز گوتی: کارەکان تەرتیب بوو.

دوروا وای وێناکرد، بە تەوازی نامەیەک لە لایەن هەڤڕکەکەیەوە ئاریشەکە بڕاوەتەوە وتەواو بووە، دڵی داخورپا و بە دەمە لاڵکێوە گوتی:- ئا... مەمنوونم.

جاک ریڤال درێژەی بە قسەکەی دا:

- ئەم لانگرومونە پیاوێکی زۆر ملایمە، هەموو مەرجەکانی ئێمەی قەبووڵ کرد. فاسیلەی بیست و پێنج هەنگاو، تەقاندنی یەک فیشەک بە ئەمری چاودێری مەیدانەکە و بە هەڵبڕینی دەست. بەم شێوەیە، واتە بە هەڵبڕینی دەست، پیاو دەتوانێ باشتر لە هێنانە خوارەوەی دەست تەقە بکات. بوارنار، تەمەشاکە، ئەمە ئەو چەکانەیە کە باسم بۆ دەکردیت.

پاشان یەک یەک هەڵیگرتن و دەستی کرد بە تیرەندازی و بەم کارە ئەوەی بە دوروا نیشاندەدا، کە لە حاڵی دەست هەڵبڕیندا، باشتر نیشانە دەگیرێتەوە.

پاشان گوتی:- دەی با بڕۆین فراڤین بخۆین، نیوەڕۆ زۆر درەنگە.

چوون بۆ خوارنگەیەکی ئەو نزیکانە. دوروا زۆر کەم قسەی دەکرد. زیاتر بە بێدەنگی نانی دەخوارد تا وا نەیەتە بەرچاو کە دەترسێت.

دوای ئەوە دەگەڵ بوارناردا چوو بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە وبە شێوەیەکی ڕۆتینی ومیکانیکی کەوتە کارکردن. زۆر بێباک و بێپەروا دەهاتە بەرچاوی ئەوانی دی.

دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ جاک ریڤال هات بە سۆراخییەوە، تەوقەی دەگەڵ کرد، قەراریان ئەوەبوو کە سبەی بەیانی سەعات حەوت شایەدەکان بە گالیسکە بێن بە دوایدا وبڕۆن بۆ بێشەی وزنیە، ئەو شوێنەی کە دوئێلەکەی تیا دەکرا.

هەموو ئەم کارانە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ئەنجامدرابوو، بە بێ هیچ دەخاڵەتێکی ئەو، بێئەوەی هیچ قسەیەکی تیاکردبێ یان ڕەئێکی دەربڕی بێ، بێئەوەی قەبووڵی کردبێ یان ڕەتی کردبێتەوە، ئەوەش بە خێراییەکی ئەوتۆ کە تەواو حەپەسابوو، بێئەوەی بە دروستی بزانێ کەچ بویەرێک ڕوودەدات.

نزیکەی سەعات نۆ بۆ ماڵی خۆی زڤڕییەوە، بە درێژایی ئەم ماوەیە بوارنار بەوپەڕی گوێڕایەڵی دەگەڵیا مابووەوە و شامیشیان پێکڤە خواردبوو.

وەختایەک بە تەنیا لە ماڵەوە مایەوە، چەند خولەکێک بە ناو ماڵەکەدا پیاسەی کرد. لەوە پەشۆکاوتر بوو کە بتوانێ بیر لە شتێک بکاتەوە. تەنیا بیری لە یەک شت دەکردەوە:- دوئێلەکەی سبەینێ - کە ئەم بیرە تەنیا هەستێکی تێکەڵ وپێکەڵی لە لا دروست کردبوو. ماوەیەک لە سوپادا کاری کردبوو، دەگەڵ عەرەباندا جەنگی بوو، لەو شەڕانەدا ڕوو بەڕووی هیچ مەترسییەک نەبووبووەوە، تەنیا وەکو چۆن

بنیادەم لە کاتی ڕاودا، تەقە لە بەرازێکی هۆڤی دەکات، بەو ئاوایە کەمێک سڵەمی بووبووەوە.

بە کورتی ئەو کارێکی ئەنجام دابوو کە دەبوا ئەنجامی بدات. بەوجۆرە خۆی نیشاندابوو، کە دەبوو وا خۆی نیشانبدات. کارەکەی دەکەوێتە سەر زاران، پشتیوانی لێدەکەن، پیرۆزبایی لێدەکەن. پاشان بە دەنگێکی بەرز، وەکو چۆن پیاو لە کاتی پەریشانحاڵییدا قسان دەکات، بەو ئاوایە گوتی:- ئەم پیاوە چ کەسێکی بێ هەستە!

دانیشت ولە فکران ڕاچوو. ئەو کارتی ئەدرەسەی کە هەڤڕکەکەی دابووی بە ریڤال، تا ناونیشان و ئەدرەسەکەی بزانێت، خستە سەر مێزەکە. جارێکی دی نووسراوی سەر کارتەکەی خوێندەوە، لە ڕۆژێکا بیست کەڕەت ئەم کارەی کردبوو: لویس لانگرومون، ١٧٦، کوچەو شەقامی مونمارتر. جگە لەوە هیچی تری لەسەر نەنووسرابوو.

ئەم وشانە کە لە پاڵ یەکدا ڕیزکرابوون، زۆر ڕازئامێز ومایەی نیگەرانی بوون، چاوێکی پێدا خشاندن. " لویس لانگرومون " چۆن بەشەرێک بوو؟ لە چ تەمەنێکا بوو؟ قەد و باڵای چەند بوو؟ شێوەی چۆن بوو؟ بەڕاستی ئەمە مەخسەرە نییە، کابرایەکی غەریبە، نەناس، لە ناکاوا بێ و لە خوت و خۆڕایی، بەبێ هیچ هۆیەک ژیان لە بنیادەم تاڵ بکات؟ هەر بۆ فشە و بەهەوەس، ژیانت لێتاڵ بکات، لە سەر چیش؟ لە سەر پیرەژنێک کە دەگەڵ قەسابی گەڕەکدا، دەمەبۆڵەیەکی بووە.

جارێکی دی بە دەنگی بەرزگوتیەوە: چەند بەشەرێکی بێ هەستە!

بێدەنگ بوو، بەدەم تەمەشاکردنی کارتەکەوە لە فکران ڕاچوو.

سات بەسات زیاتر ڕقی لەم پارچە کاغەزە هەڵدەستا، ڕقێکی پڕ لە کینە ونەفرەتی ئەوتۆ کە هەستێکی پڕ لەنیگەرانی سەیری لەلا دروست دەکرد. بەڕاستی ئەم بویەرە زۆر گەوجانە بوو. نینۆک کەرێکی، کە لە سەر مێزەکە بوو، هەڵگرت و لە ناوە چاپکراوەکەی سەر کارتەکەی چەقاند، وەکو ئەوەی بیەوێ خەنجەر لە کەسێک بدات.

کەواتە دەبێ شەڕبکات وبە دەمانچەش؟ بۆچی شمشێری هەڵنەبژاردبوو؟ ئەوپەڕی مەسەلەکە بەبرینداربوونی بازوو یان دەست کۆتایی دەهات و دەبڕایەوە، بەڵام دەمانچە، زەحمەتە، پیاو نازانێ ئاخر وئاقیبەتی ئەم کارە چ دەبێ و بەکوێ دەگات.

لە دڵی خۆیدا گوتی: بەسە، دەبێ جورئەت و غیرەتم هەبێ.

دڵی، لە دەنگدانەوەی دەنگەکەی خۆی دالەرزی و نیگایەکی دەوروبەری کرد، هەستیکرد خەریکە زۆر تووڕە دەبێت. پەرداخێ ئاوی خواردەوە و ڕۆیی هەڵاژا.

هەرکە چووە ناو جێگاکەیەوە، چراکەی کوژاندەوە.

هەرچەندە ژوورەکەی زۆر سارد بوو، بەڵام لە ناو جێگاکەدا تەواو گەرم بووبووەوە، بەڵام نەیدەتوانی بخەوێ. بەردەوام گینگڵی دەدا، تەپاوتلی دەدا، دەکەوتە سەر پشت، پێنج خولەکێک لە سەر پشت ڕادەکشا، ئەوسا دەکەوتە تلدان، جارێ بەلای چەپا و جارێ بەلای ڕاستا.

دووباره تینووی بووەوه. هەستا ئاو بخواتەوەو پاشان دووباره نیگەرانی زۆری بۆهێنا : ئایا دەترسم؟

بۆچی که هەر دەنگێکی ئاشنای له ژوورەکەدا دێتەگوێ، دڵی بەمجۆره شێتانه دەکەوێته لێدان؟ هەرجارێ که سەعاتەکه دەگەییه کاتی زەنگ لێدان، خشەخشی باندۆڵەکەی ئەوی له خەو ڕادەپەڕاند، بۆ چەند ساتێک بەڕادەیەک دەپەشۆکا که هەناسەی تەنگ دەبوو.

ئەوسا، وەکو فەیلەسوفێک کەوته تاوتوێ کردنی ئەم مەسەلەیه: یانی ماقووله بترسم؟

نه، بێگومان نەدەترسا، چونکه لێبڕابوو تا کۆتایی ماجەراکه بڕوات و قەراری دابوو دوئێلەکه بکات و ژێوان نەبێتەوه. بەڵام هەستی به ناڕەحەتی و نیگەرانیەکی ئەوتۆ دەکرد، که به ناچاری لەخۆی پرسی: " ئایا بنیادەم دەتوانێ به پێچەوانەی مەیلی خۆی بترسێت؟ " و ئەم دوو دڵی، ئەم نیگەرانی و ئەم ترسه بوونی پڕبکات، ئەگەر هێزێکی به تواناتر له هێزی ویست و ئیرادەی خۆی به سەر ئەوا زاڵ بێ چ ڕوودەدا؟

بێگومان، بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەکه دەڕوات، چونکه دەیویست بڕوات. باشه ئەگەر بترسابا یا له هۆش چووبا چی؟ کەوته بیرکردنەوه له پێگەکەی، له ئابڕوو و ئایندەی خۆی.

له ناکاوا، هەستێکی سەیر زۆری بۆهێنا، هەستی کرد پێویستی بەوەیه هەستێت و له ئاوێنەدا سەیری خۆی بکات. دووباره مۆمەکەی داگیرساند. که ڕوخساری خۆی له ئاوێنەکەدا بینی، بەزەحمەت خۆی ناسییەوه، وای هاته بەرچاو که لەمەپێش هەرگیز خۆی له ئاوێنەدا نەبینیوه.

چاوەکانی درشت هاتنە بەرچاوی و ڕەنگی پەڕی بوو، بەڵێ بێگومان ڕەنگی پەڕی بوو.

ئەم بیرە لە ناکاوا وەکو گوللەیەک لە دڵی جەقی: "سبەینێ، ئەم کاتانە لەوەیە مردبم." و دڵی تووندتر کەوتەلێدان.

دووبارە بۆ لای تەختەکەی گەڕایەوە. بە ئاشکرا خۆی بینی کە لە سەر هەمان جێگا کەوتووە. گۆناکانی تەواو قوپابوون، چاوەکانی بە قوڵا چووبوون، دەستەکانی بێڕەنگ و بێجووڵە، ڕەنگ وڕووی مردووانی لێنیشتبوو.

ئەوکاتە لە تەختە خەوەکەی ترسا، بۆ ئەوەی چاوی بە تەختەخەوەکەی نەکەوێ، ڕۆیی پەنجەرەکەی کردەوە تا تەمەشای دەرێ بکات.

سەرمایەکی تیژ سەراپای لەرزاند، یەکسەر بە هانکە هانک لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە.

بیری لەوە کردەوە ئاگر بکاتەوە. بێئەوەی تەمەشای دواوە بکات، دار و ئێزنگەکەی ناو سۆپاکەی داگیرساند. دەستی لە هەرشتێک دەدا، دەستەکانی کەمێک دەلەرزین، سەری گێژ دەبوو، هەندێ بیری تێکەڵ و پێکەڵ لە زەینیا، بەرز ونزم دەبوونەوە و ئازاری دەدا، وەکو ئەوەی ڤەخارنی خواردبێتەوە، روحی حاڵەتێکی مەستیی پەیدا کردبوو.

بەردەوام لە خۆی دەپرسی: "دەبێ چ کارێک بکەم؟ ئاخۆ چ بەڵایەکم بەسەر دێت؟."

بە ناو ژوورەکەدا کەوتە ڕاوێچکە، بەردەوام و بێ ئیختیار دووبارەی دەکردەوە: "دەبێ بەتوانا بم، ورەم بەرز بێ، زۆر بە هێز بم."

ئەوسا بە خۆی گوت: " دەبێ خەبەر بە باب و داکم بدەم، چونکە لەوەیە شتێکم بەسەربێت. "

لە پشت مێزەکەوە ڕۆنیشت، کاغەزی تایبەتی نامەنووسیی لەبەردەم خۆی دانا و لە سەرووی کاغەزەکەوە نووسی: " باوک و دایکی ئازیزم... "

ئەوسا ڕاما، دەبیرەوە چوو، سەیری کرد ئەم وشانە سەبارەت بە بویەرێکی وەها کارەساتبار، زۆر سادە و ئاسایین. ئەو پەڕەیەی دڕاند و لە سەر پەرەیەکی دیکەدا نووسی: " باوک و دایکی ئازیزم، دەبێ سبەی بەیانی لەگەڵ کەسێکا دوئێل بکەم، بۆیە لەگێنە ئەم بویەرە... "

جورئەتی نەکرد ڕستەکەی تەواو بکات و بە تەکانێک لە جێی خۆی هەستا. ئەم بیرە ئێستا، تەواو پەرێشانی دەکرد: " دەبێ بڕوات و دوئێل بکات. نەیدەتوانی خۆی بدزێتەوە. چی لە دەروونیا دەگوزەرا؟ دەیویست دوئێل بکات، ئەو نیازەی هەبوو و بڕیاری تەواوەتی دابوو، هەستی دەکرد وێڕای هەموو مکووڕی و جدیەتێکی، تەنانەت توانا و باشاری ئەمەی نەبوو کە بۆ شوێنی ڕوو بەڕوو بوونەوەکەش بڕوات.

جارجارێ، ددانەکانی بە دەم جیرەجیرێکی وشکەوە لێکدی هەڵدەسووان و، لە خۆی دەپرسی:

- ئایا حەریفەکەم تا ئێستا دوئێلی کردووە؟ دەست ڕاست و ئەنگێوەیە، کەسێکی ناسراوە، لەم کارەدا بە ناو ودەنگە؟ لێ هەرگیز ناوی ئەوی لە زاری هیچ کەسێک نەبیستبوو. هەڵبەتە ئەم پیاوە ئەگەر ئەنگێوە و تفەنگچیەکی مەعلان نەبوایە، بەم ئاسانییە و بەبێ هیچ گەنگەشەیەک ملی بۆ ئەم کارە بە تالوکەیە نەدەدا.

هەنگێ، ساتی ڕوو بەڕوو بوونەوەکەی خۆیانی، ڕەفتاری خۆی و ڕەفتاری حەریفەکەی هێنایە بەرچاوی خۆی. کە وردەکارییەکانی ئەم شەڕەی دێنایە بەرچاوی خۆی مێشکی ماندوو دەبوو و لە ناکاوا کونی بچووک و ڕەش وقووڵی لوولەی دەمانچەکەی ، کە قەرار بوو گوللەیەکی لێ بێتەدەرێ، لە بەردەم خۆیدا بینی.

دووچاری نائومێدییەکی ترسناک بوو. ئازای بەدەنی هاتەلەرزین، ئازای گرژ بوو. ددانەکانی لێکدی دەنان تا هاوار نەکات، هەستی دەکرد، زۆری پێویست بەوەیە خۆی بە سەر ئەرزەکەدا غل بکاتەوە، قەپ بەشتێکا بکات، پارچەپارچەی بکات. بەڕێکەوت چاوی بە پەرداخێکی سەر سۆپاکە کەوت و بیری کەوتەوە کە لە ناو کۆمەدیەکەیدا، بوتڵێک عارەقی هەیە کە تەقریبەن هیچی لێنەخوراوەتەوە. ئیدی لە دەورانی عەسکەرییەوە فێری ئەوە بووبوو کە بەیانیان پێکێ هەڵبدات.

بوتڵەکەی دەرهێنا و بە تامەزرۆییەوە، دەمی نا بە بوتڵەکەوەو تا هەناسەی سوار نەبوو، دەمی لێهەڵنەگرت. سێ یەکی بوتڵەکەی خواردبووەوە.

گەرمییەکی وەکوی گەرمی ئاگر گەدەی سووتاند و خێرا بە هەموو ئازایدا بڵاوبووەوەو بە دەنی سڕ بوو، ورەی بەرز بووەوە.

بە خۆی گوت: " فێڵەکەم دۆزییەوە. " چونکە زۆری گەرما بوو دووبارە پەنجەرەکەی کردەوە.

ڕۆژێکی سارد وسەهۆڵبەندان، خەریک بوو بەرەبەرە لە ئاسۆوە سەری دەردێنا. ئەستێرەکانی ئاسمان، بە هۆی

ڕوناک بوونەوەی دنیاوە، یەک بە یەک ئاوا دەبوون ودیار نەدەمان و لە خەنەکە قووڵەکەی ڕێگای ئاسندا، چرا ترافیکە، سەوز و سوور و سپیەکان، بەرەبەرە ڕەنگیان دەبوارد.

هەوەڵین مەکینەی قیتارەکان بەدەم شووت لێدانەوە لە وێستگەکان دەهاتنەدەرێ و دەچوون بۆلای ئەو فارگۆنانەی کە دەبوا لە مەکینەکان ببەسترێن. مەکینانی دی لە دووری دوورەوە، پەیتا پەیتا بەدەم شووت لێدانی تیژ وناخۆشەوە دەهاتن، لەو کەڵەشێرانە دەچوون، کە بەدەم ڕۆژ بوونەوەوە دەقولێنن وبێدار بوونەوەی خۆیان ڕادەگەیەنن.

دوروا، بەخۆی گوت: " لەوەیە جارێکی دی هەرگیز ئەم شتانە نەبینم و گوێم لەم دەنگانە نەبێت. " بەڵام کە بینی دووبارە خەریکە بیر لە چارەنووسی خۆی دەکاتەوەو خەفەت بۆخۆی دەخوات و نەترە بەردەدا، کاردانەوەیەکی توندی نواند: " دە بەسە، تا ئەو دەمەی ڕوو بەڕووی یەکدی دەبنەوە، نابێ بیر لە هیچ شتێک بکەیتەوە، ئەمە تاقە هۆیەکە بۆ ورە بەرنەدان. "

ئەوسا خەریکی خۆ ڕازانەوەی بەیانیانی بوو. کاتێ خەریک بوو ڕدێنی دەتاشی و بەدەم ئەو بیرەوە کە ڕەنگە ئەمە دواجار بێ، ڕوخساری خۆی لە ئاوێنەکەدا بدینێت، بۆساتێک نەترەی بەردا.

قومێ عەرقی دیکەی خواردەوە و دەستی بە خۆگۆڕین کرد.

سەعاتێکی دیکەش زۆر بە خاوی و دژواری بووری. بە درێژی و بەپانی ژوورەکەدا دەهات و دەچوو و هەوڵیدەدا خۆی هێور بکاتەوە و زات وەبەرخۆی بنێت. کە گوێی لێبوو

یەکێک لە دەرگای ژوورەکەی دەدات، دووچاری هەڵچوون و هارووژانێکی کوت وپڕی ئەوتۆ بوو، چیوای نەمابوو بە پشتا بکەوێ. شایەدەکانی بوون.

– بەم بەیانی زووە!

هەردووکیان پاڵتۆی چەرمیان لەبەر کردبوو. جاک ریڤال دوای ئەوەی تەوقەی دەگەڵدا کرد گوتی:

– " دەڵێی سەرمای سیبریایە. " ئەوسا پرسی: " حاڵت باشە ؟ "

– بەڵێ، زۆر باشم.

– ئارامی؟

– زۆر.

– زۆرچاکە، کەواتە هەمووشتێک باشە، هیچت خواردووە و خواردووەتەوە؟

– بەڵێ، پێویستم بە هیچ نییە.

بوارنار بەم بۆنەیەوە، نیشانێکی هەندەرانی سەوز و زەردی لە بەرۆکی دابوو کە دوروا تا نها ئەوەی پێوە نەبینی بوو.

بە پلیکانەکاندا داگەڕان. کابرایەک لە ناو گالیسکەکەدا چاوەڕوانیان بوو. ریڤال، کابرای ناساند: " دکتۆر برومان. " دوروا، تەوقەی دەگەڵدا کرد و بەدەمە لاڵکێوە گوتی: " مەمنوونم کە هاتوویت. " پاشان وەختایەک کە دەیویست لە سەر کورسییەکەی پێشەوە دانیشێت، لە سەر شتێکی ڕەق و توووند دانیشت کە وەکو سپرینگ بە ئاسمانیا هەڵدا. سەندووقی دەمانچەکان بوو.

ریڤال، دووبارەی کردەوە: " نە! کورسیەکەی دواوە، دکتۆر و کەسی دوئێلکار دەبێ لە دواوە دانیشن. " دوروا، ئەنجام لە مەبەستی حاڵی بوو و، لە لای دکتۆرەوە دانیشت.

دوو شایەدەکەش سوار بوون وگالیسکەچییەکە کەوتە ڕێ. بەخۆی شارەزا بوو؛ دەیزانی دەبێ بۆ کوێ بڕوات.

بەڵام سەندووقی دەمانچەکان جێگەیان بە هەموویان تەنگ کردبوو، بە تایبەتی بە دوروا کە حەزی نەدەکرد سەندووقەکەی لەبەرچاو بێ. ویستیان بیخەنە پشتی خۆیانەوە ،بەڵام کەمەری ناڕەحەت دەکردن، ئیدی بەباری قیتیدا لە نێوان ریڤال و بوارناردا دایاننا، بەڵام هەر سات ناساتێ دەکەوت، ئەنجام خزاندییانە ژێر پێیانەوە، هەرچەندە دکتۆر چیرۆکی خۆشی دەگێڕایەوە، بەڵام بێدەنگی بە سەریاندا زاڵ بوو. تەنیا ریڤال قسەی دەگەڵدا دەکرد. دوروا دەیویست بیسەلمێنێت کە بێ منەتە، بەڵام دەترسا ئەگەر قسەبکات، سەری داوەکەی لە دەست بەربێ وپەشۆکانە دەروونییەکەی ئاشکرا ببێت. ترسی لەرزین دەستبەرداری نە دەبوو.

گالیسکەکە نها خەریک بوو دەشتەکەی تەی دەکرد. نزیکی سەعات نۆ بوو. یەکێک بوو لەو بەیانیە سەختە زستانیانەی کە هەموو شوێنێکی تەبیعەت وەکو کریستاڵ درەخشان و بڕندە بوو. قەدی درەختەکان یەکپارچە شەختە بوو. زەوی لە ژێر پێیاندا قرچەقرچی دەکرد، هەوای وشک بچووکترین دەنگی دەگەڵ خۆیدا ڕادەڕفاند. دنیای ساف وسایەقە وەکو ئاوێنە دەدرەوشایەوەو خۆر کە ئەویش سارد و پرشنگدار، لە ئاسمانەوە دادەخزی و تیشکی

دەخستە سەر زەوی و تەبیعەتی سەهۆڵبەندان و نەیتوانی هیچ شتێک گەرم بکاتەوە.

ریڤال بە دوروای گوت:- دەمانچەکانم لە گاستین رنت وەرگرتوون. بەخۆی پڕی کردوون. سەری سەندووقەکە مۆر ومۆم کراوە. بۆ هەڵبژاردنی هەر یەکێک لە دەمانچەکان بە بەرچاوی شایەدەکانەوە، تیر وپشک دەکرێت.

دوروا، بە بێتاقەتی بەرسڤی دایەوە:- زۆر مەمنوونم.

ئەوسا ریڤال، چەند ئامۆژگارییەکی وردی کرد، چونکە ڕژد بوو لە سەر ئەوەی موەکیلەکەی هیچ هەڵەیەک نەکات. هەرخاڵێکی چەند جارێک بۆ دووبارە دەکردەوە: وەختێک دەپرسن: " ئاغایان ئامادەن؟ " بە دەنگێکی دلێر بەرسڤ دەدەیتەوە: " بەڵێ! " " وەختایەک فەرمان دەدرێت: " ئاتەش! " تۆ بلەز دەست بەرز دەکەیتەوە و پێش ئەوەی ژمارە سێ بدرکێنرێ، تۆ فیشەکی خۆت دەتەقێنی. "

دوروا، بێئەوەی بە دەست خۆی بێ، لە دڵی خۆیدا دووبارەی دەکردەوە: " وەختایەک فەرمان دەدرێ ئاتەش، من دەستم بەرز دەکەمەوە، وەختێ فەرمان دەدرێ ئاتەش، دەستم بەرز دەکەمەوە. "

گالیسکەکە گەییە ناو بێشەکە، بە دەستی ڕاستا پێچی کردەوە وخۆی بە شەقامێکدا کرد. پاشان دووبارە بە دەستی ڕاستا پێچی کردەوە. ریڤال لە ناکاوا دەرگای گالیسکەکەی کردەوەو بە گالیسکەچییەکەی گوت: " لەو لایەوە، بەو باریکە ڕێگایەدا. " و گالیسکەکە خۆی بەباریکە ڕێگاکەدا کرد کە جێگای تەگەری گالیسکەی بەسەرەوە دیاربوو و گەڵای وشک و بەخوسار (زوقم) لە مبەر و لەوبەرییەوە، دەلەرزین.

دوروا، هێشتا لەبن لێوانەوە قسەی دەکرد:

"وەختێ فەرمانی ئاتەش دەدرێ دەستم بەرز دەکەمەوە." ئەوسا ئەم بیرەی بە مێشکا هات کە ئەگەر بویەرێک بۆ گالیسکەکە چێببێت ئیدی هەموو شتێک دەبڕێتەوە. بۆنموونە گالیسکەکە وەربگەڕێ و لاقی ئەم بشکێت!....

بەڵام لەو بەری مەیدانێکی ڕووتەندا، گالیسکەیەکی دیکەی بەدی کرد کە ڕاوەستابوو و چوار پیاو لە پاڵیا وەستابوون و ئەم پێ و ئەو پێیان دەکرد، تا گەرمیان ببێتەوە. کە ئەوانی بینی بە ڕادەیەک سەر و دڵی گیرا و هەناسەی تەنگ بوو کە ناچاربوو بۆ هەناسە وەرگرتن دەمی بکاتەوە.

لە هەوەڵەوە شایەدەکان دابەزین، پاشان دکتۆر و پاشان یارۆی دوئێلکار. ریڤاڵ سەندووقی دەمانچەکانی هەڵگرت و دەگەڵ بوارناردا، بەرەو دوونەفەر لە گروپی بەرانبەر کە بەرەو ئەمان دەهاتن، چمان. دوروا بینی ئەوان بە شێوەیەکی تەشریفاتی پروتۆکۆلی سڵاویان لەیەکدی کرد، ئەوسا بەرەو مەیدانە ڕووتەنەکە کەوتنەڕێ. بە دەم ڕێگاوە جارێ تەمەشای ئەرزەکە و جارێ سەیری درەختەکانیان دەکرد. دەتگوت لەخەمی ئەوەدان شتێک نەکەوێتە سەرزەوی یان بەپێچەوانەوە لە زەوییەوە بۆ ئاسمان نەپەڕێ. ئەوسا مەوداکانیان بە هەنگاو پێوا و دوو داریان بە زەحمەت لەم سەر وئەوسەری مەیدانەکە و لە ئەرزە سەهۆڵبەندانەکەدا چەقاند. ئەوسا لە دەوری یەکدی خڕبوونەوە و وەکو چۆن منداڵان گەمە دەکەن، بەنیازی شێر وخەت دراوێکیان هەڵدا.

دکتۆر برومان لە دوروای پرسی:- حاڵت باشە، پێویستت بە هیچ نییە؟

- نا، هیچ پێویستیەکم نییە، مەمنوونم.

وای هاتە بەرچاو شێت بووە، یان لە خەودایە، یان خەو دەبینێ کە بویەرێکی نائاسایی ڕووی داوەو ئەوی لە خۆ گرتووە.

جاک ریڤال هاتەوە نک وی وبەخۆشحاڵییەوە و بەئەسپایی گوتی:

- هەموو شتێک باشە، لە هەڵبژاردنی دەمانچەکەدا بەخت یاری مە بوو.

ئەم بابەتە بۆ دوروا و بەلای ئەوەوە هیچ بایەخێکی نەبوو.

شایەدەکان، پاڵتۆکەیان لە بەری داکەند، دوروا هیچ کاردانەوەیەکی پیشان نەدا. گیرفانەکانی چاکەتەکەی گەڕان تابزانن ئاخۆ کاغەزێک یان دەفتەرچەیەکیان تێدا نییە کە بشێت بەری گوللە بگرێت.

دوروا وەک ئەوەی وێردان بخوێنێ، لە دڵی خۆیدا دووبارەی دەکردەوە: " وەختێ فەرمان دەدرێ ئاتەش، دەستم بەرز دەکەمەوە. "

ئەوسا دوروایان برد و لە پاڵ یەکێک لەو دارانەیان ڕاگرت کە لە ئەرزەکەیان چەقاندبوو و دەمانچەیەکیان دایە دەستی. لەوکاتەدا چاوی بە پیاوێک کەوت کە لە بەرامبەریا وەستابوو، تەواو لێوەی نزیک بوو. پیاوێکی کوڕتەباڵای زگ زەلامی، سەرسافی چاویلکە لەچاو. ئەم پیاوە حەریفەکەی بوو.

کابرای بە تەواوی بینی، بەڵام هەموو هزر وبیری لای ئەم ڕستەیە بوو: " کە فەرمان درا ئاتەش، دەست بەرز دەکەمەوە وتەقە دەکەم. "

دەنگێک، لە بێدەنگیە قووڵەکەی مەیدانە ڕووتەنەکەوە بەرز بووەوە، دەنگێک دەتگوت لە دووری دوورەوە دێت و پرسی:- ئاغایان ئامادەن؟

جۆرج هاواریکرد:- بەڵێ.

ئەوسا هەمان دەنگ فەرمانی دا:- ئاتەش!...

جۆرج، هیچی دیکەی نەژنەوت، هیچی دی نەبینی، هەستی بە هیچ شتێک نەکرد، تەنیا هەستی بەوەکرد دەستی بەرز دەکات و بە هەموو هێزی خۆیەوە دەست بە پەلەپیتکەدا دەنێت.

ئیدی گوێی لە هیچی دی نەبوو.

بەڵام یەکسەر، تۆزێک دووکەڵی لە کۆتایی لوولەی دەمانچەکەیەوە بەدی کرد، کابراش لە بەرانبەریا بە هەمان دەقی خۆیەوە وەستابوو، هەنگێ هەورێکی سپی چکۆلەی بە سەر سەری حەریفەکەشیەوە بەدی کرد.

هەردووکیان تەقەی خۆیان کردبوو. مەسەلەکە کۆتایی هاتبوو.

شایەدەکان ودکتۆرەکەی دەستیان بە بەدەنیا دەگێڕا، دوگمەکانی جلەکانیان دەکردەوەو بە نیگەرانییەوە دەیانپرسی:- بریندار نەبوویت؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: " نە، باوەڕ ناکەم. "

" لانگرومون " ش وەکو حەریفەکەی ساغ و سەلامەت بوو و جاک ریڤال بە ڕاوێژێکی ناخۆشەوەو لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەم دەمانچە نەعلەتیە هەمیشە حاڵەکە وایە. یان فیشەکەکە سەردەکا و بە هەوادا دەڕوات، یان یەکدی دەکوژن. کە چەکێکی حەیابەرەیە!

دوروا، لە جێی خۆی نەدەجما، گێژ بووبوو، لە خۆشحاڵیدا بەنج بووبوو: " تەواو بوو! " دەمانچەکەیان، کە هێشتا هەر بەدەستییەوە بوو، لێوەرگرت. نها وای هەستدەکرد، دژی هەموو دنیا جەنگیوە. تەواو بوو. چ خۆشیەکی بوو! نها خۆی بە دلاوەرێک دەزانی کە ئامادەبوو ڕوو بە ڕووی هەرکەسێک ببێتەوە.

شایەدەکان، لە گەڵ یەکدیدا کۆبوونەوەو چەند خولەکێک قسانیان کرد، شوێنێکیان بۆ دیدار ونووسینی ڕاپۆرتەکە هەڵبژارد، پاشان سواری گالیسکەکەیان بوون ویارۆی گالیسکەچی کە لە شوێنەکەی خۆی دانیشتبوو و پێدەکەنی، قامچییەکەی لە هەوادا بادا و شریقەی لێوە هێنا و گالیسکەکە کەوتەڕێ.

بەچوار قۆڵی لە یەکێک لە خوارنگەکانی بولڤاردا فراڤینیان خوارد و ڕاوبۆچوونی خۆیان لەمەڕ بویەرەکە دەربڕی. دوروا، هەستی خۆی دەردەبڕی.

- بۆ من هیچ بایەخێکی نەبوو، هیچ کاریگەرییەکی نەبوو. بێگومان بەخۆتان ئاگاتان لێبوو؟

ریڤال بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ، رەفتار وهەڵوێستی تۆ عەیبی نەبوو.

وەختایەک ڕاپۆرەکەیان نووسی، بە دوروایان نیشاندا کە لە کورتە هەواڵەکانی ڕۆژنامەکەدا بڵاوی بکاتەوە. کە ئەوەی خوێندەوە گوایە لەگەڵ ئاغای لویس لانگروموندا دوو

گوللەیان بەیەکەوە ناوە، بەسووکە نیگەرانییەکەوە پرسی:-
بەڵام ئێمە هەریەک گوللەمان تەقاند.

ریڤال بزایەکی کرد وگوتی:

- ڕاستە، یەک گوللە... هەریەکتان گوللەیەک... دەکاتە دوو گوللە.

دوروا، کە ئەم ڕوونکردنەوەیەی بەلاوە قەناعەتبەخش بوو، چیتر پێداگری نەکرد. بابا ڤالتر ماچی کرد.

- هەربژی، هەر هەبی، تۆ داکۆکیت لە ئابڕووی لاقی فرانسز کردا

جۆرج، ئەو شەوە، لە بارەگای چەند ڕۆژنامەیەکی گرینگ و لە کافە سەنگینەکانی بولڤاردا، بە دیارکەوت. دووجاریش تووشی حەریفەکەی بوو کە ئەویش هاتبوو خۆی بە خەڵک نیشاندەدا.

سڵاویان لە یەکدی نەکرد. ئەگەر یەکێکیان بریندار ببوایە، تەوقەیان دەگەڵ یەکدیدا دەکرد. ئەمە جگە لەوەی هەریەکەیان بەوپەڕی دڵنیاییەوە سوێندیان دەخوارد گوێیان لە گیزەی گوللە بووە کە بە پەنا گوێیاندا ڕەت بووە.

دوروا، سبەی بەیانی، دەوروبەری سەعات یازدە، کاغەزێکی چکۆلەی شینباوی وەرگرت: " پەنا بەخوا، کە ترسام! هەرچی زووە وەرە بۆ شەقامی کونستانتینوپل تا ماچت بکەم، عەشقی من، تۆ چەند ئازایت- دەتپەرستم – کلو. "

دوروا، ڕۆیی بۆ شوێنی دیاریکراو. کلوتیلد خۆی لە باوەشی خست و سەر وڕووی لە ماچدا نقوم کرد.

- ئاە گیانەکەم، ئەگەر دەزانی ئەم بەیانییە وەختێ ڕۆژنامەکانم خوێندەوە، چەند نیگەران و ناڕەحەت بووم.

دەی بۆمی باسبکە. لە نووکەوە بۆمی باسبکە، دەمەوێ ورد ودرشتی مەسەلەکە بزانم.

دوروا، ناچاربوو، مەسەلەکەی، لە سیری تا پیازی، بۆ باسبکات.

ژنەی گەنج پرسی:- خوا دەزانێ شەوی پێش دوئێلەکەت چۆن بە سەر بردووە!

- نەبابە، زۆریش ئاسوودە خەوتم.

- ئەگەر من لە جیاتی تۆبام، خەو نەدەچووە چاوم. دەی بۆمی بگێڕەوە، ڕەوش لە مەیدانی دوئێلەکەدا چۆن بوو.

جۆرج، شرۆڤەیەکی ڕۆمانتیکیانەی بویەرەکەی بۆکرد.

- وەختایەک لە بیست شەقاوی یەکدیدا وەستاین، یانی چوار هێندەی درێژی ئەم ژوورە، ، ئەوسا جاک ریڤال دوای ئەوەی کە پرسی ئامادەین، فەرمانی دا: " ئاتەش. " من یەکسەر دەستم بەرزکردەوە، بە شێوەیەکی ئاسۆیی تەواو بەرزم کردەوە، بەلام هەڵەکەم لەمەدا بوو کە دەمویست نیشانە لە سەری بگرمەوە. چەکێکی زبر و قورسیان دابوو بەمن، لەکاتێکا من فێری دەمانچەی لووس و سووک بووم، بەهەرحاڵ زبری ماشەکە (پەلەپیتکە) کردیە کارێک گوللەکە سەربکات و بە سەر سەریا تێپەڕێ. بە هەرحاڵ نەدەبوو زۆر سەربکات. ئەم نارەسەنەش تیرەنداز بوو ها. گوللەکەی بەلای ڕوومەتما تێ پەڕی، هەستم بە بایەکەی کرد.

کلوتیلد، لە سەر ئەژنۆکانی ئەو ڕۆنیشتبوو و هەردوو دەستی لە گەردنی هاڵاندبوو، دەتگوت دەیویست خۆی بکات بە شەریکی ئەو مەترسییەی کە ڕوو بە ڕووی بووبووەوە.

بەدەمەلاڵکێوە دەیگوت:- ئاە گیانەکەم، بەلەنگازۆ، ئازیزی دڵەکەم...

پاشان، کە لە گێڕانەوەی سەربهوردەکە بووەوە، ژنەی گەنج گوتی:

- دەزانی، من ناتوانم بەبێ تۆ هەڵکەم! پێویستە بە بەردەوامی بتبینم، بەڵام کە مێردەکەم لە پاریس بێ، ئەم کارە زەحمەتە، زۆر بەیانیان یەک سەعات وەختم هەیە، پێش ئەوەی تۆ لە خەو رابی دەتوانم بێم و ماچت بکەم، بەڵام ئامادەنیم پێ بنەمە ناو ئەو خانووە نەفرەتیە. چ بکەین؟

لە ناکاوا بیرێک بە مێشکی جۆرجدا هات وپرسی:- تۆ ئێرەت بەچەند بەکرێ گرتووە؟

- مانگێ سەد فرانک.

- زۆرچاکە، من خۆم ئێرە بەکرێ دەگرم و تیایا ئاکنجی دەبم. خانووەکەی ئێستام، دەگەڵ ئەم پێگەیەدا کە هەمە تێکناکاتەوە.

کلوتیلد، کەمێک دەبیرەوە چوو و بەرسڤی دایەوە:- نا، من ئەمەم ناوێ.

جۆرج، بە سەرسامی گوتی:- بۆچی ناتەوێ؟

- چونکە...

- ئەمە هەنجەت نییە. ئێرە بۆ من شوێنێکی زۆر لەبارە. دێمە ئێرە ولێرەش دەمێنمەوە.

ئەوسا بەدەم پێکەنینەوە گوتی:- کرێنامەکەشی بە ناوی خۆم دەکەم.

کلوتیلد، به ڕژدی ڕەتی دەکردەوە:- نا، نا، قەبووڵم نییە...

- باشە لەبەرچی؟

هەنگێ بە ئەسپایی و بەڕاوێژێکی دڵنەواز بە گوێیدا چپاند وگوتی:

" چونکە ژنانی دی بۆ ئێرە دێنێت و، من ئەمەم ناوێ. "

جۆرج، دەهری بوو.

- بە هیچ جۆرێ، حاشا، بەڵێن و سۆز دەدەم.
- نا، بەڵێنیش بدەی، هەر ئەم جۆرە کارانە دەکەی.
- سوێندت بۆ دەخۆم.
- بەڕاست؟
- بەڕاست، قەولی شەرەف، ئێرە ماڵمانە، تەنیا بۆ خۆمان دەبێت.

کلوتیلد، بە شەوق و زەوقێکی عاشقانە باوەشی پێداکرد وبە خۆیەوەی گوشی:

- باشە، قەبووڵمە گیانەکەم. بەڵام ئەگەر یەک جاری دی خیانەتم لێبکەی، تەنیا یەک جاری دی، ئیدی هەموو شتێکی نێوانمان بە یەکجارەکی تەواو دەبێ و دەبڕێتەوە.

بەڕاوێژێکی مەیلەو ناڕازییەوە جارەکی دیکەش سوێندی بۆ خواردەوەو بڕیاری دا، هەر ئەو ڕۆژە، بۆ ئەوەی باربکات تا کلوتیلد، هەرکاتێ بەوێدا تێپەڕێ، بتوانێ سەرێکی ئەویش بدات.

ئەوسا کلوتیلد، پێی گوت:- بە هەرحاڵ یەک شەممە بۆ شام وەرە بۆماڵی ئێمە. مێردەکەم بە پیاوێکی خۆش مامەڵەی زانیوی.

جۆرج، ئەو قسەیەی ئەوی پێخۆش بوو:- بە ڕاست؟

- بەڵێ، دڵیت بە دەست هێناوە. ئەری کاتی خۆی بە منت گوتبوو لە کۆشکێکا لە گوندێکی گەورەدا، پەروەردە بووی، وانییە؟

- با، بۆچی لەمە دەپرسیت؟

- کەواتە دەبێ سووکە شارەزاییەکت لە مەڕ کاروباری کشتوکاڵیدا هەبێ؟

- بەڵێ.

- کەواتە دەربارەی باخەوانی و بەروبوومی کشتوکاڵی قسانی دەگەڵ بکە، زۆری حەز لەو باسانەیە.

- باشە، لە بیرم دەمێنێت.

کلوتیلد، پاش ئەوەی تێر وپڕ ماچی کرد، هەستا ورۆیی، ئەم دوئێلە، هێندەی دی ئەوی لە دڵیا شیرین کردبوو.

دوروا، کە خەریک بوو بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە دەڕۆیی بەخۆی گوت:

" چەند بوونەوەرێکی خۆشە. چ ژنێکی سائەقڵە! خۆیشی نازانێ چی دەوێ و حەزی لە چییە؟ چەند خێزانێکی سەیرن! چ ڕێکەوتێ، ئەم پیرەمێردەو ئەم ژنە ئەقڵ سووکەی کۆکردووەتەوە؟ چ فاکتەر وچ لۆژیکێک، توانیویەتی ئەم سەرپەرشتیارە وادار بکات، کچە مەکتەبلییەک بخوازێت؟ ئەم ماستە موویەکی تێدایە! کێ چوزانێ؟ خۆ لەوەشە عەشق وڤیان بێ؟ "

ئەوسا لەدڵی خۆیدا گەییە ئەم قەناعەتە : " بە هەرحاڵ ماشقە وگراوێیەکی میهرەبانە. کەرم ئەگەر دەستبەرداری ببم. "

( ٨ )

ئەو دوێنێیەی کە دوروا کردی، کردیە کارێک کە وەکو ڕیپۆرتەری نمرە یەکی لاڤی فرانسز ناو دەربکات، بەڵام چونکە لە دۆزینەوەی هزر وبۆچوونی تازەدا، کۆڵەوار بوو، ئیدی خۆهەڵکێشان و بەخۆدا هەڵگوتنی لە واری داڕوخانی داب ونەریتان وگاڵتەکردن بە تایبەتمەندییە ئەخلاقیەکان وداڕوخانی هەستی نیشتمانپەروەری یان بەکورتی کەمخوێنی شەرەف و ئابڕووی لە لای فەرەنسییەکان بۆخۆی هەڵبژارد. ( زاراوەی " کەم خوێنی " لەم وارەدا داهێنانی خۆی بوو و شانازی پێوە دەکرد. )

کاتێ کە خانم دوماریل، بەو گیانە تەوسئامێزە بە دگومان وساویلکانەیەوە کە تەبعی پاریسی پێدەڵێن، بە زاراوەێن هەجو ئامێزەوە، گاڵتەی بە گەندەبێژییەکانی ئەو دەکرد، دوروا، بە خەندەوە بەرسڤی دەدایەوە: " ئەم شتانە دەبنە بایسی ئەوەی لە ئایندەدا، ناو وباوێک پەیدا بکەم. "

نها، لەو ئاپارتمانە بچووکەی شەقامی کونستانتینوپل دەژیا، وەختایەک بۆ ئەوێندەر باریکرد، جگە لە جانتایەکی کۆن، شانەکەی، گوێزان و تاقم تەراشەکەی و سابوونەکەی هیچی دی نەبوو کە بۆ ئەوێندەری بگوازێتەوە. کلوتیلد، هەفتەی دوو سێ جار، بەیانی زوو بەر لەوەی دوروا لە جێگا بێتە دەرێ، دەگەییە سەری و لە سەرما خۆی دەخزاندە ژێر جێگاکەیەوە.

دوروا، هەموو ڕۆژانێکی پێنج شەممە بۆ شێو، لەماڵی وان میوان بوو. ئیدی بە باس وخواسی کشتوکاڵ، دڵی مێردەکەی ئەوی بە دەست دێنا. جا چونکە بەخۆیشی سەری لە بابەتێن زەوی وزار وکشتوکاڵ دەخورا، هەندێجار

بە ڕادەیەک سەرگەرمی قسەوباسان دەبوون کە ژنەی گەنجیان، کە لە سەر قەنەفەکە وەنەوزی دەدا، لە بیر دەچووەوە.

" لورین " ش هەندێجار لە باوەشی بابیا و هەندێجار لە باوەشی بیل ئامی دا، خەوی لێدەکەوت.

کاتێ دوروای ڕۆژنامەڤان لە ماڵی وان وەدەردەکەوت، ئاغای دوماریل، بەو ڕاوێژە وەعزئامێزەی کە دەربارەی بچووکترین شت بەکاری دەبرد، دەیگوت: " ئەم کوڕە بەڕاستی کوڕێکی ڕوح سووک و لەبەر دڵانە. پیاوێکی زۆر شارەزا و ڕۆشنبیرە. "

هەیڤی شوبات خەریک بوو دوا ڕۆژەکانی بەڕێدەکرد. بەیانیان کە پیاو بەلای عەرەبانەی گوڵفرۆشەکاندا دەڕۆیی بۆنی گوڵە وەنەوشە سەرمەستی دەکرد.

دوروا، ژیانێکی بێ کێشە و ئاسوودەی دەگوزەراند.

بەڵێ، شەوێک کە بۆ ماڵ گەڕایەوە، سەیری کرد، نامەیەک لە ژێر دەرگای ئاپارتمانەکەوە خراوەتە حەوشەوە. تەمەشایەکی مۆری پۆستەخانەکەی کرد، نامەکە لە (کن)ەوە هاتبوو. نامەکەی کردەوەو خوێندییەوە:

کن ڤیلا ژولی

برادەری ئازیز و دۆستی خۆشەویست، تۆ بەمنت گوتبوو، ئەگەر کێشەیەکم هاتەڕێ، دەوتوانم داوای کۆمەک لە تۆ بکەم، وایە؟ زۆرچاکە، ناچارم داوای خزمەتێکی قورس لە تۆ بکەم، وەرە هاوکاریم بکە و با لەم ساتانەی ئاخر وئۆخری تەمەنی شارلدا کە ڕوو لە مردنە، بە تەنیا نەبم. هەرچەندە هێشتا زەمینگیر نەبووە، لێ بەو قسانە بێ کە دکتۆر بەمنی گوتووە، ڕەنگە هەفتە نەگەیەنێتە سەر.

ئیدی نه هێزم تیاماوه و نەزاتی ئەوەم ماوه شایەدی و بینەری ئەم گیانەڵلا و ئاویلکە بەردەوامه بم. زۆر بەترسەوه بیر لەو دوا ساتانه دەکەمەوه که چیوایان نەماوه بگەنه کۆتایی. پێموایه، من جگه له تۆ ناتوانم داوای ئەم خزمەت و کۆمەکه له هیچ کەسێکی دیکه بکەم، چونکه مێردەکەم هیچکەسێکی نییه. تۆ هاوڕێی بوویت و ئەو دەرگاکانی ڕۆژنامەڤانی له تۆ کردووەتەوه. تکادەکەم تازووه وەره. من هیچ کەسێکم نییه کەدواوی هاوکاری لێبکەم.

## دۆستی زۆر دڵسۆزت
## مادلین ڤورستیه*

هەستێکی سەیر، وەکو سروه بایەک، خۆی به دڵ و دەروونی جۆرجدا کرد. هەستی ڕزگاری، هەستی ئەو فەزا و هاماجەی کەبه ڕوویدا دەکرایەوه، له بن لێوانەوه گوتی: " هەڵبەته دەڕۆم. ئەم شارله بەلەنگازو بێنەوایه! سەرباری هەموو شتێک چارەنووسیکی هاوبەشمان هەیه! "
کاتێ نامەی ژنه گەنجەکەی به سەرۆک نیشاندا، ئاغای ڤالتر، بەدەم خوتەخوت و بۆڵەبۆڵەوه، به نەبەدڵی مۆڵەتی دا بڕوات، بەڵام چەند جارێک لێی دووپات کردەوه:- لێ به زووترین کات بگەڕێوه، لێره زۆر پێویستمان به تۆیه.
جۆرج دورۆوا سبەینێ، پاش ئەوەی بروسکەیەکی بۆ خانم و ئاغای دوماریل نارد و له چوونەکەی خۆی ئاگاداری کردنەوه، به قیتاری لەزگینی سەعات حەوتی بەیانی بەرەو (کن) کەوتەڕێ.

ڕۆژی دواتر، نزیکی سەعات چواری پاش نیوەڕۆ گەییە ئەوێندەر.

دەلاڵێکی موڵک فرۆشی، ڕێنوێنی کرد کە چۆن بۆ ڤیلا ژولی بڕوات. ساختمانەکە کەوتبووە داوێنی گردێکی چڕە دار ودرەختەوە، کەوتبووە ناو کۆمەڵێک خانووی سپی زۆرەوە کە لە کەنیتەوە تا کەنداوی ژوئان دەڕۆیی.

خانووەکە بچووک و نزم بوو، بە ستایلی ئیتاڵیایی ڕۆنرابوو، کەوتبووە قەراخ جادەیەکەوە، کە پێچاوپێچ بەنێو درەختاندا سەردەکەوت و لە سەری هەر پێچێکدا، دیمەنێکی دڵڕفێن، زاخاوی چاوی دەدایەوە.

خزمەتکارەکە دەرگای کردەوە و بەدەنگی بەرز گوتی:- ئاه، ئاغا. خانم بەوپەڕی بێقەرارییەوە چاوەڕوانی تۆیە.

دوروا پرسی:- ئەدی ئاغا حاڵی چۆنە؟

- ئاه باش نییە ئاغا. لە ئاوزینگدایە.

جۆرج خۆی بە هۆڵێکدا کرد، دیوارەکانی بە پەردەێن پەمەیی گوڵ شین داپۆشرابوون، پەنجەرەیەکی گەورە و بەرزی هەبوو کە ڕوو لە شار و دەریا دەکرایەوە.

دوروا، لە بن لێوانەوە بەخۆی گوت: " سەیرە، ئێرە وەکو خانووی هاوینەهەوار، ڤێلایەکی بەشکۆیە. ئەم هەموو پارەیەیان لە کوێ هێناوە؟ "

دەنگی خشەخشی جل هات، ناچار ئاوڕی لای دەنگەکەی دایەوە. خانم فورستیە، هەردوو دەستی بەرەو ئەو درێژکرد: " چ لوتفێکی گەورەت کردووە، چ مەحەبەتێکت نواوندووە کە هاتووی! "

ئەوسا لە ناکاوا دوروای ماچکرد وپاشان تەمەشای یەکیان کرد.

ژنەی گۆرین کەمێک ڕەنگی پەڕی بوو و تۆزێکیش لاواز بووبوو، بەڵام وەکو هەمیشە تەڕ وبڕ و ناسک بوو، بگرە لەجاران شەنگوڵتر و ناسکتر بوو. لەبن لێوانەوە گوتی:

- ڕەفتاری زۆر خراپ گۆڕاوە، دەزانێ دوا دواییەتی، ئیدی زۆرم ئازار دەدات. هاتنی تۆم پێ ڕاگەیاند. ئەدی کوا جانتاکەت؟

دوروا گوتی: لە عەماری وێستگەی قیتارەکە دامنا، چونکە نەمدەزانی بچمە چ ئوتێلێک کە لە تۆوە نزیک بێت.

ژنەی گەنج سووکە هەڵوەستەیەکی کرد و پاشان گوتی:

- هەرلێرە، لەم ڤێلایەدا دەبیت. ژوورەکەشت ئامادەیە. چونکە لە ئان و ساتدایە بمرێت، ئەگەر شەوێ بمرێ من بەتەنیا دەبم. دەنێرم جانتاکەت بێنن.

دوروا، سەرێکی دانەواند وگوتی:- بە دڵی خۆت.

ژنەی تاین گوتی:- با جارێ بچینە سەرەوە.

جۆرج دووی کەوت. مادلین، دەرگایەکی نهۆمی یەکەمی کردەوە. جۆرج چاوی بە شارل کەوت کە لە بەر پەنجەرەیەکا و لە سەر قەنەفەیەک چەند پەتۆیەکی لە خۆیەوە پێچابوو و سەیری ئەوی دەکرد، لە بەر تیشکی سووورباوی خۆرەکەدا، بێ ڕەنگتر دەهاتە بەرچاو، وەکو جەستەیەک وابوو کە لە سەر کورسییەک دانیشتبێت. بەزەحمەت ئەوی ناسییەوە، بەڵام دەیزانی، یان بەمەزەندە دەیزانی کە ئەمە دۆستەکەیەتی و حاڵی بەم حاڵە گەییوە.

ژوورەکە یەکپارچە بۆنی تا، جۆشانە، بەتج و سپرتۆ بوو، بۆنی توونندی ژووری نەخۆشانی دەردە باریکەی لێدەهات، بۆنێک کە پیاو نەیدەزانی ناوی چی لێبنێت.

فورستیە، بەخاوی و بە بێحاڵی دەستی هەڵبڕی و گوتی:

- هاتی؟ هاتی ببی بە بینەری مردنەکەم؟ مەمنوونم.

دوورواً، بزەیەکی ڕواڵەتی بۆکرد: " بینەری مردنەکەت بم! ئەم قسەیە چییە، ئەمە دیمەنی دیتن نییە، هەرگیز ئامادە نیم ئەم کاتە بۆ دیتینی کن هەڵبژێرم. هاتووم لە حاڵی تۆ بپرسم و کەمێک ئیسراحەت بکەم.

شارل لە بن لێوانەوە گوتی: " وەرە دانیشە. " ئەوسا سەری لەبەر خۆ نا و دەبیرێن نائومێدانەوە چوو.

توند توند و پچرپچڕ هەناسەی دەکێشا، جارجارێ شتێکی وەکو ناڵەی لەزار دەهاتە دەرێ، دەتگوت دەیەوێ ئەوانەی دەوروبەری ئاگادار بکاتەوە کە چەند نەخۆشە.

ژنەکەی کە سەیری کرد، ئیدی ئەو قسان ناکات، چووە بەر پەنجەرەکە شانی دادایە سەر قەراخ پەنجەرەکە و بە ئاماژەی سەری ئاسۆی نیشاندا و بە دوورواى گوت: " وەرە ببینە بزانە چەند جوانە! "

بناری گردەکەی بەرانبەریان، تا وەکو شار، بە شێوەی نیوە بازنەیی، بە کەناراوەکەدا درێژ بووبووەوە. سەرانسەری بنارەکە پڕ بوو لە ڤێلا. لایەکی نیمچە بازنەیی، بە دەستی ڕاستا، بە دیوارێکی شەپۆلگیر کۆتایی دەهات کە شارێکی کۆن و بورجی زەنگی کلێسا کەوناراکەی دەیڕوانی بە سەریا. سەمتی چەپی کەنارەکە دەگەییە کەپک ولووتەی کروازت، کە بەرانبەر بە گراڤەکانی لیرەن بوو. ئەم دوو گراڤە وەکو دوو پەڵەی سەوز بوون لە نێو ئاوە شینباوەکەدا، لەو سەرەوە، ئەوەندە ساف و پان دیاربوون، دەتگوت دوو گەڵای گەورەن و لە ئاوەکەدا مەلە دەکەن.

له دوورتر، له‌وبه‌ری که‌نداوه‌که وله سه‌رووی دیواری شه‌پۆلگیره‌که وبورجی ناقووسه‌که‌وه، زنجیره‌یه‌ک کێوی شینباو له ئاسۆدا دیاربوون که زنار ولوتکه‌کانیان له هه‌ندێ شوێن و له هه‌ندێ جێ ڕک وتیژو له هه‌ندێ جێ خوار وکه‌چ، به ئاسمانی پرشنگداره‌وه هێڵێکی سه‌یر وجوانیان پێکدێنا. ئه‌م کێوانه به قووڵه‌و لوتکه‌یه‌کی قوچه‌کی کۆتاییان ده‌هات، که بنکه‌که‌ی له قوڵایی ده‌ریادا بوو.

خام فورستیه گوتی ئه‌وێ ئیستریله. ( ئیستریل: زنجیره کێوێکه له ویلایه‌تی پروڤانس له باشووری فه‌ره‌نسا که به‌رزترین لوتکه‌ی، زناری ونیگره ).

فه‌زا و هاماجی پشت زنار ولوتکه تاریکه‌کان، سوور بوو، سوورێکی خوێن ئاسای ئاوێته به زه‌ردێک که چاو ته‌حه‌موولی نه‌ده‌کرد.

دوروا، مه‌فتوونی ئه‌م شکۆ وجه‌لاله‌ی بولێڵه‌ی ئێواره وه‌خته‌یه بووبوو. چونکه هه‌رچی سه‌ری هێنا و سه‌ری برد، په‌یڤ و وشه‌ی باشتر وخویاتر و جوانتری بۆ ده‌ربڕینی وه‌سف و ستایشی ئه‌و دیمه‌نه بۆ نه‌دۆزرایه‌وه، له‌بن لێوانه‌وه گوتی:- به‌ڵێ، به‌ڕاستی ئه‌فسووناویه!

فورستیه سه‌ری به‌لای ژنه‌که‌یا به‌رز کرده‌وه‌و گوتی:- کوا، با تۆزێ هه‌وام بۆ بیت.

هاوسه‌ره‌که‌ی به‌رسڤی دایه‌وه:

- ئاگاداربه، دره‌نگه، خۆر به‌ره‌و ئاوابوون ده‌چێت، دووباره سه‌رمات ده‌بێت و به‌خۆت ده‌زانی، ئه‌گه‌ر به‌م حاڵه‌وه سه‌رمات ببێت، حاڵت خراپتر ده‌بێت.

فورستیه، ده‌ستی ڕاستی به خاوی ته‌کاندا، وه‌ک ئه‌وه‌ی بیه‌وێ که‌سێک به‌ر مشتان بدات و به حاڵه‌تێکی تووڕه‌وه،

حاڵەتێک کە وشکی لێو، لاوازی گۆنا و زەقی ئێسکەکانی کەسێکی لەحاڵی مەرگای زیاتر دەنواند، بە ئەسپایی گوتی:

- پێت دەڵێم خەریکە دەخنکێم. ئیدی کارم تەواوە، بۆ تۆ چ فەرقێ دەکات کە ڕۆژێ زووتر یان درەنگتر بمرم.

خانم فورستیە، پەنجەرەکەی خستە سەر گازی پشت. شنەیەک وەژوورکەوت، ئۆخژنی وەدڵ و دەروونی هەرسێکیان خست. شنەیەکی خۆش، ئارام وفێنک، وەکو شنەیەکی بەهارە کە تێکەڵەیەک بێ لە بۆنی ئەو دەوەن و گوڵە زۆرانەی کە لە بەهاراندا لەم بنار وقەدپاڵەدا دەڕوان. بۆنی تیژی شیرینەو شۆکەی درەختان و بۆنی تورتی کالیپتۆس دنیای پڕ دەکرد.

فورستیە، بە هانکەهانک و تامەزرۆیی هەوای تازەی هەڵدەمژی. نینۆکەکانی لە دەسکی قەنەفەکەی ژێریا چەقاند، بە دەنگێکی نزم، فیکەئاسا و تووڕەو خرۆشیاگەوە گوتی:

- پەنجەرەکە داخە، ئەم هەوایە ئەزیەتم دەدا. حەز دەکەم لە شکەفتێکا بمرم.

ژنەکەی بە سستی پەنجەرەکەی داخست، ئەوسا هەنیەی نا بە شووشەی پەنجەرەکەوەو چاوی بڕییە دوور.

دوروا، بە حاڵەتێکی عەزاب ئامێزەوە، حەزیدەکرد، قسە دەگەڵ دۆستە نەخۆشەکەیدا بکات، دڵخۆشی بداتەوە.

بەڵام هیچ قسەیەکی دڵخۆشکەری بۆ نەدەهات. بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- لەوەتای هاتوویتە ئێرە حاڵت برێک باشتر نەبووە؟

فورستیە، بە بێقەراری کەسێکی ماندووەوە شانەکانی هەڵتەکاند وگوتی: " بەخۆت حاڵم دەبینی. " دووبارە سەری لەبەرخۆ نا.

دورروا دووباره گوتی:- هەوای ئێره له چاو هەوای پاریسدا زۆرباشه. لەوێ چلەی زستانه. بەفر دەبارێ، دنیا یەکپارچه بەستەڵەکه، هەندێجارش باران دەبارێ و له سەعات سێی پاش نیوەڕۆوه دنیا بەڕادەیەک تاریک دەبێت که خەڵک وخوا ناچار دەبن چرا داگیرسێنن.

فورستیه پرسی:- خەبەر وباسی ڕۆژنامەکە؟

- نه، هیچی تازه نییه. ئەو کوڕه " لاکرین " یان، که له ڕۆژنامەی ڤولتیر کاری دەکرد، له جێی تۆ داناوه، بەڵام بێ ئەزموونه، جارێ لەوێیه تا خۆت دەگەڕێیتەوه.

فورستیه، به پچڕپچڕی گوتی:

- من؟ من ئیدی دەبێ بچمه ژێر دوو مەتر خاکەوەو لەوێندەرەوه نووچه وهەواڵ ئاماده بکەم.

بیری مردن، هەمیشه وەکو دەنگ و دەنگدانەوەی زەنگۆڵەیەک له هەر بیرکردنەوەو پەیڤێکیدا دەنگیدەدایەوه.

بێدەنگیەکی دوورو درێژ کەوته بەینیانەوه، بێدەنگیەکی قووڵ وبەسوێ. ڕەنگه تۆخەکانی زەردەپەڕی ئێوارێ بەرەبەره کاڵدەبوونەوەو کێوەکان له ئاسمانی سووورباوا، له تاریکیدا هەڵدەکشان. سایه وسێبەری ڕەنگاوڕەنگ که سەرەتای شەویان ڕادەگەیاند وهێشتا سوورییەکی ئاگرینی بەرەو ئاوابوونیان پێوه مابوو، دەیاندا له ناو ژوورەکه و ئیدی ڕەنگێکی ئاوێته له ڕەش وئەرخەوانی، کەل وپەل، دیوارەکان وپەردەکان وگۆشه کەنارەکانی ژوورەکەیان دەڕەنگاند. ئاوێنەکەی سەرووی موغەیرییەکە، که ئاسۆی له خۆیدا دەنواندەوه، وەکو لەوحەیەکی خوێنێن دەهاته بەرچاو.

خانم فورستیە لە جێی خۆی نەدەجولا. هەر بە دەقی خۆیەوە وەستابوو و پشتی لە ژوورەکە و هەنیەی بە شووشەی پەنجەرەکەوە بوو.

فورستیە بە دەنگێکی ماندوو، پچڕپچڕ و زیقاوڵە دەستی بە ئاخافتن کرد:

– چەند بولێڵ و زەردەپەڕی تری لەم بابەتە دەبینم؟... هەشت... دە... پازدە یان بیست... ڕەنگە سێ دانە، نەزیاتر. ئێوە بە بەرتانەوە ماوە... سەبارەت بەمن کارم کراوە، تەواو... و ژیان، وەکو ئەوەی من زندوو بم، هەر بەردەوام دەبێت... ڕەوڕەوی ڕۆژگار ناوەستێت...

چەند خولەکێک بێدەنگ بوو، ئەوسا دووبارە گوتی:

– هەرچییەک دەبینم، ئەوەم پێدەڵێت کە ئەوپەڕی چەند ڕۆژێکی دیکەیە وئیتر نایانبینم... بەڕاستی ترسناکە... ئیدی هیچ شتێک نابینم... هیچ شتێک لەو شتانەی کە هەن نابینم.... ئەو شتە بچووکانەی کە بەشەر بەکاریان دەبات... پەرداخ... قاپ وئامان.... ئەو تەختەخەوانەی کە بەشەر لە سەری دەخەوێ و ئیسراحەتی لە سەر دەکات. گەڕانی شەوان بە گالیسکە زۆر خۆشە.... چەند حەزم لەوشتانەیە...

بە ئەسپایی و بە تووڕەیی قامکەکانی هەردوو دەستی دەجولاند، دەتگوت، خەریکە لە سەر دەسکی قەنەفەکەی ژێریا پیانۆ لێبدات. بێدەنگ بوونەکانی، زۆر لە قسەکانی بە ئازارتر بوون، چونکە پیاو هەستیدەکرد، فورستیە بیر لە شتێن بە ئازار دەکاتەوە.

دوروا، لە ناکاوا، قسەکانی چەند هەفتە پێشی نوربردوڤارنی بیرکەوتنەوە: " من نها مردن ئەوەندە نزیک لەخۆم دەبینم کە زۆرجار دەمەوێ دەست درێژ بکەم ولە

خۆمی دوور بخەمەوە... مەرگ لە هەموو شوێنێک دەبینم. کە گیانەوەرانی بچووک دەبینم لە سەرجادەکان پلیشاونەتەوە، کە ئەو گەڵایانە دەبینم دەڕزێن، کە مووی سپی ڕدێنی دۆستێک دەبینم، هەموو ئەمانە دڵم تێک دەشکێنن و بانگم لێدەکەن: " ئەمەش مەرگ! "

ئەو ڕۆژە لە مانای قسەکانی ئەو حاڵی نەبووبوو، ئێستا کە فورستیەی بەم ڕەوشەوە دەبینی، پەی بەچەمک و ماناکانیان دەبرد. پەشۆکانێکی گونگ وناخۆیا و بە ئازار باڵی بە سەریا کێشا، دەتگوت مەرگی نەفرەتی، زۆر لە نزیکەوە دەبینی، لەسەر ئەم قەنەفەیەدا، کە ئەو پیاوەی لە سەر پاڵکەوتبوو و هانکەهانک ئاوزینگی دەدا، دەبینی.

حەزیدەکرد هەستێت، لەم ژوورەوە وەدەرکەوێ، هەڵێت ویەکسەر بۆ پاریس بزڕێتەوە. ئەگەر دەیزانی، هەرگیز بۆ ئێرە نەدەهات.

شەو وەکو تازیە و پرسەیەکی زوو ڕەس کە بیەوێ بدات بە سەر ئەم پیاوەدا، کە لە گیانەڵڵادا بوو، بەرەبەرە باڵی بە سەر ژوورەکەدا کێشا. تەنیا پەنجەرەکە هێشتا دیاربوو، و بەژن وبالآی بێ جووڵەی خانم فورستیە لە چوارچێوەکەیدا دیاربوو.

فورستیە بە تووڕەیی پرسی:- ئێ، کەس نییە چرایەک داگیرسێنێت؟ ئەمەش بوو بە پەرستاری نەخۆش؟

سایەی، ئەو بەژن وبالآیەی کە هێشتا لە چوارچێوەی پەنجەرەکەدا دەبینرا، دیارنەما، ئەوسا دەنگی زەنگێ هاتەگوێ کە لە هەموو ماڵەکەدا دەنگیدایەوە.

پێشخزمەتێک بە خۆ وچرایەکەوە وەژوورکەوت و چراکەی لە قەراخ موغەیرییەکە دانا.

خانم فورستیە بە مێردەکەی گوت:- حەزدەکەی بخەوی یان بۆ شێوخواردن دێیتە خوارەوە؟

شارل، لە بن لێوانەوە گوتی:- نە، دێمە خوارەوە.

بەدەم چاوەڕوانی ئامادەبوونی شێوەوە، هەرسێکیان نزیکەی یەک سەعات بێ جووڵە مانەوە. جارجار قسەیەکیان لە زار دەردەچوو، قسەیەکی ئاسایی، سواو، بێفایدە، وەکو ئەوەی ئەگەر بیانهێشتبا بێدەنگییەکە زیاتر درێژە بکێشێت، یان هەوا لەم ژوورەدا، کە مەرگ تیایدا دەخولایەوە، ماوەیەکی زۆر بی جووڵە بێ، ئەوا مەترسییەک، مەترسییەکی گونگ ڕووی دەدا.

سەرەنجام پێشخزمەتەکە هاواریکرد کە شێو ئامادەیە. ئەم چاوەڕوانییە بەلای دورواوە زۆر دوور ودرێژ و تەنانەت بێ کۆتاییش بوو. شتاقیان قسەیان نەدەکرد، هەموویان بە بێدەنگی نانیان دەخوارد و بە سەری قامکان نانەکەیان ورد دەکرد. پێشخزمەتەکە بێئەوەی کەس گوێی لە دەنگی پێی بێ، دەڕۆیی، دەهات و خواردنی دێنا. چونکە شارل بەدەنگی پێیان بێزار دەبوو، پێشخزمەتەکە، پێڵاوی بن نەرمی لەپێ کردبوو تا دەنگیان لێوە نەیەت، تەنیا چرکەچرکی میلی سەعاتە دیوارییە دارینەکە، بێدەنگی ژوورەکەی دەشڵەقاند.

هەرکە لە نان خواردن بوونەوە، دوروا بە بیانووی ماندوو بوونەوە چوو بۆ ژوورەکەی خۆی. لەوێ لەبەر پەنجەرەکەدا وەستا وکەوتە تەمەشاکردنی مانگی چواردە. مانگ تریفە سارد و ماتەکەی بە سەر دیوارانی سپی ڤیلاکاندا پەخش دەکردەوەو پولەکەی نورانی بزۆز ونەرمی بە پانتایی دەریادا بڵاودەکردەوە. جۆرج لە هەنجەتێک

دەگەڕا کە هەرچی زووترە لەوێ هەڵێت، ئیدی بیانووی بۆخۆی دروست دەکرد، بۆ نموونە بروسکەیەکی بۆ هاتووەو دەبێ بڕوات وەربیگرێت، یان ئاغای ڤالتر، داوای کردووە بە زووترین کات بزڤرێتەوە.

سبەی بەیانی کە لە خەو ڕابوو، بڕیاری هەڵاتن و جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارەی، ، دژوارترو زەحمەت تر هاتە بەرچاو. خانم فورستیە فریوی ئەم هەنجەت و بیانوانەی نەخوارد، ئەو لە ئەنجامی ئەم ترسنۆکییەدا، دڵسۆزی و مەحەبەتی ژنەی گەنج لە دەست دەدات. بەخۆی گوت: " بەڕاستی ناخۆشە، بەڵام چارچییە، ژیان ئەم دەمە ناخۆشانەشی تیایە، لەوەشە ئەم ڕەوشە زۆریش نەخایەنێ.

•

دنیا ساف وهەتاو، ئاسمان شین بوو، لە شینە تایبەتیەکانی باشووری فەرەنسا، کە دڵ لە شادیا سەرڕێژ دەکات و دوروا کە وای هەستدەکرد هێشتا زووە تا سەرێکی فورستیە بدات، لە ڤێلاکە وەدەرکەوت وبەرەو دەریا دایکێشا.

وەختایەک بۆ فراڤین گەڕایەوە، پێشخزمەتەکە پێی گوت:

" ئاغا دوو سێ جار داوای تۆی کرد، ئەگەر دەکرێ بڕۆ سەرێکی لێبدە. "

چووە سەرەوە. فورستیە بە ڕواڵەت لەسەر قەنەفەکەیدا خەوی پێدا کەوتبوو. ژنەکەی لە سەر قەنەفەیەک ڕاکشابوو و کتێبی دەخوێندەوە.

کە ئەو وەژوورکەوت، نەخۆشەکە سەری قوت کردەوە. دوروا پرسی:

- ئێ، حاڵت چۆنە؟ ئەم بەیانیە لە بەرچاوم باش دیاری.

فورستیە لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ، باشترم. کەمێک وەخۆ هاتوومەوە. خێرا فراڤینەکەت لە گەڵ مادلیندا بخۆ، چونکە دەمانەوێ بڕۆین بە گالیسکە پیاسەیەک بکەین.

مادلین، هەرکە لە گەڵ دوروا دا بە تەنێ مایەوە گوتی:

- ئەمڕۆ وا وێنا دەکات نەجاتی بووە. لە بەیانییەوە خەریکە نەخشە دادەڕێژێ وبەرنامە دادەنێت. سەعاتێکی دی دەچین بۆ کەنداوی ژوئان تا هەندێک فەخفووریان، بۆ ئاپارتمانەکەی پاریسمان بکڕێن. دەیەوێ بە هەر نرخێ بووە لە ماڵ وەدەربکەوێت. بەڵام من دەترسم پێشهاتێکی ترسناکمان بێتەڕێ. ئەو بەرگەی تەکانی چاڵ وقۆرتانی شەقامەکە ناگرێت.

کە گالیسکەکە هات، فورستیە بە کۆمەکی پێشخزمەتەکە، وردە وردە، پلە بە پلە بە قالدرمەکەدا هاتەخوارێ. بەڵام هەرکە چاوی بە گالیسکەکە کەوت گوتی چادرەکەی لابەرن.

ژنەکەی قایبل نەبوو و گوتی:- سەرمات دەبێ، ئەمە کارێکی شێتانەیە.

فورستیە بە ڕژدییەوە گوتی:- نە، حاڵم زۆر باشترە. زۆر بەچاکی هەست بەمە دەکەم.

سەرەتا بەو ڕێگا پڕ سێبەرانەدا ڕەت بوون کە بە ناو باخاندا ڕەت دەبن و (کن) دەکەن بە باخێک بە ستایلی ئینگلیزی، ئەوسا ملی جادەی " ئانتیب " یان کە بە قەراخ دەریادا دەڕۆیی گرتەبەر.

فورستیه، باسی تایبەتمەندییەکانی دەڤەرەکەی دەکرد. سەرەتا ڤیلای کونت دوپاری نیشاندان. پاشان ناوی خودان ڤیلاکانی دیکەی برد. شاد بوو، بەڵام شادییەکی سارد وسڕی کەسێکی لە حاڵی مەرگا. چونکە توانای ئەوەی نەبوو کە بازووی بەرز بکاتەوە، بە ئاماژەی قامکان ڤێلاکانی نیشاندەدان.

– سەیرە، ئەمەش گراڤی سنت مارو قەسرەکەیەتی، ئەو قەسرەی کە بازن لێوەی هەڵات. ( بازن: مارشال بازن فەرماندەی لەشکری لورن، لە جەنگی ساڵی ١٨٧٠ دا دەگەڵ ئەڵمانەکاندا کە لە گەمارۆی شاری متزدا لە لایەن سوپای ئەڵمانەوە شکستی خوارد و ڕادەست بوو، پاش زندانی کردنی لەم گراڤەدا و مەحکووم بوون بە مەرگ، لە ساڵی ١٨٧٣ دا لێرەوە هەڵات وچوو بۆ مەدرید.) هەڵبەتە بۆیە لەوێیان زندانی کردبوو تا نەتوانێت هەڵێت!

ئەوسا، یادگارییەکانی دەورانی عەسکەری و ئەو هەنگەی کە خزمەتی تیاکردبوو، بیرکەوتەوە، باسی هەندێک ئەفسەرانی کرد کە زۆرشتی دەربارەیان دەزانی. لە ناکاوا جادەکە پێچی کردەوە، لەوبەری پێچەکەوە کەنداوی ژوئان بە تەواوەتی دیاربوو، گوندە سپیەکەی لەم بەری و لووتە و کەپکی ئانتیب لەوبەرییەوە.

فورستیە کە لە ناکاوا دووچاری شادیەکی منداڵانە بووبوو بە پچڕپچڕی گوتی:

– ئاە، کەشتی جەنگی، ئێستا دەیانبینی.

لە ڕاستیا پێنج شەش کەشتی جەنگی لە ناوەڕاستی کەنداوە پان وبەرینەکەدا بوون، دەتگوت تاوێرانن و بە

هەژگ و بژاڵ داپۆشراون. کەشتی سەیر، ناجۆر و گەورە، ناقولا و بەبورج و لەنگەرانەوە دەتگوت دەیانەوێ لەبنی دەریاکەدا جێگیر ببن.

کەشتیەکان، هێندە مەزن وقورس بوون پیاو باوەڕی نەدەکرد بتوانن لە جێی خۆ بجوڵێن، دەتگوت بەبنی دەریاکەوە بەستراونەتەوە، بە تۆپخانەی مەلەوان، خڕ، بەرز، لە شێوەی بورجێن دیدەوانیا و وەکو ئەو چرا دەریاییانەی کە لە سەر تاوێران ڕۆدەنرێن.

کەشتیەکی سێ بورجی گەورە، بە مەبەستی چوونە دەریا بە لایاندا ڕۆیی. هەموو بایەوانەکانی، کە سپی و دڵگیر بوون، کردبووەوەو بەرەو ڕووی بایەکە هەڵیکردبوون. ئەم کەشتیە لە چاو ئەم دێوە جەنگیانەدا زۆر جوان و ڕێک وپێک بوو. ئەو دێوە ئاسنین و دزێوانەی لە سەر ئاوەکە خەوتبوون.

فورستیە هەوڵیدەدا یەک یەک ناویان بەرێ: " لوکلبر، لوسوفرن، دەریادار دوپرە، لورو دوتاپل، لادیڤا ستاسیون. " پاشان دووبارە گوتی:- نە، هەڵەم کرد، ئەمەیان لادیوا ستاسیونە.

گەیینە بەر خانوویەکی گەورە کە لە سەر تابلۆی سەر دەرگاکەی نووسرابوو: " سیرامیکی هونەریی کەنداوی ژوئان " گالیسکەکە بە دەوری چیمەنێکدا سووڕایەوەو لە بەردەم ڤیلایەکدا وەستا.

فورستیە دەیویست دوو گوڵدان بۆ سەر کتێبخانەکەی بکڕێت. چونکە نەیدەتوانی لە گالسیکەکە دابەزێت و بەپێیان بڕوات، نموونەی گوڵدانەکانیان، یەک یەک بۆ دێنایە لای

گالیسکەکە و نیشانیان دەدا. زۆری پێچوو، تا گوڵدانی دڵخوازی خۆی هەڵبژێرێت، هەمیشە بۆچوونی ژنەکەی و دورِوای دەپرسی:

- دەزانی، ئەمەم بۆ ئەوەیە لە سەر کتێبخانەکەی ئەوسەری ئۆفیسەکەمی دابنەم. یانی کاتێ لە سەر کورسییەکەم دابنیشم، هەمیشە لە بەرچاوم بێ. حەزدەکەم مودێلێکی کۆن بێ، بە ستایلی گوڵدانانی یونانی.

نموونەکانی، ئەم دیو وئەودیو دەکرد، دەیگوت نموونەی دیکەی بۆ بێنن، پاشان تەمەشای نموونەکانی دیکەی دەکردەوە. ئەنجام گوڵدانی دڵخوازی خۆی هەڵبژارد، پارەکەی دا و دەستووری دا بە پەلە ئەو گوڵدانانە ڕەوانەی پاریس بکەن. دەیگوت:- تا چەند ڕۆژێکی دی بۆ پاریس دەگەڕێمەوە.

بەرەومال زڤرینەوە، لێ کە بە قەراخ کەنداوەکەدا تێدەپەڕین، تەوژمە بایەکی سارد لە دۆڵێکەوە هەڵیکردو ڕێک بەرەو ڕووی ئەوان هات و فورستیەی خستە کۆکین.

لە سەرەتاوە کۆکینەکەی سووک بوو، لێ بەرەبەرە زیادی کرد، ئیدی لە یەکبینە و پەیتاپەیتا دەکۆکی و کۆکە بەری نەدەدا، ئەنجام لێیکرد بە نزگرە و خنکەخنک.

فورستیە خەریک بوو دەخنکا، هەرکاتێ بیویستبا هەناسە هەڵبکێشێت کۆکە ئەوکی دەگرت، کۆکەکەی لە قوولایی سینگیەوە هەڵدەقولا. ئیدی ئوقرەی لە بەر براببوو. بە هیچ شتێک ئارام نەدەبووەوە. ناچاربوون بە چوار دەستە لە نێو گالیسکەکەوە بۆناو ژوورەکەی بەرن. دوروا کە لاقەکانی گرتبوو، لەگەڵ هەر گرژییەکی سیپەلاکەکانیا، بە لەرزینی لاقەکانیا هەستی پێدەکرد.

گەرمای جێگە وبانەکە دادی نەدا، کۆکە تا نیوەشەو بەرینەدا. ئەنجام بە هۆی دەرمانی ئارامبەخشەوە، کۆکە بەریدا. فورستیە تا دەمەو بەیانی، بە چاوی کراوەوە لە نێو جێگاکەی دانیشت.

یەکەمین قسانێ کە کردنی ئەوەبوو کە بەربەری بۆ بێنن، چونکە مکوورِ بوو لەسەر ئەوەی هەموو بەیانییەک ردێنی بتاشێت. خۆی بۆ ئەم کارە ئامادە دەکرد، هەستا، دانیشت، بەڵام هەر زوو ناچار بوو ڕاکشێتەوەو هەناسەی هێندە بە دژواری دەهات و دەچوو وپچرپچڕ بوو کە خانم فورستیە ترسی لێنیشت و ناچاربوو دوروا کە تازە خەوتبوو، بێداربکاتەوەو داوای لێبکات بچێ بە دوای دکتۆرا.
دوروا، بەپەلە ڕۆیی، دکتۆری لەگەڵ خۆی هێنا وگەڕایەوە، دکتۆر شرووبێکی بۆ نووسی وچەند ئامۆژگارییەکی کرد. وەختایەک کە دوروا خەریک بوو دکتۆری بەڕێ دەکرد، حاڵی نەخۆشەکەی لێ پرسی. دکتۆر گوتی:

- لە گیانەڵڵادایە. ناگاتە سبەی بەیانی. ئەم ژنە گەنجە داماوە ئاگادار بکەوەو لە دووی قەشەش بنێرن. من لەوەی زیاتر هیچم بۆی لە دەست نایەت. وێڕای ئەوەش دە خزمەتتاندام.

دوروا بە پێشخزمەتەکەی گوت خانم فورستیە گاز بکات.

- چیوای بە بەرەوە نەماوە. دکتۆر دەڵێت قەشەی بێننە سەرین. دەتەوێ چ بکەی؟

ژنەی گەنج، ماوەیەکی زۆر تیاما. ئەوسا بە دەنگێکی نووساو گوتی:

- بەڵێ، واچاکترە... لە زۆر ڕووەوە... دەچم ئامادەی دەکەم و پێی دەڵێم قەشە حەز دەکات بتبینێ... ئیدی هیچی ترم بەبیرا نایەت، بە ئەرک نەبێ برۆ قەشەیەک وەدۆزەو لە گەڵ خۆتا بیهێنە، یەکێک بدۆزەوە کە زۆر بە تانی قساندا نەچێ و... پێی بڵێ تەنیا گوێ لە ئیقرارەکان (ئیعتراف) بگرێ و تەواو، ڕێ ورەسمەکانی دی بەخۆمان بسپێرێت.

دوروا، قەشەیەکی پیری خۆش مەشربی لەگەڵ خۆیدا هینا کە پڕ بە پێستی حاڵ و هەڵوێستەکەی خۆیان بوو. هەرکە یارۆی قەشە چووە دیار نەخۆشەکە، خانم فورستە لە ژوورەکە هاتەدەرێ ولە ژوورەکەی تەنیشتەوەو لە پاڵ دوروا دا ڕۆنیشت.

- کە باسی قەشەم لە گەڵیا کرد، تەواو تێک چوو، ترسێکی سەیر نیشتە سەر ڕوخساری، دەتگوت... دەتگوت هەستی کردبوو.. هەستی کردبوو کە دوا دواییەتی... هەستی کرد، کاری کراوە و تەنیا چەند سەعاتێکی لە ژیاندا ماوە.

مادلین، ڕەنگی تەواو بزرکابوو. لە سەر قسەکانی ڕۆیی:

- حاڵەتی ڕوخساریم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە. بێگومان لەو دەمەدا مەرگی بەچاوی خۆی دیتووە... ئا دیتوویەتی..

گوێی لە دەنگی قەشەکە دەبوو، چونکە گوێی گران بوو، بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد، دەیگوت:

- بەڵام، نا، نا گیانەکەم، ئەوەندەش حاڵت خراپ نییە. ڕاستە نەخۆشیت، بەڵام هیچ مەترسییەکت لە سەر نییە. کەمنیش هاتوومەتە سەرینت، وەکو دۆست، وەکو ئەرکی دراوسیاتی هاتووم.

گوێیان لە وەڵامەکەی فورستیە نەبوو. پیرەمێرد دووبارە گوتی:

- نا، ڕێوڕەسمی چەورکردنت بۆناکەم. وەختایەک حاڵت باشتربوو، پێکەوە باسی ئەو ڕێوڕەسمە دەکەین. ئەگەر حەزدەکەی، دەتوانی سوود لەم دەرفەتە وەربگری و بۆنموونە لەبەردەم مندا ئیعتراف بکەیت، منیش لاریم نییە.

من بابایەکم شوان، خوا خوامە، پەزەکانم بخەمە سەر ڕێگەی ڕاست. بێدەنگیەکی دوور ودرێژ بەرقەرار بوو. فورستیە، بێگومان بە دەنگە پچڕپچڕ و بێدەنگدانەوەکەی قسەی دەکرد. پاشان قەشەکە بە دەنگێکی جیاواز، بە ڕاوێژێکی وەعز ئاسای ناو میحرابان گوتی:

- ڕەحمەتی خوا بێکۆتاییە سروودی کونفی تیور بخوێنە، کوڕم - لەوەیە لە بیرت چووبێتەوە، دەی من یارمەتیت دەدەم. لەگەڵ مندا بیڵێرەوە: " کونفی تیور دیو ئو متی پوتانتی.... بیا تاماریا سامپر ورجینی.." ( واتە ئەی خوای توانا، دان بە هەموو شتێکا دەنەم... ئەی مریەمی پیرۆز خۆم بە تۆ دەسپێرم. )

جارجار هەڵوەستەیەکی دەکرد تا فورستیە فریابکەوێ وتەکانی ئەو دووبارە بکاتەوە ئەوسا گوتی:

- دەی هەنووکە ئیعتراف بکە کوڕەکەم..

مادلین و دوروا، لە جێی خۆیان نەدەبزوان، تەواو پەشۆکابوون ولە چاوەڕوانییەکی بەسوێ و پڕ نیگەرانیدا بوون.

فورستیە، لە بن لێوانەوە شتێکی گوتبوو. قەشەکە دووبارەی کردەوە:

- تۆ لە دووی ڕابواردنی گوناحکارانەدا بوویت... چ جۆرە ڕابواردنێک کوڕی خۆم؟

مادلین، هەستا وبە سادەیی گوتی:

- با بڕۆینە ناو حەوشە. نابێ گوێ لە ئیعترافەکانی ئەو بگرین.

چوونە ناو حەوشە ولە سەر تەختێک، لە بەر دەرگا ڕۆنیشتن. بنجە گوڵەباخێکی پڕ لە گوڵ بە دیار سەریانەوە بوو، کۆمەڵێک گوڵە مێخەک لە باخچەکەی پشتیانەوە بوو و بۆن وبەرامەیەکی نەرم وخۆشی بە هەوا پاکەکەدا پەخش دەکردەوە.

دوروا، دوای بێدەنگییەکی چەند خولەکی پرسی:- پێش ئەوەی بۆ پاریس بگەڕێیتەوە، زۆر لێرە دەمێنیتەوە؟

مادلین بەرسڤی دایەوە:- نا، هەرکە ڕێوڕەسمەکان تەواو بوون ئیدی دەگەڕێمەوە.

- یانی بۆ نموونە پازدە ڕۆژی دیکەت پێدەچێت؟

- بەڵێ، هەر دە پازدە ڕۆژێکم پێدەچێ.

دوروا، دووبارە پرسی:- باشە هیچ خزم و خوێشێکی نزیکی نییە؟

- نە، تەنیا چەند بن عامێکی دووری هەن، داک و بابیشی، کاتێ ئەو منداڵ بووە، مردوون.

بە دوو قۆڵی دەیانڕوانییە پەپوولەیەک کە بەدەم فڕینەوە بلەز لە گوڵە مێخەکێکەوە دەچووە سەری یەکێکی دی و شیلەی گوڵەکەی دەمژی وبەوە خۆراکی خۆی دابیندەکرد. کە لەسەر گوڵێک دەنیشتەوە، باڵەکانی بە ئەسپایی دەجوڵاندن. ماوەیەک بەو دەقەوە وبە بێدەنگی مانەوە.

پێشخزمەتەکە هات وخەبەری دانێ کە قەشەکە کاری خۆی تەواو کردووە. بە دوو قۆڵی بە پلیکانەکاندا سەرکەوتن.

فورستیە، لە دوێنێوە تا ئێستا لاوازتر بووبوو. قەشەکە دەستی گرتبوو.

- بە هیوای دیدار، کورەکەم، سبەی بەیانی دووبارە دێمەوە دیدەنیت.

هەنگێ لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

فورستیە کە لە سەر مردن بوو، هەرکە قەشەکە وەدەرکەوت، هەوڵیدا دەستی بەرەولای ژنەکەی بەرز بکاتەوەو بە پچرپچری گوتی:- فریام بکەوە.... نەجاتم بدە... ئازیزم... نامەوێ بمرم... نامەوێ بمرم... ئاە! فریام بکەون... پێم بڵێن کە چ بکەم، برۆن دکتۆرم بۆ بێنن... هەر دەرمانێک بڵێن دەیخۆم... نامەوێ... نامەوێ..

دەگریا، دڵۆپە ڕوندکی درشت بە سەر گۆنا ژاکاوەکانیا غل دەبووەوە، گۆشە لاوازەکانی دەمی وەکو منداڵانێک کە خەمێکیان لە دڵ بێ، چرچ بووبوون.

هەنگێ دەستەکانی کەوتنە سەر جێگەکەی، بەخاوی کەوتنە جوڵەجوڵ، لە تووایە دەیانویست شتێک لە سەر چەرچەفەکە هەڵگرنەوە.

ژنەکەشی کە کەوتبووە گریان، بە دەمە لاڵکێوە گوتی:

- نە گیانەکەم هیچ نییە. ماندوویت، سبەی هەموو شتێک دێتەوە تایم، ئەو گەشت وگەڕانەی دوێنێ ماندووی کردوویت.

فورستیە، وەکو سەگێک کە ڕای کردبێت، کەوتە هانکەهانک، هەناسەی ئەوەندە لەز وبێ ئامان بوو نەدەهاتە ژماردن، هێندەش سست بوو بەزەحمەت گوێت لێدەبوو.

بەردەوام دەیگوت و دەیگوتەوە:

- نامەوێ بمرم!... ئاخ، پەروەردگار... پەروەردگارا... خودایا... چ بەڵایەکم بەسەر هاتووە؟ ئیدی هیچ شتێک نابینم... هەرگیز... هیچ شتێک... ئاه خواگیان!

تەمەشای بەرانبەری خۆی دەکرد، چاوی بڕیبووە شتێکی نادیار وناحەز، ترسی دیمەنی ئەم شتە، بە نیگایەوە دیاربوو. دەستەکانی هەمان جووڵەی ناخۆشیان دەکرد.

لە ناکاوا لەرزێک سەراپای داگرت، بە پچڕپچڕی گوتی:- گۆڕستان... من... خوای مەزن!...

چ قسەیەکی دی نەکرد. بە هەناسەی سوار و نیگای سەرگەردانەوە لە جوڵە کەوت.

کات دەبووری. سەعاتی چاڵمەی دێرێکی ئەو نزیکانە، دەمی نیوەڕۆی ڕاگەیاند. دوروا لە ژوورەکە وەدەرکەوت تا شتێک بخوات. دوای سەعاتێک زڤڕییەوە. خانم فورستیە ئامادە نەبوو بڕوات نانێ بخوات. نەخۆشەکە هیچ جووڵەیەکی نەکردبوو، هێشتا قامکە لاوازەکانی بەسەر چەرچەفەکەدا دێنا، دەتگوت دەیویست شتێک هەڵگرێت و بەرەو دەم وچاوی خۆی ببات.

مادلین، لە سەر قەنەفەیەکی خوار تەختە خەوەکەوە ڕۆنیشتبوو. دوروا، لە سەر کورسییەکی دی لە لای ئەوەوە دانیشت و هەردووکیان بە بێدەنگی چاوەڕوانیان دەکرد.

پەرستارێک کە دکتۆر بۆ چاودێری نەخۆشەکەی ناردبوو، لە لای پەنجەرەکەوە وەنەوزی دەدا.

دوروا، بەخۆیشی خەریک بوو بەرەبەرە خەو دەیبردەوە، لە ناکاوا هەستیکرد، شتێک ڕوویداوە. وەختایەک چاوەکانی هەڵێنان، ڕێک لەو دەمەدا بینی کە چاوەکانی فورستیە، وەکو دوو پرتەوی ڕوناکی، کە بکوژێنەوە، داخران. نزگرەیەکی سووک گەرووی نەخۆشەکەی بزواندو دوو باریکە ڕچەی خوێن، بە لالغاوەکانیا هاتەخوارێ و بەسەر کراسەکەیدا ڕژا. دەستەکانی خاوبوونەوە. هەناسەی بڕابوو.

هاوسەرەکەی کە پێی زانی بوو، بەدەم گریانەوە کەوتەسەر زرانی و خۆی دا بەسەر جێگاکەیدا. جۆرج، حایر و ترساو، بێئەوەی بەدەستی خۆی بێت نیشانەی خاچی بەسەر خۆیدا کێشا. پەرستارەکە کە بێدار بووبووەوە، لە تەختەخەوەکە نزیک بووەوەو گوتی: " تەواو بووە. "

دوروا، کە هێور بووبووەوە، ئاهێکی پڕ ئاسوودەیی هەڵکێشا و لەبن لێوانەوە گوتی: " زووتر لەوەی چاوەڕوان بووم، تەواو بوو. "

کە شڵەژان و نارەحەتیەکانی سەرەتا تەواو بوو، یەکەم وەجبە گریان و ڕوندک ڕژان تەواو بوو، ئیدی ئەوەی پێویست بوو بۆ مردوویەک بکرێ، کردیان. دوروا، تا شەوێ بەم لا و بەولادا غاری دا.

وەختایەک بۆ ماڵ گەڕایەوە زۆری برسی بوو. خانم فورستیە نانێکی کەمی خوارد، ئەوسا بە دوو قۆڵی، شەوێ بەدیار مردووەکەوە ئێشکیان گرت.

دوو مۆم لەسەر تەپڵەکێک داگیرسابوون ولە تەنیشت مۆمەکانەوە چەند چڵە گوڵە میموزایەکیان لەناو پەرداخێ ئاودا دانابوو، چونکە چڵە شمشادیان کە لەم جۆرە بۆنانەدا بەکار دەبرێ دەست نەکەوتبوو.

ئەم ژن وپیاوە گەنجە بە تەنیا بە دیار کەسێکەوە دانیشتبوون کە لە دنیادا، لە ژیانا نەمابوو. بێئەوەی چ قسەیەک بکەن، بەدەم تەمەشای جەنازەکەوە لە فکران ڕاچووبوون.

بەڵام جۆرج کە لە هاماجی نیمچە تاریکی دەوری جەنازەکە نیگەران بوو، بە گۆساخی مۆرەی لێدەکرد. ئەم ڕوخسارە ژاکاو و سیسەڵەیە کە ڕۆشنایی لەرزۆکی مۆمەکە هێندەی دی لاوازتری نیشاندەدا، نیگا وبیری وی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا، بەجۆرێ ئەفسوونی دەکرد کە نەیدەتوانی چاوی لێبگوازێتەوە یان بیری لێنەکاتەوە. ئەمە دۆستەکەی فورستیە بوو کە تا دوێنێ قسەی دەگەڵ دەکرد. ئەم ئاکامەی کۆتایی ژیانی مرۆڤ، چەند بویەرێکی سەیر وترسناکە. قسەکانی نوربردوڤارنی بیر کەوتنەوە کە ترسی مەرگ باڵی بە سەراپایدا کێشابوو: " هیچ کەسێک هەرگیز ناگەڕێتەوە. " ملیۆنان و ملیارەها بەشەر دێنە دنیاوە، هەموو وەکو یەک، بە هەمان چاوانەوە، هەمان کەپوو، هەمان دەم وزار و هەمان کەللە و مێشکەوە، بێئەوەی ئەم کەسەیان، کە نها لە ناو جێگای مەرگا بێگیان ڕاکشابوو، تیابێت.

چەند ساڵێک وەکو هەموو بەشەرانی دی ژیابوو، نانی خواردبوو، پێکەنی بوو، ئاشقێنی کردبوو، هیوا وئومێدی لە

دڵا پەروەردە کردبوو. کەچی تەنها هەموو شتێک، بۆ هەمیشە، سەبارەت بەو تەواو بووبوو.

ژیانێکی پێنج و دوو ڕۆژی و ئیدی هیچ! بەشەر دێتە دنیاوە، گەورە دەبێت، خۆشحاڵە، چاوەڕوان دەکات و پاشان دەمرێت. بە دوعا ئەی ژن یان ئەی پیاو، جارێکی دی هەرگیز ناگەڕێیتەوە سەرزەوی! کەچی وێڕای ئەوەش، هەرکەس بگری خولیای عومری ئەبەدی لە دڵی خۆدا پەروەردە دەکات. ئیدی هەرکەسە جیهانێکە لە ناو جەرگەی جیهانێکی دیکەدا و هەموو کەسێک لە ماوەیەکی زۆر زۆردا، بە تەواوەتی دەڕزێ و دەپروێ تا ژیانێکی تازە، لە پاشماوەکەیەوە سەر هەڵبدا. گیا و ڕووەکان، بەشەران، ستێران، هەموو گیانیان وەبەر دەکەوێ و پاشان دەمرن، تا گۆڕانێک، چیێ ببێت. هیچ بوونەوەرێک و گیانەوەرێک چ مێروو، یان مرۆڤ، یان ستێران بێ، دووبارە ناگەڕێتەوە.

ترسێکی گونگ، گەورەو کوشندە، سواری روحی دوروا بووبوو، ترس لەم نەبوونە بێ سنوورە، لەم نەبوونە حەتمیە کە بۆ هەمیشە ئەم بوونە تیژتێپەڕ و هەژارانەیە نابووت دەکات. تەنها لە هەنبەر هەڕەشەی ئەو نەبوونە سەری دانەواندبوو. بیری لەو مێروووانە دەکردەوە کە تەنیا چەند سەعاتێک دەژین، بیری لەو گیانەوەرانە دەکردەوە کە تەنیا چەند ڕۆژێک دەژین، لەو بەشەرانە دەکردەوە کە چەند ساڵێک وهەندێجار چەند سەدەیەک عومر دەڕانن. ئاخر چ جیاوازییەک لە نێوان ئەمانەدا هەیە؟ چەند ڕۆژێک زیاتر و تەواو.

نیگای بۆ خاڵێکی دی گواستەوە تا لەوەی پتر جەنازەکە نەبینێت.

خانم فورستیەش، سەری لەبەر خۆ نابوو، وادیاربوو بیری لە بابەتێن بەسوێ دەکردەوە. قژە زەردەکەی دەوری ڕوخسارە غەمگینەکەی هێندە جوان بوو، کە هەستێکی ناسکی، وەکو هیوایەکی گونگی، لە دڵی دوروادا هاڕوژاند. ئەوێک کە هێشتا تەمەنێکی بە بەرەوە مابوو بۆ دەبێ غەمگین بێ؟

کەوتە تەمەشاکردنی ئەو. مادلین کە نقومی بیرەکانی خۆی بوو ئەوی نەدەبینی. جۆرج بەخۆی دەگوت: " وێڕای ئەمەش تاقە شتێ کە لە ژیاندا بایەخی هەبێت، هەر عەشقە! لە ئامێزگرتنی ژنێک کە پیاو خۆشی بوێ! سنوور و ئاقاری شادمانی بەشەری، تەنیا ئەمەیە و هیچی دی. "

فورستیە، زۆر بە بەخت ویەغباڵ بوو کە ئەم هاوسەرە بەهۆش وجوانەی بە نەسیب بووبوو. چۆن یەکتریان ناسی بوو؟ ئەم ژنە چۆن ڕازی بووبوو، مێرد بە پیاوێکی ناچیزو کمی وەکو ئەو بکات؟ چۆن توانی بووی ئەو بکات بە بەشەر؟

هەنگێ کەوتە بیرکردنەوە لەو ڕەمزو ڕازانەی کە لە ژیانی هەر کەسێکدا هەیە. کەوتە بیرکردنەوە لەو قسانەی کە لە پاشملە دەربارەی کۆنت دو ڤیدریک دەیانکرد و دەیانگوت گوایە جیازی بۆ کردووە و مێردی بۆ دۆزیوەتەوە.

لە ئێستا بە دواوە چ دەکات؟ شوو بەکێ دەکاتەوە؟ بە نوێنەرێکی ئەنجوومەن، وەکو خانم دوماریل دەیگوت؟ یان

بە کەسێکی خودان ئایندەیەکی درەخشان، کەسێکی لە فورستیە باشتر؟ ئایا ڕێکار ونەخشە وبەرنامەی تایبەتی هەبوو؟ چەندی حەزدەکرد ئەم شتانە بزانێت. بەڵام بۆچی لە خەمی ئەو کارانەدا بێ کە دەیەوێ بیانکات؟ ئەو پرسیارەی لە خۆی کرد و بۆی دەرکەوت کە خەم وخولیای ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەنگیزە پەنهان و ئالۆزانەی کە بەشەر لە خۆیشی دەشارێتەوەو مەگەر بە کنوکۆی زۆر لە بوونی خۆیدا، دەنای پەی پێنابات.

بەڵێ، بۆچی بە خۆی هەوڵی بە دەست هێنانی ئەو نەدات؟ ڕەنگە بۆی ببێت بە پشتیوانێکی بەهێز. بەکۆمەکی ئەو زۆر بە خێرایی و بێ چەند وچوون، دەگاتە پێگە وپایەی گەورە.

بۆچی نابێ سەرکەوتوو بێ؟ هەستی دەکرد کە بە دڵی ژنەی گەنجە و، سەبارەت بەو هەستێکی زیاتر لە هاودڵی و دۆستایەتی هەیە، جۆرە خۆشەویستی و مەحەبەتێکە کە لە نێوان دوو سروشتی گونجاودا دێتەئارا و هاوکات ڕەگ وڕیشەی دەچێتەوە سەر هاودڵییەکی بێدەنگ و نەهاتگە سەرزار. ژنەی گەنج دەیزانی کە ئەو کەسێکی زیرەک، کۆڵنەدەر و سەرسەختە و دەتوانێ متمانەی پێبکات.

مەگەر خۆی داوای لێنەکردبوو کە لەو تەنگانەیەدا بۆ ئێرە بێت؟ بۆ لە دووی ئەوی ناردبوو؟ ئایا نابێ ئەم هەڵوێست و ڕەفتارەی ئەو بەجۆرە هەڵبژاردنێک، جۆرە ئیعترافێک یان جۆرە تەفزیل کردنێک لێک بداتەوە؟ ئایا لەو ماوەیەدا کە بێوەژن کەوتنی مسۆگەر بووەو، بیری لەوە

کردووەتەوە داوای کۆمەک لەم بکات، زیاتر لەبیری ئەوەدا بووە کە هاوسەری ئایندەی خۆی دیاری بکات؟

ئیدی ئارەزوویەکی توندی لە لا دروست بوو کە پەی بەم مەسەلەیە بەرێت و پرسیار لەم ژنە گەنجە بکات کە نیازی دڵی چییە. دەبوا دوو سبەی لێرە بڕوات، چونکە نەیدەتوانی بەتەنیا لەگەڵ ئەم ژنە گەنجەدا، لەم ماڵەدا بمێنێتەوە. بۆیە دەبێ پەلە بکات، دەبێت بەرلە گەڕانەوە بۆ پاریس، بە شێوەیەکی ئاقڵانە وهێمن، پەی بە نەخشە وبەرنامەکانی ئەم ژنە سەبارەت بە ئایندەی خۆی بەرێت و نەیەڵێت ئەم هەلەی لە دەست بچێت، نەبا لە هەنبەر داوا ومکووڕی کەسێکی دیدا ڕادەست بێ و وەعد و بەڵێنێکی وەها بدات کە نەتوانێ ژێوان بێتەوە.

بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بە سەر ژوورەکەدا کێشابوو، تەنیا دەنگی چرکەچرکی سیستەماتیکی میلی سەعاتی سەر سۆپاکە، بێدەنگییەکەی دەشڵەقاند.

جۆرج، لەبن لێوانەوە گوتی:- زۆر ماندوویت، ها؟

ژنەی گەنج بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ، خۆم بە پێوە ناگرم.

دەنگدانەوەی دەنگەکانی خۆیان سەرسامی کردن. دەنگەکان لەم ئاپارتمانە چۆڵ و شوومەدا، دەنگدانەوەیەکی سەیری هەبوو. هەردووکیان پێکڤە، تەمەشای ڕوخساری جەنازەکەیان کرد، دەتگوت چاوەڕوانی ئەوە بوون بزانن ئاخۆ وەکو چەند سەعاتی لەمە پێش دەجووڵێت، قسە دەکات.

دوروا، دووبارە گوتی:- حەیفێ، مردنی ئەو بۆ تۆ جەزرەبەیەکی قورسە، گۆڕانێکی گەورەیە لە ژیانت،

گۆڕانێکی ڕاستەقینە و کوت وپڕە لە هەست و لە جۆری ژیانت.

ژنەی گەنج بێئەوەی هیچ وەڵامێک بداتەوە، ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا.

دوروا، درێژەی بە قسەکانی دا:- بۆ ژنێکی گەنجی وەکو تۆ ئەم تەنیاییە کوت وپڕە زۆر زەحمەتە.

ئەوسا بێدەنگ بوو. ژنەی گەنج دیسان هیچ قسەیەکی نەکرد. دوروا بە پچرپچری گوتی:

- بە هەرحاڵ، بەخۆت دەزانی چ پەیمانێک لە نێوان ئێمەدا هەیە، تۆ چۆنت بوێ لە خزمەتتدام. من هی تۆم.

ژنەی گەنج، دەستی بۆلای ئەو درێژکرد، نیگایەکی خەمناک و مەحەبەت ئامێزی ئەوی کرد، لەو نیگایانە بوو کە تاسەر مۆخی ئێسکان دەبڕێ.

- مەمنوونم، لوتفت هەیە، کەسێکی بێ هاوتایت. ئەگەر جورئەتم هەبوایە و ئەگەر بمتوانیبا کارێکت بۆ بکەم، منیش پێم دەگوتی هەرکارێکم لە دەست بێ، درێغیت لێناکەم.

دوروا، دەستی ژنەی گەنجی، کەبۆی درێژ کردبوو، هەر لە ناو دەستی خۆیدا ڕاگرتبوو و دەیگوشی، پڕ بەدڵ حەزی دەکرد ماچی بکات. سەرەنجام بڕیاری داو دەستی ژنەی گۆرینی لە دەمی نزیک کردەوەو ماوەیەکی زۆر ماچیکرد.

پاشان کە هەستیکرد ئەم نەوازشە دۆستانەیە زۆری خایاند، ناچاربوو دەستە چکۆلە و ناسکەکەی بەربدات. دەستی ژنەی گەنج بە نەرمی کەوتە سەر ڕانەکانی و بە ڕاوێژێکی جدی گوتی:

- ئەرێ، بەڕاستی تەنیا دەبم، لێ هەوڵدەدەم نەترە بەرنەدەم.

جۆرج نەیدەزانی چۆن تێی بگەیەنێت کە زۆر خۆشحاڵ دەبێ، فرە بەختەوەر دەبێت ئەگەر ئامادەبێت شوو بەم بکاتەوە. هەڵبەتە لەم هەڵوێستەدا و لەم شوێنەدا و لەهەنبەر ئەم جەنازەیەدا، نەیدەتوانی ئەم قسەیە دەگەڵ ئەودا بکات. وێڕای ئەوەش وای وێنا دەکرد، دەتوانێ ڕستەیەکی دوولۆنە، گونجاو ولەبار بدۆزێتەوە، ڕستەیەک کە هەندێک بە توێکڵ بێ و پیاو بتوانێ لە میانییەوە، مەبەستی خۆی لە بەرانبەرەکەی بگەیەنێت.

لێ ئەم جەستە بێ جووڵەیەی کە لە بەرانبەریان داو لە سەر جێگاکە کەوتبوو و لەمپەڕی دەخستە نێوانیانەوە، بواری نەدەدا. لە لایەکەوە، هەمووی چەند خولەکێک لەمەپێش هەستی دەکرد، بۆنێکی ناخۆش لە ناو ژوورەکەدا پەنگاوەتەوە، بۆنێکی ناخۆش کە لەم سینە داڕزاوەوە بەرز دەبووەوە، یەکەمین بۆنی مەرگ، کە لە مردوویەکی بێنەواوە، دەگەییە کەپووی ئەو کەسانەی شەوێ بەدیارییەوە دادەنیشن... بۆنێک کە لە ئان و ساتدا، تابووتەکە پڕدەکات.

دوروا، پرسی:- ئەرێ ناکرێ، پەنجەرەکە کەمێک بکرێتەوە؟ هەست دەکەم هەوای ژوورەکە زۆر ناخۆش بووە.

ژنەی گۆرین بەرسڤی دایەوە:- بۆ نا، منیش هەستدەکەم بۆنێکی ناخۆش لە ژوورەکەدا پەنگاوەتەوە.

دوروا، بەرەولای پەنجەرەکە ڕۆیی و کردییەوە. شێبایەکی تەڕ و فێنک و بۆنخۆش وەژوورکەوت و شولەو گڕی مۆمەکانی، کە بە دیار جەنازەکەوە دەگران هێنایە

لەرزین و سەما. مانگ وەکو شەوی پێشوو، بێ درێغ دەیدا لە دیواری سپی ڤێلاکان و ڕووی بەرینی دەریا. دوروا، کە بە نەفەسی قووڵ هەواکەی هەڵدەمژی، لە ناکاوا دڵی پڕ بوو لە هێڤی و ئومێدان، وەکو ئەوەی لەرزینی گڕی مۆمەکان بەختەوەری ئەویان لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنابووبێ.

ڕووی کردە ژنەی گەنج وگوتی:- وەرە، کەمێک هەوای تازە هەڵمژە. چ شەو و چ هەوایەکی دڵگیرە.

ژنەی گەنج بەهێوری بەرەو نک ئەوچوو، ئانیشکەکانی نانە قەراخ پەنجەرەکە.

هەنگێ دوروا، بە ئەسپایی و لە بن لێوانەوە گوتی:

- گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم و باش گوێ لە قسەکانم بگرە، لێم مەگرە کە لەم کاتەدا ئەم قسانە بەتۆ دەڵێم، لێم توورە مەبە. چونکە من دووسبەی بۆ پاریس دەگەڕێمەوە، ڕەنگە تا تۆ بۆ ئەوێندەر دەگەڕێیتەوە، کاتی ئەم قسانە درەنگ بووبێ. بەخۆت چاک دەزانی من کەسێکی لات ولەوێر و نەبووم و دەبێ چاوەڕوانی ئایندە بم تا ڕەوشم باشتر بێ، بەڵام ئیرادەو ویستم هەیە، کەمێک ئاوەزیشم هەیە. وا هەستدەکەم ئەم ڕێگایەشم گرتووەتەبەر، ڕێگای دروستە. هەموو کەسێک دەزانێ لە گەڵ پیاوی کارامە و بە ئەزموونداچۆن بەرخورد ومامەڵە دەکات، بەڵام کەسێ کە تازە ڕێگەیەکی گرتبێتەبەر، پیاو نازانێ سەر لە کوێوە دەردێنێت. چ باش، یان باش. بە هەرحاڵ ئەگەر بیرت مابێ، ڕۆژێ لە ماڵی ئێوەدا گوتم کە باڵاترین حەز و ئارەزووم ئەمەیە کە دەگەڵ ژنێکی وەکو تۆدا زەماوەند بکەم. وەڵامم مەدەوە، با قسەکەم تەواو بکەم. ئەم قسانەی دەگەڵ تۆدا

دەیکەم داوا نییە، چونکە لەم کاتە و لەم شوێنەدا، هەر داوایەک کارێکی نابەجایە. تەنیا مەبەستم ئەمەیە کە تۆ ئاگادار بکەم دەتوانی بەیەک وشە من بەختەوەر بکەیت و، هەروەها دەتوانی من بکەی بە دۆستێکی ڕاستەقینە و برا ئاسا، یان بە مێردێکی بەختەوەر، ئیدی بەکەیفی دڵی خۆت، حەز دەکەم ئەوەش بزانیت لە هەردوو حاڵەتەکەدا، بەدڵ و بەگیان دەخزمەتتدا دەبم. داوات لێناکەم ئێستا بەرسڤم بدەیتەوە. حەزناکەم لەمبارەیەوەو لەم شوێنەدا، چ قسەیەکی دی بکەم. وەختێ لە پاریس یەکمان بینییەوە، دەتوانی تێم بگەیەنیت کە چ بڕیارێکت داوە. تا ئەوکاتە هیچ قسەیەک لەو بارەیەوە ناکەین، باشە؟

بەدرێژی ئەو ماوەیەی ئەو قسانەی دەکرد، تەمەشای ژنەی گۆرینی نەکردبوو، وەکو ئەوەبوو هەموو ئەوقسانە بۆ شەوەکە بکات. ژنەی گەنج بەجۆرێ لەبەردەمیا حایر مابوو وەکو ئەوەی گوێی لە قسەکانی ئەو نەبێت. بەنیگایەکی مەند وگونگ، دەیڕوانییە ئەو دیمەن و تابلۆ گەورە کاڵەوە بووەی بەردەمی کە هەیڤە شەوەکە لێی دەدا وڕوناکی دەکردەوە.

ماوەیەکی زۆر بە هەمان دەقەوە، شانبەشانی یەکدی، بێدەنگ ونوقمی خەیاڵان مانەوە.

سەرەنجام ژنەی گەنج گوتی:

– ˚ کەمێک ساردی کرد. ˚ ئەوسا بۆلای تەختەخەوەکە گەڕایەوە و دوورواش دوای کەوت.

وەختێ دوروا لە تەختە خەوەکە ˙ نزیک بووەوە، هەستیکرد جەنازەکە بەڕاستی خەریکە بۆن دەکات. کورسییەکەی کەمێک لە کەتەکە دوورخستەوە، چونکە

نەیدەتوانی ماوەیەکی زۆر بەرگەی ئەم بۆنە بگرێت. پاشان گوتی:- سبەی بەیانی پێویستە یەکسەر لە تابووت بنرێت.

ژنەی گەنج وەڵامی دایەوە:- بەڵێ، بەڵێ، وایە. سبەی دەوروبەری سەعات هەشت تابووت سازەکە دێ.

ئیدی کەمتر تەمەشای جەنازەکەیان دەکرد، خەریک بوو دەگەڵ مردنەکەی فورستیەدا ڕادەهاتن. بەرە بەرە ئەم مردنەیان، کە تا سەعاتێ لەوە پێش نیگەران و ناڕەحەتی دەکردن، لە لا ئاسایی دەبوو، هەرچەندە خۆشیان گیای مردنێ بوون.

لە قسان بوونەوە. مات وبێدەنگ، بەڕێز وحورمەتەوە، بە دیار جەنازەکەوە، بەبێئەوەی بخەون، شەونخونیان دەکرد. لێ دەوروبەری نیوەشەو، دوروا خەوی لێکەوت. وەختایەک بێدار بووەوە بینی خانم فورستیەش خەوی لێکەوتووە. کەمێک لە سەر کورسییەکە جوڵا تا جێگاکەی خۆی تۆزێ خۆشتر بکات، پاشان دووبارە چاوانی نوقاندن و بەدەم خوتە خوتەوە، لە بن لێوانەوە گوتی: " شەیتان بە نەحلەت بێ، ئینسان لە ناو جێگادا زۆر ئاسوودەترە! "

دەنگێک، لە ناکاوا لە خەوی ڕاپەڕاند. پەرستارەکە وەژوورکەوت. بە تەواوی ڕۆژ بووبووەوە. ژنەی گەنجیش کە ڕوو بە ڕووی ئەو لە سەر قەنەفەیەک ڕۆنیشتبوو، بەهەمان ئەندازە حایر وحەپەساو دەهاتە بەرچاو. ڕەنگی کەمێک پەڕی بوو، لێ هەرچەندە شەوێکی ناڕەحەتی لەسەر ئەم قەنەفەیە بەسەر بردبوو، بەڵام هەر گەش و پاراو، جوان و میرەبان بوو.

دوروا کە چاوی بە جەنازەکە کەوت ڕاچڵەکی و هاواریکرد: " ئا، ئا ڕیشی! " ڕدێنی لە زەرفی ئەم چەند

سەعاتەدا، لە روویا ڕوابووەوە، وەکو ئەوە بوو لە ڕووی کەسێکی زندوو ڕوابێتەوە. هەردووکیان لە دیتنی ئەم حاڵەتی زندووبوونە، بە ڕوو و ڕوخساری کەسێکی مردووەوە، هەراسان بوون، وەکو ئەوە بوو بویەرێکی پەڕجووئاسای ترسناک ڕووی دابێ، یان کەوتبنەبەر هەڕەشەیەکی نائاسایی، زندوو بوونەوەی مردوویەکەوە، یان ڕووبەڕووی یەکێک لەو مەسەلە نائاسایی و ترسناکانە بووبنەوە، کە ئینسان شپرزە دەکەن وئەقڵی دەبەن.

دوای هاتنی پەرەستارەکە، هەردووکیان ڕۆیشتن تاوەکو تا سەعات یازدە ئیسراحەت بکەن. پاشان جەنازەکەی " شارل " یان لە تابووتەکە نا، ئیدی هەستیان بە ئاسوودەیی کرد. بۆ فراڤین ڕوو بە ڕووی یەکدی لە دەوری مێزێک ڕۆنیشتن و، دەستیان بەقسانی تەسەلابەخش و شاد کرد، نها کە کاریان دەگەڵ مردووەکەدا تەواو بووبوو، دووبارە دەگەڕانەوە سەر ژیانی ڕۆژانەی خۆیان.

گەرمایەکی خۆشی بەهاری لە پەنجەرە کراوەکەوە دەهاتە ژوورەوە و بۆن و بەرامەی ئەو گوڵە مێخەکانەی کە لەبەر پەنجەرەکەدا ڕوێنرابوون، دەگەڵ خۆیدا دێنایە ژوورەوە.

خانم فورستیە، بە دوروای گوت کە پیاسەیەکی ناو حەوشەکە بکەن، بە دەوری چیمەنە بچووکەکەدا کەوتنە پیاسە وڕاوێچکە و بەکامی دڵ هەوای فێنکی ئاوێتە بە بۆنی دار کاژ و کالیپتوس – یان هەڵدەمژی.

ژنەی گەنج، لە ناکاوا دەستی بە قسان کرد، هەڵبەتە بێئەوەی سەری بۆلای ئەو وەربگێڕێت، واتە هەمان کاری

کرد کە دوێشەوو لە ژوورەکەدا کردبووی. وشەکانی بەکاوەخۆ و بەدەنگێکی هێواش وپڕ ویقارەوە دەدرکاند:

- گوێ بگرە دۆستی زۆر ئازیز، من بیری خۆم کردووەتەوە.. سەبارەت بەو پێشنیازەی بۆ منت کرد، حەزناکەم بیەڵم بە بێ وەڵام بۆ پاریس بگەڕێیتەوە. نە بە بەڵێ وەڵامت دەدەمەوە ونە بە نەخێر. چاوەنۆڕ دەکەین، بابزانین چ دەبێ، زیاتر وباشتر یەکدی دەناسین. تۆش بەچاکی بیر لەم مەسەلەیە بکەوە. ڕادەستی ویست و بڕیاری سەرڤەسەرڤە و ڕەوتەنی مەبە. هەڵبەتە کە پێش بەخاکسپاردنی ئەم شارلە بێنەوایە، لە مبارەیەوە قسان لەگەڵ تۆدا دەکەم، هۆیەکەی ئەمەیە کە دوای ئەو قسانەی کە لەگەڵ مندا کردت، زۆر پێویستە کە چاک بزانیت من کێم، تا ئەگەر لە حاڵەتێکا ئەو کەسە نەبووی... کە بتوانی من دەرک بکەی و تەحەموولم بکەیت، تا زیاتر خۆت بەو خواست و بیرانەوە خەریک نەکەیت کە بۆ منت دەربڕین. چاک بزانیت کە زەوجین و زەماوەند بۆمن و بەلای منەوە، قەید وبەند نییە، بەڵکو جۆرە شەراکەتێکە. من دەمەوێ ئازاد بم، ئازادی تەواو، سەبارەت بەو کارانەی دەیکەم. سەبارەت بە ڕەفتارم، کردارم، ڕۆیشتنم، هاتنم. من سەبارەت بە ڕەفتارم نە حەسوودی و غیرە قەبووڵ دەکەم، نە چاودێری کەس و نە چەلەحانێ و چەندوچوون قەبووڵ دەکەم. هەڵبەتە بەڵێن دەدەم بە هیچ جۆرێ ئابڕووی ئەو پیاوە ناخەمە خەتەرەوە کە زەماوەندی دەگەڵ دەکەم وهەرگیز نایکەم بە قەشمەر وگەپجاڕی خەڵکی. بەڵام ئەو پیاوەش دەبێ لەلای خۆیەوە بەڵێن بدات، بەچاوی یەک هاوتا، یەک

شەریکەوە تەمەشام بکات، نەک بەچاوی کەسێکی ژێردەست و نەک بەچاوی هاوسەرێکی ملکەچ و گوێڕایەڵ. من ئەمە چاک دەزانم کە هزرینی من وەکو خەڵکانی دی نییە، بەڵام من بە هیچ کلۆجێ ئامادەنیم، دەستبەرداری بم یان بیگۆڕم.

دەبێ ئەوەش بێژم: هیچ وەڵامێکی من مەدەوە، نە فایدەی هەیە و نە وەختیەتی. هەرکاتێ یەکدیمان بینییەوە، دەکرێ گەنگەشەیەکی دیکە لەمبارەیەوە بکەین. نها بڕۆ پیاسەیەک بکە. منیش دەگەڕێمەوە بۆلای ئەو، شەوێ یەکدی دەبینینەوە.

دوروا، ماوەیەکی زۆر دەستی ئەوی ماچکرد و پاشان بێئەوەی تاقە یەک قسە بکات، ڕۆیی.

شەوێ تەنیا لە کاتی شێو خوارنا یەکدییان بینی، پاشان چونکە هەردووکیان شەکەت و ماندوو بوون، هەریەکە، چوو بۆ ژووری خۆی تا بنوون.

جەنازەکەی شارل فورستیە، بۆ سبەی بێهیچ جۆرە ڕێ ورەسمێک لە گۆڕستانی (کن) بەخاک سپێردرا. جۆرج دوروا، بڕیاریدا سەعات یەک و نیوی دوانیوەڕۆ، بە قیتاری لەزگین بۆ پاریس بزڤڕێتەوە.

خانم فورستیە، لەگەڵیا بۆ وێستگەی قیتار ڕۆیی و بەدەم چاوەڕوانی هاتنی قیتارەکەوە، بە ئاسوودەیی، لە وێستگەکەدا و بەدەم پیاسەوە، باسی زۆر مەسەلەێن ئاساییان کرد.

قیتارەکە گەییە وێستگەکە، تەنیا پێنج ڤارگۆنی پێوەبوو، بەڕاستی زۆر لەزگین بوو. دوروا، خۆی بە ڤارگۆنێکدا کرد، جێگای خۆی گرت و ئەوسا دابەزی تا کەمێکی دی قسە

دەگەڵ ژنە گەنجەکەدا بکات. چونکە لەو هەڵدەبڕا، لە ناکاوا دووچاری خەم و پەژارەیەکی توند بوو، دەتگوت بۆ هەمیشە لەو دادەبڕێت.

ماموری قیتارەکە هاواریکرد: " نەفەرێن مارسی، لیون و پاریس، سواربن."

دوروا، سوار بوو، لێ لە پەنجەرەی ڤارگۆنەکەوە سەری دەرهێنا تا دووبارە چەند قسەیەکی دی دەگەڵ ژنەی گەنجدا بکات. مەکینەی قیتارەکە شووتێکی لێدا و پیرە قیتار بە نەرمی کەوتەڕێ.

جۆرج، هیشتا هەر سەری لە پەنجەرەی ڤارگۆنەکەوە دەرهێنابوو و تەمەشای خانم فورستیەی دەکرد، کە بە نیگا ئەوی بەڕێدەکرد. لەوکاتەدا کە ژنەی گەنج خەریک بوو لە چاوی ون دەبوو، هەردوو دەستی بۆ زاری برد و ماچێکی هەوایی بۆ ڤڕێکرد.

ژنەی گەنجیش، بە دوو دڵی، بە پارێزەوە و بەدزییەوە، ماچەکەی بۆ سەندەوە.

# بەشی دووەم

( ١ )

جۆرج دوروا، ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەی خۆی دەست پێکردبووەوە. لە ئاپارتمانێکی بچووکی قاتی خوارەوە دا، لە شەقامی کونستانتینوپلدا، ژیانێکی ماقوولی بەسەر دەبرد، وەکو پیاوێک کە خۆی بۆ ژیانێکی تازە ئامادە بکات. تەنانەت پەیوەندی دەگەڵ خانم دوماریلدا، شێوەیەکی ژن و مێردانەی لەخۆ گرتبوو، دەتگوت دەیویست، خۆی بۆ ژیانی ژن و مێردایەتی ئاییندە ڕادێنێت.

گراویێ وماشقەکەی کە زۆرجار سەری لە ئارامی و ڕێک وپێکی پەیوەندیەکانی خۆیان دەسوڕما، بەدەم زەردەخەنەوە دەیگوت: " تۆ لە مێردەکەشم گوێڕایەڵ تر بووی. "

خانم فورستیە هێشتا بۆ پاریس نەگەڕابووەوە. هەر لە کن مابووەوە. نامەیەکی ئەوی پێگەیی کە دەیگوت لە نیوەی نیساندا دەگەڕێتەوە، بێئەوەی هیچ ئاماژەیەکی بۆ خاترخوازیە ڕاستگۆیانەکەیانی کردبێت. دوروا، چاوەڕوان بوو. ئێستا سوور بوو لە سەر ئەوەی کە ئەگەر خانم فورستیە، هەردوو دڵییەک نیشانبدات، ئەوا، بە مەبەستی خواستنی، پەنا وەبەر هەر ڕێگەیەک بەرێت. بەڵام متمانەی تەواوی بەخۆی هەبوو، کە هێزێکی پەنامەکی و ئەفسوونێکی ئەوتۆی تیایە کە هەرژنێک ڕادەکێشێت و ژن نییە بتوانێ خۆی لە بەری بگرێت.

نامەیەکی کورت، ئاگاداری کردەوە کە کاتی گرینگ و بنجبڕی چارەنووسی بەو زووانە دێتەدی. " من لە پاریسم، وەرە دیدەنیم. "

" مادلین فورستیە "

هیچ شتێکی دی تیا نەنووسرابوو. نامەکەی بە پۆستەی سەعات نۆی بەیانی، گەییە دەست. هەر ئەو ڕۆژە سەعات سێی دوانیوەڕۆ، چوو بۆ دیدەنی ژنەی گەنج. مادلین، بە بزەیەکی دڵنەواز وبە میهرەبانییەوە تەوقەی دەگەڵدا کرد. بۆ چەند ساتێک چاویان لە دورچاوی یەکدی بڕی.

ئەوسا مادلین لە بن لێوانەوە گوتی:- بەڕاستی لوتفێکی زۆرت کرد کە لەو تەنگانەو هەلومەرجە دژوارەدا بۆ ئەوێندەر هاتی و لە گەڵما مایتەوە.

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- هەر کارێکی دیکەشت لێداوا بکردمایە، بۆم دەکردیت.

چوون دانیشتن، مادلین لە خەبەر وباسی پاریس و، حاڵی خانەوادەی ڤالتر و هەموو هاوکارانی ڕۆژنامەکەی پرسی. هەمیشە بیری لە لای ڕۆژنامەکە بوو.

- بیری حاڵ وهەوای ڕۆژنامەکە دەکەم. من بە هەموو بوونمەوە بووبووم بە ڕۆژنامەوان. ئەم کارەم زۆر خۆشدەوێ.

ئەوسا بێدەنگ بووم. جۆرج وای بۆچوو لە بزەکەی ئەوا، لە ڕاوێژی دەنگیا و، تەنانەت لە قسەکانیشیا، جۆرە دەعوەتێک پەنهانە، هەرچەندە بەڵێنی بەخۆی دابوو، پەلە نەکات، بەڵام هەربەخۆی نەوەستا وبەدەمەلاڵکێوە گوتی:-

ئێ... بۆ... بۆچی ناگەڕێیتەوە سەر ئەم کارە... ئەم پیشەیە... ئەمجارەیان... بە ناو وناسنامەی دورواوە؟

مادلین، لە ناکاوا دەستی خستە سەر بازووی ئەو وبەجدی و لەبن لێوانەوە گوتی:- واچاکە جارێ باسی ئەم بابەتە نەکەین.

لێ جۆرج هەستیکرد، پێشنیازەکەی قەبووڵ کردووە، لە هەنبەریا چۆکی دادا، بەکوڵ و بەدڵ دەستی ماچکرد و بەدەمەلاڵکێوە گوتی:- مەمنوونم، مەمنوونم، تەحا کە خۆشم دەوێی.

مادلین، لە جێی خۆی هەستا، جۆرجش هەستا، سەیری کرد ڕەنگ بەڕوویەوە نەماوە. هەنگێ بۆی بە دیارکەوت کە چووەتە دڵی ئەوەوەو ڕەنگە لە مێژیش بێ بۆی لێدرابێ، چونکە بەرانبەر بە یەک وەستابوون، جۆرج لە ئامێزی گرت، ئەوسا هەنیەی ڕامووسی، ڕامووسانێکی مەحەبەتامێز وسەلارانە.

وەختایەک مادلین، بە سەر سینگی ئەودا داخزی و خۆی لە هەمێزی دەرهێنا، بەڕاوێژێکی جدی گوتی:

- گوێبگرە، دۆستی ئازیز، من هێشتا هیچ بڕیارێکم نەداوە. بەڵام وێڕای ئەمەش، ئەگەری ئەوە هەیە وەڵامەکەم ئەرێ بێ. بەڵام دەبێ بەڵێنم بدەیتێ کە ئەم بابەتەت لە دەم دەرنەچێت تا ئەو کاتەی خۆم ئیزنت دەدەم.

لە کانگای دڵەوە سوێندی بۆ خوارد و بەدڵێکی شاد و پڕ لە ئومێدەوە، لە ماڵەکەی ئەو وەدەرکەوت.

لە دیدارەکانی دواتریا، پارێزێکی زۆری دەکرد، داوای ئەوەی لێنەکرد، کە بە ڕاشکاوی ڕەزامەندی خۆی دەرببڕێت، چونکە مادلین بەجۆرێ باسی ئایندەی دەکرد

وده‌یگوت: ˝ پاشان ˝ هه‌ندێ به‌رنامه و نه‌خشه‌ی ئه‌وتۆی ده‌خسته‌ڕوو که په‌یوه‌ندی به ژیانی هه‌ردووکیانه‌وه هه‌بوو، نه‌خشه وبه‌رنامه‌گه‌لێک، که هه‌میشه باشتر و ناسکتر بوو، له وه‌ڵامی بنجبڕ و قه‌بووڵ کردنی فه‌رمی.

دوروا، له‌وه به دواوه، زیاتر وجدیتر کاری ده‌کرد، خۆی له زیاده مه‌سره‌ف و ده‌ستبڵاوی بێهوده ده‌پاراست و، هه‌وڵیده‌دا پاره وپولێک پاشه‌که‌وت بکات تا له کاتی زه‌ماوه‌نده‌که‌دا زۆر نه‌دار و لات وله‌وێر نه‌بێت. ڕێک به پێچه‌وانه‌ی جارانه‌وه که زور ده‌ستباد بوو، هه‌نووکه چرووک و ئاڵچاخ بووبوو.

هاوین بووری، پاییزیش تێپه‌ڕی، بێئه‌وه‌ی چ که‌سێک به به‌ینیان بزانێ، چونکه زۆر که‌م یه‌کتریان ده‌بینی و ئه‌و بینینه‌ش له ناو خه‌ڵکی و له کۆڕ و میوانی و ئاهه‌نگاندا بوو.

شه‌وێک مادلین، که به گومانه‌وه ته‌مه‌شای چاوانی ئه‌وی ده‌کرد، گوتی:

– هێشتا ده‌رباره‌ی نه‌خشه و ڕێگاکانی ئاینده‌مان هیچت به‌خانم دوماریل نه‌گوتووه؟

– نا، دۆستی ئازیز، چونکه به‌ڵێنم به تۆ دابوو، تاقه یه‌ک وشه‌م له‌م باره‌یه‌وه به‌که‌س نه‌گوتووه.

– زۆرچاکه، ئیدی وه‌ختی ئه‌وه هاتووه پێی بڵێیت. منیش به ڤالتر وهاوسه‌ره‌که‌ی ده‌ڵێم. ئه‌م هه‌فته‌یه ده‌یبرێنینه‌وه، نا؟

جۆرج سوور بووه‌وه:– به‌ڵێ، له سبه‌یه‌وه.

مادلین، به هێوری چاوی بڕییه‌خاڵێکی دیکه. ده‌تگوت ده‌یویست وا بنوێنێ که هه‌ستی به په‌شۆکانه‌که‌ی ئه‌و نه‌کردووه، ئه‌وسا درێژه‌ی به قسه‌که‌ی دا:– ئه‌گه‌ر ڕازی

بیت، لە هەوەڵی هەیڤی مایسدا زەماوەند دەکەین. ئەمە زۆر گونجاوترە.

- بە دڵی تۆ، هەرچییەک بڵێیت ڕازیم.

- ڕۆژی دەیەمی مانگی پێنج کە دەکاتە شەممە، ڕۆژی دڵخوازی منە، چونکە ساڵڕۆژی لە دایکبوونمە.

- باشە، دەی هەیڤی پێنج باشە.

- باوک و دایکت لە نزیکی روئان دەژین، وانا؟ هەڵبەتە وەکو لە خۆتم بیستووە.

- بەڵێ، لە نزیکی روئان، لە کانتیلون.

- لەوێ چ دەکەن؟

- لەوێندەر... وردە کاسبی دەکەن.

- ئاە، زۆر حەزدەکەم ناسیاویان لەگەڵ پەیدا بکەم.

دوروا، کەمێک پەشۆکا:- بەڵام... مەسەلەکە ئەمەیە...

پاشان وەکو پیاوێکی بە ورە، قرێری خۆی دا و لە سەری ڕۆیی:

- دۆستی ئازیز، ئەوان دێهاتین، مەیخانەیەکیان هەیە وهەموو هەوڵێکی خۆیان داوە تا بتوانم درێژە بە خوێندن بدەم. من بە هەبوونی ئەم داک وبابە شەرمەزارنیم، لێ... ساویلکەییان... تەبیعەتە دێهاتیەکەیان، لەوەیە بە دڵی تۆ نەبێت.

ژنەی گەنج ناو بە ناو بزەیەکی دڵگیری دەکرد، مەحەبەتێکی ڕاستگۆیانە دەنیشتە سەر ڕوخساری.

- نا، بێگومان خۆشم دەوێن، بەدڵم دەبن. دەچینە دەیدەنییان. من ئەمەم دەوێ. دوایی لەمبارەیەوە قسەت لەگەڵدا دەکەم. منیش لە بنەماڵەیەکی نەدارو دەستکورتم... لێ من داک وبابم نەماون. لەم دنیا گەورەیەدا هیچ کەسێکم

نییە. دەستی بەرەو نک وی درێژ کرد و لە سەری ڕۆیی: جگە لە تۆ.

جۆرج، هەستیکرد هیچ ژنێک تا نها نەیتوانیوە بەمجۆرە ختووکەی سۆزی بدات، تەژی ڤیانی بکات و دڵبەندی خۆی بکات.

ژنەی گەنج گوتی:- شتێکم بەبیرا هات، هەرچەندە ڕوونکردنەوەی زۆر زەحمەتە.

جۆرج پرسی:- ئەو شتە چییە؟

- ئازیزەکەم، منیش وەکو هەر ژنێکی دی... خاڵێن لاواز و نەرێنی خۆم هەیە، حەزم لە ڕواڵەتپەروەری و ناو وناوبانگی گەورە هەیە. هەمیشە حەزمکردووە ناسناوێکی ئەشرافیانەم هەبێت، ئایا تۆ بەبۆنەی زەماوەندەکەمانەوە، ناتوانی ناو و شۆرەتێکی ئەشرافیانە بۆ خۆت تەرتیب بکەیت؟

ژنەی گەنج، کە ئەو قسەیەی کرد سووری سوور بووەوە، دەتگوت قسەیەکی دوور لە نەزاکەتی کردبوو.

دوروا، ساویلکانە وەڵامی دایەوە:- منیش زۆر کەڕەت بیرم لەم بابەتە کردووەتەوە، بەڵام هەرچی سەردێنم و سەردەبەم، ئاسان نایەتە بەرچاوم.

- بۆچی ئاسان نییە؟

جۆرج دەستی بەپێکەنین کرد:- دەترسم ببم بە گەپجاڕ.

ژنەی گەنج شانەکانی هەڵتەکاندن وگوتی:- وانییە، ئاخر لەبەرچی. هەمووان ئەم کارە دەکەن وکەسیش گاڵتەیان پێناکات. تۆتەنیا ئەوەندەت لە سەرە کە ناوەکەت بکەی بە دوو بەشەوە: ˚ دو روا، زۆریش گونجاوە. ˚ ( دو. روا:

هەڵبەتە جاران و ئێستاش وشەی: دو لە پێش ناوانەوە نیشانەی ئەشرافیەتە. )

جۆرج، بۆ ئەوەی وابنوێنێ ئاگاداری ئەم شتانە هەیە، یەکسەر بەرسڤی دایەوە:

- نا، واهی باش نییە. ئەمە کارێکی زۆر ساویلکانە و تەقلیدی و باوە. بیرم لەوە کردووەتەوە سەرەتا لە نووسینەکانمدا، ناوی زاگەکەم وەکو ناوی خوازراو بەکاربەرم، پاشان بیخەمە سەر ناوەکەی خۆم و، دواتر بەگوێرەی پێشنیازەکەی تۆ بیکەم بە دوو بەشەوە.

مادلین پرسی:- ناوی زاگەکەت کانتلویە؟

- بەڵێ

مادلین، سووکە هەڵوەستەیەکی کرد:

- نا، من حەزم لە پاشگران نییە. با بزانین ناکرێ ئەم ناوی کانتلویە کەمێک دەسکاری بکەین؟

قەڵەمێکی لە سەر مێزەکە هەڵگرت ودەستی بە نووسینی ناوان وهەڵسەنگاندنیان کرد. لە ناکاوا بەدەنگی بەرز گوتی:- تەمەشا، بزانە ئەم ناوە چۆنە.

کاغەزەکەی لە بەردەم جۆرج دا ڕاگرت. لە سەری نووسی بوو: خانم دو روا دو کانتل.

جۆرج کەمێک دەبیرەوە چوو و پاشان بە ڕاوێژێکی جدی گوتی:- بەڵێ، زۆر باشە.

مادلین زۆر خۆشحاڵ بوو، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە:

- دوروا دو کانتل، دوروا دو کانتل، خانم دوروا دوکانتل، عالە عال.

ئەوسا بە قەڵافەتێکی ئاسوودەوە درێژەی دایێ:- دەبینی چەند بە ئاسانی دەکەوێتە سەر زاری خەڵکی. بەڵام دەبێ زوو فریا بکەوی، دەنا زۆر درەنگ دەبێ. تۆ لە سبەیەوە وتارەکانت بەناوی: د. دوکانتل ەوە بڵاوبکەوە و کورتە هەواڵەکانت بە ناوی دوروا وە بڵاو بەکەوە. ئەم ناوانە هەموو ڕۆژێک لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو دەبنەوە و کەسیش سەری لەوە ناسوڕمێ کە تۆ وتارەکانت بە ناوی خوازراوەوە بڵاودەکەیتەوە.

لە کاتی زەماوەندەکەماندا، دەتوانین کەمێک دەسکاری ئەم ناوە بکەین وتۆ بە ئاشنا وبناژۆکانت بڵێی لە ڕووی خاکە ساری و لەبەر پێگەکەت، چاوت لەوە پۆشیوە کە وشەی دو بخەیتە پێش ناوەکەتەوە، یان هەر هیچ نەڵێی. ناوی بچووکی بابت چییە؟

- ئەلکسندر.

مادلین، دوو سێ جار لە بەر خۆیەوەو بە ئەسپایی ئەو ناوەی گوتەوە: " ئالکسندر، ئالکسندر " لە هەمان کاتدا گوێی لە دەنگدانەوەی فۆنەتیکەکەی دەگرت، ئەوسا لە سەر کاغەزێکی سپی نووسی:

" ئاغا وخانم ئەلکسندر دو روا دوکانتل بە شانازییەوە هەواڵی زەماوەندی ئاغای جۆرج دو روا کانتلی کوڕیان لەگەڵ خانم مادلین فورستیەدا، بەخزمەتتان ڕادەگەیەنن. "

کەمێک لە دوورەوە تەمەشای نووسراوەکەی خۆی کرد و بە خۆشحاڵیەوە گوتی:

- ئینسان، ئەگەر یەک تۆز زیرەکی بەکاربەرێ، دەتوانێ هەرچییەکی دەوێ، بەخەڵکی قەبووڵ بکات.

جۆرج وەختێ گەییە سەرجادەکە، بڕیاری دا، لە ئێستا بە دواوە، ناوی دو روا، یان دوروا دوکانتل لە خۆی بنێت، ئەنجام وای هاتە زەین کە بایەخ و سەنگ و ئیحتوبارێکی تازەی پەیدا کردووە. بەکەش وفشێکی زیاترەوە ڕێی دەکرد، سەری بەرز دەگرت، فرناختر ومەغروورانەتر سمێڵی بادەدا، ڕێک وەکو ڕێکردن و ڕەفتاری کەسێکی ڕەسەن و ئەسڵزادە. هەستیدەکرد، حەزدەکات بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بە هەر ڕێبوارێک بڵێت: من ناوم دو روا دو کانتلە.

لێ هەرکە گەیشتەوە ماڵەکەی خۆی، خەیالی خانم دو ماریل نیگەرانی کرد، یەکسەر نامەیەکی بۆ نووسی و قەراری دیدارێکی بۆ سبەینێ دانا و بەخۆی گوت: کارێکی قورسە، قەرقەشە و دەردەسەرێکی گەورەم لە گەڵیا دەبێت.

پاشان هەر بەبێ موبالاتی وخەمساردیە سروشتیەکەی خۆی کە دەبووە مایەی ئەوەی مەسەلە ناخۆشەکانی ژیان پشتگوێ بخات، ئەم بابەتەی لە زەینی خۆی تاراند ودەستی بەنووسینی وتارێکی ئینشایی کرد دەربارەی ڕەوشی باج و خەراجی تازە بۆ هاوسەنگ کردنی بودجەی وڵات.

لەم وتارەدا پێشنیازی کردووە بۆ وشەی دو لە پێش ناوانی ئەشرافیەوە ساڵانە سەد فرانک لە خاوەنەکەی بسەنرێت و بۆ ناو وعینوانانی دی، لە بارۆنەوە تا پرنس، ساڵانە لە پێنج سەد فرانکەوە تا هەزار فرانک لە خاوەنەکانیان وەربگیرێت. و لە کۆتاییدا ئیمزا وناوی د. دو کانتلی لە سەر دانا.

سبەی بەیانی بروسکەیەکی لە ماشقەکەیەوە پێگەیی کە تیایدا نووسرابوو، سەعات یەک دێتە دیدەنی. بەکەمێک نیگەرانییەوە چاوەڕوانی هاتنی کرد، سوور بوو لە سەر

ئەوەی کۆتایی بە مەسەلەکە بێنێت، لە هەوەڵەوە هەموو شتێکی پێ بڵێت ودوای ئەوەی هەوەڵین هەڵچوون و ناڕەزایەتیەکان دامرکانەوە، ئاقڵانە گەنگەشەی بکات و تێی بگەیەنێ کە ناکرێ هەموو تەمەنی بە سەڵتی بەرێتە سەر و چونکە خانم دوماریل پێداگرییەوە دەیویست درێژە بەم شێوازە ژیانە بدات، ئاساییە ئەویش بیر لەوە بکاتەوە کە هاوسەرێکی فەرمی و یاسایی هەبێت.

وێڕای ئەمەش کەمێک خەمبار بوو. لە گوێی لە زەنگی دەرگا بوو، دڵی کەوتە پەلەپەل.

خانم دوماریل، خۆی هاوێشتە باوەشی ئەوەوەو گوتی:

" سڵاو، بیل ئامی. "

پاشا هەستیکرد، بەرخورد و مامەڵەی ئەو ساردە، سەری هەڵبڕی و پرسی:- چییە، حاڵت باش نییە؟

- دانیشە، پێویستە بە جدی قسەبکەین.

ژنەی گەنج بە بێئەوەی کڵاوەکەی دابکەنێت دانیشت، تەنیا تۆڕی پێش کڵاوەکەی تا سەروو هەنیەی هەڵدایەوە و چاوەڕوانی کرد.

جۆرج چاوی بڕی بووە ئەرزەکە، لە زەینی خۆیدا پێشەکی بۆ قسەکانی ئامادە دەکرد. ئەوسا بە دەنگێکی خاو وپچڕپچڕ گوتی:- دۆستی ئازیزم، من زۆر ناڕەحەت و نیگەرانم، کە دەبێ ئەم ڕاستیەت پێ بڵێم. باوەڕ بکە زۆرم خۆشدەوێی، لە کانگای دڵەوە خۆشم دەوێی، من ئەوەندەی لەخەمی زیزبوونی تۆدام، لە خەمی ئەو هەواڵەدا نیم کە دەمەوێ پێتی بڵێم.

خانم دوماریل، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، هەستیکرد خەریکە دەلەرزێ، بە دەمەلاڵکێوە گوتی:- چی بووە؟ خێرا بیڵێ.

دوروا، بە ڕاوێژێکی غەمگین، بەڵام ڕژد، بە قەڵافەتێکی بە ڕواڵەت ماندووەوە کە عادەتەن خەڵکانێ کە خەبەری ناخۆشیان پێیە لە خۆیانی دێنن، گوتی: " مەسەلەکە ئەمەیە کە دەمەوێ ژن بێنم."

خانم دوماریل وەکو ژنێ کە خەریک بێ ببورێتەوە، ئاهێکی هەڵکێشا، ئاهێکی پڕ ئازار، کە لە ناخی ناخەوە هەڵدەقوڵێت. بێئەوەی هیچ قسەیەک بکات، هەناسەی بەڕادەیەک تەنگ بوو کە هەستیکرد خەریکە دەخنکێ.

جۆرج کە بینی ئەو هیچ قسەیەک ناکات، لە سەری ڕۆیی:

– مەگەر هەر خوا بزانێ پێش ئەوەی ئەم بڕیارە بدەم، چەند خەفەتم خواردووە. بەڵام من نە ماڵ وحاڵێکم هەیە و نە پلە وپایەیەکی کۆمەڵایەتی، لە پاریس دا بێکەس و تەنیا باڵ، پێویستم بە کەسێکە پاڵی پێوە بدەم، یانی شیرەتکار و تەگبیرکەرم بێ، پێویستم بە پشتیوانێکە، کە سەبوریم پێ بێت. لە شەریک و هاوبەشێک دەگەڕام و ئاخری دۆزیمەوە.

بێدەنگ بوو، چاوەڕوانی ئەوە بوو ژنەی تاین قسەیەک بکات، تووڕەییەک، کاردانەوەیەک بنوێنێت، هەراو هەنگامەیەک بنێتەوە، جنێوێک بدات.

لێ کلوتیلد، دەستی نابووە سەر دڵی، لە تۆ وایە دەیەوێ ڕێگە لە دەرچوونی بگرێت و بەردەوام هانکەهانکی دەکرد، ئەنجام سینگی بەردەوام بەرز ونزم دەبووەوە و سەری دەلەقی.

جۆرج، دەستەکەی دیکەی کە لە سەر دەسکی کورسییەکە دانابوو، گرت. لێ کلوتیلد بەتووندی دەستی لە

دەستی ئەو ڕاپسکاند، پاشان وەکو ئەوەی دووچاری سەرگەردانی ومەنگی بووبێ، لەبن لێوانەوە گوتی:- ئاه... خواگیان..

جۆرج، لە بەردەمیا چۆکی دادا، بێئەوەی زاتی ئەوە بکات دەستی تێوە بدات. لە کاتێکدا زیاتر لەم بێدەنگیەی ئەو نارەحەت و نیگەران بوو، تا لە هات وهاوار و هەرا و هەنگامەی، لەبن لێوانەوە گوتی:

- کلو، کلوی دەلال، هەڵوێستی من ڕەچاو بکە. بزانە لە چ ڕەوشێکدام، ئاه، چەندم حەزدەکرد بتوانم لە گەڵ تۆدا زەماوەند بکەم. بەڵام تۆ مێردت هەیە. من چ بکەم؟ کەمێک بیربکەوە گیانەکەم، بیرێک لە منیش بکەرەوە! ئاخر خۆ دەبێ منیش لەم کۆمەڵگەیەدا جێگە وڕێگەیەک بۆخۆم پەیدا بکەم و تا ماڵ و حاڵ و ژیان و گوزەرانێکم نەبێ، چۆن بەم ئاواتە دەگەم؟ باوەڕ بکە!... هەندێجار دەگەییمە ڕەوشێک حەز دەکەم مێردەکەت بکوژم...

بە دەنگێکی نەرم، گیراو وفریبێوک قسەی دەکرد، دەنگێک کە وەکو نەوای موسیقا لە گوێدا دەنگی دەدایەوە.

بینی دوو دڵۆپە ڕوندک لە چاوانی ماشقەکەی قەتیس مان و پاشان بە گۆناکانیا غل بوونەوەو، لە هەمان کاتدا دوو دڵۆپە ئەشکی دی بە پێڵوەکانییەوە ئاوێزان بوون.

لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئاخ، مەگری کلو، مەگری دەلالێ، تکا دەکەم مەگری. خەریکە دڵم دەکەی بەبریان.

هەنگێ کلوتیلد، هەوڵیدا، هەوڵێکی زۆر، بۆ ئەوەی خۆی مەغروور وبێباک بنوێنێ وبەدەنگێکی لەرزۆکی ژنێک کە لە

ئان وساتا بوو، له هۆرژنی گریان بدات، پرسی:- ئەو ژنە کێیە؟

جۆرج، هەڵوەستەیەکی کرد، بەڵام کە زانی چاری نییە، دەبێ وەڵامی بداتەوە گوتی:- مادلین فورستیە.

سەراپای خانم دو ماریل کەوتە لەرزین، ئەوسا مات وبێدەنگ هێندە بە قووڵی لە فکران ڕاچوو کە لە تۆوایە بیری چووەتەوە کە دوروا لە بەردەمیا کەوتووەتە سەر چۆک.

هەمیشە دوو دڵۆپە ڕوندکی زەلاڵ لە چاوانیەوە سەرەتاتکێیان بوو، ئەو دووە بەردەبوونەوە دووی دی شوێنیان دەگرتنەوە. هەستایە سەرپێیان. دوروا پێی وابوو کە بە نیازە بێهیچ قسەیەک، بێهیچ گلەییەک، بێهیچ بوردنێک لەوێ وەدەربکەوێ، بە هەموو بوونی خۆیەوە هەستی بەئازار و بە بچووکی کرد. بۆ ئەوەی نەیەڵێت بڕوات، هەروو لاقی لە ئامێز گرت ولە سەرووی جلەکانەوە هەستی کرد ماسولکەکانی ژنەی گەنج تورت و گرژ بوونەوەو ئامادەی مقاوەمەت بوون.

بەدەم لاڤەوە گوتی: تکا دەکەم ئاوا مەڕۆ.

هەنگێ کلوتیلد، چاوانی بڕییە خوارەوە، لە سەرێڕا ئەوی بەنیگا دابێژت، بەنیگای ئەم چاوە فرمێسکاوی، نائومێدانەوە، زۆر جوان بوو، ئەوسا بە پچرپچڕی گوتی:

- هیچ قسەیەکم نییە... هیچم پێ نییە بە تۆی بڵێم و... نەهیچ کارێکم بەکاری تۆوە هەیە... تۆ... تۆ هەقی خۆتە... تۆ... تۆ... کەسی دڵخوازی خۆت، بەباشی هەڵبژاردووە...

ئەوسا بە توندی لاقەکانی لە نێوان دەستەکانی ئەو دەرهێنا ولە دەرگاکە وەدەرکەوت، بە بێئەوەی دوروا فریای بکەوێ ڕێی لێبگرێت و بتوانێ گلی بداتەوە.

کە هەرخۆی بەتەنیا مایەوە، لە جێی خۆی هەستا، گێژو وێژ بووبوو. دەتگوت جەزرەبەیەکی توند بەرسەری کەوتبوو. ئەوسا بڕیاری خۆی داو بەخۆی گوت: " ئێ ئیدی، دەبێ ئەم کارە کۆتایی بێت... دوور لە هەر سەریەشەیەک. ئاوام پێخۆشترە. " نها کە هەستی دەکرد لە ژێر بارێکی قورس دەرباز بووە، ئاسوودە، ڕزگار و ئازاد بە جۆرە سەرمەستیەکی زادەی سەرکەوتن و تواناوە، مستی بە دیوارەکەدا دەکێشا، دەتگوت چارەنووس تاقیدەکاتەوە.

وەختایەک مادلین لێی پرسی: " بە خانم دوماریلت گوت؟ " جۆرج بە ئەرخایەنی بەرسڤی دایەوە: بەڵێ، هەڵبەتە...

ژنەی گەنج بە نیگای زوڵاڵ، زەینی ئەوی دەپشکنی.

– باشە لەم بابەتە نیگەران نەبوو؟

– هەڵبەتە نا، بە هیچ کلۆجێ، بەپێچەوانەوە بەلایەوە کارێکی ئاسایی و زۆریش بەجێبوو.

هەواڵەکە بەخێرایی بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە. هەندێکەس سەریان سوڕما، هەندێکی دی دەیانگوت پێشبینی ئەو حاڵەیان دەکرد، گروپێکی دیکەش، تەنیا بزەیەکیان دەکردو وایان دەنواند ئەم مەسەلەیەیان بەلاوە ئاساییە.

جۆرج، نها هەواڵەکانی بە ناوی د. دو کانتلەوە بڵاودەکردەوە، کورتە هەواڵەکانی بە ناوی دوروا و وتارە سیاسییەکانی کە تازە دەستی بە نووسینیان کردبوو بە ناوی دو روا بڵاودەکردەوەو زۆربەی کاتی دەگەڵ

دەزگیرانەکەیدا بە سەردەبرد. ژنەی گەنج بە میهر و مەحەبەتێکی دۆستانە، کە لە هەمان حاڵدا، حەزێکی واقیعی بەڵام پەنامەکی و هەوەسێکی پەنهانی وەکو خاڵی لاوازی تێکەڵ بوو، دەگەڵ ئەودا ڕەفتاری دەکرد، بڕیاری دابوو کە زەماوەندەکەیان زۆر تایبەتی بێ وتەنیا بە حوزوری شایەدەکان ئەنجام بدرێت و بەرنامەیان ئەمەبوو کە هەمان شەو بەرەو روئان بڕۆن. بەیانی ڕۆژی دواتر دەچنە دیدەنی باب و داکە پیرەکەی ئەو و چەند ڕۆژێک لە جەم وان دەقەتێنن.

دوروا، هەوڵیدابوو ئەو لەو بیرە ژێوان بکاتەوە، بەڵام کە بۆی نەچووبووە سەر، ناچار ملی بۆ داواکەی ئەو دابوو.

ڕۆژی دەیەمی هەیڤی پێنج، ژن ومێردی تازە کە گرێبەستی مەزەبیان لە کڵێسادا بە پێویست نەزانی بوو، چونکە هیچ کەسێکیان دەعوەت نەکردبوو، دوای ئەوەی سەرێکی خێرای شارەوانیان دابوو وگرێبەستی فەرمیان کردبوو، جانتاکانیان کۆکردبووەوەو بۆ ماڵ گەڕابوونەوە، پاشان لە وێستگەی قیتاری سن لازار سواری قیتاری سەعات شەشی دوای نیوەڕۆ بوون و نورماندی خۆت بگرە واهاتین.

پێش ئەوەی لە فارگۆنی قیتارەکەدا بە دوو قۆڵی بمێننەوە، بە هەمووی بیست کەلیمە قسەیان دەگەڵ یەکدا نەکردبوو. هەرکە هەستیان کرد قیتارەکە کەوتووەتە ڕێ، تەمەشای یەکیان کرد و بۆ ئەوەی ئەو تەکەلوف و نارەحەتیەی کە نەیاندەویست بەیەکتری نیشانبدەن، بشارنەوە، دەستیان بەپێکەنین کرد.

ڤیتارەکە، بە خاوی لە وێستگەی باتینیول تێپەڕی، بەلای سەنگەر ومەتەرێزەکانی قەراخ ڕوباری سین دا تێپەڕی و ڕێگای دەشتی گرتەبەر.

ژن ومێرد، جارجار چەند قسەیەکی ئاساییان بە بێ هیچ مەبەستێ دەگەڵ یەکدیدا دەکردو پاشان لە پەنجەرەکەوە تەمەشای دیمەنەکانی دەرەوەیان دەکرد.

پاش تێپەڕبوون، لە پردی ئانییر، کە چاویان بە ڕووبارەکە وئاپۆڕای بەلەمەکان، ماسیڤانەکان و لۆتکە بچووکەکانی سەر ڕوبارەکە کەوت، چالاکییەکی کوت وپڕیان تێکەوت. هەتاوی توندی هەیڤی مایس، بە تیشکە خوارەکانی بەلەمەکان و ڕوبارە ئارامەکەی، کە دەتگوت وەستاون و هیچ جووڵەیەک ناکەن، زێڕوەشان دەکرد. ڕوبارەکە لە ژێر تیشک وگەرمای ڕۆژی ڕوو لە ئاوابووندا، دەتگوت لەجێی خۆی چەقی بوو. بەلەمێکی بایەواندار، بە دوو بایەوانی کراوەی سپی وسێگۆشەوە، کە چاوەڕوانی هەڵکردنی کەمترین با بوو، لە باڵندەیەکی گەورە دەچوو کە بیەوێ بفڕێت.

دوروا لە بن لێوانەوە گوتی:- من دەوروبەری پاریس دەپەرستم، هەندێک بیرەوەریم لەگەڵ ماسییە سوورەوەکراوەکانیا هەیە کە خۆشترین بیرەوەری ژیانمن.

مادلین گوتی:- ئەدی بەلەمەکانی؟ گەڕانی ناو ڕوبارەکە بە بەلەمان، بەتایبەتی دەمەوخۆرئاوا، یەجگار خۆشە.

ئەوسا بێدەنگ بوون، دەتگوت نەدەوێران لەوەی پتر دەربارەی ژیان و بیرەوەریانی ڕابردوو قسان بکەن، یان بەبێدەنگی و بەکەمێک کەسەرانەوە ئەم بیرەوەریانەیان لە زەینی خۆدا دەور دەکردەوە.

دوروا، که بەرانبەر بە ژنەکەی ڕۆنیشتبوو، دەستی گرت و ماچی کرد، پاشان گوتی:- کەبۆ پاریس گەڕاینەوە، جارجاریَ بۆ شامیَ دەچینە شاتو.

مادلین، لەبن لێوانەوە گوتی: " زۆر کارمان لە پێشە! " ڕاوێژی قسەکەی بەجۆریَ بوو وەک ئەوە بوو بیەویَ بڵێت: " پێویستە شتە دڵگیرەکان، فیدای کارانی بە سوود بکریَ. "

دەستی مادلینی هەر لە نێو دەستا بوو وبە نیگەرانییەوە لە خۆی دەپرسی، کەنگیَ دەتوانیَ لەم قۆناغەوە، بچێتە قۆناغی نەوازش کردن و لە هەمێز گرتنی ئەو. ئەو هەرگیز لە هەنبەر کچۆڵەیەکی گەنج و چاو وگویَ نەکراوەدا، دەستەپاچە نەبووبوو، نەپەشۆکابوو، بەڵام هۆشمەندییە زیرەکانە وحیلەگەرانەکەیَ مادلین، شپرزەی دەکرد.

دەترسا مادلین بە ساویلکە، زۆر شەرمن یا فرە گۆساخ، زۆر گێل یان زۆر ڕووداری بزانێت.

بە ئەسپایی دەستی دەگوشی، مادلین هیچ کاردانەوەیەکی نەدەنواند. سەرەنجام گوتی:

- زۆرم پیَ سەیرە کە تۆ ژنی من بی، باوەڕ ناکەم کە تۆ ژنی من بی.

مادلین، بە حیرەتەوە پرسی:- بۆ ئەم قسەیە دەکەی؟

- نازانم. پێم سەیرە. حەزدەکەم ماچت بکەم و پێم سەیرە کە ئەم مافەم هەیە.

مادلین، گۆنای هێنایە پێشەوەو ئەویش وەک ئەوەی خوشکی خۆی ماچ بکات، سەری کوڵمی ماچکرد.

دووبارە گوتی:- هەوەڵجار کە تۆم بینی ( لە بیرتە، ئەو شەوە بوو کە فورستیە دەعوەتی کردبووم ) لەدڵی خۆدا

گوتم: " خواگیان، خۆزگە ژنێکی وەکو ئەوم دەبوو " ، نها ئەو ئاواتەم هاتووەتە دی و ئەو ژنەم هەیە.

مادلین لە بن لێوانەوە گوتی:

– لوتفی خۆتە. ئەوسا بە نیگا هەمیشە خەندانەکانی، چاوەکانی دابێژت. جۆرج لە دڵی خۆیدا گوتی: "زۆرسارد و سرم، چەند کەسێکی کەودەنم، دەبێ لەوەی زیاتر هەرمە پێش. "وپرسی:– تۆ چۆن فورستیەت ناسی؟

مادلین، بە پەستی بەرسڤی دایەوە:– یانی ئێمە بۆیە دەچین بۆ روئان تا باسی ئەو بکەین؟

جۆرج سوور بووەوە وگوتی: چەند کەرم، ئاخر تۆ زۆرم دەترسێنی؟

مادلین، بە خۆشحاڵییەوە گوتی: " من؟ شتی وانییە! ئاخر بۆ، لە پای چی تۆ بترسێنم؟

نها جۆرج، تەواو لێی نزیک بووبووەوە. مادلین بە دەنگی بەرز گوتی: " ئاە، ئەوە ئاسکێک بوو! "

قیتارەکە، نها خەریک بوو بە ناو بێشەی سن چرمن دا تێدەپەڕی و ژنەی گەنج، کارمازێکی بینی بوو کە بە غار لە شەقامێک پەڕی بووبووەوە.

لەو کاتەدا کە مادلین هەمدیس لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانیە دەرێ، جۆرج، بەلای ئەوا دانەوییەوەو گێسوە ناسکەکانی ماچکرد.

مادلین، سووکە هەڵوەستەیەکی کرد، ئەوسا سەری هەڵێنا وگوتی:– بەسە ئیدی، ختووکەم دێت.

لێ جۆرج دەستبەردار نەبوو، بەتووڕەیی، بە سمێڵە قیتەکانی، پێستە سپییەکەی ئەوی نەوازش دەکرد.

مادلین، تەکانێکی دا وگوتی:– واز دێنی یان نا.

جۆرج، که دەستی به پشتی ئەوا داخزاندبوو سەری گرت و بۆلای خۆیی وەرگێڕا، ئەوسا وەکو هەڵۆیەک خۆی بە نێچیر و چەشەکەیدا بدات دەمی ئەوی ماچکرد.

مادلین، بەدەم دەست وپێ تەکاندانەوە ئەوی لە خۆی دوور دەخستەوەو هەوڵیدەدا خۆی لە دەستی وی دەرباز بکات، سەرەنجام خۆی ڕزگارکرد و دووبارە گوتی:- پێمگوتی بەسە.

لێ جۆرج، گوێی بە قسەکەی ئەو نەدا، تامەزرۆیانە نەوازشتی دەکرد.

مادلین، هەرچۆنی بوو خۆی لەباوەشی دەرهێنا وبلەز هەستا و وەستا.

- ئاە جۆرج، واز لەم ئەتوارانە بێنە. خۆ ئێمە منداڵ نین، دەتوانین تا دەگەینە روئان خۆبگرین.

جۆرج، کە گوێی لەو قسە ماقووڵانەبوو سوور بووەوە، ئیدی لە جێی خۆی داسەکنی و پاشان هێور بووەوە و بەڕاوێژێکی جدی گوتی:- باشە، خۆ دەگرم، بەڵام لێرە تا روئان، بە هەمووی بیست وشەم پێ نییە کە بیلێم. تۆخۆت حەکەم بە، ئێمە هێشتا نزیکی پاریسین، تازە خەریکین لە پواسی ڕەتدەبین.

مادلین گوتی:- باشە، من قسەدەکەم، لە جیاتی تۆش قسەدەکەم.

پاشان بەوپەڕی ڕوونی دەربارەی ئەو کارانە دوا، کە دەبوا دوای گەڕانەوەیان بۆ پاریس، ئەنجامی بدەن. دەبێ ئەو ئاپارتمانەی کە دەگەڵ مێردەکەی پێشوویدا، تیای دەژیان، بهێڵنەوە ودورواش لە ڕۆژنامەکەدا جێگەی

فورستیه بگرێتەوە و هەمان مووچە و بەراتی ئەو وەربگرێت.

لەلایەکی دیکەوە، بەر لە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی زەماوەندەکەیان، ئەو بە کارامەیی وئاسوودەیی بازرگانێکەوە، هەموو وردەکارییەکانی مەسەلە مادی و داراییەکانی ژیانی هاوبەشیانی حەل وفەسڵ کردبوو.

زەماوەندەکەیان بە گوێرەی قەرارنامە سەری گرتبوو، بەگوێرەی قەرارنامەکە، هەرکەسە خاوەن موڵک ومالّی خۆی بوو، هەموو وردەکاری وئەگەر و پێشهاتێک لە قەرارنامەکەدا پێشبینی و تۆمارکرابوو: وەکو مردن، جیابوونەوەو لەدایکبوونی یەک یان چەند منداڵێک. جۆرج بە چوار هەزار فرانک لەم هاوبەشیەدا، بەشداری کردبوو کە بە گوتەی خۆی هەزار و پێنج سەد فرانکی قەرز کردبوو و باقیەکەی لە زەرفی ساڵی ڕابردوودا، بۆ ئەم مەسەلەیە، پاشەکەوت کردبوو. مادلین، خاوەنی ئەو چل هەزار فرانکە بوو، کە لە فورستیەوە بە میرات بۆی مابووەوە.

مادلین، دەستی بە وەسفی ئەخلاق و ئەتوار و تایبەتمەندییەکانی مێردەکەی پێشووی کرد:- پیاوێکی زۆر بە قنیات و کەم خەرج بوو، زۆر بەرنامەدار و پڕکار بوو دەیتوانی لە ماوەیەکی کەما دەوڵەمەند ببێت.

جۆرج، گوێی لە قسەکانی ئەو نەدەگرت، بیری تری لە خەیاڵ و لە بیرا بوو.

مادلین ناو بە ناو هەڵوەستەیەکی دەکرد و ئەوسا درێژەی دەدایێ:

- تا سێ یان چوارساڵی دی دەتوانی دەرامەتی ساڵانەت بگەیەنیتە سی تا چل هەزار فرانک. ئەمە ئەو مووچەیە بوو کە ئەگەر شارل مابا، وەری دەگرت.

جۆرج، کە بەرە بەرە لەم پەند و وەعزدادانەی ئەو حەوسەڵەی چووبوو، بەرسڤی دایەوە:

- پێموایە ئێمە بۆ ئەوە ناچین بۆ ڕوئان تا باسی ئەوە بکەین.

مادلین، بە نەرمی قامکی بە ڕوومەتی ئەودا هێنا وگوتی:- ڕاست دەکەی، خەتای منە.

مادلین پێدەکەنی.

جۆرجش، وەکو کورپژگەێن ئاقڵ، دەستەکانی لە سەر ئەژنۆکانی دانابوو و لەجێی خۆی نەدەجولا.

مادلین گوتی:- دەزانی، بەم شێوەیە شێوەی خەڵکانی گەمژەت گرتووە.

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- من دەبێ بەمجۆرە دەورەکەی خۆم ببینم، تۆ بەخۆت تۆزێ لەمەپێش ئەم دەورەت بۆ دانام، هەر ئەوەیە و نایگۆڕم.

- بۆچی؟

- چونکە تۆ ئیدارەی کاروباری ماڵت بەدەستە، تەنانەت ئیدارەی منیش. بەڕاستی ئەم بابەتە وەکو بێوەژنێک پەیوەندی بە تووە هەیە ئەمە کاری تۆیە.

مادلین، بە سەرسامی پرسی:- مەبەستت لەم قسانە چییە؟

جۆرج، بەڕاوێژی منداڵە مەکتەبلییەک کە دەرسەکەی بۆ مامۆستا دەڵێتەوە گوتی:

- مەبەستم ئەمەیە کە تۆ ئەزموونێکی زۆرت هەیە کە دەبێ قەرەبووی نەزانی من بکاتەوە، کارامەیی پراکتیکی تۆ لە مەسەلەی زەماوەندا، دەبێ کۆتایی بەچاو وگوێ نەکراوەیی من بێنی، تەنیا ئەوەم مەبەستە و هیچی دی.

مادلین، بە دەنگی بەرز گوتی:- ئەم قسانە چییە.

جۆرج، وەڵامی دایەوە:- ئیدی، ڕەوشەکە وایە. من ژنان ناناسم. تۆ بەپێچەوانەوە پیاوان باش دەناسیت، دەماریان دەناسیت، چونکە بێوەژنی، دەبێ من تەعلیم بدەیت... ئەمشەو، خۆ ئەگەر خۆت بتەوێ دەتوانی لە ئێستاوە دەستبەکار بی، دەست بە تەعلیم دانم بکەی..

مادلین، بە شادمانیەکی زۆرەوە گوتی:- ئەم قسانە چییە دەکەی، بۆ ئەم شتانە ئومێدت بەمنە!...

جۆرج، بە هەمان ڕاوێژی قوتابییەکەوە کە لە وەڵامی مامۆستادا زمانی تێک دەئاڵێت گوتی:

- هەڵبەتە کە ئومێدم بەتۆیە، تەنانەت چاوەڕوانم، دەرسێکی چاکم پێبدەیت... لەمیانی بیست وانەدا... دە دانە بۆ پێشەکی... خوێندن و دەستووری زمان... و دە وانەش بۆ زانیاری ومانا وبەیان... من هیچ شتێک نازانم.

مادلین، کە زۆری کەیف بەم قسانەی ئەو دەهات هاواریکرد:- چەند شێتی.

جۆرج، لە سەری ڕۆیی:

- نها کە دەست پێشکەرییەکە لە تۆوە دەستی پێکرد کە بە من بڵێی تۆ، منیش یەکسەر چاو لە تۆ دەکەم و پێت دەڵێم: عەشقی من، سات بەسات زیاترم خۆشدەوێی، باوەڕناکەم، تا ڕوئان کە زۆر دوور دێتە بەرچاو، بتوانم خۆم بگرم و چاوەڕوان بکەم.

نها، به ڕاوێژی ئەکتەرێکی سەرشانۆ قسەی دەکرد، به ئەدا و ئەتوارێک که مادلینی دێنایه پێکەنین، هەڵبەته مادلین ئەم ڕەفتار وشۆخی و ئەتواره قەرەجیانەی ئەهلی ئەدەبی بەلاوه ئاسایی بوو.

تەمەشای لا ڕوومەتی جۆرجی دەکرد وبەڕاستی جوان دەهاته بەرچاوی، وەکو کەسێک به لەزەتەوه بڕوانێته میوەی سەر درەختێک و ئەقڵ پێی بڵێ سەبر بکه تا ئەم میوەیه پێدەگات ئەوجا بیخۆ، له دوودڵیدا بوو.

ئەوسا، به دەم ئەو بیرانەوه که به زەینیا تێدەپەڕین، کەمێک سوور بووەوەو گوتی:

- قوتابییه چکۆله ئازیزەکەم، باوەڕ به ئەزموونەکانی من، ئەزموونه گەورەکانی من بکه. ماچی ناو فارگۆنی قیتاران هیچ بایەخێکیان نییه، مرۆڤ دڵی لێیان تێک هەڵدێت.

ئەوسا پتر سوور بووەوەو له بن لێوانەوه گوتی:- ئینسان نابێ گەنمەکەی به نەگەییوی دروێنه بکات.

جۆرج، که مانا پەنهانەکانی ئەو وشانەی لەم زاره جوانەوه دەردەهاتن، هێنابوویه جۆش، دەکەوته مەسخەرەبازی. ئەوسا نیشانەی خاچی بەسەر خۆیدا دەکێشا و وەکو ئەوەی لەبن لێوانەوه وێرد و دوعایان بخوێنێت، گوتی:

- من حاڵی حازر خۆم به دەستی سن ئانتوانی فەرمانڕەوای وەسوەسان سپاردووه. نها بووم به پەیکەرێکی بڕۆنزی.

شەو بەره بەره دادەهات و، دەست و بیابانەکانی سەمتی ڕاستی سکەی قیتارەکە، سێبەره ئاوریشم ئاساکانی دادەپۆشی.

قیتارەکە بە قەراخ ڕوباری سین دا دەڕۆیی. ژن و مێردە گەنجەکە سەیری ئاوە سافەکەیان دەکرد کە وەکو شریت و نەوارێکی پۆلای زاخاو دراو، لە کەناری ڕێلەکاندا ڕاکشابوو، تەمەشای دوا پرتەوی زەردەپەڕی هەتاوی ڕوو لە ئاوابوونیان دەکرد کە لە شێوەی سێبەر وسایەی تاریکدا لە ئاسمانەوە دادەڕژاو، ڕەنگێکی سووری ئاگرینی هەبوو. ئەم ڕوناکی و پرتەوانەش بەرە بەرە مەحوو دەبوونەوە، تاریک دەبوون و تاریکیەکی خەمناک جێگەی دەگرتنەوە. دەشت ودەرەکەش بە دەم لەرزینێکی شوومەوە لە تاریکیەکەدا ڕۆدەچوو. لەرزینی مەرگێک کە هەموو ئێوارەیەک، زەوی لەخۆی دەگرێت.

خەمی شەوانە کە لە پەنجەرە کراوەکەی قیتارەکەوە وەژوور دەکەوت، بەجۆرێ خۆی بەدڵ ودەروونی شادی، چەند ساتێکی پێشتری، ئەم ژن ومێردە گەنجەدا کرد، کە ناچار بە بێدەنگی کردن.

هەردووکیان، بە مەبەستی تەمەشاکردنی ئەم حاڵەتی گیانەڵلایەی ڕۆژ، ڕۆژێکی ئاوا جوانی هەیڤی مایس، تەواو لە یەکدی نزیک بووبوونەوە.

لە شاری مانت دا، چرا چکۆلەکانی ناو فارگۆنەکانیان هەڵکرد، کە تیشکە زەردباو و لەرزۆکەکانیان، بەرگی کەوەیی تەختەکانیان ڕوناک دەکردەوە.

دوروا، دەستی لە قەدی ژنەکەی ئالاند و بەخۆوەی گوشی، هەواو هەوەسە تووندەکەی چەند خولەکێک لەمە پێشی گۆڕابوو بۆ میهرەبانی. میهرەبانیەکی سست کە چاوەڕوانی وردە نەوازشانی بچووک و دڵنەوایی ئامێز بوو،

لەوجۆرە نەوازشانەی کە ئینسان دەرهەق بە منداڵان دەیکەن.

بە دەنگێکی ئەسپایی گوتی: مادی ئازیزم، زۆرم خۆشدەوێی.

شیرینی و خۆشی ئەم دەنگە، سۆزی ژنەی گەنجی بزواند، تەزوویەکی سووک بە لەشیا هات، دەمی بۆ جۆرج، کە سەری نابووە سەر سینگی، ڕاگرت.

دوای کێشماکێشێکی کەم و هەناسەبڕکێیەکی توند و ناز ونەوازشی ناشیانە، وهەندێک ناڕازیانە، شەکەت و ماندوو، لە پاڵ یەکا مانەوە، تا ئەوەبوو قیتارەکە شووتێکی درێژی لێدا، شووتێ ئەوەی ڕاگەیاند کە لە وێستگەکە نزیک بوونەتەوە.

مادلین، بە سەری قامکان، مووە تێکڕژاوەکانی لاجانگەکانی جۆرجی، نەوازش کرد وگوتی:

– زۆر گەوجانە بوو، ڕەفتارێکی منداڵانەمان کرد.

بەڵام جۆرج، کە بە جۆش وخرۆشێکی سەیرەوە پەیتا پەیتا دەستەکانی مادلینی ماچ دەکرد، بەرسڤی دایەوە:

– من دەتپەرستم، مادە چکۆلەکەم.

تاوەکو روئان، بە ئارامی و تەقریبەن بە بێ جووڵە لەباوەشی یەکا مت بوون و گۆناکانیان بەیەکەوە نابوو و چاویان بڕی بووە پەنجەرە تاریکەکانی فارگۆنەکە کە جارجارێ ڕوناکی ئەو ماڵانەی بە بەلایاندا ڕەت دەبوون، ڕۆشنی دەکردەوە. زۆر خۆشحاڵ بوون کە بەو جۆرە ئالکاوی یەکدی بوون وبەدەم خەون و خەیاڵی هاوئامێزی و نەوازشی ڕاستەقینە و ئازادترەوە دەژیان.

له میوانخانەیەکدا، کە پەنجەرەکانی بە سەر کەناراوەکانی ڕوباردا دەکرانەوە، دابەزین ودوای خواردنی شامێکی سووک چوونە ناو جێگاوەو، سبەینێ سەعات هەشت پێشخزمەتەکە هات بێداری کردنەوە.

نانی بەیانیان لە سەر تەپڵەکێکی تەنیشت تەختە خەوەکە بۆ دانرابوو، دوای ئەوەی نانیان خوارد، قاوەڵتیان کرد، دوروا، سەراپای ژنەکەی بەنیگا دابێژت، ئەوسا بە شادمانی وخۆشحاڵی پیاوێکەوە کە گەنجێکی دۆزیبێتەوە، باوەشی پێداکرد و لەبن لێوانەوە گوتی:- مادە چکۆلە ئازیزەکەم، هەستدەکەم زۆرم خۆشدەوێی... زۆر... زۆر...

مادلین، کە بزەیەکی منداڵانە و خۆشنوودی بە سەر لێوەوە بوو، بەدەم وەڵامی ماچەکانی ئەوەوە، گوتی:

- منیش... ڕەنگە.

لێ جۆرج، سەبارەت بە دیدەنی باب وداکی کەمێک نیگەران بوو. پێشتر چەندین جار باسی تایبەتمەندی و ڕەوشی وان قسەی دەگەڵ ژنەکەیدا کردبوو، ئامۆژگاری کردبوو کە چۆن مامەڵەیان دەگەڵدا بکات. ئێستاش، وای هاتەخەیاڵ کە ئەگەر ئەو قسانەی بۆ دووبارە بکاتەوە خراپ نەبێت.

- دەزانی ئەوان خەڵکانی سادە و دێهاتین نەک ئەکتەرانی ئۆپراکومیک.

مادلین پێکەنی:- دەی باشە دەزانم، چەندین جار ئەمەت پێ گوتووم. دەئێستا ڕابە با منیش هەستم.

جۆرج، بە پرتاو لە ناو جێگاکە هاتەدەرێ و بە دەم لە پێکردنی گۆرەوییەکانییەوە گوتی:

– له ماڵی ئەواندا زۆر ناڕەحەت دەبین، زۆر ناڕەحەت. ژوورەکەی جارانی من، جگە لە تەختەخەوێکی شەق وشڕ، بە دۆشەکێکی پڕ لە کاوە، هیچی دیکەی تیا نییە، ئینسان لە سەری بخەوێ. لە کانتلودا، کەس دۆشەک و سیسەمی باشی نییە.

مادلین زۆر شەنگوڵ و سەرحاڵ دەهاتە بەرچاو:

– باشتر، خراپ خەوتن... لە گەڵ... لەگەڵ تۆدا و.... بێداربوونەوە بە بانگی کەڵەشێرەوە، زۆر خۆشە.

مادلین، جلی ماڵەوەی لەبەر کردبوو، ماکسیەکی فانیلەیی سپی دەڵب بوو کە جۆرج یەکسەر ناسییەوە. دیتنی ئەوی بەم جلکانەوە لەلا ناخۆش بوو. بۆچی؟ چاک دەیزانی کە ژنەکەی دە دوازدە دەستی لەم جلانە هەیە وهەرکە لە ناو جێگا دەردەکەوێ یەکێکیان لەبەر دەکات. نەیدەتوانی جلە کۆنەکانی، ئەوەی پەیوەندی بە شووەکەی پێشوویەوە هەبوو فڕێ بدات وجلک وشتی تازە بکڕێت؟ بەکورتی دوروا حەزیدەکرد، جلکی ماڵەوەی، جلکی خەوی و، جلکی ژێرەوەی، ئەوانە نەبن کە لە ژیانی شووەکەی جارانیا لەبەری دەکردن. هەستی دەکرد ئەم جلکە نەرم و گەرمانە، شوێنەواری نەوازش و تەماسەکانی فورستیەی پێوەیە.

چوو بۆ بەر پەنجەرەکە و جگەرەیەکی داگیرساند.

دیمەنی بەندەرەکە، فراوانی لەنگەرگایەکە بە بەلەمێن بایەوانی بچووک یان کەشتیانی هەڵمی گەورەوە، بە سلینگانی میکانیکی سەر کەناراوەکە کە بە هاڕەهاڕی زۆرەوە باریان لە کەشتیان دادەگرت، هەرچەندە لە ڕابردوودا ئەم شتانەی بینی بوو، بەڵام ئەو دیمەنانە هێنایە جۆش و گوتی:– عەجەب، ئێرە چەند جوانە.

مادلین، بە تاو بۆلای مێردەکەی ڕۆیی، هەردوو دەستی نانە سەرشانی ئەو، گوێڕایەڵانە بەرەولای ئەو دانەوی بووەوە، خۆشحاڵ و هارووژاو بەو دەقەوە مایەوە. بەردەوام دووبارەی دەکردەوە:

– ئاە، کە جوانە! چەند جوانە! قەت وێنام نەدەکرد ئەم هەموو کەشتیە هەبێت.

دوای یەک سەعات حەرەکەتیان کرد، قەرار بوو فراڤین دەگەڵ دایک و باوکی جۆرجدا بخۆن، بەچەند ڕۆژێک پێش هاتنیان، ئەوانیان ئاگادار کردبووەوە. سواری گالیسکەیەکی بێ چادری شڕ وشەپرێو بوون، کە بە تەق وهۆڕەکەیا دەتگوت دووکانی مسگەرییە. بە بولڤارێکی بەرزی تا ڕادەیەک ناشیریندا تێپەڕین، پاشان بە مێرگوزارێکا ڕەت بوون کە ڕۆخانەیەکی بچووکی بە ناودا دەڕۆیی و، سەرەنجام بە قەدپاڵی گردێکا سەرکەوتن.

مادلین، کە ماندوو بوو، لەبەر تیشکی هەتاوە خۆشەکەدا، کە گەرمی دەکردەوە، لە سووچێکی گالیسکە کۆنەکەدا خەوی لێکەوت، دەتگوت لە حەمامی گەرمی ڕوناکی و هەوای دڵنەوازی دەشت ودەرا ڕاکشابوو. مێردەکەی بێداری کردەوە و گوتی:– بڕوانە.

گەیی بوونە دوو سێیەمی بەرزایی گردەکە، کە دیمەنێکی زۆرجوانی هەبوو و هەموو ڕێبوارێک کە دەگەییە ئەوێندەر دەوەستا و سەیری ئەو دیمەنەی دەکرد.

ئەو خاڵە دەیڕوانییە دۆڵێکی گەورە، بەرز و پان کە ڕووبارێکی زوڵاڵ بە پێچ و دەورەی فراوان سەرانسەری دۆڵەکەی تەی دەکرد.

ڕووبارەکە، بە خۆی و گراڤە بچووک و زۆرەکانی ناویەوە، لە دوورەوە دیاربوو، پێش ئەوەی بەناو شاری روئان دا تێپەڕێت، پێچێکی تێدەکەوت. ئەوسا شار لە کەناری ڕاستی ڕووبارەکەوە بەدیار دەکەوت، کە نقومی تەمتومانی بەیانی بوو، تیشکی هەتاو لە سەر بان ومنارە زۆر وهەمەجۆرەکانی دەدا: منارەی قووچ یان پان و گەورە، یان ناسک و نەخشین وەکو جەواهیراتی دێو ئاسا. بورجێن چوار گۆشە یان بازنەیی هەبوو، کە بە تاجێن جەنگاوەرانە ڕازابوونەوە، بورجی ناقوسان و مناران، بە گومەز و سەربانی گوتیکی کڵێساکانەوە، کە خەدەنگی تیژ و بەرزی کڵێسای جامیع بەسەر هەموویاندا دەیڕوانی، خەندەنگێکی برۆنزی سەیری ناشیرین و ناقۆلا کە بەرزترین خەدەنگی هەموو دنیا بوو.

لێ لە کەنارەکەی بەرانبەرا، دووکەڵکێشی لوولەکی گەورە وناقۆلای کارخانەکانی دەوروبەری سن سیڤەر، چووبوون بە حەوادا. ئەم دووکەڵکێشانە یەجگار زۆربوون، ژمارەیان لە منارەکان زیاتر بوو، هەناسەی ڕەشی ئاوێتە بە زوخاڵیان، دەکرد بە ئاسمانا.

بەرزترینیان، بە بەرزی هەرەمی خیوپس بوو، کە دووەمین قوللەی بەرزی دەستکردی بەشەربوو، کەم وزۆر هاوتای بەرزی خەدەنگی کڵێسای جامیع، دووکەڵکێشی کوورەی فودر بوو کە وادەهاتە بەرچاو شابانۆی حەشیمەتی پڕ جم وجۆڵ و پڕ تەپ ودووکەڵی کارخانەکان بێت، وەکو چۆن هاوسێکەی، خەدەنگی کڵێسای جامیع، بە مەلیکە وشابانۆی هەموو بینا پیرۆز، مێژوویی و، نووک تیژەکان دەژمێردرا.

لە دووری دوورەوە، لە پشت شارە کرێکارییەکەوە، لێرەوارێکی دار کاژان، کاژستانێک خۆنوێنی دەکرد و، ڕووباری سین، دوای تێپەڕبوون بە نێوان هەردوو بەشی شاردا، درێژەی بە ڕێگای خۆ دەدا، بە کەناری گرد و بەرزاییانی پڕ درەختدا، کە لێرەو لەوێ بەردە سپییەکانیان، لە شێوەی ئێسقانی جەستەیەکی گەورەدا بەدیار دەکەوتن، تێدەپەڕی و، پاشان، کە پێچێکی گەورەی بازنەیی تەی دەکرد، لە ئاسۆ ئاوا دەبوو و لە چاو ون دەبوو. بە درێژایی ڕووبارەکە کەشتیانی گەورە دەبینران و یەدەک کێشانێک کە لە دوورەوە بە ئەندازەی مێشێک دیاربوون، ڕایاندەکێشان و دووکەڵێکی خەستیان بە حەوادا دەکرد.

گراڤێن بچووک، چ ئەوانەی لێکدییەوە نزیک بوون و چ ئەوانەی لێکدی دووربوون، لە ناو ئاوەکەوە سەریان قوت کردبووەوەو لە دەنکی تەزبیحێکی کەسکی نارێک وپێک دەچوون.

یارۆی گالیسکەچی، چاوەڕوان بوو تا ڕێبوارەکان لە تەمەشاکردن تێر ببن، بە تەجرەبە دەیزانی هەر تاقم وچینە ڕێبوارێک، چەند بە دەم تەمەشاکردنەوە دەمێننەوە.

لێ وەختایەک گالیسکەکە کەوتەڕێ، دوروا لە دووری سەد مەتری خۆیانەوە، لە ناکاوا چاوی بە ژن وپیاوێکی دان عەمر کەوت کە بەرەو ئەوان دەهاتن. بەدەم هاوارەوە خۆی لە گالیسکەکە هەڵدایە خوارەوەو گوتی: خۆیانن، من باشیان دەناسم.

ژن و پیاوێکی گوندی بوون. بە لەقەلەق ڕێیان دەکرد، بەدەم ڕێکردنەوە جارجارێ شانیان بەریەکدی دەکەوت. پیاوەکە کورتەباڵا، چوارشانە، سورفل، کەمێک ورگن بوو،

وێڕای ئەوەی بەتەمەن بوو، هێشتا بەگوڕ بوو. ژنەکە بە پێچەوانەوە، باڵابەرز و ڕێوەڵە وگرژ ومۆن بوو، ژنی ناو کار وخەباتی دژواری گوند و کشتوکاڵ بوو، کە لە منداڵییەوە کەوتبووە بەرگیرووداری کارکردنەوەو بزە نەنیشتبووە سەر لێوانی. لە کاتێکا مێردەکەی بە دەم خواردنەوەوە، بە دەم هەموو مشتەرییەکانیەوە پێدەکەنی وشۆخی وسوعبەتی دەگەڵ دەکردن.

مادلینش لە گالیسکەکە دابەزی، بە دڵێکی خەمینەوە تەمەشای ئەم دووکەسە بێنەوایەی دەکرد کە لەوان نزیک دەبوونەوە. خەمێک کە تا نها شتی وای بەخۆوە نەبینی بوو. ئەوان، کوڕەکەی خۆیان بەم جوانی و پۆشتە وپەرداخییەوە نەدەناسییەوە، هەروەها باوەڕیان نەدەکرد ئەم خانمە نازدار و شیکە بەم کراسە درێژ وتەنکەوە بووکەکەیان بێ.

ژن وپیاوە دان عەمرەکە، کڕ وکپ وبلەز بەرەوپیری کوڕەکەیان دەچوون کە چاوەنۆڕی دیتنی بوون، بێئەوەی تەمەشای ئەم خانم و ئاغا شارنشینە بکەن کە گالیسکەیەک بە دوویاندا دەهات.

داک و بابی بە تەمەن، بەلای ئەواندا بوورین، جۆرج بە پێکەنینەوە هاواریکرد:- سلاو، بابا دوروا!

پیرەمێرد و پیرەژن وەستان، سەرەتا، حایرمان، ئەوسا لە سەرسامیا گێژ ومەنگ حەپەسان.

دایکی زووتر لە بابی وەخۆ هاتەوە، خێرا خۆی جەم وجۆر کردەوەو لە جێی خۆی ڕەق ڕاوەستا، بەدەمەلاڵکێوە گوتی:- ئەمە تۆی، کوڕە ئازیزەکەم؟

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:- ئەرێ، خۆمم دایە دوروا!

ئەوسا چوو بۆلای و ڕوومەتەکانی ماچکرد، ماچێکی تەڕ وتازە و ئاوداری دایک وفرزەنی. ئەوسا گۆناکانی لە گۆناکانی بابیشی هەڵسوون. بابی کڵاوەکەی داکەندبوو، کڵاوەکەی لەو کڵاوانە بوو کە لە روئاندا مۆد بوو، لە ئاوریشمی ڕەش بوو، زۆر قووچ بوو، لە کڵاوی ماڵات فرۆشان دەچوو.

ئەوسا جۆرج، ژنەکەی پێیان ناساند: " ئەمە ژنەکەمە. "

جووتە دێهاتی، حایر وحەپەساو، لە سەراپای مادلینیان دەڕوانی. ئەویان وەکو دیاردەیەکی میتا سروشتی، لە محەک دەدا، بەترس و نیگەرانیەکی، ئاوێتە بەخۆشی لەلایەن بابەکەوەو ئاوێتە بە غیرە وحەسوودی لەلایەن دایکەکەوە، تەمەشا دەکرا.

پیاوەی دان عەمر، کە تەبیعەتێکی شادی هەبوو و چەن پێکێ شەرابی سێوی هەڵدابوو وهێندەی دی کرابووەوە، جورئەتی وەبەرخۆنا و، بەتیلەی چاو نیگایەکی عەیارانەی کرد و گوتی:

– به هەرحاڵ دەتوانین ماچی بکەین، نا؟

– کوڕەکەی بەرسڤی دایەوە: " هەڵبەتە. "

مادلین، بەکەمێک ناڕەحەتیەوە، گۆناکانی بردنە پێشەوە تا پیرەمێردەی دێهاتی، شڵپەشڵپ ماچی بکات، ئەوسا لێوەکانی بە پشت دەستی سڕی.

دایکە پیرەکەش، بەجۆرە سڵکردنەوەیەکی غیرەئامێزەوە بووکەکەی ماچکرد. نا، ئەمە بووکی دڵخوازی ئەو نەبوو، ئەو کیژێکی دێهاتی قوت و قەڵەو، سوور وسپی وەک سێو و قەڵەو و گۆشتن وەک ماینی زایای دەویست. ئەم خانمە بەبۆنی مسک و عەبیرییەوە – چونکە هەر عەترێ بەلای

پیرەژنەوە، مسک وعەبیر بوو – زیاتر لە ژنانی هەرزە دەچوو.

ئەوسا، دوای گالیسکەکە کەوتن، کە بار وبنەی تازە بووک وزاوای هەڵگرتبوو.

پیرەمێرد، باسکی کوڕەکەی گرت، کەمێک ڕایکێشایە دواوە و بەخۆشەویستیەوە پرسی:- تۆ پێم بێژە، وەزع و حاڵت باشە؟

- بەڵێ باشە، زۆرباشە.
- ئەوچاتر! ئەدی ژنەکەت پارە وپلەدارە؟

جۆرج وەڵامی دایەوە:- بە جیازییەکی چل هەزار فرانکیەوە.

پیرەمێرد، بە ئەسپایی فیکەیەکی پەسندئامێزی کێشا، هێندەی ئەم برە پارەیە پێ زۆربوو، تەنیا ئەوەندەی لە دەست هات لە بن لێوانەوە بڵێت: " عەجایەب! " ئەوسا بە دڵنیاییەوە گوتی: " پەنا بە خوا، چەند ژنێکی خشکۆکت هێناوە " ڕێک پڕ بە پێستی زەوق و سەلیقەی ئەوبوو. کاتی خۆی بە ژن ناس ناوبانگی دەرکردبوو.

مادلین ودایکی جۆرج شان بەشانی یەکدی ڕێیان دەکرد، هیچ قسەیەکیان نەدەکرد. ئەوسا هەردوو پیاوەکە پێیانڕا گەیشتن.

گەیینە گوندەکە، گوندێکی بچووک بوو لە قەراغ جادەیەک، هەر بە ڕێکی جادەکە دە خانووی تیابوو، خانووەکان دێهاتیانە وکوختەێن جووتیاری بوون، هەندێکیان بە کەرپووچ دروستکرابوون و هەندێکیان بە قوڕ و خشت. خانووە گڵەکان، بەپوش و حەسیر سەریان گیرابوو و خانووە کەرپووچەکان بە قرمید. مەیخانەکەی بابا

دوروا، ، ساختمانێکی دوو نهۆمی بوو، نهۆمێکی خوارەوەو یەکێکی سەرەوە کە بە جەمەلۆن سەری گیرابوو و کەوتبووە سەمتی چەپی جادەکەوە، ڕێک کەوتبووە، دەروازەی گوندەکەوە. لقە کاژێک بەڕەسمی کۆن لە سەری چەقێنرابوو، نیشانەی ئەوەبوو کە ڕێبوارانی تینوو، دەتوانن لەوێندەر دەمێ تەڕ بکەن.

مێزی نانخواردنیان، کە دوو مێزیان پێکەوە نابوو، لە هۆڵی مەیخانەکەدا، ئامادە کردبوو، دوو دەسماڵ سفرەی گەورەیان لەسەر قاپەکان دانابوو. ژنەکەی دراوسێیان کە هاتبووە یارمەتیان، کە ئەم خانمە شکۆمەندەی بینی، کڕنۆشی بۆبرد و دوای ئەوەی کە جۆرجی ناسییەوە، بە حیرەتەوە گوتی: " یا حەزرەتی مەسیح، ئەمە تۆی بەرخۆلەکەم؟ "

جۆرج، بە خۆشحاڵییەوە بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ خۆمم، دایە برولین.

وەکو چۆن داک وبابی خۆی ڕامووسی بوو، بەو ئاوایە ئەویشی ماچکرد، ئەوسا ئاوڕی لای ژنەکەی دایەوە وگوتی:- با بڕۆین بۆ ژوورەکەی خۆمان، دەتوانی لەوێ کڵاوەکەت دابکەنی.

لە دەرگای سەمتی ڕاستەوە، ژوورێکی پێ نیشاندا کە سارد بوو، ئەرزەکەی بە کەرپووچ کەفپۆش کرابوو، دیوارەکانی تەڕاو کرابوون، تەختەخەوێکی تیابوو، کە پەردەی کەتانی بە دەورا درابوو. خاچێک لە سەرووی قاپی ئاوی پیرۆزەوە دانرابوو، دوو وێنەی ڕەنگین بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون، یەکێکیان وێنەی پل وڤێرژینی بوو و، ئەویتریان وێنەی ناپلیۆن بوو بە سواری ئەسپێکی

زەردەوە، ئەوە تاقە زینەتی ئەم ژوورە خاوێن وخەمناکە بوو. ( پل وڤیرژینی، ناوی قارەمانانی کتێبێکن بەهەمان ناوەوە، لە نووسینی برناردن دو سن پییرە. )

وەختایەک بە دوو قۆڵی مانەوە، مادلینی ماچکرد:

- ڕۆژباش ماد. بە دیداری داک و بابە پیرەکەم خۆشحاڵم. کە پیاو لە پاریس دەبێ بیریان لێناکاتەوە، کەچی دوای ئەوەی دەیانبینێ، خۆشحاڵ دەبێ.

ڕێک لەو کاتەدا باوکی بەمست کەوتە لێدانی دیوارەکە وبە دەنگی بەرز گوتی:- دەی منداڵینە، شۆربا ئامادەیە.

هەڵبەتە ناچار بوون بچنە سەر مێز وخوانەکە.

نیوەڕۆژەو فراڤینەکە دێهاتیانە ودوور ودرێژ بوو، بریتی بوو لە زنجیرەیەک خواردن کە تێکیان نەدەکردەوە، خواشیان یەک نەبوو، سوسیسی بەراز، دوایی خۆراکی گۆشتی سوورەوە کراو، پاشان هێلکە ورۆن بەتەماتەوە. بابا دوروا کە چەند پێکێک شەرابی سێو وشەرابی سووری هەڵدابوو، زەوقی حەنەکچیاتی کرابووەوە، دەستی بە گێڕانەوەی ژمارەیەک نوکتە ومەتەڵۆکی هەڵبژاردە کرد کە بۆ کۆڕ و ئاهەنگان و بۆنەی تایبەتی دainابوون، ماجەرای بێپەردە و دوور لە نەزاکەت کە بە گوتەی خۆی، لە دۆستەکانی ڕوویاندابوو. جۆرج، هەموو ئەو نوکتە و حیکایەتانەی ئەزبەر بوو، وێڕای ئەوەش پێدەکەنی، حاڵ و هەوای زێد وزاگە سەرمەستی کردبوو، عەشق و خۆشەویستی خۆڕسک سەبارەت بە دەڤەرەکەی، شوێنانی دەورانی منداڵی، هەموو هەستەکان، بیرەوەری و شتەکانی ڕابردوو کە تا دووبارە دەیبینینەوە، هەریەکەیان

بیرەوەرییەکی وەبیر دێنایەوە، جێگەی نووکە چەقۆیەک بە دەرگایەکەوە، کورسییەک بە پایە لەق وشڕ وشەپڕێوەکانییەوە کە بویەرێکی لەلا زندوو دەکردەوە، بۆنی خاک، بۆنی شۆکە و شیرینەی درەختان کە لە لێرەوارەکەی تەنیشتەوە دەهات، بۆنە تایبەتیەکانی ماڵەکە، جۆباران، هەرهەموو ئەمانە بە قووڵی کاریان تێکردبوو.

دایە دوروا، هیچ قسەیەکی نەدەکرد. مات وخەمگین لە خۆ ڕۆچووبوو، بەو نەفرەتەوە کە لە دڵیا سەری هەڵدابوو، بەتیلەی چاو دەیڕوانییە بووکەکەی. بە نەفرەتی کرێکارێکی بەتەمەنەوە، دێهاتیەکی پیری، دەست و قامک زبر وپیرەلۆک، بە جەستەیەکی ماندوو وپەریشانی کارێن دژوارەوە، دەیڕوانییە ئەم ژنە شاریە، کە وەکو ژنێکی بە نەعلەت کراو، حاشالێکراو ئەوی بێزار دەکرد، وەکو بوونەوەرێکی لەزەتخوازی ئەهلی ڕابواردن و گوناحان تەمەشای دەکرد. هەر تاو ناتاوێ هەڵدەستا تا قاپێ خواردنی تازە بێنێتە سەرمێزەکە، ڤەخارنێکی زەردباوی ناو سوراحی و شەربەیەک لە پەرداخەکان بکات، یان شەرابی گازداری سێو کە کەفی دەکرد وشیرین بوو و بە بچووکترین جووڵە، تەپەدۆری بوتڵەکان، وەکو ساردی گازدار، دەردەپەڕی و دەچوو بە حەوادا.

مادلین، زۆر کەمی دەخوارد، زۆر کەم قسەی دەکرد، خەمین بوو، بزەیەک نیشتبووە سەر لێوی، لێ بزەیەکی خەمناک و تاساو. هەستی بە مەغدووری و کەسەران دەکرد. چما؟ خۆ خۆی ویستبووی بێت، زۆرچاک دەیزانی دەچێت بۆلای خەڵکانێکی دێهاتی، دێهاتیانێکی نەدیتکە و

نیمچە هۆڤی. ئاخۆ لە خەیاڵی خۆیا چۆنی وێناکردبوون، کە لە ئەسڵا ئەهلی خەون وخەیاڵان نەبوو؟

ئایا پێشبنی ئەم شتانەی کردبوو؟ ئایا ژنان هەمیشە ئارەزووی ئەو شتە ناکەن کە لە حەقیقەتدا بوونی نییە؟ ئایا ئەوانی لە دوورەوە بە شێوەیەکی شاعیرانە لە دەف خۆی بەرجەستە کردبوو؟ نا، بەڵام ڕەنگە شاعیرانەتر، ڕەسەنتر، میهرەبانتر و خۆش ڕواڵەت تر لەم دووە بەرجەستەی کردبووبن. ویڕای ئەمەش بەتەمای ئەوە نەبوو، ئەوان وەکو کاراکتەرانی ناو چیرۆکان، خەڵکانی دیار وشایستە وئایدیال بن. ئەدی بۆچی بە ئەدا وئەتواری دێهاتیانەی ئەوان، بە تەبیعەتی ناهەموار و زبریان، بە قسە وڕاوێژیان بە ڕەفتار و دەربڕینی خۆشحاڵیان، قەڵس دەبوو؟

دایکی خۆی بیرکەوتەوە، کە هەرگیز باسی ئەوی دەگەڵ چ کەسێکا نەدەکرد، مامۆستایەکی فریو خواردوو کە لە سن دنی گەورە بووبوو و، کە مادلین گەیی بووە تەمەنی دوازدە ساڵی، لە نەداری و داخ و کەسەرا مرد. پیاوێکی نەناس و بێگانە ئەم کچۆڵەیەی گرتبووە خۆ و گەورەی کردبوو. ئایا بابی بووە؟ ئەم پیاوە کێ بوو، ئێستاش ئەمەی بە تەواوەتی بۆ ساغ نەبووەوە، هەرچەندە جارجار مەزەندەی گۆنگی لێدەدا.

نیوەڕۆژ لە تەواوبوون نەدەهات. تەنها بەرەبەرە سەروسەکوتی مشتەرییان پەیدا دەبوو، دەستی بابا دوروا یان دەگوشی، چاوڕوونی هاتنەوەی کوڕەکەیان لێدەکرد وژێراوژێر دەیانڕوانیە ژنە گەنجەکە و زۆڵانە چاویان دادەگرت، کە ماناکەی ئەمەبوو: " خواگیان، هاوسەرەکەی ئەم جۆرج دوروایە چەند جوانە. "

مشتەرییانی دی کە زۆر ناسیاو و خۆمانە نەبوون، لە سەر مێزێک ڕۆدەنیشتن و بەدەنگی بەرز دەیانگوت: " بوتڵێ شەراب! پەرداخێ بیرە! دوو پیاڵە عارەق! " ئەوسا دەستیان بە دومینە دەکرد، بە دەم هەراو هەنگامەی زۆرەوە پولە ئێسقانییە ڕەش و سپیەکانیان، بە سەر مێزەکەیا دەکوتا.

دایە دوروا، پەیتا پەیتا دەهات ودەچوو. بە هەمان قەڵافەتی گوناحانەوە، ڤەخارنی بە مشتەرییەکان دەدا، پارەی لێوەردەگرتن و بە چمکی بەرکۆشە شینەکەی، مێزەکانی خاوێن دەکردەوە.

دووکەڵی سەبیلی گڵێن وسیغارێن هەرزان بایی هۆڵەکەی پڕکردبوو. مادلین، کەوتە کۆکین وگوتی ناتوانین بڕۆینە دەرەوە؟ تاقەتم چوو، ناتوانم لەوەی پتر لێرەدا بمێنمەوە.

هێشتا خواردن تەواو نەبووبوو، بابە دوروا، نارەحەتی خۆی دەربری، هەنگێ مادلین هەستا، چوو لە بەر دەرگای مەیخانەکە، کە بەڕووی جادەکەدا دەکرایەوەو لە سەر کورسییەک ڕۆنیشت و چاوەڕوان بوو کە خەزووری و مێردەکەی قاوە و مەشرووبی دوای نانخواردن، بخۆنەوە.

دوای کەمێک جۆرج چوو بەلایەوە پرسی:- حەز دەکەی بڕۆینە خوارێ بۆ قەراخ ڕووبارەکە؟

مادلین، بەخۆشحاڵییەوە ڕازی بوو:- بەڵێ، بابڕۆین.

لە گردەکەوە داگەڕان، لە قەراخ ڕووبارەکەدا بەلەمێکیان بەکرێ گرت وهەموو دوانیوەڕۆکەیان لە کەنار گراڤێکی ناوەندی ڕووبارەکەدا، لە سێبەر وسایەی دار بییاندا گوزەراند، گەرمای خۆشی بەهاری وتەکانی بێشکە ئاسای بەلەمەکە، خەوێکی خۆشی لێخستن.

که شەو داهات ئەوسا بۆ ماڵ زڤڕینەوە.

شام لەبەر ڕۆشنایی مۆمێکی سەر مێزەکە، بۆ مادلین لە فراڤینەکەش ناخۆشتر بوو. بابا دوروا کە نیمچە مەست بوو، قسەی نەدەکرد و هاوسەرەکەشی هەر گرژ ومۆن بوو.

ڕۆشنایی کزی مۆمەکە، سێبەرەکانی ئەوانی لە سەر دیوارەکە، بە کەپووانی زەلام و جووڵەیێن نائاساییەوە، دەنواند. هەندێجار دەستێکی دێوئاسا دەبینرا کە چنگێکی وەکو خرماشەی باخەوانێک بەرز دەکردەوە و بەرەو دەمێکی کراوەی غارئاسای دەبرد، کە یەکێکیان کەمێک سەری وەردەگێڕا، لایەکی ڕووی لە بەر ڕۆشنایی زەردباو و لەرزۆکی مۆمەکە، لە سەر دیوارەکە بە دیاردەکەوت.

هەرکە لە شێو خواردن بوونەوە، مادلین مێردەکەی لە مەیخانەکە بردە دەرێ، تا لەوەی پتر لە ناو هۆڵە نیمچە تاریکەکەدا نەمێننەوە کە بۆنی دووکەڵی توندی سەبیل و ڤەخارن تێکەڵ بووبوو و هەوای ژوورەکەی قورس کردبوو.

کە گەییە هەوای ئازاد، جۆرج گوتی:– بێتاقەت بووی، نا؟

مادلین، ویستی بەرپەرچی بداتەوە، لێ جۆرج قسەکەی پێبڕی و لە سەری ڕۆیی:

– نە، قسەمەکە، بەخۆم هەستت پێدەکەم. ئەگەر حەز دەکەی و گەرەکتە لە سبەیەوە دەڕۆینەوە.

مادلین لەبن لێوانەوە گوتی:– بەڵێ دەمەوێ.

بەکاوەخۆ پیاسەیان دەکرد. شەوێکی خۆش وفێنک بوو، تاریکیە قووڵەکەی لە تووایە پڕبوو لە دەنگێن هێواش، ڕاز

ونیاز، زەمزەمە. خۆیان بە باریکە ڕێیەکدا کرد، کە سێبەری درەختانی بەرز باڵی بەسەردا کێشابوو.

مادلین، بە ئەسپایی پرسی:- لە کوێین؟

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- لە لێرەواردایین.

- لێرێکی گەورەیە؟
- زۆر گەورەیە، گەورەترین لێری فەرەنسایە.
- بۆنی خاک، درەخت و خەتەتیلکە و بۆنی تازە و کۆنی بیشە چڕەکە کە لە شیلەی چرۆ و بژۆ وگیای تەڕ و ڕزیوی بن درەختەکان پێکهاتبوو، دەتگوت لەم باریکە ڕێگایەدا خەوتبوون. مادلین کە سەری هەڵێنا، لە بەینی لق وپۆ و گەڵای درەختەکانەوە چەند ئەستێرەیەکی بەدی کرد وهەرچەندە هیچ شنەیەک نەدەهات ولق وپۆکانی نەدەهەژاند، هەستی بەهەژان ولەرەیەکی گۆنگی گەڵاکانی دەوروبەری خۆی دەکرد.

ڕاجفرینێکی سەیر دەروونی لەرزاند وگەییە سەر پێستەکەشی، نیگەرانییەکی نادیار دڵی گوشی، بۆچی؟بە خۆیشی سەری لێدەرنەدەکرد. بەڵام وای هەستدەکرد گوم بووە، خەریکە تیا دەچێ، جۆرەها مەترسی ئابلۆقەی داوە، کەسی بە دەورەوە نییە، تەنیای تەنیایە، بەتاقی تەنیا لەم دنیایەدا ولەژێر ئەم گومەزە زندووەی دیار سەریا، دەلەرزێ .

بە ئەسپایی گوتی:- کەمێک دەترسم، حەزدەکەم بگەڕێینەوە.

- باشە، با بگەڕێینەوە.
- ئەدی سبەی بۆ پاریس دەگەڕێینەوە؟

- بەڵێ، سبەی.
- سبەی بەیانی؟
- بەڵێ، سبەی بەیانی، مادام تۆ پێتخۆشە.

بۆ ماڵ زڤڕینەوە. داک وبابی جۆرج نووستبوون. مادلین خەوێکی ناخۆشی کرد، بە بچووکترین دەنگی هاوینەوار کە بۆ ئەو تازە بوو، لە خەو ڕادەپەڕی، دەنگی کوند و قڕاوکە، مرخە مرخی بەرازان کە کرابوونە ئاغەڵێکی تەنیشت خانووەکەوەو قوقاندنی کەڵەبابێک کە لە دوای نیوەشەوەوە، نزیکبوونەوەی ڕۆژی ڕادەگەیاند. هەرکە دنیا ڕوناک بووەوە، لە جێگاکەی هاتەدەرێ و خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادەکرد.

وەختێ جۆرج بەداک وبابی گوت کە بەتەمای ڕۆیشتنن، پیرەمێر وپیرەژن، حەپەسان، پاشان بۆیان دەرکەوت کە ئەم بڕیارە کوت وپڕە، سەرچاوەکەی لە کوێوەیە.

بابەکە بە ساکاری پرسی:- بەو زووانە دەتبینمەوە.
- هەڵبەتە، هاوین.
- دەی زۆرچاکە.

پیرەژن بە دەم پرتە وبۆڵەوە گوتی:- هیوادارم لەو کارەی کە کردووتە ژێوان نەبیتەوە.

جۆرج، بە ناوی دیارییەوە دووسەد فرانکێکی دانێ، تا لەو ڕێگەیەوە گلەییان ببڕێ. کوڕێژگەیەکیان بەدوای گالیسکەدا ناردبوو، گالیسکەکە دەوروبەری سبەعات دە دەهات، بووک وزاوا، پیرەژن ومێردی دێهاتیان ڕامووسی و کەوتنەڕێ.

وەختایەک خەریک بوو بە نشێوی گردەکەدا دادەگەڕان، جۆرج دەستی بە پێکەنین کرد، ئەوسا گوتی:

– ئی، ئەمەش وا، پێشتر پێم گوتبووی، نەدەبوو تۆ بە داک وبابم، وەکو خانم و ئاغای دو روا دوکانتیل بناسێنم.

مادلینش لە قاقای پێکەنینی دا و وەڵامی دایەوە:

– نها زۆر خۆشحاڵم، پەشیمان نیم، خەڵکانی باشن، خەریکە بەرە بەرە لە گەڵیاندا ڕادێم. لە پاریسەوە شیرینی و نوقڵ و ئاجیلیان بۆ دەنێرم.

ئەوسا لەبن لێوانەوە لە سەری ڕۆیی:– دوروا دوکانتیل... دەبینی هیچ کەسێک لە دیتنی ئەم ناوە لە پاینی دەعوەتنامەکانمانەوە، حایر نامێنێ. بۆ هەمووانی باس دەکەین کە هەشت ڕۆژمان لە موڵکەکانی داک وبابتدا بەسەر بردووە.

ئەوسا لە مێردەکەی نزیک بووەوە، سەری سمێڵی ماچکرد وگوتی: " سڵاو، جۆ! "

جۆرج بەرسڤی دایەوە: " سڵاو ماد. " و دەستی لەقەدی ئاڵاند.

ڕوبارە گەورەو پانەکە، لە دوورەوە، لە قووڵایی دۆڵەکەدا دەبینرا کە بە وێنەی زنجیرێکی زێوین لەبەر تیشکی خۆرەکەدا دەدرەوشایەوەو لێدکی جیا دەبووەوە، هەروەها هەموو دووکەڵکێشی کارخانەکان کە دووکەڵی زوخاڵیان دەکرد بە ئاسمانی شینباوا، هەموو منارە نووک تیژەکان کە بە ئاسمانی شارێکی کۆنا بەرز بووبوونەوە، بە ڕوونی دەبینران.

( ٢ )

خانم و ئاغای دوروا دوو ڕۆژ بوو بۆ پاریس گەڕابوونەوە، جۆرج ڕۆیی، لە ڕۆژنامەکەدا چووەوە سەر کارەکەی جارانی، واتە لاپەڕەی کورتە هەواڵان، چاوەڕوانی ئەوەبوو دەست بە کارە تازەکەی بکات، ببێ بە جێنشینی فورستیە، هەموو وەختی خۆی بۆ نووسینی وتار و شیکردنەوەی سیاسی تەرخان بکات.

ئەو شەوە بە دڵی خۆشەوە بۆ ماڵ گەڕایەوە، بۆماڵی دۆستەکەی جارانی، تامەزرۆی ماچی ژنەکەی بوو، کە بە جازیبە وجوانی جەستەیی، ئەمی خستبووە ژێر باندۆری خۆیەوە. وەختێ بە بەر دووکانێکی گوڵفرۆشی شەقامی نوتردام دو لورتدا تێپەڕی، بیری کەوتەوە کە چەپکە گوڵێک بۆ مادلین بکڕیت، چەپکە گوڵەباخێکی گەورەی، کە هێشتا خونچەکانی نەپشکوتوو بوون کڕی، خونچەکان زۆر جوان وبۆندار بوون.

کە بە پلیکانەکانی هەر نهۆمێکدا سەردەکەوت، بەکەش وفش و ڕەزامەندییەوە لە ئاوێنەکەدا تەمەشای خۆی دەکرد و ئەوکاتەی بیردەکەوتەوە کە پێی نابووە ئەم ماڵە.

چونکە بیری چووبوو کلیلەکەی ببات لە زەنگی دا. هەمان پێشخزمەتی جاران، کە لە سەر داوای ژنەکەی هێڵابوویانەوە، هات و دەرگای لێکردەوە.

لێی پرسی:- خانم هاتووەتەوە؟

- بەڵێ ئاغا.

بەڵام کاتێ کە خەریک بوو لە ژووری نان خواردنەوە تێدەپەڕی، کە بینی مێزەکە لە جیاتی بۆ دوو نەفەر، ئامادەکرابێ بۆ سێ نەفەر ئامادەکراوە، زۆری پێ سەیر

بوو و، چونکه پەردەکەی نێوان ژووری نانخواردن و هۆڵەکە لابرابوو، مادلینی لە هۆڵەکەدا بینی کە خەریک بوو چەپکە گوڵێکی وەکو چەپکە گوڵەکەی ئەوی لە گوڵدانێک دەنا. لە دڵی خۆیدا هەم ناڕازی بوو وهەم زوێر، وەکو ئەوەبوو نەفەرێکی دی، بیرۆکەی گوڵ کڕینەکە و، ئەو خەیاڵ و لەزەتەی کە بە تەمابوو لە پێشکەشکردنی چەپکە گوڵەکە بە ژنەکەی، ببینێ، کەسێکی دی لێی دزی بێت.

وەختێ خۆی بە هۆڵەکەدا کرد پرسی:- کەست بۆ شێو دەعوەتکردووە؟

مادلین، بێئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە، هەر بەو دەقەوە کە خەریک بوو گوڵەکانی لە نێو گوڵدانەکە ڕێکدەخست بەرسڤی دایەوە:

- ئاو، نا. دۆستی دێرینم کۆنت دو ڤیدریکە کە عادەتی وایە دوو شەمموان لێرە شام بخوات و ئێستاش وەکو جاران دێ بۆ لامان.

جۆرج لەبن لێوانەوە گوتی:- کەواتە، ئاوها.

بە خۆ وچەپکە گوڵەکەی دەستیەوە لە نزیکی ژنەکەی وەستابوو. حەزیدەکرد بیشارێتەوە، فڕێی بدات، وێڕای ئەوەش گوتی:- هانێ بیگرە، گوڵە باخم بۆ کڕیوویت.

مادلین، لە ناکاوا ئاوڕی لێدایەوەو بە ڕوخساری خەندان وڕووی گەشەوە هاواریکرد:- ئاه، دەستخۆش کە بیرت لە من کردووەتەوە.

بە شەوق وزەوقێکی ڕاستەقینەی پڕ لەزەتی ئەوتۆوە دەستەکانی بۆ درێژکرد و لێوەکانی ماچکرد، کە جۆرج ناڕەزایەتیەکەی خۆی بیری چووەوە.

گوڵەکانی لە دەستی وی وەرگرت، بۆنی کرد، بەکەیف وخۆشی ودڵخۆشی منداڵێکەوە، گوڵەکانی، لە گوڵدانێکی، خاڵی دا، کە بەرانبەر گوڵدانی یەکەم بوو، نا. ئەوسا نیگایەکی هەردوو گوڵدانە پڕ لە گوڵەکانی کرد وگوتی:- نها بە دڵمە. سەر سۆپاکەم زۆرچاک ڕازاوەتەوە.

ئەوسا، بەقەناعەتی تەواوەوە لە سەری ڕۆیی:- دەزانی، فیدریک، ئینسانێکی باش ومیهرەبانە. زۆر زوو دەبیت بە دۆست وبرادەری.

لە زەنگی قاپی درا، کۆنت فیدریک بوو، زۆر بەئارامی و ئاسوودەیی هاتە ژوورەوە، دەتگوت لە ماڵی خۆیدایە. پاش ئەوەی بە نەزاکەتەوە سەری قامکەکانی مادلینی ماچکرد، ئەوسا بۆلای جۆرج گەڕایەوەو بەگەرمی تەوقەی دەگەڵدا کرد و بەجدی پرسی:- ئێ حاڵ و ئەحواڵت دوروای ئازیز؟

هەمان قەلافەتی وشک ومەغروورانەی جارانی نەبوو، بەڵکو میرەبان وخۆشخوو بوو. دەیویست ئەوە نیشانبدات کە ڕەوشی جاران بە تەواوی گۆڕاوە. جۆرج، کە سەری لەم ڕەفتار و ئەتوارەی ئەو سوڕمابوو هەوڵیدا خۆی میهرەبان نیشان بدات، تا بە ڕووخۆشی و خۆشڕەفتاری وەلامی ئەو بداتەوە، دوای پێنج خولەکێک لە گفت وگۆ، دەتگوت دە دانە ساڵە یەکدی دەناسن و هاوڕێی گیانی بە گیانین.

هەنگێ مادلین کە ڕووی لە خۆشیا گەشابووەوە، پێی گوتن:

- من ئێوە پێکەوە بەجێ دێڵم. دەبێ سەرێکی مووبەقەکە بدەم.

ئەوسا، جووتە پیاو بەنیگا بەڕێیان کرد ولە ژوورەکە وەدەرکەوت. وەختایەک هاتەوە، بینی خەریکە بە دووقۆڵی

باسی شانۆ دەکەن، سەبارەت بە شانۆنامەیەکی تازە دەدوان، هێندە هاوڕاو بۆچوون بوون، کە پرشنگی دۆستی لە چاویان دەبووەوە.

شامەکەیان زۆر دڵگیر وتایبەتی بوو، کۆنت لەم ماڵەداو لە نێوان ئەم ژن ومێردە جوان وئازیزەدا، بەڕادەیەک هەستی بە ئاسوودەیی و خۆشی دەکرد کە تا درەنگانێ مایەوە.

هەرکە کۆنت ڕۆیی، مادلین لە مێردەکەی پرسی:

- پیاوێکی خۆشە، ها؟ پیاو کە بە باشی بیناسێت، ڕایەکی دی دەربارە پەیدا دەکات. دۆستێکی چاک، بێوەی، وەفادار، دڵسۆزە. ئاە کە بەبێ ئەو... هێشتا مادلین قسەکەی تەواو نەکردبوو و جۆرج وەڵامی دایەوە:- بەڵێ، بەڕای من پیاوێکی خۆشەویستە، وا تەسەور دەکەم بەباشی لە زمانی یەکدی تێدەگەین.

مادلین یەکسەر گوتی:- ئاگات لێ نییە، ئەمشەو بەر لە خەوتن کارێکی زۆرمان لەبەردەمە. پێش نانخواردن فریا نەکەوتم بۆتی باسبکەم، چونکە ڤیدریک زۆر زوو هات. هەندێ هەواڵی ناخۆشم دەربارەی مەراکش پێ گەییوە. لاروش ماتیو، نوێنەری ئێستای ئەنجوومەن و وەزیری ئایندە ئەو هەواڵانەی داومێ. دەبێ وتارێکی گرینگ و پڕ سەروسەدا لەو بارەیەوە ئامادە بکەین. واریقات و ژمارە و ئامارم لەلایە. دەبێ بە پەلە دەست بەکاربین. وەرە ئەو چرایە هەڵگرە.

جۆرج چراکەی هەڵگرت و چوون بۆ ئۆفیسەکەیان.

هەمان کتێبەکانی جاران بەڕیز لە کتێبخانەکە ڕیز کرابوون، بەم جیاوازییەوە کە ئەو سێ گوڵدانەی کە

فورستیه له دوا ڕۆژەکانی ژیانیا، که حاڵی کەمێ باش بوو، له کەنداوی ژوئاندا کڕی بوونی، ئێستا له سەر کتێبخانەکه دانرابوون.

له ژێر مێزەکەدا، ژێر پاییەکەی فورستیه، چاوەڕوانی ئەوه بوو که پێیەکانی دوورواي بنرێته سەر. جۆرج هەرکه له پشت مێزەکەوه دانیشت پێیەکانی له سەر ژێرپاییەکه ( ژێرپایی: تەختە دارێکه له ژێر مێزی کارکرنا دادەنرێ تا پای بخرێتەسەر ) دانا و قەڵەمێکی که فورستیه نووکەکەی کەمێک جووی بوو، له ناو قەڵەمدانه عاجەکه هەڵگرت.

مادلین جگەرەیەکی پێکرد، پشتی به موغەیرییەکەوه نا وئەو خەبەر و هەواڵانەی که بیستبوونی گێڕایەوه. ئەوسا بۆچوونی خۆی له مەڕ هەواڵەکان و سکیچی وتارێک که له زەینی خۆیدا گەڵاڵەی دەکرد، بۆ ئەو شەرح کرد.

جۆرج به وردی گوێی له قسەکانی ئەو دەگرت، خێراخێرا تۆماری دەکردن، وەختایەک که له نووسینیان بووەوه، بۆچوونه پێچەوانەکانی خۆی دەربڕی، مەسەلەکەی خستەبەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوه، گەورەی کردەوەو پەرەی به بۆچوونەکەدا، بەڵام نەک به مەبەستی نووسینی وتارێک، بەڵکو نەخشەیەک بوو بۆ دژایەتی وەزیرەکەی ئێستا. ئەم هێرشە دەبوو به سەرەتا و دەستپێکی کارەکه. ژنەکەی به ڕادەیەک هاتبووه جۆش، که بیری چووەوه نەفەس له جگەرەکەی بدات، بەگوێرەی بۆچوونەکانی جۆرج، ئاسۆی تازەی سەبارەت بەم مەسەلەیه لەبەرچاو کرابووەوه.

جارجار لەبن لێوانەوه دەیگوت:- بەڵێ... بەڵێ... زۆرچاکه... عاله... عەیبی نییه.

وەختایەک جۆرج لە دەربڕینی بۆچوونەکانی خۆی بووەوە، مادلین گوتی:- نها دەبێ ئەمانە بخەینە سەر کاغەز.

بەڵام جۆرج نووسین ودەستپێکی نووسینی بەلاوە دژوار بوو، وشە وپەیڤی پێویستی بە زەحمەت بۆ دەهات. هەنگێ ژنەکەی هات، بە ئەسپایی بە سەر شانیا دانەوییەوەو زۆر بە ئەسپایی دەمی لە پەنا گوێی نا ودەستی بەگوتنی ڕستە وپەیڤێن گونجاو کرد.

جارجار دووچاری دوودڵی دەبوو ودەیپرسی:- ئەمە دەقاودەق ئەو شتەیە کە دەتەوێ بیلێی؟

مێردەکەی بەرسڤی دەدایەوە:- بەڵێ، دەقاودەق.

مادلین، ڕستەێن تووند وتیژی دەزانی، ڕستەێن نیشداری ژنانە کە زۆرچاک دەیتوانی، تانە وتەشەر لەسەرۆکی دەستەی وەزیران بدات، قەلافەتی ئەوی، ئاوێتە بەو سیاسەتە دەکرد کە گرتبوویەبەر، ئیدی ئەمەی بە شێوازێکی هێندە خۆش دەردەبڕی کە هەم خوێنەری دێنایە پێکەنین وهەم دروستبوونی بۆچوون و گەنگەشەکانی خۆی پێ دەسەلماند.

دورواش، هەندێجار، چەند دێڕێکی خۆی دەخستە سەر قسەکانی ئەو وکاریگەری ڕستەکەی قووڵتر وزیاتر دەکرد. جگە لەمانە لە نووسین ودارشتنی هەواڵ و نووچەێن کورتی تەنز ئامێزا، فێری هونەری بەکاربردنی ڕستەێن دوولۆنەی، مانا پەنهان بووبوو و، کاتێ ئەو بویەرەی مادلین دەیگێڕایەوە، ئەگەر هەندێک گومان ئامێز و یان مەیلەو خەتەر بوایە، ئیدی لەڕێگای ئەو جۆرە ڕستانەوە پینەی دەکردو بە شێوازێکی هێندە کاریگەر دایدەڕشتەوە خوێنەری وادار دەکرد، بەخۆی بابەتەکە هەڵێنێ وبچێتە بنج

وبناوانی وباوەرو قەناعەتی پێبکات، کە ئەگەر ڕاستەوخۆش بۆی ڕوون کراباوە، بەمجۆرە کاری تێنەدەکرد.

وەختێ وتارەکە تەواو بوو، جۆرج بەدەنگی بەرز و بەڕاوێژێکی وتاربێژانە خوێندیەوە. هەردووکیان زۆریان بەدڵ بوو، خۆشحاڵ و حەیران بەدەم یەکەوە پێکەنین، دەتگوت تازە خۆیان بەیەکدی ناساندبوو، چاویان بڕی بووە یەکدی، بەجۆش وخرۆش ومەحەبەتەوە، بەشەوق وزەوقەوە، بەگەرم وگوڕییەکی عاشقانەوە کە لە زەین و جەستەیانەوە هەڵدەقولا یەکدییان ڕامووسی.

جۆرج، چراکەی هەڵگرت و بەنیگایەکی پڕ سۆز و گودازەوە گوتی: " نها کاتی خەوتنە. "

مادلین بەرسڤی دایەوە:- تۆ لە پێشەوە بڕۆ سەروەرم، چونکە تۆ ڕێگاکە ڕوناک دەکەییەوە.

جۆرج لە پێشەوە ڕۆیی ومادلین لە دواوە، بە نووکی قامکان ملی ختووکە دەدا تا واداری بکات خێراتر بڕوات، چونکە جۆرج بەم ختووکەدانە، ڕادەجفری وتەزووی پێدا دەهات.

وتارەکە بە ناوی جۆرج دوروا دوکانتیلەوە بڵاو بووەوە وهەرا وهەنگامەیەکی زۆری نایەوە. ئەنجوومەن تەواو تەنگەتاو بوو. بابا ڤالتر، پیرۆزبایی لە نووسەرەکەی کرد وبەشی سیاسی ڕۆژنامەکەی بەوسپارد، لاپەڕەی کورتە هەواڵان و بویەرانیش خرایە ئەستۆی بوارنار.

هەنگێ لە ڕۆژنامەکەدا، خەبات و دژایەتیەکی لێهاتووانە و بێ ئامان لە دژی وەزارەتی دەرەوە کە ئیدارەی ئەم ماجەرایەی دەدا، دەستی پێکرد. هێرشەکان کە هەمیشە زیرەکانە وپشت بەستوو بە بەڵگە و ڕووداوان بوو، جارێ

تەنز ئامێز وجارێ جدی، گاڤێ شۆخ وگاڤێ نێشدار بوون، بە بەردەوامی ودیقەتێکی ئەوتووە دەستی خۆی دەوەشاند و ئامانجی دەپێکا، کە هەرهەموو خەڵکی حەپەساندبوو. ڕۆژنامەکانی دی، هەڵبەتە بە ئاماژەوە بۆ ژێدەر وچاڤکانی، بەشێک لەو وتارانەیان وەردەگرت وبڵاویان دەکردەوە، هەندێجار بەشێکی تەواو و گرینگی ئەو وتارانەیان لە لاپەڕەکانی خۆیاندا بڵاو دەکردەوە. پیاوانی دەوڵەت کەوتنە هەوڵی ئەوەی بزانن ئاخۆ ناتوانن بە کۆمەک و لە ڕێگەی پۆلیسەوە دەمی ئەم دژمنە نەناس و چیرە درێژە دابخەن.

دوروا، لە ناوەندە سیاسییەکاندا ناوبانگی دەرکردبوو. بە چۆنیەتی تەوقەکردنی خەڵکەکە لەگەڵیا و کڵاوداگرتنیان لە هەنبەریا، هەستیدەکرد کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەلاتی زیاتر دەبێت وپایەی بەرزتر دەبێت. ژنەکەشی بە سەدەمی توانای داهێنەرانەی روحی ودەروونی خۆی وکارامەیی زانیارییەکانی ودۆست و ئاشنایانی بێ شوماریەوە لە نێو پایەدارانی کۆمەڵگەدا، هێندەی دی ئەوی سەرسام و حەیرانی خۆی دەکرد.

هەرجارێ کە بۆماڵ دەگەڕایەوە، سیناتۆرێ، نوێنەرێکی ئەنجوومەن، قازییەک، جەنەڕاڵێکی لە ماڵەکەی خۆیدا دەبینی، کەوەکو دۆستێکی دێرین، زۆر خۆمانە و بەڕێزەوە ڕەفتاری دەگەڵ مادلیندا دەکرد. لە کوێ وچۆن ناسیاوی دەگەڵ ئەم خەڵکانەدا پەیدا کردبوو؟ هەرخۆی دەیگوت لە کۆمەڵگەی پێشەنگاندا. بەلام چۆن توانی بووی متمانە ومەحەبەتیان بە دەست بێنێ؟ سەری لەم مەسەلەیە دەرنەدەچوو.

بە خۆی دەگوت: دەیتوانی ببێت بە سیاسەتوانێکی گەورە.

زۆربەی کات، بۆ نانخواردن، درەنگ دەگەییەماڵەوە، بە هانکەهانک، بەڕەنگ وڕووی گەش وبە بەدەنی لەرزانەوە خۆی بەماڵدا دەکرد و تەنانەت پێش ئەوەی کڵاوەکەشی دابکەنێ دەیگوت:

- ئەمڕۆ خەبەر وباسی گەرم و دەستی یەکم پێیە. تەسەور بکە کە وەزیری داد، تازە دوونەفەری، کە ئەندامی کومسیونی هاوبەش بوون، بە قازی دامەزراندوون. دەرسێکی وای پێدەدەین کە تا ماوە لەبیری نەچێتەوە.

پاشان، جەزرەبەیەکی لە وەزیردا و، بۆ سبەی یەکێکی دی وبۆ ڕۆژی سێیەمی یەکێکی دی. لاروش ماتیو، نوێنەری ئەنجوومەن کە ڕۆژانی سێ شەممە، ڕۆژێک لە دوای کۆنت دو ڤیدریک لە ماڵی وان شامی دەخوارد بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە تەوقەی دەگەڵ ژن و مێردەکەدا دەکرد و هەمیشە دووبارەی دەکردەوە: " بەڕاستی شەڕە نە گاڵتە، مەحاڵە دوای ئەم هێرشانە سەرکەوتن بە دەست نەیەنین. "

لە ڕاستیا، بەهێڤی ئەوەبوو پۆستی وەزارەتی دەرەوە، کە لەمێژبوو مرخی لێ خۆشکردبوو، بەدەست بێنێت.

ئەو لە سیاسەتوانە هەزار ڕووەکان بوو، بێ ئیمان، بێ توانا، دوور لە هەموو جورئەتێک و زۆر کەمزان، وەکیل مودافیعی شارستان، پیاوێکی بە سەروسیمای ناوەندی شار، کە فێڵبازانە پەیوەندی ژێراوژێری باشی دەگەڵ هەموو حیزب و داروودەستەکاندا هەبوو، جۆرە مەسیحییەکی دەمارگیری کۆماریخوازو قارەمانێکی ئازادیخواز بوو بە شێوازێکی پڕگومان، لەو جۆرە بەشەرە هەلپەرستانە بوو

که له دەمی هەڵبژاردنی گشتیدا هەزارانی وەکو ئەو، وەکو قارچک له زبڵدانی کۆمەڵگەوە هەڵدەتۆقن.

هەڵویستی دێهاتیانەی میکاڤیلیانەی ئەوی له هەموو هاوکارو خەڵکه دەست وپێ سپی وهیچ لەبارا نەبووەکەی دەوروبەری جیادەکردەوەو وەکو کەسێکی زرینگ وبەدەسەڵات ودەستڕۆ دەهاته بەرچاو، له شاری کوێرانا یەکەڵە چاو پاشایه.

کابرایەک بوو، بۆ بەرژەوەندی خۆی زیرەک بوو، هەم بەسەر وسیما بوو، هەم به نەزاکەت وئەتەکێتزان، هەم خاکی و هەم میهرەبان. لەنێو چینه باڵاکانی کۆمەڵگه وهەروەها له ناو ڕەمەکی خەڵکی ولەناو گەوره کارمەندانی ئەو زەمانەدا، بازاڕی زۆر گەرم بوو.

ئیدی له هەر کۆڕو مەجلیسێکدا باس باسی ئەو بوو، دەیانگوت: " لاروش، ڕۆژێ دێ دەبێ به وەزیر "، وبەخۆیشی زۆر بەدڵنیاییەوە لەوباوڕەدا بوو که لاروش دەبێت به وەزیر.

یەکێک بوو، له شەریکه گرینگەکانی بابا ڤالتر، هەروەها له زۆر فرۆفێڵ ودزی وفزی داراییشدا هەر هاوکار و شەریکی بوو.

دوروا، به دڵنیایی و کۆمەڵێک ئومێدی گۆنگەوە به ئاینده، پشتیوانی لەو دەکرد. لەڕاستیا درێژەی بەهەمان کار دەدا که فورستیه دەستی دابووێ، لاروش ماتیو، بەڵێنی دابووێ که ئەگەر به مرادی خۆی بگات، نیشانی لژیون دونوری بۆ وەردەگرێت، تاقه جیاوازی مەسەلەکه تەنیا ئەمه بوو که نیشانەکه به بەرۆکی مێردە تازەکەی مادلینەوە

دەکرا، دەنا، ڕەوشە گشتیەکە هەر وەکو خۆی مابووەوەو بەموو نەگۆڕابوو.

ڕەوشەکە بۆ هەمووان بە ڕادەیەک وەکو خۆی مابووەوە کە هاوکارەکانی دوروا، بابەتێکیان بەدەمەوە گرتبوو کە خەریک بوو بەرەبەرە تووڕەی دەکرد. بە فورستیە بانگیان دەکرد.

هەرکە پێی دەنایە ناو ئیدارەی ڕۆژنامەکە، یەکێک لەلایەکەوە هاواریدەکرد: " بەڵێ بزانم فورستیە. "

جۆرج خۆی لە گێلی دەدا، وای دەنواند گوێی لەو هاوکارەی نەبووە و سەری بە ناو جێ نامەکاندا دەکرد، بۆ ئەو نامانە دەگەڕا کە پەیوەندی بەخۆیەوە هەبوو. هەر ئەو هاوکارە دووبارە بەدەنگی بەرزتر دەیگوت: " ئەهای، فورستیە. " دوای بانگەکەی ئەو، دەنگی چەند پێکەنینێکی ئەسپایی و پەنهانی دەهاتە گوێ.

کاتێ دوروا خەریک بوو بۆ ژوورەکەی سەرۆک دەچوو، ئەو کەسەی کە بە فورستیە بانگی کردبوو، ڕایدەگرت ودەیگوت: ئا، ببورە، مەبەستم تۆ بوو، دەمویست قسەت دەگەڵ بکەم. ببورە هەمووجارێ لێم تێکدەچێ و بەناوی شارلی نەگبەتەوە گازت دەکەم هۆیەکەشی ئەمەیە کە وتارەکانی تۆ زۆر لە نووسینەکانی ئەو دەچن. هەرکەسێ دەیانخوێنێتەوە دووچاری هەمان شوبهە دەبێت.

دوروا، هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە، بەڵام ژێراوژێر لە تووڕەییدا خۆی دەخواردەوە. ڕقێکی کوێرانەی لەو مەرحوومە هەڵدەگرت.

تەنانەت بابا ڤالترش، لە هەنبەر ئەم دیاردەیەدا، دیاردەی لێکچوونی زەقی شێوازو بۆچوون ولێکدانەوە

سیاسییەکانی لێکۆڵینڤانە تازەکە دەگەڵ نووسینەکانی نووسەری ڕەحمەتیدا، کە بووبوو بە داستانی سەرزاری هەموو کەسان، گوتبووی: " بەڵێ، هەر دەڵێی نووسین و ئینشای فورستیەیە، بەڵام فورستیەیەکی شارەزاتر وتووندتر وبە تواناتر. "

جارێکی دی کاتێ دوروا کومەدییە تایبەتیەکەی بیل بووکەکانی کردەوە چاوی بە بیل بووکەکەی فورستیە کەوت کە نەوارێکی ئاوریشمی ڕەش لە دەسکەکەیەوە پێچڕابوو، ئەوەبوو کە خۆی بەکاری دەبرد وەی ئەو دەورانە بوو کە لە ژێر چاودێری سن پوتین دا کاری دەکرد. بە نەوارێکی پەمەیی ڕازابووەوە. هەموویان لە سەر هەمان ڕەفە بەگوێرەی درێژی و کورتی ڕیزکرابوون، دەستنووسیکی بچووکی، وەکو ئەوانە کە لە مۆزەخانەکاندا لەبەردەم شتەکاندا دەنووسرێن، دادەنەن، لەبەر دەم بیل بووکەکاندا دانرابوو ولێی نووسرابوو: " مەجمووعەی فورستیە وشەریکەکەی و، فورستیە – دوروای ئێستا، بەبێ زەمانەتی دەوڵەتی. کاڵاین لە ئیستیهلاک نەهاتگ کە لە هەموو کاتێکدا، تەنانەت لە سەفەریشدا دەتوانرێ سوودی لێ ببینرێ. "

دەرکی کومەدییەکەی داخست و بە دەنگێکی بەرزی ئەوتۆ کە ئەوانی دیکەش گوێیان لێبێت گوتی: " خەڵکانی گەوج و حەسوود لە هەموو شوێنێ پەیدا دەبن وەهەن. "

لێ کبریا و غرووری بریندار بووبوو، غروور ودڵناسکی نووسەران، کە هەمیشە ئەم هەستیاری و توورەییە لەلای شاعیران و پەیامنێران، دەهاڕوژێنێ.

ئەم وشەی " فورستیە " پەردەی گوێیەکانی دەدڕی، لە بیستنی قەڵس دەبوو، دەترسا وهەرجارێ ئەو وشەیەی بەرگوێ دەکەوت سوور دەبووەوە.

ئەم ناوە بۆ ئەو جۆرە تەوس و توانجێکی تیابوو، تەنانەت لە تەوسیش زیاتری تیابوو، بەجۆرە بێڕێزی و سووکایەتیەکی تیابوو. ئەم وشەیە هاواری دەکرد: " ژنەکەت ئەم کارانەت بۆ ئەنجام دەدات، وەکو چۆن بۆ مێردەکەی پێشووشی ئەنجامی دەدا. تۆ بەبێ ئەو نەدەکەیە هیچ و نە بە هیچ کوێیەک دەگەیت. "

زۆرچاک دەیزانی و قەناعەتی تەواوی وابوو کە فورستیە بەبێ مادلین نەیدەکردە هیچ وپولێکی قەڵبی نەدەهێنا، ئەدی خۆی، ئەمیش هەر وەکو ئەو نەبوو!

وەختایەک بۆ ماڵەوەش دەگەڕایەوە، ئەم بیرە بەسوێیە دەستبەرداری نەدەبوو. سەرانسەری ماڵەکە، دۆستە کۆنەکەی وەبیر دێنایەوە، هەموو کەل وپەلەکان، هەموو توحەفیاتەکان، دەستی بۆ هەرشتێک دەبرد. لە سەرەتاوە بیری لەم شتانە نەدەکردەوە، بەڵام ئەوەی هاوکارەکانی دەستیان دابوویێ، زامێکی ئەوتۆی کردبووە روح ودەروونی، کە تنها هەر بابەت و هەرشتێکی بچووک و نادیاریش دەیکولاندەوەو ئازاری دەدا.

دەستی دەدایە هەرشتێک، یەکسەر دەستی شارل لەبەردەمیا بەرجەستە دەبوو، کە کاتی خۆی دەستی دابووێ. ئەو شتەی کە دەیبینی یان بەکاری دەبرد، هەمان ئەو شتانە بوون کە کاتی خۆی فورستیە، بەکاری دەبردن، شتانێک کە خۆی ( فورستیە ) بۆ خۆی کڕیبوونی، حەزی لێیان بووبوو. جۆرج، بەرەبەرە، تەنانەت بە پەیوەندی ژن

ومێردایەتی نێوان دۆستە کۆنەکەی و ژنەکەی ئێستای خۆی، قەڵس و توورە دەبوو.

هەندێجار، بەخۆیشی لەم هەڵچوون و هاڕوژانە دەروونیەی خۆی، کە هیچ سەری لێدەرنەدەکرد، سەری سوڕ دەما و لەخۆی دەپرسی: " شەیتان بە نەعلەت بێ ها، بۆچی ئەم بیر و هزرەم تێوڕوکاوە؟ من هەست بە هیچ حەسوودی و غیرەیەک لە دۆستەکانی مادلین ناکەم. لە هیچ کارێکی نیگەران نیم. ئازاد و سەربەست بە ئارەزووی خۆی بۆ هەرکوێیەکی بوێ دێت و دەڕوات، کەچی یادی ئەم شارلە گوندییە، خوام نایەڵێ، دەهریم دەکات! "

لە دڵی خۆیدا، لە سەر ئەو قسەیەی دەڕۆیی: " لەڕاستیا کەسێکی بێکارەو گەوج بوو، بێگومان ئەم مەسەلەیەیە کە بەم جۆرە ئازارم دەدات . ئەوەی کە توورەم دەکات، ئەمەیە کە بۆچی مادلین شووی بەم کەرە دێهاتیە کردبوو. "

هەمیشە بەخۆی دەگوت: " چۆنە کە ژنێکی وەکو مادلین، توانیویەتی بۆ تاقە یەک ساتیش تەحەمولی ئەم حەیوانە بێ ئەقڵە بکات؟ "

هەموو ڕۆژێ، دەگەڵ هەر ئاماژەیەکی بچووکا، چ لەلایەن مادلینەوە با، یان لەلایەن پێشخزمەتەکەوە با، یان لەلایەن کارەکەری ماڵەکەوە با، وەکو نەشتەر بەدڵیا ڕۆدەچوو و ڕق وکینەی توندتر و زیاتر دەبوو.

دوروا، کە حەزی لە خواردنی شیرینی بوو، شەوێک پرسی:

- ئەرێ چۆنە، هیچ میوەجات وشیرینەمەنیەکمان نییە؟ تۆ قەت ئەو شتانە نابەیتە سەر مێزەکە.

ژنەی گەنج بە ڕووخۆشییەوە بەرسڤی دایەوە:

- ڕاست دەکەیت، هەر لەبیرم نەبوو. ئاخر شارل حەزی لەوجۆرە خواردەمەنیانە نەدەکرد...

جۆرج، بە بێئەوەی بەدەستی خۆی بێ، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- دەزانی ئەم شارلە خەریکە بەرەبەرە ژیانم لێتاڵ دەکات. لە هەموو شوێنێ ناو ناوی شارلە. شارل حەزی لەمە بوو، حەزی لەوەبوو. نها کە شارل گۆڕ بەگۆڕ چووە، بەسە با وازی لێبێنین.

مادلین بێئەوەی سەر لەم توورە بوونە کوت وپڕەی ئەو دەربکات، مات وحەیران تەمەشای مێردەکەی دەکرد. پاشان، چونکە ژنێکی بەئاوەز و تیژفام بوو، کەم دابێژێک هەستی بەوەکرد کە چی لە دڵ و دەروونیا دەگوزەرێ، ئەم ژەهری غیرەو حەسوودییە سەبارەت بە کابرای مردوو، دەگەڵ بچووکترین شتا کە ئەوی وەبیر دێنایەوە کوشندەتر دەبوو.

هەڵبەتە ئەم هەستی حەسوودی وغیرەیەی بە حاڵەتێکی منداڵانە دەهاتە بەرچاو، بەڵام چونکە بەقازانجی خۆیی دەزانی، بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت.

جۆرج، چونکە نەیتوانی بوو توورەیی خۆی بخواتەوەو پەنهانی بکات زۆر لە دەستی خۆی ناڕازی بوو. بەڵێ ئەو شەوە پاش شێو چوون بۆ ژووری کارەکەیان، تا وەکو هەمیشە وتارەکەیان بنووسن. پاش ئەوەی لە پشت مێزەکەوە ڕۆنیشت داخی دڵی بە ژێرپایی ( ئەو تەختەیەی لە ژێر مێزەوە پێی دەخەنە سەر ) یەکە ڕشت و بەپێکەنینەوە پرسی:- شارل هەمیشە پێیەکانی دەرچین؟

مادلینیش، بە دەم خەندەوە بەرسڤی دایەوە:- ئا، هەمیشە ترسی لە پەسیڤ ( هەلامەت، پەسیو ) بوو؛ ئاخر سیپەلاکەکانی تەواو نەبوون، هەستیار بوون.

دوروا، بە توانجەوە گوتی: " بەڕاستی وابوو و بەکردەوەش سەلماندی. "

ئەوسا، بەوپەڕی ئەتەکێتەوە لە سەری ڕۆیی: " شوکر من وانیم. " و دەستی ژنەکەی ماچکرد.

لە کاتی خەوتندا چونکە ئەم بیر وخولیایە هەر دەستبەرداری نەدەبوو، دووبارە پرسی:

- شارل لە کاتی خەوتنا کلێتەیەکی لە سەر دەکرد تا گوێیەکانی سەرمایان نەبێت؟

مادلین، ئەم پرسیارەی ئەوی بە سوعبەتەوە وەرگرت و بەرسڤی دایەوە:

- نا، لەچکێکی لەسەر دەکرد و لە سەر هەنیەی گرێی دەدا.

جۆرج، شانەکانی هەڵتەکاند و بە ڕاوێژی حەقارەت ئامێزی پیاوێکی خۆپەسندەوە گوتی: - چ گەوجێ بوو!

لەوە بە دواوە، شارل بوو بە بابەتی هەموو قسە وباسێکی، بە هەموو بۆنەیەکەوە، ناوی ئەوی دێنایە ناو ناوان و بەسەر و سیمایەکی بەزەیی ئامێزەوە دەیگوت: ئەم شارلە بەلەنگازە.

کاتێ کە لە ڕۆژنامەکەوە بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، چونکە لەوێندەر یەک دوو جار بە ناوی فورستیەوە بانگیان کردبوو، ئیدی لە قەبرەکەشا وازی لێنەدەهێنا و هەزار ویەک نەفرەت وجنێوی بۆ دەنارد و بەمە تۆڵەی خۆی دەکردەوە.

ئیدی کێماسی و کورت بینی و بێ ئەقڵیەکانی دەژمارد و بەشۆخی و تەوس وتوانجەوە ئەم کێماسیانەی دەژمارد. شەرح و شرۆڤەی دەکردن، گەورەی دەکردنەوە، دەتگوت گەرەکیەتی لەبەر چاوی ژنەکەیدا وابنوێنێ کە دژبەری هەڤرکێکی ترسناک دەکات و دەیەوێ لەبەرچاوی ئەوی بخات.

هەمیشە دەیگوت ودەیگوتەوە:- ماد لە بیرتە ئەم فورستیە قەشمەڕ و فشەکەرە هەمیشە دەیگوت دەیەوێ پێمانی بسەلمێنێت کە پیاوانی قەڵەو بەهێزتر و بەتواناترن لە پیاوانی لەڕ ولاواز؟

پاشان، کەوتە مەراقی ئەوەی کە هەموو وردەکاری وتایبەتمەندیەکانی پەیوەندی ژن و مێردایەتی ڕابردووی ئەوان بزانێت، کە مادلین نارەحەت و نیگەران خۆی لە پرسیارەکانی ئەو دەدزییەوە، بەڵام ئەو پێداگری دەکرد، دەستبەردار نەدەبوو.

- یاڵلا، بەسە، بۆم باسبکە بزانم. لەو ساتانەدا سەر وسیمایەکی سەیری پەیدا دەکرد؟

مادلین بە نارەحەتی و لەبن لێوانەوە دەیگوت:- واز دێنی یان نا، واز لەو بێنە.

جۆرج، دووبارە دەیگوت:

- نا، بۆم باسبکە! ڕاستە گوایە ئەم حەیوانە لە ناو جێگاشدا، کابرایەکی دەست وپێ سپی بووە، هیچی پێ نەبووە؟

هەمیشە، بەم جنێوە دەی بڕییەوە:- چ دێهاتیەکی کەر بووە.

شەوێک، ئاخر وئۆخری هەیڤی حوزەیران بوو. لە کاتێکا لەبەر پەنجەرە وازەکەدا وەستابوو وجگەرەی دەکێشا، گەرمای شەوێ خستیە سەر خولیای گەشت وگەڕان. پرسی:- ئەرێ مادە گیانەکەم، دەڵێی چی بڕۆین بۆ بێشەکە و بای باڵێک بدەین و سڕپییەکی پێمان دەربکەین؟

- چاکە، با بڕۆین.

گالیسکەیەکیان بەکرێ گرت، سەرەتا بە شەقامی شانزیلیزێدا کەوتنەڕێ و پاشان چوونە سەر شەقامی بوار وبولونی. دنیا کپ و مات، سروەیەک چییە، لە هیچ لایەکەوە نەدەهات. یەکێک بوو لەو شەوە گەرم ونمسارانەی کە هەوای گەرمی پاریس، وەکو بوخاری کوورە دەچێتە سیپەلاکەکانی بەشەرەوە. گالیسکانێکی زۆر خێڵی عاشقانیان بەژێر دار ودرەختەکاند دەگیرا. گالیسکەکان بەڕیز دەجوولان.

جۆرج و مادلین، بە دیتنی دیمەنی دەست لە ملانێی ئەو جووتانەی ناو گالیسکەکان، ژنان بە جلکی کاڵی تەنک و پیاوان بە جلکی تۆخەوە، زۆر خۆشحاڵ دەبوون، ئاپۆڕایەکی زۆری عاشقان، بە ژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرە وگەرمی پاریسدا بەرەو بێشە و جەنگەڵەکە دەڕۆیشتن. جگە لە دەنگی چەرخی گالیسکەکان بە سەر ئەرزەکەوە هیچ دەنگێکی دی نەدەهات. جووتەکان لە نێو هەر گالیسکەیەکدا کە ڕەتدەبوو، دوو بە دوو،لەسەر کورسییەکەی شانیان دادابوو وخامۆش ونوقمی هەواو هەوەس وبەدەم چاوەڕوانی جووتبوونێکی نزیکەوە، خۆیان لێکدی هەڵدەسوو. هەوای گەرم وتاریک دەتگوت لە ماچا پاراو بووبوو، هەستی نازو نوزو نەوازش وشەهوەتو ئارەزووی

حەیوانی پەراگەندە، هەواکەی قورستر دەکردو دەیهارپوژاند، هەموو ئەم خەڵکە هاوهەمێزە، سەرمەستی ئارەزوو وغەریزە، حاڵەتێکی پڕ جۆش وخرۆشیان بە دەورو بەری خۆدا بڵاو دەکردەوە. هەموو ئەم گالیسکە عەشق هەڵگرانە، کە دەتگوت نەوازشیان لێوە هەڵدەقوڵێت، شنەیەکی هەوەس وروژێنیان بە هەواکەدا دەکرد.

جۆرج ومادلینش هەستیانکرد ئەم ئاشقێنییە گیرۆیە خەریکە تووشی ئەوانیش دەبێت. بێئەوەی هیچ قسەیەک بکەن بە نەرمی دەستی یەکدییان گرت، بەڵام بەسەدەمی گەرمی وقورسی هەواکەو ئەو هەڵچوونە دەروونییەی دەیهارپوژاندن، کەمێک پەشێو حاڵ بوون.

وەختایەک گەیینە پێچی ئەو شەقامەی کە بەبەردەم مەرەرێزەکانی پاریسدا ڕەت دەبوو، یەکدییان ماچکرد و مادلین بە سووکە شەرمێکەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:- دەزانی سەبارەت بە سەفەرەکەی روئانمان، کارێکی منداڵانەمان کرد.

شەپۆلی گەورەی گالیسکەکان لە بەر دەروازەی چوونە ژوورەوەی بێشەکە، مەسافەیان وەرگرت، لەو شەقامەدا کە بۆ دەریاچەکان دەڕۆیی و گالیسکەکەی جۆرج و مادلین خۆی پێدا کردبوو، گالیسکەکان زیاتر لێکدی هاوێر بوون، بەڵام تاریکی شەوانەی بێشەکە، هەوای نمداری دەوروبەری لق وپۆی درەختان، شێی جۆبارەکان کە بە خورەخوڕ بە ژێر درەختەکاندا دەڕۆیی وئەو فێنکییەی کە لە ئاسمانی ساف وپڕ ئەستێرەوە دادەڕژا، جوانییەکی قوڵتر و پڕ ڕازتری، بە ڕامووسانی ئاشقانی نەسرەوت دەدا.

جۆرج، لە کاتێکا کە ژنەکەی بە خۆیەوە دەگوشی گوتی: ئاە، مادە چکۆلە جوانەکەم.

مادلین گوتی:- لە بیرتە جەنگەڵ و بێشەکەی نزیکی ماڵەکەی باوک ودایکت چەند شووم وخەمناک بوو؟ وام دەهاتە خەیاڵ پڕە لە گیانلەبەرانی هۆڤی ولە بڕانەوە نایەن. کەچی ئێرە زۆر جوان و دڵگیرە، ئینسان هەست بە نەوازشی شنەی بایەکە دەکات و ئەمەش دەزانم کە سیڤەر لەوبەری بێشەکەیە.

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- لە بێشەکەی نزیک ماڵی داک و بابمدا، جگە لە ئاسک و ڕێوی، حەیوانە کێوی و بەراز هیچی دیکە نییە و هەندێجاریش لێرە ولەوێ کوختە و لانەی جەنگەڵوانێک بەدی دەکرێ. ( فورستیە: لە زماندا بە مانای جەنگەڵوان دێ، کە وەکو ناوی تایبەتی بۆ مێردەکەی پێشووی مادلین، بەکار هاتووە ).

ئەم وشەیە، ئەم ناوەی دۆستە مردووەکەی کە بەڕێکەوت لە زاری دەرچووبوو، حەپەساندی، دەتگوت یەکێک لەوپەڕی لێرە چڕە دارستانەکەوە ئەو وشەیەی بەگوێیدا دابوو. لە ناکاوا بێدەنگ بوو، ناڕەحەتیەکی سەیر دایگرت. ناڕەحەتیەکی زادەی حەسوودی و غیرەیەکی پڕ ئازار ولەبن نەهاتوو کە ماوەیەک بوو ژیانی لێ تاڵ کردبوو، حەوانەوەی لە بەر بڕی بوو.

دوای هەڵوەستەیەکی مەیلەودرێژ پرسی:- ئەرێ قەت ڕێکەوتبوو، هەندێک شەو بەم شێوەیە لەگەڵ شارل دا بۆ ئێرە بێی؟

مادلین بەرسڤی دایەوە:- ئا، زۆرجار.

لە ناکاوا هەستیکرد، حەزدەکات یەکسەر بۆماڵ بگەڕێتەوە، حەزێکی تووڕە کە دڵی دەگوشی. بەڵام وێنەی فورستیە، زەینی داگرتبوو و دەستبەرداری نەدەبوو، تێی ئاڵابوو. نەیدەتوانی جگە لەو بیر لە هیچ کەسێکی دی بکاتەوەو جگە لەو باسی کەسی دی بکات.

بە ڕاوێژێکی ناجوامێرانە پرسی:- ماد، دەلێم؟

- دەڵێی چی ئازیزم؟

- قەت ڕێکەوتووە کڵاوی قوڕمساغی بکەیتە سەر شارلی داماو؟

مادلین، بە ڕاوێژێکی نیگەرانی ئامێزەوە ولەبن لێوانەوە گوتی:- تۆ بەم قسانە بەڕاستی خۆت گەوج دەکەی.

بەڵام جۆرج، دەستبەرداری ئەو بیرکردنەوەیەی خۆی نەدەبوو.

- مادە چکۆلەکەم، ڕاستەو ڕاست پێم بڵێ، ئیعتراف بکە، خیانەتت لێکردووە یان نا؟ ئیعتراف بکە کە فریوت داوە. مادلین، بێدەنگ بوو، وەکو هەر ژنێک ئەو قسەیەی لەبەر گران بوو. جۆرج دووبارە، بەڕژدییەوە گوتی:

- بەڕاستی کڵاوی قوڕمساغی هەر لە خۆی دەهات. ئا، بەڵێ، بەڵێ. بۆیە ئەگەر ببیستمەوە فورستیە قوڕمساغ بووە، زۆر خۆشحاڵ دەبم. ئاە، چەند بەشەرێکی گێل و گەمژە بوو!

هەستی کرد ژنەکەی خەریکە بزەی دێتێ، ڕەنگە شتێکی بیر کەوتبێتەوە، بۆیە هەمدیس لە سەری ڕۆیی:

- ئێ، دەبیلێ، چی تیایە؟ بە پێچەوانەوە ئەگەر ئیعتراف بکەی کە ئەوت فریوداوە، زۆرم پێخۆش دەبێت، بەتایبەتی ئەگەر ئیعتراف بۆ من بکەی.

لە ڕاستیا، ئەمەی لێ بووبوو بە مەراق کە بزانێ ئەم شارلە، ئەم شارلە چەپەل و نەگریسە، ئەم مردووە نەفرەتیە، داغمەی ئەم نەنگەی بە تەوێڵەوە نرابوو یان نا. وێڕای ئەمەش، خولیایەکی دیکە، خولیایەکی نەنگینتر و حەیابەرەتر، هانی دەدا ئەم بابەتە بزانێ.

دیسان دووبارەی کردەوە:- ماد، مادە چکۆلە ئازیزەکەم، تکا دەکەم بیڵێ. ئەو کابرایە لەوانەبوو کە شایستەی ئەو لەکە و پەڵەیە بێ، ئەگەر ئەوەت دەرهەقی نەکردبێ، بەڕاستی غەڵەتت کردووە. دەی گیانەکەم، ئیعتراف بۆ من بکە... بە من بڵێ..

ئەم مکووڕ بوونەی ئەو لە حاڵی حازردا بێگومان بەلای مادلینەوە مایەی پێکەنین بوو، چونکە پێدەکەنی، پێکەنینی کورت و پچڕپچڕ.

دەمی لە پەناگوێی ژنەکەی نابوو:- دەی گیانەکەم... قسە بکە... ئیعتراف بکە.

مادلین، بە حەرەکەتێکی زبر لێی دوور کەوتەوەو لە ناکاوا گوتی:- کە بەشەرێکی سائەقڵی، ئاخر ئەم قسانە قسەی کردنن؟

ئەم قسەیەی بە ڕاوێژێکی هێندە سەیر کردبوو، کە تەزوویەکی سارد بە سەراپای جۆرجدا هات، سەرگەردان و هەناسەسوار لەجێی خۆی وشک بوو، دەتگوت جەزرەبەیەکی دەروونی وێکەوتبوو.

گالیسکەکە نها بە کەناری دەریاچەکەدا دەڕۆیی، ئاسمان ئەستێرەباران بوو. تارمایی دوو قوو لە تاریکیەکەدا، بە ئاستەم دەبینرا کە بە کاوەخۆ لە ئاوەکەدا مەلەیان دەکرد.

جۆرج بە دەنگی بەرز بە گالیسکەچییەکەی گوت:- با بگەڕێینەوە.

گالیسکەکە گەڕایەوە، تەنها ڕووبەڕووی ئەو گالسیکانە دەڕۆیی کە بە خاوی لەبەرانبەرەوە دەهاتن و چراکانیان وەکو چاوانی درشت، لە تاریکی لێرەوارەکەدا دەدرەوشانەوە.

ژنەکەی ئەم قسەیەی بە چ ڕاوێژێکی سەیرەوە ئەدا کردبوو. لە خۆی دەپرسی: " باشە ئەمە ئیعتراف بوو؟ " دڵنیابوونی لەوەی کە گوایە خیانەتی لە مێردی پێشووی کردووە، خەریک بوو لە تووڕەییدا دەی خنکاند. پڕ بە دڵ حەزیدەکرد دارکاری بکات، دەست بنێتە بینی و بیخنکێنێ، قژی دەسکەنە بکات.

ئاە، ئەگەر وەڵامی داباوە، دەیگوت: " بەڵام گیانەکەم، ئەگەر مەبەستم بوایە خیانەتی لێبکەم، بێگومان لەگەڵ تۆدا دەمکرد. "

چەند ئەوی ماچ دەکرد، بەخۆوەی دەگوشی، زیاتر خۆشی دەویست.

دەست بە سینگ، بێجووڵە لە جێی خۆی دانیشتبوو و تەمەشای ئاسمانی دەکرد، زەینی هێشتا لەوە پەشێوتر بوو کە بتوانێ بیربکاتەوە.

هەستیدەکرد، کینە لە دڵییەوە هەڵدەقوڵێت و تووڕەییەک کە لە هەنبەر هەوەسێن ژنانە لە بوونی هەر پیاوێکا گڕ دەسەنێ، سات بە سات پتر کڵپە دەسەنێت. بۆ یەکەمینجار، هەستی بە نیگەرانی پیاوێک کرد، کە لە ژنەکەی خۆی بەگومان بێ! پێش هەموو شتێک کابرایەکی حەسوود بوو، حەسوود سەبارەت بەم پیاوە مردووە، سەبارەت بە

هەرشتێک کە پەیوەندی بە فورستیەوە هەبوو! غیرە وحەسوودییەکی سەیر وبەسوێ، کە تەنها ڕق و نەفرەت لە مادلینیشی، ئاوێتە دەبوو. باشە ئەگەر خیانەتی لە مێردەکەی پێشووی کردبێت، ئەم چۆن دەیتوانی متمانەی پێبکات؟

ئەوسا بەرەبەرە، سووکە ئارامییەک دەروونی گرتەوە، بێگوێدان بەو ناڕەحەتیەی چەشتبووی، بەخۆی گوت: " ژنان هەموو قەحپەن، دەبێ لە گەڵیاندا ڕابوێری و هیچ فیداکارییەکیان بۆ نەکەی. "

غەمگینی دڵی، لە شێوەی وشەێن پڕ نەفرەت وبێزاریدا گەییە سەرلێوی. بەڵای ڕێگەی نەدان بێنە دەرکاندن. هەمیشە لە دڵی خۆیدا دەیگوت ودەیگوتەوە: " دنیا هی خەڵکی بەتوانایە. دەبێ بەتوانا بی، دەبێ لە سەرووی هەموو شتێکەوە بی. "

گالیسکەکە تەنها خێراتر دەڕۆیی. دووبارە بە بەر مەتەریزەکاندا تێپەڕی. دوروا، لە بەردەم خۆیەوەو بە ئاسمانەوە ڕۆشناییەکی ئامال سووری دەبینی، لە ڕۆشنایی کوورەیەکی زەبەلاح دەچوو، هەراوهەنگامە و ژاوەژاوێکی تێکەڵ وپێکەڵی دەهاتەگوێ، هەرا وهەنگامەیەکی گەورە، بەردەوام، پێکهاتبوو لە دەنگێن جیاواز، هەمهەمەی گۆنگ، نزیک، دوور، ترپە وخورپەی گەورە و گۆنگی ژیان، پاریس، بەخۆی لەم شەوەی هاوینەدا، وەکو دێوێکی شەکەت و ماندوو، هەناسەی هەڵدەکێشا.

جۆرج بەخۆی دەگوت: " زۆر کەرم ئەگەر بمەوێ خۆم ناڕەحەت بکەم. هەرکەسە بۆخۆی، سەرکەوتن بۆ کەسانی ئازا وبوێرە. هەموو شتێک جگە لە خۆپەرستی هیچی دی

نییە. خۆپەرستی لە پێناوی ناوبانگ و سەروەتدا، گرنگترە لە خۆپەرستی لە پێناوی ژن و عەشق وڕابواردن دا. "

تاقی سەرکەوتنی ئەتوال، لە بەر دەروازەی چوونە ناوشار، لە سەر دووپایەی زەبەلاحی دێو ئاسادا وەستابوو، جۆرە دێوێکی بێڕەزا، کە لە تۆ وایە ئامادەیە بکەوێتە جووڵە و شەقامە پانەکەی بەرانبەری پێشێل بکات.

جۆرج ومادلین، لە ڕیزی ئەو گالیسکانەدا بوون کە جووتە خامۆش و دەست لە هەمێزەکانیان بۆماڵی خۆیان و جێگەی دڵخوازی خۆیان دەبردەوە. وا دەهاتەبەرچاو کە هەموو دنیا غەرقی شادی، لەزەت وخۆشبەختی، بەلای ئەواندا تێدەپەڕێ.

مادلین، کە تا ئەندازەیەک حاڵی بووبوو، کە مێردەکەی چی لە دڵدایە، بەڕاوێژێکی نەرم پرسی:

- بیر لەچی دەکەیەوە ئازیزم؟ نیو سەعاتێک دەبێ کە تاقە وشەیەکت لە زار دەرنەچووە.

جۆرج بە تەوسەوە بەرسڤی دایەوە:

- بیر لەم هەموو گەوجانە دەکەمەوە کەیەکدی ماچ دەکەن و بەخۆم دەڵێم لە ژیاندا، جگە لەمە، کارێن دیکەش هەن کە بکرێن.

مادلین لەبن لێوانەوە گوتی:- دروستە... بەڵام ئەم کارەش جارجار پێویستە.

- پێویستە... پێویستە... هەڵبەتە کاتێ پێویستە ئەگەر بەشەر کارێکی باشتری نەبێ بیکات.

بیرکردنەوەی جۆرج، دەگەڵ داماڵینی ژیان لە شەقڵە ڕۆمانتیکیەکەی، دەگەڵ تووڕەیی و ڕقێکی کەچ بیرانەدا لە شەڕی دەستەویەخەدا بوو: " زۆر کەرم ئەگەر خۆم ئەزیەت

بدەم، خۆم لە هەموو شتێک مەحرووم بکەم، خۆم نیگەران ونارەحەت بکەم، خۆم ئازار بدەم وروحم دووچاری ڕەنج بکەم، وەکو ئەوەی کە ماوەیەکە خەریکە ئەمە دەکەم. " وێنە وتارمایی فورستیە، بە زەینیدا تێپەڕی بێئەوەی کەمترین ڕقی هەستێنێ. وای هاتە خەیاڵ ئاشت بوونەتەوە، دووبارە بوونەتەوە بەدۆست، حەزیدەکرد ڕوو لەو هاواربکات: " شەوباش، هاوڕێ. "

مادلین کە لەم بێدەنگییە قەڵس بوو، پرسی:

- چۆنە بەر لەوەی بۆ ماڵ بچینەوە، بڕۆین لە کافەی تورتونی، مۆتەیە شتێ بخۆین.

جۆرج، بە تیلەی چاو تەمەشایەکی کرد. روخساری ناسک و قژە زێڕینەکەی لەبەر ڕۆشنایی ئەو چرا غازیانەی کە لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی کافەیەکی ساز و زەربیدا هەڵکرابوون، دەدرەوشایەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: " چەند خشکۆکە، باشتر، خەڵکانی بە تواناتر شایستەی پارووی چەورتر ونەرمترن، هاوڕێ. بەڵام ئەگەر هەوای جەمسەری باکوور گەرم ببێت، منیش لە ئێستا بە دواوە لەبەر خاتری تۆ خۆم دەڕەنجێنم. " ئەوسا وەڵامی ژنەکەی دایەوەو گوتی: " هەڵبەتە ئازیزم "، بۆ ئەوەی پەی بەڕازی دەروونی نەبات، ماچی کرد.

مادلین، وای هات بە خەیاڵدا، کە لێوەکانی مێردەکەی، لە کاتی ماچکردنی ئەمدا، چایی بوون.

وێڕای ئەمەش، جۆرج هەمان بزەی هەمیشەیی بەسەر لێوانەوە بوو، و بۆ ئەوەی یارمەتی ژنەکەی بدات لە گالیسکەکە دابەزێت، لە بەر قاڵدرمەکانی بەردەرگای کافەکەدا دەستی ژنەکەی گرت.

دوروا، سبەی بەیانی کە خۆی کرد بە بارەگای ڕۆژنامەکەدا چووە تاقیبی بوارنار، پێی گوت: دۆستی ئازیز، دەمەوێ کارێکم بۆ بکەیت. هەندێ کەس پێیان خۆشە بە فورستیە بانگم بکەن، بەڵام من خەریکە بەرەبەرە بەمە پەست دەبم. دەتوانی ئەو پیاوەتیەم لەگەڵ بکەی و بەهاوکارەکان بڵێی، ئەگەر لەمەودوا هەرکەسێک ڕێگەی بەخۆی بدات و ئەو سوعبەتەم لەگەڵدا بکات، دەکێشم بەدەمیا. ئیدی عوباڵیان بە ئەستۆی خۆیان، ئیدی دەبێ خۆیان بیر لەوە بکەنەوە کە ئەم شۆخییە دوئێلێ دێنێ یان نا. بۆیەش هاتم بۆلای تۆ چونکە ئینسانێکی ئارام و سەنگینی و لە بەزمەکەی پێشوودا یەکێک بووی لە شایەدەکانم.

بوارنار، ئەم ماموریەتەی پەسند کرد.

دوروا، بۆ شت کڕین لە ئۆفیسی ڕۆژنامەکە وەدەرکەوت و دوای یەک سەعات کە گەڕایەوە، ئیدی هیچ کەسێک بە فورستیە گازی نەکرد. وەختایەک بۆ ماڵ گەڕایەوە، دەنگی ژنانە لە هۆڵەکەوە دەهات. لە پێشخزمەتەکەی پرسی:- کێ هاتووە؟

پێشخزمەتەکە بەرسڤی دایەوە:- خانم ڤالتر وخانم دوماریل.

لێدانی دڵی کەمێک خێرابوو، ئەوسا بەخۆی گوت:- باشە، چ قەیدییە و، دەرگای هۆڵەکەی کردەوە.

کلوتیلد، لە تەنیشت موغەیرییەکەوە. لەو شوێنەدا کە تیشکی هەتاو لە پەنجەرەکەوە لە ژوورەوەی دەدا، وەستابوو. جۆرج وای هاتە بەرچاو کە کلوتیلد بە دیتنی ئەو

کەمێک ڕەنگی تێکچوو. هەوەڵجار خێرهاتنی خانم ڤالتر وهەردوو کیژەکەی کرد کە وەکو دوو نیگابان لەم لاو لەولایەوە ڕۆنیشتبوون. پاشان چوو بەلای کۆنە ماشقەکەیەوە. ژنەی گەنج دەستی هێنایە پێشێ و جورج بە نیازێکی تایبەتیەوە تەوقەی دەگەڵ کرد و دەستی گوشی. دەتگوت دەیەوێ پێی بڵێت: " هێشتا هەر خۆشم دەوێی. " کلوتیلدش، بە هەمان نیاز ومەبەست دەستی ئەوی گوشی.

دوروا پرسی:- دوای ئەم قەڕنە دابڕانە، حاڵت چۆن بوو، باش بووی؟

کلوتیلد، بە کەماڵی ئاسوودەیی بەرسڤی دایەوە:- هەڵبەتە، ئەدی تۆ بیل ئامی؟

ئەوسا ڕوویکردە مادلین و لە سەر قسەکەی ڕۆیی:- ڕێگە دەدەی هەربە بیل ئامی گازی بکەم؟

- هەڵبەتە، گیانەکەم، هەرشتێکی دیکەشت گەرەک بێ، ڕێگەت دەدەم. لە وەڵامەکەی مادلین دا، هەست بە سێبەری تەنزێک دەکرا.

خانم ڤالتر، باسی پێشبڕکێیەکی شمشێربازی و دەعوەت و زیافەتێکی دەکرد کە جاک ریڤال دەیویست لە ماڵە بێ کەیبانووەکەی خۆیدا بەرپای بکات، زیافەتێک کە قەراربوو هەموو خانمانی مەجلیس ئارا بەشداری تیابکەن. ئەوسا لە سەری ڕۆیی:

- زۆر خۆش دەبێت. لێ مخابن من کەسم نییە بۆ ئەو کۆڕەم بەرێ، چونکە مێردەکەم لەوکاتەدا لە پاریس نابێت.

دوروا، یەکسەر پێشنیازی کرد، ئەو بۆ ئەو کۆڕە ببات. خانم ڤالترش قەبووڵی کرد وگوتی: من و کیژەکانم مەمنوونیشت دەبین.

جۆرج، تەمەشایەکی کیژە چکۆلەکەی ڤالتری کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: " ئەم سۆزانیە چکۆلەیە نەک هەر خراپ نییە، بەڵکو زۆریش باشە. " شەکڵ و شێوەی بووکەڵەیەکی شەرمن و دڵناسکی هەبوو. بەژنی زۆر کورت، ناوقەدی باریک، سینگ وبەرۆکی مینیاتوری، چاوانی مینایی، شینی – کەوەیی دەتگوت بە فلچە کێشراوە، پێستی زۆر سپی، زۆر ساف و یەک دەست، هیچ خاڵ یان ڕەنگێکی پێوە نەبوو، قژەکەی تێکڕژاو، لوول، وەکو مێرگێک یەکدەست، سووک، وەکو هەورێکی دڵگیر، لە ڕاستیا لە قژی ئەو بووکەڵە جوان و گرانبەهایانە دەچوو کە ئینسان بە باوەشی کچۆلانەوە دەیان بینێ وهەندێجار لە خودی کچۆڵەکانیش گەورەترن.

خوشکە گەورەکەی، زۆر، ناشیرین بوو، پانکۆڵە، بێ حاڵ، نەدەچووە دڵی کەسەوە، لەو کیژانە بوو کە کەس نە مجامەلەیان دەکەن و نە هیچ شتێکیان دەربارە دەڵێن.

دایکیان لە جێی خۆی هەستا، ڕویکردە جۆرج و گوتی:

– کەواتە، پێنج شەممەی ئاینده، سەعات دووی دوا نیوەڕۆ.

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:– دڵنیابە خانم، خەمت نەبێ.

هەرکە خانم ڤالتر وکیژەکانی ڕۆیشتن، خانم دوماریلیش هەستاو وتی:– بە هیوای دیدار، بیل ئامی.

ئەمجارەیان ئەو، دەستی جۆرجی بە گەرمی و تاماوەیەکی زۆر گوشی. جۆرج هەستیکرد ئەم ئیعترافە بێدەنگ و پەنهانە، تەواو پەرێشانی کرد، هەستی بە جازیبەیەکی هەوەسامێز، سەبارەت بەم ژنە بورژوازییە ئەندام وردیلەیە کرد، ژنێکی قەرەج ئاسا و روح سووک و دڵگیر، کە پێدەچوو بە ڕاستی ئەوی خۆشبوێ.

لە دڵی خۆیدا گوتی: سبەی دەرۆم سەرێکی دەدەم.

هەرکە بە تەنێ دەگەڵ ژنەکەیدا مایەوە، مادلین لە قاقای پێکەنینی دا، پێکەنینێکی شاد و بێپەروا. ئەوسا، لە کاتێکا ڕاستەوخۆ چاوی لە دوڕ چاوانی ئەو بڕی بوو، گوتی:

- دەزانی چ ئاشوبێکت لە دڵی ئەم خانم ڤالترەدا بەرپا کردووە؟

جۆرج بە نەباوەڕییەوە گوتی:- بڕۆ بابە، ڕادەبوێری؟

- نە، باوەڕ بکە، بە شەوق وزەوقێکی شێتانەوە، دەربارەی تۆ قسەی دەگەڵ مندا دەکرد، لەو نەدەوەشایەوە. حەزیدەکرد مێردانی وەکو تۆ بۆ کیژەکانی بدۆزێتەوە!... خۆشبەختانە کە ئەم مەسەلانە بۆ ئەو گرینگ نییە.

سەری لە مەبەستی ژنەکەی دەرنەدەکرد. پرسی:- یانی چی، گرینگ نییە. مادلین، بە دڵنیایی ژنێکەوە کە گومانی لە داوەرییەکەی خۆی نەبێ گوتی:

- دەزانی خانم ڤالتر، لەو ژنانەیە کە هیچ پیاوێک قەت تاقە وشەیەکی عاشقانەی بە گوێیدا نەداوە، لە هەموو ڕوویەکەوە کەسێکی پۆلایینە. مێردەکەی، کە تۆش وەکو من دەیناسی. بەڵام ئەو لە قوماشێکی دیکەیە. لەلایەکەوە زۆری پێناخۆش بووە کە شووی بە پیاوێکی جوولەکە کردووە، بەڵام هەمیشە وەفاداری پیاوەکەی بووە. ژنێکی نەجیبە.

جۆرج، بە حیرەتەوە گوتی:- وامدەزانی ئەمیش جوولەکەیە.

- ئەم؟ بە هیچ جۆرێ. سەرپەرشتیاری هەموو کاروبارە خێرخوازیەکانی ئەنجوومەنی ئاینی مادلینە. تەنانەت زەماوەندەکەشی بەگوێرەی ڕێ و ڕەسمی کاتۆلیکی بووە. نەشمزانیوە ڤالتر هەر بە درۆوە و بە ڕواڵەت بووبێ بە مەسیحی، یان قەشەکە چاوپۆشی لەو مەسەلەیە کردبێ.

جۆرج لەبن لێوانەوە گوتی:- بڵێ... ئاوها... کەواتە منی زۆر بەدڵە؟

- هەڵبەتە. ئەگەر تۆ زەماوەندت لەگەڵ منا نەکردبا، پێشنیازم دەکرد، کە خوازگاری سوزانی کچە بچووکی بکەیت، مەگەر ئەو لە روزی خوشکی جوانتر نییە؟

جۆرج بە دەم سمێڵ بادانەوە بەرسڤی دایەوە:- دایکیشی خراپ نییە.

مادلین، بە نارەحەتی گوتی:

- دەزانی گیانەکەم، تەمەنای دایکەکەشت بۆ دەکەم، بەڵام ترسم لەو نییە. لێی ناترسم، هیچ ژنێک لەم تەمەنەدا، یەکەم هەڵەی خۆی ناکات. دەبێ زووتر بیر لەو شتانە بکاتەوە. جۆرج لە دڵی خۆیدا گوتی: " دەزانی ئەگەر بمتوانیبا لەگەڵ سوزاندا زەماوەند بکەم، چەند باش دەبوو..." ئەوسا شانەکانی هەڵتەکاندن: " پیف، دەڵێی شێت بووم، چما بابی شتی وا قەبووڵ دەکات؟ "

وێڕای ئەمەش، بەڵێنی بە خۆی دا، لەمە بەدواوە، زیاتر چاودێری رەفتاری خانم ڤالتر، سەبارەت بە خۆی ( جۆرج ) بکات، بێئەوەی لە خۆی بپرسێت ئایا دەتوانێ لەم رێگەیەوە هەندێک ئیمتیازان بەدەست بێنێت یان نا. ئەو شەوە، یادگارییە عەشقیەکانی دەگەڵ کلوتیلدا، بیرەوەریە مەحەبەت ئامێزو لەزەتخوازییەکانی، دەستبەرداری نەبوو. بیری کارە خۆشەکان، میهرەبانییەکان وگەشت وگوزارەکانیانی وەبیرکەوتنەوە. بەردەوام بە خۆی دەگوت: " ئەلهەقی ژنێکی میهرەبانە. بەڵێ، سبەی دەچمە دیدەنی. "

سبەینێ، دوای فراڤین چوو بۆ کوچەی ورنوی. هەمان کارەکەر دەرگای لێڤەکرد وبەشێوازێکی خۆمانی تایبەت بە

کارەکەرانی خانەوادەێن نیمچە دەوڵەمەند گوتی:- حاڵتان باشە ئاغا؟

جۆرج وەڵامی دایەوە:- بژی، کچەکەم.

خۆی بەهۆڵەکەدا کرد، هەمان ئەو شوێنەی کە دەستانی ناشی پیانۆیان تیادا لێدەدا. لورین بوو. جۆرج وای وێنا دەکرد نها دێت و خۆی لە باوەشی داوێت. لێ کیژۆڵەی گۆرین بە ویقارەوە لە جێی خۆی ڕابوو، وەکو خەڵکانی گەورە سڵا و ئەحواڵ پرسییەکی تەشریفاتی دەگەلیا کرد و چووە دەرەوە.

دەتگوت ژنێکی تەوهین کراوە، جۆرج واقی ورما. دوای کەمێک دایکی هات. جۆرج، دەستەکانی گرتن و ماچی کردن و گوتی:- چەندم بیر دەکردیت.

- منیش هەروەها.

لە تەنیشت یەکەوە ڕۆنیشتن. بە ڕووی یەکەوە گرژینەوە، چاویان لە دوڕ چاوی یەکدی بڕی بوو و پڕ بەدڵ حەزیان دەکرد یەکدی ڕامووسن.

- کلو گیانەکەم، خۆشم دەوێی.

- ئاه، منیش هەروەها

- یانی لەم حاڵەدا... لەم حاڵەدا... زۆر لێم زویر نیت؟

- با و، نا. زۆر زیز و ناڕەحەت بووم، بەڵام کە پاشان لە هۆی ئەم کارەت حاڵی بووم، لە دڵی خۆما گوتم: "قەیدی نییە، ئاقیبەت ڕۆژێ لە ڕۆژان دووبارە بۆ باوەشی من دەگەڕێتەوە."

- زاتم نەدەکرد بگەڕێمەوە، لە خۆم دەپرسی ئاخۆ چۆن بەرخوردم دەگەڵ دەکەیت. نەدەوێرام، بەڵام لە کانگای دڵەوە حەزم دەکرد بێم بۆلات. ئەرێ لورین بۆچی ئاوا

لەگەڵما سارد بوو، تەنانەت ڕۆژباشیشی لێنەکردم و بە تووڕەیی لێرە چووە دەرێ.

- نازانم. لێ لەوەتای زەماوەندت کردووە، یەک قسەی دەربارەی تۆ لە گەڵدا ناکرێ. پێموایە غیرە دەکات.

- نە بابە!

- بۆ نا گیانە. نها بە بیل ئامی ناوت نابا، پێت دەڵێت ئاغای فورستیە.

جۆرج سوور بووەوە وپاشان لە کلوتیلد نزیک بووەوە:- کوا ڕاموسانێک بدە من.

کلوتیلد، ڕێگەی دا کە ماچی بکات.

جۆرج پرسی:- دەتوانین لە کوێ یەکدی بدینین؟

- مەعلوومە، لە هەمان خانووی شەقامی کونستانتینوپل.

- ئاه!... یانی ئەو ئەپارتمانە هێشتا نەدراوە بەکرێ؟

- نا، بۆ خۆمم داناوە.

- بۆ خۆتت داناوە؟

- بەڵێ، قەناعەتم وابوو، جارەکی دی سەری ئەوێندەر دەدەیەوە.

شەپۆلێکی خۆشحاڵی غروورئامێز، ئۆخژنی خستە دڵ و دەروونی. کەواتە ئەم ژنە ئەوی خۆشدەوێ، خۆشەویستیەکی ڕاستەقینە، هەمیشەیی، قووڵ.

بە ئەسپایی گوتی: " دەتپەرستم. " ئەوسا پرسی: مێردەکەت چۆنە، حاڵی باشە؟

- بەڵێ، زۆرباشە. مانگێک لێرە بوو و پێرێ دووبارە بە ماموریەت ڕۆیشتەوە.

دوروا، نەیتوانی جڵەوی پێکەنینەکەی خۆی بگرێت:- چ ڕێکەوتێکی باشە!

کلوتیلد، سادە دڵانە گوتی:- بەڵێ، بەڕاستی ڕێکەوتێکی باشە. بەڵام دەزانی ئەگەر لە پاریسش بێ، هیچ کێشەیەک دروست ناکات.

- ڕاستە. وێڕای هەموو ئەمانەش پیاوێکی روح سووک و خۆشەویستە.

- ئەدی تۆ لە چدای؟ لە گەڵ ژیانی تازەتا چۆنی؟

- نیوداشتم، نە باش و نە خراپ. ژنەکەم هاوڕێمە، شەریکمە

- هەرئەوەندە؟

- هەرئەوەندە... بەڵام لە مەسەلە سۆزدارییەکانا...

- تێدەگەم. بەڵام وێڕای ئەمەش ژنێکی باشە.

- بەڵێ، بەڵام نام هاڕوژێنێت.

لە کلوتیلد نزیک بووەوە وبە ئەسپایی گوتی:- کەی دەتوانین یەکدی ببینین؟

- باشە... سبەی، ئەگەر حەزدەکەی.

- باشە، سبەی، سەعات دوو باشە؟

- بەڵێ سەعات دوو.

جۆرج هەستا بڕوات، بەڵام کەمێک نیگەران و ناڕەحەت، بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- دەزانی، بە تەمام خۆم ئاپارتمانەکە بەکرێ بگرم و خۆم کرێکەی بدەم. من خۆم حەزدەکەم. ئیدی ماقووڵ نییە تۆ کرێی ئەوێ بدەیت.

ئەمجارەیان کلوتیلد، بە ڕەفتارێکی عاشقانە دەستەکانی ئەوی ماچ کرد و لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەکەیفی دڵی خۆت بکە. بەلای منەوە گرینگ ئەوەیە ئەپارتمانەکە بۆ خۆمان بێت...

دوروا، بەدڵ و دەروونێکی شاد و ئاسوودەوە لە نک ئەو ڕۆیی. وەختایەک بەبەر جامخانەی وێنەگرێکا تێدەپەڕی، چاوی بە وێنەی ژنێکی چاوگەورە کەوت کە زۆر لە خانم ڤالتر دەچوو، لەدڵی خۆیدا گوتی: " ڕێک وەکو ئەوە، هێشتا پارووبەکی چەور ونەرمە، گۆشتی دەخورێ. چۆنە تا نها هیچ بایەخێکم بەو نەداوە. حەزدەکەم بزانم پێنج شەممە، چۆن مامەڵەم دەگەڵدا دەکات. " بە دەم ڕێکردنەوە، بەخۆشحاڵیەکی دەروونیەوە، دەستەکانی لێکدی هەڵدەسوون، خوشحاڵیەکی زادەی سەرکەوتنی هەمەلایەنە، خۆشحاڵی غروورئامێزی پیاوێک کە لە ئاشقێنی پڕ میهری ژنانەوە سەرچاوە دەگرێت، سەراپای داگرتبوو.

کە پێنج شەممە هات بە مادلینی گوت:- تۆ نایەی بۆ ماڵی ریڤال؟

- ئاە، نا، حەزم لەو جۆرە کۆڕ و مەجلیسانە نییە، دەڕۆم سەرێک لە ئەنجوومەنی نوێنەران دەدەم.

جۆرج، بە گالیسکەیەکی بێ چادر، چوو بە دوای خانم ڤالتردا، چونکە هەوا زۆر خۆشبوو.

کە ئاغا ژنی بینی زۆری پێ سەیر بوو، چونکە گەنج وجوان هاتە بەرچاوی. خانم ڤالتر، میکیاج و ئاڕایشتێکی تەنکی کردبوو، تۆڕێکی تەنک سینگ وبەرۆک ویەخەی جلەکانی داپۆشی بوو، کە لە میانی کونی تۆڕەکەوە، بەرز ونزم بوونەوەی مەمکە قوت وقەڵەوەکانی دەبینرا. جۆرج، هەرگیز بە تەڕوبڕی و شەنگوڵیەوە نەیبینی بوو. بەڕاستی زۆر هەوەس ئەنگێز و سێکسیانەی هاتە بەرچاو.

سەروسیمایەکی ئارام و پڕ ویقاری هەبوو ورەفتاری، ڕەفتاری دایکێکی بەڕێز و ئەرخایەنی ئەوتۆی هەبوو کە لە نەوسنی پیاوانی چاوباشقاڵی شەرواڵ پیسی دەپاراست. زۆری قسە نەدەکرد، ئەگەر قسەشی کردبا، دەربارەی بابەتی ئاسایی دەکرد. ئەو بابەتانەی کە هەمووان لێی بەئاگان. بۆچوونەکانی ئاقڵانە، ئوسوڵی و ڕێک وپێک و دوور لە هەر زێدەڕۆییەک بوون.

کیژە بچووکەکەی، سوزان کە جلێکی پەمەیی لەبەربوو، لە یەکێک لە تابلۆکانی واتو دەچوو ( واتو: نیگارکێشێکی فەرەنساوی ئاخر وئۆخری سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نوزدەیە ) کە تازە تەواوکرابێ، تەڕ وتازە و بە ڕەونەق و پڕ جیلوە بوو و، خوشکە گەورەکەی، بە مامۆستا یان سەرپەرشتیارێک دەچوو کە ماموری چاودێری ئەم کچە جوانە بووکەڵە ئاسایە بێت.

ڕیزێک گالیسکە لەبەر ماڵی ریڤال دا وەستابوو. دوروا، قۆڵی دایە خانم ڤالتر و پێکڤە وەژوور کەوتن.

پێشبڕکێیە، شمشێربازیەکە بە قازانجی منداڵانی سێوی دەڤەری شەشەمی پاریس بەرپاکرابوو، هەموو خانمانی سیناتور و نوێنەرانی ئەنجوومەن، ئەوانەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزەوە هەبوو، سەرپەرشتی پێشبڕکێیەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو.

خانم ڤالتر، بەم مەرجە قابیل بووبوو کە دەگەڵ کچەکانیا بۆ ئەم کوڕ و مەجلیسە بێت کە کەیەکێک نەبێت لە سەرپەرشتیاران و بەڕێوەبەرەکانی، چونکە ئەو کۆمەک ویارمەتیە خێرخوازییەکانی خۆی لەڕێگای کەشیشانی کڵێساوە ئەنجام دەدا. نەک لەبەر ئەوەی کە کەسێکی

مەزەبی تەواو عەیار بێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی شووی بە پیاوێکی جوولەکە کردبوو، ناچار بوو ئەم کارەبکات. هەروەها ئەوەی بە ئەرکی خۆی دەزانی کە هەندێک ڕواڵەتی مەزەبی ڕەچاوبکات، چونکە ئەم دەعوەت و زیافەتەی کە ئەم ڕۆژنامەڤانە بەرپای کردبوو، جۆرە هاماجێکی کۆماریخوازی و دواجار ئەنتی مەزەبی پێوە دیاربوو.

سێ دانە هەفتە بوو، لە هەموو ڕۆژنامەکاندا، باس باسی ئەم پێشبڕکێیە بوو:

" هاوکاری ڕێزدارمان جاک ریڤال لە دەست پێشکەرییەکی داهێنەرانەدا لێبڕاوە کە پێشبڕکێیەکی شمشیربازی، بە سوود و قازانجی سێویانی دەڤەری شەشەمی پاریس، بەرپابکات. ئەم پێشبڕکێیە لە هۆڵە جوانەکەی تەنیشت ئاپارتمانە تایبەتیەکەی خۆیدا ئەنجام دەدرێت.

" دەعوەتەکان لە لایەن خانمان لالوینی، رمونتل، رسیولن، هاوسەرانی سیناتۆرانی بە هەمان ناو و، خانمان لاروش ماتیو، پرسرول، فیرمەن، هاوسەرانی نوێنەرانی بەناوبانگی ئەنجوومەنەوە، کراوە. کۆکردنەوەی پیتاک، لە کاتی پشووی نێوان هەردوو بەشی پێشبڕکێیەکەدا، دەکرێت، ئەو پیتاکەی کە کۆدەکرێتەوە، یەکسەر ڕادەستی بەڕێوەبەری شارەوانی دەڤەری شەشەم یان نوێنەری ئەو دەکرێت. "

ئەم بابەتە خۆی لە خۆیدا بە بانگەشە و ڕیکلامێکی گەورە دەهاتە ژماردن، کە یارۆی ڕۆژنامەڤان بە قازانجی خۆیی دەزانی.

جاک ریڤال، لەبەر دەرگای ماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لە میوانان دەکرد. لە ڕاڕەو و هۆڵەکەدا مێزێکی پڕ لە خواردن و خواردنەوە دانرابوو، کە بەهای مەسرەفی ئەوانەش دەخرایە سەر دەرامەتی پێشبڕکێیەکە. بە ڕووخۆشییەوە، ئەو پلیکانەیەی کە بۆ ژێر زەمینێک دەڕۆیی نیشانی میوانەکان دەدا، ژێرزەمینەکە بۆ شمشێربازی و تیرەندازی ئامادە کرابوو و، دەیگوت: " بۆ خوارەوە، خانمان بۆ خوارەوە، پێشبڕکێیەکە لە خوارەوە ئەنجامدەدرێ. "

کە خانم ڤالتری بینی، خێرا بە پیرییەوە چوو، دەستی ماچکرد، تەوقەی دەگەڵ دورواشدا کرد وگوتی:- سڵاو بیل ئامی.

جۆرج، حەپەسا، پرسی:- کێ بەتۆی گوتووە کە...

ریڤال، قسەکەی پێبڕی و گوتی:- ئەم خانم ڤالترە ئازیزە کە ئەم نازناوەی زۆر بەدڵە.

خانم ڤالتر سوور بووەوە وگوتی:

- ، بەڵێ، دان بەوەدا دەنەم کە ئەگەر لە ئێستا زیاترم ناسیبای، منیش وەکو لورینی چکۆلە، بە بیل ئامی گازم دەکردیت. ئەم نازناوەت زۆر لێدێت.

دوروا، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:- تکا دەکەم خانم، لەمەودوا وابکە.

خانم ڤالتر چاوانی بڕینە ئەرزەکە وگوتی:- نە، جارێ، هێشتا وەکو پێویست یەکدی ناناسین.

جۆرج لەبن لێوانەوە گوتی:- یانی ئەم ئومێدەم دەدەیە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببینە دۆستی نزیک؟

خانم ڤالتر گوتی:- یەعنی، بابزانین.

جۆرج، له بەردەم ئەو پلیکانه باریکەی که ڕۆشنایی چرایەکی غازی ڕوناکی دەکرەوە، لاکەوت. گۆڕانی ڕۆشنایی ڕۆژەکە بەم ڕوناکییە زەردە کزە، حاڵەتێکی خەمناکی ئیجاد دەکرد. بۆنی تایبەتی ژێرزەمینەکە له پلیکانه تەنگەکانەوە دەهاتەسەرێ. بۆنی شێی گەرم، بۆنی دیوارە نمسارەکان که بەم بۆنەیەوە شۆردرابوون، بۆنی داری عوود که شوێنه ئاینییەکانی وەبیر دێنایەوەو، بۆنی عەتری ژنانە: وەنەوشە، زەمەق، شاپەسند دنیای پڕکردبوو.

لەم ژێرزەمینه گەورەیەوە، دەنگی قسەکردن و هەراو هەنگامەی ئاپۆڕای خۆرشیاگ دەهاتەگوێ.

سەرانسەری ژێرزەمینەکە، چرای غازی پێچاوپێچ و فانۆسانی کاغەزین که له ژێر گەڵا و گوڵا دانرابوو، تا بەردێن ناهەموار و زبری دیوارەکان دابپۆشن، ڕوناک کرابووەوە. جگه له گەڵا ولق وپۆپان هیچی دی نەدەبینرا. میچەکە بەگەڵای سەرخەس داپۆشرابوو، ناو هۆڵەکە به گوڵ و گەڵای درەختان ڕازبووەوە.

هۆڵی ژێرزەمینەکە بەم ئاڕایشانەوە، بەلای هەمووانەوە جوان بوو. دیمەنێکی خەیاڵی و شاعیرانەی هەبوو. له بەشی کۆتایی هۆڵەکەدا، شوێنێکی بچووکی غارئاسا بوو که له نێوان دوو ڕیز کورسی تایبەت به داوەرەکان دا، شوێنێکیان بۆ شمشێربازەکان دروستکردبوو.

لەم بەر ولەو بەری هۆڵەکەوە، دە ڕیز تەختە وکورسی دانرابوو که بەشی دانیشتنی دوو سەد نەفەری دەکرد، بەڵام چوار سەد نەفەر دەعوەت کرابوون.

له هەنبەر شوێنەکەدا، کۆمەڵێک پیاوی گەنج، بەجلکی تایبەتی شمشێربازانەوە، هەموو ناوقەد باریک، دەست ولاو

درێژ، سینگ شێر وسمێڵ بادراو، لە بەردەم تەمەشاڤانەکاندا ڕیزیان بەستبوو. تەمەشاڤانەکان، بەناو بانگیان دەکرد، مامۆستایان و هەوادارانی ئەم هونەرەیان دیاری دەکرد، هەرهەموویان لە پاڵەوانانی ناوداری شمشێربازی بوون. پیاوانی پیر وگەنج بە باڵاپۆشی درێژەوە کە لە شمشێربازانی خۆمانی و ئاشنا دەچوون، لە دەوروبەری ئەوانا، مژوولی قسان بوون. ئەوانەش بەتەما بوون سەرنجی تەمەشاڤانەکان بۆلای خۆ ڕاکێشن، بانگیان بکەن و تەعاروفیان دەگەڵ بکەن، ئەمانە مامۆستایانی کارامە و ناوداری فەندی شمشێربازی بوون، هیچیان جل وبەرگی شەڕیان لە بەر نەکردبوو.

خانمەکان، تەقریبەن هەموو تەختەکانیان داگیرکردبوو، دەنگی خشەخشی جلەکانیان وزەمزەمەی قسەکانیان، هۆڵی ژێرزەمینەکەی پڕکردبوو.

خانمەکان، وەک ئەوەی لە تەمەشاخانەدابن، بە باوەشێنی دەستی خۆیان باوەشێن دەکرد، چونکە هەوای ئەم ژێرزەمینە پڕ گوڵ وگەلایە، وەکو گوڵخانە، گەرم و سەنگین بووبوو. جارجار یەکێک لە ئامادەبووە لێبۆک و حەنەکچیەکان هاواری دەکرد: " نۆشابە، بیرە، ئاوجۆ! "

خانم ڤالتر وکچەکانی، چوون، لە ڕیزی پێشەوە، لە جێگای خۆیان، کە پێشتر بۆیان دیاری کرابوو، دانیشتن. دوروا پاش ئەوەی کە ئەوانی گەیاندنە ئەویٚ، لەبن لێوانەوە گوتی:

– مەجبورم دەست بەردارتان بم، چونکە پیاوان بۆیان نییە لە سەر تەختەکان دانیشن.

خانم ڤالتر، بە سووکە دوودڵییەکەوە گوتی:

- وێڕای ئەمەش حەز دەکەم لە گەڵما بمێنیتەوەو شمشێربازەکانم بە ناو پێ بناسێنێ. ئەگەر لەلای ئەم تەختەوە بوەستی، کەس بێزار ناکەیت.

بە چاوە درشت ومیهرەبانەکانی تەمەشای دوروای دەکرد. بەپێداگرییەوە لە سەری ڕۆیی: " دەی لەگەڵ ئێمەدا بمێنەوە... ئاغای... ئاغای بیل ئامی، پێویستمان بە تۆیە. "

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:- بەسەرچاو خانم، دەخزمەتودام.

خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە دەیانگوت: " ئەم ژێرزەمینە چەند جێیەکی خۆشە، زۆر دڵگیرە. "

جۆرج، بەباشی شارەزای ئەم ژێرزەمینە و تاقە کەوانیەکەی بوو. ئەو پێش نیوەڕۆیەی وەبیر دێنایەوە کە تیایا بەسەری بردبوو، بەیانی ڕۆژی پێش دوئێلەکە، بە تاقی تەنیا، لەبەرانبەر مقەوایەکی سپی بچووکا، کە لە کۆتایی ژێرزەمینی دووەما، وەکو چاوێکی گەورە و ترسناک تەمەشای دەکرد، وەبیرخۆی هێنایەوە.

دەنگی جاک ریڤال، لە سەر پلیکانەکانەوە بەرز بووەوە: " خانمان، دەست پێدەکەین. "

شەش پیاو، بە جلکێن زۆر بەدەن چەسپەوە، بۆئەوەی ماسوولکەکانی سینگیان دەربکەوێ، چوون لە جێگا دیاریکراوەکەدا ولە سەر کورسی داوەرەکان دانیشتن.

ناویان دەماودەم گەڕا: جەنەڕاڵ ڕیناڵدی، سەرۆکی داوەران، پیاوێکی کورتەباڵای سمێڵ بابڕ بوو، جوزفین رودە، نیگارکێش، پیاوێکی باڵابەرزی کەللە سافی ڕدێن درێژ بوو، ماتیو دوئوژار، سیمون رامونسیل، پییر دوکارڤن، سێ

پیاوی سەروسیما جوانی پۆشتە وپەرداخ بوون، ئەنجام گاسپار مرلورون، ڕاهێنەرو مامۆستای شمشێربازی.

دوو تابلۆ، لەم بەر ولەوبەری ژێرزەمینەکە هەڵواسراون. لە سەر تابلۆکەی سەمتی ڕاستا ناوی: ئاغای کریڤکور نووسرابوو و لە سەر تابلۆکەی سەمتی چەپ ناوی: ئاغای پلومو نووسرابوو.

هەردووکیان ڕاهینەر بوون، دوو ڕاهێنەری باش بەڵام نمرە دوو. ئەو جووتە بە ڕەفتاری وشک و سوپاییانەوە، هاتنەبەردەم شانۆکە. دوای ئەوەی بە شێوازی شمشێربازان سڵاویان لێکدی کرد، دەستیان بە هێرش و پەلامار کرد، بە جلکە سپییە چەرمەکانیانەوە لە دوو سەربازی کارتۆنی دەچوون کە بۆ ئەوەی خەڵکی بێننە پێکەنین، شمشێربازیان دەکرد. جارجار وشەی " خواردی " لە زاری یەکێک لە شمشێربازەکان دەردەهات و شەش داوەری پێشبڕکێیەکەش، بەسەر وسیمایەکی پسپۆڕانەوە سەریان بۆ پێشەوە دادەنەواند.

ئاپۆڕای خەڵکەکە جگە لەم دوو بووکەڵە زندووەی کە دەستیان لە هەوادا تەکان دەدا، هیچی دیکەیان نەدەبینی، لە هیچیش تێنەدەگەیین، بەڵام دڵخۆش و خۆشحاڵ بوون. ئەم دوو نەفەرە بەلای ئەوانەوە کەمێک ناهەموار و تاڕادەیەک مەخسەرە دەهاتنە بەرچاو. بە دیتنی ئەوان، ئەو زۆرانبازە دارینانەیان بیر دەکەوتەوە کە ڕۆژی هەوەڵی ساڵ لە بولڤارەکان دەیانفرۆشتن.

دوای دوو شمشێربازەکەی یەکەم، ئاغایان پلانتون و کاراپن هاتنە بەردەم شانۆکە. یەکێکیان ڕاهێنەری شمشێربازی بوو و ئەویتریان ڕاهێنەری سوپایی بوو.

پلانتون زۆر وردیلە ورێوەڵە بوو، کاراپن بەپێچەوانەوە زۆر زەلام و قەڵەو بوو. پیاو گومانی ئەوەی دەکرد ئەم باڵۆنە کە لە ورگی فوو دراو دەچوو، دەگەڵ یەکەم جەزرەبەی شمشێردا بتەقێ. هەموو پێدەکەنین. ئاغای پلانتون وەکو مەیموون هەر هەڵبەز ودابەزی دەکرد، بەڵام ئاغای کاراپن تەنیا بازووی دەجوڵاند و باقی بەدەنی لەبەر قەڵەوی جوڵەی نەدەکرد و هەر پێنج خولەک جارێ ئەوەندە بە قورسی وبەزەحمەت بۆ پێشەوە دادەنەوییەوە وەک ئەوەی گرنگترین بڕیاری ژیانی دابێت. دوای ئەوە زۆر بەزەحمەت دەیتوانی بچێتەوە دۆخی یەکەمی.

خەڵکانی پسپۆڕ وشارەزا، کارەکەیان بە کارامە و مەحکەم دەزانی و تەمەشاڤانەکانیش بەدڵنیاییەوە و بەگوێرەی گوتەی وان، هانیان دەدان.

دوای ئەوان نۆرەی ئاغایان پوریون ولاپالم هات، یەکێکیان ڕاهێنەر وئەویتریان ئاماتور (هاوی) بوو کە دەستیان بەگەمە پڕ جم وجووڵەکە کرد، بە تووڕەیی پەلاماری یەکتریان دەدا، هێندە بە توندی پڕیان دەدایە یەک، کە داوەرەکان ناچاربوون کورسی بەدەست هەڵێن. جووتە شمشێربازەکە، بەتووندی و لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی کۆمیدی، لەم سەری مەیدانەکەوە بۆ ئەوسەر دەچوون ودەگەڕانەوە. گەڕانەوەیان بۆ دواوە کورت و دەبووە مایەی پێکەنینی خانمەکان وهێرش و پەلامارەکانیان بە هەنگاوی هەڕاو ئەنجام دەدا، کە کەمۆکەیەک تەمەشاڤانەکانی دەهاڕۆژاند. ئەم هەڵبەز و دابەزە جومناستیکیانە، بوونە مایەی ئەوەی یەکێک لە تەمەشاڤانەکان هاواربکات: " خۆتان ماندوو مەکەن، کات

تەواو بووە! " خەڵکەکە کە کەمێک لەبێ سەلیقەیی ئەو نارەحەت بووبوون، هاواریان کرد:" وس! "

قەزاوەت و داوەری پسپۆڕەکان دەربارەی وان، دەماودەم گەڕا. جووتە شمشێروەشێنەکە زۆر خۆیان ماندوو کردبوو، بەڵام کارەکەیان، هەندێجار ڕەچاوی دیقەتی تەواوی تیا نەبوو.

بەشی یەکەمی پێشبڕکێیەکە، بە شمشێربازییەکی یەجگار جوانی جاک ریڤال و مامۆستای بە نێوبانگی بەلژیکی لوبیگ کۆتایی هات. ریڤال بووە مایەی دڵخۆشی خانمەکان. بەڕاستی گەنجێکی قۆز بوو، خۆش ئەندام، نەرم، چالاک و چەلەنگ و زۆر دڵگیرتر لە هەموو ئەو کەسانەی کە لە پێش ئەودا یاریان کردبوو. لە شێوەی بەرەڤانی و هێرشدا، هێندەی ناسکی ئەرستوکراتانە دەنواند کە هەموان پێیان خۆش بوو و ڕێک بە پێچەوانەی ڕەفتاری ڕەقیبەکەیەوە بوو. هەموو دەیانگوت: پیاوێکی بە ئەدەب و بە تەربیێتە. ئەو سەرکەوت و هەمووان چەپڵەیان بۆ لێدا.

چەند خولەکێک بوو لە نهۆمی سەرەوە دەنگی هەرا و هەنگامەیەکی سەیر دەهاتە گوێ کە تەمەشاڤانەکانی نیگەران و نارەحەت دەکرد. دەنگی هەڵبەز ودابەزی تێکەڵ بە پێکەنین وقاقا. ئەو دووسەد میوانەی کە نەیان توانی بوو، بە سەدەمی تەنگی جێگاکەوە بێنەخوارەوە، بێگومان خەریک بوون بە شێوازی خۆیان کەیف و سەفایان دەکرد. لە سەر پلیکانە خولاوەکە، پەنجا کەسێک کۆ بووبوونەوە، گەرمای ناو ژێرزەمینەکە زۆر ناخۆش بوو، خەڵکەکە بێتاقەت بووبوون. تەمەشاڤانەکان هاواریان دەکرد: " هەوای ئازاد. " ، " نۆشابە فریابخەن! "

هەمان کابرای لێبۆکی پێشوو دووبارە هاواریکرد: " نۆشابە، بیرەی سارد، ئاوجۆ! "

سەر وکەللەی ریڤال بە جلکی شمشێربازی و ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوەوە پەیدابوو وگوتی:

– ئێستا دەڵێم ساردیتان بۆ بێنن. بەڕاکردن بەرەو پلیکانەکان ڕۆیی. بەڵام ڕێگەی نهۆمی خوارەوە بڕابوو. ڕێگەکردنەوە لە نێو ئەم ئاپۆرا تێکرژاوەی سەر پلیکانەکان، بەئەندازەی کون کردنی ساپیتەکە دژوار و زەحمەت بوو.

ریڤال هاواریکرد: بەستەنی بۆ خانمان بێنن.

پەنجا دەنگ پێکەوە هاواریان کرد: " بەستەنی " سەرەنجام سینییەک لە پلیکانەکانەوە هاتەخوارەوە، لێ قاپەکان بەتاڵ بوون. ڕەندان لە ڕێگا هەموویان خواردبوو.

دەنگێکی بەرز هاواریکرد:– خەریکە لێرە دەخنکێین، خێرا شتەکە تەواوبکەن، بابڕۆین بەلای کاری خۆمانەوە.

دەنگێکی دی گوتی: " پیتاکەکە کۆ بکەنەوە! " و ئاپۆڕاکە بە هانکە هانک، بەڵام بەجدی دووبارەیان کردەوە: " پیتاکەکە کۆ بکەنەوە... پیتاکەکە... "

هەنگێ شەش کەس لە خانمان بەنێو تەختەکاندا کەوتنەڕێ و، دەنگی زرینگە زرینگی سکە ودراوان کە دەخرانە کیسەکانەوە بەرز بووەوە.

دوروا، ناوی پیاوە ناودارەکانی ئەنجوومەنی بە خانم ڤالتر دەگوت. خەڵکانی مەجلیس ئاراو بەئەتەکێت بوون، ڕۆژنامەڤانەکان، کە لە ڕۆژنامە گەورەو قەدیمیەکانەوە هاتبوون، بەجۆرە پارێزێکەوە کە زادەی ئەزموونی خۆیان بوو، بەچاوی سووکەوە سەیری لاڤی فرانسزیان دەکرد. ئەوانە گەلێک لەم ڕۆژنامە سیاسی – داراییانەیان بینی بوو

که بە فڕوفێڵ هاتبوونە ئاراوەو زۆر زوو لەگەڵ کەوتنی وەزیرێک یان کابینەیەکدا، نەمابوون. نیگارکێش و پەیکەرسازانی ئەهلی وەرزشی ناودار، لە نێو ئامادەبوواندا هەبوون، لەوانە شاعیرێکی ئەندامی ئەکادیمیا کە هەمووان بە قامکان ئاماژەیان بۆ دەکرد، دوو سازڤان وچەندین فەرەنگی لە چینی ئەشراف. دوروا، لە دوای ناوی ئەوانەوە پاشگری " رەست " شی بەکار دەبرد ( کەمانای راستا کویری دەدا ). ( راستا کویر: بەو فەرەنگی وبیانیانە دەگوترێ کە سەروەت و سامانێکی فرەیان هەیە و لە وڵاتێکی دیدا دەژین ) تا بە گوتەی خۆی لاسایی ئەو ئینگلیزانە بکاتەوە کە وشەی ئیسک لە سەر کارتی دەعوەتنامەکانیان دەنووسن. ( ئیسک، بەشی یەکەمی ئیسک ویرە Esquire کە نیشانەی ئەسڵزادەیی ئینگلیزانە ولە دوای ناوەکەیەوە بەکاردەبرێ. ) یەکێک بە دەنگی بەرز گوتی: " سڵاو، دۆستی ئازیز. " کۆنت دو ڤیدریک بوو، دوروا، تەوازی لە خانمەکان خواست و چوو تەوقە دەگەڵ ئەودا بکات. وەختێ گەڕایەوە پێی گوتن: " چەند پیاوێکی بەڕێزە، ئەم ڤیدریکە. ئەسڵزادەیی لە سەراپای دەبارێ. "

خانم ڤالتر، هیچ بەرسڤێکی نەدایەوە. کەمێک ماندوو بووبوو، دەگەڵ هەر هەناسە هەڵکێشانێکدا، سینگ و بەرۆکی بە نارەحەتی بەرز ونزم دەبووەوە، ئەمە مایەی سەرنجی دوروا بوو. جارجار نیگای لە نیگای " ئاغاژن " دەگیرا، نیگایەکی پەریشان و دوودڵ کە بۆ ساتێک لە سەر ڕووی ئەو دەگیرسایەوەو یەکسەر دەتارا. دوروا بەخۆی دەگوت: " عەجەب... عەجەب... عەجەب... یانی دەتوانم ئەمەش بخەمە داوەوە؟ "

کیسەی کۆکردنەوەی پیتاکان بە بەردەم ئەواندا ڕۆیی، پڕبوو لە سکەی زێڕ وزیو.

تابلۆیەکی دی لە بەردەم جێگاکەدا هەڵواسرا کە لە سەریان نووسی بوو: " بەرنامەیەکی تەواو چاوەڕوان نەکراو. " ئەندامانی دەستەی داوەری گەڕانەوە سەر جێگاکانیان و بەدەم چاوەڕوانییەوە دانیشتن.

دوو ژن بە جلکی شمشێربازییەوەو بە شمشێرانی سووکەوە هاتنە بەردەم شانۆکە. جلەکانی سەرەوەیان تۆخ وبەدەن چەسپ بوو وتەنوورەکانیان کورت و تا نیوەی ڕانیان بوو. زرێی سەر سینگ و مەمکیان ئەوەندە بەرز بوو کە ناچاربوون، سەریان بەرز بگرن. هەردووکیان گەنج و شەنگوڵ بوون. بەرێز وحورمەتەوە بەدەم ئامادەبووانەوە پێدەکەنین. ماوەیەکی زۆر چەپڵەیان بۆلێدان و هورایان بۆکێشان.

لە نێو خەندەو شۆخییانی ناسک وزەمزەمەی تەمەشاڤانەکانەوە، شمشێرەکانیان بە نیشانەی ئامادەیی بۆ دەست پێکردنی پێشبڕکێیەکە لە بەردەم خۆیاندا توند گرت.

بزەیەکی مەحەبەت ئامیز نیشتبووە سەرلێوی داوەرەکان و لەگەڵ هەر جووڵەیەکا ئافەرینیان لێدەکردن.

تەمەشاڤانەکان بە دەنگی بەرز، زۆریان هاندەدان، جووتە ژنی شمشێرباز هەوەسی پیاوانیان هەڵدەستان و سەلیقەی ئاسایی پاریسیانەی خانمەکانیان سەبارەت بە ناسکی دڵگیر وکەمێ گۆساخانە و زێبایی هەندێک بوێرانەی خۆیان دەهاڕوژاند. هەمان حاڵەتیان لە لا دەهاڕوژاندن کە شیعرێن توندوتیژی ئۆپەرێتان و دەنگبێژانی کافە

وگازینۆیانی سازوزەرب، بە قژی دەستکردی جوان وسیمای دەستکردیانەوە، دەیان هاڕوژاند.

هەرجارێ کە یەکێک لە شمشێربازەکان هێرشی دێنا، ئاپۆڕاکە تەواو دەخرۆشا. هەریەکێکیان پشتی بکەوتایەتە ئاپۆڕاکە، دەمەکان بە شەوقەوە دەکرانەوە، چاوەکان زەق دەبوونەوە، پیاوەکان ئیدی تەمەشای دەست و شمشێرەکانیان نەدەکرد، بەڵکو چاویان دەبڕییە ئەندامی جوان و بەژنی ڕێک وپێکی و، لەخۆشی و کەیفان هورایان دەکێشا.

ئیدی چ کەسێک تەمەشای شەڕە شمشێری شمشێربازەکانی دی نەدەکرد. هەرهەموویان هۆشیان لەلای هەرا وهەنگامەکەی نهۆمی سەرەوە بوو. بۆ ماوەی چەند خولەکێک دەنگ، دەنگی ئەم جێ وئەوجێ پێکردنی موبێلان بوو، دەتگوت لەسەرەوە ماڵ دەگوازنەوە، ئەوسا لە ناکاوا دەنگی پیانۆ لە سەرێ ڕا بەرز بووەوە و دەنگی هەڵپەڕکێ و گۆرانی بەرز بووەوە. ئەوانەی لەسەرەوە بوون، لە تۆڵەی نەدیتنی بەزم و ڕەزمەکەی خوارەوە، کۆڕی سەما وهەڵپەڕکێیان گەرم کردبوو.

سەرەتا، دەنگی پێکەنینێکی بەرز لە نێو حەشیمەتەکەوە هەستا. پاشان چونکە خانمەکان مەیلی سەما و هەڵپەڕکێیان لا هاڕوژا بوو، ئیدی سەیری شانۆ و مەیدانەکەیان نەدەکرد و بەدەنگی بەرز کەوتنەقسان.

بیری بەرپاکردنی کۆڕی سەما وهەڵپەڕکێ لە لایەن ئەو میوانانەوە کە درەنگ گەیی بوون، زۆر پەسند وخۆش بوو. بەلایانەوە خۆش بوو تەنانەت ئەوانەی کە لە خواریشەوە بوون، حەزیان دەکرد بچنەسەرەوە.

لەم کاتەدا، دوو شمشێربازی تازە هاتنە سەرشانۆ وبەجۆرێ کەوتنە هێرش و پەلامار و شەڕە شمشێر کە سەرنجی هەمووانیان ڕاکێشا.

هێندە بەجوانی وبەوردییەوە، هێندە بە دڵنیاییەوە ڕەفتاریان دەکردو بە وردی هونەری پەلامارو کشانەوەیان ڕەچاو دەکرد کە حەشیمەتەکە، حایر وحەپەساو چاویان تێبڕین.

خێرایی وخوێنساردی هێرش وبەڕەڤانیان، جووڵەی خێراو ئاقڵانەیان کە خاو دەهاتە بەرچاو و هێزی کارامە و بێ خەوشیان هەمووانی مەفتوون وسەرسام دەکرد. ئامادەبووان وایان هەستدەکرد تەمەشای دیمەنێکی جوان و بێنەزیر دەکەن کە دوو هونەرمەندی گەورە و کارامە ولەزەبر پێشکەشیان دەکردن، دوو هونەرمەند کە هەموو هونەر، کارامەیی، فەند وفێڵ و شایستەگییەکی بەدەنی دوو هونەرمەندی گەورەیان تیادا کۆبووبووەوە.

ئاپۆڕاکە بە جۆرێ لە یارییەکە ڕامابوو کە ورتە لە کەسەوە نەدەهات. وەختایەک دوای دوایەمین هێرش و پەلامار هەردوو شمشێر وەشێنەکە تەوقەیان دەگەڵ یەکدیدا کرد، خەڵکەکە کەوتنە هەڵپەڕکێ و هوراکێشان و هاواری بژی و بابژییان هۆڵەکەی هێنایە لەرزین. نها هەمووان ناوی دوو شمشێربازەکەیان دەزانی: سرجان و ڕاڤینیاک.

هەموو ئامادەبووەکان هاڕوژابوون، شەڕیان لێدەباری. پیاوەکان شەڕیان دەفرۆشت، خێسەیان لەوانەی تەنیشتی خۆیان دەکرد. لەگین بوو لە سەر بزەیەک بەگژیەکدا بچن و بکەونە گیانی یەکدی. ئەوانەی کە بە عەمراتیان شمشێریان

بەدەستەوە نەگرتبوو، تەنها بە دارعاساکانیان هونەری شمشێربازیان دەئەزموو.

تەنها تەماشاڤانەکان، هێدی هێدی وکەم کەم بە پلیکانە بزۆزەکاندا دەچوونە سەرەوە. سەرەنجام دەیانتوانی دەمێ تەڕ بکەن. وەختێک بینیان لە نهۆمی خوارەوە کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێیان بەرپاکردووە، هەموو خواردن و ڤەخواردنەکانی سەرمێزەکانیان چەپاو کرد، تووڕەبوون، میوانەکانی نهۆمی خواروەش بەدەم گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان، دەیانگوت بەڕاستی شەرمە کە دووسەد نەفەر بۆ ئەوێ بکێش بکرێن و هیچیان نیشان نەدەن.

لە نهۆمی خوارەوە، نە یەک شیرینی مابووەوە نە یەک دڵۆپە شامپانیا، نە شەربەتێ نە بیرەیەک، نە ئاونەباتێکی ترش و نە میوەیەک نەمابوو، پاکوویان دابوو. میوانەکان هەرهەموویان چەپاو کردبوو و خواردبوویان.

پێشخزمەتەکان، بە چارەی غەمگینەوە، لە حاڵێکا هەوڵیان دەدا جلەوی پێکەنینەکانیان بگرن، دەیانگوت: " ژنەکان لە پیاوەکان هارتر بوو، هێندەیان خواردبوو و خواردبووەوە، خەریک بوو دەڕشانەوە. " ئینسان وای وێنادەکرد، چیرۆکی تالانکردن و چەپاوی شارێک لەلایەن دژمنەوە، لە زاری پاشماوەکانی ئەم هێرش و پەلامارانەوە دەژنەوێ.

هیچ چارەیەکیان نەبوو تەنیا ڕۆیشتن نەبێ، پیاوەکان داخیان بۆ ئەو بیست فرانکە دەخوارد کە بە پیتاک دابوویان، لە حاڵێکا میوانەکانی نهۆمی خوارەوە، نەک هەموو شتێکیان خواردبوو و چەپاو کردبوو، بەڵکو تاقە پولێکیشیان نەدابوو.

خانمانی سەرپەرشتیاری ئەم ئاهەنگە سێ هەزار فرانکیان کۆکردبووەوە. دوای داشکانی تێچووی ئاهەنگەکە، تەنیا دووسەد و بیست فرانک بۆ منداڵە سێوییەکانی دەڤەری شەشەمی پاریس مایەوە.

دوروا، بۆ گەیاندنەوەی خانم ڤالتر و کیژەکانی چاوەڕوانی گالیسکە بوو. وەختایەک لەناو گالیسکەکەدا ڕوو بە ڕووی ئاغاژن دانیشت، جارەکی دی نیگای پڕ نەوازش وسرکی، ئەمی غافڵگیر کرد. بەخۆی گوت: ' تەسەور دەکەم قولاپەکەی قووت دابێت ' چونکە دەیزانی دەتوانێ سەرنجی خانمان بۆ خۆی ڕاکێشێت، بزەیەکی بۆکرد، چونکە خانم دوماریل، دوای تازەکردنەوەی پەیوەندییەکانیان، وادەهاتەبەرچاو، بە عەشقێکی شێتانەوە ئەوی خۆشدەوێت.

بە هەنگاوی سووک و شادەوە بۆ ماڵ گەڕایەوە. مادلین لە هۆڵەکەدا چاوەڕوانی بوو. بە مێردەکەی گوت:

– هەواڵ وخەبەری دەستی یەکەم لایە. کێشەی مەراکش خەریکە ئاڵۆز دەبێت. ئەگەری ئەوە هەیە فەرەنسا لە زەرفی چەند مانگێکی دیدا، لەشکرکێشی بۆ ئەوێندەر بکات. بەهەرحاڵ دەتوانین سوود لەمە بدینین لە بۆ سەرنگون کردنی وەزیر، هەنگێ لاروش، سوود لەو واقیعە دەبینێ و دەبێت بە جێگرەوەی ئەو.

دوروا، بۆ ئەوەی سەربکاتە سەر ژنەکەی، وای نواند کە لە قسەکانی ئەو دڵنیانییە، متمانەی تەواوی بەقسەکانی ئەو نییە. دەوڵەت ئەوەندەش شێت نییە کە هەڵە گەوجانەکەی تونس دووبارە بکاتەوە.

لێ مادلین، بە بێ سەبری شانەکانی هەڵتەکاند: ' من پێت دەڵێم چۆن! تێت دەگەیەنم بۆچی! تۆ ناتوانی لەوە حاڵی

بی کە بۆ ئەوان پای پارەیەکی زۆر لە ئارادایە. ئەمڕۆکە گیانە، لە ئاین و ئۆینی سیاسیدا، نابێ بگوترێ: " لە دووی ئەو ژنە بگەڕێن کە هەراکەی ناوەتەوە " بەڵکو دەبێ بگوترێ: " لە خودی هەرا و ماجەراکە بگەڕێن. "

دوروا، بۆ ئەوەی ئەو بجوڵێنێ، بەسەر وسیمایەکی حەقارەت ئامێزەوە ولەبن لێوانەوە گوتی: - ئەم قسانە چییە.

مادلین کە خەریک بوو تووڕە دەبوو گوتی:- تۆش بە ئەندازەی فورستیە ساویلکەی.

دەیویست ئەو ئازار بدات و چاوەڕوانی ئەوە بوو تووڕە ببێت. لێ جۆرج بزەیەکی کرد وبەرسڤی دایەوە:- فورستیە قوڕمساغەکە؟

مادلین، لە سەرساميا ڕاچڵەکی و لەبن لێوانەوە گوتی:- ئا، جۆرج!

جۆرج، کە قەڵافەتێکی تەوسامێز وگۆساخانەی لە خۆ گرتبوو، دووبارە گوتی:

- ئێ، وانییە؟ ئەدی تۆ ئەو شەوە بەخۆت بەمنت نەگوت کە خیانەتت لە فورستیە دەکرد؟

ئەوسا بە ڕاوێژێکی بەزەیی ئامێزەوە لە سەری ڕۆیی: " مێردەکی بێنەوا. "

مادلین، پشتی تێکرد و بەرسڤی نەدایەوە؛ لێ دوای یەک خولەک بێدەنگی دووبارە گوتی:

- سێ شەممە میوانمان هەیە: خانم لاروش ماتیو دەگەڵ کۆنتس پرسمور بۆ شام دێن. حەزدەکەی ریڤال و نوربردوڤارنیش دەعوەت بکەی؟ سبەینێ بۆ ماڵی خانم ڤالتر و دوماریل دەڕۆم و ئەوانیش دەعوەت دەکەم. ڕەنگە خانم " رسولن " ش بێت.

مادلین، ماوەیەک بوو، لە ڕێگەی دەسەڵاتی سیاسی مێردەکەیەوە، خەریک بوو پەیوەندییانی تازەی دروست دەکرد و ئاهەنگ ودەعوەت ودەعوەتکاری سازدەکرد تا خانمانی ئەو سیناتۆرو ئەندام پەرلەمانانە، کە پێویستیان بە پشتیوانی لاڤی فرانسز هەبوو، بۆ ماڵی خۆیان بکێش بکات.

دوروا بەرسڤی دایەوە:- زۆرچاکە، دەعوەتی ریڤال و دوڤارن لە سەر من.

خۆشحاڵ بوو، لەخۆشیان دەستەکانی لێکدی دەسوون، چونکە هەنجەت و بیانوویەکی باشی بۆ ئەزیەت دانی ژنەکەی و بۆ تۆڵەکردنەوەی کینە وغیرە ناڕاستەوخۆکەی گەشتەکەی ئەو شەوەی بێشەی بولونی دەست کەوتبوو. هەرجارێ ناوی فورستیەی دێنا، سیفەتی قوڕمساغیشی دەدایەپاڵی. هەستیدەکرد بەم کارەی درەنگ یان زوو مادلین دەهری دەکات. ئەو شەوە، دەچەلان دەرفەتی هێنا کە بە بێباکی و بە سیمای تەنز ئامێزەوە، ناوی ئەم " فورستیە قوڕمساغە " بێنێت.

سەبارەت بە مردووەکە هیچ کینەیەکی لەدڵدا نەبوو، تۆڵەی خۆی دەکردەوە.

ژنەکەی وای دەنواند گوێ بەو تەشەرانەی ئەو نادات وبەبێ موبالاتی و ڕو خۆشی ڕووبە ڕووی دەبووەوە.

سبەی چونکە قەراربوو مادلین بڕوات بۆلای خانم ڤالتر و دەعوەتی بکات، جۆرج ویستی دەستپێشکەری بکات و بەتەنێ دەگەڵ ئاغاژندا وەمێنێ و بزانێ ئاخۆ بەڕاست گیرۆدەی ئەو بووە یان نا. ئەم بابەتە هەم سەرگەرمی دەکرد و هەم جۆرە متمانەیەکی پێدەبەخشی.

سەعات دوو چوو بۆ بولڤاری مالزب بۆ ماڵی ئاغا کە لەوێ بوو. برا بۆ هۆڵی چاوەڕوانی. سەروکەللەی خانم ڤالتر پەیدابوو و بە هەشتاو وبەشادییەوە دەستی بەرەو ئەو درێژ کرد.

– چ بایەک تۆی بۆ ئەم ناوە ڕاماڵیوە؟

– هیچ بایەک لە ئارادا نەبووە، هەر حەزی دیداری ئێوە بۆ ئەم ناوەی ڕاماڵیم. هێزێک بەرەوماڵی ئێوەی ڕانیم، ئیدی نازانم چۆن، ئیدی هاتم و تەواو! ئایا ئەم دیدارە کوت وپڕ وڕاستەوخۆیە، قەرەبووی قسە وڕوونکردنەوەم بۆ دەکاتەوە.

جۆرج، ئەم قسانەی بە ئەدەبەوە دەکرد. بزەیەک نیشتبووە سەرلێوی و دەنگی، جدییەتی پێوە دیاربوو.

خانم ڤالتر، حایر مابوو، سوور بووەوە و ئەوسا بە پچرپچری گوتی:

– بەڵام... بەڕاستی... سەر لەمە دەرناکەم... غافڵگیرت کردم...

جۆرج، لەسەری ڕۆیی:– ئەمە جۆرە دەربڕینێکی خۆشەویستیە... تا دوچاری نیگەرانی نەبی.

لەلای یەکەوە و لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوون. خانم ڤالتر، شەقڵی شۆخی بە قسەکانی دا.

– کەواتە جۆرە دەربڕینێکی خۆشەویستیە... بە ڕاست؟

– هەڵبەتە! لە مێژە دەمویست ئەم کارە بکەم. زۆر دەمێکە. بەڵام چ بکەم، جورئەتم نەدەکرد. دەڵێن تۆ زۆر جدی و سەختگیریت..

خانم، ڤالتر کە وەخۆ هاتبووەوە بەرسڤی دایەوە:- چما ئەمرۆت بۆ ئەم کارە هەڵبژاردووە؟

- نازانم. ئەوسا دەنگی نەوی کرد وگوتی: "یان لەبەر ئەمەیە کە لە دوێنێوە تاکو نها، بۆ تاقەساتێکیش لە بیرم دەرنەچووی"

خانم ڤالتر کە لە ناکاوا ڕەنگی پەڕی بوو، بە دەمەلاڵکێوە گوتی:- دەی، ئەم گاڵتەبازیە بەسە، باباسی شتی دی بکەین.

لێ جۆرج، هێندە لە ناکاوا، لە بەردەمیا بەچۆکدا هات کە ژنەی داماو ترسا. ویستی هەستێت، لێ جۆرج دەستەکانی لە قەدی ئاڵاندبوو و نەیدەهێشت هەستێت و، بەدەنگێکی هەڵچووەوە، دەیگوت و دەیگوتەوە:

- بەڵێ، ڕاستە کە دەمێکە، شێتانە تۆم خۆشدەوێ. هیچ وەڵامێکی من مەدەوە. ئێ ئیدی چاوەڕوانی چیت، من عەقڵم لە دەست داوە! خۆشم دەوێی... ئاە، ئەگەر دەتزانی چەندم خۆشدەوێی!

خانم ڤالتر، هەناسەی سوار بووبوو، هانکەهانکی پێکەوتبوو و دەیویست قسەبکات، بەڵام نەیدەتوانی تاقە وشەیەک بدرکێنێ. بە دەستەکانی ئەوی دەدایە دواوە، چنگی نابووە قژەکەی تا ڕێگە نەدات ئەم دەمە نەوسنە لەدەمی نزیک ببێتەوە، بە هەشتاو سەری بەڕاست وبەچەپدا وەردەگێڕا. چاوەکانی نووقاندبوو تا ئەو نەبینێت.

جۆرج لە سەر جلەکانەوە نەوازشی دەکرد، دەستی پێدا دێنا وژنەی بەلەنگاز خەریک بوو لە ژێر گوشاری ئەم نەوازشە لە ناکاو و توونددا، لە پەل وپۆ دەکەوت. جۆرج لە ناکاوا هەستایەسەر پێیان و ویستی لە ئامێزی بگرێت، لێ

خانم ڤالتر کە بۆ یەک سات ئازاد بووبوو، خۆی ڕاپسکاند وخۆی لە دەستی ئەو ڕزگارکرد ونها لەم قەنەفەیەوە ڕایدەکردە سەر ئەو قەنەفەیە.

جۆرج کە زانی ئەم ڕاو ڕاوێنە کەریتییە، خۆی دا بەسەر قەنەفەیەکدا، دەم وچاوی بەدەستەکانی داپۆشی و وای نواند دووچاری هەنسکدان وگریان بووە.

ئەوسا هەستا وگوتی: " خواحافیز! خواحافیز! " و بەهەڵاتن لە هۆڵەکە وەدەرکەوت.

لە ڕاڕەوەکەدا بە ئارامی داردەستەکەی هەڵگرت، خۆی گەیاندە سەر شەقامەکە و، بەخۆی گوت: " شەیتان بە نەحلەت بی، وابزانم کەوتۆتە داوەکەوە. " ئەوسا چوو بۆ تەلەگرافخانە، بروسکەیەکی کورتی لەسەر کاغەزێکی بچووک بۆ کلوتیلد ڤرێکرد و قەراری دیداری سبەینێی دیاریکرد.

وەختایەک، لە کاتی هەمیشەیی خۆیدا بۆ ماڵ گەڕایەوە، بە ژنەکەی گوت:

– ئێ، فریاکەوتی هەموو میوانەکانت بۆ شێو دەعوەت بکەی؟

– بەڵێ، تەنیا خانم ڤالتر، نازانێ ئاخۆ کاتی دەبێ یان نا. دوودڵ بوو، قسەی هەلەق ومەلەقی دەکرد، دەربارەی ئیلتیزامات، گازیی ویژدان. وەلحاڵ زۆرم سەیر هاتە بەرچاو. گرینگ نییە، وێڕای ئەمەش حەزدەکەم بێت.

جۆرج، شانەکانی هەڵتەکاند وگوتی:– دڵنیام کە دێت.

وێڕای ئەمەش دڵنیا نەبوو، تا ئەو ڕۆژەی کە قەرار بوو میوانیەکە بەرپابکرێ، بەنیگەرانی مایەوە.

مادلین، بەیانی هەمان ڕۆژ، نامەیەکی کورتی ئاغاژنی پێگەیی: " بەزەحمەتێکی زۆر ئەوسا توانیم خۆم ئازاد بکەم، بۆیە دێمە دەعوەتەکەتان. بەڵام مێردەکەم ناتوانێ بێت. "

دوروا بەخۆی گوت: " چەند باشم کرد، کە جارێکی دی بەدوییدا نەچووم. ئها هێور بووەتەوە. دەبێ زۆر وریابم. "

وێڕای ئەمەش، بە کەمێک نیگەرانییەوە چاوەڕوانی هاتنەکەی بوو.

جۆرج، خۆی زۆر خاکی، زۆر بە پارێز و ئارام نیشان دا.

خانم لاروش ماتیو و ریسولن دەگەڵ شووەکانیاندا هاتبوون.

لاویکنتس دوپرسمور دەربارەی کۆڕ ومەجلیسانی ئەشرافی قسەی کرد. خانم دوماریل، بە ئارایش وجلە فانتازیە ڕەش و زەردەکانییەوە زۆر جوان بووبوو، کراسێکی ئەسپانیایی لە بەربوو کە ناوقەدە باریک و بەژن و باڵا ڕێک وجوان و باسکە کەمێک گۆشتنەکانی توونـد لە خۆ گرتبوو و سەرە بچووکە باڵندە ئاساکەی زۆر بە توانا دەنواند.

دوروا، خانم ڤالتری لە سەر مێزەکەی سەمتی ڕاستی خۆیەوە دانیشاند وبە درێژایی شامەکە ( شێو، شیو، شێڤ ) بەڕێز وحورمەتێکی زیاد لەپێویست، دەربارەی بابەتی زۆر جدی قسەی دەگەڵ کرد. جارجارێکیش نیگایەکی کلوتیلدی دەکرد. لە دڵی خۆیدا گوتی:" ئەلهەقی ئەو لە هەمووان خشیکتر وشەنگوڵتر وتەڕوبڕترە. "

ئەوسا چاوی بڕییە ژنەکەی کە ئەویش لە بەرچاوی جوان و ڕوح سووک بوو، هەرچەندە، لەناخی خۆیدا هەستی بە ڕقێکی زۆر بەرانبەر بەو دەکرد.

بەڵام ئاغاژن، لە بەر ئەوەی ڕامکردنی دژوار بوو، بە ئاسانی خۆی بەدەستەوە نەدەداو جۆرە مێیاتی و تەڕوبڕییەکی تیابوو کە پیاوانی دەجووڵاند، زیاتر دەیهاڕوژاند.

خانم ڤالتر، زوو ڕۆیی. دوروا خێرا گوتی:- با بتگەیەنم.

خانم ڤالتر قەبووڵی نەکرد، لێ جۆرج پێداگری کرد و لەبن لێوانەوە پێی گوت:

- چما ناتەوێ بتگەیەنم. زۆر لێتان زویر دەبم. وا مەنوێنە کە بە هیچ کلۆجێ نەت بەخشیوم. بەخۆت دەبینی چۆن بووم بە کوڕێکی ئاقڵ وگوێڕایەڵ.

خانم ڤالتر گوتی:- ئاخر تۆ ناتوانی میوانەکانتان بە تەنیا بەجێبێڵی.

جۆرج، بزەیەکی کرد:- قەیدی نییە، ئەوپەڕی بیست خولەکێکم پێدەچێ. تەنانەت، پێشی نازانن. ئەگەر ئەم داوایەم قەبووڵ نەکەی، بە ڕاستی دڵم دەشکێنی.

خانم ڤالتر بە ئەسپایی گوتی:- دەی باشە، ڕازیم.

لێ هەرکە بە دووقۆڵی لە نێو گالیسکەکەدا گیرسانەوە، جۆرج دەستی ئەوی گرت و بەگەرمی ماچی کرد:

- خۆشم دەوێی، خۆشم دەوێی، ڕێگەم بدە ئەمەت پێ بڵێم. دەستت بۆ نایەنم، دەستت لێنادەم. تەنیا ئەوەندەم دەوێ دڵنیات بکەم کە خۆشم دەوێی.

خانم ڤالتر، بە پچڕپچڕی گوتی:

- ئاه!... دوای ئەوەی قەولت بە من دا... زۆر خراپە... زۆر خراپ...

جۆرج، وای نیشاندا کە گوشار لە خۆی دەکات، ئەوسا بە ڕاوێژێکی خاو گوتی:

- بەخۆت دەبینی کە ئاقڵ بووم و خۆم کۆنترۆڵ کردووە. وێڕای ئەمەش تەنیا ئەوندەم ڕێگە بدە کەپێت بڵێم خۆشم دەوێی... و هەموو ڕۆژێ ئەمەت بەگوێدا بدەم... بەڵێ تەنیا ڕێگەم بدە بێم بۆماڵتان، لە هەنبەرتدا چۆک دابدەم و تەمەشای ڕوخسارە جوانەکەت، کە شایستەی پەرستنی منە، بکەم و ئەم سێ وشەیە دووبارە بکەمەوە.

خانم ڤالتر، کە دەستی بەو سپاردبوو، بەدەم هەناسەبڕکێوە گوتی:- نا، ناتوانم، نامەوێ. ئاخر خەڵکی چ دەڵێن، گەر کچەکانم و کارەکەرەکانم بزانن، چ کاردانەوەیەکیان دەبێت. نا، نا، مەحاڵە...

جۆرج دووبارە گوتی:- بەبێ دیداری تۆ ناتوانم بژیم. ئیدی ئەم دیدارە لە ماڵی خۆتاندا بێ یان لە هەر شوێنێکی دی، دەبێ تۆ ببینم، ئەگەر ڕۆژی بۆ یەک خولەکیش بووە، دەبێ بتبینم، دەستت بگرم، ئەو هەوایە هەڵمژم کە لە جلەکانتەوە هەڵدەستێت، تەمەشای بەدەنت وچاوە درشتە جوانەکانت بکەم کە ئاگرم تێ بەردەدەن.

خانم ڤالتر، بەجەستەی لەرزانەوە گوێی لەم وشە سواوە عاشقانانەیە دەگرت و بەدەمەلاڵکێوە دەیگوت:

- نا... نا... شتی وا نەبووە و نابێ. بە سە بیبڕەوە!

جۆرج، بە ئەسپایی بەگوێی خانم ڤالتریدا دەچپاند و دەیزانی دەبێ زۆر بەپارێزەوەو هەنگاو بەهەنگاو لەم ژنە سادەیە بچێتە پێشەوەو، پاشان قەراری دیدارێکی

لێوەربگرێت، سەرەتا لەو شوێنەدا کە خانم ڤالتر دەیویست و پاشان لەو شوێنەدا کە خۆی دیاری دەکرد.

- گوێ بگرە... بە هەر نرخێ بووە دەبێ بتبینم... وەکو گەدایەکی نەدار لەبەر دەرگاکەتان بەدەم چاوەڕوانییەوە دەوەستم... ئەگەر لەماڵ نەیەیتە دەرێ، بە خۆرتی خۆم بەژووردا دەکەم... بە هەرحاڵ هەر دەتبینم... دەتبینم... سبەی.

ژنی بێنەوا، دووپاتی دەکردەوە: " نا، نا، نەیەیت. ناتوانم لە ماڵەوە پێشوازیت بکەم. بیر لە کیژەکانم بکەوە. "

- دەی باشە، بڵێ دەتوانم لە کوێ بتبینم... لە جادە... لە بازاڕ... لە هەرجێیەک... لە هەر کاتێکا بتەوێ... من تەنیا ئەوەندەم گەرەکە بتبینم... سڵاوێکت لێبکەم... دەڵێم: " خۆشم دەوێی " و ئەوسا دەڕۆم بەلای کاری خۆمەوە.

خانم ڤالتر، تیامابوو کە چی بڵێ وچی بکات، چونکە گالیسکەکە خەریک بوو دەگەییە ناو حەوشەکەی خۆیان، لەبن لێوانەوە بلەز گوتی:- زۆرچاکە، سبەی سەعات سێ ونیو، دەڕۆم بۆ کڵێسای ترینیتە.

دوای ئەوەی دابەزی بە گالیسکەچییەکەی گوت:- ئاغای دوروا بگەیەنەوە ماڵی خۆیان.

وەختایەک بۆ ماڵ زڤڕییەوە، ژنەکەی پرسی:- کێوە چوو بوویت؟

جۆرج، بە ئەسپایی گوتی:- چووم بۆ تەلەگرافخانە، پەیامێکی بەپەلەم هەبوو کە دەبوایە ڤرێی بکەم.

خانم دوماریل لێیان نزیک بووەوە وگوتی:- بیل ئامی، دەمگەیەنیتەوە بۆماڵی خۆم؟ دەزانی کە من تەنیا بەم مەرجە

بەمیوانی بۆ شوێنانی دوور دەڕۆم کە لە گەڕانەوەدا یەکێک بمگەیەنێتەوە.

ئەوسا ڕوویکردە مادلین وپرسی:- خۆ غیرە ناکەیت؟

مادلین بە سستی بەرسڤی دایەوە:- نە، نە زۆر.

میوانەکان خەریک بوون دەڕۆیشتن. خانم لاروش ماتیو قەلافەتی کارەکەرانی دێهاتی هەبوو. کیژی مەحزەردارێک بوو کە لاروش لەو کاتانەدا پارێزەرێکی سادە و بێدەسەلات بوو، ئەم شووی پێکردبوو. خانم ریسولن بەتەمەن و خۆهەڵکێش بوو، قەلافەتی لەو مامانە قەدیمیانە دەچوو کە کارەکانیان لە ڕێگەی کتێبانەوە و لە کتێبخانانەوە فێربوون. لاویکنتس دوپرسمور، بە کەش وفشەوە سەیری دەکردن وبەسەری قامکە سپیەکانی و بەبێتاقەتی تەوقەی دەگەڵ ئەم خەڵکەدا دەکرد.

کلوتیلد، بە جلە سەراپا تۆڕو تەنکەکانی کە لە دەرگاکە وەدەرکەوتن بە مادلینی گوت:- دەستخۆش، شامەکەت بەڕاستی شام بوو نە گاڵتە. تۆ ماوەیەکی دی، زۆریش ناخایەنێ، دەبیت بە خاوەنی یەکەمین سالۆن و دیوەخانی سیاسی پاریس.

هەرکە دەگەڵ جۆرج دا بە تەنێ مایەوە، بە خۆوەی گوشی وگوتی:- ئاه، بیل ئامی ئازیزم، ڕۆژ بەڕۆژ زیاترم خۆشدەوێی.

ئەو گالیسکەیەی کە ئەو جووتەی دەبرد وەکو کەشتی ڕێی دەکرد. ژنەی گەنج دووبارە گوتی: ئێرە بەهیچ کلۆجێ دەگەڵ ژوورەکەماندا نایەتە بەراوردکردن.

جۆرج، بەرسڤی دایەوە: " نەخێر. " بەلام لە دڵی خۆیدا بیری لە خانم ڤالتر دەکردەوە.

مەیدانەکەی بەردەم کڵێسای ترینیتە، لەبەر هەتاوی درەخشانی هەیڤی حەوتا، چۆڵی چۆڵ بوو. گەرمای تاقەتبەر، پاریسی لە زەواق نابوو. دەتگوت هەوای قورس وگەرم لە حەوێقی ئاسمانەوە بەسەر شارا دەڕژێ، هەواکەی لە کێشا نەبوو، قورس وگەرم، سیپەلاکی ئازار دەدا.

فوارەکانی بەردەم کڵێساکە بە خاوی دادەڕژان. دەتگوت ئاوەکە لە ڕۆیشتن ماندووبووە، شەکەت وبێزار. ئاوی ناو ئەستێڵەکە کە پارچە کاغەز وگەڵا مەلەیان بەسەرەوە دەکرد، کەمێک سەوز، چڕو لینج دەهاتە بەرچاو.

سەگێک خۆی بە حەوزەکەدا کردبوو وخەریک بوو لەم ئاوە ناسازگارەدا مەلەی دەکرد، چەند نەفەرێک کە لە سەر تەختە بەردینەکانی ناو باخچە بازنەییەکەی دەوروبەری دەرگای چوونە ژوورەوەی کڵێساکە ڕۆنیشتبوون، بە حەسوودییەوە تەمەشای ئەم حەیوانەیان دەکرد.

دوروا، تەمەشایەکی سەعاتەکەی کرد، هێشتا نەبووبوو بە سێ، واتە نیوسەعات زووتر هاتبوو. لەدڵی خۆیدا بە بیرۆکەی ئەم قەراری دیدارە پێدەکەنی. لەدڵی خۆیدا دەیگوت: " کڵێسایان بۆ خەڵکانی وەکو خانم ڤالتر، بەکەڵکی هەموو کارێ دێن. تەسەلابەخش دەرهەق بەوەی شووی بە کابرایەکی جوولەکە کردبوو، زەمینەخۆشکەر بۆ ناڕازی بوون لە دنیای سیاسەت، قوتابخانە وفێرگە بۆ فێربوونی ڕەفتاری شایستە وگونجاو لە کۆڕ و مەجلیسی ئەشرافیدا، پەناگا بوو، بۆ ژوان ودیدارە عاشقانەکانی. ئەلهەقی دەشێت کڵێسا بە پێی عادەت، لە کاتێن جۆراوجۆردا و بە مەبەستێن

جیاواز بەکار ببرێ و سوودی لێوەربگیرێت، ئەگەر هەوا خۆش بێ وەکو داردەست، ئەگەر هەتاوبێ وەکو چەتری هەتاوی، ئەگەر باران بێ وەکو سەیوانی ڕاستی و ئەگەر پیاو لە ماڵیش نەهاتە دەرێ لە ڕاڕەوەکەدا دایدەنێ. ژنانی وەکو ئەو زۆرن کە خوای گەورە بەهیچ نازانن، بەڵام ئامادەنین تاقە یەک وشەی خراپ دەربارەی خوا بڵێن و ئەگەر هەلیان بۆ هەڵبکەوێ، وەکو دەلاڵی عەشقبازی سوودی لێوەردەگرن. ئەگەر پێشنیازی ئەوەیان بۆ بکرێ بێن بۆ موتێلێک، ئەم کارە بەنەنگ و ڕیسوایی دەزانن، بەڵام عەشقبازیان لە پای میحرابێکدا پێ کارێکی تەواو بەجێیە.

بەخاوی بە دەوری ئەستێڵەکەدا پیاسەی دەکرد، ئەوسا تەمەشایەکی سەعاتی کڵێساکەی کەرد کە دوو دەقیقە لە پێش سەعاتەکەی ئەوەوە بوو و سەعات سێ و پێنج دەقیقە بوو.

بیری لەوە کردەوە ئەگەر لە ناو کڵێساکەدا چاوەڕوان بکات باشترە، وەژوورکەوت. هەوایەکی فێنک، وەکو هەوای ژێرزەمینانی بەرەو ڕوو هات، بە لەزەتەوە هەواکەی هەڵمژی، ئەوسا بە دەوراندەوری کڵێساکەدا سوڕایەوە، تا شارەزای شوێنەکە ببێت.

دەنگی هەنگاوێن دی، ڕێک وپێک بەڵام پچڕپچڕ، لەو سەری بینا مەزنەکەوە، وەڵامی هەنگاوەکانی ئەوی، کە لە ژێر تاقی بەرزی کڵێساکەدا دەنگی دەدایەوە. کونجکاوی و فزوڵیەت ناچاری کرد سەرێ بکێشێت تا بزانێ ئەوە کێیە کە پیاسە دەکات. کەوتە تاقیبی، پیاوێکی قەڵەوی سەرساف بوو، کە سەری بەرز گرتبوو، کڵاوەکەی بەدەستەوە گرتبوو و دەستەکانی نابوونە پشت سەری.

پیرەژنێک لێرە و یەکێک لەوێ، کەوتبووە سەرچۆکان و دەم وچاوی لە ناو دەستەکانی نابوو و خەریک بوو وێرد و دوعای دەخوێند.

هەستی ئاسوودەییەکی زادەی تەنیایی و بێدەنگی، ڕوحی پاراو دەکرد. ڕوناکییەک کە بە سەدەمی ئەوەی لە شووشە ڕەنگینەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، جۆرەها ڕەنگی لەخۆ گرتبوو، چاوی نەوازش دەکرد.

بەلای دوورواوە فێنکی هەوای ناو کڵێساکە " زۆر دڵگیر " بوو. هاتەلای دەرگای کڵێساکەوەو دووبارە ڕوانییە سەعاتەکەی. هێشتا نەبووبوو بە سێ وچارەک. لەبەر راپەوە سەرەکییەکەدا لە سەر تەختێک ڕۆنیشت، حەزی چووە جگەرە، بەڵام بۆی نەبوو لەوێدا جگەرە بکێشێت. لەوپەڕی کڵێساکە و لە نزیکی میحرابەکەدا، هێشتا دەنگی پێی پیاوە قەڵەوەکە دەهات.

نەفەرێک هاتە ناو کڵێساکەوە، جۆرج بلەز ئاوڕی لێدایەوە. ژنێکی ئۆمی بوو، تەنوورەیەکی پەشمینی لەبەر بوو، ژنێکی هەژار بوو، لەلای یەکەمین کورسییەوە چۆکی داداو جووڵەی لە خۆ بڕی، دەستەکانی پێکەوە جووت کرد، چاوی بڕییە باڵا وکەوتە وێرد و ڕاز ونیاز.

دوروا، بە تاسەوە تەمەشای دەکرد، لە دڵی خۆیدا دەیپرسی ئاخۆ چ پەژارەیەک، چ ڕەنجێ و چ نائومێدییەک ئەم دڵە زارە، ئازار دەدات. دیار وخۆیابوو کە نەداری و هەژاری بڕستی لێبڕیوە. ڕەنگە مێردێکی هەبێ نان وشەقی دەرخوارد بدات، یان منداڵێکی هەبێ و لە حاڵی مەرگا بێ.

لە بن لێوانەوە گوتی: " خەڵکانی بێنەوا، چما کەسێکیان تیا هەیە کە بێخەم وئازار بێ؟ " لە ناخی خۆیدا زۆر لە

تەبیعەت و سروشتی بێڕەحم و بێبەزەیی پەست و قەڵس بوو. ئەوسا لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە کە ئەم داماوانە بەلای کەمەوە وا تەسەور دەکەن، کەسێک لەو سەری سەرەوە هەیە کە لە خەمی ئەواندایە، ئەوانی لە بیرە، ڕەوشیان تۆمار دەکات و تەرازوو بە دەست مشووریان دەخوات. " لەو سەری سەرەوەیە " بەڵام لە کوێیە؟

دوروا، کە کپی وبێدەنگی کڵێساکە کردبوویە کارێک لە فکران ڕابچێت، بە دەم هەڵسەنگاندنی کارەکانی ئافەریدکارەوە، لەبن لێوانەوە گوتی: " بەڕاستی ئەم شتانە زۆر گەوجانە و هیچ و پووچن. "

دەنگی خشەخشی جل وبەرگ ڕایچڵەکاند. خۆی بوو.

لە جێی خۆی هەستا وبلەز بەرەوپیری چوو. خانم ڤالتر تەوقەی دەگەڵ نەکرد، تەنیا بەچپە گوتی:

– تەنیا چەند ساتێکم کات هەیە. دەبێ بە زووترین کات بگەڕێمەوە. لە تەنیشت منەوە چۆک دابدە، تا خەڵکی گومانمان لێنەکەن.

لە ڕاڕەوە لاوەکیەکەوە کەوتەڕێ، بۆجێگای لەبار و ئەمان دەگەڕا، دیارە شارەزای هەموو گۆشەو کەنارەکانی ئەوێندەر بوو. ڕوخسای لەپشت پەچەیەکی تۆڕینی ئەستوورەوە پەنهان بوو. هێندە بەخامۆشی ڕێی دەکرد، کە کەم وزۆر دەنگی پێیەکانی نەدەهات.

وەختایەک گەییە نزیک میحرابەکە، ئاوڕی لەو دایەوە، بە ڕاوێژێکی ڕازئامێز، کە زیاتر لە کڵێسادا بەکار دەبرێ گوتی:– گۆشە وکەناران باشترە، کەمتر دەکەویە بەرچاو.

لە هەنبەر میحرابەکەدا کڕنۆشێکی برد، ئەوسا بەلای ڕاستی میحرابەکەدا پێچی کردەوە، بۆ شوێنی هاتنە

ژوورەوەی ڕاڕەوەکە گەڕایەوە و بەجدی لە هەنبەر تەختێکی تایبەتی وێرد ودوعادا، چۆکی دادا.

جۆرجیش، لە تەنیشت ئەوەوە لە هەنبەر یەکێک لەو تەختە تایبەتیانەدا چۆکی دادا، هەرکە هەردووکیان بە حاڵەتی وێرد ودوعاوە، جووڵەیان لە خۆ بڕی، جۆرج گوتی:

- مەمنوونم کە هاتی. من دەتپەرستم. هەمیشە ویستوومە ئەمەت پێ بڵێم کە چۆن عاشقی تۆ بووم، چۆن کە یەکەم کەڕەت تۆم بینی شەیدا و مەفتوونت بووم... ڕێگەم دەدەیت کە ڕۆژێ گرێی دڵمت بۆ بکەمەوە وهەرچییەکی تیایە بۆتی هەڵڕێژم و پێتی بێژم؟

خانم ڤالتر، بە دەم بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، گوێی لە قسەکانی ئەو دەگرت، لە تۆوایە هیچ شتێک ناژنەوێت. لە میانی قامکەکانیەوە گوتی:- بەڕاستی من ئەقڵم لەدەست داوە کە ڕێگە بەتۆ دەدەم ئەم قسانە بەمن بڵێیت، شێتم کە هاتووم بۆ ئێرە، ئەمەی من دەیکەم شێتاتیە، شێتاتیە دەیەڵم تۆ وا وێنابکەی کە ئەم... ئەم بویەرە، ئەم ماجەرایە دەشێت بەردەوام بێ. هەموو ئەمانە لەمێشکی خۆتا بسڕەوە، فەرامۆشی بکە، دەبێ لە بیری خۆتی بەریتەوە و هەرگیز جارەکی دی ئەو قسانە لە گەڵ مندا نەکەیت.

دوای ئەم قسانە بێدەنگ بوو. جۆرج بۆ وەڵام، بۆ وشەێن چارەنووس ساز، پڕجۆش و خرۆش دەگەڕا. بەڵام چونکە هیچ وشەیەکی عەمەلی نەدۆزییەوە، تیا مابوو چ بڵێ، سەرەنجام گوتی:

- من چاوەڕوانی هیچ نیم... بەتەمای هیچ نیم، چاوم لەهیچ نییە. خۆشم دەوێی. هەرچیەکیش بکەی، ئەوەندە ئەم ڕستەیە دەڵێمەوەو هێندە بەکوڵ و بەدڵ دەیڵێم و دەیڵێمەوە

که سەرەنجام دەرکی بکەیت. دەمەوێ خۆشەویستیم بە سەرتا دابڕژێ، ڕوحت پاراو بکات، وشە بە وشە، سەعات بە سەعات، ڕۆژ بە ڕۆژ، تا سەرەنجام وەکو بادەیەکی مەستکەر بچکێتە ناخی ناختەوەو بوونتان داگیربکات، دڵتان نەرم بکات، سۆز و بەزەییت بجوڵێنێ، ناچارت بکات کە تۆش بە من بێژیت: " منیش خۆشم دەوێیت. "

شانەکانی خانم ڤالتر خەریک بوو دەلەرزین و سینگ و مەمکەکانی بلەز بەرز ونزم دەبوونەوە، سەرەنجام بە پچرپچڕی و زۆر بلەز گوتی: -منیش خۆشم دەوێ.

جۆرج، بەتووندی ڕاچڵەکی، وەکو ئەوەی جەزرەبەیەکی توند بەرسەری کەوتبێ، ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:

- ئاه! خودایا!

خانم ڤالتر بەدەم هەناسەبڕکێوە دووبارە گوتی:- یانی دەبوایە ئەم قسەیەت پێبڵێم؟ خۆم بە گوناحبار و سووک دەزانم. منێ کە... دوو کیژم هەن.... لێ ناتوانم... ناتوانم... باوەڕم نایەت... هەرگیز باوەڕم نەدەکرد... ئیدی ئەمە... لە دەسەلاتی من بەدەرە، لە سەرووی دەسەڵاتی منەوەیە... گوێ بگرە... گوێ بگرە... من هەرگیز کەسم... جگە لە تۆ... خۆش نەویستووە... سوێندت لەسەرم نییە، سوێندت بۆ دەخۆم جگە لە تۆ کەسی ترم خۆش نەویستووە. تۆم یەک ساڵ لەمەپێش، بەپەنهانی، لە کانگای دڵمەوە خۆش ویستووە. ئاه چەندم ڕەنج کێشا، چ هەوڵێک ما نەیدەم، بەڵام ئیدی ناتوانم، خۆشم دەوێ.

بە دەم گریانەوە ڕوخساری لە نێو هەردوو دەستی نا، ئازای لە حەژمەتاندا دەلەرزی.

جۆرج، لەبن لێوانەوە گوتی:- دەستم وێدە، تا بیگرم، بیگوشم...

خانم ڤالتر، بە ئەسپایی دەستێکی لە سەر ڕوخساری لابرد. جۆرج سەیری کرد گۆنای لە هێستردا ( ڕوندک، فرمێسک، عەسر، ئەشک ) تەڕ بووە ودڵۆپە ڕوندکێکی دی بەنووکی برژانگەکانیەوە ئاوێزانە و لە ئان و ساتدایە کە بەربێتەوە.

دەستی خانم ڤالتری گرت وگوشی:- چەند حەز دەکەم فرمێسکەکانت بخۆمەوە.

خانم ڤالتر، بە دەنگێکی نەوی و شکاو کە پتر لە ناڵە دەچوو گوتی:- لاوازی من بە هەل مەزانە، کۆنترۆڵی خۆم لە دەست داوە.

جۆرج، حەزیدەکرد بزەیەک بکات. چۆن دەیتوانی لەو شوێنەدا سوئی ئیستیفادە لەلاوازی ئەو بکات؟ دەستی ئەوی نایە سەردڵی خۆی و پرسی: " هەست بەلێدانی دەکەیت؟ " ئیدی ڕستە سۆز بزوێنەکانی تەواو بووبوو.

بەڵام تۆزێ لەوەپێش دەنگی ڕێک وپێکی پێیەکانی پیاوە قەڵەوەکە نزیک دەبووەوە، هەموو شوێنەکانی بەلای کەمەوە بۆ جاری دووەم تەی کردبوو و لە ڕاڕەوێکی بچووکترەوە بۆ ئەوێ دەهات. خانم ڤالتر، وەختایەک دەنگی پێی ئەوی لە نزیکی ئەو پایەیەوە کە خۆی لەپەنایا حەشار دابوو، ژنەوت، دەستی لە دەستی جۆرج دەرهێنا و دووبارە نای بە ڕوخسارییەوە.

هەردووکیان، بە چۆکا هاتبوون، دەتگوت بە جووتە لە بەر قاپی خوا دەپاڕێنەوەو لاڤە دەکەن. پیاوە قەڵەوەکە بەلایاندا بووری، نیگایەکی خەمساردانەی کردن، کڵاو

بەدەست، دەستی لەپشتی نابوو وبەرەو دەرگای دەرێ دەڕۆیشت.

لێ دوروا، کە بە تەمای ئەوە بوو قەراری دیدارێک لە شوێنێکی دی، لە دەرێی کڵێسا دابنێ، لەبن لێوانەوە گوتی: - سبەی لە کوێ دەتوانم بتبینم؟

خانم ڤالتر، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. دەتگوت روحی لەبەر نییە، بووبوو بە پەیکەرێک لە وێرد ونزا.

جۆرج دووبارە گوتی:- حەزدەکەی سبەینێ لە پارکی مونسو یەکدی بدینین؟

خانم ڤالتر، ڕووی بۆلای ئەو وەرگێڕا، ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، هێڵەکانی دەم وچاوی لە نیگەرانی و نارەحەتیدا تێکڕژابوو، بە ڕاوێژێکی پچڕپچڕ گوتی:

- وێڵم کە... جارێ وازم لێبێنە ولێرە بڕۆ، تەنیا پێنج خولەک کە لەگەڵ تۆدام هەست بە عەزاب دەکەم... دەمەوێ لاڤە و دوعا بکەم... ناتوانم... لێرە بڕۆ... واز بێنە با دوعا بکەم. بەتەنیا... پێنج خولەک... ناتوانم... وازبێنە با لەبەر قاپی خوا بپارێمەوە، بمبورە... نەجاتم بدە... واز بێنە... پێنج خولەک...

ڕوخساری هێندە ماندوو بوو کە دوروا بێئەوەی تاقە وشەیەک بڵێ، لە جێی خۆی هەستا، ئەوسا بە سووکە دوو دڵییەکەوە پرسی:- بڕۆم و دوای کەمێکی دی بگەڕێمەوە؟

خانم ڤالتر، سەرێکی لەقاند کە ماناکەی ئەمە بوو: " بەڵێ، تا چەند خولەکێکی دی. " هەنگێ جۆرج بەرەو ئەو سەری کڵێساکە وبۆ شوێنی دەستەی سروود خوانان کەوتەڕێ.

خانم ڤالتر، کاتێ بە تەنیا مایەوە، هەوڵیدا دوعا بکات، هەوڵێکی لە ڕادەبەدەری دا تا داوای کۆمەک لە خودا بکات، بە جەستەی لەرزان و ڕوحی سەرگەردانەوە ڕوویکردە ئاسمان و هاواریکرد: " ڕەحم بکە! " .

بە تووڕەیی چاوەکانی نوقاند تا ئەو کەسەی کە لێی دوور کەوتبووەوە، جارەکی دی نەبینێتەوە! ئەوی لە زەینی خۆی وەدەرنا، کەوتە دژبەری ئەو، بەڵام لە جیاتی مەدەدی ئاسمانی کە لە دڵەی غەمگین و ماندوویدا بەتەمای بوو، جگە لە سمێڵە قیت و بادراوەکانی جۆرج، هیچی دیکەی نەدەهاتە بەرچاو.

یەک دانە ساڵی خشت بوو، شەو ورۆژ دژی ئەم وەسوەسە ڕوو لە زیادیە، خەبتی بوو، دژی ئەم وێنەیە کە لە خەویشیا دەستبەرداری نەدەبوو، جەستەی لە ئاشووبا هەڵدەکێشا و خەوی شەوی لێحەرام دەکرد، دەجەنگی. ئیدی نەیدەتوانی دوعا ولاڤە بکات، جگە لەو نەکەسی لە خەیاڵ بوو نە بیری لە کەسی دی دەکردەوە.

حاڵی حازریش پەرۆشی ئەوەبوو کە لەو دوور کەوتبووەوە، وێڕای ئەمەش، بێهودە هەوڵی دەدا، دەخەبتی، خۆی هاندەدا و بەهەموو بوونی خۆیەوە داوای کۆمەکی دەکرد. لە ناخی دڵەوە حەزی دەکرد بمرێت وبەمجۆرە ڕادەستی هەوا وهەوەسی بەدەنی نەبێت، ئەوێ کە عەمرێک بوو هەڵەیەکی نەکردبوو. ئیدی هەندێ وشەی پاڕانەوە ئامێزی بەکار دەبرد کە بەخۆیشی لە مانایان حاڵی نەدەبوو و لە هەمان کاتا گوێی لە دەنگی پێی جۆرج بوو کە بە ژێر تاق و گومەزی بەرزی کڵێساکەدا دوور دەکەوتەوە.

ئیدی بۆی دەرکەوت کە هەموو شتێک کۆتایی هاتووە، هەوڵ وتەقەللا فایدەی نییە! وێڕای ئەمەش نەیدەویست ڕادەست بێت. تووشی حەملەیەکی عەسەبی بوو کە ژنان بەدەم لەقەفرتێ و هاوارەوە لە سەر زەوی دەتلێنێتەوە. ئازای بەدەنی دەلەرزی، هەستیدەکرد، خەریکە خۆی بەپێوە ناگرێت و دەکەوێتە سەرزەوی ولەبەینی کورسیەکاندا بتلێتەوە و هاواری ترسناک بکات.

نەفەرێک بە هەنگاوی هەڕاوەوە، بەپەلە نزیک دەبووەوە. ئاوڕی لێدایەوە. کابرایەکی قەشە بوو. هەنگێ لەجێی خۆی هەستا. بەغاردان بەرەو ئەو چوو، هەردوو دەستی تێک هاڵاند و بەپچڕپچڕی گوتی: " نەجاتم بدە! نەجاتم بدە! "

کابرای قەشە حایر وحەپەساو ڕاوەستا: - چ ئەمرێکت هەیە خانم؟

- دەمەوێ نەجاتم بدەیت. ڕەحمم پێدا بکە، ئەگەر فریام نەکەوی، تیا دەچم.

قەشەکە تەمەشایەکی کرد و لە دڵی خۆیدا پرسی: ئایا ئەم ژنە شێت نییە؟

دووبارە پرسی:- من دەتوانم چیت بۆبکەم؟

پیاوێکی گەنج بوو، باڵابەرز، کەمێک قەڵەو، گۆناکانی پڕ وکەمێک داچەکیو، ڕدێنی پاک تاشی بوو، بە ئاستەم هاتبووەوە، یەکێ بوو لەو قەشە بەشەخسیەتە شارنشینانەی گەڕەکێکی دەوڵەمەندنشین وخۆشگوزەران کە دەگەڵ ئەم جۆرە لاڤە و پاڕانەوە ومەغفیرەت خوازیانەی خەڵکانی پارەدارا ڕاهاتبوو.

- گوێ لە ئیقرارەکانم بگرە، ڕێنوێنیم بکە، پشتیوانیم بکە وپێم بڵێ چ بکەم.

قەشەکە بەرسڤی دایەوە:- من هەموو هەفتەیەک، ڕۆژانی شەممە لە سەعات سێوە تا شەش گوێ لە ئیقراری باوەڕداران دەگرم.

خانم ڤالتر، باسکی ئەوی گرت، بە دەم گوشینی باسکی ئەوەوە بەردەوام دەیگوت:

- نا، نا، هەرئێستا! زۆر زەروورییە! ئەو لێرەیە، لە ناو ئەو کڵێسایەیە چاوەڕوانمە.

قەشەکە پرسی:- کێ چاوەڕوانتە؟

- پیاوێک... پیاوێک کە دەیەوێ ئابڕووم بەرێ، داوێنم لەکەدار بکات، ئەگەر تۆ نەجاتم نەدەیت، فریام نەکەویت، ناتوانم لە چنگی دەرباز ببم... من کەسێکی زۆر لاوازم، زۆر لاوازم، زۆر لاواز و بێ توانا....

بەدەم گریانەوە لە بەردەمیا چۆکی دادا:

- باوکی روحانی ڕەحمم پێدابکە! فریام بکەوە، لەبەر خاتری خوا نەجاتم بدە!

داوێنی قاپووتە ڕەشەکەی کابرای قەشەی گرتبوو کە لە دەستی دەرنەچێ و، کابرای قەشە بەنیگەرانی و دوو دڵی دەیڕوانییە دەوروبەر کە نەبا خەڵکانی بەدجسن و ناڕەسەن یان وشکە دیندارێک ئەو ژنە بدینن کە لە بەردەمیا بەچۆکا هاتووە.

چونکە لە ئەنجاما بۆی بە دیارکەوت کەن اتوانێ لە دەست ئەم ژنە دەرباز بێ گوتی:

- زۆر چاکە، هەستە، بەڕێکەوت کلیلی ژووری ئیقرار و ئیعترافم لەلایە. ئەوسا دەستی بەگیرفانیاکرد و دەستەیەک کلیلی دەرهێنا، یەکێکیانی هەڵبژارد وبەهەشتاو بەرەو ژووروچکەیەکی دارین چوو کە زبڵدانی گیانە پەشێوەکان

بوو، ئەو شوێنە بوو کە خەڵکانی باوەڕدار، گوناحەکانیان لەوێندەر خاڵی دەکرد.

قەشەکە، لە دەرگای ناوەڕاستەوە وەژوورکەوت و دەرگای لە خۆی داخست. خانم ڤالترش، بە هەشتاو خۆی بە ژوورۆچکە تەنگەکەدا کرد و بە پەرۆشەوەو بە پچرپچری گوتی:

- باوکی روحانی داوای بوردنم بۆ بکە، چونکە گوناحم کردووە.

دوروا، پاش ئەوەی فەرەیەکی بە دەوری شوێنی سروودخوانەکاندا کرد، لە راڕەوێکی لاوەکییەوە بەسەمتی چەپا گەڕایەوە.

لە ناوەندی راڕەوەکەدا تووشی کابرا قەڵەوە سەرسافەکە بوو کە هێشتا بە کاوەخۆ هەر پیاسەی دەکرد. لە خۆی پرسی:- ئەم پیاوە لێرە چ دەکات؟

کابرای قەڵەویش، پێی قورس کرد و تەمەشای جۆرجی کرد، وادیاربوو دەیویست قسەی دەگەڵدا بکات. وەختێ بەتەواوی لە جۆرج نزیک بووەوە، سڵاوی لێکرد و بە ئەدەب و نزاکەتەوە پرسی:

- ببورە ئاغا، زەحمەت نەبێ پرسیارێک، دەزانی ئەم کڵێسایە لە چ سەردەمێکا دروستکراوە؟

دوروا بەرسڤی دایەوە:- ڕاستت دەوێ منیش زانیارییەکی ئەوتۆم لەبارەیەوە نییە، پێموایە تەمەنی بیست، بیست و پێنج ساڵێک دەبێت. ئەمە جگە لەوەی ئەمە یەکەمجارمە کە دیمە ئەم کڵێسایە.

- منیش هەرگیز ئەم کلێسایەم نەدیتووە.

دوروا، که فزوڵیەتی پیشەیی هارۆژابوو پرسی:- وام دێتە بەرچاو زۆر بە وردی دیقەتی وردەکاریەکانی دەدەیت.

کابرای قەڵەو، بە نەبەدڵی گوتی:

- دیقەتی کڵێسا نادەم، چاوەڕوانی ژنەکەمم، کە قەرار وابوو لێرە یەکدی بدینین و وا زۆر ماتەڵ بووە.

سووکە هەڵوەستەیەکی کرد و دووبارە گوتی:- هەوای دەرەوە زۆر گەرمە.

دوروا، کەوتە تەمەشاکردنی ئەو، سەروسیمایەکی باشی هەبوو، لە ناکاوا بیری کەوتەوە کە زۆر لە فورستیە دەچێت. لێی پرسی:- تۆ خەڵکی شارستانی؟ ( شارستان: شارئاسا، شارۆچکە و گوندەواری سەر بە مەرکەز و ناوەندی هەر ئوستانێک ).

- بەڵێ، لە ڕین دەژیم. ئەدی تۆ قوربان، لە ڕووی کونجکاوییەوە خۆت بەم کڵێسایەدا کردووە؟

- نە، منیش چاوەڕوانی ژنێکم.

ئەوسا سلاوێکی لێکرد و بەدەم زەردەخەنەوە دوورکەوتەوە.

کە گەییە نزیک دەروازەی هاتنەژوورەوە، ژنەی بێنەوا هێشتا هەرچۆکی دادابوو، دوعای دەکرد. بەخۆی گوت: " زۆر خەمی گیرابوونی دوعاکانیەتی. " ئیدی بەزەیی پێدا نەدەهاتەوە، دڵی بەحاڵی نەدەسووتا. بەلایا ڕەت بوو و بە ڕاڕەوەکەی دەستە ڕاستا، بە ئارامی بەرەو کۆتایی کڵێساکە ڕۆیی تا خانم ڤالتر بدۆزێتەوە.

لە دوورەوە کەوتە تەمەشاکردنی ئەو شوێنەی کە پێکەوەو لە تەنیشت یەکەوە بە چۆکا هاتبوون، زۆری پێ سەیر بوو کە خانمی نەبینی، پێی وابوو پایەکەی لێ

تێکچووە. تا نزیکی دواپایە ڕۆیی و دووبارە گەڕایەوە. خانم ڤالتر ڕۆیی بوو. حایر وحەپەساو وتووڕە ڕەق ڕاوەستا. ئەوسا بیری کردەوە کە ڕەنگە ئەویش بەدوای ئەمدا بکەڕێ. دووبارە، لە ڕاڕەوە لاوەکییەکەوە بە دەوری کڵێساکەدا سوڕایەوە. کە خانمی نەدۆزییەوە، ڕۆیی لە سەر هەمان کورسی کە خانم ڤالتر لە سەری ڕۆنیشتبوو، دانیشت، چاوەڕوانی کرد تا ئەویش بێت.

دوای تۆزێک، دەنگی چپەچپ و زەمزەمە سەرنجی ڕاکێشا. کەسی لەم سووچەی کڵێساکە نەبینی بوو. ئەدی ئەم ڕاز ونیازە لە کوێوە دەهات؟

هەستا وکەوتە تاقیبکردنی سەرچاوەی ئەم ڕاز ونیازە، لە نوێژخانەکەی تەنیشت ڕاڕەوەکەوە چاوی بە ژوورۆچکەی ئیقرار کردنەکە کەوت. چمکی کراسێک لە دەرەوە مابوو و کەوتبووە سەر ئەرزەکە. چووە پێشێ تا بزانێ هی کێیە. کراسەکەی خانم ڤالتر بوو، کەواتە خەریکی ئیعتراف کردن بووا..

مەیلێکی توندی لا چێبوو کە بڕوات لە شانەکانی بنەوێ و لە ژوورۆچکەکە بیهێنێتە دەرەوە. ئەوسا بەخۆی گوت: ˝ قەیدی نییە! ئەمڕۆ نۆرەی قەشەیە کە گوێ لە ئیعترافەکانی بگرێت و سبەی نۆرەی منە. ˝ لە هەنبەر ژوورۆچکەکە و لە سەر کورسییەک ڕۆنیشت و بەئارامی چاوەڕوانی دەکرد، حاڵی حازر گاڵتەی بەم بەزمە دەهات.

زۆری پێچوو، ئەنجام خانم ڤالتر هەستا و لە ژوورۆچکەکە هاتەدەرێ کە ئەوی بینی بەرەو ڕووی هات. حاڵەتی سەروچاوی سارد وجدی بوو. پێی گوت:

– ئاغا، تکا دەکەم لە گەڵما مەیە، دوام مەکەوەو هەرگیز بەتەنیا بۆماڵی ئێمە مەیە. دەنا پێشوازیت ناکەم، ئیدی ئۆباڵت بە ئەستۆی خۆت. خواحافیز!

بە ڕەفتارێکی سەلار و سەنگینانە لەو دوورکەوتەوە.

جۆرج وازی لێهێنا کە بڕوات، چونکە لە نیەتیا نەبوو بە خورتی ناچاری بکات. ئەوسا کە قەشەکەش نە هەڵچوونەوە لە ژوورۆچکەکە هاتەدەرێ، بەرەو ڕووی ڕۆیی، چاوی لە دورچاوانی بڕی، سەری لێبردە پێشەوە وگوتی:- ئەگەر ئەم جبەیەت لەبەردا نەبوایە، دوو زللەی ئاودارم بەدەم وقەپۆزی چەپەڵتدا دەکێشا.

ئەوسا پشتی کردە قەشەکە و بەدەم فیکە لێدانەوە لە کڵێساکە وەدەرکەوت.

پیاوە قەڵەوەکە، لە دەرێی کڵێساکە، لە ژێر چەتر وساباتی سەر دەرگای هاتنە ژوورەوەکە، وەستابوو. کڵاوەکەی نابووە سەری و هەردوو دەستی نابوونە پشتی خۆی، شەکەت و ماندووی چاوەڕوانی، تەمەشای مەیدانە فراوانەکە و ئەو کوچە وکۆڵانانەی دەکرد کە دەهاتنەوە سەر مەیدانەکە.

وەختایەک دوروا بەلایدا بووری، بە ئاماژەی سەر سڵاوێکی دۆستانەیان لێکدی کرد.

جۆرج، کە هیچ کارێکی دیکەی بەدەستەوە نەبوو، بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە ڕۆیی. هەرکە وەژوورکەوت و چاوی بەسەر وسیمای مژوولی هاوکارەکانی کەوت، یەکسەر تێگەیی کە بویەرێکی نائاسایی ڕوویداوە، بۆیە یەکڕاست بۆ ئۆفیسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە ڕۆیی.

بابا ڤالتر، بە توورەیی وەستابوو و بە پچڕپچڕی وتارێکی دەخوێندەوە. بە دەم ڕستەکانەوە، هەندێک ئەرکی بە سەر پەیامنێرەکانی دەوروبەریا دەدا، هەندێک ڕێنوێنی بوارنار ی دەکرد و سەری زەرفەکانی هەڵدەپچڕی.

وەختایەک دوروا وەژوورکەوت، سەرۆک لە خۆشیا هاواریکرد:- ئاە، چ شانسێک، ئەمەش بیل ئامی!

بە جۆرە شەرمێکەوە قسەکەی بڕی و بە ڕاوێژێکی تەوازی خوازانەوە گوتی:

- ببورە کە بەو ناوەوە ناوم بردیت، ئەو ڕەوش و پێشهاتەی هاتووەتە پێشێ زۆری پەرێشان کردووم. ئەمە جگە لەوەی لە بەیانیەوە تا شەوێ گوێم لە ژن ومنداڵەکانمە کە بە بیل ئامی ناوت دەبەن، ئیدی منیش دەمم بەوە ڕاهاتووە. خۆ لێم زویر نیت؟

جۆرج، پێکەنی وگوتی:- بە هیچ کلۆجێ. ئەم نازناوە هیچی تیا نییە کە نیگەران و ناڕەحەتم بکات.

ئاغا ڤالتر، درێژەی بە گوتەکەی دا:- دەی باشە، منیش وەکو هەمووان، بە بیل ئامی ناوت دەبەم. ئێ مەسەلەکە ئەمەیە کە هەندێک مەسەلەی گرینگمان لەبەردەمە. حکومەت بە سێ سەد و دە ڕەئی دژ، لە هەنبەر سەد و دوو ڕەئی ڕازی کەوت. پشووەکانمان دووبارە دواکەوتووە، کەوتە کاتی.... و ئەمڕۆ ۷/۲۸ ە. ئەسپانیا لە ماجەرای مەراکش توورەیە و، ئەم مەسەلەیە بووە بایسی ڕوخانی حکومەت. هەموومان کەوتووینەتە کێشە. مارۆ، بۆ دامەزراندنی حکومەتی تازە هاتووەتە ڕاسپاردن. جەنەڕاڵ بوتین داکر بۆ پۆستی وەزارەتی بەرگری و لاروش ماتیو بۆ پۆستی وەزارەتی دەرەوە هەڵدەبژێرێت. پۆستی وەزارەتی ناوخۆ

بۆخۆی دادەنێت. ئێمەش، تەقریبەن دەبین بە ڕۆژنامەی نیمچە فەرمی حکومەت. من خەریکم سەر وتارەکە دەنووسم، کە بریتیە لە دەربڕینی بۆچوونێکی سادە و دیاریکردنی ڕێکار و بەرنامەی ئایندە بۆ وەزیرەکان.

بزەیەکی کرد و لە سەری ڕۆیی:

– دیارە ڕێکار و بەرنامەیەک دەگرنەبەر. بەلام من بۆ مەسەلەی مەڕاکش شتێکی جوان و سەرنجڕاکێشم دەوێ، هەواڵێکی گەرمی ڕۆژ، خەبەرێکی کاریگەر، هەیەجان وڕوژێن، وەلحاڵ نازانم چی. تۆ ئەوەم بۆ تەرتیب بکە.

دوروا، کەمێک لە فکران ڕاچوو، پاشان گوتی:

– سەرەداوەکەم دۆزیوەتەوە. لێکۆڵینەوەیەکی تەواو دەربارەی پێگەی رامیاری کۆلۆنیەکانی ئەفریقامان ئامادە دەکەم، ئەو کۆلۆنیانەی کە تونس کەوتووەتە سەمتی چەپیانەوە، جەزایر لە ناوەڕاست ومەراکش لە سەمتی ڕاست، کورتە مێژوویەکی ئەو نەژاد و ڕەگەزەی کە لەم دەڤەرە بەرینەدا دەژی و، ڕاپۆرتێکی توریستی لە خاکی مەراکشەوە تا ئاوایی گەورەی فیگیگ کە تاکو نها، پێی هیچ ئەورووپاییەکی پێ نەگەییوە و حاڵی حازر جێگەی هەڤڕکییە، دەنووسم. ئەمەت بەدڵە؟

بابا ڤالتر، بە خۆشحاڵییەوە هاواریکرد:– عالە، ناونیشانی وتارەکەت چییە؟

– لە تونسەوە تا تەنجە.

– زۆرچاکە.

دوروا، چوو بۆ ئەرشیڤخانەی ڕۆژنامەکە، تا ئەو ژمارەیە بدۆزێتەوە کە یەکەمین وتاری خۆی بە ناونیشانی: "بیرەوەری سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە

ئەفریقا " ی تیا بڵاوکرابووەوە، تا سووکە دەسکارییەکی بکات و وتارێکی تازەی لێوە هەڵێنجێ، چونکە هەمان مەسەلەی سیاسەتی کۆڵۆنیالی لە ئەفریقا، دەربارەی خەڵکی جەزایر و گەشت وگوزاری لە " ویلایەتی ئوران "ی تیا باسکرابوو.

لە زەرفی سێ چارەکە سەعاتدا کارەکە تەواو بوو، پەرەگراف و بابەتە سەرەکیەکان درانە دەم یەکەوە، هەوێنی خەبەری ڕۆژ و، ستایشی کابینەی تازەشی خرایە سەر.

سەرۆک، وتارەکەی خوێندەوە و ئەوسا گوتی:- عالە... عالە. تۆ پیاوێکی گەورەو بەتوانای، دەستخۆش، ئافەرین.

دوروا، هەرچەندە لە کڵێسای ترینیتەدا ناکام بوو، بەڵام ئەو ڕۆژەی بە یەکێک لە ڕۆژە خۆشەکانی ژیانی خۆی دەزانی، بەدڵخۆشی بۆ شام کردن بۆ ماڵ گەڕایەوە. سەبارەت بە خانم ڤالتر، هیچ نیگەران نەبوو، چونکە سوور دەیزانی ئەم نچیرە درەنگ یان زوو بە پێی خۆی بۆلای ئەم دەگەڕێتەوە.

ژنەکەی، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی بوو. هەرکە چاوی پێکەوت بە هەڵچوونەوە گوتی:

– دەزانی لاروش بوو بە وەزیری دەرەوە؟

– بەڵێ، تۆزێ لەمەپێش وتارێکم لەمبارەیەوە، دەربارەی جەزایر نووسی

– چ وتارێک؟

– تۆش دەیزانی. هەمان ئەو وتارەیە کە یەکەمجار پێکەوە نووسیمان: " بیرەوەری سەربازێکی سوارەی ماموری خزمەت لە ئەفریقا " و سووکە دەسکاری و

پێداچوونەوەیەکم بۆ کردووە کە دەگەڵ ئەم ڕەوش و هەڵوێستەی ئێستادا بگونجێت.

مادلین بە دەم زەردەخەنەوە گوتی:- زۆرچاکە.

دوای بیرکردنەوەیەکی کەم، درێژەی بە قسەکەی دا:

- دەزانی، من پێموایە، هەقە درێژە بەو وتارە بدەین کە ئەوسا تۆ وازت لێهێنا... زنجیرە وتارێکی باش و بابەتی ئەمڕۆی لێدەردەچێت.

دوروا، لە پشت مێزەکەوەو لە هەنبەر قاپە سووپەکەی بەردەمیا ڕۆنیشت وگوتی:- زۆر ڕاستە، نها کە ئەم فورستیە قورمساغە گۆڕ بەگۆڕ بوو، ئیدی هیچ کۆسپێک لەبەردەم درێژەدان بەم کارە نەماوە.

مادلین، بە ڕاوێژێکی کەسەردار وتووڕەوە، بە توندی گوتی:

- ئەم گاڵتەیە، لە نابەجاییش زیاترە. تکات لێدەکەم لەوەی پتر لە سەری مەڕۆ، دووبارەی مەکەوە. دووبارەی بکەیتەوە مانای وایە...

دوروا، دەیویست وەڵامێکی تەنزئامێز بداتەوە، لێ لەو ساتەدا بروسکەیەکی بێ ناو وئیمزایان دایە دەستی بەم ناوەڕۆکە: " بەدەستی خۆم نەبوو، داوای بوردن دەکەم، سبەی سەعات چواری دوانیوەڕۆ وەرە بۆ پارکی مونسو. "

مەسەلەکە خویا بوو، کاغەزەکەی لەبەرکی نا وبەدڵێکی شادەوە بە ژنەکەی گوت:

- ئیدی ئەم شۆخیە دووبارە ناکەمەوە گیانەکەم. بەڕاستی گەوجانەیە، هەق بە تۆیە، تۆ ڕاست دەکەیت.

و دەستی بە خواردنی شێوەکەی کرد. بە دەم نان خواردنەوە ئەم چەند وشەیەی لە دڵی خۆیدا دەگوتەوە: " بە

دەستی خۆم نەبوو، بمبورە، سبەی سەعات چواری پاش نیوەڕۆ وەرە بۆ پارکی مونسۆ "، کەواتە هاتبووە ڕەدا، ڕادەست بووبوو، مانای پشتەوەی ئەم ڕستانە ئەمە بوو: " خۆمت ڕادەست دەکەم، من هی تۆم، لە هەرشوێن و لە هەر کاتێکا تۆ بتەوێ. "

دەستی بە پێکەنین کرد.

مادلین پرسی:- مەسەلە چییە، بۆ پێدەکەنی؟

- هیچ نییە، قەشەیەکم بیرکەوتەوە کە چەند سەعاتێک لەمەبەر تووشی بووم و قەڵافەتێکی سەیری هەبوو.

دوروا، بۆ سبەی لە سەعات چواردا چوو بۆ ژوانگە. خەڵکانی بێکار و وەڕەزی دەستی گەرما هەموو تەختەکانیان گرتبوو، یان سەرپەرشتیار و دایەنانی منداڵان، کە لە خەون و خەیاڵانی خۆدا نقوم بووبوون و لە هەمان کاتدا ئەو منداڵانانەنی کە پێیان بوون و لە ناو لمەکاندا خۆیان تل دەدا، هەموو تەختەکانیان گرتبوو.

خانم ڤالتری لە خەرابەیەکی کۆنی چکۆلەدا دۆزییەوە کە چاڤکانیەکی بە نێودا دەڕۆیی. بە سەروسیمایەکی نیگەران و پەرێشانەوە بە دەوری هەندێ کۆڵەکە و پایەی بچووکی بینایەکی کۆندا پیاسە و ڕاوێچکەی دەکرد.

هەرکە سڵاوی لێکرد، خانم ڤالتر گوتی:- ئەم پارکە چەند قەرەباڵغ و جەنجاڵە.

دوروا، لە سەر کەڤرێک ڕۆنیشت و گوتی:- ڕاست دەکەی، حەز دەکەی بۆ شوێنێکی دیکە بڕۆین؟

- بۆ کوێ؟

- بۆ هەرشوێنێ بێ، بۆنموونە ناو گالیسکەیەک، پەردەی پەنجەرەکەی لای خۆت دادەیەوەو خەیاڵت ئاسوودە بێت.

- بەڵێ، ئەوەم پێ باشترە، لێرە خەریکە لە ترسا زیڕەی مەرگ دەکەم.

- زۆر چاکە، تا پێنج خولەکی دیکە وەرە بەر ئەو دەرگایەی بەلای بولڤارە بازنەییەکەدا دەکرێتەوە. من لەوێ بە گالیسکەیەکی سەر بە چادرەوە چاوەڕوانت دەکەم.

وبە هەشتاو بەرەو دەرگای چوونە دەرەوە ڕۆیی.

خانم ڤالتر پاش ئەوەی سواری گالیسکەکە بوو وپەردەکەی لای خۆی دادایەوە، پرسی:- بە گالیسکەچییەکەت گوتووە بۆ کوێمان بەرێت؟

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- کارت بەم کارانەوە نەبێ، ئەو خۆی دەزانێ دەبێ چ بکات.

ناونیشانی ئاپارتمانەکەی شەقامی کونستانتینوپلی بە گالیسکەچییەکە دابوو.

خانم ڤالتر، دووبارە گوتی:- مەگەر هەرخوا بزانێ چ ئەزیەتێک لەبەخاتری تۆ دەخۆم، لە چ عەزاب و ئەشکەنجەیەکدام. دوێنێ لە کڵێساکەدا زۆر بە زبری ڕەفتارم کرد، بەڵام دەمویست بەهەر نرخێ بووە لە تۆ دووربکەومەوە. دەترسام بەتەنیا لەگەڵ تۆدا بمێنمەوە، لێم بوراوی؟

دوروا، دەستەکانی گوشی وگوتی:

- بەڵێ، من بەڕادەیەک خۆشم دەوێی، نەک هەر لەو ڕەفتارەت دەبورم، هەرشتێکی دیکەش لەلایەن تۆوە بکرێ ئامادەم چاوپۆشی لێبکەم.

خانم ڤالتر، نیگایەکی لاڤە ئامێزی کرد وگوتی:

- گوێ بگرە، دەبێ بەڵێنم بدەیتێ ڕێزم بگریت... سەبارەت بە من... سەبارەت بەمن... زەنت خراپ نەبێ... ئەگەر وانەبێ، چیتر ناتوانم بتبینم.

جۆرج، لە سەرەتادا هیچ بەرسڤێکی نەدایەوە، هەمان ئەو بزەیەی بەسەر لێوەوە بوو کە ژنانی ئەفسوون دەکرد. ئەوسا لەبن لێوانەوە گوتی:- من خولامی تۆم.

هەنگێ خانم ڤالتر، گێڕایەوە کە چۆن پاش ئەوەی بیستی دەیەوێ دەگەڵ مادلین فورستیە دا زەماوەند بکات، عاشقی ئەو بووە، ئەم مەسەلەیەی بە هەموو وردەکارییەکانییەوە دەگێڕایەوە، وردەکاریانی پەیوەست بە ڕۆژان وکۆمەڵێک مەسەلەێن تایبەتی دیکە.

لە ناکاوا بێدەنگ بوو. گالیسکەکە وەستابوو. دوروا دەرکی گالیسکەکەی کردەوە.

خانم ڤالتر پرسی:- لە کوێین؟

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- وەرە خوارێ و بڕۆرە ئەم خانووەوە، لەوێ ئاسوودەتر دەبین.

- بەڵام ئێرە کوێیە؟

- خانووی خۆمە... ئاپارتمانی دەورانی زوگورتیاتیمە کە بۆماوەی چەند ڕۆژێک دووبارە بە کرێم گرتووەتەوە، تا پەناگەیەکی خەڵوەت و چەپەکمان هەبێت و بتوانین، بێخەم وخەیاڵ یەکدی ببینین.

خانم ڤالتر، زۆر لەوە دەترسا بە تەنێ لەگەڵ ئەودا بمێنێتەوە، خۆی بە گالسیکەکەوە چەسپاندبوو، بەدەم دەمەلاڵکێوە دەیگوت:- نا، نا، نامەوێ، نامەوێ.

جۆرج، بە ڕاویژێکی ئامیرانە وتووند گوتی:

- سوێند دەخۆم ڕێزت دەگرم. وەرەخوارێ، ئەوەتا خەڵکی خەریکە سەیرمان دەکەن، کاتێکت زانی لە دەورمان خڕ دەبنەوە. پەلە بکە... پەلە بکە، وەرە خوارەوە.

دووبارەی کردەوە:- سوێندت بۆ دەخۆم ڕێزت دەگرم.

خاوەن دووکانێکی شەرابفرۆشی، بەکونجکاوی تەمەشای دەکردن. خانم ڤالتر، بەترس و لەرزەوە خۆی بە ڕاڕەوی خانووەکەدا کرد. دەیویست بە پلیکانەکاندا سەربکەوێت، لێ جۆرج توند بازوی گرت وگوتی:- ئێرەیە، لە نهۆمی خوارەوەیە.

پاڵی نایە ناو ئاپارتمانە بچووکەکەی خۆیەوە.

جۆرج، هەرکە دەرگاکەی داخست، وەکو چۆن هەڵۆ پەلاماری چەشە ونێچیر دەدات، بەوئاوایە پڕی دایە. خانم ڤالتر، کەوتە لەقەفرتێ، بەرگری دەکرد و بە پچڕپچڕی دەیگوت:- ئا، خودایا، ئاە، خواگیان...

جۆرج، بەجۆش وخرۆشەوە، دەیلاواند ونەوازشتی دەکرد. بێئەوەی خانم ڤالتر بتوانێ لەم نەوازشە پڕجۆش و خرۆشە هەڵێ، بەرە بەرە ڕادەست دەبوو.

لەو کاتەدا کە جۆرج ئەوی لە باوەش گرتبوو، بە دەنگێکی گیراو لەبن لێوانەوە، گوتی: " باوەربکە... سوێندت لەسەرم نییە سوێندت بۆ دەخۆم کە تا ئێستا هەرگیز کەڕڵ و مەعشوقم نەبووە. " وەکو ئەوەی کچێکی گەنج بێت و بڵێت: " سوێند دەخۆم کە داوێنپاکم. "

جۆرج، لەو کاتەدا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئەم بابەتە بۆمن هیچ بایەخێکی نییە.

## ( ٥ )

دنیا پاییز بوو. جۆرج وژنەکەی هاوین لە پاریس مابوونەوەو لە پشووی کورتی هاوینەدا، نوێنەرانی ئەنجوومەن، بە وتارەکانیان خەباتێکی توندیان بەسوودی کابینەی نوێ، لە ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزدا بەرپاکردبوو.

هەرچەندە هێشتا سەرەتاکانی هەیڤی ئوکتوبەر بوو، بەڵام لە بەر پەشێوی ڕەوشی مەراکش، ئەنجوومەن ناچاربوو کۆبوونەوەکانی خۆی ئەنجام بدات.

کەس لەو باوەڕەدا نەبوو کە دەوڵەت ناچار بێ لەشکر بۆ تەنجە ڤرێ بکات، لە گەڵ ئەمەشا، پێش پشووی هاوینەی ئەنجوومەن یەکێک لە نوێنەرەکانی باڵی ڕاست، بەنێوی لامبەرساررازن، لە وتاربێژییەکی سەرنجڕاکێش و پڕ جۆش وخرۆشا، کە تەنانەت بووە مایەی پەسند وستایشی باڵی میانەڕەویش، لە سەر سمێڵە قیتەکەی خۆی و ڕدێنی سەرۆکی دەوڵەت گرەوی کرد، کە دەوڵەتی ( حکومەت ) تازەش ناچارە، وەکو حکومەتی پێشوو، لەشکر بۆ تەنجە ڤرێ بکات، تا هاوکاری ئەو سوپاییانە بکات کە لە تونس جێگیر بووبوون و وەکو ئەوەی دوو قاپ ئاو لە سەر سۆپایەک دابنەن، تا هاوسەنگی بەرقەرار ببێت. ئەو نوێنەرە لە سەر قسەکانی ڕۆیی بوو: " ولاتی ئەفریقا، لە ڕاستیا، وەکو دووکەڵکێشی سۆپایە بۆ فەرەنسا، سۆپایەک کە باشترین ئێزنگ و. سووتەمەنی ئێمە دەسووتێنێت، سۆپایەکی زەبەلاح کە بە زەبری ئەسکەناس هەڵیدەکەن و نایەڵن بکوژێتەوە. ئێوە، هەر بۆ سەرگەرمی و بەشێوەیەکی هونەرمەندانە سەمتی چەپی سەری سۆپاکەتان بە زینەتی

تونسی ڕازاندووەتەوە کە گران لە سەرتان دەکەوێ، دەبینن کە ئاغای ماروس، بە چاولێکەری هاوکارەکەی پێشووی خۆی سەمتی ڕاستی سەرسۆپاکە بە زینەتی مەڕاکشی دەڕازێنێتەوە.

ئەم گوتارە کە زۆر شۆرەتی پەیداکرد، بوو بە دەسمایەیەکی باش بۆ دوروا، تا دە گوتاران دەربارەی جەزایر بنووسێت کە لە ڕاستیا بە درێژەی ئەو گوتارانە دەهاتە ژماردن کە لە سەرەتای کاری ڕۆژنامەوانی خۆیا دەستی پێکردبوو وئیدی بە تانیا نەچووبوو، و بەهەموو توانای خۆیەوە داکۆکی لە تیوری فڕێکرنی لەشکر و هێز کرد، هەرچەندە باوەڕی وابوو کە کاری وا ڕووندادات و ناکرێت. ئەو بە وتارەکانی هەستی نیشتمانپەروەری خوێنەرانی جولاندو بە جبەخانەی بەڵگەێن تەوهین ئامێز، ئەسپانیای تۆپباران کرد، لەو بەڵگە تەوهین ئامێزانەی کە پیاو دەربارەی ئەو میللەتانە بەکاری دەبات کە بەرژەوەندییان دەگەڵ بەرژەوەندی خۆیدا هەڤدژە.

ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز بە حوکمی ئەوەی لە دەسەلاتی فەرمانڕەوا نزیک بوو، وابەستەی دەسەلات بوو، بایەخێکی گەورەی پەیداکرد. لە پێش هەموو ڕۆژنامە پڕ ئیحتوبارەکانەوە، هەواڵێن ڕامیاری بلاودەکردەوە، بە ڕستەێن مانادار و ناڕاستەوخۆ، بڕیاری ئایندەی وەزیرەکانی، یانی دۆستەکانی خۆی ڕادەگەیاند، لە ئەنجاما بوو بە چاڤکانی هەواڵ بۆ هەموو ڕۆژنامەکانی پاریس وشار وشارۆچکەکانی دەوروبەری پاریس. بابەتەکانی لە هەموو ڕۆژنامەکاندا نەقڵ دەکرا، بەرە بەرە ترسی خستە

هەموو دڵەکانەوەو ئەنجام هەمووانی وادارکرد کە ڕێزی بگرن. نها ئیدی قسە و گوتەێن دارودەستەی سازشکاران و مامەڵەچیاتی سیاسی جێگەی گومان نەبوو، بەڵکو بە ئۆرگانی فەرمی حکومەت دەهاتە ژماردن. لاروش ماتیو روحی ڕۆژنامەکە بوو و دوروا، پەیڤدار و وتەبێژی بوو. بابا ڤالتر، نوێنەری بێدەنگی ئەنجوومەن و بەڕێوەبەری بەپارێزی ڕۆژنامەکە بوو، کە دەیزانی چۆن خۆی لە هەرا وهەنگامەیەک دووربگرێ، وەکو دەیانگوت، ژێراوژێر خەریکی مامەڵەیەکی گەورە بوو دەربارەی کانزای مس لە مەراکش.

هۆڵی چاوەڕوانی ومیوانی، ماڵەکەی مادلین بووبوو بە سەنتەری ئەو کۆبوونەوە گرینگانەی کە هەموو هەفتەیەک زۆرێک لە ئەندامانی کابینەکە، لەوێندەر کۆدەبوونەوە. تەنانەت سەرۆکی کابینەی حکومەتیش دوو چەلان، لە ماڵی ئەودا شامی کردبوو، هاوسەرانی پیاوانی دەوڵەتڕانیش کە جاران دوودڵ بوون لە هاتوچۆ بۆماڵی ئەو، ئێستا شانازیان بەوەوە دەکرد کە لە دۆستانی ئەون و ئەوەندەی ئەوان سەردانی مادلینیان دەکرد، مادلین نیو ئەوەندە سەردانی نەدەکردن.

وەزیری کاروباری دەرەوە هەر مەپرسە، بووبوو بە خاوەن ماڵ. شەو ورۆژی بۆ نەبوو، هەرکاتێ دڵی پێوەبا، بۆ ماڵیان دەهات، بروسکان، نووچە وخەبەران و زانیاریانی دەگەڵ خۆیدا دێنا و دەقەکانیانی بۆ جۆرج یان مادلین، وەکو ئەوەی کاتب و سکرتێری تایبەتی ئەو بن، دەگێڕایەوە. ئیملای پێدەکردن.

کاتێ ئەو دەڕۆیی و دوروا بە تەنیا دەگەڵ ژنەکەیدا دەمایەوە، بە ڕاوێژێکی هەڕەشە ئامێزو پڕ تۆمەتی ناڕاستەوخۆ و ژێراوژێر تووڕەیی و بێزاری خۆی سەبارەت بەم پیاوە تازە پیاکەوتووە بودەڵەیە دەردەبڕی.

لێ مادلین، بە بێزاری شانەکانی هەڵدەتەکاندن و دووپاتی دەکردەوە: " تۆش هەمان کاری ئەو بکە، وەکو ئەو بکە و، ئەگەر دەتوانی ببە بە وەزیر و سەرت بەرز بگرە و، تا ئەو کاتەی بەو پۆستە نەگەی، بێدەنگ بە وهیچ مەڵێ. "

جۆرج، بە دەم بادانی سمێڵیەوە، خێسەی لێدەکرد و دەیگوت:

- هێشتا کەس نازانێ من بایی چەندم وچ کارانێکم لە دەست دێ، بەڵام ڕۆژێ ئەمە بە هەمووان نیشاندەدەم.

مادلین، فەیلەسوفانە سەری دەلەقاند و دەیگوت:- ئایندە، نیشانی دەدا.

بەیانیەک کە قەراربوو هەردوو ئەنجوومەنی نوێنەران وسەنا دوای پشووەکانی هاوینە، دووبارە دەست بەکار ببنەوە، مادلین کە هێشتا لە ناو جێگابوو، بە مێردەکەی کە خەریک بوو خۆی دەگۆڕی و قەراربوو فراڤین لە ماڵی ئاغای لاروش ماتیو بخوات و دەستوورات و زانیاری پێویست بۆ نووسینی وتاری ڕامیاری سبەی بەیانی ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز وەربگرێت، بەمێردەکەی دەگوت ئەم گوتارە پێویستە، بەجۆرە بەیاننامەیەکی نیمچە فەرمی هەنگاوە واقیعیەکانی حکومەت بێتەژماردن.

مادلین دەیگوت:- لە بیرت نەچێ، لێی بپرسە کە ئایا جەنەڕاڵ بیل ئونکیل، وەکو، بووە بە قاو بۆ ئوران دەنێردرێ یان نا، ئەم بابەتە گرینگی تایبەتی خۆی هەیە ها.

جۆرج، بەپەستی بەرسڤی دایەوە: -خۆم دەزانم دەبێ چ بکەم. بەم قسە سواوانەت بێزارم دەکەی، دەمکوژی، وازم لێبێنە.

مادلین بەوپەڕی ساردی گوتی: -بەڵام تۆ گیانەکەم، نیوەی ئەو قسانەی کە پێتی دەڵێم بە وەزیری بڵێی لە بیر دەکەی.

جۆرج، بەدەم پرتاندنەوە گوتی:- ئەم وەزیرەی تۆ مێشکی سەرم دەبات، ئینسانێکی بێشعوورە.

مادلین بە ئارامی گوتی:- بەڵام ئەم وەزیرە زیاتر هی تۆیە تا هی من بێت. چونکە سوودی بۆتۆ زۆر زیاترە.

جۆرج، نیوە ئاوڕێکی لێدایەوەو بە تەوسەوە گوتی:- ببورە، بەڵام دڵداری لەگەڵ مندا ناکات.

مادلین، بە خاوی و بەڕاوێژێکی ئارام گوتی:

- لە گەڵ منیشی ناکات، بەڵام زەمینەی سەرکەوتنمان بۆ فەراهەم دەکات.

جۆرج، بێدەنگ بوو، ئەوسا بەدەم سووکە هەڵوەستەیەکەوە لە سەری ڕۆیی:- ئەگەر قەراربوایە لە نێو دڵبەند و مەفتوونەکانت دا یەکێکیان هەڵبژێرم، ئەم ڤیدریکە پیرە بێدەسەڵاتەم هەڵدەبژارد. ئەوە گۆڕی گومە؟ هەشت ڕۆژ دەبێ کە نەمدیتووە.

مادلین، بێهیچ باندۆرێک گوتی:- نەخۆشە، تەنانەت نامەیەکی بۆمن ناردووە، کە بە هۆی سەرهەڵدانەوەی

باداری و نوقرسەکەیەوە لە جێدا کەوتووە. هەقە بڕۆی سەرێکی لێبدەیت. دەزانی تۆی زۆر خۆشدەوێ، ئەگەر بچی سەرێکی لێبدەی زۆر خۆشحاڵ دەبێت.

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ، خەمت نەبێ. دەچمە عیادەتی.

وەختایەک لە خۆگۆڕین بووەوە، کڵاوەکەی لە سەر نا، چاوێکی بە دەوروبەریا گێڕا تا بزانێ هیچی لە بیرنەچووە، چونکە هیچی نەبینی، لە تەختەکە نزیک بووەوە، تەختی نێوچاوانی ژنەکەی ڕامووسی و گوتی:

- دەی، تا شەوێ خواحافیز، باوەڕناکەم کە بتوانم پێش سەعات حەوت بۆماڵ بێمەوە.

لە ماڵ وەدەرکەوت. ئاغای لاروش ماتیو چاوەڕوانی بوو، ئەو ڕۆژە قەرار وابوو کە سەعات دە نانی نیوەڕۆ بخوات، چونکە دەیویست، لە کۆبوونەوەکەی کابینەی حکومەتدا کە قەرواربوو نیوەڕۆ پێش دەستپێکردنی کاری ئەنجوومەن، دەست پێبکات، بەشداری بکات.

هەرکە بە تەنیا وبە ئامادەبوونی سکرتێری تایبەتی وەزیر، لە دەوری مێزەکە دانیشتن، چونکە خانم لاروش ماتیو، نەی ویستبوو مەوعیدی فراڤین خواردنەکەی بگۆڕێ، دوروا، دەربارەی وتارەکەی کەوتە قسان، ئەو سەرە قەڵەمانەی، کە لە سەر کارتێک تۆماری کردبوون، بۆ وەزیر خوێندەوە، ئەوسا گوتی:

- جەنابی وەزیر، هیچ شتێکی ئەوتۆی تیادەبینی کە پێویستی بە دەسکاری و گۆڕین هەبێت.

- زۆرکەم دۆستی ئازیز. سەبارەت بە دۆزی مەراکش، زۆر بە متمانەوە قسە دەکەیت، سەبارەت بە

ڤرێکردنی هێز، بە جۆرێکی بنووسە وەکو ئەوەی قەرار بێ ئەم کارە بکرێ، بەڵام وا لەخوێنەر بگەیەنن کە سەرناگرێت و تۆش کەمترین باوەڕت بەوە نییە. بەجۆرێکی بنووسە کە خوێنەر لەبن دێڕەکانەوە، بگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە ئێمە ئامادەنین، خۆمان بخەینە گێژاوی ئەم بویەر وماجەرایەوە.

– بەڵێ حاڵی بووم، گوتارەکەم بەجۆرێ دەنووسم کە خەڵکیش وای تێبگەن، ژنەکەم پێی گوتم لە جەنابتان بپرسم ئایا جەنەڕاڵ بیل ئونکل بۆ ئوران دەنێردرێ یان نا. دوای ئەو قسانەی کە نها دەگەڵ منت کردن، وا وێنا دەکەم کە نا، نانێردرێت.

وەزیری کاروباری دەرەوە گوتی:– نا.

پاشان باس هاتە سەر یەکەمین کۆبوونەوەی ئەنجوومەن کە تا چەند سەعاتێکی دی دەکرا. لاروش ماتیو، لە بەرخۆیەوە ئەو گوتارەی دەگوتەوە کە دەیویست لەوێندەر بیدات تا زۆرترین کار لە هاوکارانی بکات. بەدەم قسەکردنەوە دەستی ڕاستی دەجولاند، هەندێجار چنگاڵەکەی بەرزدەکردەوە وهەندێجار چەقۆکەی و هەندێجار پارووە نانەکەی، بێئەوەی تەمەشای ﭺ کەسێک بکات، ڕوو لە ئەنجوومەن و نوێنەرانی نادیار، بە سەر وسیمای ڕێک وپێکەوە، بەو پەڕی دەماوەری و ڕەوانی قسەی دەکرد. سمێڵێکی بچووکی ناسکی هەبوو، کە ئەم سەرو ئەوسەری وەکو کلکی دووپشک هەڵگەڕابووەوە، جێڵی لە قژی دابوو و لە ناوەڕاستەوە بەڕێکی دابەشی کردبوو، قژەکەی وەکو گەنجانی خودئارای دێهاتی بە هەردوو لاجانگەکانیا بەردابووەوە. هەرچەندە هێشتا گەنج بوو، بەڵام کەمێک،

زیاد قەڵەو و گۆشتن بوو؛ ورگی لە ئێلەکەکەیەوە دەرپەڕی بوو. سکرتێرە تایبەتیەکە بە کاوەخۆ دەیخوارد و دەیخواردەوە، هەڵبەتە بەو زێدەبێژیانەی ئەو ڕاهاتبوو، لێ دوروا، بەغیلی بەو سەرکەوتنانە دەبرد کە ئەو بەدەستی هێنابوو، لەکاتێکا دڕووی حەسوودی لە دڵی دەچەقی، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: " بەڵێ، بەردەوام بە، بێ سەروبەر! ئەم بەرپرسانە چەند خەڵکانی بوودەڵە و سووک و چروکن. "

لاروش ماتیو، تاکاتی قاوە خواردنەوە، درێژەی بە چەنەلێدان و سەرودەست جوڵاندن دا، پاشان کە بینی خەریکە دێر دەکەوێ، زەنگی لێدا کە گالیسکەکەی ئامادە بکەن و بەدەم تەوقە کردنەوە دەگەڵ دورروادا گوتی:- ئێ، لە قسەکانم حاڵی بووی دۆستی ئازیز؟

- باش حاڵی بووم جەنابی وەزیر، متمانەت بە من هەبێ، خەمت نەبێ.

دوروا، لەوێندەرەوە، بە کاوەخۆ بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە ڕۆیی تا وتارەکەی بنووسێت ورێک بخات، تا سەعات چواری پاش نیوەڕۆ هیچ کارێکی دیکەی نەبوو، سەعات چوار قەراری دیداری دەگەڵ خانم دو ماریل دا، لە ئاپارتمانەکەی شەقامی کونستانتینوپل هەبوو، چونکە هەفتەی دوو ڕۆژان، دوو شەمموان و هەینیان، بە بەردەوامی لەوێ یەکتریان دەبینی.

بەڵام کە خۆی بە هۆڵی دەستەی نووسەراندا کرد، بروسکەیەکی داخراویان دایە دەستی، بروسکەکە لە خانم ڤالترەوە بوو کە دەیگوت:

– هەرچۆنێک بووە دەبێ ئەمڕۆ قسەت لەگەڵدا بکەم. مەسەلەکە زۆر گرینگە زۆر گرینگ. سەعات دووی پاش نیوەڕۆ لە ئاپارتمانەکەی شەقامی کونستانتینوپل چاوەڕوانم بە. دەتوانم خزمەتێکی گەورەت پێبکەم.

دۆستی هەمیشەییت تا مردن: ڤیرجینی

جۆرج، گوتی: " شەیتان بە نەحلەت بێ ها. لە گەنە دەچێت. " هێندە قەڵس بووبوو کە دەستی نەدەچووە کار، ئەوسا بە پەستی و بێزاری لە ئیدارەی ڕۆژنامەکە وەدەرکەوت.

شەش هەفتە بوو، لە هەوڵی ئەوەدا بوو، کۆتایی بە پەیوەندییەکانی دەگەڵ ئەودا بێنێت، بێئەوەی بتوانێت جۆش وخرۆشی لە کۆتایی نەهاتگی ئەو دابمرکێنێتەوە.

خانم ڤالتر، پاش گلان وڕادەست بوونەکەی، دووچاری پەشیمانییەکی توند بووبوو ولە ماوەی سێ دیدارییاندا، دڵدارەکەی بە سەرزەنشت ونەفرەت وگازنان وەڕەزو بێزار کردبوو. جۆرج کە لەم دیمەنە ناخۆشانە بێزار بووبوو و چیتر مەیل و ئارەزووی لەم ژنە ناڤساڵە ڤیرسیچمەیە نەمابوو، زۆر سادە خۆی لەو دوور گرتبوو بەو هیوایەی کە بویەرەکە خۆ بەخۆ کۆتایی بێت و ببڕێتەوە.

بەڵام ڤیرجینی نا ئومێدانە خۆی بەوەوە هەڵواسی بوو، دەتگوت دەیەوێ بەو بەردەوە کە لە ملی خۆی بەستبوو، خۆی لە ڕووبارێکدا غەرق بکات، بەتاسەوە خۆی بەم عەشقە ناکامەوە هەڵواسی بوو. جۆرج، جارێ لەڕووی لاوازی نەفس، جارێ بۆ ڕابواردن و هەندێجار لە ڕووی مداراکردنەوە، ڕادەستی خواستەکانی ئەو بوو بوو، ئەنجام

ڤیرجینی ئەوی لە چوارچێوەی ئەم هەوەس و هەوەسبازیە هەوسار پچڕیوە، بێ شەرمانە و تاقەتبەرەدا زندانی کردبوو و بە دەربڕینی مەحەبەت و خۆشەویستی لە ڕادەبەدەر، بێزار و بێتاقەتی دەکرد.

حەزیدەکرد هەموو ڕۆژێ جۆرج ببینێت، بە بروسکە لە وەخت و ناوەختەکانی، بە مەبەستی دیداری بەپەلە لە سیلەی کوچە و کۆلانێکا، لە موغازەیەکدا یان لە پارکێکی گشتیدا، ئەوی ئیحراج دەکرد.

لەم دیدارانەدا، هەمان قسانی دووبارە دەکردەوە، دەیگوت ئەو دەپرستێت، بۆ ئەو پیرۆز و مقەدەسە، ئەوسا کە بە جێیدەهێشت و دەڕۆیی سوێندی دەخوارد کە بەم چەند ساتە دیدەنیەی ئەو بەختەوەر وخۆشحاڵە.

خۆی، بە جۆرێکی جیاواز، لە وەی جۆرج بە خەیاڵ وێنای کردبوو نیشاندەدا، هەوڵیدەدا، بەناز وکریشمەی سواو وپواو، ئەدا و ئەتواری گەنجانە،. دڵی ئەو بەرێت، ڕەفتاری منداڵانە کە بۆ تەمەنی ئەو کرێت بوو. ژنەی بێنەوا، تا ئەو کاتە بەوپەڕی داوێن پاکی مابووەوە، ڕەدووی کەمترین هەوا وهەوەس نەکەوتبوو، بچووکترین لەزەتی ناڕەوای بە خۆی ڕەوا نەبینی بوو، ئەم بویەرە لە جەستە و گیانی ئەودا کە تەنهاو ژیانێکی ئارام و ڕۆتینی بەسەربردبوو، لە ناکاوا گڕی گرتبوو، لە تەمەنی چل ساڵیدا، پاییزی تەمەنی، دوای هاوینێکی سارد و بێ ڕەونەق، کردبووی بە تۆفانێ ئەوسەری دیارنەبوو. پاییزێک کە لە بەهارێکی ڕەنگزەرد دەچوو، بەگوڵێن نەپشکوتوو وخونچەێن پەژمردە پێش ئەوەی بکرێنەوە، شکۆفایی

سەیری عەشقێکی منداڵانە، عەشقێکی درەنگ وەخت، ئاگرین وساکارانە، پڕهەوراز ونشێوی پێشبینی نەکراو، جۆش و خرۆش نیشاندان و خەندە و پێکەنینی هەرزەکارانە، نەوازش وناز ونیونازی دەست وپێ گیر و تاقەتبەر، ناز ونوزی ناڤسالانە، بێئەوەی هەرگیز ڕووی گەنجاتی بەخۆوە دیبێ... لە ڕۆژێکا دە دانە نامەی بۆ دەنووسی، نامەێن شێتانە وگەوجانە، بە شێوازێکی سەیر، شاعیرانە و کۆمیدی، وەکو نامەی سوورپێستەکان، ڕازاوە بە ناوێن باڵندان و حەیواناتەوە.

هەرکە بە تەنیا دەمانەوە، بە دەربڕینی خۆشەویستی موبالەغە ئامێزی منداڵانی گەورە، ئەوی ماچ دەکرد، لێوەکانی بە شێوەیەکی ناقۆڵا دەجولاندو هەڵبەز ودابەزی منداڵانەی دەکرد. جۆرج بە تایبەتی لەو نازناوانە بێزار بوو، کە بە نازەوە لەمی دەنا: " مشکەکەم " ، " سەگەکەم " ، " پشیلەکەم "، " جەواهیرم " ، " باڵندەکەم " ، " گەنجینەکەم " بێزار بوو. لەو عەشقبازییەی کە هەمووجارێ بە شەرم و شوورەییەکی نمایشی ومنداڵانە بۆ ئەمی دەنواند، بێزاربوو لەو ڕەفتارە ترسئامێزانەی کە گوایە بە خەیاڵی خۆی زادەی خۆشەویستی بوو و بە ئەدا و ئەتواری جۆراوجۆرەوە خۆی ڕادەستی جۆرج دەکرد. بۆ نموونە لە جۆرجی دەپرسی: " من هی کێم؟ " چونکە جۆرج بلەز و یەکسەر بەرسڤی نەدەدایەوە، هەرخۆی دەیگوت: " هی تۆم . " هێندەی پێداگری لە سەر ئەم عیشوەگەرییە سووکانە دەکرد کە جۆرجی دەهری دەکرد.

به بۆچوونی جۆرج، ژنەی بێنەوا، نەیدەزانی کە دەبێ لە عەشقبازیدا زیرەکی بنوێنێ، وردی و پارێزی زۆر بەکار بەرێت. ئەو کە ژنێکی ناڤسال، دایکی منداڵ و لە چینی باڵای کۆمەڵ بوو، ئەمەی نەدەزانی کە دەبێ، جۆرە سەنگینی و ویقارێک بنوێنێ، جدی بێ، هەندێجار، فرمێسکێکی پەشیمانی سەبارەت بەو کارە ناشایستەیەی کە دەیکا، برێژێ، بەڵام فرمێسکانی دیدون ئاسا نەک فرمێسکانی جولیتانە. ( دیدون: کیژی پاشای سورڤ و شابانوی ئەفسانەیی کارتاج بوو کە بە سەد دڵ عاشق و حەیرانی ئاینیاسی شازادەی خەڵکی ترویا بوو و کە ئاینیاس بە فەرمانی خواوەندان دەستبەرداری بوو، ئەو لە نائومێدی و لە سوێیاندا خۆی فڕێدایە کۆمەڵێک ئێزنگ وچیلکەی گڕگرتووەوەو دڵی خۆی بەر خەنجەر دا ). ( جولیت: قارەمانی شانۆنامەیەکی شەکسپیرە کە عاشقی رومیو دەبێت و عەشقەکەی بە نموونەی ناسکی کچانە و سەفای عەشقێکی قووڵ و واقیعی دێتە ژماردن ).

هەمیشە دووبارەی دەکردەوە:- چەندم خۆشدەوێی بچکۆلەکەم! تۆش بەو ئەندازەیە منت خۆشدەوێ، کوڕە نازدارەکەم؟

جۆرج، ئیدی لەم قسانە: " بچکۆلەکەم " و " نازدارەکەم " بێزار بوو و لە ناخی خۆیدا حەزیدەکرد بە " پیرەژن " بانگی بکات.

بە جۆرجی دەگوت:- چ گەوجایەتیەکی گەورەم کرد کە ڕادەستی تۆبووم. بەڵام پەشیمان نیم. خۆشەویستی زۆر باشە.

هەرهەموو ئەو قسانەی ئەو بۆ جۆرج بێتام و ناخۆش بوون. بەجۆرێ ئەم ڕستەیەی " خۆشەویستی زۆر باشە." دەدرکاند، کە دەتگوت کیژێکی دڵساف و بێگەردە و ئەو ڕستەیە لە سەر شانۆی نمایش دەڵێت.

ژنەی بێنەوا، سۆز وگوداژێکی ناشیانە و لە هەمان کاتدا حاڵەتێکی جدی ئەوتۆی دەنواند کە جۆرجی دێنایە پێکەنین، ئەو پیر وکاڵانەی بیردەکەوتنەوە کە هەوڵدەدەن فێری خوێندن و نووسین ببن.

وەختایەک بە نیگایەکی قووڵ وترسناکی هەندێ لەو ژنانەی کە تەڕ وبڕی گەنجاتیان لە دەست داوە، نیگایەکی قووڵ وبەرزەفڕانە، سەبارەت بە دوا عەشقیان، تەمەشای ئەوی دەکرد، وەکو منداڵی بچووک، شیرین زمانی دەکرد، تا دڵگیرتر و ئازیزتر بێتە بەرچاو: " کۆشم دەوێی، بچکۆلانەکەم، زۆر کۆشم دەوێ، لە گەڵ ژنە چکۆلەکەتا باش بە."

هەنگێ جۆرج، خوای نەدەما، پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بەر دەمرێژی جنێوی بدات، کڵاوەکەی هەڵبگرێت و بڕواتە دەرێ و دەرگاکە لە دوای خۆیەوە بە توندی بە دیوارەکەدا بدات.

لە سەرەتاوە، زۆربەی جاران لە ئاپارتمانەکەی شەقامی کونستانتینوپلدا یەکیان دەبینی، بەڵام چونکە جۆرج دەترسا، بە ڕێکەوت، لەوێندەر تووشی خانم دوماریل ببێت، بە هەزار ویەک بیانوو خۆی لەم دیدارانە دەدزییەوە. هەنگێ ناچار بوو، هەموو جارێ بۆ فراڤین یان شام بۆ ماڵی وان بڕوات. ڤیرجینی لە ژێر مێزەکەوە دەستی دەگرت و دەیگوشی، یان لە پشت دەرگایەکی داخراوەوە عەشقبازی دەگەڵ دەکرد.

بەڵام جۆرج، زیاتر لەزەتی لە قسەکردن و گەمان دەگەڵ سوزان دا، دەبینی، کە بە دەست ڕەنگینییەکانی ئەوی سەرگەرم دەکرد. لە جەستەی بووکەڵە ئاسای ئەم کیژۆڵەیەدا، روحێکی چالاک وچەلەنگ، دوور لە هەر چاوەڕوانی وحیلەبازییەک پەنهان بوو، کە هەمیشە هەمووانی وەکو بووکەڵەی فیلمێن کارتۆن، هەمووانی دێنایە جۆش و پێکەنین. هەمووشتێک و هەمووکەسێکی، بەقسەکانی و وەڵامە حازر وئامادە وچزوودارەکانی غافڵگیر دەکرد. جۆرج، بەهرەو تواناکانی ئەوی دەهاڕوژاندو ناچاری تەنزگۆیی دەکرد. نێوانیان زۆر خۆشبوو.

سوزان، هەر ساناساتێ گازی دەکرد:- گوێ بگرە بیل ئامی. وەرە ئێرە بیل ئامی.

جۆرج، ئەمەی لە خوا دەویست، وازی لە دایکی دێنا ودەچوو بەلای کچۆڵەکەوە کە شەیتانانە چەند وشەیەکی بەگوێیدا دەدا و ئەوسا بە دووقۆڵی لە قاقای پێکەنینیان دەدا.

وێڕای هەموو ئەمانەش، جۆرج کە لە عەشقی دایکەکە وڕەفتارە دزێوەکانی بێزار بووبوو، گەیی بووە بێزارییەکی ئەوتۆ کە نە دەیتوانی ببینێ و نە گوێ لە دەم و دووی بگرێ، نە بەبێ تووڕەبوون بیری لێبکاتەوە. بۆیە چوونە ماڵی وانی تەرک کرد، بەرسڤی نامەکانی نەدەدایەوە وگوێی بە تکا وپاڕانەوەکانی نەدەدا.

ئیدی ژنەی بێنەوا، بۆی دەرکەوت کە جۆرج خۆشی ناوێت، دووچاری خەم وپەژارەیەکی توند بوو. لێ هەر دەستبەردار نەدەبوو، کۆڵی نەدەدا، لە هەموو شوێنێ تاقیبی دەکرد، لە ناو گالیسکەیەکی چادرداردا، لە بەر دەرگای

ئیدارەی ڕۆژنامەکەدا، لە بەر ماڵەکەیا، یان لەو کوچە و کۆلانانەدا کە وای مەزەندە دەکرد پێیاندا ڕەت دەبێت، چاوەڕوانی دەکرد.

جۆرج، زۆر حەزیدەکرد، بیرەنجێنێ، جنێوی بداتێ، لێی بدات و بە ئاشکرا پێی بڵێت: " چیت لێم دەوێت، وازم لێبێنە . " بەڵام لە بەر ڕۆژنامەکە و کارەکەی مدارای دەکرد، ملاحەزەی دەکرد. هەوڵیدەدا لە گەڵیا سارد بێ، زبر بێ، بەڵام بە ڕواڵەتێکی نەزاکەت ئامێزەوە و تەنانەت هەندێجار بە قسەی ناخۆش و زبر تێی بگەیەنێت کە پێویستە، کۆتایی بەم ماجەرایەیان بێنێت و بەردێکی بخاتە سەر.

ڤیرجینی، پێداگری دەکرد کە بە هەرشێوەیەک بووە، بۆ ئاپارتمانەکەی شەقامی کونستانتینوپلی بکێشێت و، جۆرج لە ترسی ئەوەی نەبادا ڕۆژێک هەردوو ژنەکە لەوێندەر تووشی یەکدی ببن ئۆقرەی لەبەر بڕابوو.

خۆشەویستی و عەشقی سەبارەت بە خانم دوماریل، لە ماوەی ئەو هاوینەدا، بە پێچەوانەوە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبوو. جۆرج، بە " گورپەکەم " دەیدواند و بە ڕاستی لەزەتی لە هاودەمی و هاونشینی ئەو دەبینی. تەبع و تەبیعەتیان لە زۆرشتا تێکیدەکردەوە، هەردووکیان لە ژیانا، سەرکێش و سەرەڕۆ و لاسار بوون، ئەهلی ڕیسک و ڕابواردن بوون، بێئەوەی بە خۆ بزانن، لە قەرەجانی بیابانگەڕ دەچوون.

هاوینێکی عاشقانەی پڕجۆش وخرۆشیان قەتاند، وەکو ئەو خوێندکارە گەنجانەی کە مانگی هەنگوین دەبەنەسەر، خۆیان لە هەموو شوێن و لەگشت کەسێک دەدزییەوە

تاپێکەوە بۆ ئارجانتوی، بۆژیڤال، فرون، یان پواسی بڕۆن و فراڤین یان شێو لە یەکێک لەو شوێنانە بخۆن.

بە سەعاتان بەسواری بەلەم بە ڕوباردا دەسووڕانەوەو لە کەناراوەکەدا گوڵیان دەچنی. خانم دوماریل، کوشتەی ماسی برژاوی ڕوباری سین، قاورمەی کەروێشک ومارماسی کوڵاو بە پیاز و شەرابی سپیەوە بوو، هەروەها دڵبەندی دانیشتنی ژێر کەپری مەیخانەکان و گوێگرتن لە هەرا وبەزمی بەلەمەوانەکان بوو. جۆرج زۆری حەز لێبوو دەگەڵ ئەودا، لە ڕۆژێکی خۆشی هەتاوا، سواری ڤارگونێکی سەربەتاڵی ڤیتاری دەوروبەری شار بێت و بەدەم گوت وبێژ و شۆخی وپێکەنینەوە، گوندە دزێوەکانی دەوروبەری پاریس بدەنە ژێر پێوەو تەمەشای خانووە پەرتووەکانی دانیشتوانی ئەو دیار ودەڤەرانە بکەن.

جۆرج، کاتێ کە ناچار بوو بۆ خواردنی شام بۆ ماڵی خانم ڤالتر بڕوا، ، کە ماشقە گەنجەکەی بیردەکەوتەوە، کە هەموو ڕۆژەکەی دەگەڵ ئەودا، لە دەشت ودەرا، لە نێو سەوزە زاراندا، بەخۆشی و شادی بە سەر بردبوو، زیاتر لە ماشقە ناڤساڵە ڤیرسیچمەکەی بێزار دەبوو.

ئەو ڕۆژەش، لە حاڵێکا پێی وابوو ئیدی بۆ هەمیشە لەو خەلەسیوە، چونکە پێشتر بە جۆرێکی زۆر ڕوون و بە شێوازی هەندێک زبر بڕیاری بڕینی پەیوەندی دەگەڵ ئەودا دابوو، ئەو بروسکەیەی پێگەیی بوو. خانم ڤالتر، لە بروسکەی گۆریندا داوای کردبوو سەعات دووی پاش نیوەڕۆ، لە ئاپارتمانەکەی شەقامی کونستانتینتوپل دا بیبینێ.

بە دەم پیاسەکردنەوە، جارێکی دی بروسکەکەی خوێندەوە: " هەر چۆنێ بووە، پێویستە ئەمڕۆ قسەت لە

گەڵدا بکەم. مەسەلەیەکی زۆر گرینگ هەیە. زۆر گرینگ. سەعات دووی پاش نیوەڕۆ لە ئاپارتمانەکەی کونستانتینوپل چاوەڕوانم بکە. دەتوانم خزمەتێکی گەورەت پێبکەم. دۆستی هەمیشەییت تا مردن – ڤیرجینی. "

جۆرج لە دڵی خۆیدا دەیگوت: " ئەم کوندە پیرە چی لێمدەوێ، گرێو دەکەم هیچ قسەیەکی نییە لە گەڵمی بکات. هەمیشە هەر ئەوە دەڵێتەوە کە گوایە من دەپەرستێت. وێڕای ئەمەش پێویستە بڕۆم بزانم چی دەوێ. باسی مەسەلەیەکی زۆر گرینگ وخزمەتێکی گەورە دەکات، لەوەشە ڕاست بکات. کلوتیلد، سەعات چوار بۆ ئەوێ دێت، دەبێ چ بکەم. خۆ دەبێ ڤیرجینی تا سەعات سێ بێڵمەوە. خوابکات ئەم دووە لەوێندەر تووشی یەکدی نەبن. دەنا وای بەحاڵم. چەند ژنانی بە وەزەنن. "

پاشان بیری کەوتەوە کە ژنەکەی خۆی تاقە ژنێ بوو کە هەرگیز ئەزیەتی نەدەدا. ژیانی خۆی دەگوزەراند و بە ڕواڵەت لە کاتە تایبەتیەکانی عەشقدا، زۆریشی خۆشدەویست، چونکە بەهیچ کلۆجێ ڕێگەی نەدەدا کەسێک نەزم و نیزامی سەرگەرمیەکانی ڕۆژانەی ژیانیان بشێوێنێت.

بەکاوە خۆ بەرەو ژوانگە ڕۆیی و لەزەینی خۆیدا، خۆی بۆ ڕووو بە ڕووبوونەوەی ئاغاژن ئامادەکرد:

– وای بە حاڵی ئەگەر خەبەر و باسێکی گرینگی پێنەبێ، کارێکی پێدەکەم کە هەرگیز لە بیری نەچێتەوە. قسەکەی کانبرون ( کانبرون: مەبەست ئەو وشە دزێوەیە کە جەنەڕاڵ کانبرون لە جەنگی واترلودا بەکاری بردبوو. فەرماندەی ئینگلیزی لە دوا ساتەکانی جەنگدا، کە شکستی

فەرەنسییەکان ئاشکرا بووبوو وبڕابووەوە، ڕوو لە فەرەنسییەکان گوتی: فەرەنساییانی ئازا ڕادەست بن و کانبرون لە وەڵامی ئەودا گوتبووی گوو.... ) لە چاو ئەو قسانەدا کە دەمەوێ بیکەم، حەڵوا بێ. لە پێش هەموو شتێکا پێی دەڵێم کە لە ئێستا بەدواوە، پێ نانەمە ماڵەکەی. خۆی بە ئاپارتمانەکەدا کرد و چاوەڕوانی خانم ڤالتری کرد.

هێندەی پێنەچوو کە ئەویش هات، هەرکە جۆرجی بینی گوتی:- ئاه، بروسکەکەمت بەدەست گەیی! زۆر باش بوو!

جۆرج، بە ڕوو گرژییەوە گوتی:- خەریک بوو دەچووم بۆ ئەنجوومەن کە بروسکەکەتم پێگەیشت. چیت لێم دەوێ؟

خانم ڤالتر تۆڕەکەی سەر دەم وچاوی هەڵدابووەوە تا ئەو ماچ بکات و بە قەلافەتی سەگێکی ترساوی دەستەمۆ کە فێری کوتەک خواردن بێ لە جۆرج نزیک بووەوە.

– چەند درهەق بە من بێڕەحمی... چەند بە زبری ڕەفتارم دەگەڵ دەکەی... ئاخر من چ خەتایەکم دەربارەی تۆ کردووە؟ یانی نازانی من لە پێناوی تۆدا چ عەزابێک دەخۆم!

جۆرج، بە دەم بۆڵەبۆڵەوە گوتی:- دیسان دەست پێکردەوە؟

بە تەواوی لە نزیکی جۆرجەوە وەستابوو، چاوەڕوانی بزەیەک یان جووڵەیەکی ئەو بوو، تاخۆی لە هەمێزی باوێت. لەبن لێوانەوە گوتی:

– نە دەبوو پەیوەندی لەگەڵ مندا بەرقەرار بکەیت تا پاشان بەم سارد وسڕییە ڕەفتارم لە گەڵدا بکەیت، دەبوایە وازم لێبێنی، دڵنیا و ئاسوودە، بە هەمان حاڵی خۆمەوە ژیابام. لە بیرت نایە لە کڵێساکەدا چ مەراییەکت دەکردم

وپاشان منت به خۆرتی کێشایه ئەم خانووه؟ و ئێستاش بەم شێوەیه قسەم لە گەڵدا دەکەی! خواگیان! ئوف خودایا! چەند بەد ڕەفتاریم لە گەڵ دەکەی!

جۆرج، بە توندی پێی بە عاردیدا کوتا و بە توندی گوتی:

– ئاه! دەستبەردار دەبی یان نا! گیانم گەییه کونه لووتم. بوو بە عەزرەتم، دەقیقەیەک لەگەڵ تۆدا بم و گوێم لەم قسە سواو وئاه ونالە وگازنانەی تۆ نەبێت. دەڵێی کچۆڵەیەکی دە دوازدە ساڵەی چاونەکراوه بوویت، فریشتەیەکی پاک و بێگەرد بوویت ومن خاپاندوومیت وله خشتەم بردوویت و دەستدرێژیم کردۆتە سەرت. نەگیانه، بابچینە سەر ئەسڵی مەسەلەکە، مەسەلەی فریودانی کیژێکی منداڵکار لە ئارادا نەبووه. تۆ لە تەمەنی ناقساڵی و بەکەماڵی ئەقڵ و خوایشتی خۆت، خۆت ڕادەستی من کردووه. لەم ڕووەوه مەمنوونی تۆم، ئەمەم لەبەرچاوه و پێی دەزانم، بەڵام بەهیچ کلۆجێ بەنیاز نیم، تا ماوم خۆم بە داوێنی تۆوه هەڵواسم. تۆ مێردت هەیه و من ژنم هەیه. کەسمان ئازاد نین. خۆمان ڕادەستی هەوەسێک کرد، ئەوەندە وبەس. ئیدی تەواو بوو.

خانم ڤالتر گوتی:

– ئاه، کە دڵ ڕەقی! چەند بێئەدەب و چەند داماوی! هەڵبەتە کچۆڵەیەکی منداڵکاری چاو وگوێ بەستراو نەبووم، بەڵام تا ئەوکاتە دڵم بەهیچ پیاوێکی دی نەدابوو. هەرگیز لە جادەی داوێنپاکی لام نەدابوو...

جۆرج قسەکەی پێبڕی:

– دەزانم، سەدان جار ئەم قەوانەت بۆ لێداومەتەوە. بەڵام تۆ دوو منداڵت هەبوو، خۆ من پەردەی کچێنیم لێ زەوت نەکردوویت.

خانم ڤالتر، هەنگاوێ چووە دواوە وگوتی:- ئاخ، جۆرج، ئەم قسەیەی تۆ ئابڕوومەندانە نییە!....

ئەوسا هەردوو دەستی نایە سەر سینگی و هەناسە بڕکێی پێکەوت، هەنسک وگریان لە ئەوکی گیرا.

وەختایەک جۆرج بینی کە ڕوندک خەریکە بە گۆناکانیا دێتەخوارێ، کڵاوەکەی کە لە سەر سۆپاکە دانابوو هەڵگرت و گوتی:- دیسان دەست بەگریان کردەوە! زۆرچاکە، کەواتە عەسر بەخێر.

بۆ نیشاندانی ئەم نمایشنامەیە منت بۆ ئێرە کێشا؟

خانم ڤالتر، هەنگاوێ چووە پێشێ تا ڕێگەی لێبگرێت، ئەوسا بە هەشتاو دەستەسرەکەی لە بەرکی دەرهێنا و بەتووندی فرمێسکەکانی سڕی. خۆی هێور کردەوە، بەدەنگێکی مکووم و بەو پەڕی ئازار وکول وکۆڤانەوە، هەژدەر هەژدەر کەوتە قسان:- نا... بۆیە هاتووم بۆ ئێرە تا... تا خەبەرێکت بدەمێ... خەبەرێکی سیاسی... تا بتوانی لە ڕێگەی ئەو خەبەرەوە پەنجا هەزار فرانک و بگرە زیاتریش بخەیتە تەنکەی باخەڵتەوە... ئەگەر خۆت بتەوێ.

جۆرج کە لە ناکاوا ڕاوێژی دەم و دووی نەرم بوو پرسی:- یانی چی؟ مەبەستت چییە؟

– دوێشەو، بەڕێکەوت هەندێ لە قسەکانی مێردەکەمم لە گەڵ لاروش دا بەرگوێ کەوت. هەڵبەتە زۆریش قسەکانیان لە من نەدەشاردەوە. لێ ڤالتر بە لاروشی دەگوت

که به هیچ جۆرێ مەسەلەکە بە تۆ نەڵێت، دەنا هەموو شتێک ئاشکرا دەکەیت.

دوروا، کڵاوەکەی لە سەر کورسییەک دانا وبە وردی چاوەڕوانی پاشماوەی قسەکانی ئەوی کرد.

– ئێ، چییان بەیەکدی دەگوت؟

– حکومەت دەیەوێ هێرش بکاتە سەر مەڕاکش.

– وازبێنە. من ئەمڕۆ نانی نیوەڕۆم لە گەل لاروش دا خوارد وئەو کەم وزۆر ئامانج ونیازەکانی حکومەتی پێگوتم تا تێهەڵکێشی وتارەکەمی بکەم.

– نەگیانەکەم، ئەوانە کڵاویان لە سەر ناوی، چونکە دەترسن دەستیان بکەوێتەڕوو و هەمووان بزانن چ مەبەستێکیان هەیە.

جۆرج گوتی: دانیشە با بزانم.

خۆیشی لە سەر قەنەفەیەک ڕۆنیشت. هەنگێ خانم ڤالتر تەپڵەکێکی هێنایە پێشەوەو لە بەینی لاقەکانی جۆرجی دانا و لە سەری دانیشت. ئەوسا بە ڕاوێژێکی نەوازش ئامێزەوە لە سەری ڕۆیی:

– چونکە هەمیشە بیرم لای تۆیە، گوێ لە هەموو ئەو قسانە دەگرم کە لە دەوروبەرما دەکرێن.

ئەوسا، بە نەرمی ومیهرەبانی بۆی گێڕایەوە کە ماوەیەکە وا هەستدەکات خەریکن هەندێ کاران دژی ئەو دەکەن و هەرچەندە لەو دەترسن، بۆ مەرامی خۆیان دەیکەن بە داردەست.

ئەوسا لە سەری ڕۆیی:– دەزانی وەختێ ئینسان یەکێکی خۆشبوێ، فێڵبازیش دەبێ، فێری فێلیش دەبێ.

سەرەنجام دوێنێ پەی بە ئەسڵی مەسەلەکە بردبوو. پای مامەڵە وسەودایەکی گەورە لە ناوا بوو، مامەڵەیەکی یەجگار گەورەو پڕ سوود کە ژێراوژێر و بەپەنهانی دەکرا. نها بزەی دەکرد و لەو زیرەکی نواندنەی خۆی خۆشحاڵ بوو، وەکو ژنێکی شارەزا لە واری دارایی و سەوا ومامەڵەی دراوییدا، زۆری کەیف بەخۆ دەهات و لەخۆشیان لە پێسی خۆی نەدەهێوری، وایدەنواند دەزانێت چ دەسیسە و ئاین وئوینێک لە کاری بۆرسە و نەختینەی بەهادارا لە ئارادایە، چۆن بەهای ئەم ئەوراقانە بە ساختە بەرز ونزم دەبێتەوەو لە ئەنجامدا زەرووانی دنیای سەرمایەداری، پاشەکەوتی بچووکی خەڵکانی ڕووتە لووش دەکەن ولە قوڕی ڕەشیان دەنەن وماڵوێرانیان دەکەن. ئەو سەرمایەگوزاری و وەبەرهێنانە بچووکانەی کە بە ناوی پیاوانی سەرڕاست، ئابڕوومەند و بەڕێزەوە، پیاوانی سیاسی یان بانکدارانی گەورە دەکران.

بەردەوام دووبارەی دەکردەوە:

– ئاە، ئەو کارەی کە ئەوانە گەرەکیانە بیکەن زۆر گەورەیە، دەسکەوتی یەجگار گەورەی بەدواوەیە. ڤالتر ئەم پیلانەی داڕشتووە و ئەم مامەڵەیەی سازاندووە، چونکە لەم جۆرە کارانەدا وەستایە. بە ڕاستی هاوتای نییە.

جۆرج، کە لەم ڕیس و گوریسەی ئەو بێتاقەت بووبوو، بەبێ حەوسەڵەیی گوتی:– دەی خێراکە وەرە سەر ئەسڵی بابەتەکە.

– زۆرچاکە، حاڵ و حیکایەتەکە بەمجۆرەیە: لەشکرکێشی بۆ سەر تەنجە، لەو ڕۆژەدا کە لاروش بوو بە وەزیری دەرەوە، قەراری لێداربوو. ئەوانە بەرەبەرە

دەستیان بە کڕینی ئەوراقی قەرەزەکانی مەڕاکش کرد کە بەهاکەی بۆ شەست وچوار پێنج فرانک داکەوتبوو. ئەوانە زۆر لێهاتووانە و لە ڕێگەی دەلالانی گومناو وتەنانەت درۆینەوەش دەستیان بەکڕینی ئەم ئەوراقانە کرد تا کەس گومانیان لێنەکات. تەنانەت کلاویان نایە سەری ڕۆچیلدەکانیش کە بە چاوی خۆ دەیانبینی هەموو ڕۆژێ ئەم ئەوراقانە کڕیاریان بۆ پەیدا دەبێ. لە وەلامی پرسیاری ئەواندا، ناوی دەلالانێکیان دەبرد کە گومناو یان نابووت و بێ ئیحتوبار بوون. لە ئەنجامدا خەیالی بانکدارەکان تەخت بوو. ونهاش دەیانەوێ هێز بۆ ئەوێندەر فڕێ بکەن. هەرکە سەربازانی مە پێ بنەنە ئەوێ، حکومەتی فەرەنسا زەمانەتی دانەوەی ئەم ئەوراقانە دەکات. لە ئەنجامدا دۆستانی مە پەنجا یان شەست ملیۆن فرانک دەخەنە تەنکەی باخەلیان. نها لە مەسەلەکە حالی بوویت؟ دەزانی بۆ لە هەموو کەسێک دەترسن و لە هەموو کەسێک بەگومانن، تا نەبا دەستەکەیان بکەوێتەڕوو؟

خانم ڤالتر سەری بە سینگی جۆرجەوە نابوو ودەستەکانی نابوون بە سەر ئەژنۆکانییەوە، خۆی پێوە دەنووساند و وای وێنا دەکرد نها دلی هێناوەتەوە جێ. ئامادە بوو لە پێناوی لاوانەوەیەک یان بزەیەکدا، پەنا بۆ هەر کارێک بیات و هەر هەلەیەک بکات.

جۆرج پرسی:- باشە تۆ دلنیایت؟

خانم ڤالتر، بە ئەرخایەنی بەرسڤی دایەوە:- بەلێ، دلنیای دلنیام.

جۆرج گوتی:- بەلێ، بەڕاستی مامەلەیەکی گەورەیە. بەلام ئەم لاروشە چەپەلە، با ڕاوەستێ بۆم، بزانە چی

بەسەر بێنم. ئاخ! هیچ وپووچ، سووک و چرووک! دەبێ ئاگای لە خۆی بێ!... ئاگای لە خۆی بێ! بزانە چۆن لە وەزیری دەخەم.

ئەوسا لە فکران ڕاچوو و لەبن لێوانەوە گوتی:- وێڕای ئەمەش، دەکرێ سوود لەم دەرفەتە وەربگیرێت.

- تۆ هێشتا دەتوانی هەندێک لەم ئەوراقی قەرزانە بکڕیت، بەهای لە هەفتا و دوو فرانک هێوەتر نەچووە.

جۆرج گوتی:- وایە، بەڵام کێشەم ئەوەیە کە پارەی نەختم بە دەستەوە نییە.

خانم ڤالتر، نیگایەکی لاڤەئامێزی کرد.

- بیرم لەمە کردووەتەوە گورپە چکۆلە ئازیزەکەم، ئەگەر لەگەڵما میهرەبان بیت، میهرەبانی تەواو، ئەگەر تۆزێکت خۆش بوێم، دەتوانم قەرزت بدەمێ.

جۆرج، لە ناکاوا و کەمێک بەتووندی بەرسڤی دایەوە:- نا، تەواو ناتوانم ئەم کارە بکەم...

خانم ڤالتر، بە ڕاوێژێکی پاڕانەوە ئامێزەوەو بە ئەسپایی گوتی:

- گوێ بگرە، تۆ دەتوانی بەبێئەوەی قەرز بکەی ئیشێکی دی بکەیت، من بەخۆم بەتەما بووم بایی دە هەزار فرانک لەم ئەوراقە قەرزانە بکڕم تا بۆخۆم دەرامەتێکی بچووک پێکەوە بنەم. ئێستا بایی بیست هەزار دەکڕم. تۆ دەبیت بە شەریکی نیوەی. تۆخۆت دەزانی کە من ئەم پارەیە نادەمەوە بە ڤالتر. ئێستا، واتە حاڵی حازر پارە نایەتە ئاڵوگۆڕ. ئەگەر ئەم مەسەلەیە سەرکەوتوو بێ، هەفتا هەزار فرانکت بە نەسیب دەبێ، تۆ تەنیا دە هەزار فرانک، بەو مەرجانەی خۆت دەتەوێ، بۆ من بگێڕیتەوە.

جۆرج دووباره گوتی:- نا، من حەزم لەم سەودا و مامەڵانە نییە.

خانم ڤالتر، بۆ ئەوەی قەناعەتی پێبکات، کەوتە بەڵگەهێنانەوە، بۆی سەلماند کە ئەگەر قەول بدات ئەم دە هەزار فرانکە بۆ کڕینی ئەوراقی قەرز بەکاربێنێ، ڕوو بە ڕووی هیچ خەتەرێک نابێتەوە، چونکە لە ئەنجاما ئەو هیچ پارەیەک بە قەرز نادات، چونکە بانکەکەی ڤالتر، بەهای کڕینی ئەوراقەکان دەدات.

وێڕای ئەمەش، ئاگاداری کردەوە کە لە ڕاستیا ئەو بە هۆی گوتارە سیاسیەکانیەوە لە لاڤی فرانسزدا، زەمینەی ئەم سوودە مۆڵەی بۆ ئەوان فەراهەم کردووەو ئەگەر بەخۆیشی سوود لەمە وەرنەگرێت، دەکاتە ئەوپەڕی ساویلکەیی و سائەقڵی.

جۆرج هێشتا دوو دڵ بوو. خانم ڤالتر لە سەری ڕۆیی:- باش بیری لێبکەوە، لە ڕاستیا ڤالتر ئەم دە هەزار فرانکە بەقەرز دەدات بەتۆ و، تۆ لە هەنبەر ئەوەدا، هەندێ کارت بۆ ئەو کردووە، کە زۆر لەم دە هەزار فرانکە بەنرخترە.

سەرەنجام جۆرج گوتی:- زۆرباشە، پەنجا بە پەنجا شەریک دەبین. ئەگەر دۆڕاین دە هەزار فرانکەکەت دەدەمەوە.

خانم ڤالتر، هێندە خۆشحاڵ بوو کە لە جێی خۆی ڕابوو، بە هەردوو دەستان سەری جۆرجی گرت و بەتاسە و تامەزرۆییەوە کەوتە ماچکردنی.

جۆرج لە هەوەڵەوە هیچ بەرخودانێکی نەکرد، پاشان کە بینی ڤیرجینی خەریکە شولی لێهەڵدەکێشێت و ناز و نەوازشەکانی گەرمتر دەبێ، بیری کەوتەوە کە کلوتیلد، بە

زوویی دەگاتەجێ و ئەگەر ئەم (جۆرج) ڕادەستی حەز و ئارەزووەکانی ئەم ژنە ببێت، هیچی بۆ کلوتیلد پێ نامێنێت.

بە نەرمی و میرەبانی ئەوی لە خۆ دوورخستەوەو گوتی:- بەسە، ئاقڵ بە.

ڤیرجینی، بە نیگایەکی خەمینەوە تەمەشایەکی کرد و گوتی:

- ئاخ، جۆرج، یانی ئەوەشم پێ ڕەوا نابینی ڕاتمووسم؟

جۆرج گوتی:- نا، ئەمڕۆ نا. کەمێک سەرم دێشێت و لەم بابەتە نیگەرانم.

هەنگێ ڤیرجینی گوێڕایەڵانە و دووبارە لە سەر تەپڵەکەکە دانیشتەوەو پرسی:

- حەز دەکەی سبەی شەو بۆ شام بۆ ماڵی مە بێیت؟ ئەگەر بێی پیاوەتیەکی گەورەم لەگەڵدا دەکەیت.

جۆرج، کەمێک سڵەمییەوە، بەڵام جورئەتی نەکرد، دەعوەتەکەی ڕەت بکاتەوەو بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ، دڵنیابە.

- مەمنوونم گیانەکەم.

بەنەرمی و بەناز و نەوازشەوە سەری لە سینگ و بەرۆکی جۆرج هەڵدەسوو، بەم کارەی تاڵێ لە قژە درێژ و ڕەشەکەی بوو بە ئێلەکەکەی ئەوەوە.

ڤیرجینی، بەمەی زانی و بیرۆکەیەکی شێتانەی بەزەینا تێپەڕی، یەکێک بوو لەو بیرۆکە ئەفسانەیانەی کە زۆربەی کات بۆ ژنان لە هەر لۆژیکێک پتر باوەڕ کردەنیە. بە کاوەخۆ کەوتە پێچانەوەی ئەم تاڵە قژە بە دەوری یەکێک لە قوپچەکانی ئێلەکەکەیەوە، ئەوسا تاڵە موویەکی دیکەی بە

دەوری دوگمەیەکی دیکەوە پێچا، ئەوسا دوگمەیەکی دی وهەر تاڵەموویەکی لە دەوری دوگمەیەک گرێ دەدا.

هەڵبەتە جۆرج لە کاتی هەستاندا، ئەم موانە هەڵدەکەنێ، ئەو ئازارەی بەهۆی ئەم کارەوە چێدەبێت، دەبێتە مایەی خۆشحاڵی ڤیرجینی! و جۆرج بێئەوەی بەخۆ بزانێت، نیشانەیەکی ئەم لەگەڵ خۆیدا دەبات، ئەو چەند تاڵە مووە لە گەڵ خۆیدا دەبات کە هەرگیز داوای نەکردبوو. ئەم تاڵە موانە دەبنە پەیوەندێک کە جۆرج بەوەوە دەبەستێ، پەیوەندییەکی پەنهان، نادیار، تەلەسمێک کە هەمیشە لەگەڵیا دەبێت. بێئەوەی کە خۆی بیەوێ بیر لەم (ڤیرجینی) دەکاتەوە، خەو بەوەوە دەبینێ و سبەینێ کەمێک زیاتری خۆشدەوێ.

جۆرج لە ناکاوا گوتی:

- دەبێ هەر ئێستا بەجێت بێڵم، چونکە لە ئەنجوومەندا، بۆ کۆتایی کۆبوونەوەکە چاوەڕوانی منن. هەرچۆنێ بووە پێویستە ئەمڕۆ لەوێندەر حازر بم.

ڤیرجینی ئامێکی هەڵکێشا وگوتی:- ئاخ، هەروا زوو.

ئەوسا، بە ملکەچییەوە لە سەری ڕۆیی:

- زۆرچاکە، بڕۆ گیانەکەم، بەڵام بیرت نەچێ سبەی شەو بۆ شێو بێی.

ئەوسا لە ناکاوا، لەم دورر کەوتەوە، هەستی بە ئازارێکی توند و زووگوزەر لە سەریا کرد، وەکو ئەوەبوو دەرزیان بەسەریا کردبێ. دڵی بەتووندی لێی دەدا، خۆشحاڵ بوو کە لەبەر خاتری ئەو تۆزێ ئازاری کێشاوە.

- خودا حافیز گیانەکەم.

جۆرج بە بزەیەکی هاوسۆزییەوە، لە هەمێزی گرت و بە ساردییەوە چاوەکانی ڕامووسی.

لێ ڤیرجینی، کە بەهۆی ئەم تەماسەوە جڵەوی خۆی لەدەست بەربووبوو، جارێکی دی لەبن لێوانەوە گوتی:

- هەروا زوو!

نیگا لاڤە ئامێزەکەی لە دەرگای لە دەرگای ژووری نووستنەکە بوو کە دەرگاکەی کرابووەوە.

جۆرج، ئەوی لە خۆی دوورخستەوە و بە ڕاوێژێکی بلەز گوتی:

- دەبێ تا زووە بڕۆم، دەنا دێر دەکەوم.

هەنگێ ڤیرجینی، لێوەکانی بردە پێشەوەو جۆرج ڕاموسانێکی ڕەوتەنی کرد، پاشان چەترەکەی کە فەرامۆشی کردبوو، دایە دەستی و دووبارە گوتی:- دەی، دەی پەلە بکە. لە سەعات سێ تێپەڕیوە.

ڤیرجینی، بزەیەکی بە ڕوویدا دا وگوتی:- سبەی شەو، سەعات حەوت.

جۆرجش بەرسڤی دایەوە: باشە سبەی شەو، سەعات حەوت.

لە سەرجادەکە لێکدی هاوێر بوون. ڤیرجینی بەسەمتی ڕاستا پێچی کردەوە و جۆرج بەسەمتی چەپدا.

دوروا، تا بولڤاری بازنەیی ڕۆیی، ئەوسا خۆی بە بولڤاری مالزبدا کرد وبەدەم پیاسەوە تەیکرد. وەختایەک بە بەر شیرینیخانەیەکدا ڕەت دەبوو، چاوی بە شابەڕووی بە شەکر کەوت کە لە قاپی کریستاڵیدا، لە جامخانەکەدا دانرابوو. بەخۆی گوت:

" نیو کیلۆیەک لەمە بۆ کلوتیلد دەکڕم، حەزی لەم جۆرە شابەڕووەیە. "

نیو کیلۆی کڕی، دووکاندارەکە بۆی لە پاکەتێک کرد و دایە دەستی.

سەعات چوار خۆی بە ئاپارتمانەکەدا کردەوە و بە دەم چاوەڕوانی ماشقەکەیەوە دانیشت.

کلوتیلد، کەمێک دێر کەوت، چونکە شووەکەی بۆ پاریس زڤڕیی بووەوەو هەشت ڕۆژ دەمایەوە. لە جۆرجی پرسی:- دەتوانی سبەی شەو بۆ شام، بۆ ماڵی ئێمە بێی؟ مێردەکەم بە دیتنت خۆشحاڵ دەبێت.

- نە، سبەی شەو لە ماڵی سەرۆک دەعوەتم. هەندێ سات وسەودای سیاسی دارابیمان هەیە کە مژوولی کردووین.

کلوتیلد، کڵاوەکەی دانا و ئەوسا دوگمەکانی بلووزەکەی کە زۆر تەنگ وبەدەن چەسپ بوو، ترازاند.

جۆرج، پاکەتە شابەڕووەکەی لەسەر سۆپاکە دانا وگوتی:

- کەمێک شابەڕووی بە شەکرم بۆت هێناوە.

کلوتیلد، لە خۆشحاڵیا، دەستەکانی بەیەکا ماڵی وگوتی:

- دەستخۆش بێ، ئەزیەتت کێشاوە.

پاکەتەکەی هەڵگرت، شابەڕوویەکی نایە دەمی و تامی کرد، ئەوسا گوتی:

- چەند خۆش وبەتامە. لەوەدەچێ هەمووی بخۆم و هیچ بۆ تۆ نەیەڵمەوە.

ئەوسا بەجۆش وخرۆشێکی لەزەتخوازانەوە جۆرجی بە نیگا دابێژت وگوتی:- تۆ هەموو حەزەکانی من دێنیتە دی.

بە کاوەخۆ شابەڕووەکانی دەخوارد و هەموو جارێ تەمەشایەکی ناو پاکەتەکەی دەکرد تا بزانێ تیا ماوە یان نا. ئەوسا گوتی:- ئێ، نها وەرە لە سەر ئەم قەنەفەیە دانیشە، منیش لەبەینی لاقەکانت دادەنیشم، ئەم گاڵ گاڵیانەم دەخۆم، واهی زۆر باشتر بەدڵمەوە دەنووسێت.

جۆرج، بزەیەکی بۆکرد، لە سەر قەنەفەیەک ڕۆنیشت و کلوتیلدی لەباوەشی خۆیا دانا، وەکو چۆن خانم ڤالتر لە باوەشی دانیشتبوو.

جارجارێ سەری بەلای جۆرج دا بەرز دەکردەوەو بە زاری پڕەوە دەیگوت:

- دەزانی گیانەکەم خەوم پێوە بینیت. لەخەوما بە دوو قۆڵی سواری وشترێک بووبووین و چووبووینە سەفەرێکی دوور ودرێژ. وشترەکە دوو کۆپەوانەی هەبوو وهەریەکەمان لە سەر یەکێکیان دانیشتبووین، بەبیابانێکا دەڕۆیشتین. چەند بابۆڵە وسەندویچ وبوتڵێ شەرابمان دەگەڵ خۆماندا بردبوو، لە سەر وشترەکەوە قەپمان لە بابۆڵەکان دەدا و شەرابمان بە سەرا دەکرد. بەلام من بێتاقەت بووم، چونکە نەمان دەتوانی هیچ کارێک بکەین، زۆر لە یەکدییەوە دوور بووین و من حەزم دەکرد پیادە ببم.

جۆرج گوتی:- منیش حەز دەکەم پیادە بم.

بەو دیمەنە پێدەکەنی، کلوتیلدی هاندەدا زیاتر قسان بکات، قسەی هەلەق و مەلەق بکات، وئەم بابەتە چیرۆکە مندالانەیە بگێڕێتەوە و ئەم ڕەفتار و ئەتوارە مندالانەیە، کە تایبەتە بە ناز ونەوازشی ژنانی ئاشقەوە، بنوێنێت. ئەم ئەتوار وقسە مندالانانەیەی کە لە زاری خانم دوماریلەوە

دەهاتە دەریێ ئەوەندە خۆش و بەلەزەت بوو هەر مەپرسە. کەچی کە هەمان ئەو قسانەی لە زاری خانم ڤالترەوە دەژنەوت، بێزار دەبوو. لەگیانی خۆی وەڕەز دەبوو.

کلوتیلدش بە جۆرجی دەگوت: " گیانەکەم، بچکۆلەکەم، گورپە جوانەکەم . " ئەم وشانەی لە زاری ئەوەوە زۆر پێخۆش بوو، لە نەوازشی لەزەت بەخش دەچوو. بەلاّم چەند خولەکێک لەوەپێش کە خانم ڤالتر هەمان ئەو قسانەی دەکرد، پێی قەلّس دەبوو، دەهری دەکرد، بێزاری دەکرد. چونکە پەیڤ ووشەیێ عاشقانە کە هەمیشە یەکسانە، هەمان پەیڤ و وشەن، تامی ئەو دەم وزارە دەدات کە لێوەی دەردێت.

بەلاّم جۆرج، هەرچەندە لەزەتی لە هەلەق ومەلەق گۆییەکانی کلوتیلد دەبینی، بیریشی لە لای ئەو هەفتا هەزار فرانکەش بوو بە دەستی بکەوێت. لە ناکاوا، دوو چەلان، بە ئەسپایی قامکی بە سەری ماشقەکەیدا کێشا و، لە قسانی خست وگوتی:

– گویێ بگرە، پشە جوانەکەم. کارێکت پێ دەسپێرم کە بۆ مێردەکەتی بکەی. لە زمانی منەوە پێی بلّێ سبەی بایی دە هەزار فرانک لە ئەوراقی قەرزی مەراکش بکڕێت کە حالّی حازر بە هەفتا ودوو فرانکە، دلّنیای دەکەم لە زەرفی سێ هەیڤی دیدا شەست تا هەشتا هەزار فرانک قازانج دەکات. پێی بلّێ ئەمە بەکەس نەلّێت. لە زمانی منەوە پێی بلّێ کە ڤرێکردنی هێز بۆ تەنجە براوەتەوەو حکومەت دانەوەی قەرزەکانی مەراکش لە ئەستۆ دەگرێت، بەلاّم یەک وشە سەبارەت بەم بابەتە بە عەبدەل بەشەر نەلّێت. ئەمە نهێنیەکی حکومەتە کە بۆم کەشف کردوویت.

کلوتیلد، زۆر بە جدی گوێی لە قسەکانی ئەو دەگرت، ئەوسا لەبن لێوانەوە گوتی:

– سوپاست دەکەم. ئەمشەو مەسەلەکە بە مێردەکەم دەڵێم. دەتوانی متمانەی تەواوی پێبکەیت، دڵنیابە ئەم سرە بەکەس ناڵێت. پیاوێکی سرقایمە. خەمت نەبێ.

پاش ئەوەی هەموو شابەڕووەکەی خوارد، فووی کردە زەرفە کاغەزینەکە و مستێکی پێدا کێشا، تەقاندی و خستیە ناو موغەیرییەکەوە، گوتی:

– دەی نها با بڕۆین پاڵبکەوین. پێش ئەوەی لەجێی خۆی هەستێ دەستی بە ترازاندنی دوگمەکانی ئێلەکەکەی جۆرج کرد. لە ناکاوا وەستا، بە دوو قامکان موویەکی درێژی، لە جێ دوگمەیەک دەرکێشا و دەستی بە پێکەنین کرد:– سەیرە، موویەکی مادلینت لەگەڵ خۆتا هێناوە. چەند مێردێکی بەوەفا و ئەمەکداریت.

ئەوسا، لە پێکەنین کەوت و بەدیقەت لەو تاڵە مووەی کە بە دەستیەوە بوو، ورد بووەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:– بەڵام ئەمە مووی مادلین نییە، ئەمە قاوەییە.

جۆرج، بە دەم بزەیەکەوە گوتی:– ڕەنگە مووی کارەکەرە تایبەتیەکەی بێ.

لێ کلوتیلد، بەوردی و دیقەتێکی پۆلیسانەوە، تەمەشای ئێلەکەکەی ئەوی دەکرد، موویەکی دیکەی، لە دەوری دوگمەیەکی دی، دۆزییەوە. پاشان مووی سێیەمیشی دۆزییەوە، ڕەنگی هەڵبزرکا وئازای کەوتە لەرزین و بەهاوارەوە گوتی:– ئەها، تۆ دەگەڵ ژنێکا ڕات بواردووە کە مووەکانی لە دەوری دوگمەکانی ئێلەکەکەت هاڵاندووە.

جۆرج کە حەپەسا بوو، بە دەمەلاڵکێوە گوتی:

- ئەوە شێت بووی، تۆ سەهووی...

لە ناکاوا بیری کەوتەوە، پەی بە مەسەلەکە برد، پەشۆکا و بە ڕاوێژێکی تەوسامێزەوە نکۆڵی کرد، هەرچەندە پێی ناخۆش نەبوو کە ماشقەکەی گومانی ئەوەی لێبکات کە جگە لەو دەگەڵ ژنانی دیکەشدا سەر وسەودای هەیە.

کلوتیلد، لە سەر جسوجۆیەکەی خۆی بەردەوام بوو، مووی دیکەشی دۆزییەوە، مووەکانی لە دەوری قوپچەکان کردەوە وهەڵیرشتنە سەر ئەرزەکە.

بەغەریزە و تەبعی فێڵبازانەی ژنانەی خۆی، پەی بە مەسەلەکە برد، بە توورەیی و بە ئەوکی پڕ لە گریانەوە هاواریکرد:- ئەم ژنە خۆشی دەوێی و ویستویەتی شتێکی ئەوت وەکو یادگاری لەلا هەبێت... ئاە، کە پیاوێکی ناپاک و خیانەتکاری...

پاشان لە ناکاوا هاوارێکی کرد، هاوارێکی توونَد، زادەی خۆشحاڵییەکی توورە: " ئاە... ئا... پیرەژنە... یەکێک لە مووەکان سپیە... نۆبەتی ئەو قەوانەیە... یانی پیرەژنانیش نابوێری... پێم بڵێ، ئەو پیرەژنە لە ڕای عەشقبازی لەگەڵیا، پارەت دەداتێ؟ پێم بڵێ...پارەت دەداتێ تا لە گەڵیا بخەوی، ڕابوێری؟ ئاە... یانی وات لێهاتووە، پارە وپول لە پیرەژنانیش بکێشیتەوە... کەواتە تەواو ئیدی پێویستت بە من نییە... ئەو ژنە بکە بەدۆستی خۆت... "

هەستا، بە هەشتاو ڕۆیی بۆلای بلوزەکەی کە لەسەر کورسیەکی دانابوو و بلەز لەبەری کرد.

جۆرج، بە تەریقیەوە ویستی نەیەڵێت بڕوات، بەدەمەلاڵکێوە گوتی:

- نا، کلو... خۆت شێت مەکە... خۆیشم نازانم ئەم مووانە چین بە سەر ئێلەکەکەمەوە... گوێ بگرە... مەڕۆ... واز بێنە... مەڕۆ...

کلوتیلد، بەردەوام دەیگوتەوە:- پیرەژنەکە بکە بەدۆستی خۆت، بڕۆ بۆلای ئەو... با مووەکانیت بۆ بکەن بە ئەنگوستیلە... بە مووە سپیەکانی... هەڵبەتە مووی سپی زۆر بۆ ئەم کارە...

بە پەلەپەل و بە تووڕەیی جلەکانی لەبەرکرد، کڵاوەکەی لە سەر کرد، تۆڕی کڵاوەکەی دادایەوە سەر ڕوخساری. دەرگاکەی ڤەکرد و لە ئاپارتمانەکە وەدەرکەوت، جۆرج، حایر وحەپەساو، گێژ ووێژ لەجێی خۆی وشک بووبوو.

هەرکە بەتەنێ مایەوە، لە ناخی دڵەوە لە خانم ڤالتر، لەم پیرەژنە پەتیارەیە، دایکی دوو کیژی گەورە تووڕە بوو! شەرت بێ بەڵایەکی وای بەسەر بێنم کە هەرگیز لەبیری نەچێتەوە، چێشتێکی بۆ لێبنەم بستێ ڕۆنی لەسەر بێ.

ئاوێکی دا بە دەم وچاوە سوور هەڵگەڕاوەکەیدا، ئەوسا بەدەم خەیاڵی ئەوەوە کە چۆن تۆڵەی لێبسەنێت، لە ئاپارتمانەکە وەدەرکەوت. ئەمجارەیان ئیدی نایبورێت، نا بە هیچ کلۆجێ نایبورێت! بەدەم پیاسەوە هات تا گەییە بولڤار، ئیدی لەبەر دەرگای جواهیرفرۆشێک وەستا و کەوتە تەمەشای سەعاتێکی بەرباخەڵان کە زەمان پێویکی سەیری هەبوو. دەمێ بوو حەزی لەمجۆرە سەعاتە بوو. نرخەکەی هەزار وهەشت سەد فرانک بوو.

لە ناکاوا موچوڕکەیەکی خۆشحاڵی پێداهات و بەخۆی گوت:

- "ئەگەر هەفتا هەزار فرانکەکەم دەست بکەوێ دەتوانم ئەم زەمان پێوە بکڕم."

بە خەیاڵ، دەستی بە ژماردن و هەڵسەنگاندنی ئەو کار وپرۆژە و شتانە کە دەیتوانی بەم هەفتا هەزار فرانکە بیانکات و بیانکڕێت.

لە هەوەڵەوە خۆی بۆ ئەنجوومەن کاندید دەکات. پاشان زەمان پێوەکەی (کرونومەتر) دەکڕیت، پاشان تێکەڵاوی سەوداو مامەڵەی بۆرسە دەبێت... و دوای ئەوەش... حەزی لێنەبوو بۆ بارەگای ڕۆژنامەکە بڕوات، حەزی دەکرد پێش ئەوەی ڤالتر بدینێ، قسە دەگەڵ مادلیندا بکات و وتارەکەی بنووسێت. بۆیە بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت.

پێش ئەوەی بگاتە کوچەی دروێ، لە ناکاوا وەستا، لە بیری چووبوو بڕوات لە حاڵی کۆنت دوڤیدریک بپرسێت کە ماڵەکەی لە کوچەی شوسەدانتن بوو. بۆیە ڕێ و ڕێ گەڕایەوە و بەدەم ڕێوە بیری لە ئایندەی پرشنگدار دەکردەوە، بیری لە بویەر و واریقاتی خۆش، شتێن باش، دڵنەواز دەکردەوە. بیری لەو پارە مۆڵە دەکردەوە کە قەرار بوو بەو نزیکانە بە نسیبی بێت و، هەڵبەتە بیری لەم لاروشە بودەڵە و چروکە و، لە ئاغاژنە قۆتڕەکەش دەکردەوە.

توورەبوون و تۆرانەکەی کلوتیلدی زۆر بەلاوە گرینگ نەبوو، چونکە زۆرچاکی دەناسی و دەیزانی زوو دەیبورێت و لەگەڵی ئاشت دەبێتەوە.

وەختایەک لە دەرگاوانەکەی پرسی ماڵی کۆنت دوڤیدریک لە کامە نهۆمدایە و لە هەمان کاتدا پرسی:

- حاڵی چۆنە، بیستوومە لەم ماوەیەدا نەخۆشبووە.

دەرگاوانەکە بەرسڤی دایەوە:

– بەڵام حاڵی جەنابی دوڤیدریک زۆر خراپە، ئاغا لەوە ناچێت بگاتە سبەینێ. نەخۆشییەکە گەییوەتە دڵی.

دوروا، بەجۆرێ نارەحەت بووبوو کە نەیدەزانی دەبێ چ بکات! ڤیدریک لە حاڵی مردندایە. تەواو پەشۆکا، بیری هێندە خراپی بە زەیندا دەهات، کە زاتی نەدەکرد، لە دڵی خۆشیا بیڵێت.

بە پچرپچری بە دەرگاوانەکەی گوت: ˚ مەمنوونم... دەگەڕێمەوە... ˚ بێئەوەی خۆیشی بە دروستی بزانێ دەیەوێ چ بڵێت. ئەوسا خۆی هەڵدایە ناو گالیسکەکەوەو بۆ ماڵی خۆی زڤڕییەوە.

مادلین بۆ ماڵ گەڕابووەوە. بە هانکەهانک و بە هەشتاو خۆی بە ژوورەکەی ئەودا کرد تا بلەز هەواڵەکەی پێ رابگەیەنێت:– دەزانی؟ ڤیدریک لە حاڵی مردندایە.

مادلین ڕۆنیشتبوو خەریک بوو نامەیەکی دەخوێندەوە. سەری هەڵێنا وپرسی:– چی؟ چیت گۆ؟... چی چی؟... چیت گوت؟

– ˚ گوتم کە ڤیدریک حاڵی بێ حاڵە، نەخۆشیەکە گەییوەتە دڵی و خەریکە دەمرێت. ˚ ئەوسا لەسەری ڕۆیی: ˚ بەتەمای چ بکەی؟ ˚

مادلین، ڕەنگی تێکچوو، لە جێی خۆی هەستا، گۆناکانی گرژ بوون، دەلەرزین، ئەوسا ڕوخساری لە نێو هەردوو دەستی نا وبە توندی دەستی بەگریان کرد. لە جێی خۆی وەستابوو، لەداخا و بەدەم هەنسک هەڵدانەوە سەراپای دەلەرزی.

– من... بۆ ئەوێ دەڕۆم... خەمی منت نەبێ... نازانم کەی دەگەڕێمەوە... چاوەڕوانی من مەکە...

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- زۆرچاکە، بڕۆ.

تەوقەیان دەگەڵ یەکدیدا کرد ومادلین هێندە بلەز لە ماڵ وەدەرکەوت، کە لە بیری چوو دەستکێشەکانی ببات.

جۆرج، بەتەنێ شێوی خوارد و پاشان دەستی بەنووسینی وتارەکەی کرد. وتارەکەی دەقاودەق بەگوێرەی ئەو ئامۆژگاریانە نووسی کە وەزیر پێی دابوو، وای لە خوێنەران گەیاندبوو کە ڤڕێکردنی هێز بۆ مەراکش سەر ناگرێت. ئەوسا وتارەکەی بۆ ئۆفیسی ڕۆژنامەکە برد، چەند خولەکێک قسەی دەگەڵ سەرۆکدا کرد و بەدەم مژدان لە جگەرەکەی، بەدڵێکی شاد وئاسوودەوە، بێئەوەی بەخۆیشی بزانێ بۆ، لە ئۆفیسی ڕۆژنامەکە هاتەدەرەوە.

ژنەکەی نەزڤڕی بووەوە، چووە ناو جێگاوە ولێی خەوت.

مادلین، نزیکی نیوە شەو گەڕایەوە. جۆرج کە لە ناکاوا لەخەو ڕاپەڕی بوو، هەستا و لەناو جێگاکەدا دانیشت. لەژنەکەی پرسی:- چی بوو؟

تاکو ئێستا، هەرگیز مادلینی بەم ژاکاوی و پەرێشانییە نەبینی بوو، مادلین لەبن لێوانەوە گوتی:- مرد.

- حەیف! فریا نەکەوت شتێک بە تۆ بڵێت؟

- هیچ. کە من گەییمە ئەوێ لە خۆ بووبووەوە.

جۆرج لە فکران ڕۆچوو. هەندێ پرسیاران دەهاتنە سەر زمانی و نەدەوێرا بیانکات.

ئەنجام گوتی:- وەرە ونبوو.

مادلین، بە هەشتاو و جلەکانی داکەند و لەپاڵ ئەودا و لە سەر تەختەخەوەکە ڕاکشا.

جۆرج، دووباره پرسی:- باشه، له کاتی مردنه‌که‌یا، هیچ خزم وخوێش و که‌س وکارێک به‌دیارییه‌وه نه‌بوو؟

- جگه له خوشکه‌زایه‌کی، که‌سی دی به‌دیاره‌وه نه‌بوو.

- ئه‌م خوارزایه‌ی ( خوشکه‌زا ) زوو زوو سه‌ری ده‌دا؟

- نا، ده دانه ساڵ بوو یه‌کتریان نه‌بینی بوو.

- ئه‌دی خزم وکه‌سی دیکه‌شی هه‌ن؟

- نه، باوه‌ڕ ناکه‌م.

- له‌م حاڵه‌دا... میراته‌که‌ی به‌م خوارزایه‌ی ده‌بڕێت، وانا؟

- نازانم.

- ئه‌م ڤیدریکه پیاوێکی پاره‌دار بوو؟

- ئه‌رێ، زۆر زه‌نگین بوو.

- ده‌زانی، سه‌روه‌ت و سامانه‌که‌ی به‌نزیکه چه‌ند بوو؟

- نا، به‌دروستی نازانم. ره‌نگه یه‌ک دوو ملیۆنێک بێ.

جۆرج، چیتر له سه‌ری نه‌ڕۆیی. مادلین، مۆمه‌که‌ی کوژانده‌وه‌و له پاڵ یه‌کا، مات وبێده‌نگ، به‌ده‌م بیروخه‌یاڵانی جۆراوجۆره‌وه، پاڵکه‌وتن.

جۆرج، خه‌وی زڕا. تها ئه‌و هه‌فتا هه‌زار فرانکه‌ی که خانم ڤالتر قه‌ولی پێدابوو، زۆرکه‌م ده‌هاته به‌رچاوی. له ناکاوا هه‌ستیکرد مادلین خه‌ریکه ده‌گری. بۆ ئه‌وه‌ی دڵنیا ببێت پرسی:- خه‌وتوویت؟

- نه.

ده‌نگی گریاناوی بوو و به ده‌نی ده‌له‌رزی. جۆرج دووباره گوتی:

- به ڕاست بیرم چوو پێت بڵێم که ئەم جەنابی وەزیرەت کڵاوی له سەر ناوین.

- چۆن؟

هەنگێ ئەو سات وسەودا وئاین و ئۆینەی، که لاروش و ڤالتر له بەینی خۆیاندا کردبوویان، لەسیری تا پیازی بۆ گێڕایەوە.

وەختێ له قسەکانی بووەوە، ژنەکەی پرسی:- ئەم شتانەت له کوێوە زانی؟

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:- ڕێگەم بده که لەوەی پتر بەتانی ئەم بابەتەدا نەچم. تۆ هەندێ شێوازت بۆ وەدەست هێنانی زانیاریان هەیه که من هیچکات ئەوەت لێناپرسم. منیش هەندێ سەرچاوە و چاڤکانی تایبەت بەخۆم هەیه که حەزناکەم کەس پێی بزانێت. بەڵام له دروستی ئەو زانیاریانەی که پێمگوتی، دڵنیابە.

هەنگێ مادلین، لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ، دوور نییە، دەشێت... من گومانم کردبوو که ئەو جووته دەیانەوێ بەبێ ئاگاداری و بەشداری ئێمە، کەین و بەینێک له بەین خۆیاندا بکەن.

لێ جۆرج که خەوی زڕابوو، له ژنەکەی نزیک بووەوە و بەسۆزەوە گوێی ماچکرد. مادلین، بەتووندی ئەوی لەخۆی دوور خستەوە:

- تکایه وازم لێبێنه، باشه؟ حاڵ و حەوسەڵەی ئەم کارانەم نییە.

جۆرج، به گوێڕایەڵی، ڕووی بۆ دیوارەکه وەرگێڕا وپشتی کرده ئەو، ئەوسا چاوەکانی نوقاندن وئاقیبەت خەو بردییەوە.

## ( ٦ )

دەر و دیواری کڵێساکە بە قوماشی ڕەش داپۆشرابوو. سەرینێکی گەورە کە تاجێکیان لەسەر دانابوو، ئەوەی بە ڕێبواران دەگوت کە ئەسڵزادەیەک مردووە.

ڕێوڕەسمەکە تازە کۆتایی هاتبوو وحەشیمەتەکە خەریک بوو بڵاوەیان لێدەکرد. وەختایەک کە بە بەردەم تابووتەکەدا دەبوورین وسەری ڕێزیان بۆ جەنازەکە دادەنەواند، تەوقەیان دەگەڵ خوارزاکەی کونت دوڤیدریک دا دەکرد و سەرخۆشیان لێدەکرد.

کە دوروا و ژنەکەی لە کلێساکە هاتنە دەرێ، بە دوو قۆڵی و شانبەشانی یەکدی وبەپێیان بەرەو ماڵی خۆیان ڕۆیشتن. هەردووکیان بێدەنگ و لە فکران ڕۆچووبوون.

سەرەنجام جۆرج وەکو ئەوەی دەربارەی خۆی قسەبکات گوتی:- بەڕاستی زۆر سەیرە.

مادلین پرسی:- چی سەیرە، دۆستی ئازیز.

- کە ڤیدریک شتێکی بە ئێمە نەبەخشیوە.

مادلین، سووری سوور بووەوە، وەکو ئەوە بوو لە ناکاوا تارایەکی سووریان بەسەر و ڕووە سپیەکەیدا کێشابێ، گوتی:- بۆچی، دەبێ شتێک بە ئێمە ببەخشێت، هیچ هۆیەکی بۆ ئەم کارە شک نەبردووە.

سووکە هەڵوەستەیەکی کرد وئەوسا لە سەری ڕۆیی:

- ڕەنگە وەسێتنامەیەکی لای مەحزەردارەکەی دانابێ. جارێ ئێمە هیچ شتێک لەم بارەیەوە نازانین.

جۆرج، کەمێک لە فکران ڕاچوو پاشان لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ، دوورنییە، چونکە ئەو پیاوە دۆستی هەردووکمان بوو. هەفتەی دوو چەلان لە ماڵی مە شامی دەکرد، هەرکاتێ ئارەزووی بکردایە بۆ ماڵی مە دەهات، یانی ماڵی مە وەکو ماڵی خۆی وابوو، بە تەواوی ماڵی خۆی بوو. تۆی وەکو کیژی خۆی خۆشدەویست و نە منداڵێکی هەبوو، نە برایەک نە خوشکێک، تەنیا یەک خوارزا. خوارزایەکی دووری هەبوو. بەڵێ بێگومان دەبێ وەسێتنامەیەکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتبێت. من چاوم لە هیچ نییە، تەنیا یەک یادگاری، تەنیا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئێمەی لەبیر بووە و، خۆشی ویستووین و سەبارەت بەو پەیوەندییەمان دەگەڵ وی دا بەوەفا بووە. بەهەرحاڵ نیشانەیەکی خۆشەویستی دەرهەق بەمە قەرزدارە.

مادلین، بە قەڵافەتێکی بیرناک و بێموبالاتەوە گوتی:

- بەڕاستی، ئەگەری ئەوە هەیە کە وەسێتنامەیەکی لەپاش خۆی بەجێ هێشتبێت.

وەختایەک بۆ ماڵ گەڕانەوە، کارەکەرەکە نامەیەکی دایەدەستی مادلین. نامەکەی کردەوە، خوێندییەوەو پاشان دای بە مێردەکەی.

نووسینگەی بەڵگەنامانی فەرمی لامانور

ژمارە هەڤدە، شەقامی دیڤۆژ

خانمی ئازیز

بە شانازییەوە، داواتان لێدەکەم کە لە یەکێک لە ڕۆژانی سێ شەممە، چوارشەممە یان پێنج شەممەدا، لە نێوان سەعات دوو بۆ چواری دوانیوەڕۆ، سەبارەت بە بابەتێک کە پەیوەندی بە ئێوەوە هەیە، لە نووسینگەکەی من دا ئامادەبن.

**لەگەڵ ڕێزدا: لامانور.**

جۆرجیش لە لای خۆیەوە سوور بووەوە.

- دەبێ سەبارەت بەهەمان مەسەلە بێ. سەیرە کە نامەکەی بۆ تۆ نووسیوە نەک بۆ من کە سەرگەڤاری خانەوادەم.

مادلین، لە هەوەڵەوە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، لێ دوای بیرکردنەوەیەکی کەم گوتی:- دەتەوێ هەر ئێستا بۆ ئەوێ بڕۆین؟

- بەڵێ، خراپ نییە.

دوای خواردنی فراڤین، بەرەو نووسینگەی ناڤبری کەوتنەڕێ. هەرکە خۆیان بە نووسینگەکەی لامانوردا کرد، سکرتێرەکە هەرکە ئەوانی بینی بە هەشتاو و بەڕێزێکی تایبەتیەوە لەبەریان هەستا .و بۆ ژوورەکەی سەرۆکی ناردن.

سەرۆک پیاوێکی گردەڵەی قەڵەو بوو، ئازای بەدەنی قەڵەو بوو. سەری وەکو گۆیەک بوو، کە بە گۆیەکی گەورەترەوەیان نابێ. دوو پای هێندە بچووک و خڕی هەبوو کە ئەوانیش لە دوو گۆی بچووکتر دەچوون.

سەرۆکی نووسینگەکە سڵاوی لێکردن، کورسی بۆ دانان و پاشان ڕووی کردە مادلین وگوتی:

- خانم، بۆیە داوام لێکردبوویت کە بێی بۆ نووسینگەکەم تا لە دەقی وەسێتنامەکەی کۆنت دو ڤیدریک، ئەوەندەی پەیوەندی بە تۆوە هەیە ئاگادار بیت.

جۆرج، نەیتوانی جڵەوی خۆی بگرێت و لەبن لێوانەوە گوتی:- مەزەندەکەم دروست دەرچوو.

سەرۆکی نووسینگەکە لە سەری ڕۆیی:

دەقی وەسیەتنامەکەتان، کە زۆریش کورتە بۆ دەخوێنمەوە. کاغەزێکی لە ناو جێگا کاغەزەکەی بەردەمی هەڵگرت و کەوتە خوێندنەوەی:

" من، کە لە خوارەوە ئیمزام کردووە، پل – ئەمیل – سیپرین – گونتران، کۆنت دوڤیدریک، بە کەماڵی سەلامەتی بەدەنی و دەروونی دوا خواستەکانی خۆم بەم جۆرەی خوارەوە دەردەبڕم: چونکە مەرگ شەرمی لە کەس نییە و دەشێت لە هەر سات و ئانێکا بەرۆکی هەموو کەسێک بگرێت، من بۆ ئەوەی پێشگیری لە هەر غافڵگیرییەکی مردن بکەم، ئەم وەسیەتنامەیەم نووسیوە و بە ئەمانەت لە نووسینگەکەی لامانور دایدەنەم:

چونکە میراتگری دەرەجە یەکم نییە، هەموو سەروەتەکەم کە بریتییە لە ئەوراقی بەهادار بە بڕی شەش سەد هەزار فرانک و مردە ماڵ و موڵکان کە بایی نزیکەی پێنج سەد هەزار فرانک دەبێ، بێ هیچ قەید و شەرتێ بە خانم کلر مادلین دوروا دەبەخشم. تکای لێدەکەم ئەم دیارییە، لە دۆستێک کە ئیدی لە ژیانا نەماوە، وەکو نیشانەی مەحەبەتێکی بێ ڕیا، قووڵ و پڕ حورمەت و ڕێز قەبووڵ بکات. "

سەرۆکی نووسینگەکە لە سەری ڕۆیی:

– ئەوەیە. ئەم وەسیەتنامەیە لە مانگی ئابی ڕابردووا نووسراوەو ئەڵتەرناتیڤی وەسیەتنامەیەکی دیکەیە بە هەمان ناوەڕۆک، کە دوو ساڵ لەمەپێش بە ناوی خانم کلر مادلین فورستیەوە نووسرابوو. من ئەو وەسیەتنامەیەشم لای خۆم هەڵگرتووە کە لە هەنبەر هەرجۆرە نارەزاییەکی کەس

وکاری کۆنت دوڤیدریک دا دەیسەلمێنێت کە خواستی کۆنتی ڕەحمەتی هەمان خواست بووە و هیچ گۆڕانێکی بەسەر نەهاتووە.

مادلین، ڕەنگی تەواو ژاکابوو، چاوی بڕی بووە پێیەکانی خۆی، جۆرج بە تووڕەیی، بە سەری قامکان، سمێڵەکانی بادەدا، سەرۆکی نووسینگەکە، پاش سووکە هەڵوەستەیەک دووبارە گوتی:

– هەڵبەتە ئەم مەرجەش هەیە ئاغا، کە خانمتان بەبێ ڕەزامەندی تۆ ناتوانێ ناوەڕۆکی ئەم وەسێتانەمەیە قەبووڵ بکات.

دوروا، لە جێی خۆی هەستا و بەڕاوێژێکی وشک گوتی:

– پێویستم بە ماوەیەکە کە بیر لەم مەسەلەیە بکەمەوە.

سەرۆکی نووسینگەکە بزەیەکی هاتێ و سەرێکی دانەواند و بە ڕاوێژێکی مەحەبەت ئامێزەوە گوتی:

– ئاغا، من لەو واز وازی و دوودڵیەی تۆ تێدەگەم. پێویستە ئەمەش بڵێم کە خوارزای جەنابی دوڤیدریک کە ئەم بەیانییە دەقی وەسێتنامەکەی بینی، گوتی ئەگەر سەد هەزار فرانکێکی پێ بدرێت، ئامادەیە بێ هیچ ناڕەزاییەک ناوەڕۆکی وەسێتنامەکە قەبووڵ بکات. بەڕای من وەسێتنامەکە هیچ عەیب و ئیرادێکی نییە، بەڵام سکاڵای مافەوانی، هەرا وهەنگامەیەک دەنێتەوە کە ڕەنگە واباشتر بێ خۆتانی لێ ببوێرن. ئیدی خەڵکی هەمیشە نارەسەنانە حوکم دەدەن. بە هەرحاڵ، بێزەحمەت دەتوانن، بەرلە ڕۆژی شەممە، ڕای خۆتانم لە بارەی تێکڕای ئەم بابەتەوە، پێڕابگەیەنن؟

جۆرج، سەرێکی دانەواند وگوتی:- بەڵێ قوربان.

ئەوسا سڵاوێکی تەشریفاتی لە سەرۆکی نووسینگەکە کرد، وەستا تا ژنەکەی، کە بێدەنگ بوو، لە پێش ئەوەوە بچێتە دەرێ وبەخۆیشی بە قەڵافەتێکی هێندە گرژ ولە خۆڕازییەوە دوای ئەو کەوت، کە خاوەن نووسینگەکە حەپەسا.

هەرکە گەیینەماڵێ، جۆرج، بە توندی دەرگاکەی داخست، کڵاوەکەی، فڕێدایە سەر تەختەخەوەکە وگوتی:

- تۆ ماشقەی ڤیدریک بوویت؟

مادلین، کە خەریک بوو تۆڕەکەی سەر ڕوخساری هەڵدەدایەوە، لە ناکاوا وبەتووندی ئاوڕی لای ئەوی دایەوە:- من؟ ئاخ؟

- بەڵێ، تۆ. ئینسان، لە خۆڕایی هەموو سەروەت و سامانەکەی بۆ ژنێک بەجێ ناهێڵێت ئەگەر...

مادلین، بەجۆرێ دەلەرزی کە نەیدەتوانی دەرزی و سنجاقەکانی تۆڕە ناسکەکەی، لە قژی دەربێنێت.

دوای ڕامانێکی کەم، بە دەنگێکی گونگ، بە پچڕپچڕی گوتی:

- چی... چی... ئەوە شێت بووی... تۆ... تۆ... تا تۆزێ لەمەپێش، بەهیوای ئەوە نەبووی... کە کۆنت شتێکی بە میرات بۆ دانابی؟

جۆرج، لە نزیک ئەوەوە وەستابوو، بە وردی دیقەتی هەموو حاڵەت و سیما گۆڕکییەکانی ئەوی دەدا، وەکو تەحقیقکارێک کە هەوڵدەدات، لە میانی ڕەفتارو ئەتواری تۆمەتبارەوە پەی بە بچووکترین نیشانەی لاوازییەکانی ببات. لە کاتێکا لە سەر هەر وشەیەک دەوەستا، گوتی:

- بەڵێ... دەیتوانی شتێک بۆ من دابنێت، بۆ من... مێردەکەت... بۆ من، دۆستی... تێدەگەی... بەڵام نەک بۆ تۆ...، وەکو دۆست... بۆتۆ، ژنی من. لە دیدی خەڵکی و چۆنیەتی قەزاوەت و داوەری خەڵکییەوە، جیاوازییەکی زۆر سەبارەت بە پەیوەندی من و تۆ لە گەڵ ئەو پیاوەدا هەیە.

مادلینش، چاوی لە دوڕ چاوانی ئەو بڕی بوو. بە شێوەیەکی قووڵ و سەیر، دەتگوت گەرەکیەتی، شتێک لە قوڵایی چاوی ئەودا بخوێنێتەوە، دەتگوت گەرەکییەتی پەی بە ناخی نادیاری ئەو بەرێت، پەی بەو شوێنە بەرێ کە بنیادەم هەرگیز نایگاتێ، مەگەر جارجارێ، لە ساتێکی بێ خەبەری، یان فەرامۆشی، یا گەوجاتیدا، بۆ ساتێکی تیژتێپەڕ، خودی خۆی نیشانبدات، ڕێک وەکو دەرگایەک کە بۆ دەمێکی کورت بە سەر نهێنییەکانی روح و دەروونی بەشەردا بکرێتەوە... ئەوسا بە ئەسپایی گوتی:

- وێڕای هەموو ئەمەش، واپێدەچێ کە ئەگەر... ئەم سەروەتە مۆڵ و گەورەیە ببەخشرابا، مەسەلەکە زۆر سەیرتر و باوەڕنەکردەنی تر دەهاتە بەرچاو.

جۆرج، بە توندی پرسی:- بە چ بەڵگەیەک؟

مادلین گوتی:- چونکە...

هەڵوەستەیەکی کرد و ئەوسا لە سەری ڕۆیی:

- چونکە تۆ کە مێردمی... ماوەیەکی زۆر کەمە ناسیاویت لەگەڵ ئەودا پەیدا کردووە... چونکە من ساڵانێکە دۆست و ئاشنای ئەوم... چونکە یەکەم وەسێتنامەی ئەو کاتە نووسیوە کە فورستیە هێشتا لە ژیانا بوو، ئەوکاتەش دەقی وەسێتانەکە هەر بەسوودی من بووە.

جۆرج، که به هەنگاوی هەڕاوەوە به ژوورەکەدا دەهات ودەچوو، وەستا وگوتی:- تۆ ناتوانی ئەم میراته قەبووڵ بکەیت.

مادلین، به بێ موبالاتی گوتی:

- زۆر ڕاسته، کەواته پێویست ناکا تا شەممە بوەستین، دەتوانین هەر ئێستا لامانور ئاگادار بکەینەوە، ، که ئەو میراتەمان ناوێ.

جۆرج، له هەنبەر ژنەکەیدا وەستا، دووباره بۆ چەند ساتێک چاویان له دورچاوی یەکدی بڕی، هەوڵیاندا، دزه بکەنه ناو شوێنه نادیار و عاسێ و پەنهانەکانی روح و ناخی یەکدی و پەی به هزر وهزرینی یەکدی بەرن. هەوڵیاندەدا، له میانی پرسیارێکی خامۆش و بەجۆشەوە، ویژدانی یەکدی کەشف بکەن. کێشماکێشی نزیکی دوو کەس که لەگەڵ یەکدا دەژین، لێ له یەکدی بێ خەبەرن، لەیەکدی بەگومانن، بۆنی یەکدی دەکەن، چاودێری یەکدی دەکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن بچنه ناخی روحی یەکدییەوە.

جۆرج، له ناکاوا به دەنگی نەوی، ڕوو به ڕووی ئەو گوتی:- دەی دەی، ئیقرار بکه که ماشقەی ئەوبوویت.

مادلین، شانەکانی هەڵتەکاند وگوتی:

- که بەشەرێکی نەفامی... ڤیدریک منی زۆر خۆش دەویست، خۆشەویستیەکی بێ ڕیا وپاک... دوور له هەر مەبەستێک... تەنیا ئەوەندە وهیچی دی.

جۆرج، پێی به عاردیدا کوتا وگوتی:- نا، درۆ دەکەی. دەنا مەحاڵه...

مادلین، بە ئارامی بەرسڤی دایەوە:- ئەوە ڕاستی مەسەلەکەیە و تەواو.

جۆرج، دووبارە دەستی بە هات وچۆ کرد و، ئەوسا دووبارە وەستا:

– کەواتە پێم بڵێ بۆ هەموو سەروەتەکەی بۆتۆ بەجێهێشتووە؟

مادلین، بەبێ موبالاتی بەرسڤی دایەوە:

– شتەکە خویایە. وەکو چۆن خۆت پێشتر گوتت، جگە لە ئێمە، یان بە گوتەیەکی دی جگە لە من هیچ دۆستێکی دیکەی نەبوو. چونکە لە منداڵییەوە منی دەناسی. دایکم لە ماڵی دایک و بابی ئەوا سەرپەرشتیار و دایەنی منداڵ و هاودەمەکانی دایکی ئەو بوو. ئەو بە زۆری دەهات بۆلای من و چونکە هیچ میراتگرێکی ڕاستەوخۆی دیکەی نەبوو، بۆیە منی بە میراتگری خۆی هەڵبژارد. ئەگەری ئەمە هەیە کە لە دڵی خۆیدا کەمێک عاشقی من بووبێ، بەڵام چ ژنێک هەیە، ڕۆژێ لە ڕۆژان پیاوێک بەو جۆرەی خۆش نەویستبێت؟ ئەم خۆشەویستیە پەنهان و ڕانەگەینراوە، کردوویەتیە کارێک، کاتی کە ویستوویەتی وەسێتنامەکەی بنووسێت، ناوی منی بیر بکەوێتەوە، بۆ نا؟ هەموو دووشەممەیەک کە بۆ ماڵی مە دەهات گوڵی بەدیاری بۆ دەهێنام. بەڵام تۆ هیچ سەرت لەم کارەی ئەو نەدەسوڕما، وانییە؟ ئەمڕۆکەش، لەبەر ئەوە سەروەت وسامانەکەی بەمن بەخشیوە، چونکە کەسی تری نەبووە سەروەتەکەی پێ ببەخشێت. بە پێچەوانەوە، ئەگەر میراتەکەی بە تۆ

بیەخشیبا، زۆر سەیر دەبوو، بۆچی دەبوایە ئەو کارە بکات؟ ئاخر تۆ دەتکردە چی ئەو؟

هێندە بە ئارامی و بە ڕاوێژێکی ئاسایی قسەی دەکرد کە جۆرجی خستە دوودڵییەوە. جۆرج دووبارە گوتی:

- فەرق ناکات، ئێمە ناتوانین لەم هەل و مەرجەدا ئەم میراتیە قەبووڵ بکەین. کاریگەرییەکەی زۆر ناخۆش دەبێت. خەڵکی جۆرەها بیری ناجۆر دەکەنەوە، هەزار و یەک قسە و قسەلۆکم دوادەخەن، پێم پێدەکەنن. هاوکارەکانم لە ئێستاوە بەغیلیم پێدەبەن و خواخوایانە بیانوویەکیان دەست بکەوێ و هێرشم بکەنەسەر. من پێویستە لە هەموو کەسێک پتر لە خەمی ئابڕوو و شۆرەتی خۆما بم. بۆیە مەحاڵە ڕێگە بدەم کە ژنەکەم میراتێک قەبووڵ بکات کە ڕەوشێکی تایبەتی هەیە، ئەویش میراتی پیاوێک کە هەمووان بڵێن عاشقی ژنەکەم بووە. فورستیە لەگینە دەربارەی ئەو بابەتانە چاوپۆشی کردبێت، بەڵام من، نا.

مادلین، بە نەرم ونیانی، لە بن لێوانەوە گوتی:

- زۆرچاکە، دۆستی من، قەبووڵی ناکەین، چش لەو ملیۆن فرانکە، با ئەوەمان نەبێت.

جۆرج، هێشتا بە ناو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد، لەوە دەچوو ڕووی دەمی لە ژنەکەی بووبێ، بێئەوەی ڕاستەوخۆ قسەی دەگەڵدا بکات:

- باشە، بەڵێ، یەک ملیۆن... بە دەرەک... ئەو لە نووسینی ئەم وەسیتنامەیەدا، بیری لەوە نەکردووەتەوە کە چ سەهوویەک دەکات و چۆن پێوەرە ئەخلاقیەکان بن پێ دەکات. بیری لەوە نەکردووەتەوە، من دەخاتە چ

هەڵوێستێکی ناجۆر و مەسخەرە ئامێزەوە... ئەمانە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ تەبع و تەبیعەت و بیرکردنەوە لە ژیاندا... ئەوەندە بەس بوو نیوەی سەروەتەکەی بەمن بەخشیبوایە، ئیدی هەمووشتێک دروست دەبوو و ڕەوتی خۆی وەردەگرت.

لە سەر کورسییەک ڕۆنیشت لاقی خستەسەر لاقان، دەستی بە بادانی سمێڵەکانی کرد، ڕێک وەکو ئەو کاتانەی کە دووچاری ئاریشەیەک یان نیگەرانییەک دەبوو، یان بیرۆکەیەکی دژواری لە مێشکا بوایە.

مادلین، شیش و قولاپەکەی هەڵگرت، کە جارجارێ کاری قولاپدۆزی دەکرد وبەدەم هەڵبژاردنی ئەو داوانەوە کە دەیویست بەکاریان بەرێ، گوتی:- من هیچ قسەیەکم نییە. ئیدی قەرار قەراری تۆیە.

جۆرج، ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، سەرەنجام بە دوودڵییەوە گوتی:

- پیاو بە هیچ جۆرێ تێناگات بۆچی ڤیدریک تۆی بەتاقە میراتگری خۆی هەڵبژاردووە و بۆچی من ڕێگەی ئەم کارەم بەتۆ داوە. قەبووڵ کردنی ئەم سەروەتە بەم شێوەیە جۆرە ئیعترافێکە... جۆرە ئیعترافێکی ناڕاستەوخۆیە لە لایەن تۆوە بە بوونی پەیوەندی ناڕەوای تۆ لە گەڵ ئەودا، هەروەها نیشانەی جۆرە نامەردی و بێ غیرەتییەکە لەلایەن منەوە. دەزانی خەڵکی ئەم قەبووڵکردنەی مە چتۆ لێکدەدەنەوە؟ دەبێ ڕێگەیەک، شێوازێکی زیرەکانە بدۆزرێتەوە تا بتوانرێ دەمی خەڵکی بێتەگرتن. بۆ نموونە دەبێ وا لە خەڵکی بگەیەنرێ کە سەروەتەکەی لە نێوان

هەردووکماندا دابەش کردووە، نیوەی بە مێردەکە و نیوەی بە ژنەکە بەخشیوە.

مادلین پرسی:- من سەردەرناکەم لەم کارە، ئاخر شتی وا چۆن دەبێت لە کاتێکا وەسێتنامەکە زۆر خویایە و بە ڕاشکاوی نووسراوە.

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:- زۆر ئاسانە، تۆ دەتوانی تا لە ژیانای نیوەی میراتیەکە بەمن ببەخشیت. چونکە ئێمە منداڵمان نییە، ئەم کارە شیاوە، بەم شێوەیە ڕێگە لە هەر قسە وقسەڵۆکێکی خەڵکی دەگیرێت و دەمیان دادەخرێت.

مادلین، بە بێ حەوسەڵەیی گوتی:

- لەمەش تێناگەم چۆن دەکرێ ڕێگە لە بەدگۆیی خەڵکی بگیرێت، خۆ دەمی خەڵکی کونە دیوار نییە چەپکێ قوڕی پێدا بدەیت و بیگریت، لە کاتێکا وەسێتنامەکە حازرە وئیمزای ڤیدریکی پێوەیە.

جۆرج، بە تووڕەیی گوتی:- چما ئێمە ناچارین وەسێتنامەکە بە دەر دیواراند هەڵواسین تا هەموو خەڵکی بیدینن؟ چەند بەشەرێکی سا ئەقڵی. بە هەموو خەڵکی دەڵێین کە کۆنت دوڤیدریک سەروەتەکەی بەیەکسانی لە نێوانماندا دابەشکردووە... و تەواو. خۆ تۆ بەبێ پرسی من ناتوانی ئەم سەروەتە وەربگریت. من کاتێ ڕێگە بە تۆ دەدەم کە تۆ نیوەی ئەم سەروەتەم بدەیتێ و من نەبم بە گەپچاڕی خەڵکی.

مادلین، نیگایەکی تیژی کرد وگوتی:- بەدڵی خۆت، من هیچ قسەیەکم نییە.

هەنگێ جۆرج هەستا و دووبارە بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، وای نیشان دەدا، دووبارە دووچاری دوودڵی بووە

و لەهەمان کاتدا خۆی لە نیگای تیژی ژنەکەی دەدزییەوە و لێکدا لێکدا دەیگوت:

- نا... نا، ڕەنگە باشترین کار ئەوە بێ کە بە یەکجارەکی چاوپۆشی لێبکەین... ئەمە زۆر ئابڕوومەندانەترە. ئیدی هیچ قاوێک داناکەوێ. خەڵکی هیچ گومانێک ناکەن.

لە هەنبەر ژنەکەیدا وەستا و درێژەی بە گوتەکانی دا:

- زۆرچاکە ئازیزم، ئەگەر تۆ ڕازی بی، من بەخۆم بۆلای خاوەن نووسینگەکە دەڕۆم و پرس و ڕاشی پێدەکەم. بۆی ڕووندەکەمەوە کە چ ترس و واز وازییەکم لەمبارەیەوە هەیە و پێی دەڵێم کە بڕیارمان داوە میراتیەکە بە یەکسانی لەبەینی خۆماندا دابەش بکەین تا ڕێگە لە قسە وقسەڵۆکی خەڵکی بگرین. کە من نیوەی ئەم میراتە وەربگرم ئیدی هیچ بیانوویەک بۆ خەڵکی نامێنێتەوە کە لەپاشملەمان بڵێن. وەکو ئەوەی بەدەنگی بەرز بەهەموو خەڵکیم گوتبێ: " ژنەکەم بۆیە ئەم میراتە قەبووڵ دەکات کە من، مێردەکەی، قەرار دەدەم کە چ کارێک باشە بیکات و چ کارێک خراپە نەیکات، من ئەمەم قەبووڵ کردووە " ئەگەر وانەبێ قسە وقسەڵۆکانی دنیامان دوادەخرێ و ئابڕوومان دەچێت.

مادلین، زۆر سادە ولەبن لێوانەوە گوتی:- بەدڵی خۆت.

جۆرج، دووبارە دەستی بە چەنەبازی و ڕوونکردنەوەکانی کردەوە:

- بەڵێ، ئەگەر ئەم میراتە بەیەکسانی دابەش بکرێ، ئیدی هەموو شتێک وەکو ڕۆژی ڕوناک عەیان دەبێت. ئێمە دۆستێکمان هەبووە کە نەیویستووە جیاوازیمان لە نێواندا

بکات، کە نەیویستووە بڵێت: "من وەکو لە ژیانا فەرقم نەکردوون، نەمویستووە لە دوای مردنیشم فەرقیان بکەم." هەڵبەتە ژنەکەی پتر خۆش ویستووە، بەڵام کە سەروەتەکەی بەیەکسانی بەسەر ئەو دووەدا دابەشکردووە ویستوویەتی ئەوە بسەلمێنێت کە پەیوەندی بەو ژنەوە، پەیوەندییەکی ئەفلاتونی و دوور لە هەر گومان و ڕیایەک بووە. دڵنیابە ئەگەر بەڕاستی وابوایە ئەم کارەی دەکرد. بیری لەم لایەنەی مەسەلەکە نەکردووەتەوە، بیری لە ئاکامی ئەم کارەی خۆی نەکردووەتەوە. وەکو خۆت چەند خولەکێک لەمەپێش دەتگوت، هەموو هەفتەیەک گوڵی بۆ دێنایت و دیارە ویستوویەتی دوا یادگاریشی بۆتۆ بەجێ بێڵێت، بێئەوەی بیربکاتەوە...

مادلین، بە دەنگێکی مەیلەو تووڕە، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

– باشە. تێگەیشتم. پێویست ناکات هێندە لە سەری بڕۆیت. یەکسەر بڕۆ بۆلای مەحزەردارەکە.

جۆرج، سوور بووەوە، کەوتە دەمەلاڵێ و گوتی:– هەق بە تۆیە، هەر ئێستا دەڕۆم.

کڵاوەکەی هەڵگرت و کە خەریک بوو کە ژوورەکە دەردەکەوت، گوتی:

– مەسەلەی خوشکەزاکەشی بە پەنجا هەزار فرانکێک یەکلایی دەکەمەوە، باشە؟

مادلین، بە غرووڕەوە گوتی:– نە، ئەو سەد هەزار فرانکەی، کە داوای کردووە، بدەیە. دەتوانی هەموو ئەم پارەیە، لە بەشەکەی من دەربێنی و بیدەیتێ.

جۆرج تەواو تەریق بووەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:- نا، ئەوەش لە نێوان هەردووکماندا دابەش دەکەم. ئەگەر هەر یەکەمان پەنجا هەزار فرانک بەو بدەین، هێشتا یەک ملیۆن فرانکی سافیمان بۆ دەمێنێتەوە.

ئەوسا، لە سەری ڕۆیی وگوتی:- خوداحافیز، مادە چکۆلەکەم.

چوو، مەحزەردارەکە ئاگاداربکاتەوە کە ژنەکەی چ بڕیارێکی داوە.

سبەینێ لە نووسینگەی ناڤبریدا، قەراردادێکیان ئیمزا کرد کە بە گوێرەی ئەو قەراردادە مادلین دوروا، لە ژیانی خۆیا پێنج سەد هەزار فرانک لە میراتەکەی خۆی، بە مێردەکەی دەبەخشێت.

وەختایەک لە نووسینگەکە وەدەرکەوتن، چونکە هەواکەی خۆشبوو، جۆرج پێشنیازی کرد تا بولڤار بە پێیان بڕۆن. خۆی لە هەنبەر مادلین زۆر میهرەبان، بە ئەدەب و بە نەزاکەت نیشان دەدا، لە خۆشیا لە کەوڵی خۆی نەدەحەجمی، پێکەنین لە لێوی نەدەبڕا، بە هەموو شتێ پێدەکەنی، بەڵام مادلین غەرقی بیرکردنەوە وکەمێکیش جدی بوو.

ڕۆژێکی پاییزی نیمچە سارد بوو، خەڵکی بلەز ڕێیان دەکرد. جۆرج ژنەکەی بردە بەردەم ئەو جەواهیر فرۆشیەی کە زۆرجار لە جامخانەکەیەوە تەمەشای کرونومەترە دڵخوازەکەی کردبوو. پێی گوت:

- ڕێگەم دەدەی دیارییەکت بۆ بکڕم؟

ما دلین، به بێموبالاتی و لەبن لێوانەوە گوتی:- بەکەیفی خۆت.

چوونە ناو جەواهیر فرۆشییەکەوە. جۆرج لە مادلینی پرسی:

- چ شتێکت حەز لێیە، گەردانە، مووچەوانە، یان گوارە؟

دیتنی جەواهێرات وزێڕ وزیوانی جوان ونگین و بەردێن گرانبەهای پرشنگدار، سارد وسڕییە ڕواڵەتیەکەی مادلینی سڕییەوە و بەنیگایەکی کونجکاوانە و کەمێک تاسەمەندانە کەوتە تەمەشای جامخانەکان.

لە ناکاوا، لە ژێر باندۆری حەزێکی دەروونیدا گوتی:- ئاه، ئەم مووچەوانەیە، چەند جوانە.

مووچەوانەیەکی زنجیری بوو، شێوەیەکی سەیری هەبوو، کە لە سەر هەر ئەڵقەیەکی، نگینێکی جیاواز دانرابوو.

جۆرج پرسی:- ئەم بازنگە بایی چەندە؟

جەواهیر فرۆشەکە گوتی:- سێ هەزار فرانک جەناب.

- ئەگەر بە دوو هەزار و پێنج سەد فرانک دەبێ بۆمی دابنە.

جواهیر فرۆشەکە، کەمێک بیری کردەوە و ئەوسا گوتی:- نەخێر بەڕێز، نابێ.

- دەی، ئەم کرونومەترەشی بخەسەر و بەهەزارو پێنج سەد فرانکی حیساب بکە. هەمووی دەکاتە چوار هەزار فرانک و پارەکەیت کاش دەدەمێ. باشە؟ ئەگەر نایدەی دەچم بۆ شوێنێکی دی.

جەواهیر فرۆشەکە، کەمێک داما و ئەنجام ڕازی بوو.

– باشه بەرێزم، ڕازیم.

جۆرج، پاش ئەوەی ئەدرەسەی ماڵەکەیانی بە جەواهیر فرۆشەکە دا، لە سەری ڕۆیی:

– تاجێکی، لەقەبی بارۆنیم بۆ دروست بکە کە یەکەم پیتەکانی ناوی خۆمی " ج. ڕ. ک " ی لە سەر دیوی ناوەوە لە سەر هەڵکۆڵرابێ.

جەواهیر فرۆشەکە، بە ئەدەبەوە سەرێکی دانەواند وگوتی:

– بە چاوان جەنابی بارون، بۆ پێنج شەممە ئامادە دەبێت.

مادلین، حایر وحەپەساو بزەیەکی بۆکرد. وەختێک لە دووکانەکە هاتنە دەرەوە، بە میهرەبانی بازووی مێردەکەی گرت. شەیتان و زیرەک و لەزەبر دەهاتە بەرچاوی. نها کە پارەیەکی مۆڵی بەدەست هێنابوو، هەقی خۆی بوو، بیر لەوە بکاتەوە کە لەخەمی عینوان و لەقەبێکی ئەشرافانەدا بێ.

خەریک بوون بە بەر تەمەشاخانەی ودڤیل دا تێدەپەڕین. شانۆنامەیەکی تازە نمایش دەکرا. جۆرج گوتی:

– ئەگەر ڕازی بی، ئەمشەو دەچین بۆ تەمەشای ئەم شانۆنامەیە. بابزانین دەتوانین لۆجێک پەیدا بکەین.

لۆجیان پەیدا کرد و بلیتیان کڕی. جۆرج دووبارە گوتی:– چۆنە بڕۆین شێو لە کابارەیەکدا بخۆین؟

مادلین، بەخۆشحاڵییەوە گوتی:– زۆر باشە، زۆرم پێخۆشە.

جۆرج، وەکو فەرمانڕەوایەک خۆشحاڵ بوو و بیری لەوە دەکردەوە کە دەتوانن چ کارێکی دی بکەن. بە ژنەکەی گوت:

- چۆنە بڕۆین خانم دوماریلش لە گەڵ خۆماندا بەرین؟ وەکو بیستوومە مێردەکەی لە پاریسە و حەزدەکەم تەوقەیەکی دەگەڵ بکەم و ئەحواڵپرسییەکی لە گەڵدا بکەم.

چوون بۆ ماڵی ئەوان. جۆرج کە لە دوای ڕووداوەکەی ئەو ڕۆژەوە، بڕێک لە یەکەم دیداری ماشقەکەی دەترسا، خۆشحاڵ بوو بەوەی کە ژنەکەی لە گەڵدایەو، ئیدی لێیان نابێ بە شەڕ...

لێ کلوتیلد، وەکو ئەوەی نەبای دیبێ و نەباران، هیچ شتێک لە نێوانیاندا ڕووی نەدابێ، نەک هەرخۆی بە دەعوەتەکەیان قاییل بوو، بەڵکو مێردەکەشی وادار کرد بەگەڵیان بکەوێ. لەکەش وهەوایەکی خۆشا شامیان کرد و شەوێکی خۆشیان پێکڤەقەتاند.

جۆرج و مادلین درەنگانێک بۆ ماڵی خۆیان زڤڕینەوە. چرا غازیەکان کوژابوونەوە. جۆرج، بۆ ڕوناک کردنەوەی پلیکانەکان، جارجارێ تەڵە شقارتەیەکی مۆمی دادەگیرساند. وەختایەک گەیینە سەر یەکەم سەحنی پلیکانەکان، تیشکی تەڵە شقارتەکە لە ناکاوا ڕوخساریانی لە ئاوێنەکەداو لەناو تاریکی پلیکانەکاندا، زۆر ڕوناک کردەوە.

ڕێک لەو تارماییانە دەچوون کە لە ناکاوا بەدیار دەکەون و لەپڕ لە تاریکی شەودا ون دەبن. جۆرج، دەستی هەڵبڕی تا ڕوخساریان بە باشی ڕوناک بکاتەوە وبەدەم خەندەیەکی سەرکەوتووانەوە گوتی:

- ئەمانەش ئەو ملیونێرانەن کە دەیانەوێ تێبپەڕن.

## ( ٧ )

دوو هەیڤ بەسەر داگیرکردنی مەراکشدا تێدەپەڕی.
فەرەنسا کە تەنجەی کۆنترۆڵ کردبوو، نها هەموو کەناراوەکانی ئەفریقای دەریای ناڤینی لە ژێر دەستدا بوو، هەڵبەتە هەموو قەرزەکانی ئەم وڵاتە داگیرکراوەشی زامن کردبوو.

خەڵکی دەیانگوت دووان لە وەزیرانی کابینەکە، بیست ملیۆن فرانکیان لەم مەسەلەیەدا، خستووەتە تەنکەی باخەڵیان وناوی لاروش ماتیوش، بە ئاشکرا کەوتبووە سەر زاران.

سەبارەت بە ڤالتر، هەمووان دەیانزانی لەم مەسەلەیەدا دووسەرە مامەڵەی کردووە و سی تا چل ملیۆنی لە شوێنی قەرزەکە بەدەست کەوتووە و هەروەها هەشت تا دە ملیۆنی لە کانزای مس و ئاسن دەستکەوتووە، هەروەها لە کڕینی زەویدا لە پێش داگیرکردنی مەراکش، بەپارەیەکی هەرزان وفرۆشتنەوەی لە دوای داگیرکردنی، بە ئیدارەی کۆلۆنیەکان، پارەیەکی مۆڵی لە تەنکەی باخەڵی ناوە.

ڤالتر، لە زەرفی یەک دوو ڕۆژدا، بووبوو بە یەکێک لە پیاوە بەدەسەڵاتەکانی دنیا، دەوڵەمەندتر و بەتواناتر لەو پاشایانەی کە کڕنۆشیان بۆ دەبراو زمانان لە ئاستیاندا دەکەوتنە تەتەپەتە، یا هەرچی دونیەت، بوودەڵەیی و بەغیلی ناخی بەشەر هەیە، دەری ببڕن ولەو زمانانەوە بکەونە ئەو گۆڕە.

ئەو ئیدی ڤالتری جوولەکە، خاوەن بانکێکی بچووک و گومانلێکراو، بەڕێوەبەری ڕۆژنامەیەکی ئەهلی تەڵەکەبازی و نوێنەر و پەرلەمانتارێک نەبوو کە لە ڕێگای ساختەوە

بووبێ بە ئەندامی ئەنجوومەن. نها بوو بوو بە جەنابی ڤالتر، جوولەکەی زۆر زەنگین.

نها دەیویست سەروەت و سامانەکەی بە ڕووی هەمرواندا بدات، خۆی پێوە بنوێنێت. چونکە دەیزانی شازادەی کارلسبورگ، کێشە وئاریشەی دارایی هەیە وزۆری پێویست بە پارە هەیە، پێشنیازی بۆکرد خانووەکەی، کە کەوتبووە شەقامی فوبورسنت ئونورەوە، کە حەوشە گەورەکەی ڕوو لە شانزەلیزە بوو، لە زەرفی بیست و چوار سەعاتدا، بە بڕی سێ ملیۆن فرانک لێبکڕێت، بەو مەرجەی کە کەل وپەلی ناو خانووەکە بەدەقی خۆیەوە بەجێ بێڵێ و دەستکاری هیچ نەکات. خانووەکەی شازادە، یەکێک بوو لە خانووە هەرە جوانەکانی پاریس. ئەم بڕە پارەیە شازادەی خستە سەر کەڵکەڵە و مامەڵەکەی قەبووڵ کرد.

بۆ سبەی ڤالتر و خانەوادەکەی لە ماڵە تازەکەیان گیرسانەوە.

پاشان خولیایەکی دیکەی کەوتەسەر، خولیای فاتحێکی ڕاستەقینە کە دەیویست وەکو ناپلیۆن پاریس بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. لەو سەروبەندەدا هەموو هونەرناسان و خەڵکی ئەهلی زەوقی پاریس دەچوونە تەمەشای تابلۆیەکی گەورەی دەسکاری نیگارکێشی بناڤ ودەنگی مەجەرستانی کارل ماکروویچ و لە گالەرییەکەی پسپۆڕ و تابلۆناسی بەنێوبانگ، جاک لونوبل، نمایش کرابوو، بابەتی تابلۆکە بریتی بوو لە ڕێکردنی مەسیح بەسەر ئاوا.

ڤالتر، تابلۆکەی بە پێنج سەد هەزار فرانک کڕی، ڕێگەی لە شەپۆلی ئەو ئارەزوومەندانە گرت کە دەهاتن بۆ دیتنی و

کردیە کارێک هەموو خەڵکی پاریس بە حەسوودییەوە باسی بکەن، سەرزەنشت یان ستایشی بکەن.

پاشان، داخویانێکی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردەوەو داوای لە هەموو خەڵکانی ناودار وهونەر دۆستانی پاریسی دەکرد کە بۆ تەمەشای تابلۆکە بێن بۆ ماڵی ئەو، تا کەس نەڵێ کە ئەو ئەهلی زەوقی لە تەمەشای ئەم شاکارە دەگمەن و بێ هاوتایە مەحرووم کردووە.

دەرگای ماڵەکەی بۆ هەموو کەس کراوە دەبێ، هەرکەسێک حەزی لێیە دەتوانێ بێت، ئەوەندە بەسە ئەو دەعوەتنامەیەی، کە بۆی ڤڕێکراوە، بە دەرگاوانەکە نیشانبدات و تەواو. دەقی دەعوەتنامەکە بەمجۆرە بوو: " ئاغا و خانم ڤالتر داواتان لێدەکەن شانازی ئەوەیان پێببەخشن و ڕۆژی ١٢/٣٠ ، لە سەعات نۆ وە تا دوازدەی شەو تەشریف بۆ ماڵەکەیان بێنن و تابلۆکەی کارل مارکوویچ کە بە ناوی ڕێکردنی مەسیح بەسەر ئاوەوە، کە بەچرای کارەبایی ڕوناک کراوەتەوە تەمەشا بکەن. "

لە پەراوێزی دەعوەتنامەکەوە بە پیتێن ورد نووسرابوو " لە نیوەشەو بەدواوە، کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ بەرپا دەکرێت. "

بەم پێیە، ئەو خەڵکانەی کە حەزیان لێبوایە دەیانتوانی بمێننەوە تا ماڵباتی ڤالتر دۆستانی ئایندەی خۆیان لە نێوا ئەواندا هەڵبژێرن. ئەوانی دی، دوای تەمەشای تابلۆکە، بۆیان هەیە بێنە تەمەشای خانووەکە، کەل وپەلەکانی وخاوەنە تازەکەی خانووەکە، هەندێک بە کونجکاوی، ژمارەیەک بە گوساخی و گروپێکیش بەبێ موبالاتی، پاشان وەکو چۆن هاتبوون بەوئاوایە دەگەڕێنەوە.

ڤالتر دڵنیابوو کە ئەم خەڵکانە جارێکی دیش دێن بۆ ماڵەکەی، و وەکو چۆن بۆ ماڵی هاوڕەگەزە جوولەکە نۆکیسەکانی، کە وەکو ئەو تازە دەوڵەمەند بووبوون، دەچوون.

سەرەتا پێویست بوو، هەموو ئەشرافان و ئەسڵزادانی بەناوبانگ بەڵام نەدار کە لە هەموو شوێنێ ناویان بەسەر زارەوە بوو، پێ بنەنە ماڵەکەیان، ئەوانە دێن تا بزانن ئەم پیاوەی کە لە زەرفی شەش هەفتەدا، پەنجا ملیۆن فرانکی لە باخەڵ ناوە، چتۆ کەسێکە، هەروەها دێن تا بزانن چ کەسانێکی دی دێن بۆ ماڵەکەی، هەروەها بۆیەش دێن کە خاوەن ماڵەکە ئەم زەوق و سەلیقەیەی هەیبووتا بێن لە ماڵەکەی ئەوا تەمەشای تابلۆیەک بکەن کە ڕەنگ وبۆی مەسیحیەتی هەیە، لە کاتێکا خۆی بابایەکی جوولەکەیە...

وەکو ئەوە بوو بیەوێ پێیان بڵێت: " تەمەشاکەن، من پێنج سەد هەزار فرانکم داوە تا ئەم شاکارەی مارکو ویچ بکڕم. ئەم شاکارە لە ماڵەکەی مندا دەمێنێتەوە تا هەموو ڕۆژێ منی جوولەکە بیدینم و زاخاوی چاوەکانمی پێ بدەمەوە. "

لە دنیای ئەشراف وئەسڵزادانداا، دەربارەی ئەم دەعوەتە، کە وێڕای ئەوەی بۆ هیچ کەسێک ئیلزامی نەبوو، گفتوگۆیەکی زۆر کرا. بە خۆیان دەگوت دەچن بۆ ماڵەکەی ئەو، وەکو ئەوەی بچنە دیتنی تابلۆ ئاویەکانی جەنابی پتی. ماڵباتی ڤالتر شاکارێکی لەلایە، دەرگای ماڵەکەی بە ڕووی هەرکەسێکدا کراوەتەوە کە بڕوات تەمەشای بکات، مردوو لەوە پاکتر دەشۆردرێ.

لاقی فرانسز، پازده ڕۆژ بوو، هەموو بەیانییەک هەواڵێکی سەبارەت بەم بویەرە هۆنەرییەی شەوی ١٢/٣٠ بڵاودەکردەوە و هەوڵیدەدا، سەرنج و هەستی کونجکاوی هەمووان بۆ ئەم بابەتە ڕابکێشێت.

دوروا، ئەم سەرکەوتنەی ئاغای زۆر لە بەرگران بوو، لە داخا خەریک بوو ژان دەیگرت.

ئەو، بەو پێنج سەد هەزار فرانکەی کە لە ژنەکەی دزی بوو، خۆی بەدەوڵەمەند دەزانی و تنها لە چاو ئەو ملیۆنان سەروەت و سامانەی کە لە دەر و دیوارانەوە بەسەر ڤالتردا دەباری و نەیدەزانی چۆن کۆی بکاتەوە یان خەرجی بکا، خۆی بە هەژار، زۆر بە هەژار دەزانی.

حەسوودی و بەغیلی ڕۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد. ڕقی لە هەموو کەس بوو، لە ماڵبات و خانەوادەی ڤالتر، کەچیتر هات وچۆی ماڵی ئەوانیان نەکردبوو، ڕقی لەژنەکەی خۆی بوو کە فریوی لاروشی خواردبوو و پێی گوتبوو ئەوراقی بەهاداری مەراکش نەکڕێت، بەتایبەتی لە لاروش کە کڵاوەکەی کردبووە سەر ئەو وکردبووی بە ئالەتی دەستی خۆی وهەفتەی دووجار دەهات لە ماڵیان شێوی دەخوارد.

جۆرج بووبوو بە کاتب و سکێرتێری ئەو و، کاتێکیش کە وتارەکانی بە گوێرەی ڕێنماییەکانی ئەو دەنووسی، بەجۆرێ حەسوودی و بەغیلی زۆری بۆ دێنا، کە پڕبەدڵ حەزیدەکرد ئەم تازە پیاکەوتووە، خۆش سەر وسیما وسەرکەوتووە بەدەستەکانی خۆی خەفە بکات. سەرکەوتنی لاروش وەکو وەزیر ناچیز بوو و، بۆ ئەوەی پۆستە وەزارییەکەی بپارێزێت کارێکی نەدەکرد کە کەس پەی بەوە بەرێ کە سەروەتێکی مۆلی لە تەنکەی باخەڵ ناوە. لێ

دوروا، له جۆری قسەکردنی غروورئامێزی ئەم کابرا دێهاتیە تازە پێیا کەوتووەدا، لە هەڵس وکەوتیا، کە گۆساخانەتر بووبوو، لە متمانە بەخۆبوونیا، هەستی بەم سەروەتە تۆز وبا وپەنهانە دەکرد.

لاروش نها لە ماڵی دورروادا حوکمڕانی دەکرد، جێگای جارانی کۆنت دوفیدریکی گرتبووەوە، بە جۆرێ قسەی دەگەڵ کارەکەرەکاندا دەکرد، دەتگوت سەرگەڤاری دووەمی ماڵەکەیە.

جۆرج، بە تۆپزی تەحەموولی ئەوی دەکرد، وەکو سەگێک بوو کە بیەوێ گاز بگرێ، بەڵام نەوێرێت. زۆربەی کات بە توندی ڕەفتاری دەگەڵ مادلیندا دەکرد، مادلینش بە بێموبالاتی شانەکانی هەڵدەتەکاند ولە تۆوایە سەروکاری دەگەڵ منداڵێکی دەست وپێ سپی و بێدەسەڵاتدایە. لەلایەکی دیکەشەوە سەری لە تووڕەیی هەمیشەیی ئەو دەسوڕما ودەیگوت:- من سەر لە کاری تۆ دەرناکەم، هەمیشە پرتەو بۆڵەتە. لە کاتێکا ڕەوشت زۆر باشە.

جۆرج، پشتی تێدەکرد و هیچ بەرسڤێکی نەدەدایەوە.

سەرەتا گوتبووی بۆ دەعوەتەکەی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە ناڕوات و ئامادەنییە، پێ بناتە ماڵی ئەم جوولەکە چەپەڵە.

دوو مانگێک بوو خانم ڤالتر، هەموو ڕۆژێک نامەی بۆی دەنارد و لێی دەپاڕایەوە کە بچێتە دیدەنی، یان لە هەر شوێنێکا کە خۆی دەیەوێ، مەوعیدێکی دیداری بۆ دابنێت تا بتوانێ ئەو هەفتا هەزار فرانکەی، کە بۆی بە دەست هێنابوو، بداتێ.

جۆرج بەرسڤی نەدەدایەوە، نامە پڕ نائومێدییەکانی ئەوی دەخستە سۆپاکەوە. نەک لە بەر ئەوەی چاوپۆشی لە بەشەکەی خۆی، لەم سەودا و مامەڵەیە کردبێ، بەڵام حەزیدەکرد بەد ڕەفتاری دەگەڵدا بکات، شێتی بکات، ناچاری بکات لە هەنبەریا چۆک دابدات. نها ئەو زۆر دەوڵەمەند بووبوو! و جۆرج دەیوسیت خۆی مەغروور بنوێنێ.

ڕۆژی دەعوەتەکە بۆ تەمەشای تابلۆکە، وەختایەک مادلین، پێی گوت کە هەڵەیەکی گەورە دەکات کە نایەوێ بۆ ماڵی ڤالتر بچێ، جۆرج وەڵامی دایەوە:- وازم لێبێنە. من لە ماڵەوە دەمێنمەوە.

دوای نان خواردنی ئێوارە، بە ماوەیەکی کەم، لە ناکاوا گوتی:

- وێڕای ئەمەش، چاکتر وایە پیاو تەحەمووڵی ئەم بێگارانە بکات، خێرا خۆت ئامادەبکە.

مادلین کە چاوەڕوانی ئەم قسەیەی لێدەکرد گوتی:- بە چارەکێک خۆم ئامادە دەکەم.

جۆرج، بە دەم خوتە وبۆڵەوە خۆی گۆڕی و تەنانەت لە ناو گالیسکەکەشا هەر پەست وبێزار بوو.

حەوشەی بەردەم بینای خانووەکەی کارلسبورگ کە تایبەت بوو بە پێشوازی میوانان، بە چوار گڵۆپی ئەلەتریکی کە لە چوارگۆشەی حەوشەکەوە هەڵواسرابوون لە چوار هەیڤی بچکۆلەی درەخشان دەچوون، ڕوناک کرابووەوە. فەرشێکی گرانبەهایان لە سەر قاڵدرمەکانی چوونە ژوورەوەی بینایەکە ڕاخستبوو و لە سەر هەر پلەیەک، خزمەتکارێک بە جلکی فەرمییەوە وەکو بت بێجووڵە ڕاوەستابوو.

دوروا، لەبن لێوانەوە بەژنەکەی گوت:- ئەمانە هەرهەمووی بۆ خۆنواندنە.

شانەکانی هەڵتەکاند، خەریک بوو لە حەسوودیدا دەمرد. ژنەکەی گوتی:- بێدەنگ بە، تۆش ئەگەر دەتوانی وابکە.

خۆیان بە بینایەکەدا کرد وبالاپۆشە ئەستوورەکانیان دایەدەست ئەو خزمەتکارەی کە هاتبووە پێشوازیانەوە.

چەندین ژنی دیکەش، دەگەڵ مێردەکانیاندا لە ڕاڕەوەکەدا بوون، ژنەکان خەریک بوون پاڵتۆ فەرووەکانیان دادەکەند. دەنگی چپەدوویان دەهاتە گوێ: " ئێرە زۆر جوانە! بە ڕاستی عەنتیکەیە! "

دیوارەکانی هۆڵ و ڕاڕەوە گەورەکە بە فەرشی دەست چنی ناسک ڕازابوونەوە کە وەکو تابلۆ حیکایەتەکەی مارس و ڤێنۆسی نیشاندەدا. لە دوولای ڕاڕەوەکەوە، پلیکانەی گەورە وجوان، بەپێچ و دەورەوە بۆ سەرەوە دەچوون و لە نهۆمی یەکەمدا یەکیان دەگرتەوە. پلەکانی قاڵدرمە و پلیکانەکان، شاکارێکی دنیای ئاسنگەری بوون، کە ڕەنگی زێڕینی مات وکۆنیان، ڕۆشناییەکی کزی بە سەرانسەری پلیکانە مەڕمەڕییە سوورەکاندا بلاودەکردەوە.

لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی هۆڵە گەورەکەدا، دوو کچۆڵە، یەکێکیان بە جلێکی تۆڕی سوورو ئەویتریان بە جلێکی تۆڕی شینەوە وەستابوون و چەپکە گوڵیان بە خانمان دەدا. ئەو دیمەنە بەلای هەمووانەوە جوان و دڵگیر بوو.

حەشیمەتێکی زۆر لە نێو هۆڵە یەک لە ناو یەکەکاندا شەپۆلی دەدا. زۆربەی خانمەکان، جلکی ئاسایی و نافەرمییان لەبەرکردبوو تا نیشانی بدەن بە هەمان

سەروسیماوە کە دەچنە پێشەنگا تایبەتیەکان، بۆ ئێرە هاتوون. بەڵام ئەو خانمانەی کە بە نیازبوون لە کۆڕی ڕەقس وسەمادا بەشداری بکەن، جلکی شەوی بێ یەخە و ئاسینیان لەبەربوو.

خانم ڤالتر، لە نێو کۆمەڵێک دۆستاندا، لە هۆڵی دووەمدا وەستابوو و سڵاوی تەمەشاڤانەکانی دەسەندەوە. زۆریان ئەویان نەدەناسی و وەکو ئەوەی لە مۆزەخانەیەکدا بن، بێ گوێدان بە خاوەن ماڵ، سەریان بەملا وبەولادا دەکێشا.

وەختێ چاوی بە دوروا کەوت، ڕەنگی بە تەواوەتی تێکچوو و تەکانێکی دایەخۆ کە بچێتە پێشوازی، بەڵام دوایی وەستا تا ئەم بڕوات بۆلای. لەوکاتەدا کە مادلین بە میهرونەوازشەوە چاک وخۆشی دەگەڵیا دەکرد جۆرج بە شێوەیەکی تەشریفاتی سڵاوی لێکرد. دوای ئەوە ژنەکەی دەگەڵ خانمی خاوەن ماڵدا بەتەنیا بەجێهێشت و ئەوسا بەناو حەشاماتەکە کەوت، تا گوێ لەو قسە وقسەلۆکانە بگرێت کە خەڵکەکە لە پاشملەی خاوەن ماڵەکە دەیانکرد.

پێنج هۆڵ بەسەریەکەوە هەبوو، کە هەر هەموویان بە پەردەێن دەگمەن ،گوڵدۆزی ئیتاڵیایی و فەرشێن گرانبەهای ڕۆژهەلاتی، ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆر ڕازێنرابوونەوە. تابلۆی گرانبەها ودەگمەنی نیگارکێشانی کلاسیکیان بە دیوارەکانەوە هەڵواسی بوو. هەموو میوانەکان، زیاتر لە ئاست ژوورێکی بچووکدا دەوەستان و بەسەرسامی لێیان دەڕوانی کە بە شێواز و ستایلی لویسی شازدەیەم، دروستکرابوو و بەجۆرە ژوورێکی پێشوازی تایبەتی دەهاتە ژماردن. دیوارەکانی ئەم ژوورە بە پەردەی ئاورێشمی ناسکی چەپکەگوڵی پەمەیی، تەخت شینی کاڵ، داپۆشرابوو.

مۆبیلەی پایەکورتی، دار زێڕینی بە ڕووکەشی لە هەمان پەردەکانی قەد دیوارەکە، نیشانەی ناسکی و زەوق وسەلیقەی جوان بوو.

جۆرج، لە نێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا هەندێ کەسی ناوداری دەناسی، لەوانە: دۆشس دوتراسین، کۆنت و کۆنتیس دوراڤانیل، شازادە جەنەڕاڵ داندرومون، مارکیزی زۆر جوان ددون، ئەمە جگە لە هەموو ئەو پیاو وژنە ناودارانەی کە لە ڕێوڕەسمی فەرمی و ڕۆژانی کردنەوەی هەر پێشانگا و هەر شانۆنامەیەکدا، دەبینران.

یەکێک بازووی گرت، دەنگێکی گەنجانە و تەڕوتازە لە گوێیدا زرینگایەوە وگوتی:

– ئاه، ئاخری دۆزیمیتەوە، بیل ئامی نارەسەن. ئەوە بۆچی سەرمان نادەیت؟

سوزان ڤالتر بوو، کە چاوە جوانە پرشنگدارەکانی، لە ژێر قژە پرە زەردە زێڕین و چین چینەکەیەوە، بڕی بوونە ئەو.

جۆرج بەدیتنی ئەو زۆر خۆشحاڵ بوو و بەگەرمی تەوقەی دەگەڵدا کرد، ئەوسا بە ڕاوێژێکی تەوازی خوازانە گوتی:– کاتم نەبووە، دوو مانگێکە هێندە سەرقاڵم، کە نەمتوانیوە بۆ هیچ شوێنێک بڕۆم.

سوزان، بە ڕاوێژێکی جدی درێژەی بە قسەکەی دا:

– خراپە، زۆرخراپە، زۆرخراپە. تۆ نابێ ئەمە لەگەڵ ئێمەدا بکەی، چونکە من ودایکم تۆ دەپرستین. من بەبێ تۆ هەڵناکەم. ئەگەر نەیەی بۆ ماڵمان، لە بێتاقەتیدا دەمرم. بۆیە بەم ڕاشکاویە ئەم قسانەت لە ڕوودا دەکەم، تا لەمەودوا، هەقی ئەوە بەخۆت نەدەی بەمجۆرە خۆتمان لێبشاریتەوە.

کوا دەستم وێدە با تابلۆی ڕێکردنی مەسیحت بەسەر ئاوەوە، کە لە کۆتایی هۆڵەکەی پشت گوڵخانەکەوە هەڵواسراوە، پێ نیشانبدەم. باوکم بۆیە لەوێی هەڵواسیوە، تا هەمووان ناچاربین، بۆ دیتنی تابلۆکە، بەهۆڵە جۆراوجۆرەکاندا تێبپەڕن، تۆ نازانی چەند دڵی بەم خانووە خۆشە و چەند بەخۆیەوە دەنازێ.

بەخاوی بە نێو حەشیمەتەکەدا ڕێیان دەکرد. هەمووان ئاوڕیان دەدایەوە تا تەمەشای ئەم پیاوە قۆزە و ئەم بووکە شووشە شەنگوڵە بکەن.

نیگارکێشێکی بەنێوبانگ گوتی:

– تەمەشاکەن، ئەم جووتە جوانە، ڕێک دەگەڵ هەموو کەل وپەلەکانی ئەم ماڵە جوانەدا تێک دەکەنەوە.

جۆرج، بەخۆی گوت:– ئەگەر بەڕاستی توانام هەبوایە، دەبوایە ئەم کیژەم بخواستبایە. هەڵبەتە مەحاڵیش نییە. باشە بۆ تا نها بیرم لەمە نەکردووەتەوە؟ چۆن فریوم خوارد و دوای ئەوەیان کەوتم؟ چ شێتاتیەکی گەورەم کرد! بەشەر هەمیشە بە پەلەیە و، هەرگیز وەکو پێویست بیر لە هەموو شتێ ناکاتەوە، ئەقڵ هەمووکاتێ میوان نییە.

حەسوودی وبەغیلی، بەغیلییەکی وشک، دووبارە دڵۆپ دڵۆپ دەڕژایە ناخییەوە، شادی لە دڵ و دەروونی دەسڕییەوە و ژیانی تاڵدەکرد.

سوزان دەیگوت: –ئاە، بیل ئامی، زیاتر هاتوچۆمان بکە، نها بابم هێندە دەوڵەمەند بووە، بەخۆیشمان نازانین چ دەکەین، ئیدی جۆرەها کاری شێتانە دەکەین، وەکو خەڵکانی شێت وشور ڕەفتار دەکەین.

جۆرج، بەدەم ڕامان و خەیاڵەوە بەرسڤی دایەوە:- ئیدی بۆخۆت بەم زووانە شوو دەکەیت و، ئیدی هەرگیز یەکدی نابینین.

کیژێ، بەدڵێکی سافەوە گوتی:

- ئاه، نا، نا، وا زووش نا، من کەسێکم دەوێ کە خۆشم بوێ، زۆرم بەدڵ بێ، یانی بە تەواوی بەگەنی بکەم. نها ئەوەندە دەوڵەمەندم کە بەشی هەردووکمان بە زیادەوە بکات.

جۆرج، بزەیەکی تەوسامێز و پڕغرووری بەسەر لێوانەوە بوو، ئەوسا کەوتە ناوبردنی هەندێ لەو کەسانەی کە بە لایاندا دەبوورین، کەسانێ لە بنەماڵە و خانەوادەێن زۆر ئەسڵزادە وقەدیمی کە ناز ناو وعینوانی ئەشرافییان بە کیژانی خەڵکانی دەوڵەمەندی وەکو ئەو فرۆشتبوو و حاڵی حازر زۆر دوور لە هاوسەرەکانیان دەژیان، بەلام ژیانێکی ئازادانە، مایەی ڕێز و ئاوێتە بە بێ پەروابیان دەگوزەراند.

ئەوسا بەدەم ئەم ئەنجامگیرییەوە لە سەری ڕۆیی:

- گرێو دەکەم کە تۆش تا شەش مانگێکی دی دەکەویتە هەمان داوەوە. هەنگێ دەبی بە خانم ماکیز، دۆشس یان پرنسس و بەنیگایەکی پڕ غروورەوە تەمەشای من دەکەی کیژەخان.

سوزان توورە بوو، بە باوەشێنەکەی کێشای بە باسکی ئەوداو سوێندی خوارد کە هەرگیز، بێ مەیل و ڕەزامەندی خۆی شوو بە هیچ کەسێک ناکات.

جۆرج، بە تەوسەوە گوتی:- باشە، دەتبینمەوە، ئەنگۆ زۆر دەوڵەمەندن.

سوزان گوتی:- بەڵام تۆش دەوڵەمەند بوویت، میراتت بەرکەوتووە.

جۆرج، ئاهێکی بەزەیی ئامێزی هەڵکێشا، بەزەیی بەخۆیا وگوتی:

- خراپ نییە لەمبارەیەوە قسە بکەین. ئەوپەڕی ساڵانە بیست هەزار لیورێکی دەرامەت دەبێت. ئەم برە پارەیە بۆ ژیانی ئەم دەوروزەمانە، پارەیەکی زۆر کەمە.

- بەڵام ژنەکەشت بەشێک لەم میراتەی بەرکەوتووە.

- بەڵێ بەهەردووکمان یەک ملیۆن فرانکمان بەرکەوتووە. بە چل هەزار لیور دەرامەتی ساڵانەوە، بەهەردووکمان ناتوانین گالیسکەیەک بۆ خۆمان بکڕین.

گەیشتنە دوا هۆڵ، گوڵخانەکە لە بەرانبەریان بوو، بە باخچەیەکی زستانەی فراوانەوە. پڕ بوو لە دار ودرەخت و ڕووەکێن دەڤەرانی گەرمسێر و گوڵێن دەگمەن. کە بەشەر خۆی بەم ژینگە و سەوزەزارەدا دەکرد، کە ڕوناکی وەکو شەپۆلێن زێوین لەبەینی لق وپۆ و گەڵای درەختەکانەوە بڵاودەبووەوەو هاڵاوی گەرمی خاکی نمسار و هەوای عەترینی بەسەردا دەهات، هەستێکی سەیری لەلا دروست دەبوو، هەستێکی شیرین، نائاسایی و سەرنجڕاکێش کە لە تەبیعەتێکی دەستکردەوە، نەرم و پەستکەرەوە سەرچاوەی دەگرت. بەشەر بەنێو باخچەێن پڕگوڵ وگوڵزار و بە ڕاڕەوێکی نەرمی ئەوتۆدا ڕێی دەکرد، دەتگوت خەنەتیلکەیە. دوروا لە ناکاوا، لە دەستەچەپاو لە ژێر ساپیتەیەکی گومەز ئاسای دارخورمایاندا، چاوی بە ئەستێڵێکی گەورە کەوت کە بۆ ئەوە دەشیا مەلەی تیا بکرێ و، لە چوارنکاڵی ئەستێڵەکەوە چوار قازی سیرامیکی دەسکاری دلف

دانرابوون، که له زاره نیوه کراوەکانیانەوه ئاو دەڕژایه ئەستێڵەکەوه.

زیخی زێڕینیان ڕشتبووه بنی حەوزەکەوەو ماسیێن سووری گەوره مەلەیان تیا دەکرد، ماسیانی سەیر، له دێوی چینی دەچوون، چاوزەق به پولەکەی شینباوەوه، له بنی زێڕینی حەوزەکەدا دەجولان وگولدۆزی و قولاپدۆزییه سەیرەکانی ئەو ولاتەیان له سەر قوماشی گرانبەها و دەگمەن وەبیردێنایەوه.

جۆرج، به دڵێکی پڕ له خورپه و داخورپانەوه بەدیار حەوزەکەوه وەستا، له دڵی خۆیدا گوتی: " بەمه دەڵێن شکۆ و جەلال، ئەمەیه ژیان، ئەمه ئەو خانووەیه که دەبێ بەشەر تیایدا بژی. خەڵکی پێی گەیبوون، من بۆچی پێی نەگەم؟ " بیری لەو ڕێگا و ئەوزارانه کردەوه که دەتگەیەننه ئەو جۆره ژیانه، بەلام ئەقڵی به هیچ کوێ ڕا نەگەیی و لەم بێ تواناییەی خۆی تووڕه بوو.

سوزان، له دنیای خەون وخەیاڵدا، خامۆش و بێدەنگ بوو. جۆرج به تیلەی چاو تەمەشایەکی ئەوی کرد و جارەکی دی به خۆی گوت:" ئەوه بەس بوو که لەگەڵ ئەم بووکه شووشه زندووەدا زەماوەند بکەم. "

سوزان، وەکو ئەوەی له ناکاوا، له دنیای خەون و خەیاڵدا هاتبێته دەر، گوتی:– ئاگاداربه.

جۆرجی، به ناو حەشیمەتێکدا که ڕێگاکەیان گرتبوو، برد وئەوسا له ناکاوا، بەسەمتی ڕاستا وەری چەرخاند.

له نێو باخچەیەکی ڕووەکانی سەیرا، که گەلا لەرزۆکەکانیان، وەکو قامکانی باریک له هەواکەدا بلاو

کردبووەوە، ئینسان پیاوێکی دەبینی کە بەبێ جووڵە لە ناو دەریادا وەستابوو.

کاریگەرییەکەی غافڵگیر بوو. تابلۆکە کە قەراخەکانی لە ناو سەوزایی بزۆزی ڕووەکەکاندا پەنهان بووبوو، ڕێک لە چاڵێکی ڕەش دەچوو لە زەمینەیەکی سەیر وخەیاڵ وروژێنا.

بەشەر دەبوا بە وردی تەمەشا بکات تا لێی تێک نەچێت و هەستی پێبکات. چوارچێوەی تابلۆکە لە ناوەڕاستی بەلەمێکا بوو کە یارانی عیسا لە ناویدا ڕۆنیشتبوون. پرتەوی فانووسیک بەدەستی یەکێک لە یاوەرەکانەوە، کە لە قەراخی بەلەمەکە دانیشتبوو، ڕۆشناییەکی کەمی دەخستەسەریان، بەڵام هەموو ڕۆشناییەکە دەکەوتە سەر مەسیح کە خەریک بوو بۆلای ئەوان دەهات.

مەسیح، بە سەر شەپۆلێکەوە دەجووڵا کە لە ژێر پێیە مەلەکوتیەکانی هەموارو ساف بووبوو وبە نەوازشەوە لە هەنبەریا سەری ڕادەست بوونی فرو دێنا. دەوروبەری پیاوە خودا ئاساکە هەرهەمووی تاریک بوو، جگە لە ئەستێرەکان کە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە.

ڕوخساری ئەو یاوەرانەی ژێر ڕۆشنایی ئەو فانۆسەی کە بە دەستی ئەو یاوەرەوە بوو کە مەسیحی پێ نیشاندەدا، زۆر گرژ دەهاتە بەرچاو.

تابلۆکە، بەرهەمی مامۆستایەکی یەجگار بەتوانا بوو، یەکێک بوو لەو بەرهەمانەی کە بیری بنیادەم دەئاڵۆزێنێ و بەساڵان لە خەیاڵدا دەمێنێتەوە.

ئەو خەڵکانەی کە تابلۆکەیان دەبینی، لە هەوەڵەوە دەحەپەسان، پاشان بە دنیایەک خەون وخەیاڵەوە

دەڕۆیشتن و دوای ئەوە گفت وگۆ و گەنگەشەیان دەربارەی بایەخی تابلۆکە دەکرد.

دوروا، پاش ئەوەی مودەتێک تەمەشای کرد گوتی:- خۆشە پیاو هێندەی پارە هەبێ کە بتوانێ توحفەێن وەکو ئەمە پێشکەش بە خۆی بکات.

شەپۆلی ئەو خەڵکەی کە لە ڕێوە دەهاتن، تووشی ئەو بوو، لە کاتێکا دەستی ناسکی سوزانی هێشتا لە قۆڵا بوو و بەنەرمی دەیگوشی، لەوێندەر دوورکەوتەوە.

سوزان، لێی پرسی:- حەزت لێیە پەرداخێ شامپانیا بخۆیتەوە؟ بابڕۆین بۆلای بوفیەکە. ڕەنگە بابم لەوێندەر بدۆزینەوە.

جارێکی دی بە هەموو هۆڵەکاندا تێپەڕین. جەماوەری خەڵک، جەنجاڵ و بە هەرا وهەنگامە، بەسەروسیمای ڕازاوە و جلکی جوانەوە، وەکو ئەوەی لە جەژنێکی گشتیدا بن، لە هەموو شوێنێکدا شەپۆلی دەدا.

جۆرج، لە ناکاوا گوێی لە کەسێک بوو دەیگوت: " ئەمەش لاروش وخانم دوروایە. " ئەو وشانە وەکو شنەبایەک بێ و لە دوورەوە بێ، بەو ئاوایە بەرگوێی کەوت. ئەم دەنگە لە کوێوە دەهات؟ چاوی بەهەموو لایەکدا گێڕا و سەرەنجام ژنەکەی خۆی بینی کە قۆڵ لە قۆڵی وەزیرا تێدەپەڕن. چاویان لە چاوی یەکدی بری بوو و بە ئەسپایی و بەشێوەیەکی خۆمانی قسانیان دەکرد.

وای هاتە خەیاڵ کە خەڵکی بەدیتنی ئەو دووانە، بە ئەسپایی هەندێ قسان دەکەن، لە ناکاوا، مەیلێکی هۆڤیانە و کەودەنانە لە ناخیا بێدار بووەوە کە بڕوات و پەلاماریان بدات وبە مست تێیان بەربێت و بیانکوژێت.

ڕەفتاری ژنەکەی ئەوی دەکرد بە گەپچاڕی ئاشنا وبێگانە. فورستیەی بیرکەوتەوە. پێدەچوو خەڵکی بەیەکدی بڵێن: " ئەمەش دورروای قورمساغ. " ژنەکەی چتۆ بەشەرێک بوو؟ تازە پێیاکەوتوویەکی ڕووتە، بەڵام زەبەردەست، کە خەڵکی بۆ ماڵیان دەهاتن، زیاتر لەبەر ئەمە بوو، کە لە خودی ئەو دەترسان، چونکە وایان هەستدەکرد، کەسێکی گرینگە، بەڵام بێگومان دەربارەی خانەوادەو ماڵباتی بچووکی وان، بە ئارەزووی خۆیان بەدگۆییان دەکرد. لەگەڵ ئەو ژنەدا، کە ماڵەکەیانی کردبوو بە شوێنێکی گومان لێکراو، هەرگیز نەدەگەییە هیچ پلەوپۆستێک، ژنێک کە بە ڕەفتاری خۆی ئابڕووی خۆی دەبرد وجۆری ژیان و هەڵس وکەوتی دەبووە بایسی وەی کە هەمووان ئەو بە کابرایەکی ساختەچی و هەلپەرست بزانن. نها وەکو بارێکی قورس بووبوو بە ملییەوە.

ئاخ ئەگەر دەیزانی! ئەوەندە بەس بوو کەمێک لێهاتووانەتر وبەچاوێکی کراوەترەوە، گەمە بکات. ئەگەر ئەم سوزانە چکۆلەیەی بەدەست هێنابا، چ قازانجێکی گەورەی دەکرد! یانی ئەوەندە کوێر بوو کە نەیتوانی بوو، ئەم واقیعە ببینێ؟

گەیینە هۆڵی نانخواردن، ژوورێکی گەورەی پایە مەڕمەڕی بوو، مافورێن کۆن و قەدیمی دەسکاری گوبلن، بەدیوارەکانیەوە هەڵواسرابوو. ( گوبلن: مافورچنێکی کۆنی فەرەنسابیە، کارەکانی زۆر جوان و سفت بوون، زۆربەی نەخشی مافورەکانی تابلۆ و دیمەنێن بە نێوبانگ بوون. جیاوازی مافوری فەرەنسی دەگەڵ هی لای ئێمەدا، ئەوەبوو

که هی ئەوان وەکو بەڕەو و گلیمان لووس بوون و وەکو مافوری لای ئێمە تووکن نەبوون، بەڵام زۆر سفت بوون. )

ڤالتر، وەختێک چاوی بە ڕۆژنامەوان و گوتارنووسە دیارەکەی کەوت، بەهەشتاو بەرەولای ئەو هات، دەستەکانی گرت و تەوقەی دەگەڵیدا کرد. ئەوسا سەرمەست و خۆشحاڵ گوتی:

– هەموو شتەکانت بینی؟ سوزان هەموو شتێکت نیشاندا، چ ئاپۆرایەک لێرە خڕبوونەتەوە، وانییە بیل ئامی؟ شازادە ˚ گرش ˚ ت بینی؟ چەند خولەکێک لەمە پێش هاتە ئێرە و پەرداخێک پونجی خواردەوە.

پاشان بە هەشتاو بەرەولای سیناتۆر ریسولن ڕۆیی کە ژنەکەی گێژو وێژ بەشوێن خۆیدا بکێش دەکرد. ژنەکەی هێندەی زێڕ و زیوەر وجەواهیراتی بەخۆدا کردبوو، بووبوو بە یەکێک لەو کوشکانەی کە لە شەیتان بازاڕاندا، زیوەرلات دەفرۆشن.

پیاوێک سڵاوی لە سوزان کرد. پیاوێکی باڵابەرز، لاواز، زڵف زەرد، کەمێک سەر ڕوتاوە، لەو قەڵافەت و سیمایانە بوو کە لە دوورەوە هاواردەکەن ئەشرافزادەن. جۆرج گوێی لێبوو کە بە ناوی مارکی دوکازولەوە خۆی ناساند. لە ناکاوا هەستی بەجۆرە غیرە وحەسوودییەک لەم پیاوە کرد. سوزان لەکەیەوە ئەم پیاوەی دەناسی؟ بێگومان لەوکاتەوە کە باوکی بەمجۆرە دەوڵەمەند بووبوو؟ دوور نەبوو خوازگاری ئیحتیمالی سوزان بێت..

یەکێک قۆڵی گرت. نوربردوڤارن بوو. شاعیری پیر، بە قژی چەور وجل وبەرگی شڕۆڵە وسەروسیمای ماندوو و

بێ موبالاتیەوە، بەم لا وبەولادا دەسوڕایەوە. بە جۆرجی گوت:

- بەمە دەگوترێ کەیف وسەفا و سەیران. دوای سەعاتێکی دی هەمووان دەرەقسن و پاشان دەڕۆن دەخەون : و کچۆڵان خۆشحاڵ دەبن. لەم شامپانیایە بخۆوە، بەڕاستی شتێکی توحفەیە.

پەرداخەکەی دانێ کە بۆی تەژی بکەن، لەبەردەم جۆرج دا، کە ئەویش پەرداخێ شامپانیای بەدەستەوە بوو، بەرزی کردەوە و گوتی:- بە سەلامەتی تۆڵە لە زەوق وسەلیقەی ملیۆنان سەروەت دەیخۆمەوە.

ئەوسا بە دەنگێکی میهرەبان و نەرم لە سەری ڕۆیی:- نەک لەبەر ئەوەی لە دەوڵەمەندبوونی خەڵکی نارەحەت بم یان بەغیلیان پێ ببەم، ئەم قسەیە وەکو نارەزاییەکی ئاسایی دەکەم.

جۆرج، ئیدی گوێی لە قسەکانی ئەو نەدەگرت. چاوی بۆ سوزان دەگێڕا کە دەگەڵ مارکی دوکازول دا لە نێو حەشیمەتەکە ون بووبوو. لە ناکاوا نوربردوڤارنی بەجێهێشت و کەوتە گەڕان بە دووی سوزاندا.

قەرەباڵغییەکی قەوغا، بە نیازی ڤەخارن ڕوویان کردبووە بوفیەکە، ئەوەندە قەرەباڵغ بوو، بواری ڕێکردنی نەبوو. وەختایەک کە سەرەنجام توانی لە قەرەباڵغییەکە ڕزگار بێ، ڕوو بەڕووی خانم دوماریل وشووەکەی بووەوە.

کلوتیلدی زوو زوو دەبینی، لێ لە مێژ بوو مێردەکەی نەبینی بوو. مێردەکەی خانم دوماریل، بەگەرمی تەوقەی دەگەڵ کرد و گوتی:- سوپاس بۆ ئەو ڕێنماییەی کە لە

ڕێگەی کلوتیلدەوە بۆت ناردبووم. زۆر مەمنوونی تۆم، دۆستی ئازیز. بە کڕینی ئەوراقی بەهاداری مەراکش، نزیکی سەد هەزار فرانکم قازانج کرد. ئەم قازانجە لە چاوی تۆ دەزانم. دەتوانم بڵێم کە تۆ دۆستێکی ئازیزی.

ئەو پیاوانەی کە بەلای ئەواندا ڕەت دەبوون، ئاوڕیان دەدایەوە وتەمەشای ئەم ژنە شەنگوڵ وچاو و برۆ ڕەشەیان دەکرد. دوروا بەرسڤی دایەوە:- لە جیاتی ئەم خزمەتە دۆستی ئازیز، من ژنەکەت لێدەستێنم یان لە ڕاستیا قۆڵ لە قۆڵی دەکەم. ژن و مێردان دەبێ هەمیشە لە یەکدی دووربخرێنەوە.

ئاغای دوماریل، سەرێکی دانەواند وگوتی:- دروستە. ئەگەر یەکمان گوم کرد، دوای یەک سەعاتی دی لەم شوێنەدا یەکدی دەبینینەوە.

- باشە.

خانم دوماریل و جۆرج دوروا، خۆیان بە قەرەباڵغییەکەدا کرد و جەنابی دوماریلش بە دوایاندا.

کلوتیلد، پەیتاپەیتا دەیگوت:- ئەم ڤالترە چەند پیاوێکی بە شانسە. بە هەرحاڵ ئەقڵی ئابووری ئەو زۆر باش کار دەکات.

جۆرج، بەرسڤی دایەوە:- خەڵکی بەهێز و دەسەڵاتدار هەمیشە سەرکەوتوو دەبن، ئیدی بە هەر ڕێگەیەک بووە.

کلوتیلد دووبارە گوتی:- بە دوو کیژەوە کە هەریەکێکیان بیست تا سی ملیۆن جیازیان دەبێ. ئەمە جگە لەوەی سوزانیان جوانیشە.

جۆرج، چ قسەیەکی نەکرد. کە یەکێکی دی هەمان هزری ئەوی دەگوتەوە زۆر توورە دەبوو.

کلوتیلد، هێشتا تابلۆکەی مەسیحی نەبینی بوو. جۆرج، پێشنیازی کرد کە بۆ تەمەشای تابلۆکەی ببات. زۆریان کەیف بە غەیبەت ولە پاشملە گۆیی ئەم وئەو دەهات و گاڵتەیان بەخەڵکانی ناودار دەکرد. سن پوتین، بەلایاندا بووری، چەند میداڵێکی لە یەخەی خۆی دابوو، جۆرج و کلوتیلد، زۆر بەم کارەی ئەو پێکەنین. کۆنە سەفیرێک کە لە دووی ئەوانەوە دەهات، میداڵی کەمتر لەوی بە بەرۆکی خۆیەوە کردبوو.

دوروا گوتی:- ئەم کۆمەڵگەی پاریسە چ چێشتێکی مجێورە.

بوارناریش کە لە نێو حەشیمەتەکەدا تەوقەی دەگەڵ ئەودا کرد، هەمان میداڵە سەوز و زەردەکەی ڕۆژی دوئێڵەکەی لە بەرۆکی دابوو.

ویکنتس دوپرسمور، بەکەلەشی زەلام و ڕازاوەی خۆیەوە، لە ناو ئەو ژوورە تایبەتیەی پێشوازیدا کە بە ستایلی لویسی شازدەیەم دروستکرابوو، وەستابوو و دەگەڵ کابرایەکی دۆک دا قسەی دەکرد.

جۆرج لە بن لێوانەوە گوتی:- چ گفتوگۆیەکی تایبەتی خۆشە.

وەختایەک بەلای گوڵخانەکەدا تێپەڕین، چاوی بە ژنەکەی کەوت کە لەنزیکی لاروش دانیشتبوو. لق وپۆپی درەختەکان، ئەو دووانەی کەم دابێژێک لە چاوی خەڵکان دەشاردەوە. وەکو ئەوەبوو بلێن: " ئێمە ئێرەمان کردووە بە ژوانگە. ژوانگە بە بەرچاوی خەڵکەوە. چونکە گوێ بە قسەی خەڵکی نادەین. "

تابلۆکەی کارل مارکوویچ، بەلای کلوتیلدەوە زۆر سەیر و مایەی سەرنج بوو. دوای تەمەشاکردنی تابلۆکە گەڕانەوە. شووەکەی کلوتیلدیان ون کردبوو.

جۆرج، پرسی:- لورین چۆنە؟ لە من زویر نییە؟

- با، وەکو هەمیشەیە. هەرکاتێ ناوی تۆ دێتە ناوان لە ژوورەکە دەچێتە دەرەوە.

جۆرج، هیچ بەرسڤێکی نەدایەوە. زویر بوونی ئەم کچۆڵەیە خەمباری دەکرد.

کە لە دەرگایەک دەرباز بوون، سوزان غافڵگیری کردن. بەدەم هاوارەوە گوتی:

- ئەمە ئێوەن! باشە، بیل ئامی. نها دەبێ بەتەنها بمێنیتەوە. کلوتیلدت لەدەست دەردێنم، دەمەوێ ژوورەکەمی پێ نیشانبدەم.

هەردووکیان بە هەنگاوێن لەزگین لەو دوور کەوتنەوەو بەناز وعیشوەوە، بە نێو ئاپۆڕای تەمەشاڤاناندا داخزین، لەو نازو عیشوە دڵگیرانەی کە ژنان دەزانن چۆن لە قەرەباڵغیدا ڕێگای خۆیانی پێبکەنەوە.

هەرکە ئەوان تێپەڕین، لە دوای ئەوانەوە دەنگێک بە ئەسپایی گوتی: "جۆرج! " خانم ڤالتر بوو کە بە ئەسپایی لە سەری ڕۆیی: " تەح کە بەشەرێکی دڵڕەقی. لە خوت و خۆڕایی من دەڕەنجێنی. بە سوزانم گوت کە خانمەکەی هاوڕێت دەگەڵ خۆیدا بەرێت تا بتوانم دوو کەلیمە قسەت دەگەڵدا بکەم. گوێ بگرە... ئەمشەو دەبێ... دەگەڵ تۆدا قسە بکەم.... دەنا... هەرخۆم دەزانم چ دەکەم. بچۆ بۆ گوڵخانەکە. بە دەستە چەپی گوڵخانەکەدا دەرگایەک هەیە کە دەتوانی لەوێوە بچیتە ناو حەوشەکە، بەو شەقامەدا برۆ کە دێتە

بەردەمت. لە کۆتایی شەقامەکەدا کەپرێک هەیە. لە ژێر کەپرەکەدا دە خولەکێک چاوەڕوانم بکە. ئەگەر نەڕۆی، هەر ئێستا و لێرەدا دەیکەم بە هات و هاوارێک دنیات دێنمە سەر!

جۆرج، بە غروورەوە گوتی:- باشە دە خولەکێکی دی لەو شوێنەدا دەبم.

پاشان لێکدی هەڵبڕان. لێ جاک ریڤاڵ، چوونەکەی ئەوی دواخست. قۆڵی گرت و بەسەر وسیما وقەلافەتێکی هەڵچووەوە، دەستی بەقسان کرد، قسەیە لێرە و یەکێ لەوێ. بێگومان لە بوفیەکەوە دەهات چونکە زۆر خەیاڵ بوو. سەرەنجام جۆرج ئەوی بەدەستی خانم دوماریل کە سەروکەللەی پەیدابووبوو سپارد و بەخۆی هەڵات. کە خۆی بە گوڵخانەکەدا کرد، خوا خوای بوو کە ژنەکەی و لاروش ئەو نەبینن. ئەم ئاواتەی هاتەدی، چونکە ئەو دووانە زۆر سەرگەرمی گفت وگۆ بوون. دەرگایەکی لە نێو گوڵخانەکەدا کردەوەو لەوێوە خۆی بە حەوشەدا کرد.

هەوای فێنک، وەکو دوشێکی ئاوی سارد ڕای جفراند. بەخۆی گوت:

- شەیتان بە نەحلەت بێ ها، لەوەیە سەرمام ببێت. دەستەسرەکەی وەکو بوینباخ لە ملی بەست. پاشان لۆش لۆش بەرەو کۆتایی شەقامەکە ڕۆیی، چونکە دوای ئەوەی لە دەوروبەرە ڕوناکەکەی بینایەکە هاتەدەرێ، بە باشی بەرپێی خۆی نەدەبینی.

ئەم بەرو ئەوبەری شەقامە باریکەکە، درەختێن ڕووت و بێ گەڵا بوو کە لقە باریک وڕووتەکانیان دەلەرینەوە. ڕوناکییەکی کز بە نێو لقەکاندا تێدەپەڕی، ڕوناکییەک کە لە

پەنجەرەکانی بیناکەوە لە درەختەکانی دەدا. هەیکەلێکی سپی لە شەقامەکەدا بەدی کرد، خانم ڤالتر بە بازووان و سینگی ڕووتەوە بە دەنگێکی لەرزۆک و پچڕپچڕ گوتی:- ئاە، ئاخری هاتیت؟ یانی تۆ بەڕاستی دەتەوێ من بکوژیت؟

جۆرج، بە ئارامی گوتی:- تکا دەکەم، مەیکە بە هەرا وهوریا، دەنا یەکسەر هەڵدێم.

خانم ڤالتر، دەستی لە ملی کرد و ڕوخساری لە ڕوخساری نزیک کردەوەو گوتی:- ئاخر من چ خراپەیەکم لە گەڵ کردووی؟ تۆ وەکو بەڕەڵلایەک ڕەفتارم لە گەڵدا دەکەی. ئاخر من چ کارێکم بەرانبەرت کردووە؟

جۆرج، هەوڵیدا ئەو لە خۆی دووربخاتەوە:

- ئەو ڕۆژە مووەکانت لە دوگمەکانی ئێلەکەکەم گرێ دابوو، ئەم کارەی تۆ لەزگ بوو، کاری من وژنەکەم بگەیەنێتە تەلاق وجیابوونەوە.

خانم ڤالتر، بۆ چەند ساتێک حەپەسا، ئەوسا سەرێکی بادا و بەدەم ڕەتکردنەوەی بیانووەکەی ئەوەوە گوتی:

- ئم، ژنەکەت گوێ بەم شتانە نادات، گومانی تیانییە یەکێک لە ماشقەکانت بۆڵەبۆڵی بە سەرتدا کردووە.

- من ماشقەم نییە.

- ئەوە قسەیە! ئەگەر وایە تۆ بۆ نایەیتە دیدەنی من؟ بۆچی ئامادەنیت تەنانەت هەفتەی تاقە جارێک شام لە گەڵ مندا بکەیت؟ ئاخ خەریکە لە داخا دەمرم، هێندەم خۆشدەوێی کە جگە لە تۆ هیچ شتێکی دیکەم لە بیر و خەیاڵدا نییە، سەیری هەرجێیەک و هەرشتێک دەکەم، تۆ دێیتە بەرچاوم، ئیدی زات ناکەم تاقە قسەیەک بکەم، لەترسی ئەوەی نەبا ناوی تۆم بێتە سەر زار! تۆ لەم شتانە حاڵی نابیت!

هەستدەکەم بووم بە قولاپێکەوە و بەدەست و پێ بەستراوی کەوتوومەتە ناو کیسەیەکەوە وخۆشم نازانم چ حاڵ و ڕۆژگارێکم هەیە. بیری تۆ بەرۆکی زەینم بەرنادات و ئەوکم دەگوشێت. شتێک لێرەدایە، سینگم دادەدڕێت، لاقم دەشکێنێ وهێزی ڕێکردنم لە بەر دەبڕێت. وەکو حەیوانی گیرۆدەی ناو قەفەز، بە درێژایی ڕۆژ، لە سووچێکا، لە سەر کورسییەک دادەنیشم و بیر لە تۆ دەکەمەوە.

جۆرج، بە سەرسامی بیری لێی دەکردەوە، تەمەشای دەکرد. ئیدی ئەو ژنە ناڤساڵە نەبوو کە ناز و نیونازی منداڵانەی بەسەر ئەودا دەکرد، بەڵکو ژنێک بوو، جڵەو لە دەست بەربوو، نائومێد، توانا بە ئەنجامدانی هەر کارێک.

لەوکاتەدا کە بیرۆکەیەکی گۆنگ خەریک بوو لە زەینی جۆرج دا چەکەرەی دەکرد، پێی گوت:

– گیانە، عەشق هەمیشەیی نییە. دووکەس عاشقی یەکدی دەبن و پاشان لێکدی هەڵدەبڕن. بەڵام کاتێ وەکو ئەمەی من و تۆ درێژە بکێشێت، ئیدی دەبێ بەبار. من ئەمەم ناوێ، ئەمە حەقیقەتی مەسەلەکەیە وتەواو. وێڕای ئەمەش، ئەگەر وە ئەقڵ بێیتەوە و دۆستانە ڕەفتارم لە گەڵدا بکەیت، وەکو جاران بۆ ماڵتان دێم. دەتوانی ئەم کارە بکەیت؟

خانم ڤالتر، باسکە ڕووتەکانی نایە سەر جلە ڕەشەکانی جۆرج و لەبن لێوانەوە گوتی:

– لەبەر خاتری تۆ دەتوانم هەرکارێک بکەم.

– دەی باشە، کەواتە لەسەر ئەمە ڕێکەوتین. تەنیا دۆستی یەکدی دەبین، تەنیا دۆست، نەک شتی دی.

ژنەی بەلەنگاز لەبن لێوانەوە گوتی:

– " باشە، قەبووڵمە " . ئەوسا لێوەکانی بردە پێشەوە و گوتی: " تەنیا یەک ماچی دی... دوا ماچ. "

جۆرج، بە میهرەبانی ڕەتیکردەوە:– نە، دەبێ پابەندی قەول و قەرارەکەی خۆمان بین.

خانم ڤالتر ڕووی بۆلای ئەو وەرگێڕا و ڕوندکەکانی سڕی، ئەوسا پریاسکەیەکی لە باخەڵی دەرهێنا، بریتی بوو لە سەفتەیەک کاغەز کە شریتێکی ئاوریشمی پەمەیی لە دەور پێچرابوو، دایە دوروا وگوتی:

" هانێ، ئەمە بەشی تۆیە لەو سوودەی کە لە کڕینی ئەوراقی بەهاداری مەراکش بە نەسیبمان بوو. زۆر خۆشحاڵم کە توانیم ئەم پارەیەت بۆ پەیدا بکەم، هانێ بیگرە... "

جۆرج دەیویست وەرینەگرێت:– نە، ئامادە نیم ئەم پارەیە وەربگرم!

خانم ڤالتر هەڵچوو و گوتی:– ئاخ، ئەم بەڵایەم بە سەردا مەدە. ئەم پارەیە هی تۆیە، ئەگەر وەری نەگریت، فڕێی دەدەمە ئەو زێرابەوە. کاری وا لە گەڵ منا مەکە جۆرج.

جۆرج، بەستە چکۆلەکەی وەرگرت و خستیە گیرفانییەوە و ئەوسا گوتی:

– پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ناو بیناکە، دەنا تووشی برک و سینەپاڵو دەبیت.

خانم ڤالتر لەبن لێوانەوە گوتی:– جا کوا! چەند حەز دەکەم بمرم و نەجاتم بێ.

دەستی جۆرجی گرت، بە نائومێدیەوە، بەوپەڕی هەڵچوون و تووڕەییەوە ماچی کرد وئەوسا بە تاو خۆی بە ناو بیناکەدا کرد.

جۆرج، بە ئارامی و غەرقی فکرانەوە، شەقامەکەی تەی کرد. دوای ئەوە بە قەڵافەتی مەغروورانە، بەدەم بزەوە خۆی بە گوڵخانەکەدا کرد. ژنەکەی ولاروش لەوێندەر نەمابوون. ژمارەی تەمەشاڤانەکان کەم دەبووەوە. وادیاربوو چ کەسێک نەیدەویست بۆ کۆڕی سەمایەکە وەمێنێ. چاوی بە سوزان کەوت کە دەستی خوشکەکەی گرتبوو. هەردووکیان بەرەولای ئەو هاتن و لەویان پرسی دەتوانن لە یەکەمین نۆرە ڕەقسا دەگەڵ کۆنت دولاتور – یوڤیلین دا بڕەقسن یان نا.

جۆرج بە سەرسامی پرسی:- ئەمە دەکاتە کێ.

سوزان عەیارانە گوتی:- دۆستی تازەی خوشکەکەمە.

روز، سوور بووەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئەمە چ شەیتەنەتێکە، سوزت، ئەم ئاغایە ئەوەندە دۆستی منە کە دەتوانێ دەگەڵ تۆدا بێ.

سوزان، بەدەم بزەیەکەوە گوتی:- بەڵێ، تێدەگەم.

روز بە تووڕەیی پشتی لەوان کرد و ڕۆیی.

جۆرج، ئانیشکی سوزانی، کە لە گەڵ ئەما مابووەوە، گرت وبە شێوەیەکی خۆیی گرت و بەڕاوێژێکی نەوازشامێزەوە گوتی:- گوێ بگرە چکۆل گیان، بەڕاستی من بەدۆستی خۆت دەزانی؟

– بێگومان، بیل ئامی.

– یانی متمانەت بەمن هەیە؟

– بەتەواوی.

- له بیرته ماوەیەک لەمە پێش چیم پێگوتیت؟
- دەربارەی چی؟
- دەربارەی شوو کردنت، یان بە گوتەیەکی دی دەربارەی ئەو پیاوەی کە بتەوێ مێردی پێبکەیت.
- بەڵێ.
- زۆرچاکە. ئامادەی بەڵێنێک بە من بدەیت؟
- بەڵێ، بەڵام لە چ بارەیەکەوە و سەبارەت بە چ شتێک؟
- بەڵێن بدەی هەرکاتێ خوازگارێک هاتە خوازبینیت، ڕاوێژ وشیرەت بەمن بکەیت و، بەبێ پرسی من هیچ قەول و قەرارێک بەکەس نەدەی.
- باشە ، قەول دەدەم.
- ئەمە لەبەینی خۆمانا بێ ها. تاقە وشەیەک لەمبارەیەوە نە بە دایکت بڵێی نە بە باوکت.
- باشە قەبووڵمە.
- سوێند دەخۆیت؟
- سوێند دەخۆم.

لەم کاتەدا ڕیڤال بە سەروسیمایەکی مژوولەوە هات بە سەرا و گوتی:

- کیژەخان، بابت بۆ دەستپێکی سەماکە لە دووت دەگەڕێ.

سوزان گوتی:- بابڕۆین، بیل ئامی.

لێ جۆرج بە گوێی نەکرد. بڕیاری دابوو، بە زووترین کات لەوێ بڕوات، دەیویست بە تەنیا بێ وبیر بکاتەوە. زنجیریەک بیرێن زۆر و تازە هۆرژمیان بۆ زەینی هێنابوو. کەوتە گەڕان بە شوێن ژنەکەیدا.

دوای چەند خولەکێک دۆزییەوە کە دەگەڵ دوو پیاوی نەناسدا، لەبەر بوفیەکەدا، خەریک بوو شیر بە کاکاوی دەخواردەوە. مێردەکەی بەو دوو پیاوە ناساند، بە بێئەوەی ناویان بڵێیت. دوای چەند ساتێک جۆرج لە ژنەکەی پرسی:- بڕۆین؟

- بە کەیفی خۆت.

قۆڵی بە قۆڵی مێردەکەیا کرد و بە هۆڵەکاندا، کە تها چۆڵ بووبوون، تێپەڕین. لە جۆرجی پرسی:

- خانمی خاوەن ماڵ لە کوێیە؟ دەمەوێ خاتر خوازی لێبکەم.

- پێویست ناکات. هەوڵدەدات بۆ کۆڕی سەماکەمان بیێڵێتەوەو منیش ماندووم وناتوانم لەوەی پتر بمێنمەوە.

- ڕاستە، هەق بەتۆیە. لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ ماڵ، بە درێژایی ڕێگاکە بێدەنگ بوون. لێ هەرکە چوونە ژوورەکەیانەوە، مادلین، لێو بەخەندە و تەنانەت بەرلەوەی تۆڕەکەی سەر ڕوخساریشی هەڵبداتەوە گوتی:

- ئاگات لێ نییە، خەبەرێکی سەیرم بۆت پێیە.

- خەبەری چی؟

- هەڵی بێنە.

- بەم درەنگە شەوە حەوسەڵەی هەڵهێنانم نییە.

- دەی باشە، سبەی ١/١ .

- ئێ چییە؟

- ڕۆژی پێشکەشکردنی نیشانانە.

- ڕاستە.

- ئەمەش نیشانەکەی تۆیە کە چەند خولەکێک لەمەپێش لاروش دایە من.

قوتوویەکی ڕەشی چکۆلەی دایێ کە زیاتر لە قوتووی جەواهیرات دەچوو. جۆرج، بە خەمساردی قوتووەکەی کردەوەو چاوی بە نیشانی لژیون دونور کەوت. کەمێک ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، ئەوسا بزەیەکی کرد و گوتی:

- حەزم دەکرد دە ملیۆنی لە پارەکانی پێ دابام... ئەم نیشانە بۆ ئەو هیچی تێناچێت.

مادلین، کە چاوەڕوانی ئەوەبوو، جۆرج بەو نیشانە زۆر خۆشحاڵ بێت، لەم کاردانەوەیەی ئەو توورە بوو و بەڕاوێژێکی سارد گوتی:- بەڕاستی کەس سەر لە تۆ دەرناکات. ئێستا هیچ شتێک دڵخۆشت ناکات.

جۆرج، بەکاوەخۆ گوتی:- ئەم پیاوە تەنیا دەیەوێ قەرزی من بداتەوە و هێشتا زۆر قەرزارباری منە.

مادلین، کە لە ڕاوێژی گوتەکانی ئەو سەری سوڕمابوو، دووبارە گوتی:

- بەڵام وێڕای ئەمەش، وەرگرتنی ئەم نیشانە لەم ساڵ و تەمەنەی تۆدا، زۆر خۆشە.

جۆرج، گوتی:- هەموو شتێک ڕێژەییە. ئەمڕۆ دەمتوانی لە مانە زیاترم هەبێت.

قوتووەکەی لە دەست ژنەکەی وەرگرت، بە هەمان کراوەیی لە سەر سۆپاکەی دانا، بۆ چەند ساتێک ڕوانییە ئەو ئەستێرە ڕەخشانەی کە لە ناو قوتووەکەدا بوو. ئەوسا سەری قوتووەکەی نایەوە، شانەکانی هەڵتەکاند و چووە ناو جێگاکەوە.

***

ڕۆژنامەی فەرمی ڕۆژی یەکەمی کانوونی دووەم، ڕایگەیاند کە ئاغای پروسپە – جۆرج دوروا، ڕۆژنامەڤان، لە

سەر خزمەتە ئاوارتەکانی، نیشانی سوارچاکی لژیون دونوری پێدراوە. ناوی بە دوو برگەی جیا لە یەکدی، دو روا، هێنرابوو، ئەمە لە نیشانەکە پتر، جۆرجی خۆشحاڵ کرد. سەعاتێک دوای بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە فەرمییە، نامەیەکی کورتی ئاغاژنی بەدەست گەیی، کە تکای لێدەکرد، شەوێ دەگەڵ ژنەکەیدا بۆ شێو، بۆ ماڵی ئەوان بڕۆن، تا بە شانازی ئەو بۆنەیەوە ئاهەنگ بگێڕن. کەمێک دوودڵ بوو، پاشان نامەکەی، کە بە ڕستەێن مەجازی هاتبووە نووسین، دا بە ژنەکەی وگوتی:- ئەمشەو، بۆ شام دەعوەتی ماڵی ڤالترین. مادلین، حەپەسا.

- عەجەب، وامدەزانی ئامادەنیت چیتر پێ بنەیتە ئەوێندەر. جۆرج، لەبن لێوانەوە گوتی:- باوەڕی خۆم گۆڕیوە. کاتێ گەیینە ماڵی ئەوان، خانم ڤالتر، بە تاقی تەنیا، لەو ژوورەدا کە بە ستایلی لویسی شازدەیەم دروست کرابوو، ڕۆنیشتبوو. ئاغاژن ئەو ژوورەی کردبوو بە ژووری پێشوازی تایبەتی خۆی. جلکی ڕەشی لەبەر کردبوو، بۆدرەی لە قژی دابوو، کە ئەمەی زۆر لێدەهات. لە دوورەوە پیر دەهاتە بەرچاو و لە نزیکەوە گەنج، وەختێ کە بە باشی دیقەتت دەدا، دەبوو بە داوێکی جوان بۆ ڕاوە نیگا. مادلین پرسی:- چیتە تازیەباری؟

ئاغاژن، بە ڕاوێژێکی خەمین گوتی:

- نا و ئا. هیچکەسێک لە خزمەکانم نەمردوون. بەڵام گەییومەتە تەمەنێک کە بەشەر دەبێ لە پرسەی ژیان و تەمەنی خۆیدا دابنیشێت. ئیدی ئەمڕۆ بۆیە جلکی ڕەشم پۆشیوە تا لەمڕوە دەستی پێبکەم. لە ئێستا بە دواوە، دڵم تازیەبار دەبێت.

جۆرج، له دڵی خۆیدا گوتی: یانی پابەندی ئەم قسەیەی خۆی دەبێت؟

ئێوارە خوانەکە کەمێک خەمناک بوو. تەنیا سوزان له یەکبینە قسانی دەکرد، روز، وادیاربوو له فکران ڕۆچووبوو. هەمووان پیرۆزباییان له جۆرج کرد.  دوای شام، به هۆڵەکان و گوڵخانەکەدا کەوتنە گەڕان و پیاسە. چونکە دورواو خانم ڤالتر له دوای هەموویانەوە دەهاتن، خانم ڤالتر دەستی گرت و کەمێک دوای خست و به ئەسپایی گوتی:

- گوێ بگرە... ئیدی دەربارەی هیچ شتێک قسەت له گەڵ ناکەم، هەرگیز... بەڵام جۆرج، بێرە دیدەنیم... ملاحەزە دەکەی کە ئیدی به ئێوە ناڵێم تۆ. بەڵام بەبێ تۆ هەڵناکەم، ناژیم. ئەشکەنجەیەکی بەترەفە. بەهەموو بوونمەوە هەست به تۆ دەکەم، له بوونمای، شەو ورۆژ له چاوەکانما، لەدڵما، له جەستەمدا هەڵتدەگرم، دەتپارێزم، دەڵێی ژەهرێکت کردووە به گەرووما کە له ناخەوە دەمخوات. ناتوانم. نا، ناتوانم. ئامادەم بۆتۆ تەنیا پیرەژنێک بم. بۆیە قژم سپی کردووە تا ئەمەت بۆ بسەلمێنم، لێ وەرە بۆ ئێرە، جارجار سەرێ بدە، وەکو دۆستێک.

دەستی جۆرجی گرتبوو، دەی گوشی، پان و پلیشی دەکردەوە، نینۆکەکانی له گۆشتەکەی ئەوا دەچەقاند.

جۆرج، بەوپەڕی ئارامی بەرسڤی دایەوە:

- قەبووڵمە. ئیدی پێویست بەوە ناکات لەمبارەیەوە تاقە قسەیەک بکەین. بەخۆت دەبینی کە ئەمڕۆ هاتووم. هەرکە نامەکەتم به دەست گەیی هاتم.

ڤالتر، کە دەگەڵ هەر دوو کیژەکەی و مادلین دا له پێشەوە دەڕۆیی، لەبەر تابلۆکەی مەسیح دا وەستا. بەدەم

پێکەنینەوە گوتی:- تەسەور بکە، دوێنێ ژنەکەمم بینی، کە وەک ئەوەی لە نوێژخانەدا بێ، لەبەردەم ئەم تابلۆیەدا چۆکی دادابوو. خەریک بوو دەپاڕایەوە. خوایە کە پێکەنیم!

خانم ڤالتر، بە دەنگێکی مکووم، دەنگێ کە جۆش و خرۆشێکی پەنهانی پێوە دیاربوو، گوتی:

- هەر ئەم مەسیحەیە کە من ڕزگاردەکات. هەرجارێ کە تەمەشای دەکەم هێز وشەهامەتم پێدەبەخشێت.

لە بەردەم تابلۆکەدا، لەو شوێنەدا کە مەسیح بەسەر شەپۆلەکانی دەریاکەوە دەڕۆیی وەستان. خانم ڤالتر، لەبن لێوانەوە گوتی:- چەند جوانە! یاوەرەکانی چەند لێی دەترسن و لە هەمان کاتدا چەند خۆشیان دەوێت! تەمەشای سەری بکەن، چاوەکانی، چەندە سادەن، دە ئەوەندە میتا بەشەرین.

سوزان بە دەنگی بەرز گوتی:

- چەند لە تۆ دەچێ بیل ئامی. دڵنیام لە تۆ دەچێت. ئەگەر تۆ ڕدێنت بەرداباوە یان ئەو ڕدێنی تاشیبا، کوت مت لە یەکدی دەچوون. ئاە، تەمەشا بکەن، چەند لێکدی دەچن بەڕاستی سەیرە.

داوای لە جۆرج کرد لای تابلۆکەوە بوەستێت و، هەمووان بۆیان تەسدیق کرد کە بە ڕاستی ئەو دوو ڕوخسارە لێکدی دەچن.

هەموو سەرسام بوون. ڤالتر ئەمەی بەلاوە سەیر بوو. مادلین، لێو بەخەندە گوتی: بەڵام سیمای مەسیح پیاوانەترە.

خانم ڤالتر، بە بێ جووڵە وەستابوو، بە نیگایەکی جێگیر، ڕوخساری عاشقەکەی دەگەڵ ڕوخساری مەسیحدا بەراورد دەکرد و ڕەنگی بە هەمان ئەندازەی ڕەنگی قژەکەی کە بە بۆدرە سپی کردبوو، بزرکا و سپی دەهاتە بەرچاو.

( ٨ )

له باقی مانگەکانی دیکەی زستاندا، دوروا و هاوسەرەکەی، زۆربەی جار سەری ماڵی ڤالتریان دەدا. تەنانەت هەندێجار جۆرج بە تەنیا بۆ ئەوێندەر دەچوو و شامی لەوێ دەکرد. مادلین زۆربەی کات دەیگوت شەکەتە وحەزیدەکرد لە ماڵەوە بمێنێتەوە.

جۆرج، ڕۆژی هەینی بۆ ئەم دیدارانە تەرخان کردبوو و خانم ڤالتر لەو ڕۆژەدا کەسی بۆ شام دەعوەت نەدەکرد، ئەو شەوەی بۆ بیل ئامی تەرخانکردبوو، تەنیا بۆ ئەو. دوای شام یاری وەرەقیان دەکرد، خواردنیان بە ماسیانی چینی دەدا. بە خێزانی پیاسەیان دەکرد. خانم ڤالتر چەندین جار، لە پشت دەرگایەکەوە، لە پەنای کۆمەڵێک گوڵەوە لە گوڵخانەکەدا، یان لە گۆشەیەکی تاریکدا، لە ناکاوا باوەشی بە جۆرجدا دەکرد، بە خۆیەوەی دەگوشی و بەگوێیدا دەچپاند: " خۆشم دەوێی!... خۆشم دەوێی! بۆت دەمرم! "

بەڵام جۆرج هەمیشە بە ساردی ئەوی لە خۆی دوور خستبووەوەو بەڕاوێژێکی وشک بەرسڤی دابووەوە: " ئەگەر جارێکی دی کاری وا بکەی چیتر پێ نانەمە ئێرە. "

ئاخروئۆخری هەیڤی مارس، لە ناکاوا باسی زەماوەندی جووتە خوشک کەوتە سەرزاران. وەکو دەگوترا روز قەراربوو دەگەڵ کۆنت دولاتور – ئیڤیلین دا زەماوەند بکات و سوزان شوو بە مارکی دوکازول بکات. ئەم دوودانە بووبوون بە ئەندامی ماڵباتەکە. لەو ئەندامە خۆمانیانەی کە مدارایەکی تایبەتی دەکران و لە ڕەچاوکردنی زۆربەی ئەتەکێت و تەشریفاتەکان مەعاف بوون.

جۆرج و سوزان، بە جۆرە ڕاستگۆییەکی خوشک وبرایانە و ئازاد دەژیان، بە سەعاتان پێکڤە قسانیان دەکرد، بە هەموانیان ڕادەبوارد و بە ڕواڵەت زۆر یەکتریان خۆشدەویست.

هەرگیز دەربارەی زەماوەندی ئیحتیمالی کیژەی گەنج و هەروەها دەربارەی ئەو خوازگارانەی کە دەهاتنە خوازبێنی، گەنگەشەیان نەکەوتبووە بەین.

ڕۆژێک بابا ڤالتر، بۆ فراڤین جۆرجی بۆ ماڵەوە بردەوە. چونکە خانم ڤالتر، لە دوای فراڤین دەبوایە خجلی کاروباری ماڵەوە بێ، بە لیستی حیسابی ئامادەکارانی خواردنەکان ڕابگات، جۆرج بە سوزانی گوت: " بابڕۆین خواردن بە ماسییە سوورەکان بدەین. "

هەریەکەیان پارچە نانێ گەورەیان هەڵگرت و بۆ گوڵخانەکە چوون. لە سەرانسەری کەناری مەڕمەڕی حەوزەکەدا، دۆشەکەڵەیان دانابوو تا تەمەشاڤانان بتوانن ئاسوودەتر و لە نزیکەوە تەمەشای ماسییەکان بکەن. جۆرج وسوزان دوو دۆشەکەڵەیان لە تەنیشت یەکەوە دانا وبەسەر حەوزەکەدا دانەوینەوەو نانەکانیان گرمۆڵە دەکرد و دەیان خستە ئاوەکەوە. ماسییەکان هەرکە ئەوانیان دەبینی بە تەکاندانی خێرای کلکان دەهاتنە پێشەوە، بەچاوە بەرجەستەکانیان تەمەشای ئەوانیان دەکرد، بە دەوری خۆیاندا دەخولانەوە. ئیدی کە گرمۆڵە نانەکان دەچوونە خوارەوە، ماسییەکان بلەز بۆی دادەکشان. پاش ئەوەی نانەکەیان دەخوارد، دووبارە دەهاتنەوە سەرێ تا گرمۆڵە نانێکی دی بقۆزنەوە.

جووڵەی دەمیان جوان بوو، هەڵبەز و دابەزینی لەزگین و لە ناکاویان دیمەن و حاڵەتێکی سەیری بەم گیانلەبەرانە دەدا. ڕەنگە سوورەکەیان بەسەر زیخە زێڕینەکەی بن حەوزەکەوە، درەوشانەوەیەکی سەیری هەبوو. گاڤێ بلەز دەجولان، ڕەنگە قرمزە تۆخەکەیان دەتگوت مەشخەڵێکی بزۆزە و لە ناو ئاوە زولاڵەکەدا دەجولێت، یان بە هەڵوەستە و وەستانێکی لە ناکاوا، پەراوێزێکی شینباو لە دەوری پولەکەکانیان چێدەبوو.

جۆرج و سوزان، ڕوخساری خۆیان لە ئاوەکەدا دەبینی و پێی پێدەکەنین.

جۆرج لە ناکاوا و بە ئەسپایی گوتی:- هیچ باش نییە، هەندێ شت لە من بشاریتەوە سوزان.

کیژەی گەنج پرسی:- چیم شاردۆتەوە بیل ئامی؟

- بیرت نایە، شەوی زیافەت و دەعوەتەکە، لێرە لە ناو گوڵخانەکە چ سۆزێکت ( بەڵێن، قەول ) بە من دا؟

- نە!

- کە هەرکاتێ یەکێک هاتە خوازگاریت، بە من بڵێیت.

- ڕاستە، مەگەر چی بووە؟

- هاتوونەتە خوازبێنیت.

- کێ؟

- خۆت باش دەزانی، لە خۆت بپرسە.

- نە، سوێند دەخۆم.

- با دەزانی! ئەو درێژە لە خۆ ڕازیە، مارکی دوکازول.

- یەکەم لە خۆڕازی نییە.

- دەشێت، بەڵام گێلە. هەرچی سەروەتی هەیە لە قەبەڵی قوماری کردووەو گەنجاتی خۆی بۆ زەماوەندی یەک لە دوای یەک تەرخان کردووە. ئەلهەقی پڕ بە پێستی تۆیە، تۆیەک بەم هەموو جوانیەوە، بەم گەنجاتی یە تەڕ وبڕەوە و بەم هەموو زیرەکی و هۆشمەندییەوە.

سوزان، لێوبەخەندە پرسی:- بۆچی، بەم شێوەیە لە عەلەیی دەدوێی؟

- من؟ بە هیچ جۆرێ.

- با. دەنا هیچ یەکێک لەو عەیبانەی تیا نییە کە تۆ گوتت.

- چەند خۆش خەیاڵی. ئەو کابرایەکی کەودەنی بەفێڵ و دەهۆی لەبنەوە بڕە.

سوزان، بە ئاستەم ئاوڕی لەو دایەوە وچاوی لە ئاوەکە هەڵگرت وگوتی:

- بزانم، چی دەربارەی دەزانی؟

جۆرج وەکو ئەوەی ڕازێکی، کە مایل بە درکاندنی نەبووبێ، لە زار دەرهێنرابێ گوتی:

- مەسەلەکە ئەمەیە کە من... من.... بەغیلی بەو دەبەم. غیرەی لێدەکەم.

سوزان کەمێک حەپەسا وگوتی:- تۆ؟

- بەڵێ، من.

- عەجایەب، بۆچی بەغیلی پێدەبەیت؟

- چونکە عاشقی تۆم و خۆتیش ئەمە چاک دەزانیت، نارەسەن.

سوزان، بەڕاوێژێکی جدی گوتی:- ئەوە شێت بووی، بیل ئامی؟

جۆرج بەرسڤی دایەوە:

- دەزانم، کە ئەقڵەکەم لە دەست داوە. یانی دەبێ من پیاوێکی ژندار، ئەم شتە بە تۆ، بە کچێکی گەنج بڵێم؟ شێت کەمە، گوناحکاریشم، کەسێکی بودەڵە، خوێڕی، هیچ ئومێدێکم نییە، هەر بۆیە شێت بووم. وەختایەک کە بیستم دەتەوێ شوو بکەی، بەجۆرێ تووڕە بووم کە حەزم دەکرد کەسێک بکوژم. هیوادارم بمبوری سوزان.

بێدەنگ بوو. ماسییەکان کە کەس نانی بۆ لە ئاوەکە نەدەکردن، بێ جووڵە وەستابوون، وەکو سەربازانی ئینگلیزی بەڕیز وەستابوون و دەیانڕوانیە ئەم دوو ڕوخسارەی بەدیار ئەوانەوە دانەوی بوونەوە.

سوزان، بە ڕاوێژێکی نیوە غەمین و نیوەشاد لەبن لێوانەوە گوتی:

- حەیفێ کە تۆ ژنت هێناوە، لەوەی زیاتر چیت دەوێ؟ هیچ کارێک ناکرێ. مەسەلەکە تەواوبووە.

جۆرج، لە ناکاوا ڕووی تێکرد و ڕوو بەڕوو گوتی:- ئەگەر ژنم نەبوایە، شووت پێدەکردم؟

کیژێ، ڕاستگۆیانە گوتی:- بەڵێ، بیل ئامی مێردم پێدەکردیت، چونکە تۆم لە هەر کەسێکی دی پتر خۆش دەوێ.

جۆرج هەستا، دەمی تێک ئاڵاند وگوتی:

- مەمنوونم... سوپاس... تکات لێدەکەم بەڵێن بە هیچ کەسێک مەدە، باشە؟ کەمێک چاوەڕوان بکە. تکا دەکەم! قەولم دەدەیێ؟

- قەول بێ.

جۆرج، کە تیکە نانێکی گەورەی بەدەستەوە بوو، فڕێی دایە ئاوەکەوە وئەوسا وەکو ئەوەی بەڕاستی ئاوەزی لە دەست دابێت، بەبێ خاتر خوازی، لە گوڵخانەکە هەڵات.

ماسییەکان بە تامەزرۆییەوە، پەلاماری ئەو تیکە نانەیان دا کە ورد نەکرابوو و بەسەر ئاوەکەوە وەستابوو. بە دەمە چکۆلەکانیان تیکەتیکەیان لێدەکردەوە، پاشان نانەکەیان بۆ ئەوبەری حەوزەکە برد و لە ژێر پارچە نانەکەدا وەکو هێشوویەکی بزۆز خڕ بوونەوە، وەکو گوڵێکی زندووی بزۆز، گوڵێکی گیاندار کە سەرەوخوار کەوتبێتە ئاوەکەوە، دەهاتنە بەرچاو.

سوزان، حایر و سەرسام، پەشێو و پەرێشان، لەجێی خۆی هەستا و بەکاوەخۆ بۆ هۆڵەکە ڕۆیی. جۆرج لە ماڵی وان ڕۆیی بوو.

جۆرج، زۆر بە ئارامی بۆ ماڵ گەڕایەوەو کە بینی مادلین خەریکە نامە دەنووسێت، لێی پرسی:- هەنیی بۆ شێو با ماڵی ڤالتر دێیت؟ من دەڕۆم.

مادلین، سووکە هەڵوەستەیەکی کرد و ئەوسا گوتی:

- نا، کەمێک بێ حەواسم. حەز دەکەم لێرە، لە ماڵەوە بمێنمەوە

جۆرج بەرسڤی دایەوە:- بە کەیفی دڵی خۆت ، کەس زۆرت لێناکات.

ئەوسا کڵاوەکەی هەڵگرت و بلەز لە ماڵ وەدەرکەوت.

دەمێ بوو چاودێری ژنەکەی دەکرد، تاقیبی هەڵس وکەوت وڕەفتار و ئەتواری دەکرد و لە هەموو کارەکانی ئاگادار بوو. ئیدی ئەوکاتە کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد،

هاتبوو. تۆنی دەنگی ژنەکەی کە گوتبووی: "حەزدەکەم لێرە، لە ماڵەوە بمێنمەوە" ئەوی نەخاپاندبوو.

ڕۆژانی دواتر بە میهرەبانی ڕەفتاری دەگەڵیا کرد. تەنانەت وای دەنواند کە خوشحاڵ و بەکەیفە، کە شتێک بوو، ئاسایی نەبوو. ژنەکەی پێی دەگوت:- دەبینم، سەرحاڵ و بەدەماخی.

ڕۆژی هەینی زووتر لە کاتی ئاسایی خۆی گۆڕی و بەژنەکەی گوت، پێش ئەوەی بۆ ماڵی ئاغا بڕوات، هەندێ کاری هەن دەبێ ڕاییان بکات.

نزیک سەعات شەشی دوانیوەڕۆ، پاش ئەوەی ژنەکەی ڕاموسی لە ماڵ وەدەرکەوت، ئەوسا لە مەیدانی نوتردام دو لورت گالیسکەیەکی بەکرێ گرت. بە گالیسکەچییەکەی گوت:

- بۆ خانووی ژمارە هەڤدەم بەرە، لە شەقامی فونتن ولەوێ چاوەڕوانم بکە تا خۆم پێت دەڵێم. دوایی بۆ خوارنگەی کوک فزان، لە شەقامی لافایت، دەڕۆین.

گالیسکەچییەکە، کەوتەڕێ، جۆرج پەردەی پەنجەرەکانی دادایەوە. کاتێ گەیینە بەرماڵەکەی خۆیان، چاوی لەوێندەر نەدەگواستەوە. دوای دە خولەکان، مادلینی بینی لە ماڵ وەدەرکەوت و بەرەو بولڤاری بازنەیی نشێو بووەوە.

هەرکە مادلین، دوور کەوتەوە، جۆرج سەری لە پەنجەرەی گالیسکەکەوە دەرکێشا و بە گالیسکەچییەکەی گوت:- بجمێ.

گالیسکەکە کەوتەڕێ و دوای کەمێک جۆرجی لە بەر خوارنگەی کوک - فزاندا، کە خوارنگەیەکی بەشکۆ بوو ولەو دەڤەرەدا بە نامێ بوو، داگرت. جۆرج، خۆی بە هۆڵە

گشتیەکەی خوارنگەکەدا کرد و بە ئارامی دەستی بە نان خواردن کرد، بە دەم نانخواردنەوە جارجارێ تەمەشایەکی سەعاتەکەشی دەکرد. سەعات حەوت و نیو، دوای ئەوەی قاوەکەی خواردەوە، دوو پێک شامپانیای دەرەجە یەکی بەسەردا کرد و جگەرەیەکی پێکرد، لە خوارنگەکە وەدەرکەوت، گالیسکەیەکی، کە بەوێدا ڕەت دەبوو، بانگکرد وبە گالیسکەچییەکەی گوت بۆ شەقامی لاروشفوکەی ببات.

بێئەوەی پرس بە دەرگاوانەکە بکات، بە پلیکانەکانی ئەو خانووەدا کە مەبەستی بوو، هەڵگەڕا تا گەییە نهۆمی سێیەم. بەکارەکەرەکەی کە دەرگاکەی لێکردبووەوە، گوت:- جەنابی گیبردولورم لە ماڵە یان نا؟

- بەڵێ جەناب.

کارەکەرەکە بۆ هۆڵێکی برد، جۆرج بۆ چەند ساتێک بەدەم چاوەڕوانییەوە لەوێندەر مایەوە. دوای تۆزێک پیاوێکی کەڵەگەت، بە سینگ و بەرۆکی پڕ نیشانەوە، کە ڕەفتارێکی سوپاییانەی هەبوو و، هەرچەندە گەنج بوو، لێ سەری ماش و برنج بووبوو، هاتە ژوورەوە.

دوروا، سڵاوی لێکرد وگوتی:- جەنابی کەلانتەر، وەکو پێشتر پێمگوتی، ژنەکەم حاڵی حازر دەگەڵ عاشقەکەیدا، لە خانوویەکی موبیلەدارا، کە لە کوچەی دمارتیر بەکرێیان گرتووە، خەریکی شام کردنە.

یارۆی کەلانتەر، سەرێکی دانەواند و گوتی:- من لە خزمەتودام.

جۆرج، لە سەر قسەکەی ڕۆیی:- جەنابت تا سەعات نۆ وەختت هەیە، نا؟ لە سەعات نۆ بە دواوە ناتوانی خۆت بەو

خانووەدا بکەی تا بە چاوی خۆت زیناکاری هاوسەرەکەم ببینی.

– بەڵێ وایە. زستانان تا سەعات حەوت و لە ٣١ مارس بە دواوە تا سەعات نۆ دەرفەتم هەیە. چونکە ئەمڕۆ ٤/٥ ، تا سەعات نۆ کاتم هەیە.

– زۆرچاکە جەنابی کەلانتەر. من گالیسکەکەم لە خوارەوە، لە کۆڵانەکەدا ڕاگرتووە، دەتوانی ئەو مامورانەی کە پێویستت پێیانە سوار بکەین و پاشان بڕۆین بۆ بەر ئەو خانووەی کە پێمگوتیت و کەمێک چاوەڕوان بکەین. تا درەنگتر بگەینە ئەوێندەر، دەرفەتی ئەوەمان زیاتر دەبێ کە بدەین بەسەریانا و بەسەر تاوانەکەوە بیانگرین و غافڵگیریان بکەین.

– بەکەیفی دڵی تۆ جەناب.

کەلانتەرەکە لە هۆڵەکە وەدەرکەوت، دوای کەمێک بە باڵاپۆشێکەوە، کە لەبەری کردبوو تا کەمەربەندە سێ ڕەنگەکەی نەبینرێ، گەڕایەوە. لەبەر دەرگای چوونە دەرەوە وەستا تا جۆرج لە پێشەوە وەدەربکەوێت، لێ جۆرج کە بیر وخەیاڵی ڕۆیی بوو و لە جێیەکی دی بوو، نە دەڕۆیی و لێکدا لێکدا دەیگوتەوە: " نابێ جەناب، تۆ پێش بکەوە، نابێ... تۆ پێش بکەوە. "

یارۆی کەلانتەر گوتی:– پێشکەوە جەناب، من خاوەن ماڵم، نابێ، دەبێ تۆ پێش بکەویت.

جۆرج، سەرێکی دانەواند وخێرا وەدەرکەوت.

هەوەڵجار چوون بۆ پۆلیسخانە و سێ پۆلیسیان، کە جلکی مەدەنیان لەبەر کردبوو، لەگەڵ خۆدا هەڵگرت. جۆرج پێشتر ئاگاداری کردبوونەوە کە عەمەلیاتە غافڵگیرییەکە

ئەمشەو ئەنجام دەدرێت. چونکە جێگەی هەموویان لە ناو گالیسکەکە نەدەبووەوە، یەکێک لە پۆلیسەکان چوو لە تەنیشت گالیسکەچییەکەوە ڕۆنیشت و دوانەکەی دی لەسەر تەختەکەی بەرانبەری جۆرج وکەلانتەرەکە دانیشتن و گالیسکەکە بەرەو کوچەی دەمارتیر وەڕێکەوت.

دوروا بەکابرای کەلانتەری گوت:

– من نەخشەی ئاپارتمانەکەم لەلایە. لە نهۆمی دووەمە. هەوەڵجار هۆڵێکی بچووکە و دوایی ژوورێکی نووستنە. ژوورەکانی ئاپارتمانەکە ڕێگەیان بۆ دەرەوە نییە. ناتوانن لە هیچ شوێنێکەوە هەڵێن. کەمێک لە دووری خانووەکە کابرایەکی قفڵ ساز هەیە. ئەویشم ئاگادار کردووەتەوە کە لە خزمەتتاندا بێ.

کە گەیشتنە بەر خانووی دیاریکراو، سەعات هەشت وچارەک بوو. بیست خولەکی دیکەش بە بێدەنگی چاوەڕوانیان کرد. لە سەعات نۆ کەم چارەکەدا، جۆرج گوتی: " نها دەتوانین بچینە ژوورەوە. " بێ ئەوەی گوێ بە دەرگاوانەکە بدەن، کە ئاگای لە هاتنە ژوورەوەی وان نەبوو، بە قاڵدرمەکاندا هەڵگەڕان. یەکێک لە پۆلیسەکان لە دەرێ ڕا، لەبەر ماڵەکەدا وەستا.

بەچوار قۆڵی لەبەر دەرگای ئاپارتمانەکەدا وەستان. دوروا سەرەتا گوێی بە دەرگاکەوە نا و پاشان لە کونی دەرگاکەوە ڕوانیە ناو ژوورەکە. نە گوێی لە دەنگێ بوو ونە هیچی بەدی کرد. هەنگێ لە زەنگی دا.

یارۆی کەلانتەر، بە پۆلیسەکانی گوت:– ئەنگۆ لێرە چاوەڕوان بن، بەڵام ئامادە و حازر بۆ پەلامار.

هەموو بەدەم چاوەڕوانییەوە وەستان. دوای دوو سێ خولەکان، جۆرج، دووبارە چەند جارێک لە زەنگی دا. دەنگێکی نەوی لەوسەری ئاپارتمانەکەوە هاتەگوێ و پاشان دەنگی هەنگاوی سووک نزیک بووەوە. نەفەرێک لە کونی دەرگاکەوە تەمەشای دەرەوەی کرد. هەنگێ جۆرج بە پشتی قامکان، چەند جارێک لە دەرگا تەختەکەی ئاپارتمانەکەی دا.

دەنگی ژنێک ، کە هەوڵیدەدا، تۆنی دەنگی خۆی بگۆڕێ پرسی:- کێیە؟ کەلانتەرەکە گوتی:- بە ناوی قانوونەوە داوات لێدەکەم دەرگا بکەوە.

دەنگەکە هەمدیس پرسی:- تۆ کێی؟

- من کەلانتەی پۆلیسم. ئەگەر دەرگاکە نەکەنەوە، بە تۆپزی دەیکەینەوە.

دەنگەکە دووبارە پرسی:- چیت دەوێ؟

لەم کاتەدا جۆرج گوتی:- منم، پێویست ناکا، هەڵێی، فایدەی نییە، چوار دەورت گیراوە.

دەنگی پێیەکان کە پەتی بوون دوور کەوتەوە و دوای چەند چرکەیەک زڤرییەوە.

جۆرج گوتی:- ئەگەر دەرگا نەکەنەوە، لە پاژنەوە دەری دێنین. هەر بەو دەقەوە، دەسکە مسەکەی دەرگاکەی گرت و شانی لە دەرگاکە توند کرد. چونکە کەس وەڵامی نەدایەوە، هێندە بەتووندی گوشاری لە دەرگاکە کرد کە قوفڵە کۆنە ڕزیوەکەی شوقە موبیلەدارەکە، هەڵکەندرا، هێندە کوت وپڕ کرایەوە کە تۆزێکی مابوو جۆرج بەسەر مادلین دا بکەوێ. مادلین، مۆم بەدەست لە هۆڵەکەدا وەستابوو، بلوز وتەنوورەیەکی لەبەر بوو، قژی ئاڵۆزکاو و پێی پەتی بوو. جۆرج، هاواریکرد:- خۆیەتی. لە قافا گرتمانن.

بە هەشتاو خۆی بە شوقەکەدا کرد وکەلانتەرەکەش، کڵاوەکەی داکەند و، دوای کەوت. ژنەی گەنج، سرک و سڵۆک لە دووی ئەوان دەهات و ڕێگاکەی بۆ ڕوناک دەکردنەوە. بە ژووری نانخواردندا تێپەڕین، کە پاشماوەی خواردن و قاپە چەورەکان هێشتا کۆ نەکرابووەوە، بوتڵێن خاڵی شامپانیا، قاپێ جگەری قازی نیوە خوراو، ئێسقانی بێ گۆشتی مریشک و پارچە نان بەسەر مێزەکەوە پەخش و بڵاو بووبووەوە. دوو قاپ، لە سەر تەپڵەکێکی کەنار مێزی نانخواردنەکە دانرابوو کە پڕبوون لە قەپێلک و قاوغی بەتاڵی سەدەف.

ژووری نووستنەکە، دارژاو و داپژاو، بەسەر یەکا درابوو. کراسێکی ژنانە، لە سەر کورسییەک کەوتبوو، دەرپێ قوتەیەکی پیاوانە بەسەر دەسکی کورسییەکی دیدا درابوو. دوو جووت پوتین، جووتێکی ژنانە و جووتێکی پیاوانە، لە پای سیسەم وتەختەخەوەکەدا، لە سەرلا لە ئەرزەکەدا کەوتبوون.

ژووری نووستنی ئەو شوقانە بوو کە بە کەل وپەل و ناوماڵەوە بەکرێ دەدرێن. لەو کەل وپەلە ئاساییانەی کە بۆنی ناخۆش و ناجۆری ژووری ئۆتێلانیان لێدێ، ئەو بۆنەی کە لە پەردە، دۆشەک، دیوارەکان و کورسییەکانەوە دێ، بۆنی هەموو ئەو خەڵکانەی کە ڕۆژێک یان شەش هەیڤان لەم ژوورە گشتیانەدا دەخەون و کە دەڕۆن کەمێک لە بۆنی تایبەتی خۆیان، بەجێ دەهێڵن، لەو بۆنانە کە دوای ئاوێتەبوونی بۆنی ئەو کەسانەی پێش ئەوان لەم ژوورانەدا ماونەتەوە، بۆنێکی ناخۆش، تێکەڵ وپێکەڵ و تەحەمووڵ ناپەزێری لێدێت.

قاپێکی پڕ لە کێک، بوتڵێک شەراب و دوو پەرداخی نیوە بە سەر سۆپاکەوە دەبینرا. کلاوێکی پیاوانە نرابووە سەر پەیکەری سەعاتێکی گەورەی دیوارییەوە.

یارۆی کەلانتەر، بە توندی ڕووی کردە مادلین و چاوی لە دوڕ چاوانی بڕی و پرسی:

– تۆ خانم کلر مادلین دوروا، هاوسەری قانوونی جەنابی پروسپە جۆرج دوروای، ڕۆژنامەڤانیت، کە بە خۆی لێرەیە؟

مادلین، بە دەنگێکی تێکشکاو گوتی:– بەڵێ جەناب.

– لێرە چ دەکەیت؟

مادلین، هیچ بەرسڤێکی نەدایەوە.

یارۆی کەلانتەر دووبارە پرسی:– لێرە چ دەکەیت؟ بۆ لە ماڵی خۆتا نیت؟ بە نیوە ڕووتی لەم شوقە موبیلەدارەدا، کە شوقەی کرێیە چ دەکەی، چما بۆ ئێرە هاتوویت؟

کەمێک چاوەڕیی کرد، کە مادلین هیچی نەدەگوت هەمدیس گوتی:

– نها کە خۆت ناتەوێ ئیعتراف بکەیت، من ناچارم، ڕەوشەکە دیاری بکەم، حوکم لە سەر ڕەوشەکە بدەم.

لە سەر تەختەخەوەکە، کەلەشی پیاوێک کە خۆی وەبن چەرچەفێک دابوو، دەبینرا. یارۆی کەلانتەر لە تەختەکە نزیک بووەوە وگوتی:– ئاغا؟

کابرای ژێر چەرچەفەکە جووڵەی بۆنەکرد. وادیاربوو پشت لەوان خەوتبوو و سەری لە ژێر سەرینەکە نابوو.

کەلانتەرەکە، دەستی بەو بەشەی بەدەنی پیاوەکەدا هێنا کە وادیاربوو شانەکانی بوو ودووبارەی کردەوە:

– ئاغا، تکا دەکەم، ناچارم مەکە کە بە توندی ڕەفتارت لە گەڵدا بکەم.

لێ ئەو بارستایەی ژێر چەرچەفەکە، هێندە بێ جووڵە بوو لە تۆوایە مردووە.

دوروا، کە بە توندی هاتبووە پێشەوە، چەرچەفەکەی گرت وبەتووندی ڕایکێشا. سەرینەکەی لە سەر سەری کابرا لادا وڕوخساری زەرد هەڵگەڕاوی لاروش ماتیو بەدیار کەوت. جۆرج، بە سەریا دانەوییەوە، لە کاتێکا لە تووڕەییا سەراپای دەلەرزی و حەزیدەکرد دەست بنێتە بینی وخەفەی بکات، بەدەم ددانە چیرەوە هاواریکرد:- بەلای کەمەوە غیرتی ئەوەتان هەبێ دان بە کارە دزێوەکەتاندا بنەن.

کابرای کەلانتەر هەمدیس پرسی:- تۆ کێی؟

یارۆی عاشقی پەشێو حاڵ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. کەلانتەرەکە دووبارە گوتی:- من کەلانتەری پۆلیسم، ئەمرت پێدەکەم ناوی خۆت بڵێ.

جۆرج، کە تووڕەییەکی هۆڤیانە سەراپای دەهەژان، هاواریکرد:

– خوێڕی وەڵام بدەوە، دەنا ناچار دەبم خۆم ناوەکەت بڵێم.

هەنگێ کابرای سەر تەختە خەوەکە، بەدەمە لاڵکێوە گوتی:

– ئاغای کەلانتەر، ڕێگە مەدە، ئەم شەلاتیە سووکایەتیم پێبکات. من سەروکارم دەگەڵ ئەودایە یان دەگەڵ تۆ؟ پێویستە وەڵامی ئەو بدەمەوە یان تۆ؟

لەوە دەچوو، زاری وشک بووبێ و دەمی چووبێتە کلیلە.

یارۆی کەلانتەر بەرسڤی دایەوە:- لەگەڵ من، تەنیا وەڵامی من بدەوە، ئاغا، لێم پرسیت تۆ کێیت؟

کابرا هەمدیس بێدەنگ بوو. چەرچەفەکەی لە ملییەوە هالاندبوو و بەنیگای سڵۆکەوە سەیری دەوروبەری دەکرد. سمێڵە باریک و بادراوەکەی، بە ڕوخسارە زەرد هەڵگەڕاوەکەیەوە، ڕەشی ڕەش دەچووە.

یارۆی کەلانتەر دووبارە پرسی: یانی ناتەوێ وەڵامم بدەیەوە؟ لەم حاڵەتەدا ناچارم دەبێ بتگرم. بەهەرحاڵ لە ناو جێگاکە وەرە دەرەوە، دوای ئەوەی جلەکانت لەبەر کرد، هەنگێ تاقیقت لە گەڵ دادەکەم.

کابرا لە ژێر چەرچەفەکەوە کەوتە جووڵەجووڵ و لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەڵام ناتوانم بە بەرچاوی ئێوەوە لە جێگاکە بێمە دەرێ.

- بۆچی؟

کابرا بەرسڤی دایەوە:- چونکە... چونکە... بە تەواوەتی ڕووتم.

دوروا، دەستی بە تەوس وتوانجان کرد، کراسێکی پیاوانە لە ئەرزەکەدا کەوتبوو، هەڵیگرت وبۆ کابرای تووڕ دا، ئەوسا بەدەم هاوارەوە گوتی:- دەی هەستە... کە بتوانی لەبەردەم ژنەکەما خۆت ڕووت بکەیەوە، دەتوانی لەبەردەم منیشدا جلەکانت لەبەر بکەیت.

ئەوسا پشتی کردە ئەو و ڕووی کردە موغەبیریەکە.

مادلین، وەخۆ هاتبووەوە، نها کە دەیبینی هەموو شتێک کەوتۆتە ئەو گۆڕە ودەستەکەی کەوتۆتە ڕوو، ئامادە بوو، هەرکارێک بکات. گڕی جەسارەتێکی سەیر لە چاوانی

دەبووەوە، پارچە کاغەزێکی لوول کرد و بە کۆمەکی ئەو دە مۆمی لە شەمدانێکی هەرزان بەهادا کە لە سووچێکی سۆپاکە دانرابوو، داگیرسان. ئەوسا پشتی بە موغەیرییەکەوە دا، یەکێک لە لاقە ڕووتەکانی کە لەژێر کراسەکەیەوە هاتبووە دەرێ، لەبەر ئاگرەکە ڕاگرت تا گەرم ببێتەوە، جگەرەیەکی، کە کاغەزەکەی پەمەیی بوو لە قوتووە جگەرەکەی دەرهێنا، دایگیرساند و دەستی بە مژلێدانی کرد. کەلانتەرەکە بۆلای ئەو هات و چاوەڕوانی ئەوە بوو تا دڵدارەکەی جلەکانی لەبەر بکات. مادلین، بە ڕوودابییەوە پرسی:- ئەمە کاری هەمیشەیی تۆیە، جەناب؟

کەلانتەرەکە، بە ڕاوێژێکی سەلارانە گوتی:

- هێندەی دەست بە بەڕێوە بچێ کەمتر، خانم.

مادلین، تەوس خەنێکی بۆکرد وگوتی:- پیرۆزباییت لێدەکەم، چونکە کارێکی چەپەڵە.

وای دەنواند سەیری مێردەکەی ناکات، ئەو نابینێت.

لێ کابرای ناو جێگاکە خەریک بوو جلەکانی لەبەر دەکرد. پانتۆڵەکەی لەبەر کردبوو، پۆتینەکانی لەپێ کردبوو، بەدەم هاتنەپێشەوە خەریک بوو دوگمەکانی ئێلەکەکەی دادەخست.

کابرای کەلانتەر ( ئەفسەر پۆلیس ) ئاوڕی لای ئەوی دایەوە:- نها ئاغا، دەتەوێ پێم بڵێی تۆ کێیت؟

کابرا بەرسڤی نەدایەوە.

کەلانتەرەکە گوتی:- ناچارم دەستگیرت بکەم.

کابرا لە ناکاوا هاواریکرد: - دەستم بۆ نەیەنی ها. من پارێزبەندی یاساییم هەیە، هێز نییە بتوانێ من دەستگیر بکات.

دوروا، وەک ئەوەی بیەوێ بیکوتێ بە ئەرزدا، بە هەشتاو بەرەو ڕووی چوو و گوتی:

– ئەمە تاوانی ئاشکرایە... ئاشکرای ئاشکرایە، ئەگەر بمەوێ دەتوانم بەگرتت بدەم، بەڵی دەتوانم ئەم کارە بکەم.

ئەوسا بە دەنگێکی لەرزۆک لە سەری ڕۆیی: – ئەم کابرایە ناوی لاروش ماتیویە، وەزیری کاروباری دەرەوەیە.

یارۆی کەلانتەر، حایر و حەپەساو هەنگاوێک هاتە دواوە و بەدەمە لاڵکێوە گوتی:– جەناب نها ئامادەی ناوی خۆتم پێ بێژی یان نا؟

کابرا زۆری لە خۆی کرد، ئەنجام لێبڕا قسەبکات:

– هەر باشە، ئەم خوێڕیە بۆ یەکەمجارە لە ژیانیا درۆ نەکات. وایە من ناوم لاروش ماتیویە و وەزیری کاروباری دەرەوەم.

پاشان دەستی بەرەو سینگی دوروا، کە خاڵێکی سووری بەسەرەوە دەدرەوشایەوە ڕاکێشا وگوتی:

– ئەم نیشانی لژیون دونورە بە سەر سینگیەوە دەبینی، من ئەم نیشانەم بەم بۆدەڵەیە داوە.

ڕەنگی دوروا زەرد هەڵگەڕا. بلەز نیشانەکەی لەیەخەی خۆی کردەوە و خستیە ناو موغەیرییەکەوە:

– نیشانێک کە لە لایەن بێ شەرفێکی وەکو تۆوە درابێ، هەر قابیلی ئەمەیە.

ڕوو بەڕووی یەکدی وەستابوون، ددانیان چیڕ کردبووەوە و کۆڵەمستیان گوشی بوو، غەزەب لە چارەیان دەباری، یەکێکیان باریکەلەیەکی سمێڵ باریک و ئەویتریان کەتەیەکی سمێڵ بابڕ بوو.

کەلانتەرەکە بلەز کەوتە بەینیانەوە و بە هەر دوو دەست لێکدی هاوێر کردن:

- ئاغایان، خۆتان لەبیر نەکەن کە ئێوە کێن، ویقار و شەخسیەتی خۆتان لە دەست نەدەن.

هەردووکیان بێدەنگ بوو و لێکدی دوورکەوتنەوە. مادلین هێشتا بەدیار سۆپاکەوە وەستابوو و لێو بەخەندە جگەرەی دەکێشا.

کەلانتەرەکە دووبارە گوتی:

- ئاغای وەزیر، من تۆم بەتەنیا دەگەڵ خانم دوروا، کە بە خۆی لێرەیە، غافڵگیرکرد، تۆ لە سەر تەختەخەوەکە خەوتبووی و ئەویش نیمچە ڕووت بوو. جلەکانتان بە تێکەڵ و پێکەڵی لە ناو ژوورەکەدا کەوتبوو، هەر هەموو ئەمانە نیشانەی ئاشکرای زیناکارییە. ناتوانی نکۆڵی لەم ڕاستیانە بکەیت. وەڵامت بۆ ئەمە چییە؟

لاروش ماتیو، لە بن لێوانەوە گوتی:- من چ قسەیەکم نییە، تۆ ئەرکی خۆت جێبەجێ بکە.

کەلانتەرەکە ڕووی کردە مادلین وگوتی:- خانم تۆ دان بەوەدا دەنەی کە ئەم جەنابە عاشقتانە؟

مادلین، زۆر بێ پەروا، گوتی:- نکۆڵی ناکەم، بەڵێ ئەو عاشقی منە.

- ئەوەندە بەسە.

ئەوسا کەلانتەر، چەند سەرەقەڵەمێکی دەربارەی شوێنەکە و ئەوەی کە بە چاوی خۆی دیبووی، لە دەفتەرچەکەی خۆیدا تۆمار کرد. وەختێ کەلانتەر لە نووسین بووەوە، وەزیر کە جلەکانی بەتەواوی لەبەر

کردبوو و پاڵتۆ و کڵاوەکەی بە دەستەوە گرتبوو، پرسی:-
کارت بەمن ماوە ئاغا؟ من چ بکەم؟ دەتوانم بڕۆم؟

دوروا، ئاوڕی لەو دایەوە وبەدەم تەوسخەنێکەوە گوتی:

- بۆ دەڕیی؟ ئێمە کارمان تەواو بوو. دەتوانی بڕۆی دووبارە بخەویتەوە، نها بە تەنیا بەجێتان دەهێڵین.

ئەوسا قامکی خستە سەر بازووی یارۆی کەلانتەر و لەسەری ڕۆیی:

- با بڕۆین جەنابی کەلانتەر. ئیدی چ کارێکمان بێرە و لێرە نییە.

کەلانتەرەکە، بە سەرسامی دوای ئەو کەوت، لێ جۆرج لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا تا کەلانتەرەکە لەپێش ئەوەوە وەدەربکەوێ. کەلانتەرەکەش، هەربۆ مجامەلە خۆی دواخست.

جۆرج، بە پێداگرییەوە گوتی:

- " بفەرموون جەناب. " کەلانتەرەکە گوتی: " نابێ. " یارۆی ڕۆژنامەڤان سەرێکی بەرێزەوەی دانەواند وبەڕاوێژێکی پڕ نەزاکەتی تەنزئامێزەوە گوتی: " نها نۆرەی تۆیە جەنابی کەلانتەر کە پێش بکەوی. ئێرە، تەقریبەن ماڵی منە. "

پاش چوونە دەرەوە، بە نەرمی و بەسەر وسیمایەکی ڕازپۆشانەوە، دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە داخست.

***

جۆرج دوروا، دوای سەعاتێک خۆی بە بارەگای ڕۆژنامەی لاڤی فرانسزدا کرد. ئاغای ڤالتر، هێشتا لەوێ بوو، بەوپەڕی جدی مژوولی ڕاییکردنی کاروباری ڕۆژنامەکە بوو. ڕۆژنامەکەی لەم ڕۆژانەدا، بایەخێکی زۆری

پەیدا کردبوو و بۆ ئەنجامدانی مامەڵە و دان وستانی گرینگی بانکی، خاوەنەکەی ئاسانکاری زۆری دەکرد.

بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە سەری هەڵبڕی وپرسی:

- عەجایەب، لێرە چ دەکەی؟ ڕەنگ و ڕوویەکی سەیرت هەیە. بۆچی ئەمشەو، بۆ شام نەهاتیت بۆ ماڵی مە؟

دوروا کە لە کاریگەری قسەکانی خۆی دڵنیابوو، بەدەم تاکیدکردنەوە لە سەر هەر وشەیەک گوتی:- ئا ئێستا، یەک سەعات لەمە پێش وەزیری کاروباری دەرەوەم سەرنگون کرد.

ڤالتر لە پێی وابووسوعبەت دەکات پرسی:- سەرنگونت کرد؟... چۆن؟

- بەم زووانە کابینەکە وادار دەکەم لای ببەن. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە کە ئەم داڵە کەرخۆرەیە ( سیسارکە کەچەڵە ) ترۆ بکەن.

ڕۆنامەڤانی پیر، حایر وحەپەساو، وای وێنا دەکرد وتارنووسەکەی مەستە. لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەریێ دوروا لەوە دەچێ وڕاوە بکەی.

- نا، بە هیچ کلۆجێ، سەعاتێ لەمەپێش لاروش ماتیوم بەحاڵی زیناوە دەگەڵ هاوسەرەکەما، غافڵگیر کرد. کەلانتەر بەخۆی حاڵەکەی بینی، تەواو وەزیر لێبووەوە.

ڤالتر، بە سەرسامی عەینەکەکەی لە سەر چاوی بەرزکردەوە وگوتی:- خۆ درۆم لەگەڵ ناکەیت؟

- بە هیچ کلۆجێ. تەنانەت بە نیازم وەکو خەبەرێک لە ستوونی ڕووداوەکاندا بڵاوی بکەمەوە.

- چما بە تەمای چیت؟

- بەتەمام ئەم ساختەچییە، ئەم دزە و ئەم پیاوە خوێڕییە لە پۆستی وەزیری بێنمە خوارەوە.
جۆرج، کڵاوەکەی نایە سەر کورسییەک و درێژەی بە گوتەکەی دا:
- وای بەحاڵی ئەو کەسانەی دەبنە کۆسپی سەر ڕێگام. ڕەحم بە هیچ کەسێکا ناکەم.
بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە کە هێشتا لە مەسەلەکە دوو دڵ بوو، لەبن لێوانەوە گوتی:- بەڵام... ئەی ژنەکەت؟
- لە سبەیەوە داوای جیابوونەوە دەکەم. دەینێرمەوە بۆلای مەرحووم فورستیە.
- دەتەوێ تەڵاقی بدەیت؟
- هەڵبەتە. پێیان ڕادەبواردم. بەڵام زۆر ناڕەحەتیم کێشا، بۆ ئەوەی لە قافا بیانگرم، ماوەیەک خۆم لە گێلی دا، دامە تان کەرێتی. بەڵام باش بوو، سەرکەوتم. نها من سوارم و ئەوان پیادە.
ئاغای ڤالتر، هێشتا باوەڕی نەدەهات. بە نیگای سڵۆکەوە لە دوروای دەڕوانی و بەخۆی دەگوت: " عەجەب، ئەم کوڕە چ جانەوەرێکە، دەبێ لە گەڵیا بسازی. " جۆرج دووبارە گوتی:- نها بۆخۆ ئازاد بووم... بایی خۆم سەروەتم هەیە. بەنیازم لە هەڵبژاردنی نیو دەورەی ئوکتوبەرا، لە زاگە و زێدی خۆما کە هەمووان من دەناسن، بەشداری بکەم. من بەم ژنەوە کە جێگای گومانی هەمووان بوو، نەمدەتوانی بگەمە هیچ شوێنێک و ببمە مایەی ڕێز وحورمەتی خەڵکی. ئەو منی بەکابرایەکی کەر زانی بوو، منی دیل و ئەسیری خۆی کردبوو. بەڵام هەرکە هەستمکرد ژێراوژێر خەریکی چ پوخڵەواتێکە، ئیدی کەوتمە چاودێری و تاقیبی.

دەستی بە پێکەنین کرد، درێژەی بە گوتەکانی دا:

– ئەم فورستیە بەلەنگازەش قورمساغ بوو، ژنەکەی خیانەتی لێدەکرد، بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات، متمانەی تەواوی پێی هەبوو و خەیاڵی ئاسوودە بوو. ئێستا لە دەست ئەم دەڵە دێوە ڕزگار بووم کە لەو بۆ من مابووەوە. دەستەکانم لە کۆت وبەند دەرباز بوون و دەتوانم خۆم بگەیەنمە جێگایانی بەرزی بەرز.

لە سەر کورسییەک دانیشت. ئەوسا وەک ئەوەی خۆی بدوێنێ لە سەری ڕۆیی:

" دەگەمە جێگایانی بەرزی بەرز. "

بابا ڤالتر، هێشتا هەر بەچاوانی بێ چاویلکەوە تەمەشای دەکرد، عەینەکەکەی بەسەر تەوێڵیەوە بوو و بەخۆی دەگوت: " بەڵێ، ئەم هەتیوە خوێڕییە دەگاتە زۆر شوێن. "

جۆرج، لە جێی خۆی هەستا وگوتی:

– با بڕۆم خەبەرەکە بنووسم. دەبێ بەشێوازێکی ناڕاستەوخۆ و پەردەپۆشانە دای بڕێژم. بەڵام دەزانی ئەمە بۆ بابایەکی وەزیر، دەبێ بە عەیبەیەکی زۆر گەورە. کابرایەکە نقومی دەریا بووە، کەس نییە بکارێت ڕزگاری بکات. ڕۆژنامەی لاڤی فرانسز، ئیدی هیچ سوودێ لەو نابینێت.

ڕۆژنامەڤانی پیر، چەند ساتێک دوو دڵ ما، پاشان بڕیاری خۆی دا:

– قەیدی نییە، بنووسە، وای بە حاڵی ئەوانەی کە هێندە گەوجن کە خۆیان لە قورە ڕەش هەڵدەکێشن، ناوی خۆیان دەزڕێنن.

•••

( ٩ )

سێ هەیڤان بووری. حوکمی تەڵاق و جیابوونەوەکە لە سەر داوای دوروا دەرچوو. ژنەکەی دووبارە هەمان ناوی فامیلی فورستیەی هەڵبژاردەوە، چونکە خانەوادەی ڤالتر دەیانویست بۆ پشووی هاوینە ڕۆژی ٧/١٥ بۆ تروڤیل بڕۆن، بڕیاریان دا پێش جیابوونەوە لە یەکدی، ڕۆژێک لە هاوینەوار، پێکڤە بەسەر بەرن.

ڕۆژی پێنج شەممەیان بۆ ئەم کارە هەڵبژارد و سەعات نۆی بەیانی بە سواری گالیسکەیەکی شەش نەفەری گەورەی، چوار ئەسپە بەڕێ کەوتن.

قەرار بوو بڕۆن بۆ سن جرمن، لە کڵاو فەرەنگی هنری چوارەم فراڤین بخۆن. ( کڵاو فەرەنگی: ژوورێکی بازنەیی هەشت گۆشەیە، کە هەرچوار دەوری دەرگا یان پەنجەرەیە و دنیای لێوە دیارە و سەرەکەی کەپر و ساباتە. ) بیل ئامی داوای کردبوو تاقە میوانی پیاویان هەر ئەم بێ، چونکە حەزی لە چارەی مارکی دوکازول نەدەکرد. بەڵام لە کۆتاییدا بڕیاردرا لە ڕێوە کۆنت دولاتور ئیڤلین، لەخەو هەستێنن و دەگەڵ خۆدا بیبەن، ڕۆژی پێشتر ئاگاداریان کردبووەوە.

گالیسکەکە، بە دەم یورغەی ئەسپەکانەوە، شەقامی شانزەلیزەی بڕی و بەناو جەنگەڵ و لێرەواری بولونی دا تێپەڕی.

هەوایەکی هاوینەی دڵگیری هەبوو، زۆر گەرم نەبوو. پەڕەسێلکان بەدەم فڕینەوە ئاسمانی شینیان تەی دەکرد و قەوسێکی گەورەیان چێدەکرد، کە پیاو وای وێنادەکرد، ئەو

قەوسە، دوای ڕۆیشتنی پەڕەسێلکەکانیش هەربە ئاسمانەوە دەمێنێ و دەبینرێت.

ژنەکان لە سەر تەختەکەی دواوەی گالیسکەکە دانیشتبوون، دایکەکە لە ناوەڕاست وکچەکان لەم لا ولەولایەوە. سێ پیاو، پشت لە سەمتی حەرەکەتی گالیسکەکە و ڕوو لە ئافرەتەکان دانیشتبوون، دوو میوانەکە لەم لاو لەولای ڤالترەوە دانیشتبوون.

لە ڕوباری سن تێپەڕین. بە دەوری مون ڤارین دا سوڕانەوە تا گەیشتنە بورژیڤال، ئەوسا بە کەناری ڕوبارەکەدا کەوتنەڕێ تا گەیینە پک.

کۆنت دولاتور ئیڤلین، پیاوێکی ئاقڵ بوو، تەنکە ڕیشێکی بەردابووەوە کە بە سووکترین با دەکەوتە سەما، ئەمە کردبوویە کارێک دوروا بڵێت: " بایەکە یارییەکی جوان بە ڕدێنی دەکات. " ئەو بەنیگایەکی پڕ موحیبەتەوە سەیری ڕوزی دەکرد. مانگێک بوو لێکدی مارە بڕابوون و دەزگیران بوون.

جۆرج، بە ڕەنگ وڕووی هەڵبزرکاوەوە، زۆربەی کات چاوی دەبڕییە سوزان، ئەویش ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. نیگایان لێکدی هەڵدەنگوت، لێکدی حاڵی دەبوون، ژێراوژێر فکریان ئاڵوگۆڕ دەکرد و پاشان لێکدی دەڕەڤین. خانم ڤالتر ئارام و خۆشحاڵ بوو.

نانخواردنی نیوەڕۆیان زۆری خایاند. پێش ئەوەی بۆ پاریس بگەڕێنەوە، جۆرج پێشنیازی کرد لە سەر بەرزاییەکانی دیار دۆڵ و شیوەکە کەمێک پیاسە بکەن.

هەوەڵجار وەستان وتەمەشای دیمەنەکەیان کرد. هەموویان بەڕیز لە پاڵ دیوارەکەدا وەستان ونقومی

تەمەشای ئاسۆ و ئەو دیمەنە بوون کە لەبەر پێیاندا ڕاکشابوو. ڕووباری سین لە پاینی گردێکی بەرزا، وەکو مارێکی گەورە کە بەناو گیادا بخزێت، بەرەولای فرون لاڤیت دادەکشا، لە دەستە ڕاستا، لە تروپکی گردێکدا، جۆگای مارلی، وەکو هەزار پێیەکی گەورە، بەلاقە درێژەکانییەوە، لەژێر ئاسمانی شیندا دەدرەوشایەوەو، خودی باژێرۆکی مارلی لە خوارەوە، لە نێو چڕە دارستانەکەدا لەچاو ون دەبوو.

چەندین گوندەوار لێرەولەوێ، لە دەر ودەشتێکی پان و بەریندا، لەخوارەوە بڵاو بووبوونەوە. گۆلاوەکانی ڤەزینە، لە نێو سەوزەزارەکانی بێشەیەکی بچووکدا بەڕوونی دەبینران. لە سەمتی چەپا، لە دووری دوورەوە، بۆرجی زەنگە نووک تیژەکەی سارتروڤیل دیاربوو کە چووبوو بە ئاسمانا.

ڤالتر گوتی:- لەهیچ جێیەکی دنیادا دیمەنی وا جوان نییە، تەنانەت لە سویسراش دیمەنی وا جوان نییە.

پاشان بەکاوەخۆ کەوتنە پیاسە وڕاوێچکە تا هەم پیاسە بکەن و هەم لەزەتی زیاتر لەم دیمەنە ببینن.

جۆرجُ و سوزان، لەوانی دی دواکەوتن. هەرکە چەند هەنگاوێک لەوانی دی دواکەوتن، جۆرج بە دەنگێکی نەوی و بەخۆشحاڵییەوە بە سوزانی گوت:- سوزان، من دەتپەرستم، ئەوەندەم خۆشدەوێی کە خەریکە ئەقڵم لە دەست دەدەم.

سوزان، لەبن لێوانەوە گوتی:- منیش وەکو تۆم بیل ئامی.

جۆرج دووبارە گوتی:- ئەگەر تۆ شووم پێنەکەیت، سەری خۆم هەڵدەگرم و پاریس و وڵات بەجێدێڵم.

سوزان بەرسڤی دایەوە:- خۆت تاقیبکەوە و بە باوکم بڵێ، کێ دەزانێ لەگینە ڕازی بێت.

جۆرج، بەنیگەرانییەوە گوتی:- نە، فایدەی نییە، بۆ دەیەمین جار دووبارەی دەکەمەوە کە فایدەی نییە. دەرگای ماڵەکەتانم لێدادەخات، لە ڕۆژنامەکە دەرم دەکات، ئەوسا ئێمە ناتوانین یەکدی ببینین. ئەمە ئەو ئەنجامەیە کە دڵنیام گەر بەفەرمی خوازبێنیت بکەم، دێتە ڕێگام. تۆیان بۆ مارکی دوکازول داناوە. چاوەڕوانی ڕەزامەندی تۆن.

سوزان پرسی: - ئەدی تەگبیر؟

جۆرج، کەمێک وەستا، تەمەشایەکی دەوروبەری کرد وگوتی:

- ئەوەندەت خۆش دەوێم کە ئامادەبیت دەست بدەیە کارێکی شێتانە؟

سوزان، بەجدی بەرسڤی دایەوە:- بەڵێ.

- گەورەترین، کاری شێتانە؟

- بەڵێ.

- ئەدی هێندەت جورئەت هەیە کە ڕوو بە ڕووی باب و داکت ببیتەوە؟

- بەڵێ.

- بەڕاستی؟

- بەڵێ.

- زۆرچاکە، ڕێگایەک هەیە، تەنیا یەک ڕێگا! ئەم کارە دەبێ لەلایەن تۆوە ئەنجام بدرێ نەک لەلایەن منەوە. تۆ جگەرگۆشەی ئازیز ودوردانەیانی، هەرشتێ بکەی هیچت پێ ناڵێن، ئەگەر کارێکی سەرکێشانەش بکەی، بەلایانەوە سەیر نابێت. لەبەرئەوە باش گوێبگرە، ئەمشەو کە بۆماڵ

گەڕایتەوە، هەوەڵجار بچۆ بۆلای دایکت، ڕێک و ڕەوان پێی بڵێ کە حەزدەکەیت شوو بە من بکەیت. زۆری پێ ناخۆش دەبێت، بۆڵەبۆڵ دەکات...

سوزان، قسەکەی پێبڕی و گوتی:- باوەڕناکەم، دایکم لە خوای دەوێ.

جۆرج، بەپەلە درێژەی بە گوتەکەی دا:- نا، تۆ ئەو باش ناناسیت. ئەو پتر لە بابت توورە دەبێت و دەیکات بە فەرتەنە. بەخۆت دەبینی چۆن قەبووڵ ناکات. بەڵام دەبێ خۆڕاگر بی، کۆڵنەدەیت، سووربی لە سەر ئەوەی کە ئیلا وبیلا شوو بەمن دەکەیت، تەنیا من، جگە لە من شوو بەکەسی دی ناکەیت. ئەم کارە دەکەیت؟

- ئا، دەیکەم.

- کە لە ژوورەکەی دایکت هاتیتە دەرەوە، دەچێت بۆ ژوورەکەی بابت وهەمان ئەو قسانە لەگەڵ ئەویشدا دەکەیت، بە سەروسیمای زۆر جدییەوە.

- باشە، باشە، دوایی؟

- دوای ئەم قۆناغە مەسەلەکە ئاڵۆز دەبێ. ئەگەر خۆت ڕژد بی، تەواو ڕژد و ئامادە بی کە شوو بەمن بکەی، سوزانی ئازیزی دڵەکەم... هەنگێ دەتفرێنم!

سوزان، لە خۆشیا بە توندی ڕاچڵەکی، تۆزێکی مابوو لە خۆشیا لە چەپڵە بدات.

- ئاە! چەند خۆشە! دەمرفێنی؟ کەی دەمرفێنی؟

هەموو چیرۆک وحیکایەتە ڕۆمانسی و کۆنەکانی ڕفاندن و ڕەدوو خستنی کیژانی گەنج، سواربوونی گالیسکانی پۆستەبەر، مانەوە لە کاروانسەراکانی نێوان ڕێگا، ماجەراو بویەرێن هەیەجان ئەنگێز و ئەفسووناوی ئەم

چیرۆک و سەر بهوردانە لە ناکاوا لەزەینی دا بەرجەستە بوون، وەکو ئەوەی خەونێکی ئەفسووناوی بێ و خەریک بێ بێتەدی. دووبارە گوتی:- کەی دەمرفێنیت؟

جۆرج، بە دەنگێکی زۆر نەوی گوتی:- باشە... ئەمشەو... هەر ئەمشەو.

سوزان، بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:- بۆ کوێ دەڕۆین؟

- ئیدی ئەمە نهێنییە. باش بیر لەوکارە بکەوە کە دەتەوێ بیکەیت. ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت کە دوای ئەم ڕەدوو کەوتنە، ناتوانی جگە لە من شوو بە چ کەسێکی دی بکەیت! ئەمە تاقە چارەیە، بەڵام زۆر... زۆر پڕ مەترسی وبە تالوکەیە... هەڵبەتە بۆ تۆ.

سوزان، گوتی:- من بڕیاری خۆم داوە... لە کوێ تۆ بدینم؟

- دەتوانی بە تاقی تەنیا لە ماڵی خۆتان بێیتە دەرەوە؟

- بەڵێ، دەزانم چۆن دەرگا بچووکەکە بکەمەوە.

- زۆرچاکە، کاتێ دەرگاوانەکە نزیکی نیوەشەو چوو بۆ خەوتن، وەرە بۆ مەیدانی کنکورد. من لەوێ لە ناو گالیسکەیەک لەبەر وەزارەتی دەریاوانی چاوەڕوانتان دەکەم.

- دێم.

- ئەسەح؟

- ئەسەح.

دەستی سوزانی گرت و گوشی:

- کە خۆشم دەوێی، چەند ئازایت، یانی تەواو و ناتەوێ شوو بە ئاغای دوکازول بکەیت؟

- ئاە، نا.

– که سەبارەت بەم مەسەلەیە گوتت نایکەم، بابت زۆر تووڕە بوو؟

– بەڵێ، دەیویست بۆ دێرم ڤڕێبکات.

– دەبینی کە دەبێ بوێر بی و پێداگربی.

– پێداگری دەکەم.

سوزان، بە سەرێکی پڕ لە خەیاڵی فڕاندن و هەڵگرتنەوە، تەمەشای بەرجەوەن و دیمەنەکەی بەردەم خۆی دەکرد. لەوێش دوورتر دەڕوا... دەگەڵ ئەوا!... ڕەدوو دەخرێ، دەدزرێ... بەم بابەتەوە دەنازێ. نە بیری ئابڕووی خۆی دەکردەوەو نە لەو بە دناوی و ناوزڕانەی کە یەخانگیری دەبوو. چما ئەسڵەن ئەو شتانەی بەخەیاڵدا دەهات؟ بیری لەو شتانە دەکردەوە؟

خانم ڤالتر، ئاوڕی لەوان دایەوە و بە دەنگی بەرز گوتی:– بۆ نایەی کیژم. چ دەکەی لەگەڵ بیل ئامی دا؟

پێیان هەڵگرت و خۆیان بەوانی دی گەیاندەوە. هەمووان خەریک بوون باسی مەلەوانیان لە دەریادا دەکرد، کە قەراربوو سبەینێ بۆ ئەوێندەر بڕۆن.

لە گەڕانەوەدا بە ڕێگای شاتۆدا هاتنەوە، بۆ ئەوەی هەمان ڕێگای پێشوو دووبارە تەی نەکەنەوە.

جۆرج، ئیدی قسەی نەدەکرد، بیری دەکردەوە: باشە، ئەگەر ئەم کچۆڵەیە کەمێک زات وەبەر خۆی بنات، سەرەنجام بە ئاوات دەگەم!

سێ دانە هەیڤ بوو، سوزانی غەرقی خۆشەویستییەکی تووش کردبوو. تەفرەی دابوو، خاپاندبووی، دڵی بردبوو. توانی بووی بە تەجرەبەیەک کە هەیبوو، کچە مەفتوونی

خۆی بکات. بە ئاسانی روحی سادەی ئەو کچۆڵەیەی کۆنترۆڵ کردبوو.

یانی لەپێشا واداری کردبوو، لە شووکردن بە ئاغای دوکازول، دوودڵ بێ. نها ڕازی کردبوو کە دەگەڵ ئەمدا بڕەڤێ. چونکە جگە لەم ڕێگەیە، هیچ ڕێگەیەکی دی بۆ وەدەست هێنانی کیژێی، شک نەدەبرد.

خانم ڤالتری باش دەناسی، هەرگیز قاییل نەدەبوو کچەکەی خۆی بەو بدات. هێشتا ئەوی شێتانە خۆش دەویست. هەرچەندە توانی بووی بە جۆرە فەرامۆشکردنێکی حیساب بۆکراو، هەندێک ساردی بکاتەوە وڕامی بکات، بەڵام هەستی دەکرد ئەم عەشقە شێتانەیە و بێ بەرە وەکو خۆرە ناخی ئەو دەخوات. ئەمەشی دەزانی کە هەرگیز ناتوانێ، نۆڕینی ئەو بگۆڕێت و بە هیچ کلۆجێ قاییل نابێت، سوزان شوو بەو بکات.

بەڵام کاتێ کە کیژێی لە دەستیان دەرهێنا و لە شوێنێکی دوورە دەستا شاردییەوە، هەنگێ لە پێگەیەکی بە هێزەوە مامەڵە دەگەڵ بابیا دەکات.

سەرڤاڵی ئەم بیرانە بوو و ئیدی بە وشە و قسەی بێ سەروبەر وەڵامی ئەو قسانەی دەدایەوە کە ئەوان دەگەڵیان دەکرد، چونکە بیری لەلای ئەوان نەبوو. کە گەیینەوە پاریس ئەوسا بڕێک وەخۆهاتەوە.

سوزانیش لە فکران ڕاچووبوو، زەنگوڵەی ئەسپەکانی ژێر گالیسکەکە لە مێشکیا دەزرینگایەوەو، ئەو جادە بێ کۆتاییانەی ژێر تریفەی هەیڤەکەی دێنایە بەرچاوی خۆی، ئەو لێرەوارە تاریکانەی کە بە ناویاندا تێدەپەڕین، کاروانسەراکانی کەنار جادەکە و، پەلەپەلی خزمەتگوزارانی

تەویلەکان، بۆ گۆڕینی ئەسپەکان، هەر هەمووی هێنایە بەرچاوی خۆی.

وەختایەک گالیسکەکە گەییەوە ناو حەوشەکەی خۆیان، ویستیان جۆرج بۆ شێوکردن بێڵنەوە، بەڵام ئەو قەبووڵی نەکرد و بۆماڵەکەی خۆی زڤرییەوە.

پاش ئەوەی خواردنێکی کەمی خوارد، وەک ئەوەی لە سەر سەفەرێکی دوور ودرێژ بێ، دەستی بە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی بەڵگەنامە و ئەوراقەکانی خۆی کرد. نامە خەتەرەکانی سووتاند، هەندێکیانشی شاردنەوە، ئەوسا هەندێ نامەی بۆ چەند دۆستێکی نووسی.

جارجار تەمەشایەکی سەعاتە دیوارییەکەی دەکرد و بەخۆی دەگوت: " دار دەدەم بە ڕوحیانا. " لە هەمان کاتدا، نیگەرانی ڕوحی ئازار دەدا. ئەدی ئەگەر نەخشەکەی سەری نەگرت چ بکات؟ بەڵام لە چ شتێک بترسێت. تاکو نها توانیویەتی بەرەی خۆی لە قوڕاوان دەربکێشێت! بە هەرحاڵ ئەمجارە دەیویست، دەست بداتە قومارێکی گەورە!

نزیکی سەعات یازدە، لە ماڵ چووە دەرەوە، کەمێک بە کۆڵانەکاندا سووڕایەوە، ئەوسا گالیسکەیەکی بەکرێ گرت وڕۆیی بۆ مەیدانی کنکورد، لە بەر محەجەرەکانی وەزارەتی دەریاوانیدا ڕاوەستا. جارجار تەڵە شقارتەیەکی دادەگیرساند تا تەمەشای سەعاتەکەی بکات. کەبینی نزیکی نیوەشەوە، لە ڕادەبەدەر نیگەران و ناڕەحەت بوو. هەرساناساتێ لە دەریچەی گالسیکەکەوە سەری دەبردە دەرێ وتەمەشای دەوروبەری دەکرد.

سەعاتێک لە دووری دوورەوە دوازدە زەنگی لێدا، پاشان یەکێکی نزیکتر، پاشان دوانی دی پێکەوە، کەمێ

دوورتر، دوایی یەکێکی دی زۆر لە دوورتر. وەختایەک دەنگی دوازدە زەنگەکانی سەعاتەکە خامۆش بوو، جۆرج بەخۆی گوت: " مەسەلەکە تەواو. موەفەق نەبووم. سوزان نایەت."

وێڕای ئەمەش مکووڕ بوو لە سەر ئەوەی ئەگەر تا بەیانیش بووە هەرلەوێ چاوەڕوان بکات. پیاو دەبێ لەم حاڵ و بارانەدا بەسەبر وحەوسەڵە بێ.

دوای کەمێک دەنگی زەنگێکی هاتەگوێ کە چارەکە سەعاتی ڕادەگەیاند، پاشان نیو سەعات، پاشان سێ چارەکە سەعات و سەرەنجام هەموو سەعاتەکان، وەکو کەڕەتی پێشوو سەعات یەکیان ڕاگەیاند. ئیدی بە ئومێدی هیچ نەما، مابووەوە و هەوڵیدەدا، بزانێ ئاخۆ چ بویەرێک ڕوویداوە. لە ناکاوا سەری ژنێک لە هەنبەر دەریچەی گالیسکەکەدا بە دیارکەوت و پرسی:- لێرەی بیل ئامی؟

جۆرج، لە جێی خۆی ڕاپەڕی و هەناسەی سواربوو:- تۆی، سوزان؟

- بەڵێ، خۆمم.

بە هەشتاو کەوتە گەڕان بە دوای دەسکی دەرگای گالیسکەکەدا و لە پەشۆکاویدا بۆی نەدەدۆزرایەوەو لێکدا لێکدا دەیگوت:- ئاە تۆیی... تۆیی... وەرە ژوورەوە.

سوزان، سواری گالیسکەکە بوو و خۆی لە باوەشی ئەو هاوێشت.. جۆرج، هاواری لە گالیسکە چییەکە کرد و گوتی: " بکەوەڕێ. " و گالیسکەکە جما.

سوزان، هانکەهانکی پێکەوتبوو، نەیدەتوانی هیچ بڵێت.

جۆرج پرسی:- کوا بۆم باس بکە چی ڕوویدا؟

- جا چی ڕووینەدا، بە تایبەتی وەختێ بەدایکمم گوت.

جۆرج، لە نیگەرانیدا دەلەرزی:- دایکت؟ چی گوت؟ کوا زوو بۆم باسبکە.

- زۆر ترسناک بوو. چووم بۆ ژوورەکەی، ئەو قسانەم پێگوت کە پێشتر ئامادەم کردبوون، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، ئەوسا هاواریکرد: " شتی وا نەبووە و نابێ! " من گریام، تووڕە بووم، سوێندم خوارد کە جگە لە تۆ شوو بە چ کەسێکی دی ناکەم. وام وێنا دەکرد هەر هەستێ و بکەوێتە وێزەم. وەکو شێتی لێهاتبوو، پێی گوتم لە بەیانییەوە بۆ دێرت ڤرێدەکەم. هەرگیز بەو حاڵەوم نەبینی بوو، هەرگیز! هەنگێ باوکم کە لە هات وهاواری ئەو نیگەران بوو بوو هات بۆلامان. ئەو بە ئەندازەی دایکە تووڕە نەبوو، بەڵام پێی گوتم کە تۆ شایستەی من نیت.

منیش کە لێیان تووڕە بوو بووم، لەوان زیاتر هاوارم بە سەرا کردن. هەنگێ بابم بە سەر وسیمایەکی خەمناکەوە، کە بە هیچ جۆرێ لەو نەدەهات، پێی گوتم کە لە ژوورەکە وەدەر بکەوم. ئیدی ئەم قسەیە بووە بایسی ئەوەی لە گەڵ تۆدا بڕەڤم. ئەوەتا هاتووم. بۆکوێ دەڕۆین؟

جۆرج، بە میهرەبانی دەستی لە قەدی سوزان هاڵاندبوو و بە دڵە خورپەوە گوێی لە قسەکانی دەگرت و کینە و نەفرەتێکی توونی سەبارەت بەم بەشەرانە سەراپای تەنی بوو. بەڵام ئەو تازە چنگی لە کچەکەیان گیر بووبوو. ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو، داشی خۆی سوار بکات و پێیان نیشان بدات کە چ لێزانێکە.

بە سوزانی گوت:- ئێستا بۆ سواربوونی قیتار زۆر درەنگە. بە گالیسکە دەڕۆین بۆ سیڤەر و شەو لەوێندەر

دەبەینە سەر. سبەی بەیانی دەڕۆین بۆ لاروش گویون. گوندێکی جوانە لە کەناری سن، لە نێوان مانیت و بۆنییرە.

کیژێ لەبن لێوانەوە گوتی:- من هیچم لە گەڵ خۆدا نەهێناوە، هیچم پێ نییە.

جۆرج، بە بێ خەمی بزەیەکی کرد وگوتی:- قەیدی نییە، لەوێ تەرتیبی دەکەین.

گالێسکەکە بە جادەکاندا دەڕۆیی. جۆرج دەستی کچۆڵەکەی گرت و بەنەرمی و بەرێزەوە ماچی کرد. چونکە باوەڕی بە ڤیانی ئەفلاتوونی نەبوو، نەیدەزانی چی پێ بڵێت. لێ لە ناکاوا هەستیکرد سوزان خەریکە دەگری.

بە ترسەوە پرسی:- چییە دەلالی من؟

سوزان بە دەنگێکی گریاناویەوە گوتی:- دایکە بێنەواکەم ئەگەر بزانێ من ڕەدوو کەوتووم، ئەمشەو خەوی لێناکەوێ.

بەڕاستیش دایکی نەخەوتبوو.

دوای ئەوەی سوزان لە ژوورەکە وەدەرکەوتبوو، ڕوو بە ڕووی مێردەکەی دانیشتبوو بە داماوی و پەرێشانی پرسی:- خودا گیان، مەبەستی لەو قسانە چی بوو؟ ئەو قسانە چییان دەگەیاند؟

ڤالتر، بە تووڕەیی هاواریکرد:

- چییان دەگەیاند؟ ئەمەیان دەگەیاند کە ئەم پیاوە ساختەچییە ئەوی مەفتوون و بەندیواری خۆی کردووە. هەر ئەوە بوو کە بووە بایسی ئەوەی سوزان، لە دوکازول ژیوان ببێتەوە. چاوی تەماحی بڕیوەتە جیازییەکەی.

بەوپەڕی تووڕەیی کەوتە ڕاوێچکە و دووبارە گوتی:

- تۆ هەمیشە ئەوت دەکێشایە ئێرە، بەشان وباڵیتا هەڵدەگوت، مدارات دەکرد، نازیت دەکێشا. لە بەیانییەوە تا

شەوێ، وێردی زمانت هەر بیل ئامی بوو. ئەمەش یاداشتەکەت.

خانم ڤالتر، بە ڕەنگی زەردەوە، لە بن لێوانەوە گوتی:- من؟... من ئەوم دەکێشایە ئێرە!

ڤالتر، بۆلاندی بەسەریا:- بەڵێ تۆ! هەمووتان کوشتەی ئەون، خانم دوماریل، سوزان و هەموو ژنەکانی دی. تەسەور دەکەی من نەمدەزانی کە تۆ بۆچی دوو ڕۆژ بەبێ هاتنی ئەو بۆئێرە نەتدەتوانی هەڵبکەی؟

خانم ڤالتر، بە سەروسیمایەکی کارەساتبارەوە هەستا و وەستا:

- قەبووڵ ناکەم بەو زمانە قسەم لە گەڵدا بکەی، من وەکو تۆ لە دەکەیەکی گەورەدا پەروەردە نەبووم.

ڤالتر، بۆ دەمێک گێژ وویژ بوو، پاشان بە ئەسپایی گوتی: " شەیتان بە نەحلەت بێ ها. " و لە ژوورەکە وەدەرکەوت و دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە دا بە یەکا.

خانم ڤالتر، هەرکە بە تەنیا مایەوە، بە شێوەیەکی سروشتی بەرەولای ئاوێنەکە ڕۆیی تا بزانێ ڕوخساری نەگۆڕاوە، چونکە ئەم بەڵایەی بە سەر هاتبوو، زۆر قورس و ناخۆش بوو. سوزان عاشقی بیل ئامی بووبوو و بیل ئامی دەیویست زەماوەند دەگەڵ سوزاندا بکات! نە، ئەو بەهەڵە ئەو قسەیەی بیستبوو، ئەم بابەتە ئەسڵ و ئەساسی نەبوو، درۆ بوو،کیژێ بە هەڵە فریوی ئەم گەنجە قۆزەی خوارد بوو، هەڵبەتە ئاسایی بوو، کە حەزی کردبوو شوو بەو بکات، یەکێک بوو لەو سەرکێشیانەی کە کیژۆلان دەیکەن! بەڵام جۆرج نەدەبوو ئەم کارە بکات. حایر و حەپەساو، وەکو چۆن بە شەر ڕوو بەڕووی کارەساتێکی

گەورە دەبێتەوە، بەو ئاوایە لە فکران ڕاچوو. نا، بێگومان بیل ئامی ئاگای لەم سەرکێشیە منداڵانەیەی سوزان نییە.

مودەتێکی زۆر بیری لە ڕیاکاری و دوو ڕوویی، یان بێگوناحی ئیحتیمالی جۆرج کردەوە. ئەگەر خۆی ئەم پیلانەی دانابێ، مانای وایە بەشەرێکی زۆر بۆدەڵە وخوێڕییە. چ پێشهاتێک ڕوو دەدات؟ چ عەزاب و ڕەنجێکیان دێتەڕێ.

ئەگەر جۆرج، ئاگای لە هیچ شتێک نەبوایە، دەکرا هەموو شتێک سڕپۆ و پینە بکرابایە، سوزان بە سەفەرێکی شەش مانگە دەبەن و هەموو شتێک کۆتایی دێت و دەبڕێتەوە. بەڵام خۆی چۆن دەتوانێ جارێکی دیکە جۆرج ببینێتەوە؟ هێشتا هەر عاشقی ئەو بوو. ئەم عەشقە سەوداییە وەکو نووکی ڕمێک لە ناخی ڕۆچووبوو و بە هیچ شێوەیەک دەرنەدەهاتەوە. بەبێ ئەو نەدەژیا، بۆیە مردنی پێ لە ژیان باشتر بوو.

لە نێوان ئەم نیگەرانی و دوودڵیانەدا سەرگەردان بوو. سەری هاتەژان، بیر وهزرینی لە کێشا نەبوو، زۆری ئازار دەدا. هێندە بیری لە چارە کردبۆوەو نەیدۆزی بووبووەوە، ئیدی شەڕی بەخۆی دەفرۆشت. تەمەشایەکی سەعاتەکەی ژوورەکەی خۆی کرد، سەعاتێک پتر لە نیوەشەو بووری بوو. بەخۆی گوت:

" ناتوانم بەم حاڵەوە هەڵکەم دەنا دین وهار دەبم. دەبێ هەموو شتێک لە بنج وبناوان بکەم. هەنووکە دەچم سوزان بێدار دەکەمەوە، تا ڕاستی مەسەلەکە لە زمانی خۆیەوە بژنەوم. "

به پێی پەتی، بۆئەوەی هەراوهەنگامە نەنێتەوە، مۆمێکی داگیرساوی بەدەستەوە گرت و بۆ ژووری کیژەکەی ڕۆیی. دەرگاکەی زۆر بە هێواشی کردەوە، وەژوورکەوت و تەمەشایەکی تەختەخەوەکەی کرد. تەختەخەوەکە تێک نەچووبوو، هەوەڵجار هەستی بە هیچ نەکرد. وای خەیاڵکرد کیژێ ڕەنگە چووبێ لە گەڵ بابیا گەنگەشە بکات، لێ لە ناکاوا بەدگومانییەکی ترسناک سەراپای داگرت و بە هەشتاو بۆ ژووری مێردەکەی ڕۆیی. ڕەنگ زەرد و لێوبەبار و هەناسەسوار خۆی بە ژوورا کرد. ڤالتر، بەدەم پاڵکەوتنەوە خەریکی خوێندنەوەو موتاڵا بوو. کە چاوی بە ژنەکەی کەوت، بە نیگەرانییەوە پرسی:- ها! چی بووە؟ چ بەڵایەکت بەسەر هاتووە؟

ژنەی تاین بە دەمەلاڵکێوە گوتی:- سوزانت نەدیوە؟

- نا، بۆ؟

- ئەو... ئەو... لە ژوورەکەی خۆیدا نییە.

ڤالتر، بە تەکانێ لە ناو جێگاکەی دەرپەڕی، نەعلەکانی لەپێ کرد و هەر بەجلکی خەوەوە بە هەشتاو بەرەو ژووری کچەکەی ڕۆیی.

کە ژوورەکە و تەختەخەوەکەی بە دەقی خۆیەوە بینی، دڵنیابوو کە کیژەکەی ڕەڤی بوو.

خۆی بە سەر کورسییەکدا دا و ئەو چرایەی کە بە دەستیەوە بوو، لە بەرپێی خۆیدا و لە سەر ئەرزەکە داینا.

ژنەکەی هات و بە دەمە لاڵکێوە گوتی:- ئێ چ بکەین؟

ڤالتر، توانای قسەکردنی نەبوو. ئیدی تووڕە نەبوو، بەدەمناڵەوە گوتی:- کار لە کار ترازاوە، ئیدی ئەو

ڕفاندوویەتی، لەچنگی ئەودایە. دەستی خۆی لێمان وەشاندووە.

خانم ڤالتر سەری لە هیچ دەرنەدەکرد، پرسی:- یانی چی دەستی خۆی وەشاندووە؟

- یانی، نها ناچارین، بە زەماوەندی وان قایيل ببین.

ژنەکەی بە دەم هاوارێکی هۆڤیانەوە گوتی:- لەگەڵ ئەوا؟ هەرگیز! شێت بوویت؟

ڤالتر، بەخەمینی گوتی:- هات وهاوار فایدەی نییە. کیژەکەمانی ڕەدوو خستووەو ئابڕووی بردووەو باشترین کار ئەوەیە کە سوزانی بدەینێ. ئەگەر ئاقڵانە ڕەفتار بکەین، کەس بەم کارەساتە نازانێت.

خانم ڤالتر کە لە داخ و کەسەراندا دەلەرزی دووبارەی کردەوە:- هەرگیز، هەرگیز نابێ بە هی ئەو، من هەرگیز قاییل نابم.

ڤالتر، بە داماوی گوتی:- بەڵام حاڵی حازر هی ئەوە، لە دەستی ئەودایە. تا ئێمە مل نەدەین، لە لای خۆی گلی دەداتەوە، دەیشارێتەوە. جا بۆ ئەوەی ئابڕوومان نەچێت، باشترین شت ئەوەیە تا زووە، ڕادەستی داواکانی ببین.

ژنەکەی کە بەدەم ئازارێکی پەنهانەوە دەتلایەوە، لێکدا لێکدا دەیگوت:- نە، نە، من هەرگیز قاییل نابم.

ڤالتر، بەنیگەرانی دووبارە گوتی:- ئەم بابەتە هی باس و گەنگەشە نییە، ناچارین مل بۆ داواکانی بدەین. ئاخ، شیر حەرام! خوێڕییە چاک کڵاوی کردە سەرمان... بە ڕاستی دەستی خۆی وەشاند. دەمانتوانی خەڵکانی زۆر باشتر پەیدا بکەین، بەڵام نەک بە هەمان زیرەکی و دووربینی ئەو، ئایندە

بۆ ئەم کابرایەیە، ئەمە ڕۆژەکەیە، من مردوو و تۆ زندوو، ڕۆژێ دێ دەبێ بە پەرلەمانتار و وەزیر.

خانم ڤالتر، بە توانایەکی هۆشیانەوە گوتی:- هەرگیز نایەڵم دەگەڵ سوزاندا زەماوەند بکات... تێدەگەی... هەرگیز!

ئاغای ڤالتر کە توورە بووبوو، ناچاربوو وەکو بزنس مان، سەرەنجام تای بیل ئامی بگرێت.

- بێدەنگ دەبی یان نا... دووبارەی دەکەمەوە کە دەبێ ئەم کارە بکەین، ناچارین. کێ چووزانێ، ڕەنگە لەم کارە ژیوان نەبینەوە. پیاو لە گەڵ ئەم جۆرە خەڵکانەدا ناتوانێ پێشبینی ئەوەبکات کە چ بویەرێک ڕوو دەدات. بە چاوی خۆت نەتبینی چۆن بە سێ گوتار، ئەم لاروش ماتیۆ کەرەی لە سەر تەختی وەزارەت هێنایە خوارەوە، بە چ زیرەکییەک ئەم کارەی کرد، کارێک کە بۆ ئەو وەکو مێردێکی خیانەت لێکراو، زۆر زەحمەت بوو. بە هەرحاڵ، مەسەلەکە ئەوەیە کە دەست و پێی بەستووینەتەوەو، ئیدی ناتوانین خۆمان دەرباز بکەین.

خانم ڤالتر، دەیویست هاوار بکات، لە عاریدا بتلێتەوە، قژی خۆی بڕنێتەوە. بە دەنگێکی توورە ولە هەمان کاتدا نائومێدەوە هەمدیس دووبارەی کردەوە:- نابێ بە هی ئەو... من ڕازی نابم.

ڤالتر هەستا، چراکەی هەڵگرت و گوتی:

- تۆ وەکو هەموو ژنان سائەقڵی، هەمیشە بە سۆزەوە کار دەکەن. ناتوانن خۆتان دەگەڵ هەڵوێستەکاندا بگونجێنن... هەر هەمووتان گەوجن. من دەڵێم کە ئەو دەگەڵ سۆزاندا زەماوەند دەکات... ناچارین ڕازی بین.

به پێ خشکێ لە ژوورەکە وەدەرکەوت. بە بیجامەکەیەوە، وەکو تاپۆیەکی کۆمیدی بە ڕاڕەو وهۆڵە بەردینەکەی خانووە گەورە و کپ و خامۆشەکەیدا تێپەڕی و بە بێدەنگی خۆی بە ژوورەکەیدا کرد.

خانم ڤالتر، بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە، لە توانا بەدەر، هەر لەوێ وەستابوو، هێشتا نەیدەزانی بە وردی چی ڕوویداوە. تەنیا ئازاری دەچەشت. هەستیکرد ناتوانێ تابەیانی، بەو دەقەوە، بەبێ جووڵە لەوێندەر بوەستێت، پێویستی بە هەڵاتن، بە ڕاکردن، بە کۆمەک هەبوو.

لە خەیاڵی ئەوەدا بوو کە هاوار بۆ کێ بەرێ، کێ دەتوانێ بە هاوارییەوە بێ، کام پیاو. بیری بۆ کەس نەدەچوو! هاوار بۆ قەشەیەک بەرێ، بەڵێ قەشەیەک! دەیتوانی خۆی باوێتە سەر پێی ئەو و دان بەهەموو شتێکا بنێت، دان بە هەڵە و نائومێدییەکانیا بنێت. کەشیشەکە لەوە تێدەگات کە ئەم جۆرجە خوێڕییە ناتوانێ زەماوەند دەگەڵ سوزان دا بکات و ئەو لەم کارە ژیوان دەکاتەوە.

دەبوا بە زووترین کات قەشەیەک بدۆزێتەوە! بەڵام لە کوێی بدۆزێتەوە؟ دەیتوانی بۆ کوێ بڕوات؟ وێڕای ئەمەش نەیدەتوانی بەم حاڵەوە بمێنێتەوە.

هەنگێ وێنە ئارام و بە ویقارەکەی مەسیح، بە دەم ڕێکردنەوە بە سەر شەپۆلانی دەریاوە، لە ناکاوا وەکو ئەوەی لە غەیبەوە پەیدا بووبێ، هاتە بەرچاوی. مەسیحی بەهەمان ڕوونی ناو تابلۆکە. کەواتە مەسیح بانگی دەکرد. پێی دەگوت: " وەرە بۆلای من. لە بەردەم منا چۆک دابدە. دڵخۆشیت دەدەمەوە و ئیلهامی ئەوەت پێدەبەخشم کە دەبێ چ بکەی. "

مۆمە داگیرساوەکەی هەڵگرت، لە ژوورەکە هاتە دەرەوە، بە پلیکانەکاندا داگەڕا تا گەییە گوڵخانەکە. تابلۆکە لەوسەری گوڵخانەکە، لە ناو هۆڵێکی چکۆلە دانرابوو. هەمیشە دەرگا شووشەییەکەی هۆڵەکەیان دادەخست تا نم وشێی گوڵخانەکە، وێنەکە خراپ نەکات. هۆڵە چکۆلەکە و تابلۆکەی ناوی، وەکو نوێژخانەیەکی ناو لێرەوارێکی چڕە دارستانی سەیر و دەگمەنی لێهاتبوو. کاتێ خانم ڤالتر خۆی بە گوڵخانەکەدا کرد، چونکە هەمیشە ئەوێندەری بە ڕوناکی بینی بوو، لە هەنبەر تاریکیە قووڵەکەی ئەوێدا لەجێی خۆی چەقی. چڕە درەختانی گەرمەسێری، بە هەناسەی نمساری خۆیان، هەوای گوڵخانەکەیان قورس کردبوو. چونکە هەموو دەرگاکان داخرابوون، هەوای ئەم بێشە سیحراوییە، کە لە ژێر گومەزە شووشەییەکەی گوڵخانەکەدا پەنگابووەوە، زۆر بە زەحمەت دەچووە سییەوە، بەشەری گێژ و سەرمەست دەکرد، هەم لەزەتی پێدەبەخشی و هەم ناڕەحەتی دەکرد، هەستێکی تێکەڵ و پێکەڵ و گۆنگی لە لەزەتی جەستەیی هەیەجان ئەنگێزولە مەرگ بە بەدەن دەبەخشی. ژنەی بێنەوا، بە ئارامی دەجولا، کەوتبووە ژێر باندۆری قووڵی دەوروبەرەوە، ئەو درەخت و ڕووەکە سەیرانەی کە لە بەر ڕۆشنایی لەرزۆک و بزۆزی مۆمەکەدا بەدیار دەکەوتن، حاڵەت و قەلافەتی دێوانیان هەبوو، لە شێوەی تارمایی و شەبەنگاندا یان دیاردەی نامۆ و عەجیب وغەریبا دەهاتنە بەرچاوی.

لە ناکاوا چاوی بە وێنەکەی مەسیح کەوت. ئەو دەرگای بەینی خۆی و تابلۆکەی کردەوەو لە ناو هۆڵە چکۆلەکەدا و لە بەردەم تابلۆکەدا چۆکی دادا.

سەرەتا بە سەرگەردانی و پەرێشانی کەوتە دوعا ونزا، بە پچڕپچڕی ڕیزێک وشەی عاشقانەی گوت، بەجۆش و خرۆش و نائومێدییەوە داوای کۆمەکی کرد. ئەوسا جۆش و خرۆشی پاڕانەوە ودوعا و نزاکەی دامرکایەوە، سەری بەرەو ڕوخساری وێنەکە بەرز کردەوە و، بە دەم نیگەرانییەکی توندەوە، بەهەمان دەقەوە مایەوە. ڕوخسار وچارەی مەسیح لە بەر ڕۆشنایی لەرزۆکی مۆمەکەدا، کە زۆر کەم و لە پایینەوە ڕوناکی دەخستە سەری، هێندە لە بیل ئامی دەچوو، کە ئیدی وێنەی ناو تابلۆکە مەسیح نەبوو، بەڵکو عاشقەکەی بوو کە سەیری ئەو دەکرد. هەمان چاوان بوو، هەمان تەوێڵ، هەمان ڕوخسار و هەمان نیگای سارد و مەغرووورانەی جۆرج بوو.

بە پچڕپچڕی گوتی: " مەسیح! مەسیح! مەسیح! " بەڵام وشەی جۆرجی دەهاتە سەرزار. لە ناکاوا بیری لەوە کردەوە کە لەگینە لەو ساتەدا جۆرج، خەریکی سواربوونی کچەکەی بێ. لە شوێنێکا، لە ژوورێکا، بە تەنیا دەگەڵ کچەکەیدا بێ. ئەو! ئەو لە گەڵ سوزاندا.

هەمدیس، لە ژێر لێوانەوە دووبارەی دەکردەوە: " مەسیح! مەسیح! " بەڵام بیری لەو دووانە دەکردەوە... لە کچەکەی، لە عاشقەکەی خۆی! لە ژوورێکا، بە تەنیا بوون... و شەو بوو. ئەوانی لەبەردەم خۆیدا دەبینی. هێندە بە ڕوونی دەیبینین، کەوای وێنا دەکرد لە جیاتی تابلۆکە ئەوان لەبەردەمیا وەستاون، بەدەم یەکەوە پێدەکەنن، یەکدی ڕادەمووسن. ژوورەکە تاریک بوو، پەتۆکان خرابوونە لاوە. لە جێی خۆی هەستا کە بۆلای ئەوان بڕوات، بڕوات و لە قژی کچەکەی بنەوێ و لە هەمێزی عاشقەکەی خۆی

دەربێنێت. دەیویست دەست بخاتە بینی کچەکەی، خەفەی بکات، کیژێ کە لێی بێزار بوو، کیژێ کە خۆی ڕادەستی ئەم پیاوە دەکرد. دەستی بۆ برد... دەستەکانی بەر تابلۆکە کەوتن و سەری بەر پلیکانەکانی مەسیحی ناو تابلۆکە کەوت.

هاوارێکی بەرزی کرد و بە پشتا کەوتە سەر زەوی. مۆمەکە لە دەستی بەربووەوە وکوژایەوە.

پاشان چی ڕوویدا؟ ماوەیەکی زۆر، هەندێک شتێن عەجیبی لە دنیای خەون و خەیاڵدا بینی. هەمدیس جۆرج و سوزان هاتنەوە بەرچاوی، بە بەردەمیا ڕەت دەبوون، بەباوەشی یەکەوە، هاوڕێ دەگەڵ عیسا مەسیحدا، کە موبارەک بایی عەشقە نەفرەت ئەنگێزەکەیانی لێدەکردن

بە شێوەیەکی خەیالاوی وگۆنگ وای هەستدەکرد لە ماڵەکەی خۆیدا نییە. دەیویست هەستێ، هەڵێت، لێ نەیدەتوانی. سەراپای سڕ بووبوو، قەڵەمی دەست وپێی شکابوو، تەنیا زەینی بێدارو بەخەبەر بوو، زەینێک کە لە هەمان کاتدا پەشێو بوو، کە وێنەێن ترسناک، خەیاڵی و ناواقیعی ئازاریان دەدا. بیرەکانی لە دنیای کابوسێن نا ئاسایی، سەیر وهەندێجار کوشندەدا سەرگەردان بوو، هزر و بیرانێک کە ڕووەک و گیای خەوهێنەری دیار و دەڤەرێن گەرمەسێر، بە شێوەێن عەجیب و بوونە قورسەکانیانەوە، لە مێشکی بەشەریدا دروست دەکەن.

کە ڕۆژ بووەوە، کارەکەرەکان، خانم ڤالتریان بە بێهۆشی و بە نیمچە مردوویی، لەسەر ئەرزەکە ولە پای تابلۆکەدا، تابلۆی مەسیح بەدەم ڕێکردنەوە بەسەر ئاوەوە، دۆزییەوە. ئەوەندە حاڵی شڕ بوو کە هەمووان دەترسان

نەبا بمریت. ڕۆژی دووەم وەخۆ هاتەوەو دەستی بەگریان کرد.

سەبارەت بە دیار نەمانی سوزان، بە کارەکەرەکانیان گوت کە لە ناکاوا بۆ دێر ڤرێکراوە و، ئاغای ڤالترش لە وەڵامی نامەیەکی دوورودرێژا کە لە دورواوە پێی گەیی بوو، ڕەزامەندی خۆی سەبارەت بە شووکردنی کیژەکەی بەو، دەربڕی.

بیل ئامی، هەمان شەوی ڕەڤینەکەیان لە پاریس ئەم نامەیەی، کە پێشتر حازری کردبوو، خستبووە پۆستەوە. لەم نامەیەدا، بەڕێزەوە گوتبووی کە لە مێژ بوو کیژەکەیانی خۆش دەویست، بەڵام هیچ قەول و قەرارێکی پێشوەختەیان لە بەینا نەبووبوو، بەڵام کە بینی کیژێ بە حوسن و ڕەزای خۆی هاتووە بۆلای ئەم تا بێژێ: " دەمەوێ ببمە ژنی تۆ." بەم ئەنجامگیرییە گەیی کە بۆی هەیە کیژێ لای خۆی گل بداتەوە، تەنانەت بشی شارێتەوە، تا ئەو کاتەی وەڵامی داک و بابی کیژێی پێدەگات، چونکە ڕەزامەندی دایک و باوکی کیژەی گەنج بۆ ئەو و لە لای ئەو، لە ڕەزامەندی خودی کیژەکە، گرینگتر و فەرزترە.

داوای لە جەنابی ڤالتر کردبوو، وەڵامەکەی بە ئەدرەسی پۆستەخانەدا بۆ ڤرێبکات، تا یەکێک لە دۆستەکانی بیگەیەنێتە دەستی ئەو.

وەختایەک بە مرازی خۆی گەیی، سوزانی بۆ پاریس گەڕانەوە، ناردییەوە بۆلای باوک و دایکی و بەخۆیشی ماوەیەک خۆی دەرنەخست. شەش ڕۆژیان لە کەناری ڕوباری سین دا و لە گوندی لاروش گویون، بە یەکەوە بەسەر بردبوو. سوزان، تا نها، قەت ئەوەندەی کەیف

نەکردبوو و بەم ئەندازەیەی لێخۆش نەگوزەرابوو. وەکو کیژە گوندییەک ڕەفتاری کردبوو. چونکە جۆرج، ئەوی بە کاروانسەراچییەکە و باقی خەڵکی خوشکەکەی ناساندبوو، ئیدی ژیانێکی شاد، ڕاستگۆیانە وئازادانەی بەسەر بردبوو و هیچ هەڵەیەکیان نەکردبوو، جۆرە ڕەفاقەتێکی عاشقانەیان لە نێوان چێ بووبوو.

جۆرج وای پێ باش بووبوو کە بە حورمەتەوە ڕەفتاری دەگەڵ بکات و ڕێز و قەدری بگرێت. هەرکە گەیی بوونە ئەوێندەر، سوزان، برێک جلی ژێر و سەرەوەی ژنانی گوندی لە گەڵ کڵاوێکی حەسیری ڕازاوە بەگوڵێن سەحرایی کڕی. ژینگەی گوند و ژیانی ناو گوندی زۆر لێخۆش هاتبوو. لەوێندەر بورجێکی کۆن و کۆشکێکی زەمان و سەردەمانی زۆر کۆن هەبوو، لەوێ مافووری دیواری جوانیان نیشاندابوون.

جۆرج، باڵاپۆشێکی درێژی لە فرۆشیارێکی ئەوێندەر کڕی وسوزانی هەندێجار بە پێیان لە کەناری ڕوبارەکە و هەندێجار بەسواری بەلەم، بەم لاو بەولادا دەگێڕا. هەرتاو ناتاوێ، بەجۆش و خرۆشەوە یەکدییان ڕادەمووسی، سوزان، بێ گوناهانە و جۆرج ئامادەی ڕادەست بوون بە هەوەس. بەڵام دەیزانی چۆن جڵەوی خۆی بگرێت. وەختێ بە سوزانی گوت: " سبەی بۆ پاریس دەگەڕێینەوە، چونکە بابت لە سەر زەماوەندی مە ڕازی بووە. " سوزان، زۆر بە دڵسافییەوە گوتی: " من ئەم چەند ڕۆژەش هەر تۆم بە مێردی خۆم دەزانی و زۆر خۆشم لێگوزەرا! "

( ١٠ )

له ئاپارتمانەکەی کوچەی کونستانتینوپل دا، هەموو شوێنێک هەر تاریک بوو، چونکە جۆرج دوروا و کلوتیلد دوماریل کە بەرێکەوت یەکیان لەبەر دەرگا بینی بوو، لە ناکاوا خۆیان بە ژووردا کردبوو وهێشتا فریا نەکەوتبوون پەردەکان لابەرن. کلوتیلد گوتی:- چییە دەتەوێ سوزان ڤالتر بخوازی؟

جۆرج، بە نەرمی قسەکەی ئەوی سەلماند و گوتی:- چما نەتدەزانی؟

کلوتیلد، تووڕە ونیگەران لە بەردەمیا وەستا و گوتی:

- تۆ دەتەوێ لە گەڵ سوزان ڤالتر دا زەماوەند بکەی، بەڕاستتە! سێ دانە مانگە من دەخاپێنی و ئەم بابەتە لە من دەشاریتەوە. هەمووان ئەم مەسەلەیە دەزانن، تەنیا من نەبێ. مێردەکەم ئەمەی پێگوتم.

جۆرج، کە کەمێک قەڵس بوو، دەستی بە قەشمەری بازی کرد، ئەوسا کڵاوەکەی لە گۆشەیەکی سەر سۆپاکە دانا و لە سەر کورسییەک دانیشت.

کلوتیلد، کە چاوی لە دوڕ چاوی ئەو بڕی بوو، بە دەنگێکی نەوی و ڕاوێژێکی تووڕە گوتی:

- لەوساوە کە ژنەکەت تەڵاق داوە، زەمینەت بۆ ئەم حیلە و حەواڵەیە خۆش دەکرد و زۆریش نەجیبانە، منت وەکو ماشقەی خۆت ڕادەگرت، تا وەکو تا ئەوکاتە باوەشت چۆڵ نەبێ، چەند بەشەرێکی خوێڕیت!

جۆرج گوتی:- چی بووە؟ خۆ قیامەت ڕانەبووە، ژنێکم هەبوو بە خیانەتەوە گرتم و تەڵاقم دا، نها دەمەوێ ژنێکی دیکە بێنم. ئەمە هیچی تیایە؟

کلوتیلد، که سەراپای دەلەرزی، لەبن لێوانەوە گوتی:- تەحا کە بەشەرێکی فێڵبازی ترسناکی!

جۆرج، بزەیەکی کرد و گوتی:- بە تەمای چیت! خەڵکی کەودەن و ساکار هەمیشە فریو دەخۆن!

لێ کلوتیلد، ڕژد بوو لە سەر بۆچوونەکەی خۆی:

- دەبوایە لە هەوەڵەوە بمزانیبا چتۆ بەشەرێکی، قەت باوەڕم نەدەکرد، ئەوەندە بودەڵە بی.

جۆرج، بە ڕواڵەتێکی پڕ ویقارەوە گوتی:- تکا دەکەم، ئاگات لە دەمت بێ.

کلوتیلد، لە هەنبەر ئەم هەڵوێستەی ئەو، هەڵچوو:

- چی؟ نها دەتەوێ جلکی فەرمی تەواو لەبەر بکەم ئەوسا قسەت لەگەڵدا بکەم؟ نۆبەتی ئەم قەوانەیە! لەوەتای تۆم ناسیوە، وەکو کەسێکی بێ سەر وبەر، وەکو گەدایەک ڕەفتارت لە گەڵ مندا کردووە و، بەتەمای ئەم قسانەت لە گەڵدا نەکەم؟ تۆ کڵاو لە سەری هەمووان دەنەیت، پارە لە هەمووان دەکێشیتەوە، هەمیشە لە دووی ڕابواردن و پارە پەیدا کردنیت و، هێشتا بەتەمای وەکو پیاوێکی نەجیب و ئابڕوومەند ڕەفتارت دەگەڵدا بکەم!

جۆرج، هەستایە سەرپێیان، بەدەم لێوە لەرزێوە گوتی:- یا بێدەنگ بە یان لێرەت دەکەمە دەرەوە.

کلوتیلد، بەلێوە لەرزێوە گوتی:- فڕێم دەدەیە دەرێ... من لێرە دەکەیتە دەرەوە؟ ... تۆ... تۆ...

بە ڕادەیەک توورە بوو، کە هەناسەبڕکێی پێکەوت و خەریک بوو دەخنکا، ئیدی نەیدەتوانی قسەبکات، ئەوسا لە ناکاوا، تەقییەوە و هاواریکرد:

- من لێرە فڕێ دەدەیە دەرەوە ها؟ لە بیرت چووەتەوە کە لە ڕۆژی یەکەمەوە من کرێی ئەم ئاپارتمانەم داوە؟ با، هەڵبەتە جارجار تۆش داوتە. بەڵام کێ ئێرەی بەکرێ گرتووە؟... من... کێ ئێرەی پاراستووە؟... ئەمەشیان هەر من... و ئێستا دەتەوێ من لێرە فڕێ بدەیە دەرەوە ها؟ تۆ دەبێ بێدەنگ بی هەی هیچ و پووچی تۆڕی! چما نازانم چۆن نیوەی میراتیەکەی ڤیدریکت لە چنگی ژنەکەت دەرهێناوە؟ وادەزانی نازانم چۆن لەگەڵ سوزان دا خەوتوویت تا ناچاری بکەی شووت پێبکات؟...

جۆرج، بە هەردوو دەست شانەکانی ئەوی گرت و بە توندی ڕایتکاند:

- قەبووڵ ناکەم، ئەم قسانە دەربارەی ئەو بکەیت.

کلوتیلد، هاواریکرد:- دەزانم کە لەگەڵیا خەوتوویت و سواری بوویت.

جۆرج، ئامادە بوو هەر قسەیەکی دی قەبووڵ بکات، بەڵام ئەم درۆیە دەهری دەکرد. کە گوێی لەو حەقیقەتانە بوو کە کلوتیلد تۆزێ لەمە پێش دابووی بە ڕوویا، سەراپای کەوتە لەرزین، بەڵام ئەو تۆمەت و بۆختانەی سەربارەت بەم کیژە گەنجەی کە قەرار بوو بەم زووانە ببێت بە ژنی، ختووکەی دەدا کە دەست لە کلوتیلد بکاتەوە و حەسیر مەیدانی بکات. دووبارە گوتی:-" بێدەنگ بە... ئاگات لە دەمت بێ... بێدەنگ بە ها... "

وەکو چۆن لقی درەختێک تەکاندەدرێ بۆ ئەوەی میوەکانی بوەرێ، بەو ئاوایە کلوتیلدی ڕادەتەکاند.

کلوتیلد، بە قژی پەرێشان و بە دەمی داچەقیوەوە، هەر هاواری دەکرد:- لە گەڵیا خەوتوویت.

جۆرج، شانەکانی بەردا و، تا هێز لە دەستیا بوو زللەیەکی توندی ئەوتۆی بەدەم وچاویا کێشا کە ژنەی تاین بەلای دیوارەکەدا پەرت بوو وکەوتە سەر ئەرزەکە. بەڵام بۆلای ئەو گەڕایەوە و بەچوار چنگۆڵە خۆی گرتەوە و هاواریکرد:- لە گەڵیا خەوتووی!

جۆرج، هێرشی بۆ برد، خۆی بەسەریا دا، وەکو ئەوەی دەگەڵ پیاوێکا بە شەڕ هاتبێ، کەوتە وێزەی.

کلوتیلد، لە ناکاوا بێدەنگ بوو، لە ژێر جەزرەبەکانی ئەوا کەوتە ناڵین. ئیدی لەجێی خۆی نەدەجوولا. ئیدی ڕوخساری لە سووچێکی نێوان دیوارەکە و زەمینەی ژوورەکە پەنهان کردبوو و بەدەم ئازارەوە دەینالاند.

جۆرج، وازی لە لێدانی هێنا ولەجێی خۆی هەستا. ئەوسا بۆ ئەوەی هێور ببێتەوە چەند جارێک بەناو ژوورەکەدا هات وچوو. ئەوسا وەکو ئەوەی بیرۆکەیەکی بە مێشکا هاتبێ، خۆی بە ژووری نووستنەکەدا کرد، لەگەنێکی تەژی ئاو کرد و سەری بە لەگەنە ئاوەکەدا کرد. ئەوسا دەستەکانی شۆرد، پاشان بەدەم سڕینی دەست و چاویەوە، هاتەوە بۆ ژووری چاوەڕوانی تا بزانێ ئەم ژنە گەنجە چ دەکات.

کلوتیلد، لە جێی خۆی نەجمابوو، بە هەمان دەقەوە لە ئەرزەکەدا کەوتبوو و بە نەرمی دەگریا.

جۆرج پرسی:- کرمەکەت مرد یان نا؟

کلوتیلد، هیچ وەلامێکی نەدایەوە. هەنگێ جۆرج، کەمێک موعەزەب، کەمێک شەرمەزار وتەریق لە ناوەندی شوقەکەدا ڕاوەستا و کەوتە تەمەشاکردنی ئەم کەلەشەی کە لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو.

ئەوسا لە ناکاوا بڕیاری خۆی دا، کڵاوەکەی لە سووچی سۆپاکەدا هەڵگرت وگوتی:

- خودا حافیز، هەرکاتێ ئامادەبووی، کلیلەکە لەلای دەرگاوانەکە دابنە. من ناتوانم لەوەی پتر ماتەڵ بم.

چووە دەرەوە، دەرگاکەی داخست و پاشان چوو بۆ کابینەی دەرگاوانەکە و پێی گوت:- خانم لە ژوورەوەیە. کەمێکی دی دەڕوات. بە خاوەنی خانووەکە بڵێ کە لە یەکی ئوکتۆبەرەوە ئیدی ئاپارتمانەکە هی خۆیەتی. ئەمڕۆ ٨/١٦ ، ئیدی بۆ بەتاڵکردنەوەی کرێنامەکە، لە کاتی خۆیا ئاگاداری دەکەمەوە.

ئیدی بە هەشتاو لەوێندەر ڕۆیی، چونکە بۆ تەدارەکی ڕێوڕەسمی زەماوەندەکە زۆرشت مابوو دەبوایە بیکرێت.

ڕێوڕەسمی زەماوەندەکە خرابووە ١٠/٢٦، دوای کردنەوەی ئەنجوومەنانی شورا وسەنا. قەرار بوو ڕێوڕەسمەکە لە کڵێسای مادلین بەرپا بکرێ. خەڵکی بەبێئەوەی حەقیقەتەکە بەدروستی بزانن، زۆر قسە وقسەڵۆکیان بۆ دروست کردبوون. قسە وقسەڵۆکی جیاواز کەوتبووە سەر زاران. خەڵکی ژێراوژێر دەیانگوت جۆرج کیژۆڵەکەی فڕاندووە تا باب و دایکی ڕازی بن، بەڵام کەس لەم مەسەلەیە دڵنیا نەبوو.

بەگوێرەی گوتەی کارەکەرەکان، خانم ڤالتر، کە هیچ قسەیەک دەگەڵ زاوای ئایندەیدا ناکات، هەر ئەو شەوەی کە بڕیاری تەواوەتی لە سەر ئەم زەماوەندە درا، دوای ناردنی کیژەکەی بۆ دێر، دەستی دابووە خۆکوژی.

ئیدی بە نیمچە مردووی بۆ ژوورەکەی خۆیان بردبوو. هەڵبەتە هەرگیز وەکو جارانی لێنەدەهاتەوە. ئیدی قەلافەتی

پیرەژنانی پەیدا کردبوو، قژەکەی بۆز بووبوو و هەموو یەک شەممەیەک بۆ کڵێسا دەچوو و لەوێندەر دەچووە خەڵوەتەوە.

لە ڕۆژێکی سەرەتاکانی هەیڤی ئەیلوولدا، لاڤی فرانسز ڕایگەیاند کە جەنابی بارون دوروا دوکانتل بووە بە سەرنووسەری ڕۆژنامەکە و ئاغا ڤالتر پۆستی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەکەی بۆ خۆی داناوە.

هەنگێ، فەوجێک لە گوتارنووسانی بەناوبانگ، پەیامنێر، نووچەگەهان، لێکۆڵینڤانی سیاسی و، ڕەخنەگرانی هونەریی و شانۆیی، بەزەبری پارە لە ڕۆژنامە قەدیمی و سەنگینەکان دزران.

ڕۆژنامەوانانی قەدیمی و دیار، ئیدی بە بیستنی ناوی لاڤی فرانسز، بەبێ موبالاتیەوە شانیان هەڵتەدەکاند. سەرکەوتنی لەزگین و تەواوی ڕۆژنامەکە، ئەو بۆچوونە تەوسامێزەی کە نووسەرانی جدی و نمرە یەک، لە هەوەڵەوە سەبارەت بە ڕۆژنامەکە هەیانبوو، سڕییەوە.

زەماوەندەکەی سەرنووسەری ڕۆژنامەکە، بوو بە ڕۆژەڤ وهەمووان بە بویەرێکی گەورەی پاریسییان دادەنا. جۆرج دوروا و ماڵباتی ڤالتر، ماوەیەک بوو سەرنجی کونجکاوانەی زۆر کەسیان بۆ خۆ ڕاکێشابوو. هەموو ئەو کەسانەی کە لە بۆنەکانا ناویان لە کورتە هەواڵەکان و واریقاتی ڕۆژانەدا، لە ڕۆژنامەکانا دەهات، بڕیاریان دا لە ڕێوڕەسمەکەدا بەشداری بکەن.

ڕێوڕەسمەکە لە ڕۆژێکی هەتاویی پایزییدا بەرپاکرا.

هەموو خزمەتگوزاران و کارمەندانی کڵێسای مادلین، لە سەعات هەشتی بەیانییەوە، فەرشی سووریان لە سەر

پلیکانانی هاتنە ژوورەوەی کڵێساکە، کە دەیڕوانییە سەر کوچەی ڕویاڵ، ڕاخست وڕێگەیان بەو ڕێبوارانە نەدەدا کە بەنیازی هاتنە ناو کڵێساکە بوون، بێنە ژوورەوە و پێیان دەگوتن قەرارە ڕێوڕەسمێکی گەورە لە کڵێساکەدا ئەنجام بدرێت.

ئەو کارمەندانەی کە بەیانی بۆ دایەرەکانیان دەچوون، کیژانی کرێکار و ئەو شاگرد دووکانانەی بۆ سەر کارەکانیان دەچوون، هەڵوەستەیەکیان دەکرد، تەمەشایان دەکرد و لە فکران ڕادەچوون و بیریان لە خەڵکانی دەوڵەمەند دەکردەوە کە بۆ جووت بوون دەگەڵ یەکدا، ئەم هەموو پارە و پوولەیان خەرج دەکرد.

نزیکی سەعات دە، خەڵکانی کونجکاو بەرەبەرە لە دەور وبەری کڵێساکەدا خڕدەبوونەوە. چەند دەقیقەیەک ڕادەوەستان، بە ئومێدی ئەوەی ڕێوڕەسمەکە خێرا دەست پێبکات و ئەوانیش ببینن و کە هیچ هەواڵێک لە ڕێوەڕەسمەکە نەدەبوو، ئەوانیش لە دووی کاری خۆ دەڕۆیشتن.

سەعات یازدە، فەوجێکی پۆلیس هاتن و یەکسەر بڵاوەیان بە جەماوەری تەمەشاڤانان کرد، چونکە سات بە سات ژمارەیان فرە و فرەتر دەبوو.

یەکەمین وەجبە میوان، ئەوانەی کە گەرەکیان بوو جێگای باشیان بەربکەوێ تا بتوانن ڕێوڕەسمەکە لە نزیکەوە تەمەشا بکەن، سەروکەللەیان پەیدا بوو، دوو ڕیزە کورسییەکانی ئەم بەر و ئەوبەری ڕاڕەوە سەرەکییەکەی کڵێساکەیان گرت.

میوانانی دیکەش بەرە بەرە دەهاتن، خشەخش و ورشە وپرشەی جلکی ئاورێشمی خانمان دنیای پڕ دەکرد، پیاوان بە سەروسیمای پڕ ویقار وهەمووان کەم دابێژێک سەرساف، بە شێوەیەکی، کە لەوێ و لەوکاتەدا، بە ویقارتر و فەرمی تر بووبوو، ڕێیان دەکرد.

کڵێساکە بەرەبەرە تەژی دەبوو. تیشکی درەخشانی خۆرەکە کە لە دەرگا گەورەکەی کڵێساکەوە دەیدا لە ژوورەوە، یەکەمین ڕیزی میوانەکانی ڕوناک دەکردەوە. لە شوێنەکەی ئاوازخوانەکانەوە کە کەمێک لە شوێنەکانی دی تاریکتر بوو، میحرابەکە کە لە ڕوناکی زەردباوی مۆمەکانا نقوم بووبوو، لەچاو ئەو ڕوناکییە درەخشانەوە کە لە دەرگا گەورەکەی هاتنە ژوورەوە دەهاتە ژوورێ، زۆر بچووک وڕەنگ زەرد دەهاتە بەرچاو.

ئەو میوانانەی کە یەکتریان دەناسی، بە ئاماژەی دەست و سەر یەکدییان گازدەکرد و لە دەوری یەکدی خڕدەبوونەوە. ئەهلی قەڵەم کە کەمتر لە پیاو ماقوڵان و ئەشرافان، تەشریفاتیان ڕەچاو دەکرد، بەدەنگی نەوی قسانیان دەکرد و تەمەشای ژنانیان دەکرد.

نوربردوڤارن، کە لە ناسیاوێک دەگەڕا، جاک ریڤالی لە بەینی ڕیزی کورسییەکاندا بەدی کرد وبۆلای ئەو ڕۆیی. کاتێ گەییە دەف وی گوتی:- " ئێ ئیتر وایە، ئایندە هی خەڵکانی ڕەندە! " جاک ریڤال، کە دنیای دابووە بەر کلکان و بەغیلی بە هیچ شت و هیچ کەسێکا نەدەبرد، بەرسڤی دایەوە: " بۆ ئەو زۆر باش بوو. ئیدی ژیانی مسۆگەر بوو. " ئەوسا کەوتنە ناوبردن و باسی ئەوسیمایانەی کە دەیانناسین.

ریڤال پرسی:- هیچ شتێک لەمەڕ ژنەکەی پێشووی دەزانی؟

یارۆی شاعیر بزەیەکی کرد و گوتی:- ئا و نا. ئەوەندەی من بیستوومە، تەریک و گۆشەگیر، دوور لە خەڵکی دەژی، لە گەڕەکی مونمارتر... بەڵام... بەلامێک لە ئارادایە. ماوەیەکە هەندێک وتاران لە ڕۆژنامەی لاپلوم دەخوێنمەوە، کە زۆر لە وتارەکانی فورستیە و دوروا دەچێت. وتارەکان بەناوی پیاوێکی قۆز وگەنجەوە بە ناوی جان لودول ەوە بلاو دەبنەوە، گەنجێکی هۆشیار ، لە بابەتی جۆرجی دۆستمان، کە ناسیاوی دەگەڵ ژنەکەی پێشووی ئەمدا پەیدا کردووە. لەبەر ئەمە بەم ئەنجامە گەییووم کە مادلین گەنجانی تازەکاری خۆشدەوێن و ئەمە پیشەی هەمیشەییەتی. حاڵی حازر ئەو ژنێکی دەوڵەمەندە. ڤیدریک و لاروش ماتیو بە خۆڕایی هاتوچۆیان نەدەکرد.

ریڤال گوتی:- ئەم مادلینە دەلالە پارچەیەکی خراپ نییە. زۆر فاما و عەیارە. دەبێ لە خەڵوەتیشا ژنێکی زۆر باڵکێش و دەلال بێ. بەڵام تۆ پێم بڵێ، چۆنە کە دوروا دوای تەلاقی فەرمی دەتوانێ ڕێوڕەسمی زەماوەندی دووەمی لە کڵێساکەدا بگێڕێت؟

نوربردوڤارن بەرسڤی دایەوە:- بۆیە لە کڵێسادا زەماوەند دەکات چونکە زەماوەندی یەکەمی لە دیدو ڕوانگەی کڵێساوە فەرمی نەبووە.

- یانی چی؟

- یانی دۆستی ئازیزمان بیل ئامی، لە ڕووی باوەڕ نەبوونەوە بە ئەتەکێت و داب ونەریتان، یان لە بەر ئەوەی زیادە مەسرەف نەکات، تەنیا لە شارەوانیا مادلینی مارە کرد

و چاوپۆشی لە خێری زەماوەندی مەزەبی و موبارەکاندنی پەیوەندییان لە لایەن دایکی موقەدەسمانەوە، لەلایەن کڵێساوە کردبوو. لەبەر ئەمە لەدیدی کڵێساوە زەماوەندی یەکەمی بەجۆرە سیغەیەک یان پەیوەندییەکی ناڕەوا دێتە ژماردن. بۆیە ئەمڕۆ وەکو کوڕێکی عازەب، کە هەرگیز ژنی نەبووبێ، لە کڵێسادا ئامادە دەبێت، کڵێساش هەموو ڕێوڕەسمەکەیان، بە تەشریفاتی تەواوەوە بۆ ئەنجام دەدات، ئەم کارە بۆ بابا ڤالتر، زۆر پڕ خەرجە.

هەمهەمەی حەشاماتەکە، بەرە بەرە زیاتر لە ژێر گومەزی بەرزی کڵێساکەدا دەنگی دەدایەوە. هەندێ دەنگ، کە کەم دابێژ، بە بەرزی قسەیان دەکرد، دەهاتنە گوێ. پیاوە بەنامێ و ناودارەکانیان بەیەکدی نیشاندەدا، ئەوانیش بەوە خۆشحاڵ بوون کە مایەی سەرنج بوون.

ئەم پیاوانە هەمان قەڵافەتیان دەنواند کە عادەتەن لەناو خەڵکیدا ولە کۆڕ و مەجلیساندا دەیان نواند، ئەوانە فێری ئەم جۆرە کۆڕ و ئاهەنگانە بوون، چونکە بوونیان بە زینەتی زەرووری ئەم جۆرە کۆڕانە، یان بە جۆرە ئاڕایشێکی هونەری دەهاتە ژماردن.

ریڤال لە سەر گوتەکانی ڕۆیی:

– ئەرێ، برادەری ئازیز، تۆ کە زۆر هاتوچۆی ماڵی ئاغا دەکەی، ڕاستە کە خانم ڤالتر و دوروا بەهیچ جۆرێ قسەیان نییە و زاریان لە زاری یەکدی ناگەڕێ؟

– بەهیچ کلۆجێ. نەیدەویست کیژە بچووکەکەی بە دوروا بدات، لێ وادیارە دوروا، خالە لاوازەکانی بابی کیژێی گرتووە، هەندێ خاڵی لاواز سەبارەت بە مەراکش. ئیدی

هەڕەشەی لە پیرەمێرد کردووە، کە ئەو شتە ترسناکانەی دەربارەی ئەو دەیانزانیٚ، بڵاو دەکاتەوە. ڤالتریش سوودی لە ماجەراکەی لاروش ماتیو وەرگرتووە و یەکسەر ملی بۆ ئەم زەماوەندە داوە. بەڵام دایکی کیژیٚ کە وەکو هەموو ژنان کەللە ڕەقە، سوێندی خواردووە هەرگیز زاری لە زاری زاواکەی نەگەڕیٚ. کە ڕوو بەڕووی یەک دەبنەوە، دیمەنێکی عەنتیکە پەیدا دەکەن. خانم ڤالتر دەبیٚ بە پەیکەرێکی بێدەنگ، پەیکەری تۆڵە و دوروا، زۆر بە کەسەرە، هەرچەند بەڕواڵەت خۆی ئارام دەنوێنیٚ، چونکە ئەم پیاوە دەزانیٚ چۆن خۆی کۆنتڕۆڵ بکات و بە سەر خۆیدا زاڵ بیٚ.

هاوکارانی دی هاتن و تەوقەیان دەگەڵ واندا دەکرد، ئیدی گفت وگۆی سیاسیان دەکەوتە بەینەوە. ژاوەژاو و هەمهەمەی جەماوەری تەمەشاڤانانی دەرەوەی کڵێساکە، وەکو هاژەهاژی گونگی دەریایەکی دوور، دەگەڵ پرتەوی هەتاوەکەدا، لە دەرگا گەورەکەی کڵێساکەوە دەهاتە ژوورەوە ودەگەڵ زەمزەمەی هێواشتری ئەوانەی ناو پەرستگاکەدا تێکەڵ دەبوو ولەژێر گومەزە بەرزەکەدا دەنگیدەدایەوە.

لە ناکاوا پاسەوانێک کە یونیفۆرمی سەربازانی سویسرایی لەبەر بوو، بەدەسکی نێزەکەی سیٚ جاری بە پارکێتی کڵێساکەدا کێشا. هەموو ئامادەبووان، لە نێو خشەخشی جلکان و تەق وهۆڕی کورسییەکانەوە ئاوڕی لای دەرگای هاتنە ژوورەوەی کڵێساکە دایەوە. لەو کاتەدا بووکە گەنجەکە، کە قۆڵی بابی گرتبوو، لە بەر ڕۆشنایی ڕەخشانی دەرگای هاتنە ژوورەوەکە، بە دیار کەوت.

هێشتا سەروسیمای بووکە شووشەی هەبوو، بووکە شووشەیەکی جوان ودڵنەواز کە ئێستا لە ژێر تارایەکی سپی و گوڵ نارنجیدا نقوم بووبوو.

بووکێ دەگەڵ بابیدا بۆ چەند ساتێک لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا، پاشان هەرکە یەکەم هەنگاوی نایە سەر شانۆی کڵێساکە، ئۆرگەکە بە دەنگی بەرز کەوتە لێدان و هاتنەژوورەوەی بووکێی بە خەڵکانی ناو کڵێساکە ڕاگەیاند.

بووکێ، بە ئاستەم سەری دانەواندبوو، بەڵام بێهیچ شەرمکردنێک، کەمێک خەمین، لەبەر دڵان، باڵکێش و جوان، وەکو هاوسەرێکی مینیاتۆری دەهاتە پێشەوە. ژنەکان، کە چاویان پێکەوت کە بە بەردەمیاندا دەبووری، بۆی دەگرژینەوە و چپەدووی ستایشیان بەرز بووەوە. پیاوەکان لەبن لێوانەوە دەیانگوت: " لەبەر دڵان، دڵگیر و قەشەنگ. " جەنابی ڤالتر، بەڕەنگی کەمێک بزڕکاو، عەینەک لەچاو، بە کەش وفش و ویقارێکی زیاد لە پێویستەوە لە گەڵیا دەهات.

چوار کیژ لە دوایانەوە هێدی هێدی دەهاتن، هەموو شۆخ وشەنگ، جلکی پەمەییان لەبەر کردبوو، وەکو دەستە خوشکی بووکێ، دەجووڵان و بە هاودەمی ئەو دۆتمیرە جوانە دەژمێردران. کوڕانی برازاواش کە هەموویان بە دیقەت هەڵبژێردرابوون و هاوتای دەستە خوشکەکانی بووکێیان دەکردەوە، بەهەنگاوی ئارام کە دەتگوت بە ڕێنوێنی مامۆستایەکی بالێ ڕێکخرابوو، دەجووڵان.

خانم ڤالتر، لە دوای ئەوانەوە دەهات و باسکی بابی زاواکەی تری، مارکی لاتورئیڤیلین ی گرتبوو کە کاڵە مێرێکی هەفتاو ودوو ساڵە بوو. ئەو ڕێی نەدەکرد، بە پێ خشکێ دەهات، لە گەڵ هەر هەنگاوێکا دەتگوت لەوەیە ئێستا

ببورێتەوە. میوانەکان وایان هەستدەکرد پێیەکانی بەبەردەکانی زەمینەی کڵێساکەوە دەنووسێن. هەنگاوەکانی لە دووی ناچن و دڵی وەکو گیانلەبەرێک کە ئامادەی دەرپەڕین و هەڵاتن بێ، لە سینگیدا بەتووندی لێدەدات.

لاواز بووبوو. قژە سپییەکەی، هێندەی دی ڕەنگە زەرد و گۆنا قوپاوەکانی بەرجەستە دەکرد.

چاوی بڕی بووە بەرانبەر خۆی تا هیچ کەس نەبینێت و بیر لە هیچ شتێک نەکاتەوە، تەنیا لەو بابەتە نەبێ کە ئازاری دەدا.

پاشان سەر وکەڵلەی جۆرج پەیدا بوو، لە گەڵ خانمێکی دان عەمری نەناسدا. ئەو سەری ڕاست ڕاگرتبوو، بێئەوەی نیگای جێگیر و زبری لە ژێر برژانگە کەمێک چرەکانییەوە جگە لە بەردەمی خۆی بۆ هیچ شوێنێکی دی بگێڕێت. سمێڵەکانی بەسەر لێوەکانیەوە قیت وەستابوون، دەتگوت یاخی بوون. بەڵام بە شایەتی هەمووان، پیاوێکی گەنج و جوان و زۆر قۆز بوو. زۆر قۆرە دەماغ بوو. قەد و باڵایەکی شووش و باریک، ئەو جلکە ڕەشانەی کە لەبەری کردبوون، زۆری لێدەهات، نیشانی لژیون دونور، وەکو خاڵێکی خوێنین بە بەرۆکییەوە دەدرەوشایەوە.

ئەوسا ئەندامانی ماڵباتەکە دەهاتن، روز دەگەڵ سیناتۆر ریسولیندا بوو. روز، مانگ و نیوێ لەوە پێش شووی کردبوو. ویکنتس پرسمورش دەگەڵ کۆنت دولاتور ئیڤیلین دابوو. لە دوای ئەمانەوە، تاقمێکی عەجیب لە هەواداران و دۆستانی دوروا، کە بە خانەوادە و خزمە تازەکانی ناساندبوون، دەهاتن، ئەمانە خەڵکانێکی ناسراوی ناو کۆمەڵگەی مام ناوەندی پاریس بوون، لەوانە بوون کە زۆر

زوو دەبوون بە دۆستانی دڵسۆز و، لە هەندێ ڕووەوە دەبوون بە بن عامی خەڵکانی نۆکیسە، ئەسڵزادانی لە بیرکراو، نابووت، ئابڕوو تکاو، هەندێجار ژنداری بێ سەروبەر. وەکو ئاغایان بیل ڤین، مارکی دوبانژولین، کۆنت و کۆنتێس دوراڤیلین، دۆک دورومۆانو، شازادە کراڤالو، سوارچاک ڤالر یالی، دوای ئەوانە میوانەکانی ڤالتر دەهاتن، شازادە گرس، دۆک و دۆشس دوفراسین، مارکیز د دون ی جوان. ئەمانە ژمارەیەک لە خزمانی دێهاتی خانم ڤالترشیان تیابوو، کە هەوڵیاندەدا وا خۆ بنوێنن کە پڕ بە پێستی ئەم ڕێورەسم وبۆنەیەن.

ئۆرگەکە هێشتا هەر لێی دەدا، دەنگە بەرز و خۆشەکەی لە گەروە مەزن و بەتواناکەیەوە دەهاتە دەرێ و لە ژێر گومەزی بەرزی کڵێساکەدا دەنگی دەدایەوەو وەکو هاوار و قریوەی شادمانی یان داخ و کەسەری خەڵکی دەچوو بە ئاسماندا. تا لە گەڵ گەورەکان دەرگای کڵێساکە داخران و مەیدانەکەی ناوەوەی کڵێساکە وەکو ئەوەی هاتاوی لێ وەدەر نرابێ، لە ناکاوا تاریک بوو.

نها، دوروا لە تەنیشت هاوسەرەکەیەوە، لە ناو مینبەرەکەدا ڕوو بە ڕووی میحرابە ڕوناکەکە بەچۆکدا هاتبوو. قەشەباشی (اسقف) تازەی تەنجە، بە گۆچانی تایبەتی مەترانانەوە کڵاوێکی قووچی لە سەر نابوو، لە شوێنی پاراستنی شتە گرانبەها و پیرۆزەکانی کڵێساوە هاتە دەرێ، تا بە ناوی خودای بەرز وباڵاوە ئەو جووتە لە یەکدی مارە ببڕێت.

پرسیاره ئاساییەکانی ئەم جۆره ڕێوڕەسمەی پرسی، ئەڵقەکانی دایە دەستیان تا لە قامکی یەکتری بکەن، ئەو وشانە کە پەیوەندی ئەبەدی نێوان ئەو دووانەی ئیجاد دەکرد، خوێند و وەعزێکی ئاینی کورتی بەگوێی ئەم ژن و مێردە تازەیەدا دا. ئەوسا بە ئاو وتار و بۆ ماوەیەکی هەندێک درێژ، دەربارەی وەفاداری و دڵسۆزی ژن ومێرد بۆ یەکتری دوا. کابرای قەشەباشی کابرایەکی بە کەڵەشی کەڵەگەت بوو، لەو کەشیشە ڕەزا سووکانە بوو، کە زەقی ورگیان نیشانەی شکۆ و ویقاریانە.

دەنگی گریە وهەنسک هەڵدانێک، کردیە کارێک هەندێ لە ئامادەبووان سەر بۆلای شوێنی گریەکە وەربگێڕن. خانم ڤالتر بوو کە ڕوخساری لە نێو هەردوو دەستی نابوو ودەگریا.

ئەو لە ناچاریدا ڕادەست بووبوو. مەگەر چی کردبوو؟ لێ لەو ڕۆژەوە کە کیژەکەی لە ژوورەکەی کردبووە دەرەوە ماچی نەکردبوو، لەو ڕۆژەوە کە بە دەنگی نەوی بە دوروای، کە دووبارە هاتبووە بەرانبەری و بە تەشریفات و ئەتەکێتێکی تایبەتیەوە سڵاوی لێکردبوو، گوتبوو: ˚ تۆ خوێڕی ترین کەسی کە لە ژیانما دیتوومە، هەرگیز قسەم دەگەڵ نەکەیت، چونکە وەڵامت نادەمەوە! ˚ بە دەم ئازارێکی قورس و بێکۆتاییەوە دەتلایەوە. بە ڕق ونەفرەتێکی توونددەوە دەیڕوانییە سوزان، کینە و نەفرەتێک کە لە عەشقی سەودایی نائومێدانە و لە غیرە و حەسوودییەکی کوشندەوە سەرچاوەی دەگرت، حەسوودی و غیرەی دایک

و ماشقە سەبارەت بە ڕەقیب، حەسوودییەکی ناگوتەنی، هۆڤیانە و بە سوێ وەکو برینێکی تازە وساڕێژ نەبووگ.

نها، قەشەباشییەک خەریک بوو کیژەکەی و کۆنە عاشقەکەی ئەمی، لە یەک کڵێسادا، لە بەردەم ئەودا و بە حوزووری دوو هەزار کەس، لێکدی مارە دەکردا و ئەو نەیدەتوانی چ قسەیەک بکات و نەیدەتوانی ڕێگە لەم کارە بگرێت. تەنانەت نەیدەتوانی هاوار بکات: " ئاخر ئەم پیاوە هی منە، مەعشوقی منە. ئەم مارە بڕینەی ئێوە تەقدیسی دەکەن مایەی شەرمەزارییە. "

گەلێک لەو ژنانەی کە هاتبوونە بەزەیی، لەبن لێوانەوە دەیانگوت: " دایکە داماوەکەی چەند خەفەتبارە. "

قەشەباشییەکە گوتی: ئێوە لە خەڵکانی بەختەوەری ڕۆژگارن، دەوڵەمەندترین و بەڕێزترین خەڵکن. ئێوە ئاغا کە بەهرە وتواناکانتان لە خەڵکانی تری جیاکردوونەتەوە، ئێوە کە نووسەرن، مامۆستای خەڵکین، ڕێنوێنی خەڵکی دەکەن، پەند و دەرسیان دادەدەن، مامورییەت وئەرکێکی جوانتان لە ئەستۆیە، بوون بە سەرمەشق بۆ خەڵکی...

دوروا، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، گوێی لە قسەکانی قەشەباشی دەگرت. کەسێکی گەورەی ئەهلی کڵێسا ئەم قسانەی بەو دەگوت و جەماوەر، جەماوەرێکی ناودار و بە ئیحتوبار لە پشتیەوە بوون و لەبەر خاتری ئەو لەوێندەر خڕ بووبووەوە. وای دەهاتە بەرچاو کە هێزێکی نائاسایی ئەو بۆ پێشەوە دەبات، لە زەوی بەرزی دەکاتەوە. خەریک بوو دەبوو بەیەکێک لە دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی

سەرزەوی، ئەوێک کە کوڕێکی گوندی و کوڕی دوو جووتیاری بێنەوای خەڵکی کانتلو بوو.

لە ناکاوا ئەوانی لە ناو مەیخانە پەڕپووتەکەیاندا هێنایە بەرچاوی خۆی، مەیخانەیەک بەسەر تەپەیەکەوە و، بەسەر بەرزاییەکەوە کە دەیڕوانییە دۆڵە گەورەکەی روئان، دایک و باوکی، بەدەم پیاڵەدانانەوە بۆ گوندییانی ناقۆڵا، هێنایە بەرچاوی خۆی. دوای وەرگرتنی میراتیەکەی کۆنت دوڤیدریک، پێنج هەزار فرانکی بۆ ناردبوون. نها بە تەمابوو پێنج هەزار فرانکیان بۆ بنێرێت، مولکێکی بچووکیان بۆ بکڕێت تا شاد و بەختەوەر بن.

وەعزە بە ئاو وتاوەکەی قەشەباشی تەواو بووبوو. قەشەیەک بە جبەیەکی زێڕینەوە سەرکەوتە سەر میحرابەکە و، دەنگی ئۆرگەکە ئومێدی ژیانێکی پڕ بەختەوەری بۆ ئەو جووتە خواست.

هەندێجار دەنگ و دەنگدانەوەکە ئەوەندە سەیر بوو لە شەپۆلی دەریا دەچوو، هێندە بەهێز وبەرز دەبووەوە، لە تۆ وایە هەرئێستا گومەزی کڵێساکە هەڵدەکەنێ و بە ئاسمانی شینیدا دەبات. دەنگی پڕ لەرەی ئۆرگەکە، کڵێساکەی پڕ دەکرد و گیان وجەستەی دەهێنایە لەرزین. پاشان لە ناکاوا ئارامی دەگرت، نۆتەێن ناسک و تەڕ وتازە دەچوون بە حەوادا، وەکو شنەیەکی خۆش، نەرم، ختووکەی گوێچکەیان دەدا، ئەمانە نەوا وئاوازی جوان، نەرم وناسک و بەرز ونزم بوون، کە وەکو مەلێن بچووکی خۆشخوان، پەڕ وباڵیان لێک دەدا. دوای ئەوە، ئەم موزیقا جوان و دڵنەوازە دووبارە و لە

ناکاوا بەرز دەبووەوە، لەبەر بەهێزی خۆی ترسناک دەبوو، دەتگوت پوشکەیە کە گۆڕاوە و بووە بە دنیایەکی گەورە.

پاشان دەنگێن مرۆڤانی بەرز بووەوەو بە سەر سەرە داخراوەکاندا تێ پەڕی فری ولاندوک، دوو ئاوازخوانی نێوداری ئۆپرا خەریک بوون دەسترین. بۆنی خۆشی داری عود کڵێساکەی پڕ کرد، لە میحرابەکەدا ڕێوڕەسمی بەخشین وقوربانی خواوەندی ئەنجام دەدرا. فرزەندی خودا، بەگازی پیروخاکیانەی خۆیەوە دەهاتە سەر زەوی تا سەرکەوتنی بارون جۆرج دوروا موبارەک بکات.

بیل ئامی لەلای سوزانەوە بەچۆکا هاتبوو و سەری دانەواندبوو، لەوکاتەدا خۆی کەم وزۆر بە ئیماندار، کەم وزۆر بە مەزەبییەکی سەرڕێژ لە ئەمەکداری دەرهەق بە خوایەک دەزانی کە ئاوڕی لەو دابووەوە و بەڕێزەوە ڕەفتاری دەگەڵ ئەودا دەکرد، بێئەوەی بە دروستی بزانێ ڕووی کردە کێ، سەبارەت بەم سەرکەوتنەی خۆی، سوپاسی دەکرد.

وەختایەک ڕێوڕەسمی مەزەبی کۆتایی هات، لە جێی خۆی هەستا، قۆڵی لە قۆڵی هاوسەرەکەی کرد و چوو بۆ شوێنی پاراستنی شتە پیرۆزەکانی کڵێساکە. هەنگێ مەسیرەی بێ پایانی بەشدارانی ڕێوڕەسمەکە دەستی پێکرد. جۆرج غەرقی خۆشحاڵی، خۆی بە پاشایەک دەزانی کە میللەتەکەی هاتبووە پێشوازی. دەستانی دەگوشی، هەندێ وشەی پچرپچڕی نامەفهوومی دەگوت، سڵاوی دەکرد، وەڵامی پیرۆزبایی خەڵکی دەدایەوە و لێکدا لێکدا دەیگوت: " زۆر بەخێر هاتن، لوتفتان هەیە. "

لە ناکاوا چاوی بە خانم دوماریل کەوت، یادی هەموو ئەو ڕامووسانانەی کە بەوی دابوون ولەوی سەندبوون، یادی هەموو ناز نەوازشەکان، ڕاز ونیازەکان، عاشقێنی و عەشقبازییەکان، دەنگدانەوەی دەنگەکان و تامی لێوەکانی، لە ناکاوا هەوەس و ئارەزووی لە هەمێز گرتنی ئەویان لە خوێنیا هێنایە جۆش. ژنێکی گەنج و خشیک و لەبار، سەروسیما منداڵانە و نیگا زندوو و گەش بوو. لەدڵی خۆیدا گوتی: " وێڕای هەموو شتێک چ ماشقەیەکی دڵنەوازە. "

کلوتیلد، بە سووکە شەرمێک و کەمێک نیگەرانییەوە هاتەپێشەوە و دەستی بۆ درێژ کرد. جۆرج دەستی گرت و لە دەستی خۆیدا ڕایگرت، هەنگێ هەستی بەگازی پەنهانی ئەم قامکە ژنانەیە و گوشینی ئەم قامکانە لە ناو دەستی خۆیدا کرد کە لە هەموو شتێک عەفووی دەکرد ولاپەڕەیەکی تازەی دەکردەوە و هەموو شتێکی لە نوێ دەست پێدەکردەوە. ئەویش ئەم دەستە نەرم وناسکانەی گوشی، دەتگوت دەیەوێ بڵێت: " هێشتاش هەر خۆشم دەوێی، هەر هی تۆم! "

نیگایان، خەندان، درەخشان و لێوانلێو لە عەشقدا، لێکدی هەڵەنگوت. کلوتیلد، بەدەنگە ناسک و دڵنەوازەکەی، لەبن لێوانەوە گوتی: " بەهیوای دیدار ئاغا. "

جۆرجیش، بە شادمانییەوە بەرسڤی دایەوە: " بە ئومێدی دیدار خانم . "

ئەوسا کلوتیلد، ملی ڕیگای گرت و ڕۆیی.

خەڵکانی دی هێدی هێدی دەهاتنە پێشەوە. حەشیمەتەکە وەکو ڕووبارێک بە بەردەمیا دەڕۆیی. ئیدی ژمارەی ئەوانەی

که بۆ موبارەک بایی دەهاتن، بەرەبەرە کەم بووەوە. دوایەمین بەشداران بە بەردەمیاندا تێپەڕین. جۆرج، بازووی سوزانی گرت، تا دووبارە مەیدانی کڵێساکە تەی بکەن.

کڵێساکە پڕبوو لە خەڵکی، هەموو میوانەکان گەڕابوونەوەو لەشوێنی خۆیان ڕۆنیشتبوون تا بووک وزاوا، کە پێکەوە ڕێیان دەکرد، ببینن.

جۆرج بە هەنگاوی هێواش و ئارام دەڕۆیی، سەری بەرز گرتبوو و چاوەکانی بڕی بووە حەوشەکەی بەر کڵێساکە کە لە تیشکی خۆرا نقوم بووبوو. پێستی بەدەنی بە ئاستەم مێرولەی دەکرد، لەو مێرولە و تەزوانەی کە لە خۆشی و بەختەوەریدا بە قالبی بەشەرا دێت. کەسی نەدەبینی. تەنیا بیری لە خۆی دەکردەوە.

وەختایەک گەییە ئاستانەی دەرگا گەورەکەی کڵێساکە، چاوی بە حەشیمەتێکی زۆر کەوت، حەشیمەتێکی ڕەش، پڕ سەر وسەدا، کە بۆ دیتنی ئەو خڕ بووبوونەوە، بۆ دیتنی جۆرج دوروا. خەڵکی تەمەشایان دەکرد و خۆزیان پێدەخواست.

پاشان، نیگای لە جەماوەرەکە گواستەوەو، کردیە شوێنێکی دیکە. لە دوورەوە، لە پشت مەیدانی کنکوردەوە چاوی بە ئەنجوومەنی نوێنەران کەوت. وای هاتە بەرچاو نها دەتوانێت، بەیەک باز، لە دەرگا گەورەکەی کڵێسای مادلینەوە خۆی بگەیەنێتە دەرگا مەزنەکەی پالەبوربۆن.

بە پلیکانە بەرزەکانی کڵێساکەدا، بە نێوان ئەو دوو دیوارەدا کە تەمەشاڤانان ئیجادیان کردبوو، داگەڕا و چووە خوارەوە. بەڵام ئەو، ئەوانی نەدەبینی، بیری بۆ دواوە

دەگەڕایەوە، چاوی لەبەر تیشکی هەتاوەکە هەڵنەدەهات... بەو حاڵەوە بەخەیاڵ خانم دوماریلی دەبینی کە لەبەر ئاوێنەدا وەستاوە وخەریکە قژە کورتە لوولەکەی سەر لاجانگەکانی ڕێک دەخات، ئەو قژەی کە هەمیشە، وەختایەک لە ناو جێگا دەهاتە دەرەوە، تێک دەڕژا و دەئاڵۆسکا.

**تێبینی:** ڕۆژی ٢٠٢١/٥/٣١، لە سلێمانی/ گەڕەکی چوارچرای نوێ، لە پاچڤەی ئەم ڕۆمانە بوومەوە کە لەم دەقەوە کردوومە بە کوردی: گی دو موپاسان/ بل ئامی/ ترجمە: پرویز شهدی/ انتشارات مجید چاپ اول، تهران. ١٣٨٤.

# زنجیرە چاپکراوەکانی
# دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان
# ساڵی ٢٠٢١ - ٢٠٢٢

١- میتۆد و لێکۆڵینەوە. نووسینی: پ.ی د. سامان حوسێن ئەحمەد.

٢- دۆزەخ. نووسینی: ژان-پۆل سارتەر. و: د. نەجاتی عەبدوڵلا.

٣- فرانسیسکۆس... قەدیسی من. نووسینی: نیکۆس کازانتزاکیس- و: دلاوەر قەرەداغی.

٤- چوارمێخە کێشانەوەی مەسیح. نووسینی: نیکۆس کازانتزاکیس- و: دلاوەر قەرەداغی.

٥- ڕاپۆرت بۆ گریکۆ. نووسینی: نیکۆس کازانتزاکیس- و: دلاوەر قەرەداغی.

٦- مێژووی میدیا. نووسینی: دیاکۆنۆف ئیگەر میخایلۆفیچ. و: د. پێشەوا خالید

٧- هۆمۆدیۆس مرۆڤی خوداڕەنگ: مێژوویەکی پوختی داهاتوو.

نووسینی: یووڤال نووح هەراری- و: عەلی نادر.

٨- کەژاڵ- نووسینی: مەندانا موعینی. و: ڕووناک شوانی.

٩- سەرکێشیی یەکەمی ئەقڵ- نووسینی فراس السواح. و: د. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد.

١٠- لە بارەی مێژوو و کولتووری کوردییەوە. نووسینی: د. زرار سدیق تۆفیق.

١١- فەلسەفاندنی پەتا- نووسینی: ئازاد حەمە.

١٢- کلۆڵی مێژووگەرایی. نووسینی: کارل پۆپەر. و: بادینان محەمەد.

١٣- زەردەشت ئاوا دوا. نووسینی: فریدریش نیتشە. و: یاسین بانیخێلانی.

١٤- مێژووناسی و فەلسەفەی مێژوو. کۆمەڵێک نووسەر. و: بێستوون عەبدولکەریم.

١٥- ڕێگاکانی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. نووسینی: ئەلێخاندرۆ زامبرا- و: ئارام ڕەشید.

١٦- دوژمنی گەل. نووسینی: هێنریک ئیبسن- و: محەمەد فەریق حەسەن.

١٧- ڕەچەتەی پزیشکی بۆ ئەوپەڕی بەختەوەری. نووسینی: دیپاک چۆپرا- و: غازی محەمەد.

١٨- لەوانەیە ون بووبێتم. نووسینی: سارا سالار- و: محەمەد کەریم.

١٩- چاخی بەردین لە کوردستانی باشووردا. دۆرۆسی گارۆد- و: محەمەد حەمەساڵح تۆفیق.

٢٠- قامەتی پاییز. نووسینی: سەلام مستەفا.

٢١- ئابووری. نووسینی: پارسا داسگیوپتا - و: ئەیوب حەسەن

٢٢- گەندەڵی. نووسینی: لێسلی هۆمس- و: بیلال ئیسماعیل حەمە

٢٣- سەرمایەداریی. نووسینی: جەیمس فولچەر- و: بیلال ئیسماعیل حەمە

٢٤- زانیاری. نووسینی: لۆچیانۆ فلۆریدی- و: حوسێن ڕابی(حوسێنی)

٢٥- کۆیلایەتی لە ئەمەریکا. نووسینی: هێثەر ئەندریا ولیامس- و: هۆگر خدر

٢٦- واتای ژیان. نووسینی: تێری ئیگڵتن- و: عەبدولخالق یەعقووب

گی دو موپاسان، نووسەری فەرەنسایی لە ١٨٥٠/٨/٥، لە کۆشکی "میرومانسنیل"ی هەشت کیلۆمەتری دیپ دێتە دنیاوە. لور دو موپاسان، وەکو دایکێک دەیەوێت کوڕەکەی بە دەستوور و داب و نەریتێن ئەشرافیانەی ماڵباتەکەی خۆی پەروەردە بکات.

بابی، واتە گوستاف دو موپاسان، هیچ پیشینەیەکی ئەشرافی نەبوو، یانی ئەشراف زادە نەبوو، ئیدی ژیانی خێزانداری ئەم ژن و پیاوە بەهۆی غرووری ژنەکە و سەرسەرێتی و لامێژیی نهێنی پیاوەکەوە، هەمیشە ناخۆش و بە ئاژاوە بووەو کەشێکی ئارام و ئاسوودە بۆ ئەم کورێژگە هەستیارە نەڕەخساوە. ئیدی بەهۆی کێشماکێش و شەڕە دەنووکی بەردەوامی ئەم دایک و باوکەوە، بەرەبەرە نیشانەێن خەمینی و ڕەشبینی لە کوڕەکەدا پەیدا دەبێت و باندۆر و کاریگەریی شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی بەردەوامی ئەم دایک و باوکەی تا مردن لە کۆڵ نابێتەوە.






ناوەندی توێژینەوەی ئەدەبیی
عەبدولڕەحمان زەبیحی
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2022